ادع الى سبيل ربك بالحكمة و الموعظة الحسنة و جادلهم بالتي هو أحسن

# ووتاری هەینی

# ئاسودەیی ئیسلام



## بەرگی یەکەم



نووسینی

فاتح مەلا ڕەسول شارەستێنی

چاپی یەکەم

١٤٣٣ك - ٢٠١٢ز

ناوی کتێب: ئاسودەیی ئیسلام

نووسەر: فاتح مەلا رەسوڵ شارەستێنی

بابەت: ئاینیی، وتاری هەینی

بەرگ: یەکەم

ساڵی چاپ: ١٤٣٣ک، ٢٠١٢ز

چاپ: یەکەم

چاپخانە: چاپخانەی زانا

پێشکەشە بە:

دایکو باوکی خۆشەویستم.

هەموو ئەو کەسانەی کە لەخزمەتیاندا خوێندوومە.

رۆحی مامۆستا عەبدولکەریمی مودەریس، ئەو کەسەی بۆ یەکەمجار لەکوردستاندا؛ وتاری رۆژی هەینی بەزمانی شیرینی کوردی بۆ گەلی کورد خوێندەوە.

بەهاوسەری بەرێزو هاورێبازم.

نوری چاوانم محەمەدو ئیبراهیمو ئاسوودەو ئەڤین.

بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس و ستایش بۆخوای تاكو تەنیاو بێ شەریك، درودو سڵاوی خوا لەسەر پێشەواو سەروەرمان" نوری چاومان" شەفیعی مەحشەرمان محمد المصطفى (ﷺ). بێت.

رەزاو رەحمەتی خوا لەسەر یارانو شوێنكەوتووانی تاقیامەت.

بەڕێزان: ئەوەی لەدووتویی ئەم كتێبەدا دەیخوێنیتەوە: وترای رۆژانی هەینییە كە خوێندومەتەوەو بە (سی دی) بڵاوكراونەتەوە، پاشان بەشێوەی نووسینی كتێب داڕێژراوەتەوەو منیش خستنمە بەردەستی خۆشەویستان و بەڕێزان لەوتاربێژان و بانگخوازان، بەئومێدی ئەوەی لەدوعای خێر بێبەشمان نەكەن، ئەوەی راستو رەوان بوو، ئەوە فەزڵی خوایە بەسەرمانەوەو ئەوەش كە هەڵەو كەموكوڕی بوو، لەلایەن بەندەوەیەو داوای لێبوردن لەو خوایە دەكەم كە تەنیا هەرئەوە تووشی هەڵە نابێو لەهەڵەی بەندەكانی دەبووری..

خوای گەورە پشتو پەنای هەموو لایەك بێت.

**مەلا فاتح**

# ناوەڕۆک

# ووتاری یەکەم
# بۆ مانگی موحەڕەم

## کۆچکردنی پێغەمبەری خوا لە مەککەوە بۆ مەدینەو سەری سالی کۆچی

الحَمْدُ لله رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجمعين.

**ئيمانداران:** ئێستا ئێمە وا لە سەری ساڵی کۆچی (......) دا دەژین.

بۆنەو یادێکی پڕ بایەخە کە شاو سەرمەشقی بۆنەو یادەکانە. کە ئەویش (هیجرتە) کۆچکردنی پێغەمبەری خواو هاوەڵانیەتی لە مەکەوە بۆ مەدینە. جائومێدەوارم ئەم ساڵی کۆچی یە بەخۆشی و بەرەکەتی دین و دنیاوە بە سەرماندا بێ و خوای گەورە بەندایەتی و خواپەرستی ساڵی ڕابردووی لێ وەرگرتبێن و لەکەم و کوڕییەکان و هەڵەو تاوانەکانمان بورا بێت (إن شاء الله).

**خۆشەویستان:** لە ئیسلامدا زۆر بۆنەو موناسەبات و یادکردنەوە هەن. کە بە شێکن لە سیرەتی ژیاننامەی پێغەمبەری سەروەرمان (ﷺ). کە پێویستە مرۆڤی موسڵمان بەگەورەو بەتەمەنیەوە. تاوەکو منداڵ و لاوی. بەژن و پیاویەوە. بەخوێندەوار نەخوێندەواری یەوە بە هەموو ئاست و چین و توێژێکیەوە، لێ ی شارەزابێ و لێ ی بەهرەمەند بێ و بیکات بەسەر مەشق و چاو ساغ ڕابەری لە ژیانی ڕۆژانەیدا و لە بواری تاك و خێزان و کۆمەڵ و حکومەتدا. وە هەموو ساڵێك یادیان بکاتەوە، بەڵام وەکو ئاهەنگ و چیرۆك گێڕانەوە نا. بەڵکو هەرجارەی هەندێ لە ئامۆژگاری و وانەو دەرسەکانی ئەو یادە باس بکرێن کە بۆ ئێستا و داهاتومان ڕووناکی ڕێگامان بێ (إن شاء الله).

بەڵام مێژووی موسڵمانان گەلێك بۆنەو یادی گەورەو گرانبەهای تێدان. بەڵام لە ناویادا ئەو لەویەت و پلەبەندی و جیاوازی هەیە.

لە دایك بوونی پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر گەورەو پیرۆزە. (بعثة) و بوون بەپێغەمبەربونی گەورەتر، یادی بەدرو ئوحود وخەیبەرو فەتحی مەککەی زۆر گەورەن.

یادی موعجیزەی شەوڕەوی (ئیسراو میعراج) تاکە موعجیزەی تایبەتە بە حەزرەتی محمد المصطفی (ﷺ) لە ناو هەموو پێغەمبەراندا.

بەلاّم هیجرەت شای هەموو یادو موناسەبەتەکانە.کە دواتر کرا بەسەری سالّی موسلّمانان. کەپێ ی دەوترێ سالّی کۆچی. کە لەزەمانی فاروق و موجتەهیدو فەقیهی ئیسلام حەزرەتی (عومەری کوڕی خەتتاب) دا. بیری لەوە کردەوە کەدەبێ موسلّمانان مێژوویەکیان هەبێ. ئەو مێژووەش لە یاد و موناسەباتێکی گەورە وەرگیرابێ ، ئەوە بوو دوای ڕاوێژێکی زۆرو ئالّوگۆڕی بیروڕا، یادی هیجرەت هەلّبژێردراو کرا بەسەری سالّی کۆچی، لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێ، ئەویش ئەوەیە: باشە بۆچی لە ناو هەموو بۆنەو ڕووداوە گەورەو گرنگەکاندا هیجرەت و کۆچ هەلّبژێردرا ؟! لە وەلاّمی ئەو پرسیارەدا دەلّێین:

١- هیجرەت دووبارە دەبێتەوە تا قیامەت هیجرەت هەر هەیە. بە جۆرەکانی هیجرەتەوە کە دواتر (إن شاء الله) باسی دەکەین، وەهیجرەت بەرهەمی تاکەکەس نی یە. بەلّکو کۆمەلّ کاریەو کارێکی دەستە جەمعی یە. بە تەمەنی تێدایە وەکو أبوبکر. گەنجی تێدایە، عەلی لاوی وریاو چالاکی بواری هەوالّگری تێدایە.

عبد الله کوڕی أبوبکر. شوانی تێدایە عبداللەی کوڕی ئورەیقت. ئافرەتی تێدایە ئەسمائی کچی أبوبکر.

**کەواتە:** ئیسلام بڕوای بەوە نییە کە موناسەبەتی فەردی و تایبەت بەتاکە کەس بکرێ بە بنچینەو مێژووی ئومەت و گەل نەتەوە...

٢- لە هیجرەتدا. نەك هەر مرۆڤە موسلّمانەکان بەشداریان کرد. بەلّکو بالّندەو زیندەوەرانیش. گیاندارانیش بەشداریان تێداکردوە. بە نوێنەرایەتی بالّندەکان. کۆتر، ڕەمزی ئاشتی و بێوەیی بەشداری کرد.

که تا ئێستاش کۆترەکان لەو ووشکانی ئەشکەوتی (ثـــە ور) دا بــە کۆمــەڵ لــە دەوری ئەو ئەشکەوتەن و بە چاوپێکەوتنیان یادو بیرەوەرییەکانمان دێنــەوە بەرچــاو. بە نوێنەرایەتی مێروەکان: (جاڵجاڵۆکە) بەشداری لە هیجرەتدا کـردو دیفـاعی لــە پێغەمبەر (ﷺ) کرد. حوشتری ئاژەڵی چالاکی بیابان بەشداری کرد.

هــەروەها لــەڕووی جــوگرافی یــەوە: شــاخ، ئەشــکەوت، بــەرزی ونزمــی ، بیابــان، ووشکایی ڕێ ی ڕاست، لاڕێ ، باخات ، مەڕو مالآت، تاکە ماڵ ، دێهــات ، شــار هەمووی بەشداری ئەم گەشتەی هیجرەتیان کردو ناوی خۆیان تۆمار کرد.

٣- ڕێکخستنی کاروبارەکان ، سیاسەت و ڕێکخستنی دیاری کرد. **بەم شێوەیە:**

١- هەموو صەحابە تاك تاك و دوو سێ، بە دزی یەوە کۆچیان کرد.

تەنها پێغەمبەری خواو أبوبکر و عەلی ماڵ ومناڵیان مانەوە لە مەککەدا.

کــە ئــەوەی بــە ڕابــەرو سیاســەت مــەداران گــوت: دەبــێ ســەرکردە خــۆی بجاتــە مەترسیەوەو شوێن کەوتوانی ڕزگار بکات. وە ڕزگار بوونی گیانی شوێن کــەوتوانی پێش گیانی خۆی بجات.

٢- لە هیجرەتدا هەموو هەنگاوێك بە ئیحطیاط و ووریاییەوە دەنرێت، **وەکو:**

أ- پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە گەرمەی نیوەڕۆدا چوو بــۆ مــاڵی حــەزرەتی أبــوبکر! چونکە لەو کاتەدا لەبــەر گــەرما کــەس بــە دەرەوە نییــە لــە گەرمــەی نیــوەڕۆدا تابیبێنێ، وە پێشتر هەرگیز لەو کاتەدا کەوەختی پشوو ئیسراحەتە نەچوو بــوو بــۆ ماڵی أبوبکر تاوەکو مەترسی ئەوەی هەبێ لەو کاتەدا چاودێری بکرێ.

ب- پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێشتا زیاتر ئیحطیاط دەکات و دەم وچاوی دەپێچــێ ، تا ئەگەر کەسێکیش بینی نەیناسێتەوە.

جـ- کەچوە ماڵی أبوبکر فەرمووی: ئەی أبوبکر باکەس لە ژوورەوە نەبێت ، ئیشــی تایبەتیم پێتە کە ئەمەش فێری وانەی (نهێنی پارێزی) مان دەکات.

د- فەرمووی: ئەی أبوبکر فەرمانی هیجرەتم پێ دراوەو تۆش هاوەڵمی.

بەڵام نەیفەرموو لە کوێوە دەڕۆین ودەچینە کوێ ، چونکە جارێ ئەوە پێویست نی یە ئاشکرا بکرێ.

هـ- پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەسمائی کچی أبوبکری ئاگادار کرد کە دەچێتە ئەشکەوتی (ثه ور) دەبێت ئەسماء خواردنیان بۆ ببات و دواتر لەوێ هەندێ کاری گرنگی پێ دەسپێرێ، پرسیار: باشە بۆچی ئەسماء؟! وەڵام:

١- زۆر نهێنی پارێزە، ئەوەتا دواتر أبو جهل دەچێتە بەر دەگایان و هەڕشەی لێ دەکات کە دەبێ پێ ی بڵێ محمد و باوکی بەرەو کوێ ڕۆیشتون. وە بە توندیش زللەیەك دەدات لە گوێ ی ئەسماء وگوارەکەی لە گوێ دەردەپەڕێنێ. بەڵام ئەسماء دەڵێ نازانم و هیچ نهێنیەك نادرکێنێ.

٢- ئەسماء ئافرەتێکی حامیلەیەو سکەکەی (٧) مانگەو کەس عەقڵی نایبڕێ ئافرەتێکی دووگیان بەو حاڵەوە بگاتە شوێنێکی وەکو ئەشکەوتی (ثه ور).

وەلێرەدا ئەو وانە گەوریەش فێر دەبین کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند سیقەو متمانەی بە ئافرتەو چۆن لەگەڵ پیاودا نەك هەر جیاوازی ناکات. بەڵکو ئەو کارە نهێنیە پڕمەترسیەی کە پیاوانی گەورە نەیاندەزانی، بە ئەسماء سپێردراو متمانەی پێ کرا.

و- پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ حەزرەتی أبوبکردا لە شەودا بەرەو ئەشکەوتەکە بەڕێکەوتن وە لە دەرگای پشتی ماڵەکەوە چونە دەرەوە، نەوەکو کەس لە دەرگای دەرەوە بیانبینێ.

ز- ئەبوبەکر وای زانی کە بەڕێگای ئاسایی مەدینەدا دەڕۆن.

بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێکەی پێچەوانەی مەدینەی هەڵبژاردوو ڕووی کردە باریکە ڕێگایەکی وا کە تەنها یەك کەس دەیتوانی پێی دا بڕوات. تاوەکو گەیشتنە ئەشکەوتی (ثه ور).

بەڵێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ حەزرەتی أبوبکر گەیشتنە ناو ئەشـکەوتەکە، ئەمجا ڕۆژ بۆوەو دنیا ڕووناك بۆوەو ئەوانەی کە بۆ کوشتنی پێغەمبەری خـوا (ﷺ) لەبەر دەگای ماڵی حەزرتدا وەستابوون. بۆیان دەرکەوت پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ماڵەوە نەماوەو ئەوەی لە ناو جێگاکەدا خۆی داپۆشیوە عەلی کوڕی ئەبو طالبـە. بۆیە قورەیش زۆر پەرێشـان بـون و تێکـڕا کەوتنـە گـەڕان، خـەڵاتی زۆر گـەورەی (١٠٠) حوشتریان دیاری کرد بۆ هەرکەسێ محمد بـە زینـدویی یـان بـە مردویـی بگێڕێتەوە بۆ مەککە. بەڵێ لە کاتی گەڕاندا سەرانی کوفری مەککە گەیشتنە سەر ئەشکەوتەکە بەڵام خوای گەورە پێغەمبەری خواو ئەبوبەکری پاراسـت و کافرەکـان هەر چەند لەسەر ئەشـکەوتەکە وەسـتابوون و ئەگـەر سـەیری ژێـر قاچـی خۆیـان بکردایە ئەیانبینین  بەڵام خوای گەورە پاراستنی و دوای بینینی هێلانـەی کـۆترو تەونی جاڵجاڵۆکە خۆیان لەناو خۆیاندا دەیانویست قەناعەت بە یەکتر بکەن کە ئەم ئەشکەوتە کەسی نە چۆتە ناوەوە و گەڕانەوە.

**لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت:** باشە بۆچی کافرەکان چونە سەر ئەشکەوتەکە لە کاتێکـدا هـیچ عـەقڵێك نەیـدەگرت کـە پێغەمبـەر (ﷺ) لـە مەککـە دور نەکەوتبێتەوە و لەو ئەشکەوتەدا بێ؟

**لە وەڵامدا دەڵێین:** کاری خوا هەمووی لەو پەڕی جوانی دایە. کافرەکان چونە سەر ئەشکەوتەکە. بۆ ئەوەی پێغەمبەری خـوا (ﷺ) لەگـەڵ حـەزرەتی أبـوبکردا ئـەم وانەیە بخوێنن و بە کردەوە بە چاوی سەر ببینن کە: هەر چەندە پلان سـەرکەوتوبێ و نەخشەسازی و ئیحطیاط بکرێ، پاراستن هەر بەدەست خوایەو دەبێ تـەنها پشـت بەخوا ببەسترێ دوای ئەوەی هەموو سەبەبەکانی خۆپاراسـتن بـەکار هێنـرا، ئـەوجا نابێ وا بزانی ئەو هۆکارانە دەتپارێزن. بەڵکو تەنها خوای گەورە دەتپارێزێ.

**ئیمانداران:** دوای گەڕانێکی زۆر، قورەیش بە نائومێدی یەوە گەڕانەوە بۆ مەککە و لەم کاتەدا ئەسماء خواردنی بۆ بردن بۆ ئەشکەوتەکە. لە ئەشکەوتەکەدا کۆبونەوەیەکی سێ قۆڵی کرا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، أبوبکری صدیق ، ئەسماء ، پێغەمبەری خوا (ﷺ). بەڕاوێژی أبوبکر و ئەسماء. نەخشەی ڕۆژانی داهاتوی داناو جێ بەجێ کردنی نەخشەکە سپێردرا بە ئەسماء.کەواتە: ئەسماء بوو بە لێپرسراوی ڕێکخستنی نهێنی ناو شار. نەخشەکەش بەم شێوەیە کارەکانی دابەش کردبوو:

١- عبداللە کوڕی أبوبکر. کە گەنجێکی زۆر ووریاو چالاك بوو. زۆر بەهەست بوو. زوو لەشت دەگەیشت، دانرا بە هەواڵگر و چاودێری جموجۆڵی دوژمن. کە دەبێت ڕۆژانە بچێتە ناو خەڵك و گوێ لە قسەکانیان بگرێ و بزانێ پیلانی تازەیان چی یەو بەرەو کوێ دەڕۆن بۆ دۆزینەوەی پێغەمبەری خواو حەزرەتی أبوبکر. پاشان کە دنیا تاریکی کرد زۆر بە نهێنی بەرەو ئەشکەوتی ثە ور بڕوات و دەنگ وباس و هەواڵ ئەو ڕۆژەیان پێ بگەیەنێ، بەم شێوەیە عبداللە ی کوڕی ئەبوبەکر هەموو شەوێك ماوەی (٧) سەعات بەپێ دەڕۆیشت چونکە ئەشکەوتی ثە ور بەنزیکی (٣بۆ٤) سەعات لە مەککەوە دوورە. کەواتە بە چوون و هاتنەوە هەر لەهەمان شەودا (٧) سەعات بەپێ دەڕۆیشت. وەپێش دنیا ڕووناك بوونەوە خۆی دەکردەوە بەماڵی خۆیاندا و وای نیشان دەدا ئەو شەوە لەناو ماڵی خۆیان نەچۆتە دەرەوە.

٢- عامیری کوڕی فەهیرە: کە شوانی مەڕەکانی حەزرەتی أبوبکر بوو. مەڕەکان بەرێتە نزیك ئەشکەوتەکە بۆ دوو مەبەست:

١- شیریان بداتێ.

٢- جێ پێکانی شەوی عبداللە ڕەش بکاتەوەو کەس هەست نەکات بەو ناو پوش و پەلاشەدا کەسێك بەرەو ئەشکەوتەکە چووە.

٣- کەسێك پەیدا بکەن بەلاڕێ و ڕێگایەکی نە ناسراودا، کە کەمترین هاتوچۆی خەڵکی لەسەر بێ، بیانگەیەنێتە مەدینە، ئەو کەسەش دەبێ دوو صیفەتی تیادا بێت:

١- زۆر نهێنی پارێزو ئەمین بێ.

٢- خبير الصحراء — بێ ، زۆر شارەزایی بیابان بێ و هەموو ڕێگاکان بزانێت، ووتیان: تەنها کەسێکی موشریك هەیە بەڵام ئەمین و زمان سەلامەت و زۆر شارەزایە. ئەو پیاوەش: (عبداللەی کوڕی ئوڕەیقیط) بوو. پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕازی بوو کە پەیوەندی پێوە بکرێ و کرێ ی باشی پێ بدرێ و دوو حوشترەکەی أبوبکر ئامادەی کردبوون بۆ ئەوە سەفەرەی هیجرەت. بدرێتە دەستی و بیانبات بۆ ئەشکەوتەکەو لە وێوە بیانگەیەنێتە مەدینە.

**لێرەش دا ئەو وانەیە فێردەبین کە:** دروستە یارمەتی لە کافری ئەمین و شارەزا وەربگیرێ. بەڵێ، بەم شێوەیە دەرچون و لە ڕێگادا ئەگەر کەسێکیان توش ببوایە ، زۆر کەس أبوبکری بە هۆی بازرگانی یەوە دەناسی، دەیانگوت: ئەی ئەبوبەکر ئەو پیاوە کێ یە هاوڕێتە؟ حەزرەتی أبوبکر دەیفەرموو: (هذا هادٍ يهْديني السَّبيل) ئەم پیاوە بەڕێزە ڕێنیشادەرەو ڕێگام نیشان دەدات و لە بزربون و سەر لێتێکچوون دەمپارێزێ، کەسە پرسیارکەرەکە واتێ دەگەیشت کە أبوبکر مەبەستی ڕێگای بیابانە، بەڵام حەزرەتی أبوبکر مەبەستی ئەوەبوو کە ئەمە پێغەمبەری پێشەوامەو ڕێگای ئیسلامم نیشان دەدات و لە گومڕایی و سەرگەردانی ڕزگارم دەکات! کە ئەمەش پێ ی دەوترێ (تەوریە) کە درۆش نەکەی و نهێنی خۆشت بپارێزی.

**بەڵێ بەڕێزان:** هیجرەت بەم شێوەیە هەمووی بە پلان و نەخشەی ورد جێ بەجێ کراو دوور بوو لە جوڵانی عاتیفەو سۆزو کتوپڕ بڕیاردان و حیساب بۆ دوژمن نەکردن لە هەمان کاتدا هەموو پشت و پەنایەکیش نەنها خوای گەورە بوو.

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) یە قینی هەبوو کە هەرچەندە هەموو ڕێگایەکی خۆپاراستنی بەکارهێناوە بەڵام ئەگەر خوا نەت پارێزێ و کارت بۆ ئاسان نەکات ، هیچت بۆ ناکرێ و نا پارێزرێ ی کە بەداخەوە ئەمڕۆ زۆر لە موسڵمانان ئەم دەرس و وانە گەورەیەی هیجرەمان لە یاد کردوەو بە سۆزو عاطیفە بڕیار دەدەین و هەنگاو هەڵدەگرین و هیچ خۆ ئامادەکاری و ئەسبابی پێویستمان بە دەست نەهێناوەو سەرەنجام تووشی شکست دەبین. وە بەنەزانی وادەزانین کە مادام موسڵمانین ئیتر پیویستیمان بە گرتنەبەری ڕێ وشوێنی زانستی وکاری بە نەخشە نیە، بەڵام ئەوەتا پێغەمبەری پێشەوامان کە دین دەبێ لەو وەرگیرێ چۆن کارەکانی بە نەخشەو خۆپاریزی پشت بەستن بە خوای گەورە ئەنجام داوە.

**خاڵێکی تر:** لەو هۆیانەی کەبوە هۆی هەڵبژاردنی هیجرەت بۆ سەری ساڵی کۆچی ئەوەیە:کە هەموو بۆنەو یادەگەورەکانی ناو مێژوووی سەرەتایی ئیسلام وەکو غەزای بەدرو خەیبەرو فەتحی مەککە و دروست کردنی دەوڵەت و نووسینەوەوی دەستوور و برایەتی مهاجرین و ئەنصار و کردنەوەی مزگەوت، هەمووی بەرهەمی هیجرەتە. ئەگەر هیجرەت نەبوایە ئەمانە هیچی نەدەبوون. کەواتە: دروست بوونی ئەم ئوومەتە ، دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هیجرەتە.

**خاڵێکی تر: هیجرەت خاڵی وەرچەرخان و گۆڕان بوو:**

بە هیجرەت قورئانی مەککی و مەدەنی دروست بوو. لە دوای هیجرەتەوە دەربڕینی قورئانی لە﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾ەوە بوو بە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ ئایەتەکانی عەقیدەو پەروەردە لە دوای هیجرەت بوون بە ئایەتی ئەحکام و حوکم وجیهاد.

هیجرەت دیاری کرد کێ خراپەکار و شەڕخوازو ئیرهابییە وکێش ئاشتی خوازو ئەمانەت پارێز. کافرەکانی قورەیش و دوژمنانی ئیسلام بوون کە پیلانی دەربەدەرکردن و بەندکردن و تیرۆرکردنی پێغەمبەری خوایان داڕشت. کە قورئانی پیرۆز تۆماری دەکات و دەفەرمێ:﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الأنفال: ٣٠

لە (دار الندوە) دا بڕیاریاندبە (١٠) گەنجی بەتوانا بەیەك جار پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکوژن. دوای ئەمەش کە زانیان دەرچوە لە مەککە و پیلانەکەیان فەشەلی هێناوە. سەد حوشتریان کرد بە دیاری و خەڵات بۆ هەرکەسێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکوژێت.

بەڵام پێغەمبەری ئاشتی خواز و هەڵگری پەیامی ڕێزی مرۆڤ. عەلی ئامۆزای ڕادەسپێرێ کە لەدوای خۆی لە مەککە بمێنێتەوەو هەموو ئەو پارەو سامانەی کە ئەو قوریشانەی دوژمنایەتی دەکەن و کافرن بە دینەکەی. کە سیقەیان بە کوڕ و برای خۆیان نەبوەکە پارەو سامانیان لای دابنێنن. هاتون لای محمدی ئەمینی دەست پاك دایاننناوە.

نا فەرموێ: با لە جیاتی موڵك و خانوو سامانی بەجێ ماومان لە مەككە پارەكانیان ببەین.

**بەڵكو دەفەرمێ:** ئەی عەلی هەموو ئەو ئەمانەتانە یەك بە یەك بدەوە بە خاوەنەكانیان. بەڵێ هیجرەت گۆڕانكاری دروست كرد (یەثریب) ی كرد بە (مەدینە). ئای چ ناوێكی خۆشە مەدینە. واتە: شارنشینی و مەدەنیەت هی ئیسلامە. مەدینە لەو سەردەمەدا شارێكی زۆر گەورە بوو، بە تەواوی مانا شاربوە (كیباری صەحابە ، صیغاری صەحابە ، قسە خۆش ، سروودبێژ ، شاعیر ، پزیشك ، باخەوان، جووتیار ، كرێكار ، ئاسنگەر ، ئاشەوان ، زەرەنگەر ، نوێژنەكەر ، عەرەق خۆر)ی تێدا ژیاوە.

**لە رووی بیروباوەڕ:** (موسڵمان، جوولەكە، موشریك، مونافیق) هەمووی تێدابووە. بەڵام لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی مەدینەدا بووە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەركردایەتی كردوە. كەواتە: شاری موسڵمان تەواوی ئازادی تێدایە بۆ هەموو كەس و هەموو چین و توێژو بیرو باوەڕێك.

سوپاس بۆ خوای گەورە ئەمڕۆ لە كوردستانی ئازیزو ئاوەدان و ئازاد ، شارو شارۆچكەكان مەدینەیەكی بچوكن. هەمووی منارەی بەرزی مزگەوت و صەدای اللّه أكبر و گەنج و ڕیش سپی راكیع و ساجید و ئافرەتی داپۆشراوو دەم بە زیكر و بازرگانی دەست پاك و پۆلیس و ئاسایشی دڵسۆزو قەدرو حورمەت و برایەتی و بەیەكەوە ژیانی تێدایە. بەداخەوە زۆر لە ڕاگەیاندنەكان هەر خەڵكە خراپ و بێ دینەكە و عەرەق خۆرەكە نیشان دەدات و وا دەردەخات كەس پابەند نیە بە ئیسلام و مزگەوت ئادابی دینەوە!!

**خاڵێكی تر:** هەموو كۆچكردن و بە جێ هێشتنی نیشتمان و زێدی لە دایك بونێك دڵ نارەحەتی و بەشێك لە نائومێد بوونی تێدایە. بەڵام هیجرەتی پێغەمبەر (ﷺ) پڕی بوو لە گەشبینی. **ئەوەتا:** عەلی لە جێگای خۆی دەخەوێنێ بۆ ئەوەی بەیانی ئەمانەتەكان بداتەوە بە خاوەنەكانیان. خۆ بێگوان پێغەمبەری خوا (ﷺ)

عەلی بە کوشت نادات و نایکات بە قوربانی ڕزگار بـونی خـۆی. بـەڵکو بەوپـەڕی متمانە بە پارێزگاری خوا بۆ عەلی بەجێ ی دەهێڵێ.

وە هەروەها کـاتێ کـە سـەرانی کـوفری مەککـە گەیشـتبوونە سەرئەشـکەوتەکە حەزرەتی أبوبکر دەیفەرموو: ﴿لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا﴾ التوبة: ٤٠

نەك هەرمەترسە، بـەڵکو هـەر غـەمباریش مەبـە، عادەتـەن مرۆڤـ لەسـەفەری ئاسایشدا بێ تاقەت دەبێ ، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو یەقینە پتـەوەوە بـە پشت بەستن بە خوا، زۆر بە دڵنیایی یەوە لە ئەشکەوتەکەدا پاڵی دابۆوە.

وە هەروەها دواتر کەسوراقە بەشمشێری ڕووتەوە شوێنیان کەوتبوو ، تەماحی سـەد ووشترەکە چاوی تاریك کردبوو، ویژدانی مراندبوو کە چـۆن لەبـەر سـامان و مـاڵی دونیا دەستی بچێتە خوێنی پاکترین مرۆڤی سەرزەوی ، بیەوێت ئەو نورو ڕووناکی یە بکوژێنێتەوە هەموو دنیاو گەردوون لە تاریکی دا بژین ،بۆ ئەوەی سـەرمایەکی دەست بکەوێ. کە بەداخەوە ئەمڕۆ لە سەدەی بیست و یەکدا ، ئەم فکـرە بۆگەنـە بە نێو دەوڵەتی دەکرێ و دەبینین بە هەزاران مـاڵ تاریـك دەکـرێ ومنـاڵ هـەتیوو دەخرێ وژن و بێ هاوسەر دەکـرێ لـە پێنـاوی بـە دەسـت هێنـانی دۆلارو پـول و پارەیەکی پیس و بۆگەن دا.

بەڵێ لەو کاتەدا کـە سـوراقە ئەسپەکەی تـاودابوو تـا بـەزووترین کـات دەسـتی بیانگاتێ و خەڵاتەکە مسۆگەر بکات و لە سەر خوێنی دوو کەسی بێ تاوان و پـاك ببێتە سەرمایەداریکی گـەورە. لـەو کاتـەدا حـەزرەتی أبـوبکر فـەرمووی: ئـەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە سوراقەیە و والێمان نزیـك بۆتـەوە. فـەرمووی: ئـەی ئەبوبەکر هـیچ مەترسـەو تەنانـەت پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هـەر ئاوڕیشـی لێ نەدایەوە و بەردەوام بوو لەسەر قورئان خوێندنەکەی. ئەوەبوو سوراقە وەختێکی بـە خۆی زانی کە ئەسپەکەی لەسەر پشتی فڕێ ی دایە خوارەوە و خـەریك بـوو ملـی

بشکێ: پاشان سوراقه داوای ئەمانی کردو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمانی دایەو فەرموشی: ئەی سوراقه ، ئێستاکه تۆ ئێمه بەبێهێز دەزانی وتەنها و تەنها پەرستنی خوایی ئێمەی له دەستی تۆ ڕزگار کرد، ئەوەش بزانه هەر ئەو خوایە ڕۆژێك ئەم دینەی خۆی واسەر دەخات کە بەچاوی خۆت دەیبینی وا بازنەکانی کیسرای فارس له دەستی تۆدایه !! بازنەکانی کیسرای فارس !!! که لەو زەمانەدا یەکێ له گەورەترین و بەهێزترین دەسەڵاتداری سەرزەوی بووه ، ئەوەبوو له خەلافەتی حەزرەتی عومەری کوڕی خطاب دا کە وولاتی فارس فەتح کرا، بازنەکانی کیسرا کەوتە دەستی موسڵمانەکان و که هێنایان بۆ مەدینه حەزرەتی عومەر لەبەر چاوی هەموو هاوەڵان و خەڵکی مەدینەدا بانگی سوراقەی کردو بازنەکانی کردە دەستی یەوە و بەڵێنەکەی ئەو پێغەمبەرە ڕاستگۆیەی کە ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ۝ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ﴾ النجم: (٣-٤) ، هاتەدی.کە ئەمەش یەکێکه له هەزاران بەڵگەی پێغەمبەریەتی حەزرەتی محمد (ﷺ) که ئەم هەموو دڵنیابوون و پێشبینی یه و وەعدە پێدانێکی ئاوابە سوراقە لەو کاتەدا، تەنها بەرهەمی ئیمان بە پەیامی پێغەمبەرایەتیە و نه بەپارە ، نه بەپلەو پایەو مەسئولیەت دەست نەکەوێ. ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ﴾ الطلاق: ٣

**ئیمانداران:** هیجرەت و کۆچکردن ورۆیشتن له شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی ترو ڕەویەکی تر، دیاردەیەکی گەردوونیه، ئەم کۆچ کردنەش نەك هەر مرۆڤەکان ، بەڵکو باڵندەکانیش له گەرمه سێرەوە کۆچ دەکەن بۆ شوێنە ساردو کوێستانەکان، وە بەپێچەوانەشەوە.

وەهەروەها تۆخمەکانی ئەم کەونه ، ئەم ئەرزو ئاسمانه هەموی له جوڵەو کۆچ دان: ﴿كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ الأنبياء: ٣٣. وە بەدرێژایی مێژوو مرۆڤەکانیش کۆچیان هەبووە، پێغەمبەران کۆچیان کردووەو بەرهەمی کۆچکردنەکەشیان بۆتە ڕەحمەت و

بەرەکەت بۆ دەورو بەریان حەزرەتی ئیبراهیم چەند جار کۆچی کردوە، لـە بابـل بـۆ ووڵاتی شام. پاشان بۆ فەلەسطین ، دواتر بۆ حیجـاز ، کۆچـی کـردو نیشـتیمانی خۆی بەجێهێشت لە دەست زوڵـم و سـتەمی نەمرودکـە خـۆی و دارو دەسـتەکەی پیلانیان دادەنا بۆ کوشتن و وسوتاندنی لە ئاگردا﴿ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ﴾ العنكبوت: ٢٤.

**حـــەزرەتی ئیـــبراهیمیش فـــەرمووی:** ﴿إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّيٓ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ العنكبوت: ٢٦. وە پاشان إبراهيم کۆچی کرد لە دەست فیرعەونی ئەوکاتەی میصـر کە هەوڵی دەدا ، دەست بەسەر سارا خاتونی خێزانی حەزرەتی ئیبراهیم دا بگرێ و خوای گەورە هەروەکو چۆن لە ئاگری نەمرود إبراهيمی پاراست سارا خێزانیشی لـە چاوی پیسی فیرعەونی میصر پاراست. بەڵێ بەرهەمی هەموو ئەم کۆچکردانە بـوو بە مایەی خێرو بەرەکەت بۆ ئەوشوێنە ووشك و بێ ئاوە. (بِـوادِ غَيْـرِ ذي زَرْعٍ) کەوای لێهات لە کۆن و ئێستادا بۆتە ئاوەدانترین شوێنی سـەرزەوی و هـیچ دامـو دەزگایەك نیـە لـە جیهانـدا ئەوەنـدی مرۆڤـ بـە دەورەوە بێـت ئـەوەتا ئـەمڕۆ گەورەترین نوسینگە لە جیهاندا (پنتاگۆن) ٥ ، کە ڕۆژانە (٢٩) هەزار کەس ئیشی تێدا دەکات و (٤٤) هەزار هێڵی تەلەفونی تێدایـە. بـەڵام دەوری کەعبـەی پـیرۆز هەموو کاتێك بە دەیان هەزار کەس و لە کاتی حەج دا بە ملیۆن خەڵکی لـێ یـە. کە هەرچی مەرام و مەبەست و تەماحی ماڵی دونیایە ئەو خەڵکـەی نەگەیاندۆتـە ئەو شوێنە تەنها گەیشتن بە ڕەزامەندی خوای گەورەو بێ شەریك نەبێ.

بەڵێ بە بەرهەمی کۆچی إبراهيم و إسماعيل و هاجەرە خاتون بـوو کـە مەککـەی ووشك و بێ کشتوکاڵ وسەرچاوەی بژێوی. لە هەموو لایەکی جیهانەوە ڕزق و ڕۆزی ڕووی تێ دەکات. بەڵێ بەرهەمی کۆچی إبراهيم بوو کە کەعبە بنیات نرایەوەو بوو بە قیبلەی بڕواداران و هەرکەس ڕوبکاتە ئەو کەعبەیە، هـەتا مـاوە پێویسـتی بـە ڕووگەو قیبلەیەکی تر نیەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ناکات و ناڵێ ئەمڕۆ ئەمـە باشـەو

جي بەكەڵك نايەت. موسڵمان يەك قيبلەی هەيە هەيەو كە لە قەبريشدا لێی دەپرسن ڕووگەت كوێ يە؟! دەڵێ: (والكَعْبَةُ قِبْلَتِي). هەروەها حەزرەتی موساش كۆچی كردوە لە ميصرەوە بۆ مەدييەن.
لە دەست زوڵم و ستەم و پيلانی ژەهراوی و كوشندەی فيرعەون و دەستەكەی.(سُبحانَ الله) مێژووی پێغەمبەران هەمووی وەكو يەكە.
بۆ ئيبراهيم پيلانی كوشتن و سوتاندنی بۆ دارێژرابوو. پێغەمبەری خۆشمان حەزرەتی محمد (ﷺ) لە دار الندوه دا پيلانی دور خستنەوەو بەندكردن و كوشتنی دارێژرابوو!!
كە قورئان بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلۡمَلَأَ يَأۡتَمِرُونَ بِكَ لِيَقۡتُلُوكَ فَٱخۡرُجۡ إِنِّي لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ۝٢٠ فَخَرَجَ مِنۡهَا خَآئِفٗا يَتَرَقَّبُۖ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ القصص: ٢٠-٢١. كە بەرهەمی ئەم كۆچ و هيجرەتەی حەزرەتی موسا ڕزگاربوونی بەنی ئيسرائيليەكان بوو لە دەست زوڵم و ستەمی فيرعەون و لەناوچونی حوكمی ديكتاتۆری بوو.
حەزرەتی سولەيمان بە هۆی (با) وە كە تەختەكەی بەرزكردۆتەوەو وەكو فڕۆكەی سەردەمە سەفەری بۆ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای سەر زەوی كردوەو مرۆڤەكان و جنۆكەكان و زيندەوەرانی بەسەر كردۆتەوەو بۆتە ڕەمزی دەوڵەمەندی دەسەڵاتدارو دادپەروەرو دڵسۆز و خەمخۆر.
هەروەها هەر لە پێغەمبەران (حەزرەتی يونس) هيجرەتی كردوە بۆ قوڵايی دەريا ، بۆ عماق. وە يەكەم غەواصی بەحری بوە لە مێژوودا. وە پێغەمبەری ئيسلاميش حەزرەتی محمد چوو بۆ ئافاق لە ئيسراو معراج دا. وە لە چاكان و پاكانيش كە هيجرەتيان كردوەو بەسەر زەوی دا گەڕاون. (ذو القرنين) بوە، كە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەوی گەڕاوە، وەگەلانی نەزان و دواكەوتوی فێری ژيان و شارستانيەت كردوەو گەلانی چەوساوەی لە دەست زوڵمی (يەئجوج و مەئجوج) ڕزگار كردوە،

یەکەم کەس بوە کە سەدی لە مس و قورقوشمی تواوە دروست کردوە کە تا نزیکی هاتنی قیامەت (یأجوج و مأجوج) ناتوانن کونی بکەن و سەر زەوی وێران بکەن.
**کەواتە:** بەرهەمی ئەم هیجرەتەی (ذو القرنین) هەموو مرۆڤایەتی لە شەڕو خراپەو دەستی وێرانکاری یأجوج و مأجوج پاراستوە. هەروەکو خوای گەورە لە سورەتی (الکهف) دا بە درێژی بۆی باس کردوین.
وە هەروەها زانایان و مێژوو نووسانی ئیسلام چەندین کۆچیان کردوەو بە وولاتاندا گەڕاون بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی زانست. زانایانی زانستی حەدیس وەکو پێشەوا: بوخاری ومسلم و زانایانی فیقهو شەرع وەکو پێشەوا: شافیعی و گەورە زانایانی تر، کە هەموو ئومەتی ئیسلامی قەرزاری جوهدو هەوڵ و تێکۆشانیانە.
لە بەرامبەریشدا ، خوانەناسان و کافران کۆچیان کردوە وولاتی خۆیان بەجێ هێشتووەو ڕویان کردۆتە وولاتان ، بەڵام ئایا بۆ خێرو خۆشی گەلان بوە؟! نەخێر. بەڵکو بۆ کاولکاری بوە. ئەوەتا جەنگیزخان و هۆلاکۆ و تەتەر و مەغۆل کە هەموو سەر زەویان شێواندو تەنها لە شاری بەغداد دا زیاتر لە دووملیۆن کەسی موسڵمانیان شەهیدکردو ئەوەندەیان کتێب و دەست نووسی زانستی زانایانی موسڵمانیان خستە ناو دیجلەوە کە ئاوەکەی بۆ ماوەیەك بوو بە مەرەکەب و قەبارەیان لە ئاوەکەدا بەرز بۆوەو وەکو پرد خەڵك بەسەریاندا دەپەڕینەوە.
وە لە مێژووی نوێشدا بەریتانی و فەرەنسی و پورتوگالی و ئیسپانی یەکان بەسەر زەویدا گەڕاون و وڵاتانی موسڵمانیان داگیرکردوەو هەرچی بەرهەمی وولاتەکانیانە بردیانن و تائێستاش شوێنەواری داگیرکردنیان پێوە دیارە و بونە جیهانی سێ یەم.
بەڵام هیجرەتی پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) لە مەککەوە بۆ مەدینە، هەمووی خێرو بەرەکەت بوو. هەمووی گەورەکردن و وەفاداری بوو. **سەرنج بدەن:**
١- هیجرەت أبوبکری کرد بە یاری غارو ﴿ثَانِيَ اثْنَيْنِ﴾ التوبة: ٤٠.

ئەو شەرەفە گەرەی پێ بڕا. عەلی بوو بەڕەمزی لە خۆبردوویی و ئازایەتی و گوێڕایەڵی.

٢- ئەسماء کردە بەر پرسی یەکەم و هەڵگری هەموو نهێنی یەکان و نازناوی (ذات النطاقین) ی پێدرا.

٣- عامیری کوڕی فەهیرە کە شوانێکی بێ ناونیشان بوو ، بوو بە ئەستێرەیەکی پرشنگداری ناومێژوو، لە هەزاران کتێب و ژیاننامەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ناوی باس دەکرێ !! کە ئەگەر بەشداربوونی لەم هیجرەتەدا نەبوایە هەرگیز ئەو ناوەی بە نەمری نەدەمایەوە.

٤- عبداللەی کوڕی أبوبکر بوو بە یەکەمین ئەفسەری ئاسایش و بواری هەواڵگری لە مێژووی ئیسلامدا و ئەو گەورەییەی دەست کەوت.

٥- عبداللەی کوڕی ئوڕەیقیط، کە دوایی موسڵمان بوو. تاکە کافرە لە مێژوودا کە هەنگاوەکانی زەمانی کافر بوونیشی — دوای هاتن و ناسینی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە شکۆ و پاڵەوانیەتی و مەردایەتی بنوسرێتەوە. چونکە لە خزمەت پێغەمبەری خودابوو وە بەرێگای ئەمین و سەلامەتدا گەیاندیە مەدینە.

٦- هیجرەت بوو کە سوراقەی ڕزگار کرد لە تەماحبازی و مادە پەرستی. کە ئەوەندەی حەز لە دەوڵەمەندبوون بوو، ئامادەبووو خوێنی ئەشرەفی مەخلوقات برێژێ ـە پێناوی سەد حوشتردا، کە چی هەر پێغەمبەری خودا نزیك بۆوە دڵنیایی وەرگرت و دیفاعی لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەکردو ئامادەیی خۆی دەربڕی کە هەرچی لاشیەتی لە ولاخی سواری و خۆراك و شمشێرەکەی و پارەی گیرفانیشی بیبەخشێ بە پێغەمبەری خودا (ﷺ)

واتە: سەدوو هەشتا پلە گۆڕا و بوو بەمرۆڤێکی نوێ. کە بەڕاستی لە هەموو زەمان و زەمینێکدا ئەوەی کە مرۆڤ ڕزگار دەکات لە تەماح بازی ناڕەواو خۆدەوڵەمەند کردن لەسەر حسابی خوێنی خەڵك بریتی یە لە پابەندبوون بە ئیسلام و خۆخستنە پەنای پێغەمبەری خودا (ﷺ) کە ئەگەر گوێ بۆ فەرموودەکانی بگری و بەقسەی بکەی وەکو ئەوە وایە کە لە خزمەتیدابی.

٧- لەسەفەری هیجرەتدا پێغەمبەری خودا (ﷺ) لای دایە ماڵێکی مەڕدار کە لە سیرەدا بەماڵی (أم معبد الخزاعیة) ناسراوە. کە ئافرەتێکی زۆر خانەدان و میوان دۆست بوو. بەڵام تەقدیری خوا وابوو کە لەو کاتەدا مەڕەکانیان هەمووی لە دەشت بون و هاوسەرەکەشی لە ماڵ نەبوو.تەنها مەڕێکی پیر نەبێ کە لەبەر بێ توانایی و پیری لەماڵوە مابۆوەو گوانەکانی چرچ ببون و زۆر دەمێك بوو شیری تێدا نەمابوو. ئەم ئافرەتە بەڕێزە هەرچەندە کە پێغەمبەری خوای نەناسی، بەڵام زۆر ڕێزی لێ گرتن و زۆر خەمی بوو کە هیچی نیە بیانداتێ بیخۆن و ئاژەڵەکانیان لە ماڵ نیە. پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ڕێگا دەدەن ئەو مەڕە ووشکە بدۆشم؟!! أم معبد ووتی: بەڵام ئاخر خۆ ئەوە زۆر دەمێکە ووشکە و گوانەکانی ووشك بوونەتەوە!! پێغەمبەری خودا (ﷺ) داوای کرد کە مەنجەڵێکی زۆر گەورەی بۆ بێنن. ئەوە بوو چوە لای مەڕەکەوەو بسم الله ی کردو دەستی مویارەکی برد بۆ گوانەکانی، سبحان الله خەریك بوو لە شیردا دەتەقین ئەوەندەی شیر لێ دۆشی تا ئەو مەنجەڵە گەورەی پڕکرد لە شیرو کەفی شیرەکە لەسەر لێواری مەنجەڵەکەوە دەڕژا !! ئیتر هەموویان لێیان خواردەوەو هێشتا شیری تێدا مابوو. ئەم مەڕە کە ئەو دەستە پڕ بەرەکەتەی پێغەمبەری خودای بەرکەوتوە، بەردەوام گوانی پڕبووە لە شیرو تا ساڵی (الرمادە)ش ئەو مەڕە هەرمابوو. وە تاکە مەڕبوو کە لە گرانی و ووشکە ساڵی و بێ لەوەڕیەدا شیری تێدابوو !!

بەڵێ ئەمە پێغەمبەری خوایەو ڕوو بکاتە هەر ماڵێك ، هەر ولاتێك بەرەکەتی خوای بەسەردا دەڕژێ. دەی موسڵمانی بەڕێز ، ئەگەر دەتەوێ ئاوا ماڵت پڕ بەرەکەت بێ، وەرە پێشوازی لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بکە — مەڵێ خۆ بەلاشەی پیرۆزی لە ناوماندا نی یە. ئیتر چۆن تەشریفی بێتە ماڵم؟! نەخێر زۆر ئاسانە، وەرە سونەتەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە ماڵەکەتدا زیندوو بکەوە، کچ و کوڕەکانت لەسەر ڕێبازی ئەو پەروەردە بکە ، ژیانی هاوسەرو خێزانیت بەپێ ی فەرموودەکانی ئەو بەڕێوە ببە، لە کارو کەسابەت و بواری داراییت دا بەبێ پرسی شەرع هەنگاو مەنێ و بڕیار مەدە.

ئیتر ئەوە بزانەو یەقینت ببێ کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دێتە ناومالّت و وەکو مالّی (أم معبد) بەرەکەت دەکەوێتە ڕزق و ڕۆزیتەوە، بەرەکەت دەکەوێتە ژیان و ژینتەوە ، بەرەکەت دەکەوێتە دلّ و دەرون و مێشك و ناختەوە ، لە خەم و پەژارە بەدوور دەبی، ناوت بەرزو بلّند دەبێ ، چونکە هەر کەسێ ڕۆژێ لە ڕۆژان لە خزمەت ئەو پێغەمبەرو پەیامی ئەو سەروەرەی ئالارەدا بوبێ، هەموو کات ناوی هەر بەنەمری ماوەتەوەو هەر بەرزو بلّند و بێژراوە .. ولله الحمد

٨- کە گەیشتە مەدینە، سەرتاپا ڕەحمەت بەسەر ئەو شارەدا باری. بەم شێوەیە:

١- ناوەکەی (یە ثرب) ە وە گۆڕی بۆ (مەدینە) ، ئای چەند ناوێکی خۆشەو زمانی مرۆڤ بە ناو هێنانی مەدینە لەزەت و تام وەردەگرێ.

٢- مەدینە پێش ئەوەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) هیجرەتی بۆ بکات. شوێنێکی ناسازو پڕ لە زەرەرو تاو نەخۆشی بوو. کەچی بە دوعای پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەو ئاو و هەوا ناسازەی لێ چوە دەرەوەو بوو بو (طیبة) و (طابة) شارە بۆن خۆش و دلّگیرو ئاو و هەوا سازگارەکە.

٣- شەڕی چەند سالّەی نێوان ئەوس و خەزرەج بەم هیجرەتە رسول الله بۆ ناویان کۆتایی پێ هات و بوون بە برای گیانی بە گیانی. خۆ ئەگەر پێغەمبەری خودا (ﷺ) — تەنها زەعیمێکی سیاسی و سەرکردەیەکی سەربازی بوایە ئاگری ناکۆکی و شەڕی نێوانیانی زیاتر خۆش دەکرد. چونکە زیاتر جێ پێ ی خۆی قایم دەکرد!

٤- بە گەیشتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بۆ مەدینە، دوو منالّی بێ باوکی ، بێ کەسی بەرزکردەوەو لەناو ئەو هەموو شوێنە خۆش و نزیك باخەدا،زەوی ئەو دوو منالّە بێ باوکەی کڕی و کردیە مزگەوت. کە ئەو دوو منالّە هەتیوە کە باوکیان وەفاتی کردبوو زۆر پێویستیان بە پارەکە هەبوو، وەلێ ی سوود مەندبوون، وە پێشتر هیچ کەس ئەو زەوییانەی نەویستبوو وە بەرهەمیان لێ هەلّنەگرتبوو، وە ناویشیان چوە ناو ژیاننامەی پێغەمبەری خواوە (ﷺ).

٥- ئەبو ئەیوبی ئەنصاری کە پیاوێکی هەژار و نەداربوو، لە خانوویەکی دوو نهۆمی زۆر سادەدا دەژیا ، شەرەفدار بوو بەوەی بوو بە خانەخۆێ ی پێغەمبەری خودا (ﷺ).

٦- پێغەمبەری خودا (ﷺ) وەکو تەواوی ژیانی کەوەفادار بوو بۆ هەرکەسێ کە رۆژێك چاکەیەکی لەگەڵ کردبێ، ئەوپەڕی وەفاداریشی نواند بەرامبەر خەڵکی مەدینە و هەرگیز پێشوازی گەرمیان و بەخشینی ماڵ و سامان و باخ و زەوی و خانووی ماڵیان بە برا کۆچکەرەکانیان، لەبەر چاوی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لانەدەچوو، بۆیە بە مەدینەییەکانی دەفەرموو : ((**لَوْلَا الْهِجْرَةُ لَكُنْتُ أمرءا مـن الْأَنْصَارِ وَلَوْ سَلَكَ الناس وَادِيًا وَشِعْبًا لَسَلَكْتُ وَادِيَ الْأَنْصَارِ وَشِعْبَهَا**)). رَوَاهُ البُخارِي وَمُسْلِم.

واتە: ئەگەر بەهۆی هیجرەتەوە نەبوایە کە منیش لە مەککەوە کۆچم کردوە بۆ مەدینە ، ئەوا خۆم بە یەکێك لە ئەنصار – مەدینەیی – دەزانی، وە ئەگەر خەڵکی هەموو بە شیوو دۆڵێکدا بڕۆن ، من بەو شیوو دۆڵەدا دەڕۆم ئەو ڕێگایە دەگرمە بەر کە ئەنصارەکان – مەدینەییەکان پێیدا دەڕۆن.

لە فەتحی مەککەدا ، کە دوای (دە) ساڵ دووری لە زێدی لە دایك بوون و کەعبەی پیرۆز بە دڵی خۆش و سەری بەرزەوە چوەوە ناو مەککەی موککەڕەمەوەو کە عبەی لەبت و بت پەرستان پاك کردەوەو دەستەدەستە خەڵکی دەهاتن و موسڵمان بونی خۆیان ڕادەگەیاند ، لەم کاتەدا پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕوی کردە مەدینەییەکاز و فەرمووی: وائەزانم لە ناو خۆتاندا سەربەسەری یەکەوە بنێن و بڵێن: تازە پێغەمبەری خودا (ﷺ) چۆتەوە شوێنی لە دایك بوونی خۆی و دەورەی کەعبەی قیبلەی هەموو ئیمانداران و ئیتر جارێکی تر نایەتەوە بۆ ناومان بۆ مەدینە؟ ووتیان: بەڵێ دڵمان وای پێ دەوتێن!

پێغەمبەری (ﷺ) فەرمووی: ((كَلَّا إِنِّي عبد اللَّهِ وَرَسُولُهُ هَاجَرْتُ إِلى اللَّهِ وَإِلَيْكُمْ وَالْمَحْيَا مَحْيَاكُمْ وَالْمَمَاتُ مَمَاتُكُمْ)) نەخێر، من بەڕاستی بەندەی خوام و پێغەمبەری خوام. هیجرەتم کردوە بۆ لای خواو پاشان بۆ لای ئێوە هاتووم ژیانم لەگەڵ ژیانتانەو مردنم لەگەڵ مردنتانە، هەرگیز لێتان جیانابمەوەو لەگەڵتان دێمەوە بۆ مەدینە. مەدینەییەکان دەستیان کرد بەگریان و فەرمویان: (واللّٰه ما قُلْنَا الـذي قُلْنَا إلا الضِّنَّ بِاللَّهِ وَبِرَسُولِهِ) بەخوا ئەوی ووتمان ، تەنها لە خۆشویستیمان بۆ خواو پێغەمبەرەکەی ، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: ((إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُصَدِّقَانكُمْ وَيَعْذِرَانِكُمْ)) رَواهُ مُسْلِم (١٧٨٠).

واتە: بەڕاستی خواو پێغەمبەرەکەی بە ڕاستگۆتان دەزانن و عوزرتان لێ قبوڵ دەکەن.

**بەڵێ خۆشەویستان:** پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەم لوتکەی سەرکەوتندا ، ئەو وەعدو پەیمانەی هەر لەیادبوو، کە لەوپەڕی بێ هێزیدا ، لەبەیعەی عەقەبەی دووەمدا بە خەڵکی مەدینەی فەرموو (بَل الدَّمَ ، وَالهَدَم الهدم ، أنا مِنْكُمْ وَأَنْتُمْ مِنِي). خوێنم لەگەڵ خوێنتانەیە شکانم لەگەڵ شکان و شکستتانە. من لەئێوەم و ئێوەش لە منن!! بەڵێ پەیمانەکەی بردەسەرو لە مەککە نەمایەوەو گەڕایەوە بۆ مەدینەو لەوێ وەفاتی کردو پێغەمبەری خودا (ﷺ) چوە ناویەوە، بەهۆی گۆڕی پیرۆزیەوە ساڵ دوانزەی مانگ هەموو ڕۆژێ بە هەزاران کەس زیارەتی گۆڕی پیرۆزی دەکەن و سەلامی لێ دەکەن هەرکەس بچێتە مەککە و کەعبە، خۆی ناگرێ و ئیللا دەبێ بچێتە خزمەتی (رسول الله) ش لە مەدینەی پیرۆز و پرشنگدار. بەڕاستی پێغەمبەری خودا (ﷺ) یەکەمین سەرکردەو دواهەمین سەرکردەشە کە ئاوا بە بەردەوامی ، بە تامەزرۆیی و عەشق و ئەوینەوە.

خەڵكی زیارەتی دەكەن و هێشتا هەر جێگاشیان لەبەر قاپی ئەو سەردارو سالاری مەدینەدو ئەم دینە دەست ناكەوێ ، لەگەڵ ئەو هەموو زیارەت و لە خزمەت دابونەشدا ، خوای گەورە ئەوەندە ڕێزی لەو پێغەمبەرەی خۆی گرتوەكە هەرگیز گۆڕی پیرۆزی پڕ نوری نا پەرستێ و بێ شەرعیەكی لەسەر ناكرێ و دوورو پاك و خاوێنە لە هەموو جۆرە شیركێك!.

**بەڵێ ئیمانداران:** هەر بەرەكەتی هیجرەت بوو كە مەدینە بوو بەو شارە پیرۆزەی كە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەو بارەیەوە فەرمووویەتی: ((**مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَمُوتَ بِالْمَدِينَةِ فَلْيَمُتْ بِالْمَدِينَةِ فَإِنِّي أَشْفَعُ لِمَنْ مَاتَ بِهَا**)) رَواهُ ابن حبان في صحيحه.

واتە: هەركەس دەتوانێ كە لەمەدینەدا بژی تا ئەو كاتەی كە بەڵكو لە مەدینەدا بمرێ. با هەوڵ بدات و لە مەدینەدا بمرێ ، چونكە بە ڕاستی من شەفاعەت دەكەم بۆ هەر كەسێك كە لە مەدینەدا بمرێ). هەر لە بەرەكەتی هیجرەت بوو كە مزگەوتی پیرۆزی پێغەمبەری (ﷺ) لە شاری مەدینە دروست كراو پێغەمبەری خۆشویست مورژدەی داوە بەوەی كە هەر نوێژێك لە ناو مزگەوتی پێغەمەردا بكرێ ئەجرو پاداشتی (هەزار) نوێژی تری هەیە كە لە غەیری ئەوێدا بكرێ.

ئای ئەم خێرو بەرەكەتە چ خەلاتێكە و چ فەزڵێكە كە هەركەسێك دانیشتوی مەدینە بێ بە تەواوی عومری، هەموو نوێژێكی ناو مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) بە (١٠٠٠) نوێژ بۆی دەنوسرێ، واتە: مەدینەییەكان، نەك هەر چینی صەحابییەكان ، بەڵكو هەموو ڕۆڵەكانیشیان هەتا ڕۆژی قیامەت لەم بەرەكەتە بێ بەش نابن ، جا سەرنج بدەن ئەگەر كەسێك لە مەدینە بژی و ماوەی (٢٠) ساڵ نوێژی لەناو مزگەوتی پێغەمبەردا (ﷺ) كردبێ خێرو پاداشتی لە قیامەتدا بە ئەندازەی ئەو كەسەیە كە لە دەرەوەی مەدینەدا (٢٠٠٠٠) بیست هەزار ساڵ نوێژی كردبێ !!!!.

یاخود ئەگەر کەسێك لە ساڵێکدا (١٨٢٥) نوێژ دەکات.

لە مزگەوتی پێغەمبەردا (ﷺ) ، وەکو ئەوەیە کە لە ساڵێکدا ( یەك ملیۆن و هەشت سەدو بیست و پێنج هەزار) نوێژی لە غەیری ئەو مزگەوتە پیرۆزەدا کردبێ.

هەر لە بەرەکەتی هیجرەت بوو بۆ مەدینە ، کە یەکەم سروود کە بەنەمری دەمێنێتەوە ، ئەو سرووده یە کە مەدینەییەکان لە پێشوازی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) پێشکەشیان کرد:

طَلَع البَـــدْرُ عَلَينا مِنْ ثَنيـــاتِ الوَادع وَجَبَ الشُكْرُ عَلَينا ما داعـــاً لله داعٍ.

أَيُها المَبْعُوثُ فِينا جئْتَ بالأمْرِ المُطاع ....جئْتَ شَرَّفْتَ المدينةَ مَرْحَبَاً ياخَيْرَ داعٍ.

ئەوەتا ئەمرۆ دوای (١٤٣١) ساڵ دەڵێ ی ئێستا ئەو سرووده دەوترێ و بۆ یەکەمجارە گوێمان لێ دەبێ. ئەمرۆ بە دەیان هونەرمەندو دەنگ خۆش ، بە دەیان ئاوازی کۆن و نوێ و دەف و ئامێری مۆسیقیەوە ، سروودی (طَلَع البَدْرُ) دەڵێنەوەو یادی هیجرەت دەکەنەوە.

سبحان الله ، ئەم ئیسلامە و ئەو هیجرەتەی هەمووی موعجیزەیە، هیچ شتێکی نیە کۆنی بەسەر بێ ، ئەوانەی کە ئیسلام بە کۆنە پەرست دەزانن ، با چاك تێ بگەن تەنها ئیسلامە کە سروودەکانیشی دوای هەزار ساڵ زیاتر هەر زیندون و تازەن ، ئەوەتا دەڵێ ی وا ئەمڕۆیە کە لەبەر چاومان پێشوازی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکەن. بەڵام نا حەزانی ئیسلام و پێغەمبەر (ﷺ) هەر ئەوە بەشیانە کە قورئان دەفەرموێ : ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ﴾ الكوثر: ٣

ماڵ و دیوە خانی ئەبو جەهل بوو بە شوێنی سەر ئاو!! مەحوی دەفەرموێ:

هەوا خواهی ( عَليهِ الرَّحمة وَالرِضوان ) یان بۆما

ئەعادیشی (عَلَيهِ اللَّعْنَه) یە بەشیان و بەسیانە.

**بەرپێزان:** هەر لەبەرهەم و بەرەکەتی هیجرەتە کە یەکەمین ووتاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە لە مەدینە خوێندیەوە ، بە ماناترین ووتارە لە ڕووی ئەوەوە کە ووتارێکە: ئایینی یە. سیاسی یە ، کۆمەڵایەتییە، ئابووری یە، هەموو بوارەکانی تێدایە وەکورتترین ووتاریشە هەمووی دوو دێڕەو(١٥) ووشەیە، ئەوەتا فەرمووی: لە﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾، بانگی هەموو خەڵکی کرد ، نەیفەرموو: أيها المؤمنون، ئەی ئیماندران ، بەڵکو فەرمووی: ئەی خەڵکینە ، واتە ئیسلام دینێکی عالەمیە، بۆ هەموو خەڵکی جیهانە ، بە هەموو زمان و ڕەنگێکەوە بۆ هەموو زەمان و سەر زەمینێك فەرمووی:

**ئەی خەڵکینە:** (**أفشوُا السَّلامَ**) ، سەلام کردن لە ناو خۆتاندا بلاو بکەنەوە، زۆر سەلام لەیەك بکەن، ئەمە لەڕووی سیاسیەوە ئەوەی پێ ڕاگەیاندن کە ئیسلام دینی ئاشتی یەو ئیتر شەڕ تەواو بوو. سیاسەتمان بەرپاکردنی ئاشتی یە. کە ئەمەش بە کردەوە سەلمێنراوە لە مەککەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرگیز لە ئەنجامی ئەو هەموو ئەشکەنجەو ئازارەی هاوەڵاندا پەنای نەبرد بۆ تیرۆر کردنی ئەبو جەهل یان هەر سەرکردەیەکی دڵ ڕەقی ناو مەککە ، لە کاتێکدا زۆر بە ئاسانی ئەو کارە ئەنجام دەدرا، چونکە چەندین کەس کە دەهاتنە ناو مەککەوەو موسڵمان بوونی خۆیان ڕادەگەیاندو کەس نەیدەناسین کێن و کەس نەیدەزانی موسڵمان بوون، ئامادەیی خۆیان دەردەبڕی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر کارێکیان پێ بسپێرێ ئەنجامی بدەن

بەڵام پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەرگیز ڕێگای بە کوشتن و تیرۆرکردنی کەس نەدا، نەیهێشت کەس بازاڕو دوکانیان بسوتێنێ و نا ئارامی لە مەککەدا بەرپا بکات ئەگەر کەسێك بڵێ : ئاخر لەوانەیە لەترسی گیانی خۆیان بوبێ کە دوایی بزانن موسڵمانان و تۆڵەیان لێ بکەنەوە؟

**له وەڵامدا دەڵێن:** ئەی خۆ کە هیجرەتیان کرد بۆ مەدینە، هەم توانای ئەوەیان یەکجار زۆر بوو کە خەڵکی فیداکارو لە خۆبردوو بنێرنە ناو مەککەو کێیان بوێ لە ناوی بەرن و (دارُ النَدْوَة) و بازارِ و دوکانیان بسوتێنن و لە مەدینەشدا کەس ناتوانێ تۆڵەیان لێ بکاتەوە ، بەڵام هەرگیز ئەم کارە نەکراو لەناو مەدینەشدا بە کردەوە ئاشتی بەرپاکراو دەبینین هەموو جەنگەکان لە دەرەوەی شاری مەدینە کراون و هیچی لەناو مەدینە ئەنجام نەدراون ، ئەم سیاسەتی دەوڵەتی پێغەمبەرە (ﷺ) کە سیاسەتی بە رپاکردنی ئاشتی یە.

**بڕگەی دووەمی ووتارەکەی فەرمووی:** (وأَطْعِمُوا الطَّعامَ) : خواردن و خۆراك ببەخشن واتە: بنەمای ئابووری دەوڵەتەکەمان لە سەر ئەوە بنیات نراوە کە ماڵ و سامان هی هەژار دەوڵەمەندو ، ئەو کەسەی سەرمایەدارەو دەوڵەمەندە ، نابێ ئەو سەروەت و دارایی یە هەربەهی خۆی بزانێ بەڵکو ئەوە بەشی هەژارو نەداریشی پێوەیەو خوای گەورە بەئامانەت و بۆ تاقی کردنەوە لەژێر دەستی ئەودا داینـاوە و دەبێ بەشی هەژارانی لێ بدات

**پاشان بڕگەی سێ یەمی ووتارەکەی فەرموو:** (وَصِلوُا الأرْحامَ) ، سیلەی ڕەحم و خزمایەتی پتەو بکەن و مەیپچڕێنن، ئەمەش لایەنی کۆمەڵایەتی دیاری کرد ، کە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە ، ئەی خەڵکینە ئێمە هەموو خزمی یەکترین و ڕۆڵە و نەوەو وەچەی یەك دایك و باوکین کە ئادەم و حەوایە

**بڕگەی چوارەمی ووتارەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:** ( **وَصَلّوُا بالليلِ والنَّاسُ نِيام** ). بۆ شەحنی ئیمانتان شەونوێژ بکەن لەو کاتەدا کە خەڵکی خەوتون.

جاکە ئەم چوار خاڵەتان جێ بەجێ کرد، بە تەبای و ڕێزگرتنی یەك و بەدڵ و بەزمان سەلام لە یەکترکردن ، ژیان ، شارەکەتان پڕبوو لە ئاشتی و گوڵتان پێشکەش بە یەکتر دەکرد لە جیاتی گوللە بەیە کەوە بنێن، وەدەستی بەخشینتان

لە نێواندا بوو، دەوڵەمەندتان هاوکاری هەژاری دەکرد. شیرتان بە دەمی یەکتر ەوە دەکرد لە جیاتی بە شمشێر خوێنی یەك بڕێژن، وە لە ناو خۆتاندا سیلەی ڕەحم و خزمایەتیتان دەپاراست، وە شەوان هەڵدەستان و شەونوێژتان دەکرد. ئەوە پاداشتی ئەم کردەوە جوانانە: (**تَدْخُلوُا الجَنَّةَ بِسلام**). بە سەلامەتی و سەرفرازیەوە دەگەن بە بەهەشتی خوای گەورە.

**جا سەرنج بدەن ئیمانداران:** هەر گەل و میللەتێك ئەم چوار بڕگەیەی ووتارەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) جێ بەجێ کرد، ئەوە هەر لەدنیادا ژیانی دەبێت بە بەهەشت و ژیانێکی دوور لە ژان بەسەر دەبات و کەمردیش لەم بەهەشتە بچکۆلەی کاتی یەی دونیاوە دەگات بە بەهەشتی نەبڕاوەی هەتا هەتایی. خوای گەورە دنیاو قیامەتمان بەهەشت بێت. آمین

هەروەها بەڕێزان پێم باشە جارێکی تر سەیری ئەو ووتارە کورت و پوختەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەینەوە کە لە سەرەتادا بە (أفشوُا السَّلام) بە ووشەی (السلام) دەستی پێ کردو کۆتا ووشەشی (**تَدْخُلوُا الجَنَّةَ بِسلام**) کۆتای پێ هات کەواتە: دینی ئیسلام ئەوەڵ و ئاخری ئاشتی و سە لامەتیە.

وە لەم ووتارە کورت و پوخت و مانا فراوانەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوەی تێ گەیاندین کە:دینەکەمان،ئیسلامەکەمان= دنیا+ قیامەت (عیبادەت+سیاسەت ).

دەی موسڵمانان با شانازی بکەین بەو پێغەمبەرە خۆشەویست و ڕابەرە بێ وێنەمان.

**بەتەحەددآوە دەیڵێین:** چ سەرکردەیەك، چ ووتاربێژێك هەیە و دەبێ لە مێژوودا کە ئاوا دونیاو قیامەت لە (١٥) ووشەدا کۆ بکاتەوە؟!!

**کەواتە:** هەر کەسێ دەیەوێ فێری سەرکردەیی و ئیدارەو سیاسەت بێ ، فێری ووتاربێژی و قسە ڕەوانی بێ ، بابێ و بچێتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڵێ

یارسول الله علمنی ، چونکه هەرکەسێ لەلای ئەم سەرداروو سەرکردە فێر نەبێ، سەری لە جەهلەوە دەردەچێ و دەبێ بە ڕۆڵەی ئەبو جەهل، وە وەکو ئەبو جەهلەکان ڕوو ڕەشی دونیاو قیامەت دەبێت و ماڵی دونیاو قیامەتی شوێن کەوتوەکانیشی وەك خۆی وێران دەکات.

**جا خوشك و برای بەڕێز** ، پیری داناو لاوی هۆشمەند ، فەرموو ئەمڕۆ هەڵی بژێرە، لای **محمد المصطفی** وڕێبازی ئەوت دەوێ ، یان ڕێگای نەفامی و نادانی و نەزانی و تاریکی. سەربەرزی و گەشبینی و بەهیممەتی و بە ختەوەری و بەرەکەت و بەهرەت دەوێ، یان دڵتەنگی و شەڕو خوێن و بەدبەختی و دەست بە تاڵیت دەوێ؟! ئەوە مەیدانەو ئەمڕۆ دونیایەو هەردوو ڕێگاکە کراوەیە: ﴿إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴾ الإنسان: ٣،﴿فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴾ الكهف: ٢٩ ،﴿فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا ﴾ البقرة: ٢٥٦

**بەڵێ ئیمانداران:** ئەمە مێژووی ئێمەیە ، ساڵی ئێمەی موسڵمان ساڵی کۆچی یە ، کە ئەم هەموو فەزڵ و گەورەتییەی تێدایە.

**مەحوی دەفەرموێ:**

ئەگەر ئەم هیجرەتە نەبوایە ، دین ئەم شەوکەتەی کەی بوو.
کـــە هەرکەس تێ بگـــا بەم دینە نەسخی جوملە ئەدیـــانە.
بە هیجرەت دینی مهاجر خدمەتی ئەنصار
لە قوە هاتە فعل و بوو لە عالەمدا بە دەستانە.....

هەموو گەورەییەکانیش دەگەڕێنەوە بۆ پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) شاعیر فەرمویەتی:

**فَتأرِيخُنا مِنْ رَّسول الله مبدأه وَما عَداه فلا عِزٌّ وَلاشأنٌ**

ئەگەر مێژوومان زایینی و فەینیقی و عەشتاری و بابلی سۆمەری بێ، هیچ مەجدێکی تێدا نی یە، بەلاّم چونکە مێژووەکەمالن دەگەڕێتەوە بۆ سیرەی

پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ). ئەوا مێژووەکەمان هەمووی شکۆیە، هەمووی مەردایەتیە، هەمووی خۆشویستی یە، هەمووی برایەتیە، هەمووی داد پەروەری یە، هەمووی ماف پەروەری یە، هەمووی ئەو چەمکانەیە کە مرۆڤایەتی پێویستی پێ یەتی، وە گرفت و کێشەکانی ئەم سەرزەویەش تەنها بە دەرمانی ئاسمان چارەسەری بۆ دەکرێ، کە وەحی خواو قورئانەکەیەتی و ڕێبازی پێغەمبەرە هەڵبژێردراوەکەیەتی.

خوای گەورە دامەزراومان بکات لەسەر ڕێبازی ئیسلام و دنیاو قیامەتمان بەختەوەری بێ.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾

ٱللَّهُمَّ ءَامِينَ

# سەرچاوەکان

١- قورئانی پیرۆز.

٢- السيرة النبوية ، د.علي محمد محمد الصلابي ، ص,٢٢٦

٣- على خطى الحبيب ، عمرو خالد ، ص,٩٦

٤- سيرة الرَّسول ، محمود المصري ، ص,٢٠٧

٥- صَحابيات حول الرسول (ﷺ) ، محمود المصري ، ص٤٨٧.

٦- نظرة النعيم في مكارم أخلاق الرسول الكريم ، ج٨ ، ٣٥٥٢ ، ص٣٥٦٣.

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعين.

**ئیمانداران:** به پیشتیوانی خوای گەورە لەم ووتارەشدا هەر لە خزمەت کۆچکردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، و هاوەڵانی بەڕێزیدا دەبین، لەم ووتارەدا (إن شاء الله) تیشك دەخەینە سەر ئەوەی کە لە هیجرەتدا هەموو جۆرە ڕێگریەك لە لایەن کافرەکانەوە دەکرا بۆ گێڕانەوەی هاوەڵان بۆ مەککە و هەموو جۆرە فیداکاریەکیش لە لایەن کۆچکەرانەوە کرا، فەرموون هەندێ لەو شێوازی ڕێگری و فیداکاریانە ببیستن:

**یەکەم:** شێوازی جیاکردنەوەی پیاو لە خێزانەکەی و منداڵەکەی و منداڵ لە دایك و باوکەکەی. هەروەکو ئەوەی کەبەسەر هەردوو هاوەڵی بەڕێز (ئەبو سەلەمەو ئوم و سەلەمە)ی خێزانیاندا هێنا، ئەوە بوو کاتێك ئەبو سەلەمە هیجرەتی کرد کەسو کاری (ئوم سەلەمە — هیندی کچی ئەبی ئومەییە) ی خێزانی هاتنە سەر ڕێگای و گوتیان: نابێ کچەکەمان لەگەڵ خۆت ببەی ، کەسوکاری ئەبوسەلەمەش ووتیان: ئێمەش ناهێڵین منداڵەکە لای دایکی بێ ، ئەوەبوو هەردوو بنەماڵە دەستی (سەلەمە)ی ساوایان ڕادەکێشا تا لەو ناوەدا ئەو منداڵە بەسەزمانە بێ ئاگایە دەستی لە جێ چوو وە کەسوکاری ئەبوسەلەمە منداڵەکەیان بردە لای خۆیان و باوك و کەسوکاری ئوم سەلەمەش (ئوم سەلەمە) یان گرت و بردیانە ماڵی خۆیان، واتە ئوم سەلەمە، هەم لەمێردەکەی دابڕا هەم تاقە منداڵەکەشیان لێ سەندەوە، بەڵام ئەبو سەلەمەی فیداکار فەرمووی: چی دەکەن بیکەن، من هەرگیز لە کۆچ کردن بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەشیمان نابمەوەو ئەوەبوو بە تەنها، بەبێ ژن و منداڵ ، بەبێ ماڵ و سامان، بە تاقی تەنها ملی ڕێگای گرت و بەرەو مەدینە بەڕێکەوت. ئوم سەلەمەش لە ژوورێکدا بە تەنها لە ماڵی باوکی دەست بەسەر بوو، بۆ ماوەی یەك ساڵ ئەم ئافرەتە بۆ مێردوو تاقە منداڵەکەی و ناو ئیمانداران

دەگریا و لێیان دەپاڕایەوە کە ڕێگای بدەن کۆچ بکات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ). ئەوەبوو دوای ساڵێك کەسوکارەکەی بەزەییان پێدا هاتەوەو ڕێگایان دا بڕوات بەرەو مەدینە ، ئەم ئافرەتە فیداکارو دڵسۆزە بۆ ئیسلام ، چوو لە ماڵی خەزووری کچەکەی وەرگرتەوەو دوای ساڵێك دابڕان و گریان بە تاقەکچەکەی شادبۆوەو بە سۆزی دایکانە لە باوەشی گرت و بە تاقی تەنها بەبێ وولاخی سواری ، بەبێ کەس و هاوڕێ ، ملی ڕێگای مەدینەی بەپێ گرتەبەرو و خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی و ئیسلام هەموو مەترسیەکانی بیابان و تەنهایی لا ئاسان کردبوو، بەڵێ نێوانی مەککەو مەدینە لە (٤٠٠) کیلۆمەتر زیاترە!!! ئوم سەلەمەی دڵ پڕ لە ئیمان ڕێگای گرتەبەر ، لە دەرەوەی مەککە تووشی بوو بە (عوسمانی کوڕی طه لحه) وە ، کە ئەو کاتە کافربوو.

بەڵام کە زانی ئەم ئافرەتە ئاوا دڵسۆزانە و لێبڕاوانە شوێن بیرو باوەڕەکەی کەوتووە و کەس ئامادەنەبوە بیگەیەنێتە مەدینە، هەست و سۆزی جۆڵاو بەزەیی پێداهاتەوە وبە حوشترەکەی گەیاندیە مەدینە، ئوم سەلەمە باسی پیاوەتی و مەردایەتی عوسمانی کوڕی طه لحه دەکات کە چەند مەردبووە و هەرگیز ئاوڕیشی بۆ نەداوەتەوە و لە وەختی پشوودا حوشترەکەی بۆ خستوەو خۆی زۆر دوور کەوتۆتەوە تا ئەم شەرم نەکات و پشووی خۆی بدات.

ئەم عوسمانی کوڕی طه لحه یە کلیلی کەعبەی پێبوو ، لە مەککەدا ، ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر تەکلیفی لێ کرد کە کلیلی کەعبەی بداتێ و دەرگای کەعبەی بۆ بکاتەوە بۆ ئەوەی نوێژی تێدا بکات ، بەڵام عوسمانی کوڕی طه لحه ووتی: هەرگیز دەگات بۆ ناکەمەوە و ناهێڵم نوێژی تێدا بکەی!!

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەی عوسمان دنیا هەر ڕۆژەی لە دەست کەسێکدایە، ئەی ئەگەر ڕۆژێك من دەسەڵاتم پەیدا کردوو ، تۆ بەبێ دەسەڵاتی

کەوتیتە دەستم و کلیلەکەم لێ سەندی ئەوکات دەڵێ ی چی؟ عثمان ووتی: ئەگەر ئەو ڕۆژە هات ئەوە مردن بۆ من باشترە!! بەڵام ڕۆژگار هات و ڕۆیشت و فەتحی مەککە کراو پێغەمبەری خوا(ﷺ) کلیلەکەی لە دەست عثمان وەرگرت و عوسمانیش زۆر دەترساو ئەو قسەیەی ئەو کاتەی هەر لەبیر بوو ، بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ)کە دەرگای کەعبەی کردەوە و بتەکانی ناوی فڕێ داو پاکی کردەوە، بانگی عوسمانی کوڕی طه لحه ی کردوو، کلیلەکەی دایەوەو فەرمووی: ئەی عثمان: (يَوْمُ بِرٍّ وَ وَفاءٍ).

ئەمڕۆ ڕۆژی چاکەو وەفاداری یە. ئەو مەردایەتییەی کە لەگەڵ (ئوم و سەلەمە) دا کردت بەزایە نەچووەو ئەمڕۆ بەوە پاداشت دەدەینەوە کە لە ڕابوردووت دەبورین و کلیلەکانی کەعبەش هەر لای خۆت دەبێ و دوای خۆشت لای نەوەکانت دەبێ و هیچ کەس بۆی نی یە ئەو کلیلەتان لێ وەربگرێ، (سُبحانَ اللّٰه) تا ئەمڕۆش کلیلەکانی کەعبە هەر لەلای نەوەکانی عوسمانی کوڕی **طه لحه** یە و هیچ پاشاو سەرکردەیەك ناتوانێ لێیان بسەنێت.

**کەواتە:** دەبێ کافریش چاکەو مەردایەتییەك کە لەگەڵ موسڵمانان کردویەتی لەبەر چاو بگیرێ و ڕێز لە هەڵوێستەکەی بگیرێ و پاداشت بکرێ.

وە ئافەرین بۆ ئەو کەسەش کە لەکاتی دەسەڵاتدا پیاوەتی و چاکە دەکات و دەیکاتە توێشووی ڕۆژی لێقەومانی ، چونکە هیچ دەسەڵاتێك تاسەر نیەو چاکە و خراپە هەر لەدنیادا پێش قیامەت دێتەوە ڕێگای خاوەنەکەی.

**بەڕێزان:** بە ڕاستی ئەوە ئیمانە، خێزانێك ئاوا یەك ساڵ لەیەك دابڕێن. خێزانێك کە خۆشترین کاتی ژیانیان بوو، چونکە تازە بەیەك گەیشتبوون ، تەنها یەك منداڵیان هەبوو ، کەچی لە پێناوی ئیسلامدا لە یەك دابڕان وە بەرگەشیان گرت و چۆکیان دا نەدا ،کەواتە ڕێگای ڕەزامەندی خواو گەیشتن بە بەهەشت هەمووی هەر

گوڵی بۆن خۆشی لەسەر نیە ، بەڵکو درك داڵیش دێتە ڕێگـاو خـۆڕاگری دەوێ. وە هەر لەم باس و بەسەر هاتەوە تێ دەگەین کە هەر کەسێ بۆ خوا لێ بـبڕێ، خـوای گەورە دوژمنانیشی بۆ موسەخەر دەکات ، هەروەکو عوسمـانی کـوڕی گـه لحهـی دڵنەرم کرد بۆ گەیاندنی ئوم سەلەمەو منالەکەی بۆ مەدینە.

وە ئەو وانەیەش وەردەگرین کە: هەرکەسێ کاری جوان بکات و بەزەیی بە خەڵکی داماودا بێتەوە ، ڕۆژێك دێ ئەو چاکەیە دێتەوە ڕێگای و بە بەرەکەتی ئەم چاکەیە عوسمانی کوڕی **طه لحه** هیدایەتی خـوای وەرگـرت و سـەرەنجام موسـڵمان بـوو. وە کلیلەکانی کەعبەشی دەست کەوتەوەو ئەو پلەو پایەو ڕێزەی لە دەست نەچوو.

**دووەم: أسلوب الإختطاف**: - پیلانی شاردنەوەو فڕاندن: هەروەکو یەکێ لە وانـەی کە لەگەڵ حەزرەتی عومـەری کـوڕی خطـــاب هیجرەتـی کـرد بـەرەو مەدینـە. ( عیاشی کوڕی ئەبی ڕەبیعە) بوو.

ئامۆزاو دایك برای (ئەبو جـەهل و **حاریثی** کـوڕی هیشـام) بـوو ، لـە دەری وەی مەککە کافرەکان هاتنە سەر ڕێگای و ووتیان: ئەی عیاش دایکت نەزری کردوە لـە سەر خۆی کە نەسەری بشوات، نەبچێتە بەر سێبەر ، هەتا چاوی پێت نەکەوێ.

**حەزرەتی عومەر فەرمووی:** بەقسەیان مەکـە دایکـت هـەر وەرس دەبـێ ، بـەڵام عیاش بەقسەی نەکردن و گەڕایەوە ، ئەوانیش گرتیان بەندیان کرد.

**سـێ یـەم: أســـلوب الحـــبس**: شـێوازو پیلانـی گـرتن و بەنـدکردن: کافرەکـان هەرکەسێکیان لە موسڵمانان لە ڕێگە هیجرەتدا بگرتایە لـە ژوورێکـی سـەربەتاڵدا سجنیان دەکرد بۆ ئەوەی:

١- جگە لە ئازاری بەندەکە گەرماش ئازاری بدات.

٢- تاوەکو ئەو کەسانەی پێ چاو ترس بکەن کە نیازی هیجرەتیان هەیەن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشتە مەدینە ئەمانە هەر لە سجندا بوون ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەك یەك دوعای بۆ کردن کە خوای گەورە ڕزگاریان بکات.

**چوارەم: أسلوب التجريد من المال:** شێوازو پیلانی ڕووت کردنەوە لە ماڵ و سامان، صوهەیبی ڕۆمی، کاتی خۆی هۆزەکەی دەستی بەسەردا گیرا لە لایەن ڕۆمەکانەوە کرا بە کۆیلە و دەست بەدەست فرۆشرا تا گەیشتە مەککە و (عبدالله کوڕی جدعان) کڕی و پاشان بە پارە ئازادی کردو کە نوری ئیسلام هات، صوهەیب موسڵمان بوو، پارەو سامانێکی زۆری بەیەکەوە نابوو ، وەختێ هیجرەتی کرد گرتیان و ووتیان: (أَتَيْتَنا ها هُنا صَعْلوكاً حَقِيراً ، فَكَثُرَ مالُكَ عِنْدَنا ، ثُمَّ تَنْطَلِقَ بِنَفْسِكَ وَمالِكَ ، وَاللهِ لا يَكُونُ ذالِكَ ).

واتە: تۆ کە هاتیتە ئەم شارەی مەککە ، کەسێکی بێ دەرەتانی هەژاری ، نەدار بووی ، لێرە لای ئێمە و لە شارەکەی ئێمە و لە بازاڕەکەی ئێمەدا دەوڵەمەند بووی و ماڵ و سامانێکی زۆرت بەیەکەوە نا، ئێستا دەتەوێ بە خۆت و ماڵ و سامانتەوە بڕۆی بۆ لای محمد و بەو ماڵەو پارەیەت یارمەتی محمد بدەی دژی ئێمە. هەرگیز شتی وانابێت!

**صوهەیب فەرمووی:** ئەگەر هەرچی پارەو پولێك پێمە بتان دەمێ وازم لێ دێنن؟! ووتیان: بەڵێ، فەرمووی: ئەوە هەموو پارەکانم ، پاشان ووتیان: دەبێ جل وبەرگەکانیشت دابنێ ی و تەنها جل وبەرگی ژێرەوەت لەبەردا بمێنێ. جلەکانیشی دانا ، ووتیان: پێڵاوەکانیشت دابنێ بەپێ ی پەتی بڕۆ ! ئەویشی دانێ ، پاشان ووتیان: ئەزانیین لە مەککە ماڵی ترت شاردۆتەوە، هەتا شوێنی ئەویشمان پێ نەڵێ ی ناهێڵین بڕۆی!!

**صوهەیب فەرمووی:** بەڵێ لە فلآن شوێنە هەندێ پارەی ترم هەیە و شاردومەتەوە، بڕۆن ئەویش دەربێنن و بیبەن تەنها وازم لێ بهێنن بگەم بە خۆشەویستەکەم حەزرەتی محمد (ﷺ) کافرەکان یەکسەر باوەڕیان پێ کرد کە ڕاست دەکات و ماڵەکەی لە فلآن شوێندا شاردۆتەوە چونکە موسڵمان ڕاستگۆیە و سیقەو متمانەی لای کافری بە خوێن تونیش هەیە، بۆیە ڕێگایان دا و صوهەیب بەڕێ کەوت بەرەو مەدینەی پرشنگدار بۆ بەجێهێنانی ئەو فەرزەی ئیسلام کە هیجرەتە، چونکە لەوکاتەدا هیجرەت واجب بوو.

بەم شێوەیە صوهەیب تەنها جلی ژێرەوە ، بەبێ پێڵاو ، بەبێ تاقە درهەمێك گەیشتە مەدینە، هەرکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) چاوی پێکەوت فەرمووی: (ربح صهیب، ربح صهیب) صوهەیب قازانجی کرد ، صوهەیب قازانجی کرد!! باشە صوهەیب چی قازانج کردوە ؟!! خۆ قازانج لە معامەلەو کڕین و فرۆشتندا دەکرێ ، صوهەیب ئەوەی لە منالێیەوە ، بە عەرەقەی ناوچەوانی و کۆڵی پشتی پەیدای کردبوو، هەموی لێ سەندراوە، ئیتر چی قازانج کردوە؟!! بەهەشتی بردەوە!! کە بەقەدەر گۆچانێك لە بەهەشتدا چاکترە لەگرانبەهاترە لە دونیا و هەموو ئەوەشی کە لەسەر دونیا هەیە! خوای گەورەش لە عەرشی عەزیمەوە ، بە جوبریلی ئەمیندا ، ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴾ البقرة: ٢٠٧

بەڵێ: ، ڕەزامەندی خوا ، ڕەفاقەتی پێغەمبەر (ﷺ) بە ئازادی ژیان لە سایەی ئیسلامدا و لەناو موسڵماناندا ڕزگار کردنی نەفس و لاشەت لە ئاگری دۆزەخ ، گەیشتن بە ڕەحمەتی خوا ، گەورەترین دەسکەوت و قازانجە و تاکە هیواو ئاواتی مرۆڤی ئیماندارە.

**کەواتە:** دەبێ بۆ دەسکەوتنی ئەو قازانجە لە ژمارە نەهاتوەو هاتنەدی ئەو هیواو ئاواتە گەورە مرۆڤ لە هیچ فیداکارییەك سڵ نەکاتەوە وە ماڵ و سامانی خۆی لە

پێناودا ببەخشێ وە پێغەمبەری مامۆستا و پێشەوامان بۆ خۆی بەکردەوە ئەوەی جێ بەجێ کرد. ئەوەتا کاتێ کە بڕیاری هیجرەتی داو هاوەڵی خۆشەویستی خۆی، ئەبوبەکری صدیقی ئاگادار کرد کە بەیەکەوە کۆچ دەکەین ، ئەبو بەکر فەرمووی: ئوێدەواربووم بەڕەحمەتی خوا کە هاوڕێیەتی پێغەمبەری خوام (ﷺ) لەم سەفەرەدا بە نسیب ببێ، لەبەر ئەوە هەر لەوکاتەوە دوو حوشتری زۆر چاك و چاپوکم دابین کردوەو لەسەفەرەکەی کۆچدا سواری پشتیان دەبێن ، پێغەمبەری (ﷺ) فەرموی: دەبێ پارەکەیم لێ وەربگریتەوە، حەزرەتی أبوبکر زۆر فەرموی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆم ومالّ و منالّ و سامانم بە قوربانت بێ ، ئەوەی منیش هی تۆیە، بەلاّم پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕازی نەبوو ، هەتا ئەبوبەکر پارەکەی وەرنەگرتەوە.

کەواتە: دەبێ سەرکردەش مالّی خۆی وەکو سەرباز بکات بە قوربانی ئیسلام ، چونکە ئەوە بەهەشتەو لێبڕان و قوربانی دانی دەوێ ،

**ڕەحمەتی خوا لە شاعیر کە فەرمویەتی:**

ڕێگای بەهەشت لەدوای ئیمان.

ئیستیقامەتەو کۆلّ نەدان ، ژیانە لە سایەی قورئان

بێوەیی یەو لە خواترسان

بەهەشت بڕوای پاکی دەوێ کردەی جوان و چاکی دەوێ.

یەقینێکی پۆلاّیین و دلّێکی بێ باکی دەوێ.

بەهەشت هەروا بەلاش نیە.

پارویەکی حازر نیە و پولّێکی موفت و کاش نی یە.

بە خشینی سامانی دەوێ.

ئەگەر بەتەمای بەهەشتی ، بی ( باج ، بەها ) ناکڕێ.

گەر ڕێبواری ئەو ڕێ دوورەی بەبێ تێشوو نا بڕێ.

ئەبێت ئەوەی لەلات بەنرخ و سەنگینە.
لە دڵتا جوان و شیرینە.
ئەو سامانەی کەلای خەڵکی ، نیشانەی بەخت و نگینە.
ئەبێت لە پێناوی بە هەشت ، ئامادەبی فیدای بکەی.
بە بڕیاری بۆ خوا ژیان ، ماڵی دینت ئاوا بکەی.
ئینجا دەستت بەرز کەیت و بەهەشت لە خوا داوا بکەی.

وانەیەکەی تر لە هیجرەت ئەوەیە کـە فێـری خۆشەویـستی نیشـتیمانمان دەکـات، ئەوەبوو کاتێ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لـە مەککـە دەرچـوو ئـاوڕی بـۆ دایـەوەو فەرموی: ئەی مەککە ، ئەی شوێنی لە دایك بونم، ئەی شوێنی گرِوگـاڵ و گـەورە بوونم ، بەڕاستی تۆ خۆشەویسترین زەوی خوای لەلای من. وە ئەگەر ئەم قەومەم ، ئـەم خـزم هـۆزەم ناچـار بـە بـەجێ هێشـتنی تۆیـان نەکردمایـە، هـەرگیز جـێم نەدەهێشتی. پاشان فرمێسك بەچاوە پیرۆزەکانیدا هاتە خوارەوە، هەتا خوای گەورە هەر لەوێدا دڵنەوایی کردو ئەم ئایەتە پیرۆزەی بۆ نـارد کـە دەفـەرموێ:﴿إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍۚ﴾ القصص: ٨٥

بەڵێ هیجرەت فێـری نیشـتیمان پـەروەری و سـۆزی نەتەوایـەتیمان دەکـات، کـە جیاوازە لە ڕەگەز پەرستی و شـۆڤێنی ، کـە پاراسـتنی خـاك و نیشـتمان ئـەرکی سەرشانی موسڵمانانە، بەڵێ ئیماندار دەبێ دڵسۆز بێ بۆ وولاتەکـەی. بـۆ شـوێنی ژیان و نیشتەجێ بونەکەی. بەو مەبەستەی کە وولاتی ئاوەدان بێ ، ئەخلاق و بەها بەرزەکان پارێزراوبن، مزگەوت منارەی بەرزبێ، حاجی و ڕیـش سـپی موعـەزەزو موکەڕم بێ گەنجی پاك و خوشکی بالاّ پۆش ڕێزدار بێ نەك سەما کـارو عـەرەق

خۆر و بەرتیل خۆر و شەرواڵ پیس و مـوزەوەرو مـوزەویر قسـە بەدەست و بڕیـار بەدەست و بڕیار دەری چارەنوسی میللەت بێ.
بەڵێ ، قەومیەت و نیشتیمان پەروەری ڕاستەقینە دوورە لە شۆڤێنی و عونصـوری و هیتلەری و مۆسۆلۆنیەت.

**ئیمانداران:** هیجرەت فێرمان ئەکات و تێمان دەگەیەنێ کە دەبـێ هـەموو شـتێك بکرێ بە قوربانی دین ، چونکە هەرکەسێ ، هەر خێزانیك هەر نەتـەوەك تـوانی ژینی بکات بە قوربانی دینی، لە ئەنجامدا بەدوو دەستی پـڕەوەو دەگەڕێتـەوە کـە یەکێکیان ژینە، یەکێکیان دینە. وە هەر کەسێك، هەر خێزان و گەل و نەتەوەیـەك دینی لە دەست دا. سەرەنجام بەدوو دەستی بەتاڵ دەگەڕێتەوە کە دەسـتی خـەیاڵ و دەستی بەتاڵە، چونکە دونیا وەختێ بە قیمەتە کە لە خزمەتی دیندا بێ.
ئێمەی موسڵمان هەرچی هەمانە هی ئیسلامە ، ئـەوەتا شـۆڕش وخـەباتمان دانـاو زاناو شـاعیرو کەڵـە پیـاو و شۆڕسـواری نـاو جەرگـەی مێـژوومان، هـەڵێنجراوی مزگەوت و ئیسلامە. لە کەنیسەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە نەهاتوە.
**بەڕێزان:** ئێمە کە یادی کۆچکردنی **پێغەمبەری خوا** (ﷺ)دەکەینەوە، ئایا ئەمڕۆ لەم سەردەمی خۆماندا چۆن هیجرەت بکەین؟! پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرموێ:
((**والُمهاجِرُ مَنْ هَجَرَ ما نَهَى اللهُ عَنْهُ**)) رَواهُ البُخارِي وَمُسْلِم.
واتە: کۆچکردوو بۆ لای خوا ، ئەو کەسەیە کە پشت لەو شتانە بکات کە خوای گەورە نەهی لێ کردوە.
**بەڕێزان:** بە ڕاستی لەم سەردەمەدا ڕوو کردنە خـوا زۆر گرنگـە، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((العِبادَةُ فِي الهَرَجَ كَهِجْرَةٍ إلِيَّ)) رَواهُ مُسْلِم.

واتە: بەندایەتی و عیبادەتی خوای گەورە لـە سـەردەمی فیتنـەو جیـاوازی نێـوان خـەڵکی دا ، کـە هـەمووی لەسـەر دونیـا پەرسـتی پـەلاماری یـەکتری دەدەن. ئەوکەسەی لەو زەمانەدا ڕوو لە خوا بکات و دینداریێکی بە حەق و ڕاستەقینە بێت ، ئەوە وەکو ئەوە وایە کە بۆلای من هیجرەتی کردبێ و لەگەڵ موهاجرین دا خوای گەرە کۆی دەکاتەوە(إن شاء الله).

**زانای گەورەی ئیسلام: عیزی کوڕی عبدالسلام** (رحمه الله) **فەرمویەتێ:**

**هیجرەت دوو جۆری هەیە: هجرة الأوطان ، وهجـرة الأثم والعـدوان.** بـەجێ هێشتنی خاك و نیشتیمان و بەجێ هێشـتنی گونـاهو تـاوان ، باشـترینیان بـەجێ هێشتن و وازهێنانە لە گوناهو تاوان. چونکە بەو جۆرە هیجرەتە خـوای گـەورە لـە بەندەی خۆی ڕازی دەبێت و نەفس و شەیطانی پێ دەمکوت دەبێت، وە هەرکەسێك نەتوانێ پشت لە گوناهو تاوان بکات و لە ناخی خۆیدا کۆچ نەکات لە خراپەوە بـۆ چاکە، بێگومان ناشتوانێ زێدو نیشتیمانی خۆی بـەجێ بهێڵـێ لـە پێنـاوی خـواو پاراستنی عەقیدەو بیرو باوەڕەکەیدا.

**ئیمانـداران:** زۆر کـاروکردەوەی چـاك و جـوان هەیـە کـە وەکـو هیجـرەت وایـە هەروەکولـەو فەرموودەیـەدا هـاتووە کـە هـەردوو پێشـەوای فـەرموودە نـاس (بوخاری موسلم) لە عبدالله کوڕی عومەرەوە ڕیوایەتیان کـردوە کـە فەرمویـەتی: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) – عەرزی کـرد – (أُبايِعُـكَ عَلَـى الهِجْرَةِ وَالجِهادِ أَبْتَغي الأجْرَ مِنَ اللهِ) دەمەوێ پەیمانت پێ بدەم لەسـەر هیجـرەت و جیهادو تێکۆشان لە پێناوی خوادا ، بە ئومێدی ئـەوەی پاداشـتی خـوای گـەورەم دەست بکەوێت ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فـەرموی: (**فَهَلْ مِنْ وَالِدَيْكَ أَحَدٌ حَيٌّ؟**) ئایا هیچ کام لەدایك و باوکت لە ژیاندا ماون ؟ کابرا ووتی: بەڵێ لە خـوا بـەزیاد بێ هەردووکیان لە ژیاندا ماون.

پێغەمبەری (ﷺ) فەرموی: بە دڵ حەزت لە پاداشتی خوایە؟! کابرا ووتی: بەڵێ فەرموی: ((فَارْجِعْ إلى وَالِدَيْكَ فَأحْسِنْ صُحْبَتَهُما)) بگەڕێرەوە بۆ لای باوك و دایکت و زۆر بە جوانی هەڵس و کەوتیان لەگەڵ بکەو لە خزمەتیاندابە.

**ئیمانداران:** بە وردی سەرنجی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدەن ، ئەو کەسە دڵی حەزی لە خێرو ڕەزامەندی خوای گەورە بووە، وە حەزی کردوە لە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێ و لە خزمەتیدا هیجرەت بکات و وڵات و نیشتیمانی خۆی بەجێ بهێڵێ و پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ کوێ چوو لەگەڵی بچێ، ودجیهاد بکات و بەرگری لە پاراستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئیسلام بکات ، وە لەسەر ئەمە پەیمان بداتە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) (خوای گەورە خۆی زاناترە) کە لەوانەیە لەو کاتەدا جەنگ و جیهاد لە گۆڕێ نەبوبێ، یان لاشەو توانای ئەو کەسە لەو ئاستەدا نەبوبێ، کە بتوانێ هیجرەت و جیهاد بکات. بەڵام نابێ دەرگای خێری لەسەر داخرێ هەر بۆیە باشترین کردەوەی نیشانداو فەرموی: بڕۆ لە خزمەتی دایك و باوکتدابە.

جا ئەی ئەو کەسانەی کە ئێستا باوك و دایکتان ، یان یەکێك لەو دوو ئازیزانەتان، لە ژیاندا ماوە و ئەمڕۆ بە پیری و نەخۆشی کەوتونەتە لای ئێوە، ئەو ئەجرو پاداشتە گەورە لە دەست خۆتان مەدەن و بەخزمەت کردنی جوان و پوخت و دڵسۆزانەی دایك و باوکتان. خۆتان بەرنە ڕیزی ئەو کەسانەوە کە لە پێناوی خوادا هیجرەتیان کردوەو لە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) جیهادیان کردوەو بە ڕۆح و ماڵ و سامانیان ئیسلامیان بڵاو کردۆتەوە.

**ئیمانداران:** گوێ بۆ ئەم موژدەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بگرن کە موژدە دەدات بە تۆی ئیماندار کە لەم سەردەمەدا زیاتر دڵخۆش بی بە دینداری و خواناسیەکەت،

زیاتر باوەش بە دینەکەتدا بکەی، خۆشەویستمان (ﷺ) دەفەرموێ:
((إنَّ مِنْ وَرائِكُمْ أَيامَّ الصَبْرِ ، لِلمُتَمَسِّكِ فِيهِنَّ يَوْمَئِذٍ بِما أَنْتُمْ عَلَيْهِ أَجْرُ خَمْسِينَ مِنْكُم ، قالوُا: يا نَبِيَ اللهِ أَو مِنْهُمْ؟! قال: بَلْ مِنْكُمْ) حديث صحيح ، صححه الألباني في السلسلة الصحيحة ج١ الحديث رقم: ٤٩٤.

واتە: بە ڕاستی لە دواتانەوە ڕۆژگارێك هەیە. ڕۆژگارێك دێتە پێشەوە کە ڕۆژی خۆڕاگریە ، هەرکەسێك ئالەو ڕۆژگارەدا پاپەندبوونی تەواوی بە دینەکەوە هەبێت، ئەوە پاپەندبونەی کە ئەمڕۆی ئێوەی هاوەڵانی من بۆ ئەم ئیسلامە هەتانە ، ئەوا ئەجرو پاداشتی پەنجا کەس لە ئێوەی هەیە!! صەحابەکان فەرمویان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەبەستت لە پەنجا کەس لەخۆیان وەی سەردەمی خۆیانە؟! فەرموی: نا ، مەبەستم پەنجا کەس لە ئێوە صەحابەو هاوەڵی خۆشەویستی منە!.

**دەی ئیمانداران:** توخوا با ئەم موژدە گەورە لە دەست نەدەین ، وەرن با بۆ چەند ساتێکی کەمی ئەم ژیانە ، ئەو پاداشتە گەورە لە دەست نەدەین ، با بەتوندی دەست بە قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بگرین ، چاومان هیچ شتێ نەبینێ کە دژایەتی هەیە لەگەڵ ڕێبازو سوننەتی پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) با دوژمنانی دینەکەمان نەمان خەڵەتێنن بە ناوی پێشکەوتن و مۆدو عەولەمەو دروشم گەلێکی بێ ناوەڕۆکی قرپۆك. دڵنیابین براوە ئەو کەسەیە ڕۆژ بە ڕۆژ دینداریەکەی پتەو دەکات و خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لە دڵیدا ڕەگ دادەکوتێ و درەختی ئیمانی دێتە بەرهەم و بەرهەمی جوان و ناسك و بەسوود پێشکەش بە خۆی و خێزان و منداڵ و کۆمەڵگاکەی دەکات.

**ئیمانداران: سەرنجی ئەم بەسەر هاتە بدەن:** ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵانی دا لە شاری مەدینە ڕۆیشتبوە دەرەوە. تەماشایان کرد وا ووشتر سوارێك

به غاردێت بەرەو ڕووی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێغەمبەری خـوا (ﷺ) تەماشـای کردو فەرموی: وا ئەزانم ئەو سوارە بەرەو ڕووی ئێمە دێ و دەیەوێ بگاتـە ئێمـە ، پاش کەمێ سوارەکە گەیشت و دابـەزی و پێغەمبـەری خـواو هـاوەڵانی بـە خێـر هاتنیان کردو، پێغەمبەر(ﷺ): لە کوێوە هاتوی؟ لاوەکە بـەدەم هەناسـە بڕکـێ و مانـدووبونی سـەفەرو تـەپوتۆزی بیابانـەوە ، ووتـی: لـەلای خێـزان و منـاڵ و هۆزەکەمەوە هاتوم ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ئەی دەتەوێ بەرو کـوێ بڕۆیـت؟ ووتی: دەمەوێ بگەم بە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا (ﷺ). (کـە نەیـدەزانی ئـەو کەسەی قسەو گفتوگۆی لە گەڵ دەکات پێغەمبەری خوایە(ﷺ) فـەرموی: باشـت دەست کەوت: گەنجەکە تێگەیشت کە ئەوە پێغەمبەری خوایە (ﷺ) لە خۆشـیاندا دەم و چاوی گەشایەوە ئازارو مانـدووبوونی سـەفەری نـەما، یەکسـەر ڕووی کـردە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((**يا رَّسولُ الله عَلِّمْني مـا الإيمـانُ ؟!**)) ئـەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شارەزام بکەو پێم بڵـێ ئیسـلامەتی چـی یـە؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموی: ئیسلامەتی ئەوەیە کە شایەتمان بێنی بەوەی کە هیچ پەرسـتراوێك نیە کە شایەنی پەرستن بێ تەنها (الله) نـەبێ وە شـایەتمان بـەوە بـدەی کـە محمـد پێغەمبەری خوایە (ﷺ) وە نوێژ بکەی و زەکات بدەی و ڕۆژوی ڕەمەزان بگـری و حەجی ماڵی خوا بکەی. گەنجەکـە ووتـی: وا شـایەتمانم هێنـا و بڕیـارم دا ئـەوەی فەرموت بە پشتیوانی خوا جێبەجێ ی بکەم، گەنجەکە سـواری ووشـترەکەی بـۆوەو هێشتا دوو سێ هەنگاو دور نەکەوتبۆوە، کە قاچی حوشترەکەی کەوتە کونێکـەوەو حوشترەکە کەوت و گەنجەکەی فڕێ داو هەر خێرا هـەڵیان گرتـەوەو ڕایـان کێشـا ، هەتا دوا هەناسەی داو مرد:

**پێغەمبەری خوا** (ﷺ) **فەرموی: (عَلَيَّ بِالرَّجُلِ)** ئەو پیاوەم بۆلا بێنن، عـەماری کوڕی یاسر و حوزەیفە چون بەلایەوە و ویسـتیان هـەڵی بسـێنن و دای بنیشـێنن،

بەڵام دانەنیشت بەلادا کەوت، جوڵاندیان جوڵەی تیادا نەمابوو ، بۆیە ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مردوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەرەو لای هات و کاتێ نزیك بۆوە وەلێ ی سەیری دەکرد بەڵام لەناکاو ڕوی کرد بەرەو لای حوزەیفەو عەمارەوە وە فەرموی: ئایا بینیتان کە ڕووم لەو کەسە مردوە وەرچەرخاند؟! ووتیان بەڵێ ، فەرموی: ((فَإنّي رَأَيْتُ مَلَكَيْنِ ، يَدُسّانِ في فِيهِ مِنْ ثِمارِ الجَنَّةِ ، فَعَلِمْتُ أَنَّهُ ماتَ جائِعاً)) رَواهُ أحْمَد بِسَنَدٍ حَسَن.

فەرموی: بە ڕاستی من بینیم کە دوو فریشتە لەلای بون و خواردنیان دەکرد بە دەمیەوە لە میوەو بەرهەمی بەهەشت، بۆیە منیش زانیم کە بەبرسیەتی مردووە!!

جا ئیمانداران: ئێمەش لەم سەردەمەدا ئەگەر بمانەوێ وەکو خەڵکی مەدینە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بین (ﷺ) با بێن سوننەت و فەرمودەکانی بڵاو بکەینەوە، گوێ بۆ ئەم ڕووداوە بگرن: پیاوێك، کەسێکی سادەو ئاسایی بوو، هیچ زانستی شەرعی نە خوێندبوو ، بەڵام دڵی پڕبوو لە خۆشەویستی خواو سەرخستنی دینی خوا. ڕۆژێکیان کە لەوانەی بانگخوازێکدا دادەنیشێ، لەناو وانەکەدا مامۆستاکە دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: ((كَلمتانِ خَفيفَتانِ عَلى اللِّسانِ ، ثَقيلَتانِ في الميزانِ ، حَبيبَتانِ إلى الرَّحمنِ ، سُبْحانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ ، سُبْحانَ اللهِ العَظيم)) رَواهُ البُخاري وَمُسْلِم.

واتە: دوو ووشە هەن: لەسەر زمان زۆر سوك و ئاسانن ، بەڵام لەتای تەرازودا لە ڕۆژی قیامەتدا زۆر قورسن ، بەلای خواوە زۆر خۆشەویستن ، ئەو دوو ووشەیەش ((سُبْحانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ ، سُبْحانَ اللهِ العَظيم)) ئەم پیاوە کە ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) بیست، دڵی هاتە جۆش و دوای تەواو بوونی وانەکە و هاتنە دەرەوەی لە مزگەوت بڕیاریدا کە بانگەوازی خەڵکی بکات بۆ لای دینی خوا

که ئیسلامه. بەڵام خۆ ئەم هیچ عیلمێکی شەرعی نازانێ خۆی بەخۆی گوت: ئەی ئەوە نیە ئەو فەرمودە موژدە بەخشەی پێغەمبەری خوام بە جوانی لەبەرکردوە ، دەی ئەم فەرمودە ئەگەیەنم بەهەر کەسێ گوێم بۆ بگرێ ، ناوی خوای لێ هێناو هەر لەڕێگاوە چوو بۆ لای کابرایەکی میوەو سەوزە فرۆش و ئەم فەرمودە موژدە بەخشەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ خوێندەوە و داوای لێ کرد کە ئەم (**سُبْحانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحانَ اللهِ العَظِيم**)ە زۆر لەسەر زمانی بێ وتای تەرازوی خێری خۆی لە قیامەتا پێ قورس بکات لەو ڕۆژەدا کە مرۆڤ زۆر موحتاجە بۆ تەنها چاکەیەك.

ئیتر بەم شێوەیە ، ئەم پیاوە کە تەنها ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەزانی هەموو هیواو ئاواتی ببوە بڵاوکردنەوەی ئەم فەرمودەیە بەناو خەڵکی دا.

بەڵێ هەر کەسێکی دەست بکاتەوتایە بیزانیایە گوێ ی بۆ دەگرێ و خۆشەویستی خواو پێغەمبەری (ﷺ) لە دڵدایە ئەم فەرمودەیەی پێ دەگەیاند.

ڕۆژگار ڕۆیشتن و ئەم پیاوە دڵپاکە، دڵ پڕ لە خۆشەویستی خواو پێغەمبەرە (ﷺ) پڕ لە خۆشەویستی ئەم ئیسلامە شیرینە، توشی نەخۆشیەکی ترسناك بوو.

نەخۆشیەکەی درێژەی کێشا و دکتۆرەکان ووتیان: پێویستی بە نەشتەگەری هەیە، ئەوەبوو بردیانە ژوری نەشتەگەری و نەشتەگەریەکی زۆر گەورەو قورسی بۆکرا.

ئەو دکتۆرەی کە عەمەلیاتەکەی بۆ کرد نوێژی نەدەکرد و ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕوی لە مزگەوت نەکردبوو!

بەڵێ کاتێ لە هۆڵی نەشتەگەری هێنایانە دەرەوە و بەنجەکەی خاو ببۆوەو کەوتبوەوە سەرقسە، دکتۆرەکەی چوو بەلایەوە و ئەم پیاوە نەخۆشە کەچاوی کردەوە و دکتۆری بینی ووتی: ئەی دکتۆر قسەیەکت بۆ بکەم گوێم بۆ دەگری؟!

دکتۆر ووتی: بەڵێ فەرموو هەر پرسیارێك و قسەیەکت هەیە ئامادەم گوێت بۆ

بگرم و بەقسەت بکەم ، نەخۆشەکە کە لاشەی نەخۆشە بەلام بیری ساغە، بەلام فکرەی سەلیمە، بەلام قەلبی سەلیمی هەیە﴿ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴾ الشعراء: ٨٨ - ٨٩.

**بەدکتۆری ووت:** ئەی دکتۆر تکایە ئەم موژدەیەی پێغەمبەری خوات (ﷺ) لە دەست نەچێ، تەرازوی خێری قیامەتتی پێ قورس بکە، پاشان فەرمودەکەی ووت: (كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ إلخ). ئیتر دەستەکانی شل بوون و و سەری بەلادا کەوت و مرد!!! دکتۆرەکە زۆر سەری سوڕما لە ئیمان و بیروباوەڕی ئەم پیاوە، لەو تەمەنەدا، لە ژێر کاریگەری بەنجدا، لەسەر قەلەوێرەی خەستەخانەدا، لە جیاتی ئۆف و ئازاری، لە جیاتی ئەوەی بلێ دکتۆر نەشتەگەریەکەم سەرکەوتوو بوو یان نا، دکتۆر چیم لێ دێ، تەنها ئەوەی لە یادە بەم فەرمودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) بانگەواز بکات بۆ لای خوا ، بۆیە دکتۆرەکە بیری کردەوە و بە خۆی گوت: بە ڕاستی تۆ دکتۆری ومن نەخۆش، من عەقیدەو بیروباوەڕم نەخۆشە کە تا ئێستا سەری بەندایەتیم بۆ خوا نە خستۆتە سەر زەوی ، کە هەموو هیواو ئاواتم ئەم چەند ساڵ ژیانەی سەر ئەم زەویەیە کە ناشزانم زوو یا درەنگ بە جێ ی دێلم.

کەچی ئەم پیاوە چەند خەمی قیامەتی بوو. چەند خەمی قیامەتی من و موسلمانانی بوو، بۆیە دکتۆرەکە هەرلەوێدا تەوبەی کردو ڕووی کردە خواو بۆ بەیانی ڕووی کردە خوێندنی زانستی شەرعی و سوپاس بۆ خوا ئێستا یەکێکە لەو کەسانەی بانگەوازی خەلکی دەکات بۆ لای خواو خزمەتێکی گەورەی ئیسلام دەکات و لە خەمی قیامەتی خۆی و خەلکی دایە.

وە هەموو ئەو چاکانەی کە بە پشتیوانی خوا بەدەستی دێنێ دەچێتە تای تەرازووی خێری ئەو پیاوەشەوە کە بە نەخوێندەواری ، تەنها بە زانینی یەك فەرمودەی

زێڕینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگی خەڵکی دەکرد بۆ لای خواو ووشیاری دەکردنەوە کە قیامەتیش وەکو دنیا توێشوی دەوێ ، بگرە توێشوی ڕاستەقینە ئەوەیە کە بۆ ئەو جیهانە نەبڕاوە چارەنوس سازە ئامادە بکرێ ، کە ئەویش تەقوایە﴿ وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَىٰ ﴾ البقرة: ١٩٧

بەڵام ئایا ئێمە ئەو هیمەتە بەرزەمان هەیە؟!

**بەڕێزان:** ئەمڕۆ لە جیهاندا هەریەك بە جۆرێ دیفاع لە ئیسلام دەکات و دەبێتە پشتیوانی ئەم دینە ، بۆ نموونە:

لە ئیسپانیا کەسێکی مەسیحی موسڵمان دەبێ و ناوی خۆی دەنێ (عومەر) ئەو کەسە: (عومەر فریدریك کانتۆنی) یاریزانی یانەی (ئیشبیلیەی ئیسپانیا) یە. ئەم تازە لاوە موسڵمانە کاتێك لە لایەن موسڵمانەکانەوە هەواڵی ئەوەی پێ دەگات کە یەکێك لە کۆمپانیاکانی خانوو بەرەی ئیسپانیا هەوڵدەدات بۆ لابردنی مزگەوتێك لە ئەندەلوس بە بەڵگەی ئەوەی کە گرێبەستی ئەو زەویەی مزگەوتەکەی لەسەرە کۆتایی هاتوە، لەبەر ئەوە مافی خۆیەتی مزگەوتەکە بکاتە هەر پڕۆژەیەکی تری نا ئایینی، بەگەیشتنی هەواڵەکە بە (فریدریك کانتۆنی) ئەستێرەی تۆپی پێی ووڵاتی ماڵی، لە ڕێگەی کۆمەڵێك موسڵمانەوە کەلە ئەندەلوس دادەنیشن و خۆیان نەیاتوانیوە زەوییەکە بکڕن، کانتۆنی بۆ بەرگەگرتن لە لابردنی مزگەوتەکە (٥٠٠) هەزار دۆلاری بەخشی بۆ ئەوەی ئەو مزگەوتە بمێنێتەوە.

(**سُبْحانَ الله**) خوای گەورە ئەم دینەی خۆی هەر پەخش و بڵاو دەکاتەوە و پیشتیوانی بۆ دروست دەکات و هەرکەسەی بە جۆرێ دیفاعی لێ دەکات، جاری وا هەیە بە مەلایەك، بە دەوڵەمەندێ ، بە یاریزانێك ، بەیاسا ناسێك ، بە دکتۆرێك بە نەخوێندەوارێك ئەم دینەی خۆی هەر پەخش و بڵاو دەکاتەوە.

بەڵێ ئەم ئیسلامە جار بە جارێ هەوری دوکەڵاوی بەری ڕۆژی زێڕینی دەگرێ، بەڵام هەر زوو ڕوە گەشەکەی دەردەکەوێتەوە.

**بۆ نموونە:** لە ڕوسیا لە ساڵی (١٩١٧) وە هەرچی شتێك پەیوەندی بە ئایینی ئیسلامەوە هەبوو قەدەغەکراو مزگەوتەکان کران بەتەویلەی ئەسپە پۆلیسیەکان، بەڵام کە کۆمۆنیستی هەرەسی هێنا ئیسلام لە ڕووسیا گەشایەوە لە ساڵی (١٩٩١) لە ڕووسیا (١٨) کەس چونە حەج، بەڵام لە (٢٠٠٧) دا (بیست وشەش هەزار) حاجی لە ڕووسیا چوون بۆ حەج !! ئێستا لە ڕووسیا زیاتر لە (٤) هەزار مزگەوت هەیە.

**ئیمانداران:** لە کاتێکدا یادی هیجرەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکەینەوە، دڵشادین بە عیزەتی ئەم ئیسلامە، کە ئەمڕۆ هەر یەکەو بە جۆرێك دەیەوێ یادگاریە ئیسلامییەکان زیندوو بکاتەوە ، ساڵی (٢٠٠٧) قوتابی (سالم ممۆ) کە لە بنچینەدا مەغریبیەو ئێستا لە فەڕنسا دەخوێنێ ، بەپێ لە فەڕەنساوە هات بۆ حەج. ئەو خوێندکارە تەمەنی (٣٦) ساڵەو بە خۆی و کامێراکەیەوە کە بڕی کرد لە بەڵگە نامە ئەو ڕێگایەی پڕی و چەندین دۆخی تینویەتی و برسیەتی و مەرگەساتی بینیوە ، هەروەکو جاران کە بە ئاسانی حەج نەدەکرا، دەگێڕنەوە ، حاجیەك لەبەر پیری ڕەجمی شەیطانی بۆ نەدەکرا ، ووتیان : باشە بۆچی بە گەنجی نەهاتی ؟ ووتی: ئاخر کاتێ من بەڕێ کەوتم لە ناوچەکانی سەروی (تبت) گەنج بووم. تا گەیشتومەتە ئێرە (مەککە) ڕیشم سپی بوو، پشتم چەمایەوەو پیربووم. چونکە قۆناغ بە قۆناغ بەپێ هاتوم و لەهەر شارێ ماوەیەك ماومەتەوە و هەندێ کاسپیم کردوەو کرێکاریم کردوەو پارەیەکم دەست کەوتوە و بەڕێ کەوتوم بەرەو شارێکی تر تا ئەو پارەیەی لام بوە خەرجم کردوەو خواردومە، پاشان دەستم کردۆتەوە بە کارکردن و هەندێ پارەی ترم دەست کەوتوە تاوەکو ئەویشم خواردوەو هەندێ ڕێگای ترم بڕیوە ، ئەمە هەمووی بە مەبەستی گەیشتن بەو کەعبەیەی کە ڕووگەی نوێژەکەم بوەو بەجێ هێنانی فەرزی حەج، بەم شێوەیە تاوەکو گەیشتمە ئێرە ئاوا پیر بووم و بێ هێزو لاواز بووم !!

خـوای گـەورە لێـت دەپاڕێینـەوە زیـاتر خۆشویسـتی خـۆت و پێغەمبەرەکـەت و ئیـسلامەکەت بخەرە ناو دڵ و دەروونمانەوەو بمانگێڕە لە خزمەتکارانی ئیسلام.

اَللَّهُمَّ آمِين

# سەرچاوەکان


١- السيرة النبوية، د.علي محمد محمد الصلابي، ج، ص٤٣٩، ص٤٤٢ ، ص٤٤٦.

٢- گۆڤاری دوانگە ، ژمارە: ٢٤، لا(٤٥) ، شعری م. غەریب پێنجوێنی.

٣- علي خطي الحبيب ، عمرو خالد ، ص٩١,

٤- موسوعة: نَظرة النَعيم في مكارم أخلاق الرَّسول الكريم (ﷺ)، ج٨ ، ص٣٥٥١ _٣٥٦٥.

٥- يسألونك ، د.حسام الدين ، ج٤ ، ص٢٧٠,

٦- رحلة إلى السماء، د. محمد عبدالحمن العريفي ، ص٧,

٧- صور من الحياة الأنبياء والصحابة والتابعين ، محمود المصري ، ج١ ، ص٤٨٦,

٨- ڕۆژنامەی کۆمەڵ ، ژمارە: ٣٠٢ لە ٢٠٠٧/١٢/١٥ دا.

٩- ڕۆژنامەی ستاندەر ، ژمارە: ٨ لە ٢٠٠٧/١٢/١٧

# ووتاری سێ یەم

# بۆ مانگی موحەڕەم

# گرنگی حكومەت و دەوڵەت لە ئیسلامداو مافی هاوڵاتی لەسەر كاربەدەست

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبهِ أجمعين.

**ئیمانداران:** دوای گەیشتنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ شاری مەدینە، هیچ پشوویەکی نەدا هەتا ئەم کارە بنچینەییانەی ئەنجامدا:

**یەکەم:** دروست کردنی مزگەوت.

**دووەم:** برایەتی لەنێوان موهاجیر و ئەنصار.

**سێ یەم:** نوسینی دەستوری مەدینە.

کە ئەم دەستوری مەدینەیە یەکەم دەستورە لە مێژووی نیوە دورگەدا، چونکە ڕۆم و فارس دەستوری وولاتیان هەبوو، بەلاّم هەر بۆ بەرژەوەندی خۆیان و دەسەلاّتیان بوو، بەلاّم دەستوری مەدینە، مافی موسڵمان، مافی جولەکە، مافی موشریك ، مافی ئەمنەیەتی شار، مافی شاری مەدینە کە دەبێ هەمویان بەیەك دەست دیفاعی لێ بکەن.

کەواتە: ئەوەی ئەمڕۆ لە سەدەی بیست و یەك دا، خەڵکی بە ناوی پێشکەوتو خوازی و مەدەنیەت و دیمکراسیەوە، بۆ حوکمی فرەلایەنی و پەرلەمانی بۆ وولاّت داوای دەکەن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ یەکەمجار لە مێژوودا بەردی بناغەی داناو بەکردەوەش جێ بەجێ کرا. نەك وەك ئێستا هەر قسەبێ.

کەواتە: وولاّت بەبێ حکومەت بەڕێوە ناچێ.

تەنانەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: **((الأمارةُ الفاجرة خَيْرُ مِنَ الهَرج))** رَواهُ الطَبَرانيُ في الكَبير. واتە: دەسەلاّت و فەرمانڕەوایەتیەکی خراپەکار هێشتا زۆر باشترە لەبێ سەروبەرەیی و بێ حکومەتی.

**وە هەروەها زانای گەورە:** (الطرطوشي) لة (سراج الملوك) دا، ج١، ص٢٠٠دا دەفەرموێ: (وَلَوْ جُعِلَ ظُلْمَ السُّلْطانِ حَوْلاً في كَفَّةٍ ، ثُمَّ جُعِلَ فَسادَ الرَّعِيَّةِ

وَمَظالِمَهِمْ وَهَرَجِهِمْ في سَاعةٍ، إذا إخْتَلَّ أَمْرُ السُّلْطانِ في كَفَّةٍ. كانَ هَرَجُ سَاعةٍ أَعْظَمُ وَأَرْجَحُ مِنْ جَوْرِ السُّلْطانِ حَوْلاً).

**واته:** ئەگەر زوڵم و ستەمی کار بەدەست و فەرمانڕەوایەك ، کە لە ماوەی ساڵێکدا بەرامبەر میللەت ئەنجامی دەدات. هەموو ئەو زوڵم و ستەمە بخرێتە تای تەرازویەکەوە پاشان بێ حکومەتی و بێ فەرمانڕەوایەتی کە بەسەر میللەت دا دێ و ئەو خۆ خۆری و زوڵم و ستەمەو خۆ خۆریەکەی کە لە دیارنەبونی دەسەڵاتی دەوڵەتدا خەڵکی بەرامبەر یەکتر ئەنجامی دەدەن ، بخرێتە تای تەرازویەکەوە ، کەلە ماوەی تەنها یەك کاتژمێر بێ حکومەتی و ئیدارەییدا ڕوودەدات — نەك ساڵێك — ئەوا زەرەرو زیانی ئەو یەك سەعاتە خۆ خۆری و بێ حکومەتیە گەورەترو قورسترەو باڵاترە لە ستەمی فەرمانڕەواو کاربەدەست کەلە ماوەی ساڵێکدا کردویەتی!

وە هەر لەبەر گرنگی حکومەت و دەسەڵاتە لە وڵاتدا کە حەزرەتی (**عوسمانی کوڕی عەفان**) خەلیفەی سێ یەمی ڕاشدین ، فەرمویەتی: (إنَّ اللهَ لَيَزَعُ بِالسُّلْطانِ مالا يَزَعُ بالقُرْآنِ). موفەسیری گەورەی قورئان ، **شێخی ئیبن کەثیر**، لە تەفسیری ئایەتی: ﴿وَٱجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَٰنًا نَّصِيرًا﴾ الإسراء: ٨٠.

ئەم ووتە جوانەی ئیمامی عثمانی هێناوە و شەرحی فەرمودەکەی ئیمامی عثمانی کردوە و فەرمویەتی: (أَيْ لَيُمْنَعُ بِالسُّلْطانِ عَنِ إرْتِكابِ الفَواحِشِ وَالآثامِ مالا يُمْتَنِعُ كَثيرٌ مِنَ النَّاسِ بالقُرآنِ). بەڵێ خەڵکی واهەیە بە گوێبیستی یەك ووتاری ڕۆحی و بەسۆز واز لە خراپە دێنێ، بەلام کەسانێکیش هەن کە وەلامی ئەو داواکاریانە نادەنەوە کە قازانج و سودی خۆی و کۆمەڵگاو هاولاتیانی تێدایە.

مەگەر بەوەی کە هێزێکی گێڕەرەوە لەلایەن دەسەڵات و حکومەتەوە مل کەچی بکات بەوەی کە لایەنی خێری تێدا زاڵ بکات بەسەر لایەنی خراپەو تەماح کاری نابەجێ دا.

**بەڕێزان:** حکومەت و دەسەڵاتی وڵات ئەگەر عەدالەت بێ لە هەموو شتێ باشترە.

عومەری کوڕی عبدالعزیز داوای لە شێخ حەسەنی بەصری کرد کە صیفاتی ئیمامی عادلی بۆ دیاری بکات ، شێخ حەسەنی بەصری فەرموی: (إنَّ اللهَ جَعَلَ الإمامَ العادِل قَوُّامَ كُلِّ مائِلٍ ، وَقَصْدَ كُلِّ جائِرٍ، وَصَلاحَ كُلِّ فاسِدٍ ، وَقُوَّةَ كُلِّ ضَعيفٍ، وَنصفَةُ كُلِّ مَظْلومٍ، وَمَفزع كُلِّ مَلْهُوفٍ، وَالإمامُ العادِلُ كَالْقَلْبِ بَيْنَ الجَوارِحِ، تصلح الجَوارِحُ بِصَلاحِهِ ، وَتُفْسدُ بِفَسادِهِ).

واتە: بە ڕاستی خوای گەورە پێشەوای دادگەری کردوە بە: ڕاست کەرەوەی هەموو لاریەك، وەچاك كەری هەموو خراپەکارێك، هێز بۆ هەموو لاوازو بێ دەسەلاتێك، پشت و پەنای هەموو ستەم لێکراوێك، ڕزگارکەری هەموو لێقەوماوێك ، کە داوای یارمەتی دەکات، وە پێشەوای دادگەر وەکو دڵ وایە لەناو ئەندامەکانی لاشەدا، هەموو ئەندامەکانی لاشە چاك دەبن و ڕەفتاری چاك دەکەن ئەگەر دڵ پاك و خاوێن و پڕ لە خێربێ، وە ئەگەر دڵیش پڕبوو لە بوغزو کینەو خراپەویستی هەموو ئەندامەکانی لاشە خراپەکار دەردەچن، دەی هەمان شێوە ئەگەر سەرکردەو پێشەوای گەل و میللەت چاك بوو، ئەوا هاولاتیش چاکەکار دەبێ، وە بە پێچەوانەوەشەوە ئەگەر پێشەوا و ڕابەری وولات و میللەت خراپەکارو لاربوو، هاولاتیانیش لارو خوارو کار خراپ دەبن!

**ئیمانداران:** بە ڕاستی ئەولیاو پیاوچاکان زۆر چاك گرنگی حکومەت و دەسەلاتیان بۆ دەرکەوتبوو، ئەوەتا، شەقیقی بەلخی ئامۆژگاری هارونە ڕەشیدی دەکردو پێ ی ووت: ئەی هارون، خودا خانویەکی هەیە ناوی دۆزەخەو تۆی کردوە بەدەرگاوانی ئەو خانوەو سێ شتی بەتۆ داوە، هەتا بەو سێ شتە موسڵمانان لەو دۆزەخە دوور بخەیتەوە: ماڵ و شمشێرو قامچی.

**بەماڵ:** داماوی وئیحتیاجی خەڵکی مەهێڵە، هەتا بە هۆی نەبوونی و نەداری یەوە توشی دزی و درۆزنی و ڕێگری و ستەمکاری نەبن.

چونکە ئەم ڕەوشتە خراپانە هەمووی بەرهەمی هەژارین.

**بەهۆی شمشێریشەوە:** ڕێگا لە ستەمکار بگرە هەتا زوڵم و ستەم لە خەڵکی نەکات، سەرپێچی کاریش، لادەریش لە یاساو ڕەوشتە بەرزەکان بە قامچی ئازار بدە هەتا بە خۆیاندا بچنەوە و نەبنە هۆی بڵاوبونەوەی خراپە لەسەر زەویدا و ژیانی خۆیان و خەڵکیش نەکەن بەژان

جا ئەگەر تۆبەو جۆرەکاری دەسەڵاتت بەڕێوەبرد، ئەوا خەڵکی لە دۆزەخ ڕزگار دەکەیت و خۆشت ڕزگار دەبیت ، بەڵام ئەگەر بەو جۆرەت نەکرد ، ئەوا لە پێش خەڵکی یەوە دەچیتە دۆزەخ.

جا حکومەتیش لە کار بەدەست و میللەت پێك دێت، وە هەردوولا مافیان هەیە و لە بەرامبەردا ئەرکیشیان لەسەر شانە بەرامبەر ئەوی تریان، جا بە پیشتیوانی خوای گەورە ئاماژە دەکەین بە مافەکانی میللەت بەسەر حکومەت و کاربەدەستانی حکومەتەوە.

**یەکەم: أَنْ يَحْكُمَ بالعَدْلِ وَالحَقِ وَلايَظلِمَهُم** ، ئەبێ فەرمانڕەوایەتی بکات بە دادگەری و ڕاستی و زوڵم لە هاولاتیان نەکات، وە دادگەری و حەقیش نایەتەدی ، بەجێبەجێ کردنی شەرعی خوانەبێ ، خوای گەورە بە پێغەمبەری خۆشەویستی دەفەرموێ: ﴿ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ ﴾ المائدة: ٤٩.

**واته:** ئەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دادوەری بکە بەو بەرنامەیە(قورئانە)ی کە لەلایەن خواوە بۆت دابەزیوە، شوێنی ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوە، پاشان ئەفەرموێ: ﴿ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾ المائدة: ٥٠.

**واته:** ئایا ئەوانە حوکم و فەرمانڕەوایی جاهیلیەت و نەفامییان دەوێت و ئەویان لاپەسەندە؟! ئاخر بۆ بیرناکەنەوە؟ کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکمی جوان و چاك و بە

جیّ بیّت. به تایبەت لای ئەو کەسانەی کە بەوردی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە.

**کەواتە:** دادگەری و عەدالەت و چەسپاندنی حەق کاتێك لە حوکمڕانیدا دێتە جیّ کەوا بە پیّ ی شەرعی خوا فەرمانڕەوایەتی بکریّ.

**زانای گەورە، موفەسیری قورئان (فەخری ڕازی):** لە تەفسیرەکەیدا ( ج١، ص١٤١) دەفەرمویّ: هەموو زانایان و شەرع زانان لەسەر ئەوە هاودەنگن کە هەر کەسیّ بووە فەرمانڕەوای موسڵمانان، (وَجَبَ عَلَيْهِ أَنْ يَحْكُمَ بالعَدْلِ) پێویستە لەسەری کە بە دادگەری فەرمانڕەوایەتی بکات و زوڵم و ستەم لە میللەت نەکات.

بەڵیّ ، نابیّ کاربەدەست جیاوازی لەناو هاوڵاتیاندا بکات لە جیّ بەجێکردنی یاسادا. یاسا بەسەر فەقیرو هەژارو بێکەس و پشتواندا جیّ بەجیّ بکات، بەڵام نەتوانیّ بەسەر دەسەڵاتدار دا جیّ بەجیّ بکات، یان چاوپۆشیان لیّ بکات. هەردوو پێشوای گەورەی فەرموودەناسی (بوخاری ومسلم) ڕیوایەتیان کردوە کە:

جارێکیان ئوسامەی کوڕی زەید، هاوەڵی پایەبەرزو خۆشویستی کوڕی خۆشەویستی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لە لایەن چەند ئەشراف و ناودارێکەوە تەکلیفی لیّ کرا کە بچێتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم تکایەی لێبکات، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەندە ئوسامەو پێشتریش زەیدی باوکی خۆش ویستوە، کە قسەی ڕەت ناکاتەوە، داوا کاریەکەش ئەمەبوو: ئافرەتێکی مەخزومی،، کە لە بنەمەماڵەیەکی ناسراو و دەوڵەمەندبوو، دزی کردبوو ، وە دزی یەکەی لەسەر جێگیربوبوو، وە هەموو مەرجەکانی دەست بڕینی دزکە لە شەرعدا هەیە،

لەو ئافرەتەو بڕی ماڵە دزراوەکە و شوێنی دزی لێکراوەکە و باری دارایی و ئابووری ئافرەتەکەدا ، هاتبوەجیّ ، بەڵام کەسوکارەکەی لەناوخۆیاندا کۆبونەوە

ووتیان: ئەگەر ئەم ئافرەتەی ئێمە لەسەر ئەم دزی یە دەستی ببڕدرێ ئەوە بەڕاستی شەرمەزار دەبین لەناو خەڵکی داو ئەوە لە شان و شکۆی ئێمە ناوەشێتەوە بۆیە ئوسامەی کوڕی زەیدیان ناچار کرد کە ئەم داوایە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکات و دەستی ئەو ئافرەتە نەبڕدرێ و بەردێك بخرێتە سەر ئەم باسەو پەردە پۆش بکرێ:

کاتێ ئوسامە چوە خزمەت پێغەمبەری خواو (ﷺ) باسەکەی لەگەڵ کردەوە، (غَضِبَ رَسولُ اللهِ (ﷺ) پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری هێمن و حەلیم، هەر کە گوێ ی لەم قسەو داواکاریەبوو، توڕەبوو، دەم و چاوی موبارەکی سور هەڵگەڕا، بەتوڕەییەوە ڕوی لە ئوسامەی خۆشەویستی کردو فەرموی: ((أَتَشْفَعُ فِي حَدٍ مِنْ حُدودِ اللهِ؟)) ئەوە تکا دەکەی بۆ لابردنی حەدێك لە حەددو سنورەکانی خوای گەورە؟!) سەرکردە لە خۆشویسترین کەسی خۆی توڕببێ کاتێ تەکلیفی ئەوەی لێ دەکات یاسایەك پێشێل بکرێ و بەسەر دەوڵەمەندو ناسراودا جێ بەجێ نەکرێ) پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەستاو چوە ناو مزگەوتەوەو خەڵکی کۆبونەوەو فەرموی: ((إنَّما هَلَكَ مِنْ قَبْلَكُمْ أَنَّهُمْ كانُوا إذا سَرَقَ فِيهِمُ الشَرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإذا سَرَقَ فيهِمُ الضَّعيفُ أَقامُوا عَلَيْهِ الحَدُّ)).

فەرموی: بە ڕاستی خەڵکان و ئومەتانی پێش ئێوە بە هۆی ئا ئەمانەوە خوای گەورە بە هیلاکی بردن، چونکە ئەوان: ئەگەر کەسێکی دەست ڕۆیشتوو لە بنەماڵەیەکی ناودار و ناسراو دزی بکردایە وازیان لێ دێناو چاوپۆشیان لێ دەکردو بۆیان پەردە پۆش دەکرد، بەڵام ئەگەر کەسێکی لاواز و بێ دەسەڵات و بێ کەسدزی بکردایە ئەوا سزیان بەسەردا جێ بەجێ دەکرد و حوکمیان دەکرد.

بەڵێ لە هەموو زەمان و زەمینێکدا ، قانون و یاسای مرۆڤ کرد ، یان قانون و یاسای شەرعی خوا بەڵام بەدەست کاربەدەستانێکی نا دادگەرەوە ، وەکو تۆڕی

ماسی گرتن وایە تەنها ماسی بچوك ڕاو دەكات و ماسیە بچوكەكان بە داوی تۆڕەكەوە دەبن ، بەڵام نەهەنگ و قرشە بەهێزەكان و خاوەن ددانە تیژەكان نەك هەر بەدوای تۆڕەكەوە نابن بەڵكو تۆڕەكەش قوت دەدەن. بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر لە وێدا قسەو بڕیارێكی وای دەركرد كە هیچ كەس ئیتر بواری ئەوەی نەمێنێ تكا بۆ تاوانبار بكات، وە كاربەدەستانی فێركرد كە دەبێ لە جێبەجێ كردنی بڕیار و یاساكانی شەرعدا جیاوازی لە نێوان هیچ كەسێكدا نەكەن ، بۆیە بەو زمانە پیرۆزەی ئەم چەند ووشەی فەرموو كەتا مێژووی مرۆڤایەتی ڕەوڕەوەی بەردەوام بێ قسەیەكی ئاوا بەخۆیەوە نابینێتەوە. كە فەرمووی: ((**وَاللهِ لَوْ أَنَّ فاطِمَةَ بِنْتِ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَها**)) سوێند بە خوای گەورە ، ئەگەر بێتو فاطمەی كچی محمد – كە كچی خۆمەو خۆشویستی خۆمەو خۆشەویسترین كەسمەو یادگاری خاتوو خەدیجە و تاكە ئەولادمە لە كوڕو كچ كە لە ژیاندایە، سوێند بە (الله) ، ئەو فاطمەیەی كچم دزی بكات ، بە دەستی خۆم دەستی دەبڕم !!!).

**بەڕێزان:** كاربەدست و فەرمانڕەوای موسڵمانان دەبێ بە دادگەری حوكم بكات لە نێوان هاوڵاتیاندا، تەنانەت ئەگەر بێ تاوان كافرێكی جولەكەی دژ بە ئیسلام بوو، وە تاوانبار موسڵمانێكی خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو. كاربەدەستی دادگەر پشتیوانی جولەكەبێ تاوانەكە بكات و سزای موسڵمانە تاوانكارە كە بدات. وە ئەمەش هەر قسە نیە لە ئیسلامدا.

بەڵكو لە ئیسلامدا بە كردەوە جێ بەجێ بوەو قورئانی پیرۆز بخوێنەرەوە لە سورەتی (النساء) ئایەتی (١٠٦) و ئایەتەكانی دواتر. باسی ئەم ڕووداوە دەكەن:

لە شاری مەدینەدا موسڵمانێك زرێ یەك – ئامێرێكی جەنگی یە بۆ خۆپاراستن لە شمشێر و تیر جەنگاوەر بەكاردی دەهێنێ وەكو ساج وایە – موسڵمانێك زرێ یەك

له موسڵمانێك دەدزێ، كاتێ خاوەن زرێ دەكەوێتــە گــەڕان بەشــوێن زرێ كەیــدا ، موسوڵمانە دزەكە كە دەزانێ خەریكە لە ماڵی ئەوان نزیك دەبێتەوەو دزیەكەی لێ ئاشكرا دەبێ، دێ دەیخاتە بنەگونیەك ئاردەوەو فڕێ ی دەداتە ماڵی جولەكەیەكەوە گونیە ئاردەكە كون دەبێ و ئاردی لێ دەڕژێ تــا بــەر مــاڵی جولەكەكــە!! كــابرای جولەكەش ئاگای لە هیچ نیە ، بەڵێ كاتێ خاوەن زرێ دەگاتــە مــاڵی كــابرای دز، دزەكەش دەڵێ من هیچم نــەبینیوە، بــەڵام ئــەم ئــاردە ڕژاوەو بــەرەو مــاڵی ئــەو جولەكەیە ڕۆیشتوە، ڕەنگە بەشەو دزیبێتی و لــە ئاردەكــەدا شــاردبێتیەوە، بۆیــە هەردوكیان دەچنە ماڵی جولەكەو دەست دەكەن بە گــەڕان هــەتا لــەناو ئاردەكــەدا زرێ یەكە دەدۆزنەوەو جولەكە بەدز دەناسێنن.

ئەم كێشەو دەنگ و باسە دەگاتە خزمەت پێغەمبەری خــوا (ﷺ) ئــەویش وەكــو لایەنی مرۆڤی گومانی بۆ پەیدا دەبێ كە جولەكەكــە دزەو موســڵمانە دزەكــە بــێ تاوانە جولەكەكەش بەردەوام بێ ئاگایی خۆی ڕادەگەیەنێ و دەڵێ من وا ئەزانم ئەو موسڵمانەی كە ڕێنمایی ئەم خاوەن زرێ یەی كردوە بۆ ماڵی مــن ئــەو خــۆی دزی یویەتی و وا دەیەوێ لە ملی منی بئالێنێ ، لــەم كاتــەدا كــە هــەموو بەڵگــەكان خەریكە دزیەكە ئەدەن بەسەر جولەكەكەدا خــوای گــەورە لــە عــەرشــی عەزیمــەوە، جوبریلی ئەمین دەنێرێتە خوارەوەو ئەو كۆمەڵــە ئایەتــەی ســورەتی (النســـاء) بــۆ پێغەمبەری خــوا (ﷺ) دەنێــرێ و پــاكی وبــێ ئاگــایی جولەكەكــە دەســەلمێنێ و موسڵمانەكە بەتاوانكار و دز دەناسێنێ.

ئەم موسڵمانە ناوی (طوعمە) بوو، ڕای كرد بۆ مەككە و كافر بــۆوەو خــوی شــیری هەتا پیری هەرتەرك نەكردو شەوێكیان چوو بۆ دزی و لە كاتی ســەركەوتن بەســەر دیوارێكدا، دیوارەكەی بەسەردا ڕوخاو لەژێریدا مرد.

به ڕاستی ئەمە گەورەیی ئیسلامە، ئاوا دادگـەری بـەکردەوە دەچەسـپێنیٚ، ئـەوە گەورەیی ئیسلامە لە قورئاندا باسی پاکی وبیٚ ئاگایی جولەکەیـەکی دژ بەئیسـلام تۆمار دەکات و موسڵمانێکی دز ئاشکرا دەکات و ڕاستییەکان وەکو خـۆی تۆمـار دەکات، کە لە غەیری ئیسلامدا ئەمە مەحاڵە کە ئەندامی خـۆی بـە دزو نـەیاری خۆی بە پاك هەروەکو واقیع باس بکات.

**بەڕێزان:** کاتێك حەزرەتی ئەبو بەکر بوو بە خەلیفە، یەکـەم ووتـاری ئـەوەبوو کـە فەرمووی، ئەی خەڵکینـە: (الضَّعيفُ فيكُمْ قَوِيٌّ عِنْدِي حَتَى أَرْجع عَلَيهِ حَقَّــهُ إنْ شاء اللهُ، وَالقويُّ فيكُمْ ضَعيفٌ عِنْدِي حَتَى أَرْجع الحَقَّ مِنْهُ إنْ شاءَ اللهُ).

واتە: بێهێزتان لەلام بەهێزە هەتا ئەو مافەی لیٚ ی داگیرکراوە بە پشـتیوانی خـواو ئەگەر خوا مەیلی لیٚ بیٚ بۆی دەگێڕمەوە، وە بەهێزتان لەلام بـیٚ هێـزو لاوازە تـا ئەو مافەی کە لە خەڵکی داگیرکردوە وەری دەگرمەوە لیٚ ی — ئەگەر خوا بیەوێت.

بەڵیٚ ئەم ووتە زێڕینانەی حەزرەتی أبوبکر گەورەترین وانەیە کـە جێگـای خۆیـەتی هـەموو لێپرسـراوێك لەسـەر مێزەکـەی و لـە پشـت سـەریەوە هـەڵی بواسـێت و بیسەلمێنیٚ کە لە بەرامبەر یاسادا هیچ کـەس بـەهێزو دەسـەڵاتدار نـی یـەو هـیچ کەسیش بیٚ کەس و پشتیوان نی یەو کیٚ خاوەن حەق بیٚ ئەوە بەهێزە وە فەرموشی (إن شاء الله) واتە: ئەمە هەمووی بە مەرێك منی سەرکردە بۆم جیٚ بەجیٚ دەکـریٚ ، ئەگەر خوا پشت و پەنام بیٚ چـونکە بێگومـان خواویسـتی لەسـەر سـەرکەوتنی حەقە بەسەر ناحەقدا.

**دووەم:** کار بەدەست دەبیٚ دڵسۆز بیٚ بـۆ گـەل و میللەتەکـەی. پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((مامِنْ أمير يَلي أُمُورَ المُسلِمين ثُمَّ لايجهدُ لَهُم وَيَنْصَــحُ إلا لَمْ يَدْخُلْ مَعَهُمْ الجَنَّةَ)) رواهُ مُسْلِم.

واته: هەر ڕابەرو سەرکردەیەك ئیش وکاری موسڵمانانی کەوتە ژێـر دەسـت و بـوو بەسەر پەرشتیان، پاشان کە چوە سەر کورسی وفەرمان ڕەوایی و کورسی کـولێرەی مسۆگەر کرد. بۆ ئەو خەڵکە تێ نەکۆشاو خەمی لێ نـەدەخواردن ودڵسـۆز نـەبوو بۆیـان و تـەنها لـەبیری موچـەو ژیـانی خـۆی دابـوو، ئـەوە لەگـەڵ ئـەو خەڵکـە موسڵمانەدا ناچێتە بەهەشتەوە!..

**ئیمانداران:** هەندێ کەس واحاڵین کـە ئەگـەر دەسـەڵات بـە دەسـت کاربەدەسـتی موسڵمانەوە بێ حوکم بە شەریعەتی ئیسلام بکرێ، ئەوە لەو کاتەدا کاربەدەسـت و فەرمانڕەوای موسڵمانان هەر ئاگای لە موسڵمانان دەبێ و حـەقی بەسـەر کـافرەوە نیەو خواخوایەتی لەناو بچن، بەڵام نەخێر ئیسلام وانی یـە، مـادام هـاوڵاتی ئـەو حکومەتەیە جیاوازی ناکرێ، با هاودینی موسڵمانانیش نەبێ ، خۆ هاوژینیانە.

بە دەربڕینی ئەم سەردەمە، مافی هاوڵاتی بونی بۆ هەیە ئەمەش هەر قسـەی دەم و نوسینی ناو کتێب نی یە، بەڵکو ئیسلام بەکردەوە سەلماندویەتی.

**بۆ نموونە:** لە خەلافەتی عومـەری کـوڕی عبـدالعزیزدا لـە جـەزیرەی میصـرەوە، نامەیەك لە ئافرەتێکی قیبطي میصریەوە ، کە پیرەژنێکی بێ کەس و کـار و خـزم بوە، ناوی ( فرتونة السوداء) نامەیەك بەکەسێکی خوێندەوار دەنوسێ و بە بەریدا دەینێرێ بۆ خەلیفەی دادپەروەر حەزرەتی عومەری کوڕی عبـدالعزیز، نامـەی ئـەم ئافرەتە باس لە کێشـەیەکی دەکـات، کـە ئـەویش ئەوەیـە: دیـواری حەوشـەکەی ڕووخاوەو مریشکەکانی لەژێر مەترسی دزو دڕندەکاندان و ئەمیش نـەخۆی توانـای چاککردنەوەی هەیە نەپارەشی هەیە کەسێك بە کرێ بگرێ بـۆ چـاکردنەوەی بۆیـە داوا لە خەلیفەی موسڵمانان دەکات، کە هەرچەندە ئەم موسڵمان نیە، بـەڵام وەکـو هاوڵاتی، کە دیواری حەوشەکەی بۆ چاك بکرێتەوە!!

کاتێك نامەکە بە بەریدا گەیشتە دەست حـەزرەتی عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز، نامەکەی پشت گوێ نەخست، وە ئەوانەی کە نامەکانیان دێنایە بەردەست خەلیفـە نەیانتوانی نامەکە فڕێ بدەن و نیشانی خەلیفەی نەدەن، چـونکە وافێـر نـەکرابون، یەکسەر خەلیفە عومەر بەهەمان بەریدا نامەی بۆ والـی میصـر(ئـەیوبی کـوڕی

شەرحەبیل) نوسی و داوای ئەم پیرەژنە بێ کەسە قیبگی یەی خستە بەرچاوو فەرموی: هەرکات ئەم نوسراوەی منت پێ گەیشت ، بەپەلە بگەرە ماڵی ئەو ئافرەتە و بە دەستی خۆت دیوارەکەی بۆ چاك بکەرەوە، نەك بیسپێری بە کەسێکی ترو ئەویش پشت گوێ ی بخات

نەك هەرئەوەندە بەڵکو خەلیفە عومەری کوڕی عبدالعزیز بەهەمان بەریدا نامەشی نوسی بۆ (فرتونة السوداء) فەرموی: نامەکەتم بە دەست گەیشت و بەم نزیکانە والی – پارێزگاری – شار (أیوب) دێت بۆ ماڵت و دیوارەکەت بۆ چاك دەکاتەوەو کەس ناتوانێ مریشکەکانت بدزێ، یان دڕندە بیانخوات (إن شاء الله).

بەڵێ کاتێ نامەی خەلیفە گەیشتە دەستی (ئەیوبی کوڕی شەرحەبیل) کۆڵان بە کۆڵانی شار گەڕا تا دۆزیوە، سەیر دەکات پیرەژنێکی بێ کەسی داماوە، ئیتر والی بە دەستی خۆی و هاوکاری سەربازەکانی دیوارەکەی بۆ چاك کردەوەو داواکاریەکانی بۆ جێ بەجێ کرد.

ئای چەند خۆش بوو کاربەدەستانی ئەمڕۆش بەریدێکی ئاوایان هەبێ، نەك وەکو بەریدی سەرجادەکان کە دواتر فڕێ دەدرێن، چەند جوان و جێگای دڵخۆشی بوو کە سەرۆك وەزیر و وەزیرەکان ڕەقەم تەلەفۆن و مۆبایلەکانیان بە ئاشکرا بەخەڵکی بگوتایە بۆ ئەوەی لەهەر دائیرەیەکاو لە هەر جێگایەکدا هاوڵاتی مافی دەخورێ یان بێ یاسایی دەکرێ، خێرا دەزگای پەیوەندیدار ئاگادار بکاو ئەویش کەسی تایبەتی هەبێ و ئەو کەسە بدۆزێتەوەو ئەگەر وانەبوو سزای بدات، ئەگەر واشبوو دەست خۆشی لێ بکات، جا بزانە گەندەڵی لە وڵاتدا دەمێنێ.

**سێ یەم:** کاربەدەست نابێ غەش لە میللەتەکەی بکات. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: ((**ما مِنْ عَبْدٍ يَسْتَرْعِيهِ اللهُ رَعِيَّةً، يَمُوتُ يَوْمَ يَمُوتُ، وَهُوَ غاشٍ لِرعِيَّتِهِ إلا حَرَّمَ اللهُ عَلَيهِ الجَنَّةَ**)) رَواهُ مُسْلِم.

واتە: هەر بەندەیەك، خوای گەورە کردی بە سەرپەرشتیاری گەل و نەتەوەیەك، جا کاتێ وەختی مردنی هات ومرد

ئەگەر غەشی لە میللەتەکەی و کەسانی ژێر دەستی کردبێ ، ئەوە خوای گەورە بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات:

**جا غەش کردن جۆری هەیە:**

١- وەعدو بەڵێنی بە هاوڵاتی دەدات و تەنها هەر دڵخۆشی دەکات و بۆی جێ بەجێ ناکات و هەر بەڕێ ی دەکات. ئەوە غەشە.

٢- هەرکارێك بەخۆت ناکرێ، بەڵام دەتوانی هەوڵی بۆ بدەی و لەسەرو خۆتەوە ئەو سوودە بە میللەتکەت بگەیەنی نایکەی، ئەوە غەشە.

٣- بێ شەرعیەك لە سنوری دەسەڵاتی تۆدا دەکرێ ئەی کاربەدەست، بەو بێ شەرعیە خەڵکی پێ ی توشی بەڵای دونیاو قیامەت دەبن، تۆی کاربەدەستیش مەنعی ناکەی ئەوە غەشە لە ڕۆڵەی ئەو میللەتەی دەکەی.

٤- ماڵ و سامانی حکومەتت لەبەر دەستدایە، کە لە ڕاستی دا ئەوە ماڵی میللەتە. تۆی کاربەدەستیش بۆ بەرژەوەندی شەخصی خۆت بەکاری دێنی ئەوە غەشە.

**لە خەلافەتی عومەری کوڕی خطاب دا**. پاسەوانی (بیت المال) کە ناوی (معیقیب) بوو، (بیت المال) ی دەماڵی و خاوێن دەکردەوە، دیرهەمێکی لەناو خۆڵەکەدا دۆزیەوەو هەڵی گرتەوەو پاکی کردەوە. لەو کاتەدا منالێکی بچکۆلەی حەزرەتی عومەر لەوێ بوو. دیرهەمەکە — کە نرخی زۆر کەم بوە — دای بەدەستی منالەکە، منالەکەش ڕۆیشتەوە بۆ مالەوە و کە لێیان پرسی ئەو دیرهەمەت لە کوێ بوو. ووتی: ئەو پیاوە دایە دەستم. خەلیفە عومەر زانی ئەوە پاسەوان و پاککەرەوەی

(بيت المال) بوه، بۆيه بانگی كردوو فەرمووی: ئەریٚ چ خراپەو دوژمنايەتيەكم لەگەڵ تۆ هەيە؟! ووتی: قوربان هيچ، بەڵام بۆچی بوه؟! عومەر ديرهەمەكەی لە دەست منالەكەی وەرگرتەوەو فەرمووی: بيخەرەوە( بيت المال)ەوە، **ئەمجا فەرمووی:** (أَرَدْتُ أَنْ تُخاصِمَنِي أُمَّة مُحَمَّدٍ (ﷺ) في هذا الدِّرْهَمِ يَوْمَ القيامَــةِ). ئايا دەتەویٚ كە بمكەی بە دوژمنی ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە بەرامبەر ئەم ديرهەمەدا لە ڕۆژی قيامەتدا. پاشان ديرهەمەكەی لەدەستی منالەكەی وەرگرتەوەو خستيەوە صندوقی (بيت المال)ەوە

بەڵام ئەم دەست پاكيە زەرورە لە كار بەدەستانی سەرەوە پیٚ بكات، شەقيقی بەلْخی بە هارونە ڕەشيد گوت: (إنَّكَ عَيْنٌ وَعُمّالُكَ الأنهارُ فَأنْ صَفَتِ العَيْنُ، صَفَتِ الأنْهارِ، وإنْ تَكَدَّرَتِ العَيْنُ تَكَدَّرَتِ الأنهارُ).

واتە: ئەی هارون تۆكانی و سەرچاوەی ئاوی و كاربەدەستەكانت جۆگەو ڕووبارن، جا ئەگەر ڕوبارەكە ڕوون بوو، ئەوا ئاوی جۆگەكانيش ڕوون دەبیٚ، خۆ ئەگەر ئاوی ڕووبارەكە ليٚلْ بیٚ ئەوا جۆگەو ڕوبارەكانی كەلیٚ ی بونەتەوە ليٚلْ دەبن...

زانای پايەبەرزی ئيسلام ئيمامی غەزالی دەفەرمویٚ: (وَبالجُمْلَةِ ، إنَّمـا فَسَدَتِ الرَّعِيَّةُ بِفَسادِ الُملوُكِ ، وَفَسادِ الُملوُكِ بِفَسادِ العُلَماءِ).

واتە: بە شێوەيەكی گشتی خراپەكاری ڕەعيەت و ميللەت بە خراپەی كاربەدەستانەوەيە. خراپەی كاربەدەستانيش بە خراپەی زانايانەوەيە – كە ئامۆژگاری كاربەدەستان ناكەن و هەڵەو كەم و كوڕيەكانيان ناخەنە بەرچاور.

جا ئێمەی مامۆستايانی ئايينی بۆيە ئەمانە باس دەكەين و دەيكەين بە بەرچاو ڕوونی بۆ كاربەدەستان و ميللەتمان، تا نەبين بە شەريكی تاوان و كەم و كوڕی كاربەدەستان.

**چوارەم:** دەبێ کاربەدەست سنگی والآبێ کە میللەت بتوانێ موحاسبەی بکات. حەزرەتی أبوبکری صدیق. کە بوو بە خەلیفە لە یەکەم ووتاری دا فەرموی: ئەی خەڵکینە (إنِّي قَدْ وَلِيْتُ عَلَيكُمْ، وَلَسْتُ بِخَيْـرِكُم) مـن بـوم بـە کاربەدەست و فەرمانڕەوایی ئێوە، بەڵام لە ئێوە چاکتر نیم (فَأنْ أَحْسَنْتُ فَأَعْينونِي) ئەگەر چاکەم کرد یارمەتیم بدەن و پشتم بگـرن، (وإنْ أَسأْتُ فَقَوِّمُونِي) ئەگـەر خراپەکـەم کـردو لەرێ ی شەرع لامدا ئەوا ڕاستم بکەنەوە — نەك هەر ئەوەندەی پـێم بڵـێن خراپـت کرد، بـەڵکو ڕاستیشـم بکەنـەوە. چـونکە زۆرجـار کاربەدەسـت ڕێگـا دەدات بـە ڕاگەیاندنّ و ڕای گشتی کەڕەخنەی لێ بگرن و باسی کەم و کوڕیەکانی بکەن، بەلام ڕێگە بەوە نادات کـە ڕاسـتی بکەنـەوە هـەنگاو و هەڵوێسـتی پـێ بگـۆڕن !!

(أَطيعوُنِي ماأطَعْت اللّهَ وَرَسُولَهُ) گوێڕایەڵیم بکەن هەتا ئەو کاتەی گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خـوام (ﷺ) (فَإذا عَصَيتُ اللّهَ وَرَسُولَهُ فَلا طَاعَةَ لِي عَلَيكُمْ). وە هـەر کاتێ سەرپێچی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەری خوام کرد، ئەوا گوێڕایەڵیم لەسـەر ئێوە پێویست نیە.

بەڵێ ئەبێ کاربەدەست ئاوا سینەی خۆی بـۆ جـەماوەر بکاتـەوە و فێـری ئـەوەیان بکات کە نابێ میللەت گوێڕایەڵی کوێرانە بکات و هەر چەپڵە لێ بدات و عـەقڵی خۆی زەڕبی سفر بکات، هەموو لە یادمانە کـە دیکتـاتۆری لـە ناوچـوی عێـراق، (صدام حسین) ئەو خەڵکەی وا فێرکردبوو کە یـەکێ لـە دروشمـە هـەرە دیـارو زۆر دووبارەکان ئەود بوو کە دەیانگوت: إذا قَالَ صدام ، قَالَ العِراق.

واتە: عەقڵی ئەو هەموو ملیۆنان خەڵکەی وڵاتی عێراق بریتی یە لە قسەو بڕیـاری صەدام، ئیتر پابەندبوون بە یاسا و دەستوور و چاکەو خراپەوە گرنگ نیە.

گرنگ ئەوەیە جەنابی سەرۆك بەدڵی بێ، کە هەمومان سەرەنجامە ڕەش وشومەکەی ئەو گوێڕایەڵیە کوێرانەمان بینی، کە چۆن سەری سەرۆك وسەربازی کرد بە قوڕدا.

**هەروەها حەزرەتی عومەری کوڕی خطاب**، کاتێ بوو بە خەلیفە فەرموی: ئەی خەڵکینە: (ماذا تَقُولُونَ لَوْ ملتُ بِرأْسِي إلى الدُّنيا هَكَذا ؟! – وَأَمالَ بِرأْسِهِ) چی دەڵێن کاتێك ملم لارکردەوە بەلای دنیادا ئا بەو شێوەیە – ئاماژەی دا بەسەری و لاری کردەوە؟! پیاوێك هەستاو ووتی: (كُنَّا نَقُولُ بالسَّيْفِ هَكَذا – وَأَشَارَ إلى نَقَطْعِ) ئێمەش بە شمشێر ئاوا دەڵێین (ئاماژەی کرد بەوەی کەسەرت دەپەڕێنین)، حەزرەتی عومەری فەرموی: (إيايَّ تَعْنِي بِقَولِكَ؟) مەبەستت لەمنە بەو قسەیەت کە دەڵێ ی ملی دەپەڕێنین؟! کابرا ووتی: (نَعَمْ إِيَّاكَ أَعْنِي بِقَولِي).بەڵێ مەبەستم لە تۆیە بەم قسەیەم.

حەزرەتی عومەر فەرموی: (الحُمْدُ لله الَّذي جَعَلَ في رَّعيَّتِي مَنْ يُقَوِّمُني إذا عْوَجَجْتُ) سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە کە لەناو میللەت و هاولاتیانم دا، کەسێکی وا ئازاو حەق ویستی دروست کردوە، کەکاتێ منی خەلیفە لاربوم و ڕێگای ڕاست لام دا ڕاستم دەکاتەوە.

نەیفەرموو ئادەی بیگرن و لەناوی بەرن. بیکوژن، بیگرن چۆن توانیت ئاوا بەرامبەر بە خەلیفەی موسڵمانان قسە بکەیت؟ نەخێر ، بەڵکو سوپاسی خوای کرد کە کەسی ئاوا لەناو گەل و هاولاتیاندا دروست بوەو خەلیفە ڕاست دەکاتەوە.

**جا بەڕێزان:** لەسەردەمی ئەمڕۆدا ڕاست کردنەوەی سەرکردەو کاربەدەست مەرج نیە تەنها هەر بە شمشێر بێت، بەڵکو:

١- لەڕێگەی پەرلەمانەوە، ئەندام پەرلەمان کە نوێنەری خەڵکە، دەنگی نارەزایی لە هۆڵی پەرلەماندا بەرزبکاتەوە، کاتێ بەرپرسی جێ بەجێ کردن و وەزارەتی حکومەت کەم تەرخەم بوو لە خزمەت کردن بە میللەت دا.

٢- مامۆستای ئایینی لە وتاری ڕۆژانی هەینی دا، بە شێوازێکی حەکیمانە و زمان شیرنانە. بە مەبەستی چاککردن و ڕەخنە لێگرتنی بنیات نەرانە، کاربەدەستان ئاگادار بکاتەوە لە کەم وکوڕی و کەمتەرخەمییەکانیان کە بەرامبەر میللەت هەیانە.

٣- ڕۆژنامە نووس و ڕاگەیاندن. کەم وکوڕیەکان بە بەدواچون و ڕیپۆرتاژ بخەنە بەرچاو، بە مەبەستی چارەسەر کردن.

٤- پیاو ماقولان و ڕیش سپیان بە شێوەیەکی هێمنانە، سەردانی دام و دەزگاکانی حکومەت بکەن و خراپەو کەمو کوڕیەکانیان بخەنە بەر چاوو، کاتیان بۆ دابنێن بۆ خۆ چاککردن.

کاربەدەستانیش دەبێ بە سنگی فراوانەوە ڕەخنەی جەماوەر قبول بکەن، وەنەك هەر پێیان ناخۆش نەبێ، بەڵکو زۆریش سوپاسیان بکەن، چونکە پێشنانمان جوانیان فەرموە: (دۆست ئەو کەسەیە دەمگریەنێ ، نەك ئەوەیە پێم پێ دەکەنێ).

وە لە هەموو حاڵەکاندا دەبێ ئاگاداری ئەوەبین کە خراپ چاك بکەین، نەك بارودۆخی خراپ، خراپتر بکرێ، وە هەنگاوو هەڵوێستی عاطیفی نەنرێ.

﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾

ٱللَّهُمَّ ءَامِين

# سەرچاوەکان

١- قورئانی پیرۆز.
٢- الأخلاق السياسية ، محمد زكريا النداف ، ص١٢٠ ، ص٣٦٦ ، ص١٣٤
٣- موسوعة الحقوق الأسلامية ، سعد يوسف ، ص٧٣٩ ، ص٧٥٩ ، ص٧٧٣ ، ص٧٩٨
٤- درود، فاتح محمد سميع ، بەرگی یەکەم ، ل١٥٧
٥- أبوبكر الصديق ، د. علي محمد الصلابي ، ص١٥٣
٦- تبصرة الأنام بالحقوق في الأسلام ، صالح طه عبدالواحد ، ص٣١٥
٧- لە خزمەت قورئاندا – ئەندازیار: عثمان محمد رشيد ، ل٢٤

# ووتـاری چوارەم

# بۆ مانگی موحەڕەم

# مافی هاووڵاتی لەسەر کاربەدەست

# (بەشی دووەم)

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجمعين.

**ئیماندران:** له وتاری ڕابردوودا باسی ئەوەمان کرد کە حکومەت لە دوو باڵ پێك دێت کاربەدەست لەگەڵ میللەت. وە هەریەکێك لەو دوو باڵە ماف و ئەرکی خۆی هەیە، کە بەپیشتیوانی خوا لەم ووتارەدا بۆ تەواوکردنی باسەکەی وتاری رابردوو باسی هەندێکی تر لە مافەکانی میللەت لەسەر کاربەدەستان دەکەین.

**١- أَنْ يَحْكُمَ بالعَدْلِ وَالحَقِّ وَلايَظْلِمَهُمْ:** کاربەدەست پێویستە لەسەری کە بەدادگەری حکوم بکات لە نێوان هاولاتیانداو پشتیوانی حەق و ڕاستی بکات و ستەم نەکات لە هیچ کەسێك. جا ئەم دادگەریەی کاربەدەست و فەرمانڕەوا چەند بوارێك دەگرێتەوە، وەکو:

**-أ- العَدَالة التَوْزِيعيَّة:** دادگەری و عەدالەت لە دابەش کردنی ماڵ و سامانی دەوڵەتدا چونکە کاربەدەست خاوەنی موڵك و سامانی دەوڵەت نیە، بەڵکو تەنها چاودێرو سەرپەرشتیارە بەسەریەوەو لە مەترسی و فەوتان دەیپارێزێت.

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبی طالب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێت: (مَرَّتْ إِبِلُ الصَدَّقَةِ عَلى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَأهْوى بِيَدِهِ إلى وَبَرَةٍ مِنْ جَنْبِ البَعْيرِ، فَقَالْ: ما أَنا بِأَحَقَّ بَهذِهِ الوَبْرَةِ مِنْ رَجُلٍ مِنَ الُمسْلِمينَ) مُسْنَدْ الإمام أَحْمَد.

واتە: ڕۆژێکیان – کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەناو هاوەڵانی دابوو، ووشترێکی زەکات بەلای پێغەمبەری خوادا (ﷺ) تێپەڕی – کە لە بیت المال – خەزێنەی دەوڵەتی ئیسلامی دا بوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی برد بۆ قشپلەێك کە بە تەنیشتی ووشترەکەوە نوسابوو – لە کاتی پاڵ کەوتنیدا - پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی برد بۆ پشقلەکەو فەرموی: من شایانترو لە پێشترم نیم بەم قشپلەێك – کە هیچ بەهایەکی نیەو هیچی پێ ناکرێ بەتەنها – لە هیچ کەس لە موسڵمانان!!

بەم ووتە زێڕینەی ئەوەی لە موسڵمانان گەیاند کە هەرچەندە من پێغەمبەری خوام وە سەرکردەی یەکەمی دەوڵەتم، وە گەورەترین قوربانی و ماندوبونم داوە لە پێناوی

ئەم دەسەلاتەی کە ئێستا هەیەبەلام لە ئاستی مالی موسلمانان و خەزێنەی دەولەتدا هیچ لە پێشتری – إمتیاز – ێکم نیە بەسەر موسلمانانەوەو هەروەکو هاولاتیەك بەشم بە مالی دەولەتەوە هەیە.
بەلێ کاربەدەستی دلسۆز بەمیللەت و ڕاستگۆ لەگەلْ گەلدا. هەرگیز ڕێگا بەخۆی نادات کە لە مالی گشتی دەولەت مالْ و منالی ، یان کەس و کارو دۆست و لایەنگرانی تێر بکات و لەسەر حیسابی مولکی دەولەت دەولەمەندیان بکات و خزمایەتیان بکات.
**بەلێ ئیماندران:** پێغەمبەری دلسۆز (ﷺ) کاتێ کە خوای گەورە سەری خست بەسەر گەلە کۆمەکی (الأحزاب) دا و جولەکەی بەنو نەزیر و بەنو قورەیزەی لە مەدینە دوور خستەوە، وە مالْ سامانێکی زۆر هاتە ناو خەزێنەی دەولەتەوە لەم کاتەدا، خێزانە بەرێزەکانی – وەکو هەر ئافرەتێك کە حەزی بە کەل و پەلی ناو مالْ و ژیانی تێرو تەسەلە – چونە خزمەت پێغەمبەری خواو (ﷺ) لە دەوری دانیشتن و ئەوەی لە دلیاندا بوو بە زمان دەریان بڕی و عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو ڕۆژانە دەبیستین کە کچ و خێزانەکانی کیسراو قەیصەر چۆن هەموو لاشەیان سەراپا بە ئالتون و خشلْ و موجەوهەرات داپۆشراوە، بەلام ئەوەش حالی ئێمەیە کە خۆت لە گەلمان ئەژی و ئەیبینی کە لە چ هەژاری و نەداری و نەبونیەك دا ژیان بەسەر دەبەین.
بەلکو لەمەودوا ئێمەش وەکو مالْ و خێزانی سەرکردەکانی دنیا پاروی چەورو گەرم و جێگای نەرم بەشمان بێت و لەم ژیانە کولەمەرگیە ڕزگارمان بێت!
پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کاتێکا کە خزمەت کردنی مالْ و منالْ و خێزانی بە باشترین شێوە و بەپێ ی توانا بەوەداناوە کە لە پێناوی خوادا بیبەخشی. بەلکو ئەوەی بۆ مالْ و منالی خۆتی صەرف دەکەیت لە هەموو خێرو خێراتێك پاداشتی

زیاتره لای خوای گەوره — بەڵام چونکه ئەو ماڵ و سامانەی که له بەردستیابوو، موڵکی تایبەتی خۆی نەبوو ، بەڵکو موڵکی گشتی و دەوڵەت بوو — بەم داواکاریەیی خێزانه بەڕێزەکانی زۆر دڵتەنگ بوو. وه دڵی موبارەك و ناسکی ئازاری پێگەیشت. تا ئەوەبوو ماوەیەك ئەو خۆشییەی جاران لەناو ماڵی پێغەمبەردا هەبوو. نەماو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دڵتەنگی پێوه دیاربوو. هەتاوەکو خوای گەوره ئەم ئایەتانەی نارده خوارەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلۡمُحۡسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴾ الأحزاب: ٢٨ ـ ٢٩

بەڵێ پێغەمبەری خوا لەژێر ڕۆشنایی ئـەم ڕێنماییـەی خـوای پەروەردگارداخێزانـه بەڕێزەکانی کۆکردەوەو دوو ڕێگای خستنه بەردەم: ئەگەر تەنها بیر له خۆشـی ئـەم دونیا کاتی و کۆتایی پێ هاتوه دەکەنەوەو ڕازاوەیی دونیایان دەوێت، ئەوه بـه پـێ ی تواناو لەوەی لەبەر دەستیایەتی له ماڵی خۆی — نەك ماڵی گشتی و دەوڵەت — له شت و مەك و پارەو سامان پێیان دەبەخشێ و لەوەو دواش به جـوانترین شـێوەو بەو پەڕی حورمەتەوە. دەستبەرداریان دەبێ و له یەکتری جیادەبنەوه وەکـو ژیـانی هاوسـەری، سـبحان الله سـەرنجی (وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ) بـدەن. کـه ئـەم ئایەتـه گەورەترین بەڵگەو باشـترین سـەلمێنەره کـه ئیسـلام هـەرگیزاو هـەرگیز لەبـەرەی (توندوتیژی بەرامبەر ژن) دا نەبووه.

ئەوەتا ژنێك به ژیانی هاوسەری گـەورەترین مرۆڤی سـەرزەوی، بـەڵکو سـەرداری هەموو پێغەمبەران ڕازی نەبێ، لەبەر ئەوەی له بواری ئابوری و داراییـدا هـەژارەو دەست کورته، بەڵام هەرچی جوانی و پاکی و ڕەوشت بەرزی و ڕێزه بەرامبـەر ئـەو

خێزانەی هەیەتی ، کەچی واش یەك ووشەی ناشرین و نابەجێ یان پێ نالێ ج جای لێدان و دارکاری و کوشتن !! — بەڵکو بە (سَرَاحًا جَمِيلًا ) جیابوونەوەیەك ك ە ئەوپەڕی جوانی و ڕێزو قەدری بۆ ئەو ژنە تێدایە گرێ ی هاوسەریەتی دەکاتەوە. بەڵێ ئیسلام هەمووی (جمیل) هەموی جوانیە. هەموی نەرم و نیانیە لەو شوێنانەشدا کە مرۆڤەکان تێ ی دا توڕەو پەستن و حەز بە ئازاردانی بەرامبەریان دەکەن!! یان ڕێگەی دووەم: هەڵبژاردنی خواو پێغەمبەری خواو پاداشتی ڕۆژی قیامەت ن کەئەگەر ئەمەیان هەڵبژێرین — ئەوا لای خوا پاداشتی گەلێ گەورە بێ ئەندازەیان بۆ دیاری دەکرێ ، ئیتر پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەك یەك خێزانەکانی بانگ کردو لە خاتوو عائیشەوە دەستی پێ کرد هەروەکو لە صحیحی (مسلم) دا هاتووە کە فەرمووی: ئەی عائیشە من شتێکت بۆ باس دەکەم حەزناکەم پەلە بکەی تێ ی دا ، هەتا باش بیری لێ دەکەیتەوە و پاشان پرس و ڕاوێژ بە دایك وباوکت دەکەی، خاتوو عائیشە فەرمووی چی یە؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایەتەکەی بە سەردا خوێندەوە کە باسی هەڵبژاردنی یەکێ لەم دوو ڕێگایە دەکات کە باسمان کرد.

(سُبحانَ الله) ئیسلام چەند بڕوای بە ئازادی تاکە کەس هەیە، ئەوەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم هەڵبژاردنە دەخاتە بەردەم خێزانەکانی لە کاتێکدا خۆی پێغەمبەرەو خێزانەکانی ئیماندارن و یەقینیان هەیە کە ئەوەی خواو پێغەمبەر بڕیاری بدەن هەرئەوە چاکە و ئەوی تری زیانمەندی یە.

بەڵام ئەمە ناکاتە واجب لە سەریان و نا فەرموێ دەبێ من چۆنم بوێ بۆ ژیان و ژیان بەسەر بردن ئێوەش وابکەن و وەکو من بن، بەڵکو خوای گەورە ڕێگای هەڵبژاردنی ئازادیان دەخاتە بەردەم و پێغەمبەری خواش (ﷺ) بەو پەڕی ڕوخۆشی و زمان شیرینیەوە پێیان ڕادەگەیەنێ و داوایان لێ دەکات بە وردی بیر بکەنەوەو ڕاوێژ بکەن بە دایك وباوکیان. ئالێرەدا عائیشە فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا

(ﷺ) ئایا له هەڵبژاردنی تۆدا پرس به دایك و باوكم بكەم، نەخێر، بەڵكو هەر ئێستا بڕیار دەدەم و خواو پێغەمبەرەكەی هەڵدەبژێرم. وه هەموو خێزانەكانی تریشی هەمان هەڵوێستی مەردانە و ژیرانەیان نواند – ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لەسەربێ و كۆتایی بەم كێشەیەی ناو ماڵی پێغەمبەری خوا هات و یەك دیرهەم له ماڵی گشتی دەوڵەت بۆ ماڵ و خێزانی پێغەمبەری خوا صەرف نەكرا.

**بەڕێزان:** سوێند به خوا ئەگەر ئەمە له قورئاندا تۆمار نەكرایە، ڕەنگە بڕوامان نەكردایە كه ئاوا كەسێكی ناودار و خاوەن كەسایەتی بێ وێنەو خاوەن شەرم و شكۆ – كەمەسەلەی تەلاق دانی خێزان – چەند كاریگەری سلبی لەسەری دەبێ – كەچی ژیانی هاوسەری و ژیان لەگەڵ ئەو خێزانە بەڕێزانەی خۆیدا – كە هەریەكەیان نموونەی پاكی و بەرێزی و هەوڵ و قوربانی دانن بۆ ئیسلام، به قوربانی بەرژەوەندی میللەت و پاراستنی سامانی گەل بكات و بەكردەوە بیچەسپێنێ كە هیچ كەس بۆی نی یە ماڵی دەوڵەت بۆ بەرژەوەندی ماڵ و خێزانی بەكار بهێنێت، من له ئێوه دەپرسم! ئایا مێژووی مرۆڤایەتی هەڵوێستی ئاوا جوامێرانەی بە خۆیەوه بینیوه كه سەركردەی یەكەمی وولات ئیختیاری جیابونەوه (طلاق) یان ڕازی بوون به كەمی بژێوی ژیان بخاته بەردەم هاوسەرەكانی، بۆ ئەوەی دادگەری له بواری دابەش كردنی سامانی میللەتدا بچەسپێ و ماڵی میللەت بۆ بەرژەوەنی تایبەتی سەركردە بەكارنەهێنرێ؟!

**ئیمانداران:** لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوەش بكەین، كه لێپرساو و كاربەدەست له دەوڵەتی ئیسلامی دا ژیانی بۆ دابین دەكرێ بۆ ئەوەی ژیانێكی پوخت و دوور له ئیسراف و زیادەڕەوی وه دوور له هەژاری ڕادەبەدەر بەسەر بەرێت.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((مَنْ كانَ لَنا عامِلاً فَلْيَكْتَسبْ زَوْجَةً ، فَأنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ خادِمٌ ، فَلْيَكْتَسبْ خادِماً ، وإن لَمْ يَكُنْ لَهُ مَسْكَنٌ فَلْيَكْتَسبْ مَسْكَناً مَنْ اتَّخَذَ غَيْرَ ذالِكَ فَهُوَ غالٍ أَو سارِقٍ)) سُنَنُ أَبِي داوُد.

واتە: هەرکەسێ فەرمانبەری ئێمەبێ و کار بەدەستی دەوڵەت بێ، پێویستە ژنی هەبێ، ئەگەر خزمەتکاری نەبوو، با خزمەت کاریشی هەبێ وحکومەت موچەکەی بۆ دەدات، وە ئەگەر خانوی نیشتەجێ بوونی نەبوو پێویستە حکومەت خانوشی بۆ دابین بکات، بۆ ئەوەی بە مێشکی ئاسودەوە کاری هاووڵاتیان جێ بەجێ بکات و دڵی لای بێ خانویی و بێ خێزانی نەبێت، جا ئەگەر کار بەدەستێك ئەمانەی بۆ کرا، پاشان لەسەرو ئەمانەوە ماڵی حکومەتی بەکارهێنا بۆ ژیانی خۆی ئەوە ماڵی گشتی دەوڵەتی پاشقول داوە یان ئەو کەسە دزە!.

بە ڕاستی ئەگەر ئەم فەرمودەیە بکرێتە یاسای لێپرسینەوە بۆ کاربەدەستان، ئیتر گەندەڵی کۆتایی دێت و دەیان کۆڕو کۆبۆنەوە و دەزگای لێپرسینەوەی کاربەدەستی دزو خیانەتکاری پێویست نی یە!.

بەڵێ بە ڕاستی عەدالەت و دادگەری پێش ئەوەی سودی بۆ میللەت هەبێ سودی بۆ کار بەدەست هەیە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمویێت: ((إنَّ أَحَبَّ النَّاسِ إلى اللهِ يَوْمَ القيامَةِ وَأَدْناهُمْ مِنْهُ مَجْلِساً ، إمامٌ عادِلٌ ، وَأَبْغَضُ النَّاسِ إلى اللهِ وَأَبْعَدَهُمْ مِنْهُ مَجْلِساً إمامٌ جائِرٌ)) سُنَن الترمذي. واتە: بە ڕاستی خۆشەویسترین خەڵك لە ڕۆژی قیامەتدا لەلای خوای گەورە، وە نزکترین شوێن لە خوای گەورەوە لە قیامەتدا بۆ کاربەدەست و پێشەوای دادگەرە، وە بۆ غزاوترین کەس لەلای خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا و دورترین کەس لە خوای گەورە وە لە قیامەتدا پێشەواو سەرکردە و کاربەدەستی زاڵم و ستەم کارە.

وە فەرمویەتی(ﷺ): حەوت تاقم و دەستە لە ڕۆژی قیامەتدا لە ژێر سێبەری عەرشی خوای گەورە نەبێ، لەو ڕۆژەدا کە هیچ سایەو سێبەرێك نیە، تەنها سایەو سێبەری عەرشی خوای گەورە نەبێ، یەکەم کەس لەو حەوت تاقمە (إمامٌ عـادِلٌ) پێشەواو سەرکردەی دادگەرە.وە فەرمویەتی: سێ کەس دوعایان ڕەت ناکرێتەوە و خوای گەورە لێیان وەردەگرێت یەکێ لەوانە: (إمامٌ عادِلٌ) پێشەوای دادگەرە.

ئـای چ ڕێـزو قەدرێکـە کـە خـوای گـەورە بـە پێشـەواو کاربەدەسـتی دادگـەری بەخشـیوە.بـۆ دونیـاش حـوکم و دەسـەڵات و فەرمانڕەوایـەتی کاربەدەسـت و فەرمانڕەوای دادگـەر درێـژەی دەبـێ و کورسـی دەسـەڵاتی لـە ژێـر دەرناچـێت و ناکەوێتە ژێر پێی میللەتەوە.

**طرطوشي لـە سـراج الملـوك** (ج١، ص٢٢٢)**دا دەڵـێ:** ئـەو کاربەدەسـت و فەرمانڕەوایەی کە هەرچەندە کافریش بێ بەڵام پارێزگاری لە سیاسـەتی چاکسـازی وڵات بکات ئەوا دەسەڵاتەکەی ماوە دارترو بـەهێزتر دەبـێ لـەو کـار بەدەسـت و فەرمانڕەوایەی کە هەرچەند ئیمانـداریش بـێ و دادگـەربێ لەگـەڵ خۆیـدا، بـەڵام سیاسەتی چاکسازی و بەڕێوە بردنی وڵاتی نەبێ.

**وە پێشەوا (إبن تيميه)ش دەفەرموێ:** ووتـراوە: (إنَّ اللّهَ يُقيمُ الدَّوْلَةَ العادِلَـةَ وإنْ كانَتْ كافِرةً، وَلايُقيمُ الظالِمَةَ وَإنْ كانَتْ مُسْلِمَةً).

واتە: بـە ڕاسـتی خـوای گـەورە دەوڵـەتی دادگـەر پایـەدارو دامـەزراو دەکـات و دەیهێڵێتەوە لەسەر حوکم با کافریش بێ، وە دەوڵەتی زاڵـم و سـتەمکاریش لـەناو دەبات با موسڵمانیش بێت.

جا خۆزگە کاربەدەستانی وڵاتەکەمان بۆ بەختەوەری دونیا و قیامەتی خۆیان پاشان میللەتەکەیان دادگەریان بچەسپاندایە. بـە تایبـەتی لـە دابـەش کردنـی سـامانی گشتی میللەت دا.

**مافی دووەمی میللەت لەسەرکاربەدەست ئەوەیە:** کاربەدەست دڵسۆز بێ بۆیـان، کاربەدەست و فەرمانڕەوا بە شداری میللەت بکات لە ناخۆشـی و کارەسـاتەکاندا. چونکە وولات بـارودۆخی هـەرزانی و ئاشـتی بەسـەردادا دێ و حاڵـەتی گرانـی و شەڕیشی بەسەردا دێ، دەبێ سـەرکردەو لێپرسـراو لـە هـەموو بـارو دۆخەکانـدا بەشداربێت و وەکو یەکێ لە هاوڵاتیان وا بێت.

**جابر دەفەرموێت:** خەندەقمان هەڵدەکەند – لە جەنگی خەنـدەق دا، پێغەمبـەری خواش (ﷺ) وەکو صەحابەکان ئیشی دەکردو پاچ و خاکەنازی بەدەستەوە بوو، تـا

ئەوەبوو لە شوێنێکدا تاوێرە بەردێك هاتە پێشەوە، صەحابەکان زۆر هەوڵیان لەگەڵدا بۆیان نەشکا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە بەمەی زانی، فەرمووی: ((أَنا نازِلٌ ثُمَّ قامَ وَبَطْنُهُ مَعصُوبٌ بِحَجَرٍ)).
واتە: من دەڕۆمە خوارەوە پاشان کە بەردە گەورەکەی شکاند هەڵساو هاتە دەرەوە سکی ڕووشابوو بە پارچەو تەڵەزمی بەردەکە! جابر دەفەرموێ: ماوەی سێ ڕۆژ تامی هیچ جۆرە خواردنێکمان نەکرد هەستم کرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبرسان بەردی لەسەر سکی بەستبوو ، لە ژێر پشتێنەکەیدا بۆیە ڕوخسەتم وەرگرت و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە بە خێزانەکەم ووت: (رأَيتُ بالنَبي شَيْئاً مَا كانَ في ذلِكَ صَبْرٌ) شتێکم بە شتێکم بە پێغەمبەری خواوەوە بینی — کە بەردی لەسەر سکی بەستبوو لە برسان بە ڕاستی ناتوانم لە ئاستیدا خۆڕاگرم.
ئایا هیچمان هەیە لە ماڵەوە بیکەن بە خواردن و پێغەمبەری خوای بۆ بانگ بکەین؟! خێزانەکەم ووتی: گیسکێکمان هەیە لەگەڵ هەندێ جۆ، ووتم: زۆر باشە، جۆیەکە بهاڕەو بیکەبە ئاردویەك دوو ئافرەتی دراوسێمان بانگ بکە لەگەڵت بکەن بەنان و منیش گیسکەکە سەردەبڕم و دەڕۆمەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) و عەرزی دەکەم بۆ نان خواردن بێت بۆ ماڵی ئێمە، خێزانەکەی جابر ووتی: زۆر باشە و خۆمان و ماڵ و منداڵمان بە قوربانی پێغەمبەری خوابین ، بەڵام تکایە بە نهێنی پێ ی بڵێ و با بەتەنها یەك دووکەس لەگەڵ خۆی بێنێت، چونکە خواردنەکە کەمە و بابەتەواوی تێر بخۆن و شەرمەزار نەبین.
جابر ووتی: زۆر باشە هەرواد‌ەکەم، ئەوە بوو جابر چووەوە خزمەت پێغەمبەری خوا بۆ سەرچاڵەکەو بە گوێ ی دا چرپاند، کە خۆم و دایکم وباوکم بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ).
گەورەمان بکەو خۆت و یەك دووکەس لە خزمەتتا بن، ئەم ژەمە لە ماڵی ئێمە نان دەخۆن. پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی پیرۆزی زیاتر گەشایەوەو فەرمووی: ئەی خەڵکینە هیچ کەس نەڕواتەوە بۆ نان خواردن، ئەمڕۆ هەمومان لە ماڵی -جابر - دەعوەتین و بەیەکەوە لەوێ نان دەخۆین!! ئەی جابر تۆش بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە و یارمەتی و هاوکاری خێزانت بکە، بەڵام پێیان بڵێ: با هەویرەکە نەکەن بەنان هەتا

دێم و گۆشتەکەش با لەسەر ئاگردانەکە دانەگرن و لێ ی گەڕێن تا هەمومان دێـین، بەڵێ جابر گەڕایەوە بۆماڵەوەو هەواڵەکەی بە خێزانەکەی گەیاندو پێی ووت: نازانم چی بکەین.

خۆ بەخوا من بە نهێنی بە پێغەمبەری خوام ووت، خێزانەکەی فەرموی: هیچ غـەم مەخۆ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی باشتر دەزانێ و خوای گـەورە بەرەکـەتی تـێ دەخات (إن شاء الله).

ئەوەبوو لە شکرەکە بەرەو ماڵی جابر هات جگە لە چەند کەسێك نەبێت کە بۆ چاودێری سنورەکە مانەوە - (دیارە ئەوکاتە هێشتا لە شکری قورەیش و هاوپەیمانەکانیان نەگەیشتبونە مەدینەو ئەوبەر چاڵەکە) کاتێ گەیشتنە ماڵی جابر، پێغەمبەری خوا (ﷺ) تفی موبارەکی کردە سەر هەویرەکەو فەرموی بسم الله ی لێ بکەن و دەست بکەن بەنان کردن، وە خۆشی چوە سەر مەنجەڵە گۆشتەکەو فەرموی: با هەر دوو کەس دووکەس قاچێك بێنن و نان وەربگرن بێن منیش بەدەستی خۆم گۆشتیان بۆ تێ بکەم!

بەڵێ هەموو ئەو خەڵکە کە ژمارەیان لە (١٠٠٠) کەس بوو تێریان خواردو پاشـان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ئەی جابر کێ ماوە نـان بخـوات ، جـابر عـەرزی کرد: تەنها من و جەنابت ماوین ، فەرموی: دەی وەرە با ئێمەش نانەکەمان بخۆین. جابر دەفەرموێ: ئێمەش نانمان خوارد سوێند بە خوا هێشتا گۆشت و نانەکە بەشـی زۆری تێ دا مابۆوە!!

ئەمە لەگەڵ ئەوەی یەکێکە لە موعجیزاتی پێغەمبـەر (ﷺ) کـە خـواردن لەبـەر دەستی پیرۆزیدا خوای گەورە بەرەکەتی تێخستوە. وە لەوەش گـەورەتر ڕاسـتگۆیی سەرکردە لەگەڵ سەربازو شوێن کەوتوانی دا دەردەخات، هەر کاتێ سـەرکردە ئـاوا خەمخۆری شوێن کەوتوانی بوو، خۆی لێ جیانەکردنەوە، بە تایبەت لە حاڵە ناخۆشی و پڕ مەترسیەکاندا. وە نەیگوت: هەرخۆم تێربم ئیتر خەڵکی با قەناعەتیان هەبێت، بەڵکو تێربوونی خەڵکی شوێن کەوتەی پێش خۆی خست، ئەوە بە دڵنیاییەوە خوای

گەورە بەرەکەتی خۆی بەسەر ئـەو وولاّتـەو رِزق و رِۆزی و بەرهەمیانـدا دەبـارێنیّ ئەگەر سامانی وولاّت کەمیش بیّ، خۆراکیش کەم بیّ خوای گەورە بەرەکـەتی تـیّ دەخات و سەرکردەو گەڵ ژیانێکی پرِ بەختەوەری بەسەر دەبەن.

**ئیمانداران:** نمونەیەکی تر لەسەر خەم خۆری پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەکو سەرکردە بۆ شوێن کەوتوانی ئەم بەسەر هاتەیە کە لە (صَحيحي مُسْلِم) دا هاتووە و هاوەڵی بەرِێز ( ئـەبو سـەعیدی خـودری) بۆمـان دەگێرِێتـەوەو دەفـەرموێت: یـەکیّ لـەو کەسانەی کە لە کاتی هەڵکەندنی خەندەق دا لەگەڵمان بوو.

گەنجێك بوو، چەند رِۆژێك بوو ژنی گواستبۆوەو تازە زاوابوو. ئەوەبوو رِۆژێکیان ئەم گەنجە بە شەرمەوە هاتە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) عـەرزی کـرد: ئەگـەر روخصەتم بدەیت حەز دەکەم سـەرێك لـە ماڵـەوە بـدەم. پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هەرچەندە وەختەکە زۆر نارِەحەت بـوو وە دوژمـن لەوبـەر خەندەقەکـەوە بـوو. وە چاوەرِیّ ی هێرشی دوژمن دەکرا لە نزیکترین کاتدا. لەگـەڵ ئەوەشـدا پێغەمبـەری خوا(ﷺ) مۆڵەتی داو فەرموی: ((**خُذْ عَلَيْكَ سِلاحَكَ فَـإنِّي أخْشَـى عَلَيْـكَ قُرَيْظَةَ**)).

واتە: چەکەکەت (شمشێرەکەت) بکەرەوە شانت وە لە ئامادە باشیدابە ، چونکە من بەرِاستی دەترسم لێت کە جولەکەی قورەیزە بە تەنها بت بینن و فرسەتت لیّ بێـنن و بتکوژن.

سەرنج بدەن پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن موراعاتی حاڵی ئەو گەنجەی کردوە، کـە تازە ژنی هێناوەو تامەزرۆی بینینی خێزانی بوەو خێزانی تازە بوکیشی چـاوەرِیّ ی هاتنەوەو بینینی بوە.

نەیفەرموو، لەم کاتەدا چۆن داوای مۆڵەت و رِۆیشـتنەوە دەکـەیت ، نـابینی ئـەو هەموو خەڵکە هیچی نارِواتەوە! نەخێر، بەڵکو تەماشای بـارودۆخی ئـەم گەنجـەی

کردو لەگەڵ هەست و سۆزیدا ژیا. وە پاشان چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە خەمی سەربازەکانیدایەو ئامۆژگاری دەکات و بە بیری دەخاتەوە کە لە ڕێگادا زۆربە وورییایی یەوە بڕوات و بێتەوە نەوەکو دوژمن زەفەری پێ بەرێت.

کە بەڕاستی دەبێ ئاوا سەرکردە خەمخۆری شوێن کەوتوانی بێت و هەریەکەیان وەکو ڕۆڵەی خۆی حیساب بکات و دڵسۆز بێت بۆیان.

نەك وەکو ئەو هەموو سوکایەتیەی کە ئەمڕۆ لە جیهانی بەناو پێشکەوتودا بەسەرباز دەکرێت لە لایەن سەرکردەوە.ڕاپێچی شەڕی بە خۆڕای دەکرێت و سزای توند دەدرێت و بە خۆڕایی و بێ مەبەست خوێنی بە فیڕۆ دەدرێت!!

دەگێڕنەوە کە یەکێ لە پیاو باشان کە بۆ بانگەوازی دینی ئیسلام بە وولاتاندا زۆر گەڕابوو، وەکەشکۆڵێك بوو لە بەسەر هاتی سەرسوڕهێنەر کە بەچاوی خۆی بینیبوی، ڕۆژێك دەچێتە سەردانی خەلیفەی ئەوکات کە سەرکردایەتی موسڵمانانی کردوە، خەلیفە داوا لە پیاو باشە زاناو حەکیمەکە دەکات کە ئامۆژگاری بکات.

ئەویش دەڵێ: ئەی فەرمانڕەوا حەزدەکەم ئەم بەسەرهاتەت بۆ بگێڕمەوە کە خۆم بینیومەو ئیتر پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرە. بەسەر هاتەکەش ئەمەیە:

جارێکیان سەفەری وولاتی (چین) م کرد. دەنگوباسێکی گەرم لەناو خەڵکیدا هەبوو، ئەویش ئەوە بوو کە پاشاو سەرکردەی وولات گوێ ی تووشی نا بیستن – کەڕبوون – بوبوو. وە هەرچی دکتۆر و حەکیمەکانی وولاتی – چین و وولاتانی دەوروبەر هەیە هەوڵی خۆیان خستبوە گەڕ بۆ چاکبونەوەی بەڵام سوودی نەبو بوو. وە بەتەواوی لە دنیای بیستن بۆ یەکجاری دابڕابوو.

وە پاشا بەردەوام دەگریا و خەمی زۆری دەخوارد. وەزیرو کاربەدەستان دەچنە لای و بە نوسین بۆی دەنوسن کە: ئەی پاشاو گەورەمان تۆ هەر پاشای وولاتی و هەر

چەندە نەشبیستی  دەتوانی لە ڕێگەی نوسینەوە هەموو هەواڵێك وەربگری و بزانی و کێشەو گیرو گرفتێکت بۆ دروست نابێ. ئیتر بۆچی ئەوەندە خۆت ئازار دەدەیت؟!

**پاشا دەڵێت:** بە ڕاستی گریان و ناڕەحەتی و دڵتەنگی من لەبەر ئەوە نیە کە گوێیەکانم توانای بیستنیان نەماوە و لە دنیای بیستن دابڕاوم، بەڵکو بۆ ئەوە دەگریم کە کاتێ ستەم لێکراوێك لەبەر دەرگاوە هاوارم بۆ بکات تا مافی بۆ بسەنم من نەتوانم گوێم لە دەنگی ئەو مەزلوم وستەم لێکراو و ماف خوارەوە بێت!!

وە کاربەدەستانیشم ڕێگەی پێ نەدەن تا لە ڕێگەی عەرزو حاڵەوە بە نووسراو کێشەکەی بگەیەنێتە لام، بەڵام بیرێکی باشم بۆ هاتوە ئەویش ئەوەیە، ئەگەر چی گوێم لە دەست داوە بەڵام خۆ چاوەکانم هەر دەبینێن و هێزی بینینم وەکو خۆی ماوەتەوە.

لەبەر ئەوە لە مڕۆوە بڕیار دەدەم کە: لەم وولاتی (چین) ە دا هیچ کەس بۆی نیە جل وبەرگی سور لەبەر بکات تەنها کەسێك نەبێ کە ستەمی لێ کرابێت و مافی خورا بێت، وە من هەموو حەفتەیەك ڕۆژێك بە تەواوی شاردا دەگەڕێم  وە ناوچەکان بەسەردەکەمەوە لە گوندو شارۆچکەکان، جا هەرکەسێ جل و بەرگی سووری لەبەردا بوو یەکسەر تێدەگەم کە ئەوە ستەمی لێ کراوەو بانگی دەکەم و کێشەکەی چارەسەر دەکەم.وە هەر کەسێکیش لە کاربەدەستانم نەهێڵێ کە ئەو ستەم لێکراوە جلی سور لەبەر بکات و چاوم پێ ی بکەوێ،سزای زۆر توندی دەدەم!

**جا پیاو باشە زاناکە فەرموی:** ئەی سەرکردەی موسڵمانان ئەوە فەرمانڕەوایەکی غەیرە موسڵمان و کافر ئاوا خەمخۆری هاولاتیانی بوو. وە ئاوا هەوڵی داکۆکی کردن لە ستەم  لێکراوانی دەدا. وە ئاوا دڵسۆز بوو بۆیان ، ئیتر تۆ کە موسڵمانی و بڕوات بە خوای گەورە و ڕێبازی پێغەمبەرو لێپرسینەوەی قیامەتە، وە بەرپرسیاری بەرامبەر بە میللەتێکی موسڵمان و خواناس، ئیتر چۆن دەبێ دڵسۆزیان نەبی و ئاوا لە خەمیاندا نەبی و سکاڵایان نەبیستی و مافی مافخوراویان نەگێڕیتەوە؟!...

**بەڵێ:** سەرکردە و لێپرسراو نەك هەر دەبێ خەمخۆری گیانی هاوڵاتیانی وولاتەکەی بێت بەڵکو دەبێ خەمخۆری ئاژەڵەکانیش بێت ، خەمخۆری ئۆتۆمبێل و هۆکانی گواستنەوەشیان بێت بەدروست کردنی ڕێگاوبانی جوان و پاك و مۆدرێن کە کارەسات کەم بکاتەوە و خەڵکی سەروماڵی لە کارەساتێکی ئۆتۆمبێل دا تێدا نەچێت.

با کاربەدەستان وەکو حەزرەتی عومەری کوڕی خطاب دڵسۆزبن کە فەرموی: (وَاللّٰهِ لَوْ عثرت بَغَلَةٌ فِي العراقِ لَخَشَيتُ أَنْ يَسْأَلَنِي اللّٰهُ عَنْها لِمَ لَمْ تصلِحْ لَها الطَرِيقَ يا عُمَرُ؟!) واتە: سوێند بە خوای تاك و تەنها ئەگەر وولاخێك (ئەسپێك) لە عێراقدا سەرسمێك بدات و بکەوێت و لەناو بچێت. دەترسم کە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیارم لێبکات ئەی عومەر بۆچی ڕێگاکەت بۆ چاك نەکرد ؟!!

**مافی سێ یەم:** دەبێت کاربەدەست غەش لە میللەت نەکات، نەك تەنها غەشی مادی و دزین و پاشقول دان و بە فیڕۆدانی ماڵ و سامانی گشتی میللەت و وولات، بەڵکو غەشی ئەوەیان لێ نەکات کە: حەز بکات هەرچی خێرو خۆشیەك هەیە لە وولاتدا، خەڵکی بەهی ئەوی بزانێ خەڵکی مەدحی بکەن و چەپڵەی بۆ لێ بدەن و شیعر و پەخشان بە بالایدا بخوێنن. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا زۆر بەتوندی زەمی ئەو جۆرە کەسانە دەکات و دەفەرموێ:﴿وَيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا﴾ آل عمران: ١٨٨

واتە: حەز دەکەن ستایش و سوپاس بکرێن لەسەر شتانێك، لەسەر کارو کردەوەیەك کە ئەوان نەیانکردوەو ئەوان هۆکاری بونی نین!

تەماشا بکەن چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم هەڵە کوشندەی بەکردەوە ڕاست کردۆتەوە.

**موغیرەی کوڕی شوعبە دەفەرموێ:** ئەو ڕۆژە کە (إبراهیم) ی کوڕی پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد، وە پێغەمبەری خوا زۆر بۆی غەمبار و دڵتەنگ بوو، وە فرمێسك بە خوڕ بە ڕیشی پیرۆزیدا هاتە خوارەوە، وە فەرموی: ((**وإِنا عَلَى فِراقِكَ**

ياإبراهيمُ لَمَحْزُونَ)) بـه ڕاسـتی ئـەی ئیبراهیمـی جگـەر گۆشـم، ئـەی كـوڕە تاقانەكەم، ئەی كۆرپە نازدارەكەم، بە ڕاستی بەمردنی تۆو بـەوەی جێـت هێشـتین هەمووومان زۆر غەمبارین).

ئالەو كاتەدا كە هەموو شاری مەدینە چاو بە فرمێسك بون و هەموو ماڵێك وەكـو مردویەكی لێ مردبێ لە تاوی پێغەمبەری خوا ئاوا بوون، ئالەم كاتەدا لـە نوێـژی نیوەڕۆدا، كە ڕۆژ بە ناوەڕاستی ئاسمانـەوە بـوو، ڕۆژ گـیراو تاریـك بـوو. هـەموو خەڵكەكە ووتیـان: (إِنْكَسَفَتْ لِمَوْتِ إِبْراهيمَ). ئـەوە ئـەو ڕۆژە بۆیـە گـیراو بۆیـە ڕووناكیەكەی داپۆشرا لەبەر مردنی ئیبراهیمی كوڕی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

ئەوەتا نەك هەر ئێمە بەشداری مەحزونی و غـەمباری پێغەمبـەری خـواین بـەڵكو ئەوە ئاسمانیش لەگەڵیدا لەخەم و پەژارەدایە و ڕۆژیش خۆی داپۆشی و ڕووناكی نـە نـارد بـۆ سـەر زەوی !! ئـا لـەم سـاتە خەمناكیـدا، لـەو ڕۆژە دڵتەنگیـەدا، كـە صەحابەكان تەماشای چاوی پرۆزی پێغەمبەریان كرد وا فرمێسك بە چـاویدا دێتـە خوارەوە، ئەو صەحابانەی كە ئەوەندە دڵسۆزی پێغەمبـەربوون ئامـادەبون ئیعـدام بكرێن، بەڵام پێغەمبەری خوا دڕكێ نەچێ بـە پـێ ی دا، وا ئـەو پێغەمبـەرە بـە مردنی ئیبراهیم جەرگی كون كون بوو. ئەوەندەیان مەوقیفەكە لەلا گەورە بوو، كـە ئەو ڕۆژ گیرانە یان بە بەشداری كردن لە پرسەی ئیبراهیم دانا.

**سەرنج بدەن ئیمانداران:** ئەگەر پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) سـەركردەیەكی دونیـایی بوایە ئەوە بە باشترین فرسەتی دەزانێ بڵێ، بەڵێ زۆر ڕاستە ئەوەتا من ئاسمانیشـم لەگەڵە نەك هەر ئێوە، كەواتـە: زۆر مـەمنون بـن كـە سـەركردەیەكی وا گـەورەو بەرزتان هەیە كە خۆر تیشكی زێڕینی خۆی لەبەر غەمباری من دەشارێتەوە).

بەڵام نەخێر ئەوە پێغەمبەری خوایە (ﷺ) ئەوە ئەو سەركردە گەورەیـە، كـەدەبێ هەرچی سەركردەیەك لە جیهاندا هەیە هەتا كۆتایی دونیا. كە دەیەوێت بە ڕاسـتی سەركردەبێ و میللەت و گەلەكەی لە سایەی فەرمانڕەواتیەكەیدا بەختـەوەر بێـت. دەبێ پێ بەپێ ی ئەو خۆشەویستە هەنگاو هەڵبگری و فەرمانڕەوایی بكات.

بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ویستی ئەم هەڵەیان بۆ ڕاست بکاتەوە، یەکسەر چوە ناو خەڵکەکەوەو فەرموی: ((**إنَّ الشَّمْس وَالقَمَرَ آيتانِ مِنْ آياتِ الله، لايَنْكَسفانِ لِمَوتِ أَحَدٍ وَلا لِحَيَاتِهِ، فَأذا رَأَيْتُمُوهُما فَادْعُوا الله وَصَلُّوا حَتَّى يَنْجَلــي**)) رَواهُ البُخاري.

واتە: بـە ڕاسـتی ڕۆژ و مـانگ، دوو نیشـانەو بەڵگـەن لـە نیشـانەو بەڵگـەکانی دەسەلاتی خوای گەورە نەلەبەر مردنی کەس وە نەلەبـەر ژیـانی کـەس نـاگیرێن و ڕووناکیان ناشاردرێتەوە. جا ئەگەر حاڵەتی ڕۆژگیران یان مانگ گیرانتـان بینـی، ئەوە دوعا بکەن و لە خوا بپاڕێنەوە و نوێژی ڕۆژگیران و مانگ گیران بکـەن هـەتا ڕوناکیان دەگەڕێتەوە).

بەم شێوەیە تێ ی گەیاندن کە ئەمە بابـەتێکی زانسـتی یـەو هـیچ پەیوەنـدی بـە مردنی کوڕی من و هیچ کەسێکەوە نیە و لەو حاڵەتانەدا دەبێ تەنها پەنا بـۆ خـوا ببرێ (چونکە هەموو شت تەنها بە دەست خوایە) و نوێژ بکرێت و باسی دەسـەلات و گەورەی خوا بکرێت کە چۆن ڕۆژو و مانگی ئاوا لەسەر خولگەی تایبەت دأناون و بەردەوام لە جوڵەدان و هەرگیز ڕێڕەوی خۆیان ناگۆڕن و لەم جولان و خولانەوەیەدا خزمەت بە ئێمە دەکەن لەسەر زەوی و شەوو ڕۆژمان بۆ پێك دێـت بـە فـەرمان و ویستی خوای گەورە:-

**بەڵێ:** هەر سەرکردەیەك حەز بەوە بکات میللەت بۆ هەموو قسـەیەکی چـەپڵەیەك لێ بدەن و هەموو ڕۆژنامەیەك لاپـەڕەی یەکـەمی وێنـەی ئـەوبێت و لـە هـەموو شوێنێکا وێنەی هەڵبواسرێ و هەرچی خێرو خۆشیەك هەیـە خـەڵکی لەناوچـەوانی ئەوی بناسن، ئەوە بەڕاستی ئەو بەناو سەرکردەیە غەشی لە عەقڵی ، لـە هـۆش و گۆش و بیرکردنەوەی ئەو گەلە کردوە و ئەو وولاتە هەرگیز پێشکەوتن بـە خۆیـەوە نابینێت ، لە کۆتایی ئەم بابەتەدا و ئەم ووتـارەدا کـە هـەڵی دەگـرین بـۆ وتـاری داهاتوو (إن شاء الله). حەز دەکەم ئەم باسەتان بۆ بگێڕمـەوە کـە وەکـو لەتیفـەو نوکتەیەکی خۆش بەلام زۆر جوان و پڕمانا وایە.

ئافرەتێکی ڕۆژنامە نوسی إیطالي بە ناوی (ئۆریانا ڤالانچی) کە ڕۆژنامە نوسێکی بوێرو ناسراوە چاوپێکەوتن لەگەڵ سەرکردەیەکی وڵاتێکی عەرەبی دەکات - ناوهێنانی بە پێویست نازانم - لە کۆتا پرسیاری چاوپێکەوتنەکەیدا لە سەرۆك دەپرسێت: جەنابی سەرۆك تۆ بڕوات بە بوونی - خوا - هەیە؟ سەرۆك زۆر بە نیگەرانی و هەڵچونێکی بەرچاوەوە ڕاستەوخۆ دەڵێت: ئەوە کەی پرسیارە ، من کەسێکی موسڵمانم ، عەرەبم ، سەرۆکی وڵاتێکی عەرەبی و ئیسلامیم ، چۆن دەبێت بڕوام بە خوا نەبێت؟! ئافرەتە ڕۆژنامە نوسەکە زۆر بە هێمنی دەڵێت:
بەڵام جەنابی سەرۆك لەو کاتەوەی کە من گفتوگۆت لەگەڵ دەکەم ، هەستم دەکرد کە خۆت -خودا- بیت!! (نَعُوذُ باللّٰه) سەرۆك دەڵێ چۆن؟!!
دەڵێ چونکە من وا تێگەیشتم تۆ کە باسی خۆت و گەلەکەت دەکەیت خۆت بە ژێنەرو مرێنەرو ڕۆزی دەرو خۆشی هێنەر و نزم کەرو بەرزکەرەوەی ئەو خەڵکە هەموی دەزانی و حەزدەکەی هەموی لە چاوی تۆ بناسن، دەی ئەمەش تەنها بە خوا - اللّٰه- دەکرێت نەك بە سەرکردەی وولاتێك ، کە دەبێ وەکو هاولاتیەك خۆی تەماشا بکات!!

بێگومان ئەم بۆچون و وەلامە خێرایەی ڕۆژنامە نوسەکە بۆ جەنابی سەرۆك ، تەواو وەڕس کەرو تاقەت پڕوکێن دەبێت، وەکو چەکوشێك لەسەری درابێت تەواو وورِو کاسی دەکات! تا ووتاری داهاتوو هەموو لایەکتان بە خوای گەورە دەسپێرم.

﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾

ٱللَّهُمَّ ءَامِينَ

# سەرچاوەکان

١- قورئانی پیرۆز.

٢- الأخلاق السياسية ، محمد زكريا النداق،ص٢١٩، ص٢٢٤، ص٢٤١، ص٢٣٤.

٣- تەفسیری ئاسان ، بورهان محمد أمين.

# ووتاری یەکەم
# بۆ مانگی صەفەر
# مافی میللەت لەسەر کاربەدەست
# (بەشی سێ یەم)

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجمعين.

**ئیمانداران:** لەم وتارەشدا بەویست وپشتیوانی خوای گەورە باسی هەندێ مافی تری میللەت دەکەین بەسەر لێپرسراو وسەرکردەی ولاّتەوە،

**کەگەیشتینە مافی چوارەم:** مافی چوارەم ئەوەیە کەکاربەدەست وفەرمانڕەوا دەبێ نەرم ونیان بێت لەگەڵ میللەتەکەیدا. وەخۆی بەزل نەزانێ لەسەریان وتەکەبوریان بەسەردا لێ نەدات بۆئەوەی لیّ ی بترسن.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ الشعراء: ٢١٥

واتە: باڵی بەزەیی ومیهرەبانی خۆت نەوی بکە بۆ ئەو ئیماندارانەیکەشوێنت کەوتون.

**وەخوای گەورە بەخۆشەویست دەفەرموێت:** ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِجَبَّارٖ﴾ ق: ٤٥. واتە: ئەی محمد (ﷺ) تۆ زۆردار نیت بەسەریانەوە تابەزۆر باوەڕیان بەسەردا بچەسپێنی. بابچینە خزمەت پێغەمبەری پێشەنگ وپێشەوامان بزانین چۆن وەکو سەرکردەیەك وانە دەدات بەسەرکردەکان کەلەگەڵ میللەت وگەلدا، لەگەڵ هاولاّتیاندا ئاوا بجولێنەوە هاوەڵی بەڕێز (ئەبو مەسعود): کەناوی (عوقبەی کوڕی عەمرە) دەفەرموێت: کەسێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، کەسەکە قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا دەکرد، ئەو کەسە زۆر شەرمی دەکرد ولەشەرمان ولەشوێنەواری ئەوەی کەپێغەمبەری خوای وەکو سەرکردەیەکی دونیایی دەهاتە بەرچاو دەلەرزی ولێوی دەلەرزی وقسەی باش بۆ نەدەکرا.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیّ ی فەرموو: ((**هَوِّنْ عَلَيْك، فَأنِّي لَستُ بِمَلِكٍ، إِنَّما أَنا ابْنُ إِمْرَأَةٍ كانَتْ تَأْكُلُ القَديدَ**)) رَواهُ إبنُ ماجَة.

واتە: کاکەگیان لەسەرخۆبە، بۆ واشڵەژاوی، بۆ دەترسی، بەڕاستی من پاشایەك وفەرمانڕەوایەکی ستەم کاری دونیایی نیم، بەڕاستی من کوڕی ژنێکم. کەگۆشتی ووشکەوەبوی دەخوارد). لێرەدا چەند خاڵی گرنگ هەیە:

١- فەرموی: من کوڕی ژنێکم. واتە: بەهەتیوی لەدایك بوم وباوکی خۆم نەبینیوە تاکەسێکی زۆردار ودەسەلاّتدارم. نەیفەرموو: کوڕی پیاوێکم چونکە تۆزێ خۆبەگەورە زانینی تێدایە.

٢- ڕێزی ئافرەت دەردەخات لای پێغەمبەری خوا (ﷺ). کەبەشانازیەوە دەفەرموێ: من کوڕی ئافرەتێکم.

٣- کەفەرموی: تَأْكُلُ القَدِيدَ. واتە: دایکم لەبەرهەژاری خێزانەکەمان پارەی ئەوەی نەبوو کەگۆشتی تازە بکڕێ لای قەصاب. بەڵکو ئەو گۆشتە ووشکەی دەکڕی کەلەبەر هەتاوو وشك کرابۆوە وبەهەرزان دەفرۆشرا. جافەرموی: کەمن ئەوکەسە بم ئیتر تۆ بۆچی دەترسی ودەلەرزی وشەرم دات دەگرێ، نەخێر بەهێمنی وبێ ترس و شڵەژان قسەی خۆت بکە.

وە زۆرجار بەصەحابەکانی دەفەرموو: ڕۆژگارێك بوو، من لەم شیوو دۆڵانەی دەوری مەککەدا شوانیم بۆ خەڵك دەکرد، لەپێناوی چەند دیرهەمێکی کەمدا. کە بژێوی ژیانی خۆمی پێ دابین بکەم.

ئای بەداخەوە کەی ئێمە بینیمان ڕۆژێك سەرکردەیەك لەبەردەم میللەتدا بڵێ: ڕۆژێك بوە کەمن ئێستا سەرکردە ودەسەلاّتدارم، لێقەوماو وهەژار ونەدار بوم وبێ پارە وبێ پاروو بێ نان وبێ ئاو بوم، تاخوای گەورە ڕەحمی پێ کردم وبومە ئەم سەرکردەی ئەمڕۆ!.

**مافی پێنجەم:** پێویستە لەسەر کاربەدەستانی بالاّی حکومەت کەسێك دانەنێن بەلێپرسراوو کاربەدەستی سەرخەڵك کەپسپۆڕ نەبێ لەوکارەی کەپێی دەسپێردرێ.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوبارەیەوە فەرمویەتی: ((إذا وُسِّدَ الأَمرُ إلى غَيْرِ أَهْلِهِ فانْتَظِرِ السّاعَةَ)) رَواهُ البُخاريُّ.

واتە: هەرکاتێ ئیش وکار سپێردرا بەکەسێ کەئەهلی ئەو ئیشە نەبێ – واتە پسپۆری ئەو بوارە نەبێت ئەوا چاوەڕێ ی هاتنی قیامەت بکە، بەومانایەی کەدونیا تێك دەچێ وهیچی بەسەر هیچەوە نامێنێ وهیچ بەرهەمێك بەکەڵك نایەت وهیچ ئیش وکارێکی خەڵکی ناڕوات.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) جیاوازی دەکرد لەنێوان پیاو باشی کەسێك وەکو تاك ونێوان توانای ئەوکەسە بۆ سەرکردایەتی کردن وکار بەڕێوەبردنی خەڵکی، چونکە زۆرکەس وەکو شەخصی خۆی زۆر پیاوی چاکە وکەسێکی بەڕێزە وزۆر دەستپاکە ودڵسۆزە. بەڵام لەکاروباری ئیداری وولات وفەرمانگە سەری دەرناچێ ولێی نازانێ، ئیتر ئەم کەسە تەنها لەبەرئەوەی پیاوی چاکە وبەڕێز وئەمین ودەستپاکە. نابێت بکرێ بە لێپرساوی کاروباری دنیایی خەڵکی چونکە ئەمەیانی پێ ناکرێ ولەوناوەدا مافی خەڵکی دەفەوتێ..

یەکێ لەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناوی (ئەبی زەڕی غەفاری یە) پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبارەی گەورەیی وبەڕێزی کەسایەتی ئەم هاوەڵەوە دەفەرموێت: ((ماأَظَلَتِ الخَضْراءُ وَلاأَقَلَّتِ الغَبراءُ مِنْ ذي لَهْجَةٍ أَصْدَق وَلاأَوْفَى مِنْ أَبي ذَرْ، شَبَّهَ عيسى ابْنِ مَرْيَمَ)). واتە: ئاسمان سێبەری بەسەر کەسدا نەکردوە ڕاستگۆ تربێ ووەفادار تربێ لەئەبوزەڕ. لەڕیوایەتێکی تردا کەپێشەوای فەرمودە (ترمذی) ڕیوایەتی کردوە دەفەرموێ: (أَبُو ذَرْ تِمْشي في الأَرض بِزُهْدِ عيسى ابنِ مريَم). واتە: ئەبو زەڕ بەسەر زەویدا دەڕوات بەزوهد ودونیا بە کەمگرتنی عیسی ی کوڕی مەریەم.

بەڵام هەروەکو ووتمان چاکی وپاکی تاکەکەس بۆ ژیانی خۆی شتێکە وشیاوبون بۆ فەرمانڕەوایی شتێکی ترە، هەرئەو هاوەڵە بەڕێزەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەپێغەمبەری خۆشەویست ئاوا تەزکیەی دەکات وپاکی وچاکی باس دەکات،

بۆخۆی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: ڕۆژێکیان چومە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وعەرزم کرد: يارَسُولَ الله، ألاتَسْتَعْمِلنِي؟! ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا نامخەیتە سەرکارێك ولێپرسراویەتیەکم پێ ناسپێری وبەو هۆیەوە لەخزمەتی موسڵماناندا بم. (مەبەستی خزمەتکردنی موسڵمانانە. نەك بفەرموێ بەخوا دەست کورتم. بەڵکو بمکەی بەلێپرسراوی شوێنێك بەئومێدی ئەوەی دەوڵەمەند ببم!! نەخێر ئەو مەبەستی ئەوەیە خزمەت بەموسڵمانان بکات. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەئەبو زەڕ زۆرباش دەناسێ لەچاکی وخواناسی و ڕاستگۆیی ودڵسۆزی بۆ موسڵمانان لەوەڵامدا دەفەرموێ: ((يا أَباذَرْ إِنَكَ ضَعيفٌ وَإِنَها أَمانَةٌ. وَإِنّها يَوْمَ القِيامَةِ خزْيٌ وَنَدامَةٌ إِلا مَنْ أَخَذَها بِحَقِّها وَأَدى الَّذي عَلَيْهِ فيها)) رَواهُ مُسْلِم.

واتە: ئەی ئەبو زەڕی خۆشەویست بەڕاستی تۆ کەسێکی لاوازی لەبواری بەڕێوەبردن وئیدارەدا. وە ئەم لێپرسراویەتیەش ئەمانەتە، وە بەڕاستی مەسئولیەت لەڕۆژی قیامەتدا دەبێت بەتیاچون وپەشیمانی مەگەر بۆ کەسێك کەبەحەقی وخۆی وبەشیاویەتی خۆی بۆ ئەوکارە وەری گرتبێ وپاشان ئەوەی پێشی سپێردراوە بەجوانی جێ بەجێی کردبێت.

- هاوەڵێکی زۆر پایەبەرزی تری پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناوی (بەرائی کوڕی مالیك)ە. کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بارەیەوە فەرمویەتی: ((كَمْ مِنْ أَشْعَثَ أَغْبَرَ ذي طِمْرَيْنِ لا يُؤبه لَهُ. لَوْ أَقْسَمَ عَلَى الله لأَبَرَّهُ مِنْهُمْ البَراءُ بنُ مالِك)) رَواهُ التِرمذي وَصَحَّحَهُ الألباني فِي صَحيح الجامع (٤٥٧٣).

ئەم صەحابە پایەبەرزە ئەوەندە دڵسۆز بوو بۆ ئیسلام وموسڵمانان، لەیەکێ لەجەنگەکاندا کەلەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕوی دا، ئەو غەزایەدا خەریك بوو موسڵمانان دەشکان بەرامبەر دوژمن.

بۆیە صەحابەکان لەدەوری بەرائی کوڕی مالیك کۆبونەوە وپێیان ووت: ئەی بەراو لەخوای خۆت بپاڕێوە وداوای لیٚ بکە سەرکەوتنمان پیٚ ببەخشیٚ چونکە خوای گەورە قسە وداوای تۆ ڕەت ناکاتەوە، **بەرائیش فەرموی:** (أَقْسَمْتُ عَلَيْكَ يارَبْ لما مَنَحْتَنا أَكْتافَهُمْ، وَأَلْحِقْني بِنَبِيٍّ) رَواهُ الحاكِم وَصَحَّحَهُ.

واتە: سوێند دەخۆم ئەی پەروەردگارم کەدوعام قبوڵ بکەیت وداواکەم ڕەت نەکەیتەوە سەرمان بخەی بەسەر کافرەکاندا ومنیش بگەیەنی بەپێغەمبەری خۆشەویستم!.

ئەوەبوو موسڵمانان خۆیان ڕێك خستەوە وهێرشیان کردە سەر دوژمن و بەرائیش زۆر قارەمانانە لەمەیدانا جەنگا، هەتا ئەوەبوو لەو غەزایەدا شەهید بوو. وە موسڵمانان سەرکەوتن! کەچی لەگەڵ ئەم هەموو قەدر وحورمەت وپلە وپایەی کە ئەم صەحابە هەیبوو لای خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرگیز ڕۆژێك لەڕۆژان نەکرا بەلێپرسراوو سەرکردەیەکی ناو موسڵمانان!

**حەزرەتی (عومەر) دەیفەرموو:** (لاتَسْتَعْمِلوُا البَرَّاء على جَيْشٍ، فَإِنَّهُ مهلكة مِنَ المَهالِكِ يقدمُ بِهِمْ).

واتە: بەراء مەکەن بەلێپرسراوی سەربازی هیچ سوپایەك!!، بۆچی ئەی ئەمیری ئیمانداران؟! فەرموی: چونکە ئەوەندە بەغیرەتە لەجەنگدا سڵ لەدوژمن ناکاتەوە وئەوەندە خۆی ولەشکرەکەی دەباتە پێشەوە هەتا لەناو دەچن!! کەوتە: مەرج نیە کەسی زۆر ئازا وبەغیرەت بکریٚ بەفەرماندەی سەربازی چونکە لەوانەیە لەیاسای جەنگ لابدا وسوپاکە بەهۆی ئازایەتی ئەوەوە بفەوتیٚ!..

- **نمونەیەکی تر:** عەبباسی مامی پێغەمبەر (ﷺ) داوای لەپێغەمبەری خوا کرد کەبیکات بەلێپرسراوو فەرمانڕەوا لە طائف. یان لەمەککە یان لەیەمەن. لەگەڵ

ئەو هەموو خزمەتەی کەعەبباس بە ئیسلام وپێغەمبەری خوای (ﷺ) کرد بوو. وەکو:

١- لەکاتی ناموسڵمانیدا بەشداری پەیمانی عەقەبەی دووەمی کرد، لەوشەوە تاریك وپڕ مەترسیەدا. هەرچەندە موسڵمانیش نەبوو. بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەك مامێك وکەسێکی نزیکی خۆی لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ چاوپێکەوتنی وەفدی مەدینە وبەستنی پەیمانەکە. کەئەمەش ڕادەی گەورەیی عەباس دیاری دەکات لەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ)

٢- هەر (عەبباس) بوو کەهەواڵی نارد بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ مەدینە کەئاگاداربە قورەیش وهاوپەیمانەکانی بەنیازن لەناکاودا بدەن بەسەر مەدینەدا وپێغەمبەر وموسڵمانەکان بۆ یەکجاری لەناوبەرن، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر سودمەند بوو لەم هەواڵە وخۆیان کۆکردەوە وخەندەقیان هەڵکەند.

٣- لەفەتحی شاری مەککەدا — دەوری کاریگەری بینی کە بە ئاشتی وبێ گرفت مەککە ڕزگار بکرێت. بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو دڵسۆزی وئەو هەموو خزمەتەی کەعەبباس بەپێغەمبەری خوا وئیسلام وموسڵمانانی کرد. لەوەڵامی داواکەیدا، کەداوای پۆست وپلەی کرد. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((**ياعَمَّ نَفْسُ تَنْجيها خَيْرٌ مِنْ إمارَةٍ لاتُحْصيها**)).

ئەی مامەی خۆشەویستم، نەفسێك ڕزگاری ببێت ولێی ئەپرسێتەوە لەسەر مافی خەڵکی. باشتر وچاکترە لەلێپرسراویەتیەك کەنەتوانرێ هەڵبگیرێ.

کەبەڕاستی ئەمە وانەیەکی گەورەیە بۆ لێپرسراوان کەمەسئولیەت وبەڕێوەبەرایەتی فەرمانگە وناوچەیەك نەدەنە کەسێك کەخزمیانە ولەبەرخاتری خزم خزمێنە بیکەنە لێپرسراو بائەوکەسە باش ودڵسۆز وئەمینیش بێ وەکو کەسی خۆی.

بەڵام کەشیاو نەبوو. نابێ پۆست وپلەی پێ بدرێ، وەتەنها وتەنهاش گەندەڵی لەبەڕێوەبردنی ولاتدا بەم ڕێنماییەی پێغەمبەری خوا لادەچێت ونامێنێت.

وەپێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەی بۆ صەحابەکان ڕوون کردەوە کەپێدانی پۆست ولێپرسراوی بەکەسێك مانای ئەوە نیە ئەوکەسە، یەکەم کەسی خۆشەویستی پێغەمبەرە(ﷺ)، نەخێر بەڵکو لەبەرئەوەیە کەشارەزا وپسپۆڕ ولێزانە لەو بوارەدا. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((**إِنِّي لأُؤَمِّرُ الرَّجُلَ عَلى القَوْمِ، وَفِيهِمْ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْهُ، لأَنَّهُ أَيْقَظُ عَيْناً وَأَبْصَرُ بالْحَرْبِ**)) رَواهُ البَيْهَقيّ.

واتە: بەڕاستی من کەلێپرسراوی دەدەمە کەسێك ودەیکەمە کاربەدەست لەسەر قەوم وگەلێك مانای ئەوەنیە کەس لەو باشترنیە. بەڵکو لەوقەوم وگەلەدا کەسی زۆر لەوباشتر ودیندارتر وپاکتر وچاکتر هەیە – وەکو ئاستی ژیانی تاك – بەڵام بۆیە ئەم دەکەم بەلێپرسراو، چونکە چاوکراوەتر وبەئاگاترە، واتە لەڕوی سیاسیەوە کەسێکی وریایە، وە لەجەنگدا بەرچاو ڕوونە وفەرماندەیەکی لێهاتوی بواری سەربازی یە. کەئەم فەرمودەیەش دووخاڵی زۆر گرنگمان لەمەرجەکانی سەرکردە بۆ دیاری دەکات.

١- بەرچاوڕونی لەبواری سیاسەت وکاروباری نێودەوڵەتی. نەك بێئاگا بژی لەوەزعی جیهان.

٢- شارەزابون لەکاروباری سەربازی. نەك بەپێی ئارەزوی خۆی. لەهەڵچون وتوڕەبونێکی ناخی خۆیدا شەڕێکی گەورە بەرپا بکات وگیانی سەربازەکانی بەفیڕۆ بدات.

- پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەجەنگی (ذاتُ السَّلاسل) دا. فەرماندەیی سوپاکەی سپارد بە (عەمری کوڕی عاص) هەرچەندە عەمر تازە موسڵمان بو بوو.

وە لەزەمانی بێ بڕواییدا زۆر دژایەتی پێغەمبەری خواو (ﷺ) موسڵمانانی کردبوو. بەڵام چونکە زۆر کەسێکی ووریا وزمان پاراو وشارەزای بواری جەنگ بوو کردی بەفەرماندەی دەیان هاوەڵی بەڕێزی کەچەندین ساڵ پێش عەمر موسڵمان بو

بوون. جاکاتێ جەنگی (ذاتُ السَّلاسل) کۆتـایی پـێ هـات. عـەمر سـەرکەوتنی گەورەی بەدەستهێناو ئەوەندەی تر ناوو ناوبانگی دەرکرد.

جاکاتێ کەگەڕایەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەدڵی خۆیـدا وای دەزانـی کەلەهەموو صەحابە بەڕێزترە و لە دڵـی پێغەمبـەر (ﷺ) خۆشەویسـترە چـونکە لەناو ئەو هەموو صەحابەدا ئەوی هەڵبژاردوەبۆ سەرکردایەتی کـردن. بۆیـە لـەناو کۆڕێکی گەورەدا چوە خزمەتی وعەرزی کـرد: (أَيُّ النّاسِ أَحَبُّ إِلَيْـكَ يارسُـولَ الله؟!).

واتـە: ئـەی پێغەمبـەری (ﷺ) چ کەسـێك لەهـەموو کـەس زیـاتر خۆشەویسـتە بەلاتـەوە وجێگـای لـەدڵتا زۆر گەورەیـە؟! پێغەمبـەر (ﷺ) یەکسـەر فـەرموی: عائیشەی خێزانم. عەمر فەرموی: (مِنَ الرِّجال؟!) مەبەستم ئەوەبوو لەناو پیاواندا کێ لەهەموو کەس خۆشەویسترە بەلاتەوە؟!

فەرموی: (أَبُوها) باوکی عائیشە. أبوبکر. عـەمر فـەرموی: ئـەی دوای ئـەبوبکر. فەرموی: عومەر. فەرموی: ئەی دوای عومەر. فەرموی: فلان. (فَعَدَّ رِجالاً) هـەر عەمر پرسیاری دەکرد وپێغەمبەری خوا کەسێکی دەگوت.

تا ئەوەبوو چەند کەسی ووت. عەمر دەفـەرموێ: (فَسَكَتُّ مَخافَةَ أَنْ يَجْعَلَـنِي في آخِرِهِمْ). منیش ئیتر بێدەنگ بوم لەترسـی ئـەوەی نـەوەك کـەس نـەمێنێ ومـن بکەومە کۆتاکەس لەخۆشەویستانی ناودڵی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم فەرمودەیە (مُتَّفَقٌ عليه ، بُخاري ومُسْلِم) ڕیوایەتیان کردوە.

لەم فەرمودەیەوە تێ دەگەین کەپێغەمبـەری خـوا (ﷺ) عـەمری کـوڕی عاصـی فەرمانـدەی لێهـاتوو وهـەموو صـەحابەی تـێ گەیانـد کـەکاتێ کەسـێك دەبـێ بەلێپرسراو مانای وانیە لەهەموو ئەوانەی کەئەو سەرکردەیانە باشترە.

بەڵکو زۆربەی هەرە زۆریان لـەو باشـترن لـەڕوی دینـداری وخواناسـی وعیبـادەت وخۆشەویستیان لەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەلاّم ئـەوەی کەبۆتـە هـۆی ئـەوەی

کەئەم بکرێ بەلێپرسراو ئەوەیە: کەشارەزای ئەو بوارەیە ودەتوانێ لەوانی تر باشتر بەڕێوەی ببات.

(سُبْحانَ الله) لەگەورەیی ئەم پێغەمبەری ئیسلامە. بەم شێوازە لێپرسراو پەروەردە دەکات وتێی دەگەیەنێ. جاکەلێپرسراو وفەرمانڕەوا ئەمەی زانی ئەوا:

١- هەرگیز تەکەبور وخۆبەزل زانینی لەدڵ دا دروست نابێ. کەوابزانێ ئەو لەژێر دەستەکانی باشترە، وەخۆی بەفیل بزانێ وئەوانیش بەمێروله.

٢- ئەوکاتە لێپرسراو وسەرکردە سوپاسی خوا دەکات کەلەناو ئەو هەموو کەسانەدا، خوای گەورە ئەم شارەزایی ولێهاتویەی بەم بەخشیوە ووەکو تاقی کردنەوەیەك پێ ی داوە. تاوەکو سوپاسی خوای لەسەر بکات وبڵێ: (هٰذا مِنْ فَضْلِ رَبِّي) نەك (هٰذا مِنْ فَضْلِ حِزْبِي!!). وە بەم شارەزایی وبەهرەیەش کەخوا پێ ی داوە خزمەتی هاولاتیان وگەل ونیشتمانەکەی خۆی پێ بکات.

- بەڕاستی هەرکات لێپرسراو وفەرمانڕەوا وکاربەدەست بەم قەناعەتەوە چوە سەر کورسی حوکم، ئیتر هەرگیز دیکتاتۆریەت دروست نابێ وئەمڕۆ دیموکراسیترین دەوڵەتی دنیا لەحوکمڕانیدا نەگەیشتۆتە ئەوەی کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دایناوە وبەعەمەلی پیادەی کردوە.

- وە هەرکاتێ کاربەدەست زانی ئەوکارەی پێی سپێردراوە پێی ناکرێ، چەند جوانە خۆی دەست لەکاربکێشێتەوە وکورسیەکەی چۆڵ بکات بۆ یەکێکی شیاو نەك وەکو قیڕ وسیکۆتین بەکورسیەکەوە بنوسێ وهەتا نەمرێ یان کورسیەکە لەژێریا نەڕزێ ودەسەلاتەکە لەناونەچێ بەری نەدات!!

وە پێویستیشە لەسەر کاربەدەستانی سەرو کاتێ زانیان کەئەو کەسەی کەئەمان دایاننناوە بەکاربەدەست ستەم دەکات، یان کاروباری خەڵکی پێ ناچێت بەڕێوە، یان پسپۆڕ نیە ولەئاستی ئەوکارەدا نی یە وپێشتر وایان نەناسیوە.

ئەوە پێویستە یەکسەر لەسەر کار لابرێت.

**پێشەوای دادپەروەر عومەری کوڕی خَطّاب دەفەرموێت:** (إِذا بَلَغَني عَنْ عامل ظالِمٍ أَنَّهُ قَدْ ظَلَمَ الرَّعِيَّةَ. وَلَمْ أُغَيِّرْهُ فَأَنا ظالِم)

ئەگەر هەواڵم پێ گەیشت کەیەکێ لەفەرمانڕەواکانمان زوڵم وستەم دەکات لەهاووڵاتیان — جازوڵم وستەم جاری واهەیە بەلێدان وگرتن وئەشکەنجەدان ومالّ خواردن وبەرتیل خۆری وخزم خزمێنە وپشتیوانی لەدەسەلأتدار وپشت کردن لەبێ کەسە، جاری واش هەیە کەزوڵم وستەمەکە بەوەیە کە لەکاروبار نازانێ وسەری لێ دەرناکات وئیشی هاووڵاتیانی پێ ناچێت بەڕێوە، بەڵام دەست لەکارناکێشێتەوە وکورسی وقەڵەمەکە ناداتە دەست کەسێکی شیاوو لێهاتوو، ئەوەش هەرستەمی لەمیللەت کردوە، بادینارێك یان دۆلارێکی لێ نەدزیبێ یان بەرتیلی وەرنەگرتبێ:

جا حەزرەتی عومەر فەرموی: ئەگەر زانیم ئەو کاربەدەستە ستەمی کردوو لامان نەداو کەسێکی شیاومان لەشوێن دانەنا. ئەوا من خۆم کەسەرکردەی یەکەمی وولأتم ستەمکارم!!

**مافی شەشەم:** دەبێت لێپرسراو باش لەوە تێ بگات کە لێپرسراویەتی (تەشریف) نیە بەڵکو (تەکلیفە)، بۆ ئیسراحەت نیە بەڵکو بۆ خزمەت کردنە، بەمەبەستی ئەوەی ڕەزامەندی خواو خزمەتی میللەتەکەی بەدەست بهێنێ.

دەگێڕنەوە کەپێشەوا (عومەری کوڕی خَطّاب) زۆربەی جار بەدانیشتنەوە خەوی لێ دەکەوت، عەرزیان کرد بۆچی بەشەواندا تێرناخەوی. یان بۆچی بەڕۆژدا چەند کاتژمێرێك لەماڵەوە دانانیشی وپشوو بدەی؟! **لەوەلأمدا فەرموی:** (إِنْ نُمْتُ النَّهارَ ضَيَّعْتُ حَقُ الرَّعِيَّةِ. وَإِنْ نُمْتُ الَّيْلَ ضَيَّعْتُ حَقَّ رَبِّي).

ئەگەر بە ڕۆژدا بخەوم ئەوا مافی هاووڵاتیانم بەفیڕۆ دەدەم. وەئەگەر بەشەویش بخەوم ئەوا مافی پەروەردگارم دەفەوتێنم، کەپێویستە بۆ خۆراکی ڕۆحم وهێزی دەرونم، کەلەکاروباری ڕۆژدا یارمەتیم دەدات، شەوانە چەند کاتێك لەخزمەت

پەروەردگارمدا گفتوگۆ بکەم وشەونوێژ بکەم وبپارێمەوە بۆخۆم ومالّ ومنالّم وتێکڕای ئوممەتی ئیسلامی. کەخوای گەورە یارمەتیم بدات ئەم ئەرکی لێپرسراویەتیە بەجوانی جێ بەجێ بکەم وشەرمەزاری بەردەم خوای گەورە وئوممەتی ئیسلامی نەبم. کەبێگومان هەرکەسێ پەیوەندی لەگەلّ پەروەردگاریدا بەهێز نەبێ وخوای گەورە پشتیوانی لێ نەکات، بەرەکەت لەکاروباریدا نابێت وسەرکەوتوو نابێت.

بەلّێ لێپرسراویەتی لەئیسلامدا بۆ پشوودان وپالّدانەوە نی یە، بەلّکو ئەوکاتە ئەرکی قورس وگران دەست پێدەکات، هەربۆیە کاتێ خۆشەویستمان – پێغەمبەری خوا (ﷺ) – بوو بە پێغەمبەر وخاتوو خەدیجە پێ ی فەرموو: ئەوەندە خۆت ماندوو مەکە وەرە هەندێ پشوو بدە وبخەوە. فەرموی: ئەی خەدیجەی دلّسۆز وخۆشەویستم، ئەزانم تۆ چەندە لەخەمی منداى. بەلاّم (مَضَى عَهْدُ النَّوْم) ئیتر لەمەودوا باری ئەم ئوممەتەم لەسەر شانە بۆیە کاتی خەوتن تێ پەڕی وبەسەرچوو!!

**وە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا چەسپاوە کە:**

نابێ کاربەدەست بەلّێندەرایەتی (مقاوەلات) وپرۆژەی ئابوری هەبێ، پێغەمبەری (ﷺ) فەرموی: (مِنْ أَخْوَنِ الخِيانَةِ تِجارَةُ الوالي في رَعِيَّتِهِ). الجامِعُ الصَغير لِلإمام السيوطي: رَقَمْ: ٨٢٢٣.

واتە: لەناپاکی ترین ناپاکی یە کەلێپرسراو بازرگانی لەناو گەلەکەیدا بکات وپرۆژەی ئابوری دەولّەت (مقاوەلات) بەدەستی ئەوەوە بێت. بۆچی؟!

چونکە کەس ناتوانێ لێپرسینەوەی بەرامبەر بکات، لەسەر پرۆژەی خراپ وسەرەنجام گەندەلّی دروست دەبێت.

هەروەکو ئەمڕۆ دەبینین هەرچی پرۆژەیەك دەکرێت بەشی بەرپرسێکی بالاّدەستی پێوەیە. بۆیە پرۆژە زۆر جێ بەجێ دەکرێ وپارەیەکی زۆری حکومەت بۆ پرۆژە خزمەت گوزاریەکانە کە ولاّت ئاوەدان بکاتەوە ومیللەت بحەسێنێتەوە، بەلاّم

چونکە کاربەدەستان پشك وبەشیان هەیە لەو پرۆژانەدا ودەستی مەسئولێکی گەورەی لەپشتەوەیە، بەکەم وکورتی وسەقەتی جێ بەجێ دەکرێت ودروست دەکرێت وبەشێکی زۆری ئەوپارەیەی بۆی تەرخان کراوە دەخورێت وکەسیش نیە لەئەندازیار وچاودێرانی پرۆژەکە بتوانێت ڕەخنەبگرێت، چونکە نەقلّ وفەصلّ دەکرێت!!

**کەواتە:** ئەگەر حکومەت دەیەوێت گەندەڵی لاببات ئەوا بابێت ئەم فەرمودە زێڕینەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بخاتە بواری جێ بەجێ کردنەوە وئیتر هیچ بەرپرسێك بۆی نەبێت ببێتە بەڵێندەری پرۆژەی حکومی، یان شەریك وهاوبەشی لەپرۆژەیەکدا.

- وە نابێت کاربەدەست بۆیە پلە ودەسەڵات بگرێتە دەست، بە ئومێدی ئەوەبێت کەپارەی زۆر وبێ عەزیەتی دەست بکەوێت و لەپڕێ ببێ بەکوڕێك.

تەماشاکەن کاتێ کە حەزرەتی (أبوبکری صدیق) بوو بە خەلیفە فەرموی: (أَعْطُونِي كَأَوْسَطِ رَجُلٍ مِنْ قُرَيْش، لَيْس بِأَدْناهُمْ وَلا أعلاهُم).

هەزاران ڕەزا وڕەحمەتی خوات لەسەربێت ئەی صدیقی ئیسلام. چەند ووشەی کورت بەڵام چەند پڕمانا وبەپێزت بۆ بەجێ هێشتین. فەرموی: (أَعْطُونِي) پێم بدەن. نەك بۆخۆی چونکە خەلیفەیە بەئارەزوی خۆی پارە لەماڵی دەوڵەت هەڵبگرێت.

کەواتە ئەوەی چەسپاند کەدەبێ سەرکردەی یەکەمی ووڵات — تا کۆتا پلەداری حکومەت — موچەکەی بەئاگاداری میللەت بێ و ڕەزامەندی گەلی لەسەربێت!

**پاشان فەرموی:** وەکو کەسێکی قوڕەیش لەمهاجرین کەموچەیەکی ناوەندم هەبێ نە لەهەموو کەس کەمتر، نەوەکو زۆرترین موچەی موهاجرێکی قوڕەیش لە پلەی موچەدا!! کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت. زۆر هاوڵاتی هەبوە کە پلەی موچەکەی زۆر لەخەلیفە زیاتر بووە!!

وە ئەمە یەکەم جاربوو کە کاربەدەستی ئاوا بێتە سەر کورسی فەرمانڕەوایەتی کە ئاوا بێ تەماح بێت بەرامبەر ماڵی گشتی حکومەت ومیللەت.

ئایا ئیسلام دواکەوتویی یە و بەکەڵکی ئەوە نایەت حوکمی پێ بکرێت چونکە سەرکردە هەموو سامانی وولات بەئارەزوی خۆی لەناودەبات وتەخش وپەخش دەکات. یان لەبەرئەوە بەکەڵکی حوکم کردن نایەت چونکە دەستی لێپرساوی ناپاك دەگرێت وبۆ مێژوو دەیسەلمێنێ کەیەکەم خاوەن پلەوپایەی ئیداری لە وولاتدا موچەکەی کەمترە لەزۆر لەهاولاتیانی وولاتەکە!!

ئیتر کەئەمەش جێ بەجێ کرا، ئەوکاتە سەرکردە دەزانێت کە ئەگەر لەسەرکار لاچوو، نەك موچەکەی بۆ خۆدەوڵەمەندکردن لەسەر حوکم بێنێتەوە، بەڵکو بۆ خزمەت کردنی زیاتر دەمێنێتەوە!..

- **هەروەها حەزرەتی عومەری کوڕی خَطّاب دەیفەرموو:** من وئەم ماڵ وسامانی حکومەتە کەلەژێر دەستم دایە، وەکو ماڵی هەتیوو بێ باوك تەماشای دەکەم. ئەگەر دەوڵەمەند بم. ئەوا بەپێ ی پێویست وبەچاکە لێ ی دەخۆم!

**عبدالله ی کوڕی عومەر بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت:** هەندێ ووشترم کڕی وپاشان بۆئەوەی کەوا قەڵەوبن بیانفرۆشمەوە بەقازانجێکی باش، بردمن بۆ لەوەڕگای گشتی. ئەوەبوو ماوەیەکی باش لەوێ مانەوە، تاوەکو قەڵەوبون.

ئەمجا بردمن بۆ بازاڕی فرۆشتنی ئاژەڵ ولەبەرجوانی وقەڵەویان کڕیار دەهاتن بۆ تەماشا کردنیان، لەوکاتەدا باوکم (حەزرەتی عومەر) ئەمیری ئیمانداران — هاتبوو بۆ بەسەرکردنەوەی بازاڕی ئاژەڵ فرۆشتن، کەچاوی بەو ووشترە قەڵەوە بەرچاوانە کەوت. فەرموی: ئەمانە هی کێن؟ ووتیان: هی عبدالله ی کوڕتە. فەرموی: بەخ، بەخ، کوڕی ئەمیری ئیمانداران!! ئادەی بۆم بانگ بکەن. بەپەلە ڕام کرد وچومە خزمەتی وعەرزم کرد: چی دەفەرموی ئەی باوکە گیان، ئەی ئەمیری ئیمانداران؟! فەرموی: وەرە بۆم باس بکە ئەم ووشترە قەڵەوانەت لەکوێ بون؟! ووتم: قوربان ئەم ووشترانەم بەپارەیەکی کەم کڕین، چونکە لەڕ ولاواز وبێ گۆشت بون، پاشان بردمن

بۆ لەوەڕگای گشتی ولەوێ ماوەیەکی زۆرمانەوە وباش خزمەت کران وئاوا قەڵەو وجوان بون وئەمجا بەتەمام بیانفرۆشم.

**حەزرەتی عومەر فەرموی:** بەڵام لەلەوەڕگای گشتی دا جیاوازی ووشترەکانی تۆ کراوە لەگەڵ ئەوخەڵکەدا، ووتویانە: ئادەی باش ووشترەکانی کوڕی عومەری ئیمانداران بلەوەڕێنن، ئادەی باش ئاویان بدەن، کام شوێن لەوەڕی خۆش بوە بەهۆی سود بینین لەناوو پلەی من لەوێ بۆیان لەوەڕاندوی ولەباشترین وسازگارتین کانی وئاو بۆیان ئاوداوی، ئیتر لەبەر ئەوە ئەم ووشترانە بفرۆشە وسەرمایەکەی خۆت چەندە، کاتی خۆی چەندت بەو ووشترە لاوازانە داوە. ئەوەندەی لێ هەڵبگرەوە وزیادەکەی بخەرەوە ناو (بَيْتُ المـال)ی موسڵمانانەوە، چونکە ناوو پلەی من لەحکومەتدا نابێ ببێ بەمایەی سود گەیاندنی ماددی بەکوڕەکەم!!

جا ئایا ئیسلام کۆنە پەرستیە؟! ئایا ئەگەر ئەم ویژدانە زیندوە، ئەم سەرکردە دادگەرە حوکمی جیهان بکات، مرۆڤایەتی هیچ گرفتێکی ئەمڕۆی دەمێنێت؟! ئایا بەم حوکمە جوانە عومەریە نەبێت گەندەڵی لەبواری ئیداری وئابوری حکومەتدا لادەچێت؟! بێگومان نەخێر. وەپێشەوا (عەلی کوڕی ئەبوطالب)یش هەروەها خۆی لەبەکارهێنانی پارەی گشتی میللەت دەپاراست ئەوەبوو لەبەرنەبونی وهەژاری شمشێرەکەی کەناسراوە بە (ذُوالفَقّار) لەبازاڕی کوفەدا فرۆشت. چونکە ئەوەندە پارەی نەبوو پێویستیەکانی ماڵ ومناڵەکەی دابین بکات.

**مافی حەوتەم:** پێویستە کاربەدەستان ڕێز لەئاین وبیرو باوەڕی میللەت بگرن، ئەمڕۆ بەچاوی خۆمان دەبینین لەعەلمانیترین دەولەتی سەرزەویدا. سەرکردەی وڵاتەکانیان دەچنە کەنیسە وبەڕێنمایی پیاوانی کەنیسە کاردەکەن، هەروەکو پێشتریش کاتی کۆبونەوەی سەرۆکی ئیسرایل لەگەڵ فەلەسطینیە کان لە میصر کرا، چونکە ڕۆژی شەممە بوو. سەرۆکی جولەکە بەپێ ڕۆیشت بۆ شوێنی کۆبونەوەکە وسواری ئۆتۆمبێل نەبوو!

ئەی باشە ئاینی پیرۆزی ئیسلام دینی دونیا وقیامەتە. ئەوە ئیسلامە کەباسمان کرد چۆن مافی میللەت دیاری دەکات لەسەر کاربەدەست وبەپێچەوانەشەوە، کە

بەڕاستی هیچ بەرنامە ویاسایەك نەیتوانیوە ئاوا بەوردی ئەو مافانە دیاری بكات وپیادەی بكات.
چونكە ئیسلام جێ بەجێ كردنی ئەومافانەی بەستۆتەوە بەقیامەتەوە. بەستویەتیەوە بەچاودێری خواوە. لەبەرئەوە نابێ ونەشیاوە ونایاسابییە. كارێك، كردەوەیەك كە (٩٥٪) زیاتری میللەتێك لەدیدی ئاینەكەیەوە بەخراپ وحەرامی بزانێت، حكومەت وكاربەدەست لەبەرخاتری (٥٪)ی خەڵكی لادەر وخراپەكار ڕێگەی پێ بدات، وەكو عەرەق وقومار!!
وەئەی میللەتی موسڵمان، چاوو دڵتان ڕون وگەش بێ، سەرتان بەئیسلامەتیەكەتان هەربەرزبێ لاتان یەقین بێ كەئەم ئیسلامە هیچ هێزێك نیە بەینی بێنێ، تەنانەت دوژمنەكانی لەماڵی خۆیاندا ئیسلام چۆكی پێداداون. ئەوەتا لاپەڕەكانی مێژوو وێنەكان بۆمان دەگێڕنەوە كەئەو (مصطفى كمال أتاتورك)ەی كەهەرچی داب ودەستوری ئیسلامەتی بوو لەتوركیا لای برد، لەچكی ئافرەتانی بەهەموو شێوەیەك قەدەغە كرد، كەچی بۆیەك ساتیش نەیتوانی لەچكی سەری هاوسەرەكەی خۆی لابدات ووێنەكەی هەیە!. خوای گەورە دڵی ئەو ژنەی واڕاگیراو كرد كەلەچكەكەی سەری دانەنێ بۆئەوەی شكست بەرامبەر ئیسلام نیشانی ئەتاتورك بدات هەرلەماڵەكەی خۆی دا.

**وە بۆ ئاسودەیی دڵتان پێتان دەڵێم:**

كە ئاگاداربن لە موسڵمان بونی ئەم كەسایەتیە ناودارانەی ئەوروپا و جیهان:

١- زانای ئەتۆم لەبەریطانیا خاتوو: (كریستین جاك هیلین) كەناوی خۆی ناوە ئامینە.

٢- (تیف جۆنسۆن) مامۆستای مێژوو لەزانكۆی ئەندیان، كەناوی خۆی ناوە فاروق.

٣- (جاك ئیلس) حاكمی شاری (میشیگان) لەویلایەتی جۆرجیا كەلە (٢٠٠٧)دا موسڵمان بوو.

٤- ئەندازیاری بیناسازی لەستۆكهۆڵم (ماكس داهس تراند).

٥- پرۆفیسۆری ڕوسی (فولتین بروسا كوف) كەمامۆستای (كۆندە لیزە رایس) وەزیری پێشوی دەرەوەی ئەمریكا بوو، بۆ فێربونی زمانی ڕووسی.

٦- سەرۆكی ژوری بازرگانی پاریس (بیربو نارد).

٧- كوڕی وەزیری تەندروستی بەریطانیا (جۆفرانك دوبسۆن) كەناوی خۆی ناوە (ئەحمەد).

٨- (بێنگت یوها نسۆن)ی سویدی خاوەنی بڕوانامەی دكتۆرا لەهەندەسەی ئەلكترۆنی كەئێستا یەكێكە لە بانگخوازی ئیسلام لەسوید.

٩- سیاسەتمەداری ئەمریكی (دكتۆر ڕۆبەرت كرین) بڕوانامەی دكتۆرا لە یاسا وسیاسەت وپسپۆر لەیاسای نێودەوڵەتی وڕاوێژكاری سەرۆكی پێشوی ئەمریكا لەكۆشكی سپی. كەئێستا ناوی خۆی ناوە (فاروق عَبْدُالحَق)!

جاتۆ بڵێ ی ئەمانە كۆنەپەرست ونەزان بن و بێ دینەكانی ئێمە زانابن؟!!

**وە بزانن:** كاربەدەست چۆن بێ، میللەتیش ئاوا دەبێ. زانای گەورە (الطرطوشی) لەكتێبی – سِراجُ المُلوُك – دا ، ج١، ص٢٥٠ دەفەرموێ:

(النّاسُ عَلى دينِ المَلِكِ إلاّ القَليلَ) خەلكی لەسەر ئاینی پاشا ودەسەلاتدارەكانن مەگەر كەمێكیان نەبێت. لێرەدا مەبەست لەدین (ئاین) بیر وباوەڕ نی یە، بەلكو ڕەفتار وڕەوشت وهەڵس وكەوتە. بۆ نمونە:

١ – لەسەردەمی فەرمانڕەوایی (حەجاجی كوڕی یوسفی ثە قە فی)دا، كاتێ بەیانیان لەخەو هەڵدەستان لەیەكتریان دەپرسی: ئەرێ ئەمشەو كێ كوژراوە؟ ئەی ئەمشەو كێ هەڵواسراوە ولەسێدارە دراوە؟ ئەی كێ قەمچی باران كراوە؟ ئەی كێ

دەستی بڕدراوە؟ چونکە حەجاج ودار ودەستەکەی هەرخەریکی کوشتن وهەڵواسین وقەمچی لێدانی خەڵکی بون. دەنگ وباسی ناو خەڵکیش هەرکوشتن ولێدان بوو:..

٢ — وە لەسەردەمی (وەلید)دا کەهیواو ئاواتی کارگە وباخ وباخات بوو، خەڵکی لەسەردەمی ئەودا باس وخواسیان هەرباسی کۆشك وخانوی بەرز وکارگەی فلان وجۆگە هەڵبەستن ونەم ناشتن وباخ دروست کردن بوو. هەروەکو حەز وئارەزوی کاربەدەست وفەرمانڕەواکەیان.

٣ — وەکاتێك (سولەیمانی کوڕی عَبْدُالمَلِك) بوو بەفەرمانڕەوا. کەهەموو ئاواتی ژن وناوباسی ئافرەت وخۆراکی خۆشی بوو. خەڵکەکەش دەنگ وباسی ناوکۆڕ ومەجلیسیان هەرباسی ژن خواستن وژنی جوان وخواردنی خۆش بوو. هەربیریان لەوە دەکردەوە.

٤ — بەڵام کاتێك خەلیفەی دادپەروەر (عومەری کوڕی عَبْدُالعَزیز) بوو بەخەلیفە، چونکە بۆخۆی هەرخەریکی قورئان خوێندن وزیکری خواو شەونوێژ وڕۆژوی سوننەت بوو، لەگەڵ بلاوکردنەوە وچەسپاندنی دادپەروەری لەناو خەڵکیدا. خەڵکەکەش باس وبابەتیان ئەوەبوو کەپرسیاریان لەیەکتری دەکرد:؟. مانگی چەند خەتمی قورئان دەکەیت؟! ئەی چەند ڕۆژوی سوننەت دەگری لەمانگێکا؟! ئەمە باس وقسە وپرسیاری ناوکۆڕ ودانیشتنەکانی خەڵکی بوو، هەروەکو پێشەواکەیان عومەری کوڕی عَبْدُالعَزیز.

**لەکۆتایی ووتارەکەماندا**. ئاماژە بۆ ڕاستی یەك دەکەین کە: ئەونەوەیەی کەلەناو زوڵم وستەمدا گەورە بێ هەرستەمکار دەردەچێ وپێچەوانەکەشی ڕاستە. هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: **((لايَلْبَثُ الجَوْر بَعْدي إلاّ قَليلاً حَتَّى يطلع، فَكُلَّما طلعَ مِنْ الجَوْرَ شَيٌ، ذَهَبَ مِنَ العَدْلِ مِثْلُهُ حَتَّى يُولَدَ في الجَوْرِ مَنْ لايَعْرِفُ غَيْرَهُ))**.

واتە: ستەم وزوڵم دوای من هەرماوەیەکی کەم بەداپۆشراوی ونادیاری دەمێنێتەوە، پاشان دەردەکەوێ وکەدەریش کەوت، هەتا شتێك لەستەم دەربکەوێت، ئەوا بەهێندەی ئەوستەمە دادپەروەری وعەدالەت دەڕوات ونامێنێت. هەتا وای لێ دێ

ئەوەی لەدایك دەبێ وگەورە دەبێ تەنها هەرزوڵم وستەمی دیوە ودادگەری نەبینیوە، هەربۆیە تەنها ستەم دەناسێ ووادەزانێ شتێك نیە بەناوی دادگەری.

دەفەرموێ: ((ثُمَّ يَأْتِيَ اللهُ تبارَكَ وَتَعالى بِالْعَدْلِ، فَكُلَّما جاء مِنَ العَدْلِ شيءٌ، ذَهَبَ مِنَ الجَوْرِ مِثْلَهُ، حَتَّى يُولَدَ فِي العَدْلِ مَنْ لايَعْرِفَ غَيْرَهُ)). رَواهُ أَحْمَد فِي المُسْنَد.

واتە: پاشان خوای گەورە دادپەروەری وعەدالەت دێنێتەوە، جا بە هەرچەندە لەدادگەری دەربکەوێت، ئەوا ئەوەندە لەزوڵم وستەم لادەچێت. تاوای لێ دێ دادگەری ستەم لادەبات وئەونەوەیەی لەدایك دەبێ لەجیهانێکی پڕ لەدادگەری وعەدالەتدا چاوی هەڵدێنێ وپێ دەگا وگەورە دەبێ وجگە لەدادگەری شتێکی تر ناناسێ ونازانێ دنیای ستەم چۆنە.

بەڵێ هەموو ئەوکەسانەی کەلەژێر ستەمی فەرمانڕەوای زاڵمدا لەدایك دەبن وگەورە دەبن چونکە هەرزوڵم وستەم وچەوساندنەوەیان بینیوە، وادەزانن دنیا هەموی وایە ودادگەری وعەدالەت ویەکسانی تەنها هەرووشەی ناوکتێبن وخەیاڵی شاعیران ونوسەرانن!

**بەپێچەوانەشەوە**. ئەوەی کەلەحوکمڕانیەکی دادگەردا لەدایك ببێ وپێ بگات، وادەزانێ زوڵم وستەم ودرۆ وخیانەت. تەنها ووشەن وبۆ بەرامبەری ووشە جوان وپاکەکان دانراون ئەگینا لەکرداردا کەس نیە بیانکات!

خوای پەروەردگار ووڵاتی کوردستانی پیرۆزی ئێمە وسەرجەم ووڵاتان پڕبکات لەدادگەری وعەدالەت ولەستەم وستەمکاران وستەمکاری بمانپارێزێت.

﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾

ٱللَّهُمَّ آمِين

# سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز.

٢- تەفسیری ئاسان ، بورهان محمد أمین.

٣- الأَخلاق السِّياسِيَّة ، محمد زكريا النَدَّاف ، ص٢٣٢، ص١٤١، ص٢٧٣، ص٣٧٢، ص,٢٢٩

٤- الحُقوق الإِسلامِيَّة ، سَعْد يوسف أبوعَزيز ، ص٧٤٤، ص,٧٧٠

٥- صُوَرٌ وَمَواقِفٌ مِنْ حَياة الأَنبياء وَالصّحابَةِ وَالتّابِعينَ ، محمود المصرى ، ج٢ ص,٤٨٣

٦- دَوْرُ القِيَم وَ الأخَلاق في الإِقتِصاد الإِسْلامي، د.يوسف القرضاوى ص,٤٢٦

٧- ڕۆژنامەی یەکگرتوو، ژمارە: ٦٧٣ لە ٢٠٠٨/١/٢٢ ، ل١٠

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيِّدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجمعين.

**ئیمانداران:** لەووتارەکانی ڕابردوودا باسی میللەتمان کرد لەسەر کاربەدەستانی وولات. بەپشتیوانی خوای گەورە لەم ووتارەشدا باسی مافەکانی کاربەدەست دەکەین لەسەر میللەت.

**مافی یەکەم:** گوێڕایەڵی کاربەدەست لەسنوری شەرعدا:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ ﴾ النساء: ٥٩

واتە: فەرمانبەرداری و گوێڕایەڵی خوای گەورە بکەن، وەفەرمانبەرداری و گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا. (محمد) (ﷺ) بکەن لەگەڵ فەرمانڕەواکانی خۆتان.

**جاسەرنجی ئایاتەکە بدەن.** نەیفەرموو: (وَأَطِيعُواْ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ) ووشەی (أَطِيعُواْ)ی دووبارە نەکردەوە، بۆچی؟! لەبەرئەوەی کاربەدەستان و فەرمانڕەوای سەر موسڵمانان لەبەرخاتری خۆیان گوڕایەڵیان ناکرێ و بەقسەیان ناکرێ.

بەڵکو لەبەرئەوە بەقسەو بەگوێیان ئەکرێ چونکە فەرمان دەکەن بەگوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ).

جا هەرکاتێ فەرمانڕەوا فەرمانی بەخەڵکی کرد کەگوێڕایەڵی بکەن لەشتێکدا کەخواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی ڕازی نین ئەوە بەگوێی ئەو کاربەدەستە ناکرێت. واتە: لە چوارچێوەی شەرعدا گوێڕایەڵی دەکرێت بەڵام لەئایەتەکەدا لەگەڵ (ٱلرَّسُولَ) دا، ووشەی ( أَطِيعُواْ ) ی، دووبارە کردەوە چونکە: ﴿ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَۖ ﴾ النساء: ٨٠

هەرکەسێ گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکات و بەقسەی بکات. ئەوە گوێڕایەڵی خوای گەورەی کردوە. چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) (مَعْصوم) و

پـارێزراوە لەلایـەن خـواوە کەتووشـی ڕەفتـارو گوفتـاری هەڵـەو نابـەجێ ببێـت.
بەڵام کاربەدەست مەعصوم نیەو تەنها لەچوارچێوەی شەرعدا گوێڕایەڵی دەکرێت، لەبەرئەوەی ئەویش مرۆڤەو قابیلی ئەوەیە تووشی هەڵەو بڕیاری هەڵەدان ببێت.
ئەمەش ئەو بابەتـە گرنگەیـە کەئـەمڕۆ جیهـان داوای دەکـات کـەنابێ سـەرکردە کوێرانە گوێڕایەڵی بکرێت. بەڵکو دەبێ سـەرکردەش پابەنـدی (یاسـا و دەسـتوری وولات) بێت و ئەگەر لەدەستور دەرچـوو ئـەوا گوێڕایـەڵی ناکرێـت و لەسـەر کـار لادەبرێت. کەئەمە لـەقورئانی پـیرۆزدا چەسـپاوەو ئیسـلام کردوویـەتی بەیاسـای گوێڕیەڵی بۆ سەرکردە! هەر بەم ئایەتـە قورئانیـەش دیکتاتۆریـەت و خۆسـەپێنی کاربەدەست و چەپڵەلێدان و بژی و بڕوخێی میللەت بەکوێرانە، لادەبرێت.

**ئایا (وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ کێیە؟)**

**إبنُ عَبّاس** دەفەرموێ: يَعْنِي أَهلُ الفِقْهِ وَالدِّينِ.

واتە: ئەوانەی ئەهلی زانستی شەرعی خواپەرستی بەڕاسـتین، دەبـێ گوێڕایـەڵیان بکرێت چونکە ئەگەر شارەزای شەرع بوو. ئەوا بەپێی شەرع – بەیاسا و دەستور – حوکم دەکات بەظاهری و بۆناخی خۆشی دڵسۆز دەبێت بەرامبەر گـەل و میللـەت چونکە بەردەوام خوای گەورە بەچاودێر بەسەر خۆیەوە دەبینێـت و بـەنهێنی. بـەبێ چاودێری میللەت خیانەتیان لێ ناکات و دەسـەڵاتەکەی بـۆ بەرژەوەنـدی تایبـەتی خۆی بەکارناهێنێت..

**ئیمانداران:** پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەفەرمودەیەکـدا باسـی باشـترین و چـاکترین سەرکردەمان بۆ دەکات و دەفـەرموێت:(( **خِيارُ أَئِمَّتِكُم الَّذينَ تُحِبُّونَهُمْ وَيُحِبُّونَكُمْ**

وَتُصَلُّونَ عَلَيْهِم – أَيْ تدعُونَ لَهُم – وَيُصَلُّونَ عَلَيْكُم، وَشِرارُ أَئِمَتِكُم الَّـذِينَ تُبْغِضُونَهُم وَيبغضُونَكُم وَتلعنونَهُم وَيلعنونَكم)) رَواهُ مُسْلِم: ١٨٥٥

واته: باشترین سەرکردەو پێشەواکانتان ئەو کەسانەن کەئێوە – میللەت – خۆشتان دەوون و ئەوانیش ئێوەیان خۆشدەوێت. ئێوە دوعای بەخێریان بۆ دەکەن و ئەوانیش دوعا بۆ ئێوە دەکەن. خراپترین کاربەدەستانیشتان ئەوانەن کـەئێوە ڕقتـان لەوانـەو ئەوانیش ڕقیان لەئێوەیە. نەفرەتتان لێ دەکەن – لە پاشملە کاتێ کەچـاویان لێتـان نیە، بەمیللەتتان نازانن و بەعیللەت و نەخۆشیتان دەزانن. ئێوەش وەکـو میللـەت لەپاشملە کەچاوتان لێیان نیـەو لـەماڵی خۆتـان و کـۆڕو کۆبونەوەکانتانـدان تـف و نەفرەتیان لێ دەکەن و دەخوازن خوا لە ناویان بـەرێت و کورسـی حوکمیـان لـەژێر لابچێت:

**کەواتە:** پێویستە حکومەت و میللەت لەیەك سەنگەردابن، نەك نـەفرەت لەیـەکتر بکەن. وولاتـانی پێشـکەوتوو بـەوە پێشـکەوتوون کـە کاربەدەسـت و میللـەت و هەردووکیان لەیەك سەنگەردان و وەکو دووباڵی مەلێك بەهەردووکیان لەشەقەی باڵ دەدەن بۆ بەرزبونەوەو پێشکەوتن.

بەلاَم وەکو ووتمان گوێڕایەڵی کاربەدەست هەر لەچاکەدا دەکـرێ. پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویەتی ((عَلى المَرْءِ المُسْلِمِ السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ فيما أحب وَكرِهِ. إلاَّ أَنْ يُؤْ مَرَ بِمَعْصِيَةٍ فَأذا أُمِر بِمَعْصِيَةٍ فَلا سَمِعَ وَلاطاعَةَ)). رَواهُ البُخـاري (٦٨٢٥) وَمُسْلِم (١٨٣٩).

واته: پێویستە لەسەر مرۆڤی موسڵمان کەگوێڕایەڵ و فەرمانبەرداربێ بۆ ئەوەی کە لەسەر کردەکەیەوە پێی دەگات، جاپێی خۆش بێ ئەو فەرمانە، یان لەدڵی گران بێ وپێی ناخۆش بێ. مەگەر سەرکردەکەی فەرمانی پێ بکات بەگوناهو تاوان.

جا هەرکات فەرمانی پێکرد بەتاوان و بێ شەرعی. ئەوا نەگوێی لێ دەگرێ و نەبەقسەی دەکات.

**بەڕێزان:** پێم خۆشە سەرنجتان بۆ دوو وشە لەم فەرمودەیەدا ڕابکێشم. یەکەمیان: وشەی (السَّمْع) دووەمیان ووشەی: (الطّاعَة). کەئەوەمان تێدەگەیەنێ.

موسڵمان تەنها بەڵێ قوربانی لەسەر نیەو پێش جێ بەجێ کردنی فەرمان و بەڵێ بەسەرچاو، دەبێ (السَّمْع)ی هەبێ واتە بەجوانی تێگەیشتبێ کەچ فەرمانێکی بەسەردا دەدرێ، جابێگومان قسەکە جوان بەدڵ گوێت بۆ گرت. بیری لێدەکەیتەوەو لەبێژنگی دەدەی و چاك و خراپی لێك جیادەکەیتەوە و بڕیاری لەسەر دەدەی، کەواتە دەبێ یەکەمجار جوان گوێ لەفەرمانی سەرکردە بگرین.

ئەمجا بەڵێ ی بۆ بکەین، نەك هێشتا نیوەی قسەکەی تەواو نەکردووەو هەر (مُبْتَدأ)ی وتوەو (خَبَر) دیارنیە دەست بکەی بەچەپڵەلێدان و بەڵێ قوربان!!

بۆ زیاتر ڕون کردنەوەو تێگەیشتن لەم باسە گرنگە. گوێ بگرن بۆ ئەم بەسەرهاتە کەلە (هەردوو صەحیحی پێشەوایانی فەرمودە بوخاری و مُسْلِم)دا هاتوەو لەپێشەوا عەلی کوڕی ئەبی گالبەوە دەیگێڕنەوە. کە ئیمامی عەلی دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆمەڵە صەحابەیەکی نارد بۆ شوێنێك، کەسێکی یاریدەدەری (أَنْصار) ی کردە سەرکردەو لێپرسراویان و فەرموی: ئەم پیاوە لێپرسراو و فەرماندەتانە. گوێڕایەڵی بکەن و لەفەرمانی دەرمەچن. پاشان خواحافیزی لێ کردن و ئەوانیش لەشاری مەدینە دورکەوتنەوە، لەکاتی گفتوگۆ و قسەکردندا. سەرکردەکەڕقی هەڵساو لەناخی خۆیدا توڕەبوو.

پاشان ڕووی کردە ئەو کۆمەڵە صەحابیەی کەئەم سەرپەرشتی دەکردن و پێی ووتن: ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێ نەکردن کەگوێڕایەڵیم بکەن و بەقسەم بکەن؟ ووتیان: بەڵێ، ووتی: دەی فەرمانتان پێ دەدەم دارو چیلکەو پووش و

پەلاّشم بۆ کۆبکەنەوە. ئەوانیش دارو چیلکەیەکی زۆریـان کـۆکردەوە، ووتـی: دەی ئێستا ئاگری پێوەبنێن. ئاگریانداو گڕیەرز بۆوە! سـەرکردە ووتـی: فـەرمانتان پـێ دەکەم دەبێ خۆتان بخەنە ئەو ئاگرەوە!! (فَقالَ لَهُمْ شابٌ مِنّهُمْ) گەنجێك ڕوی کـردە سەربازەکان و پێی ووتن: (إنّما فَرَرْتُم إلى رَسُولِ الله (ﷺ) مِنَ النّارِ، فَلا تعْجلُـوا حَتّى تلقوا رَسُولَ الله (ﷺ). فإنْ أمَرَكُمْ أن تَدْخُلُوها فَادْخُلُوها).

بەڵێ گەنجێك هەڵسا (خۆزگە ئەمڕۆش گەنجەکانمان ئاوا بوێرو زیرەك و بەئاگابونایە) هەڵساو ووتی: ئەی هاوەڵان لەڕاستی دا ئێمە کەڕامان کـردوە بـۆلای پێغەمبـەری خوا (ﷺ) پشتمان لەهـەموو ڕابردوومـان کـردوەو بـەرەو ڕوی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ڕۆیشتوین. بۆئەوە بوە کە لە ئاگر دورکەوینەتەوە ئێستا چۆن خۆمان بخەینە ناو ئاگرەوە. لەبەرئەوە پەلە مەکەی. هەتا دەچینەوە خزمـەت پێغەمبـەری (ﷺ) ئەم باسەی بۆ دەگێڕینەوەجاکە فەرموی بچنەناویەوە ئەوکاتە بڕۆنە ناویەوە. چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرگیز فەرمان بەخراپە نادات و هەرچـی ئـەو بیفـەرموێ بەبێ دوو دڵی پێویستە جـێ بـەجێی بکـەین. بـەڵام هـی ئـەم سـەرکردەیە. کـە کەسێکە وەکو خۆمان. نابێ بەقسەی بکەین هەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگـادار نەبێ. (بەڵی ئەمڕۆ هەریەك لەئێمە کەئاوا گرفتێکمان بۆ دروسـت بـوو. دەتـوانین بگەڕێینەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ). چـونکە ئەگـەر پێغەمبـەر (ﷺ) بەلاشە لەناوماندا نەماوە. بەڵام خۆ فەرمودەکانی ماون، ئەگەر شەخصی نـەماوە. شەخصیەتی ماوە. بوخاری و موسلیمەکەی ماوە و وەڵامی هـەموو پرسـیارەکانی تێدایە و هەموو گرێ کوێرەکانی ژیانمان بۆ دەکاتەوە).

بەڵی لەسەر قسەی ئەم گەنجە دلێرە بوێرە بەهیمەتـە، کـەس بەقسـەی سـەرکردەی نەکردو گەڕانەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەباس و بەسـەرهاتەکەیان بـۆ گێڕایەوە. پێغەمبەری خـوا (ﷺ) ڕووی کـردە صـەحابەکان – کەلـەو سـەفەرەدا

لەژێر فەرماندەی ئەو سەرکردەدا بوون ڕوی تێکردن و فـەرموی: **((لَو دَخَلْتُموهـا ماخَرَجْتُم مِنْها أَبَداً، إِنَّما الطّاعَةُ في المَعْرُوف)).**

**واتە: ئەگەر بەقسەی ئەو سەرکردەتان بکردایە و بچونایەتە ناو ئـەو ئـاگرەوە ئـەوا هەرگیزاو هەرگیز لێی نەدەهاتنە دەرەوە. بەڕاستی گوێڕایەڵی لەچاکەدایە.**

ئەگەر سەرکردەو لێپرسراو فەرمانی پێکردی بۆ چاکەو خۆشبەختی دونیاو قیامـەت لەسنوری شەرعدا فەرمانەکەی جێی دەبۆوە، ئەوا بەقسەی دەکـەی. ئەگـەر جێـی نەدەبۆوە. فەرمانەکەی ئاوا ڕق هەستانێکی شەخصی بوو. نابێ بەقـسـەی بکـەی و دەبێ ڕەدی بدەیتەوە.

**بەڵێ ئاگری ئەمڕۆ بێ دینیە. خۆ کۆژیە لەسەر شەڕە پەڕۆو، شەڕە حیزب و شـەڕە کورسی و شەڕە پارە و سامان، هەرکەسێ خۆی بخاتە نـاو هـەرگیز لێـی دەرناچـێ چارە ڕەشی دنیاو قیامەت دەبێت: دەی وەرە بەقسەی پێغەمبەرەکەت بکەو خـۆت مەخـــەرە ئاگرەکـــەوە لـــەپێناو ڕق هەڵســـانێکی شەخصـــی ســـەرکردەیەك و** بەرژەوەندیەکانی دا!پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی ئەو کاربەدەستەمان بـۆ دەکـات کەنابێ گوێڕایەڵی بکرێت، **کەدوو ڕەوشتی تێدایە:**

**یەکەمیان:** درۆزنی، **دووەمیان:** ستەم کاری. دەفەرموێ: بە صەحابی بەڕێز: **(کەعبی کوڕی عوجرە): (أَعاذَكَ الله مِنْ إِمارَةِ السُّفَهاءِ)! داوا دەکەم لەخواکـە بـت پارێزێت** لەفەرمانڕەوایەتی نەفام و سەرلێشێواو گومڕایان. کـەعب فـەرموی: ئـەی **پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەبەستت چی یە لەکاربەدەستی نەفام و سەرلێشێواو؟!** فەرمووی: **((أُمَراءٌ يَكونُونَ بَعْدي لايَهْتَدُونَ بِهَدِيي، وَلايَسْتَنُونَ بِسُـنَّتي، فَمَـنْ صَدَقَهُم بِكَذابِهِم وَأَعانَهُم عَلى ظُلْمِهِم. فَأُولَئِكَ لَيْسُوا مِنِّي وَلَسْـتُ مِـنْهُم، وَلايرِدُونَ عَلى حَوْضي)).**

واتە: کۆمەڵە کاربەدەستێك لەدوای من دێن، بەرێبازی مندا نارۆن، جا هەرکەسێ درۆکانیان بەڕاست بزانێ و پشتیوان و هاوکارو یارمەتیدەریان بێت لەسەر ستەم و زوڵمیان ئەوە ئەو کەسانە لەئومەتی من نین و منیش لەوان نیم (خۆم بەپێشەواو پێغەمبەری ئەوان نازانم) وە لە ڕۆژی قیامەتدا نایەنە سەر حەوزی کەوسەرو ئاوی حەوزەکەم ناخۆنەوە! پاشان فەرموی: ((وَمَنْ لَمْ يُصَدِّقْهُمْ بِكَذِبِهِمْ. وَلَمْ يُعِنْهُمْ عَلى ظُلْمِهِمْ فَأُولئِكَ مِنِّي. وَأَنا مِنْهُمْ. وَسَيَرِ دُوْنَ عَلى حَوْضِي)).

واتە: وە هەرکەسێ درۆی ئەو کاربەدەستانە بەڕاست نەزانێ و چەپڵە بۆ قسەو بەڵێنە درۆکانیان لێ نەدات و پشتیوان و هاوکاریان نەبێت لەسەر زوڵم و ستەمەکەیان و نەبێتە جاسوس و دارو دەست و ڕۆژنامە نوس و هاوکاریان. ئەوا ئەو کەسانە لەمنن و منیش لەوانم، وەئەوانە دێنە سەر حەوزی کەوسەرەکەم و لێی دەخۆنەوەو هەرگیز تینویەتی بەخۆیانەوە نابیننەوە.

جا بەوردی سەرنجی ئەم فەرمودەیە بدەن، کە ڕێنمایی و ڕۆشنایی یە بۆ بەرچاوی گەل و میللەت کە میللەت دەبێ سەیری ڕەفتارو کرداری سەرکردە بکات. هەر سەرکردەیەك درۆزن و ستەم کاربوو ئەو کەسانەی لەمیللەتدا دەبنە چەپڵەو لێدەرو ڕاگەیاندەکاریان و ئەو شەو درۆیەك دەکات ئەم بەیانیەکەی لاپەڕەیەك لەمەدح و ستایش بۆ درۆکەی دەنوسێت، وە زوڵم و ستەمەکەی بەعەدلی ئیمامی عومەر ناو دەبات و دەڵێ: ئەمە محمدی مەهدی یە و خوا بۆ ئێمەی ناردوە. ئەو جۆرە کەسانە لەمیللەت، کەپێیان دەوترێ. ناپاك و مامۆستا و چی و ڕاپۆرتچی و مەصڵەحەت چی. لەپێغەمبەری خوا بەرین و پێغەمبەری خواش (ﷺ) لێیان بەریە — ئەگەر خۆشی بەنەوەو ئەولادی ئەو زاتە بەرزە بزانن ئاوی کەوسەر ناخواتەوە.

بەڵام ئەوکەسە ڕۆشنبیر و شۆڕشگیرانەی کەبەقەڵەم. بەچەك. بەڕاگەیاندن بەرچەرچی درۆو دەلەسەکانیان دەدەنەوەو هاوکارییان ناکەن لەسەر زوڵمەکەیان،

بەڵکو بەگژیا دەچنەوە ئەوانە لەخۆشەویستانی پێغەمبەرن لە دنیاو قیامەتدا ئـاوی حەوزی کەوسەر بۆ خەڵکی ئاوا باشە جامن لێرەدا دەپرسم؟

ئایا ئیسلام تریاکی گەلانە، یان وریا کەرەوەی گەلانـە کـەپێیان دەڵـێ موسـڵمانی بەحەق ئەو کەسەیە دژی سەرکردەو فەرمانڕەوایی درۆزن و ستەم کارەو لەسەنگەری دژایـەتی دایـە لەگەڵیـدا بەهـەموو شـێوازێکی سـەردەمیانەو سـەرکەوتوانەو شەرعیانە؟!

**زاناو پێشەوای ناودارو گەورە – ئیمامی قَرْطُبی لەتەفسیرەکەیدا**، ج٥، ص٢٢٤دا **دەفەرموێ:** ئەگەر کاربەدەستی موسڵمانان بیدعەی لەدیندا کردوو شتێکی بەحەزو ئارەزووی خۆی هێنایە ئیسلامەوە کەئیسلام خۆی لێی بێ بەریە، ئەوە ئەگەر پێش نوێژی (ئیمامەتی) بۆ موسڵمانان کرد نابێت نوێژی لەدواوە بکرێ.

مەگەر ترسی ئەوە هەبێ کەتووشی ئەشکەنجەو لێدان و زینـدانی کردنیـان بکـات. ئەوکاتە بۆ پاراستنی گیانی خۆیان، خەڵکەکە نوێژی لەدواوە دەکەن بەڵام:

(وَتُعادُ الصَّلاة) دەبێ نوێژەکـەیان دووبـارە بکەنـەوە کەچـوونە ماڵـەوە!! کەواتـە: گوێڕایەڵی کاربەدەست تائەو جێگایە واجبە کەبەپێی شەرع ڕەفتار بکات.

**مافی دووەم:** دەبێت میللەت لە ئاشکرو نهێنی دا بەقسـەی کاربەدەسـت بکـات. بۆئەوەی نیفاق لەنێوان حکومەت و میللەتدا دروست نەبێت.

کە سەرەنجامەکەی ڕووخانی حکومـەت و دروسـت بـونی بۆشـایی دەسـەڵاتە. کـە میللەت تیا زەرەرمەند دەبێت.

میللەت دەبێت ڕاشکاوانە هەڵوێست بنوێنێ یـان دوعـای هیدایـەتی بـۆ بکـات، کەئەو دوعا کردنە بۆی ڕیاو ڕوپامای نەبێت. بەڵکو لەڕێگای ئـەو دوعایـەوە کـە دەڵێ: خوایە هیدایەتی کاربەدەستەکانمان بدەی بیانگێڕیتەوە بۆ سەر ڕێگای ڕاست،

کاربەدەست تێ دەگەیەنێ کەئاگاداری خۆت بە واخەریکە لەڕێگەی ڕاست لادەدەی و تووشی هەڵدێر دەبی. ئەمە مانای دوعاو پاڕانەوەیە بۆ کاربەدەست. **هەروەکو** (فوزەیلی کوڕی عیاض و أحمدی کوڕی حەنبەل) فەرمویانە: (لَوْ كانَ لَنا دَعْوَةٌ مسْتَجابَةٌ لَدَعَوْنا بِها لِلْسُلطانِ). ئەگەر بمانزانیایە خوای گەورە کام دوعایەمان لێ قبوڵ دەکات ئەوا ئەو دوعایەمان دەکرد بەوەی کەبقۆ سەرکردەو کاربەدەستی وولات دەپاڕاینەوە. کە لەسەر ڕێگای ڕاست بێت!.

**مافی سێ یەمی کار بەدەست لەسەر میللەت ئەوەیە:** میللەت بەبیر سەرکردەو کاربەدەستانی وولاتەکەی بێنێتەوە کەئەوان ئەو سەرکردەو کاربەدەستەیان دروست کردووەو پێگەیاندووە، جارێکیان لەمیانی قسەو گفتوگۆدا دەنگە دەنگێك کەوتە نێوان موهاجرین و ئەنصارەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوە سەر مینبەرو فەرموی: **(یا مَعْشَرَ الأَنْصار، مقالة بلغتني عَنْكُم، وجدَةً وَجد تموها في أَنْفُسِكُم؟ أَلَم تَكُونُوا:**

**١ ضُلاّلاً فَهَداكُمُ الله بي.**

**٢ وَعالَةً فَأَغْناكُمُ الله.**

**٣. وَأَعْداءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُم؟ قالُوا: بَلِ اللهُ وَرَسُولُهُ أَمَنُّ وَأَفْضَلُ.**

واتە: ئەی کۆمەڵی ئەنصار: ئەوە چی یە ئەو چرپەو بۆڵەبۆڵەی کەدەیبیستمەوەو لەناختاندا شتێکی دروست کردوە. گوایە من هەندێماڵی زیاترم داوە بەموهاجرین و بەشی ئێوەی ئەنصارم نەداوە.

**بەڵام منیش لەئێوە دەپرسم ئایا ئێوە:**

١- گومڕاو سەرگەردان نەبوون (بتتان دەپەرست) خوای گەورە بەهۆی منەوە هیدایەتی دان.

٢- دەست کورت بون. خـوای گـەورە دەوڵەمەنـدی کـردن (تەماشـاکەن لەمیانـدا نەیفەرموو: خوا بەهۆی منەوە دەوڵەمەندی کردن، چونکە ڕزق و ڕۆزی زیـاد کـردن تەنها و تەنها هەر بەخوایە. چونکە (الرّزاق) تەنها خۆیەتی).

٣- وە دوژمنی یەکتری بون — ئەوسوحەزرەج چـەند سـاڵ دوژمنایـەتی یـەکتریان کـردو خـوێنێکی زۆریـان لەنێوانـدا ڕژا — خـوای گـەورە بـە بەرەکـەتی ئیسـلام خۆشەویستی خستە نێوانتانەوە. ئایا وانەبوو؟

هەموو بەیەك دەنگ ووتیان: بەڵێ منەتی خـوا و پێغەمبـەری خوامـان لەسـەرەو هەموو ئەو فەزڵ و بەرەکەتەمان بەئیسلام پێ گەیشت.

**پاشان پێغەمبەری خوا** (ﷺ) **فـەرموی:** ((**أَلا تُجيبُونِي يامَعْشَـرَ الأَنْصـار؟!**)) ئەوە وەڵامم نادەنەوە ئەی کۆمەڵی یاریدەدەرانی مەدینەیی؟! تەماشـاکەن فێریـان دەکات کە مافی بەرگری لەخۆکردنیان هەیە. مافی ئەوەیان هەیە کەچۆن دەسەڵات زۆرشتی باشی پێشکەش کردون. ئەوانیش زۆر قوربانی دانیان پێشکەش کردوە بـۆ دروستکردنی ئەو کیان و دەسەڵاتە.

**بەڵێ ئەنصارەکان فـەرمویان:** (وَبِماذا نُجيبُكَ يارَسُولَ اللهِ، وللهِ وَلِرَسُولِهِ المَنُّ وَالفَضْلُ؟!) ئایا بەچی وەڵامت بدەینەوە ئەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لەکاتێکـدا هەرچی چاکەو خێرو بێر هەیـە هـەموی هـی خـواو پێغەمبـەری خوایـەو منەتـە بەسەرمانەوە. **پێغەمبەری خوا** (ﷺ) **فەرموی:** ((**أَمّا وَاللهِ لَوْشِئْتُم لَقُلْتُم، فَلَصدقْتُمْ وَلَصُدِّقْتُم**)).

واتە: بەڵام سوێند بەخوای گەورە. ئەگەر حەزتان لێبوایە ئـەوا دەتـانتوانی بڵـێن و قسەکەشتان ڕاستەو بەڕاستیشم دەزانی و پشتیوانیم لێدەکرد. ئەویش ئەوە کـەبتان وتایە:

١ أَتَيْتَنا مُكَذَّباً فَصَدَّقْناكَ: هاتینه ناومان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەکاتێکدا کە لەمککەدا بەدرۆیان زانی و ئێمە بڕوامان پێ کردی و قسەو فەرموودەکانتمان بەڕاست زانی.

٢ وَمَخْذُولاً فَنَصَرْناكَ: بێ دەسەلات بووی، سەرمان خستی و پشتیوانیمان لێ کردی و بەهۆی پشتیوانیمان بۆت ئاوا ئەم هێزو دەسەلاتەی ئەمڕۆت پەیدا کردوە.

٣. وَطَرِيداً فَآوَيْناكَ: پیلانی کوشتن و دەربەدەرکردنیان دارشتی و ناچاریان کردی شوێن و زێدی خۆت جێ بێڵی، بەڵام ئێمە پەنامان دایت و خۆمان و سەروەت و سامانمان پێشکەش کردیت.

٤. وَعائِلاً فَواسَيْناكَ: دەست کورت و هەژار بوی، ئێمە کردماننە هاوبەش و شەریکی ماڵ و سامان و خانوو باخ و کارو کاسپی و بازاڕمان.

(ئەم فەرمودەیە ئیمام ئەحمەد گێڕاویەتیەوە).

**جا سەرنج بدەن ئیماندارانی بەڕێز.** پێغەمبەری خوا (ﷺ) سێ مافی حکومەتی لەسەر میللەت دیاری کرد، بەڵام چوار مافی بۆ میللەتیش لەسەر کاربەدەست دیاری کرد!...خۆزگە ئەم ووشە گەوهەری و ئاڵتونیانە هەموو پارێزەرێك. هەموو هاوڵاتیەك. لەبەری بوایەو بەرگری پێ لەخۆی و میللەتی ستەم لێکراوی ماف خوراو پێ بکردایە.

**مافی چوارەمی کاربەدەست لەسەر میللەت ئەوەیە کە:**

دەبێ میللەت ڕاستگۆ بێ لەگەڵ کاربەدەست و بەرتیلی بۆنەبات و فێری خزم خزمێنەو واسیتەو بەرتیل خۆری نەکات. بەڕاستی زۆرجار کاربەدەست لەسەرەتاوە کەدێتە سەرمێزی کارکردن و ئیدارە، کەسێکی ڕۆشنبیرو ئازادی خوازەو لەناخەوە هەژاری خۆشدەوێت و حەز دەکات یاسا جێبەجێ بکات بەسەر هەموو کەسدا

بەیەکسانی. بەڵام خەڵکی خوی خراپ دەکەن بەدەعوەت کردن و بەرتیل بۆ بردن و زۆرهاتوچۆ کردن!

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا ئاگادارمان دەکاتەوە لەتاوانی بەرتیل خۆری و دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ البقرة: ١٨٨. واتە: نەکەن ماڵ و دارایی یەکتر لەنێوانتاندا بەناحەق بخۆن. (وەك بەرتیل و سوو، یان داگیرکردن و فرِوفێڵ) نەکەن هەندێکی بدەن بەکاربەدەستان بۆ ئەوەی هەندێك ماڵی بخۆن لەرِێگەی ناحەق و گوناهەوە. لەکاتێکدا خۆشتان دەزانن کەئەو کارە رِەوا نیە.

**وە پێویستە ئەوەش بڵێین:** کەئەگەر کەسانێکیش بەناوی هەدیەوە شتێکیان برد بۆ کاربەدەست بۆ فەرمانگەکەی یان بۆ ماڵەوەی، نابێ وەری بگرێ.

رِەحمەتی خوا لەخەلیفەی دادپەروەر (عومەری کورِی عَبدُ العَزیز) کە فەرمویەتی: (كانَتِ الهَدِيَّةُ فيما مَضَى هَدِيَّةً، فَأَمّا اليَوْم فَهِي رشْوَةٌ). واتە: جاران هەدیە تەنها هەدیە بوو. بەڵام ئەمرِۆ بەرتیلە.

ئەی کەی و چ کاتێك کاربەدەست بۆی هەیە هەدیە وەربگرێت؟ کاتێك کەلەگەڵ ئەو کەسەی کەدیاری و هەدیەکەی بۆ دێنێت پێشتر هاتوچۆی هەبوو بێت و دیاری و هەدیەی پێشکەش کردبێت. کەلەوکاتەدا هیچ پلەو پێوستێکی نەبوبێت، ئەوا ئێستاش دروستە دیاری وەربگرێت.

**ئەم فەرموودەیەی سەروەر و سالارمان بکە بەقیاس کە فەرموی:** ((**فَهَلا جَلَسَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ أَوْبَيْتِ أُمِّهِ، فَيَنْظُرْ يُهْدي لَهُ أَمْ لا**)) رَواهُ البُخاريُّ.

ئایا ئەگەر ئەو کاربەدەستە لەپۆست و پلەکەی لاچوو، چوو لەماڵی باوکی یان ماڵی دایکی دانیشت، باتەماشا بکات ئایا هەدیەی بۆ دەچێت لەلایەن ئەو کەسەوە یان نا؟! بەڵام بەخوا بەدەگمەن نەبێ ئەو کاتە نازانێ ماڵت لەکوێ یەو ناتناسێ، کەواتە ئێستا کەکارێکت بەدەستە هەرچیەکت بداتێ بەبەرتیل حیساب

دەکرێت. لەکۆنەوە وتراوە: (الهَدِيَّةُ تَفقَأُ عَيْنَ الحُكْمِ) دیاری و هەدیە چاوی حوکم و یاسا دەردەپەڕێنێ و کوێری دەکات!!

دەگێڕنەوە هەژارێك و دەوڵەمەندێك دەبێتە کێشەیان. هەژارەکە دەچێتە لای دادوەر (حاکم) و شکوای حاڵی خۆی دەکات و دادوەریش دەنێرێت بەشوێن شکات لێکراوداو کەدێت سەیر دەکات فلان دەوڵەمەندە!! بۆیە حاکم پشتیوانی لەدەوڵەمەندەکە دەکات.

بەڵام کێشەکە بەو دانیشتنە کۆتایی پێنایەت. و ئیزنیان دەداتەوە بۆ دانیشتنی داهاتوی دادگا. هەژارەکە دەزانێ کە دادوەر لەبەر هەژاری پشتی ئەمی نەگرت. بۆیە چوو (هیزە) یەك ڕۆنی بەدیاری برد بۆ ماڵی حاکم.

دەوڵەمەندەکەش لەکاتێکی تردا دوو تەنەکە هەنگوین و ئەسپێکی ڕەسەنی کرد بەدیاری و بردی بۆ ماڵی حاکم.

بەڵێ ڕۆژی مەحکەمە هاتەوە پێشەوەو دەست کرا بەقسەو حاکم هەر پشتی دەوڵەمەندەکەی دەگرت: هەژارەکە بۆ ئەوەی بەبیری حاکمی بێنێتەوە کەڕۆنم بۆ هێنای بۆ ماڵەوە. ووتی: جەنابی حاکم عەباکەت چەور بوو!!

حاکم هیچ خۆی تێك نەداو ووتی: ببورە چەور نەبووە. چونکە ئەسپێك هاتوو لەقەیەکی لێداو هیزە ڕۆنی ڕشت!!

بەڵی بە ڕاستی ئیمانداران پێویستە هەمومان چاك بین. نەك هەر کاربەدەست بەتەنها چاك بێ. بەڵکو دەبێ کۆمەڵگا هەموو چینەکانی چاك بن. گەنجی، پیری، ئەهلی بازاڕو مەعامەلەی، پاشان کاربەدەستانیش ئەمین و ڕاستگۆو دادپەروەر بن.

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: أَرْبَعَةٌ يُبْغِضُهُمُ اللهُ:**

١ البَيّاعُ الحلاّف. ٢ وَالفَتَى المُخْتال.

٣. وَالشَّيْخُ الزَّانِي. ٤. وَالأمامُ الجائِرُ.

(حَدیْث صَحیح. رَواهُ النَّسائي وَابنُ حَبّان في صَحیحِهِ الترغیب وَالترهیب. رَقم: ٣٢٥٤.

**واتە: خوای گەورە ڕقی لەچوار جۆر مرۆڤە:**

١- ئەوکەسەی کەبەردەوامن خەریکی کڕین و فرۆشتنەو لەسەر هەموو شتیّ سویّند دەخوات و بەسویّند خواردن ماڵەکەی بەسەر خەڵکی دڵپاکدا ساغ دەکاتەوەو غەشیان لیّ دەکات.

٢- گەنجی لەخۆبایی. کەهەموو هیواو ئاواتی جرت و فرت و ئەملاو ئەولاو خۆبادان و دەوری خویّندنگای کچان و زنجیر بادان و خۆهەڵکیّشان بیّ. لەجیاتی خەمی خۆی و داهاتوی وولاّتەکەی!!

٣- پیری زیناکار. کەخوی شیریەتی و بەپیریش تەرکی ناکات. لەجیاتی پیربون و بەساڵاچونەکەی بیکاتە داناو زاناو جیّگای ڕیّزو متمانەی خەڵکی بەگشتی و گەنجان بەتایبەتی، کەچی بەمووی سپی یەوە کردەوە کانی هەر ڕەش بن و هەر خەریکی باسی ئافرەت و نەزەری حەرام و تەماشاکردنی کەناڵی ناشەرعی بیّت.

٤- کاربەدەستی ستەم کارو زاڵم.

**ئەم چوارە خوای گەورە زۆر ڕقی لیّیانە، بۆچی؟!**

چونکە ئەم چوار کەسەن دنیایان ناخۆش کردوەو بازاڕیان تیّك داوەو قەدرو حورمەت و متمانەیان لەناو بردوە. جاسەرنج بدەن لەگەڵ (الإمَامُ الجَائِر) دا — گەنجی لەخۆبایی و سەرشیّت و پیری بەدڕەوشت و فرۆشیاری سویّند خۆر، هاتوە کەبەرونی تیّمان دەگەیەنیّت. ئەگەر کاربەدەست ستەمکار بیّ. دیارە چین و تویّژەکانی ناو ئەو کۆمەڵگاو خەڵکەش باش نین و خراپە کارن.

**ئیماندارانی بەڕێز:** بزانن هەتا ئێمە خۆمان چاك نەكەین، دڵنیـا بـن حكومـەتیش چاك نابێ. برایەكی موسڵمان دەڵێ: لەیابان مۆزەفی دائیرەكـە ئەگـەر چـی كـاتی دەوامیش تەواو ببێ تائیشی ئەو ڕۆژە هەموو نەكات و یەك معامەلەی هاولاتیەك بمێنێ، دائیرەكە جێ ناهێڵێ. كەچی بەداخەوە لای ئێمـە زۆربـەی كارمەنـد و كـار گوزار خوا خوایەتی حكومەت لێی خافڵ بێ و دەوام نەكات. ئیتر حكومـەت چـۆن چاك دەبێت؟!

**سەرنجی بواری پاك و خاوێنی بدەن، لە وولاتێكی وەكو (ئێران)دا.**

كەسێك گەنج بێ یان پیر ئەگـەر كاغـەزێك. كلێنسـێك. عەلاگەیـەك. زەرفێكـی بەدەستەوە بێت بۆ فڕێ دانی هیچ بەلایـەوە گـران نیـە كـە (١٥) مـەتر بـڕوات و پیسییەكە بكاتە ناو تەنەكەی خۆڵەكەوە. لێرە شارەوانی زۆرجار شـوێنەكانی پـاك كردۆتەوە. كەچی هاولاتی دەچێ زبڵی لێ دەڕژێتـەوە. حكومـەت گڵـۆپی لەسـەر جادەو پارك و باخچـەكاندا دانـاوە. كەچـی هـاولاتی نـەزان دەچـێت دەیشـكێنێ! ئاوەڕۆی بۆ دروست دەكات. هاولاتی دەچێ چی پیسی مـاڵ و حەوشـەیە دەیكاتـە بۆری ئاوەڕۆوە تاوەكو بگیرێت!! بیرلەوەناكاتەوە بەیانی یەكـەم كـەس خـۆی زەرەر دەكات. ئیتر میللەتی ئاوا بە ڕاستی عیللەتە و نەخۆشی یە!.

**سەرنج بدەنە ئەم ڕوداوە واقیعی یە:**

مامۆستایەك دەڵێ، قوتابیەكی كوردی سلێمانی لەپەنجاكانـدا دەڕوات بـۆ خوێنـدن بۆ بەریتانیاو لە شاری (لەندەن) دكتۆرا دەخوێنێـت، ئـەم بۆخـۆی باسـەكەمان بـۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

ڕۆژێك لەناو شاری (لەندەن)دا كابرایەكی خۆڵ ڕێـژی سـەرجادە ئامۆژگاریـەكی وا كاریگـەری كـردم كەهـەرگیز لـەبیرم ناچـێت: ئـەویش ئـەوە بـوو. ڕۆژێكیـان

بەکەشخەیەکی تەواو و قاتێکی جوان و تێرو تەواو لەبەرمدا بوو، پێڵاوی جوان و بۆینباخ و بۆنی خۆش و تەرتیبات. بەشەقامێکدا دەڕۆیشتم، ئاگام لەخۆم نەبوو، پێم هەڵکەوت لەتەنەکەی خۆڵ. تەنەکەکە کەوت و خۆڵەکەی ناوی ڕژا. گوێم نەدایەو ڕۆیشتم. لەدواوە کابرایەك بانگی کردم، گەڕامەوە سەیر ئەکەم پاککەرەوەی شەقامەکانە، ووتی: خەڵکی ئەم وولاتەیت؟ ووتم: نەخێر ووتی: بێگومان خەڵکی عێراق یان ئێران یان یەکێ لەوولاتانی جیهانی سێیەمی! ووتم: بەڵێ کوردی عێراقیم! ووتی: باشە پلەی خوێندن و بڕوانامەت چی یە؟! بەفشەو فیزەوە ووتم: خەریکی خوێندنی دکتۆرام، ئیتر ڕۆیشتم!، دیسان بانگی کردمەوەو دەستی بەگیرفانیدا کردو چەند بڕوانامەی دەرهێنا. یەکێ لەبڕوانامەکانی ماستەر بوو!! ووتی: ژینگە پارێزو خۆڵ ڕێژم و ئەوەش شەهادەکەمەو شانازیش بەم کارەمەوە دەکەم. بڕۆ سەیری داری میوە بکە هەتا زۆرتر بەردار بێت، سەربەخوار ترە!! خۆبەزل نەزانین و لەخۆبایی نەبوون و بەفیزەوە نەڕۆیشتن لەئایین و فەرهەنگی ئێوەدا بایەخی زۆری پێ دراوە، ئەی باشە بۆچی زوو لەخۆتان دەگۆڕێن و خۆتان خۆتان وون دەکەن! زۆرتەریق بوومەوەو شەرمەزار بوم و داوای لێبوردنم لێکرد...

بەئومێدی ئەوەی بەهەموومان بەمیللەت و کاربەدەستەوە لەخزمەت دین و ژینی ئەم وولات و خاکە پیرۆزەدا بین و ژیانێکی بەختەوەرو ئاسودەو قیامەتێکی سەرفرازانەو کۆتا مەنزڵ بەهەشتی خوا بەشمان بێ و لەخوای گەورە دەپاڕێینەوەو دەڵێین:

﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾

ٱللَّهُمَّ ءَامِينَ

# سەرچاوەکان


١. تەفسیری ئاسان ، بورهان محمد أمین.

٢. موسوعَة الحُقوق الإسْلامِية ، سَعد یوسف أبو عَزیــز، ص٧٥١ ، ص٧٣٢ ، ص٧٢٩

٣. تَبْصِرَة الأَنام بالْحُقوق في الإسْلام ، صالح بن طه عبدالواحِد ، ص,٣٢١

٤. الأَخْلاق السِّیاسیَّة ، محمد زکریا النَدّاف ، ص٢٤٢ ، ص,٢٢٢

٥. کەشکۆڵی کاروان ، ناصح محمد شریف ، ص,٢٩

٦. الترغیب والترهیب ، للحافظ المُنذري ، فةرمودةی ذمارة: (٣٢٥٤).

٧. خۆرئاوا بەرەو ئیسلام ، وەرگێڕانی: سەردار ڕەزا ، ل,٤٣٠

٨. پێنج ووتار لەشیکردنەوەی زانستی کۆمەڵگە ، فاروق عبدالعزیزکریم ، ل٣٠.

الحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ العالَمين، وَالصَّلاةُ وَالسَلامُ عَلَى سَيِّدنا مُحمدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ.

**ئیماندارانی بەڕێز:** لەزنجیرە باسێکدا پشتیوان بەخوای تاك وتـەنها، باسـی یـەکێ لەگوناهە گـەورەکان دەکـەین. کەڕوخێنـەری ڕەوشـتە بەرزەکانـە. کـە کۆمـەڵگا هەڵدەوەشێنێ.

ئەویش تاوانی داوێن پیسی یـە، (زینـا) یـە، پـێش هـەموو شـتێ زۆر پێویسـتە پێناسەی زینا بزانین بۆئەوەی واتێنەگەین کە هەر نزیك بونەوەیەکی نێرومـێ یـەك لەیەکتری بەزینا حیساب دەکرێت...

**لە شەرعدا دەفەرموێ:** ئەو زینایەی کەدەبێتە هۆی واجب بونی حەد لەسەر مرۆڤـ بەوە دێتەدی کەسەری چوکی نێرینە بچێتە ناودامێنی ئافرەتێکەوە کەحەڵاڵی خۆی نیە، بامەنیشی نەیەتەوە.

**کەواتە:** ئەگەر ئەم مەرجە نەبوو وەنەهاتەدی، ئەوا حەد واجب نابێ وکاربەدەسـتی وەخت ئەوکەسانە تەمێ دەکات کەکەمتر لەزینایان کردوە، جابەلێـدان بێـت، یـان بەبەند کردن بێت یان بەنەفی کردن ودورخستنەوە. وە ئەوکەسەش پێویسـتە تەوبـە بکات لەنێوانی خۆی وپەروەردگاریدا. یـەکێ لـەجۆرەکانی زینـا، جـوت بونـە لـە ڕێگەی کۆمەوە.

زانای گـەورە (إبنُ قُدامـــة): لـەکتێبی (المُغْـــنِي، ج٨ ، ص١٨١) دا دەفـەرموێ: (وَالوَطءُ فِي الدُّبرِ مثله فِي كَوْنِهِ زِناً، فَكانَ زَنَّىً كَالْوَطءِ فِي القُبُلِ).

واتە: جوت بون لەکۆمەوە هەروەکو جوت بونە لەدامێنەوە. وەهەر بەزینا حیسابە.

**جۆرەکانی زینا: ئەوەی کەخەڵکی ئەیزانێ:**

**١- کچ وکوڕ کە نەچوینە ژیانی هاوسەریەوە.**

**٢- لەو تاوانتر:** ژن وپیاو، کە هەردوکیان یان یەکێکیان چوبێتە ژیانی هاوسەریەوە، تەنانەت ئەگەر بۆ یەك جاریش بێت.

**٣- لەویش تاوانتر:** زینا لەگەڵ ژنی دراوسێ. (جارێکیان پیاوێك لە پێغەمبەری خوای پرسی: أَيُّ الذَّنْبِ أَكْبَرُ عِنْدَاللهِ؟ چ تاوانێك لەهەموو تاوانێك گەورەترە لای خوا؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: **((أَنْ تَدْعُوَ لِلّهِ نِدّاً وَهُوَ خَلَقَكَ))**، هاوبەش بۆ ئەو پەروەردگارەت دابنێی کەدروستی کردوی.

پیاوەکە ووتی: ئەی لەدوای ئەو گوناهە. چ گوناهێکی گەورەتر هەیە؟ **قالَ: ((أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ مَخافَةَ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ))** واتە: منالی خۆت، جگەر گۆشەی خۆت بکوژی لەترسی ئەوەی نەوەك نانت لەگەڵ بخوات!!

کابرا ووتی: ئەی لەدوای ئەوە چ گوناهێك زۆر گەورەیە؟ فەرموی: **((أَنْ تُزانِي حَليلَةَ جارِكَ))** ئەوەیە زینا لەگەڵ ئافرەتی دراوسێکەتدا بکەیت.. ئەم فەرمودەیە (مُتَّفَق عَلَيْهِ).

- یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) کەناوی (مقدادی کوڕی ئەسوەدە) دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕوی لە هاوەڵانی کرد وفەرموی: **((ماتَقولُونَ في الزِّنا؟!))**. ئایا لەبارەی زینا وداوێن پیسی یەوە دەڵێن چی وچۆن سەیری ئەوتاوانە دەکەن؟ صەحابەکان فەرمویان: (حَرَّمَهُ اللهُ وَرَسُولُهُ، فَهُوَ حَرامٌ إِلى يَوْمِ القِيامَةِ) خواو پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردوەو، هەتا ڕۆژی قیامەتیش زیناکردن هەربەحەرامی دەمێنێتەوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەهاوەڵانی فەرموو: **(لأَنْ يَزْنِيَ الرَّجُلُ بِعَشْرَةِ نِسْوَةٍ. أَيْسَرُ عَلَيْهِ مِنْ أَنْ يَزْنِيَ بِامْرَأَةِ جارِهِ)** حَدْيثٌ صَحيحَ رَواهُ أَحمد. واتە: دەی بە خوا ئەگەر کەسێك – پیاوێك – زینا لەگەڵ (دە) ئافرەتدا بکات، هێشتا تاوانی ئەو (دە) زینایە. کە شەرەف وحورمەتی (دە)

ئافرەت، دەبنەماڵە، سەدان کەس پێی لەکەدار دەبێ، هێشتا تاوانەکەی سوکترە لەوەی کەپیاوێك زینا لەگەڵ ژنی دراوسێیەکەی بکات!!

**٤- جۆرێکی تری زینا – پیری زیناکەرە:** کەدیارە مرۆڤ بەپیری فێری زینا نابێت ئەگەر بەگەنجی فێرنەبوبێت، واتە: لەگەنجیدا زیناکار بوە ووازی لێ نەهێناوە وتەوبەی نەکردوە هەتا پیر بوەو بەپیریش هەرزینا دەکات!

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((**لا يَنْظُرُاللهُ يَوْمَ القِيامَةِ إلى الشّيْخِ الـزَّاني. وَلا العَجُوز الزَّانِيَة**)). حَدْيثٌ حَسَنٌ رَواهُ الطَّبَراني في الأَوْسَط.

واتە: خوای گەورە لەرۆژی قیامەتدا بەچاوی رەحمەت تەماشای پیاوی پیری زیناکار و پیرەژنی زیناکار ناکات!).

**٥- لەهەموو جۆرە زیناکان تاوانتر:** (الزِّنا بالْمَحارِم) زینا لەگەڵ مەحرەمدا، جائەو مەحرەمیەتە بەهۆی ژن وژن خوازیەوە دروس بوبێ وەکو: کەسێك زینا لەگەڵ باجی خۆی (خێزانی باوکی) بکات، یان زینا لەگەڵ خەسوی (دایکی ژنەکەی) بکات.

کەخەسوو باجی یەکەی بەهۆی ژن وژن خوازی یەوە لێی حەرام بوون وبەئەبەدی.

یان ئەو مەحرەمیەتە بەهۆی خزمایەتی وخێزانی خۆیەوە بێ. وەکو کەسێك زینا لەگەڵ خوشکی خۆی یان پوری خۆی. یان کچی خۆی بکات.یان ئەو مەحرەمیەتە بەهۆی شیرخواردنەوە بێ.

**بۆ نمونە:** کەسێك شیری لەئافرەتێك خواردوە بۆماوەی پێنج جار وتەمەنیشی لەدووساڵ کەمتربوە. ئەوە هەرچی کچی ئەو ژنەیە دەبن بەخوشکی وئەبەد لێ ی حەرامن وەکو خوشکی خۆی.

ئەمجا کەسەکە بچێ زینا لەگەڵ ئەو خوشکە شیریەی خۆی بکات. ئەوە هیچ فەرقی نیە لەگەڵ ئەوەی زینای لەگەڵ خوشکی دایك وباوکی خۆی کردبێ.

جا ئەگەر کەسێك ئاوا زینای لەگەڵ مەحرەمی خۆی کرد ئەوا سزاکەی کوشتنە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((مَنْ وَقَعَ عَلَى ذاتِ مَحْرَمٍ فَاقْتُلوُهُ)) رَواهُ إبن ماجَّة (٢٥٦٤).

واتە: هەرکەسێك زینای لەگەڵ مەحرەمێکی خۆیدا کرد بیکوژن.

وەگێڕدراوەتەوە لەپێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وئیسحاقەوە کەفەرمویانە:

واجبە ئەوکەسەی زینا لەگەڵ مەحرەمی خۆیدا دەکات بکوژرێت، جا کوڕ بێت وژنی نەهێنابێ یان خێزانداربێ. ئەگەر ئەوئافرەتەی کەزینای لەگەڵ کردوە ژنی باوکی بێ – باجی بێ.. بەڵگەشیان ئەوفەرمودەیە کە هاوەڵی بەڕێز (بەڕاو) دەیگێڕێتەوە ودەیفەرموێت: توشی خاڵم بوم ئاڵایەکی بەدەستەوە بوو. ووتم: بۆ کوێ دەڕۆیت؟ خاڵم ووتی: (بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إلى رَجُلٍ نَكَحَ إمْرأَةَ أَبْيـهِ، أَنْ أَضرِبَ عُنُقَهُ وَآخذ مالَهُ). حَديْثٌ صَحيح رَواهُ أبوداود.

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردومی بۆ لای پیاوێك کەزینای لەگەڵ ژنی باوکی دا (زڕدایکی خۆیدا) کردوە، فەرمانی پێکردوم کەبچم لە ملی بدەم وسەری بپەڕێنم ماڵەکەی دەست بەسەردا بگرم وبدرێت بەدەوڵەت.

ڕەنگە یەکێك بپرسێت کە ئایا ڕودەدات کەسێك زینا لەگەڵ خوشکی خۆیدا بکات؟ یان زینا لەگەڵ کچی خۆیدا بکات؟!

**لە وەڵامدا دەڵێین:** بەڵێ، ئەوەی لەشەرعدا باسکراوە بێگومان لەمرۆڤدا ڕودەدات. نمونەی واقیعی ئەم ڕۆژگارەش، ئەوەتا کەسێك کە کوردە وخەڵکی کوردستانە زینای لەگەڵ خوشکی خۆی کردوە وگیراوە ودانی بەتاوانەکەیدا ناوە ویەدرێژی لەڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ، ژمارە: ٤٤٩٤ دا کە لە ٢٠٠٨/٢/١٢ دەرچوە لەلاپەڕە (٩)دا) بلاّوکراوەتەوە.

یان ئەوکوردەی کە لەووڵاتی سوید دەژی ودەست درێژی سێکسی کردۆتە سەرکچەکەی وخۆی و لە گۆڤاری (هۆنیا) ژمارە: (٤٥) دا بلاّوکراوەتەوە.

جا بۆ ڕێگرتن لەم حاڵەتانەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (کاتێ منالەکانتان تەمەنیان گەیشتە (دە) ساڵ. لەسەر نەکردنی نوێژ لێیان بدەن – لێدانی بەئاگا هێنانەوە – ((وَفَرِّقُوا بَيْنَهُم في المَضاجِعِ)) لەناو جێگای خەوتنیشدا لەیەکیان جیابکەنەوە. ئەم فەمودەیە: حَدیْث حَسَن رَواهُ أبوداود بإسْنادٍ حَسَن.

هەر لەبەر ڕێگریە لە کەسانی دەرون نەخۆش وبەدڕەفتار کە لەشەریعەتی ئیسلامدا لەباسی شتنی مردودا، کەلەو وەختە سامناکەدا کەئارەزوو نامێنێ وبیروهۆش لەدنیا وخۆشیەکانی هەڵدەکەندرێ.

**ئالەو وەختەشدا شەرع دەفەرموێ:** تەنها پیاو بۆی هەیە ژنی مردوی خۆی بشوات. وە ژنیش بۆی هەیە مێردی مردوی خۆی بشوات.

هەروەکو لەم فەرمودەیەوە بۆمان دەردەکەوێت کەدایکمان عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە ودەفەرموێت: (رَجَعَ إلَيَّ رَسُولُ الله (ﷺ) ذاتَ يَوْمٍ مِنْ جَنازَةٍ بالْبَقيعِ، وَأنا أجدُ صُداعاً في رأْسي، وَأنا أَقُولُ: وَا رَأْساه، قالَ: ماضَرَّكِ لَوْمُتٍّ قَبْلي فَغَسَلْتُكِ وَكَفَنْتُكِ، ثُمَّ صَلَّيْتُ عَلَيْكِ وَدَفَنْتُكِ؟! قُلْتُ: لِكنِّيَّ، أَوْ لَكَأَنِّي بِكَ وَالله لَوْفَعَلْتَ ذالِكَ لَقَدْ رَجَعْتَ إلى بَيْتِي فَأَعْرَسْتَ فيهِ بِبَعْضِ نِسائِكَ، قالَ: فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، ثُمَّ بدئَ بِوَجْعِهِ الَّذي ماتَ فيهِ) حَديْثٌ حَسَن رَواهُ إبنُ ماجَّة وَأَحْمَد وَحَسَّنَهُ الأَلْباني في المِشْكاة (٥٩٧١).

واتە: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەدوای ئەوەی کەلەناشتنی مردویەك بەشداری کرد کەلەگۆڕستانی بەقیع ناشتبویان. گەڕایەوە بۆ ماڵەوە بۆلام. لەوکاتەدا من سەرم زۆردێشا ودەمگوت: ئای سەرم، ئای چەند سەرم ئازاری هەیە. پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرموی: چ زەرەرێ دەکەی کە ئەگەر تۆ لە پێش مندا بمری وخۆم بەدەستی خۆم بتشۆرم وکفنت بکەم وپاشان نوێژی مردوت لەسەر بکەم

وبتخەمە ناوگۆڕەکەتەوە بەدەستی خۆم؟! خاتوو عائیشە دەفـەرموێ: منـیش ووتم ئەی چی دەبێ ئەگەر من ئەوە لەگەڵ تۆ بکەم. چونکە بەخوا ئەگەر من پـێش تـۆ بمرم وتۆ ئاوا بمشۆی وکفن ودفـنم بکـەی، ئـەوا کەهاتیتـەوە بـۆ ماڵەکـەم لەگـەڵ یەکێکی تر لەخێزانەکانت لەماڵەکەمدا ژیانی هاوسەری دەکەیت!!

**خاتوو عائیشە دەفەرموێ:** کە ئەوەم ووت پێغەمبەری خوا (ﷺ) زەردەخەنەیەکی کرد وپاشان سەرئێشەکەی ئەویش دەستی پـێ کـرد وپاشـان هـەر بـەو سەرئێشـە توندەی وەفاتی کرد! جالێرەدا مەبەستمان لەو بڕگەیە بـوو، کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەموی: ئەی عائیشە ئەگەر تۆ لـەپێش منـدا بمـری ئـەوا بەدەسـتی خـۆم دەتشۆم.

**کەواتە:** دروستە پیاو ژنی خۆی دوای مردنـی بشـوات وەهـەروەها دروستیشـە ژن مێردی مردوی خۆی بشوات. خاتوو عائیشە دەفەرموێ: (لو استَقبَلتُ مِن أمري ما استَدبَرتُ ما غَسَّلَ رَسُولُ الله (ﷺ) إلا نِساؤهُ) حَديْث حَسَـــن رَواهُ أبــوداود وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألْباني في الأرْواء (٧٠٢).

واتە: ئەگـەر ئـەوەی ئیسـتا ئـەیزانم لـە سـەرەتاوە بمزانیایـە نەمدەهێشـت جگـە لەخێزانەکانی خۆی، هیچ کەس پێغەمبـەری خـوای (ﷺ) دوای وەفـاتی بشـوات. وەهەروەها (ئەسمائی کچی عومـەیس) ئەبوبـەکری صـدیقی شـۆردوە دوای مـردن کەمێردی بووە.

**وەلێرەدا پرسیارێك دەکرێت:** ئایـا کاتێـك دایـك مـرد دروسـتە کوڕەکـەی خـۆی بیشوات؟! یان باوك کچی عازەبی مردوی خۆی بشوات؟!

**لە شەرعدا دەفەرموێت:** دروست نیە بۆ پیاو کەدایکی خۆی دوای مـردن بشـوات! وەدروست نیە کەدایك کوڕی باڵغی خۆی بشوات، وە هەروەها دروست نیـە کـەپیاو کچی خۆی بشوات، لەبەرئەوەی پیاو نابێ ژن بشوات ئەگەرچی مـەحرەمی خۆشـی

بن تەنها بۆ ژن هەیە کەمێردەکەی خۆی بشوات، وە پیاو ژنەکەی خۆی بشوات. غەیری ئەو دوانە بۆ یەکتر هیچ نێرمێ یەك دروست نیە یەکتری بشۆن، هەر بۆیە ئەگەر پیاو مرد تەنها دەبێ پیاو بیشوات وژن مرد ئەوا تەنها ژن دەیشوات بەلأم ئەگەر کوڕێك تەمەنی نەگەیشتبوە حەوت ساڵی ومرد دروستە ژنێك بیشوات، وە ئەگەر کچۆڵەیەکیش مرد وتەمەنی نەگەیشتبوە حەوت ساڵی ئەوا دروستە پیاوێك بیشوات. بەلأم ئەگەر کوڕەکە تەمەنی گەیشتبوە حەوت ساڵی تەواو. وە کچەکەش تەمەنی گەیشتبوە حەوت ساڵی تەواو، ئەوا لەوکاتەدا کوڕەکە دەبێ پیاو بیشۆرێت وکچەکەش دەبێ ژن بیشۆرێ. بەلأم ئەگەر کچێك مرد کەشوی نەکرد بوو، هیچ ژنێك نەبوو لەوکاتەدا کە ئەوکچە بشوات، ئەوا لەبەر زەرورەت ودەست نەکەوتنی ئافرەت دروستە باوك کچی مردوی خۆی بشوات. بەلأم برا بۆی نیە خوشکی خۆی بشوات. ئەگەر ئافرەتیش دەست نەکەوێت بیشوات!!

بۆیە شەرع ئاوا ئەم بابەتەی بەوردی باس کردوە وحەزەری زۆری تێدا کراوە، چونکە گورگی ئاوا هەیە کە پەلاماری خوشکی خۆشی دەدات، ئەگەر کەسێکیش بڵێ: ئاخر خۆ ئەوکەسانە زۆر دەگمەنن.

**ئەوا دەڵێین:** چۆن جاری واهەیە نەخۆشیەك بڵاودەبێتەوە، خۆ لەوانەیە ئەو نەخۆشیە کە لە وولأتەکەدا هەیە لەوسنورەدا هەبێ، بەلأم ڕادەگەیەنرێ کە پێویستە هەمووکەس حەزەری خۆی بکات. دەی خۆنەخۆشی ئەخلاقی. فەوتان ولەناوچونی لاشە وئیمان وقیامەت ودنیاشی پێوەیە.

**٦- زینا لەگەڵ ئافرەتی مردوو:** ئەگەر کەسێك لەگەڵ ئافرەتێکی مردودا جوت ببێ حوکمی ئەم جووت بونە سوکترە، چونکە لە شەرعدا دەفەرموێت: یەکێ لەمەرجەکانی حەدی زینا ئەوەیە: (أَنْ تَكُونَ المَرْأَةُ حَيَّة. فَلا يَحدُّ عِنْدَ الجُمهورِ

واطئ المَيْتَةِ، وَيحدُّ في المَشْهُورِ عِنْدَ المالِكِيَّةِ) الفِقه الأسلامى وَأَدِّلَتُهُ. د.وَهْبَة الزحيلى ج٧، ص٥٣٦٢.

واتە: پێویستە ژنەکە زیندوبێ، کەواتە: ئەگەر کەسێك لەگەڵ ئـافرەتێکی مـردودا جووت بوو ئەوە لای جمهوری زانایـانی ئیسـلام حـەددی لەسـەرنیە وتـەنها تـەمێ دەکـرێ. بـەڵام لای ڕەئـی مەشـهوری مالیکیـەکان دەبـێ حـەددی لێ بـدرێت (ئەگەر کوڕ بوو (١٠٠) دارو ئەگەر ژن بوو بەدار ڕەجم کردن).

**ڕەنگە یەکێ بپرسێ:** جائایا ئەمە ڕودەدات کەسێك لەگەڵ ژنێکـی یـان کچـێکی مردودا جووت ببێ؟

**لەوەڵامدا دەڵێین:** بەڵێ. هەرچـی لەشـەرعدا باسـکراوە مانـای ئەوەیـە إحتمـالی ڕودانی هەیە. هەروەکو ئەوەی جارێکیان پاسەوانی (مـەیت خانەیـەك) چـوبوە لای ئافرەتێکی مردوو کەشەو لە (طُبْ عَدْلِي) بەجێ هێشترابوو بۆ ڕاپۆرتی پزیشکی!!

٧- **جووت بون وسێکس کردن لەگەڵ ئاژەڵ:** ئەگەر کەسێك لەگەڵ ئاژەڵێکدا جوت بـوو، ئـەوا حـەددی شـەرعی لەسـەر نیـە. چـونکە لەشـەرعدا دەفـەرموێت: یەکێ لەمەرجەکانی حەددی شەرعی ئەوەیە: (أَنْ يَزْنِي بآدَمِيَّةٍ، فَإِنْ أَتَى بَهيمَةً فَـلا حَدَّ عَلَيْهِ بِاتِّفاق المَذاهِبِ الأَرْبَعَةِ، وَلِكنَّهُ يعزر، ولاتَقْتُلُ البَهيمَة وَلا بَأْس بِأَكْلِهـا عِنْدَ الجُمْهُور).

واتە: دەبێ ئەو زینایە وجوت بونـە لەگـەڵ مرۆڤـدا کرابـێ، جـا ئەگـەر کەسـێك سێکسی لەگەڵ ئاژەڵێك کـرد. ئـەوا حـەددی شـەرعی لەسـەر نیـە بەیەکـدەنگی هەرچوار مەزهەبەکە، بەڵام ئەوکەسە سەرکۆنە دەکرێ وتەمێ وئامۆژگاری دەکـرێ کەجارێکی تر شتی وا دوبارەنەکاتەوە. وە ئاژەڵەکەش ناکوژرێت، ئەگەر ئاژەڵەکـە گۆشتی دەخورا (وەکو مەڕ وبزن) ئەوا هیچ خراپەیەکی تێدانیە ئەگـەر گۆشـتەکەی بخورێ لای جمهوری زانایان.

(ئەمە لەکاتێکدا کەس بەمەی نەزانیبێ تەنها فەرمانڕەوا نەبێ.

واتە خەڵکی ئەم باسەیان نەبیستبێ ونەزانن ئەوئاژەڵە کاری وای لەگەڵ کراوە! بەڵام ئەگەر کارەکە ئاشکرا بوو بەوەی لەبەرچاوی خەڵکا کرا. یان خەڵکی بەسەر (بکەر)دا چون کە لەگەڵ ئاژەڵەکەدا بوو، ئەوا: (وَتُقْتَلُ بِشَهادَةِ رَجُلَيْنِ عَلى فِعْلِهِ بِها، وَيَحْرُمُ أَكْلُها وَيضمنها عِنْدَ الحَنابِلَةِ).

ئەگەر دووکەس شاهیدیان دا کە ئەو ئاژەڵە سێکسی لەگەڵ کراوە. واتە (شتەکە ئاشکرا بوو. ئەوا ئەو ئاژەڵە دەکوژرێ وحەرامە گۆشتەکەی بخورێ وفڕێ دەدرێ. وە ئەو کەسەش کەئەو ئاژەڵەی والێ کردوە دەبێ بیبژێرێ بۆ خاوەنەکەی لای حەنبەلیەکان. (الفِقْهُ الإِسلامي وَأَدِّلَتُهُ ، د.وَهْبَة الزُّحَيلي ج٧ ، ص٥٣٦٠).

**لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت، ئەویش ئەوەیە:** باشە ئەگەر جووت بون لەگەڵ ئەو ئاژەڵەدا کاریگەری کردۆتە سەرگۆشتی ئاژەڵەکە بۆچی لەجاری یەکەمدا کە کەس پێ ی نەزانیوە، فەرموی: ئاساییە گۆشتەکەی بخورێ. بەڵام کە خەڵکی پێ ی زانی دەبێ بکوژرێ ونابێ گۆشتەکەشی بخورێ؟

**لەوەڵامدا دەڵێین:** هیچ کاریگەری لەسەر گۆشتی ئاژەڵەکە دروست نەکردوە، بەڵام بۆیە لەحاڵەتی ئاشکرابونی کارەکەدا، ئاژەڵەکە دەکوژرێ، بۆئەوەی کەخەڵکی بەبینینی ئەو ئاژەڵەی وای لێ کراوە باسی زینا وداوێن پیسیان لانەوروژێ ونەبێتە باس وخواسی کۆڕ ومەجلیسیان.

با زینا بەقسە وباسیش لەناو خەڵکی دا قسەی لێ نەکرێ وبیری خەڵکی بۆلای نەوروژێنرێ، بەتایبەت ئەوگەنجانەی کەلەتەمەنی هەرزەکاری وگوڕوتین وبلێسەی سێکسی وئارەزوی جنسیدان. وەخێزانیان نیە وبەهەر باس وقسە ودیمەن وبابەتێکی جنسی ئارەزویان دەجولێ وبەشوێن تێرکردنیدا وێڵن.

ئەگەر بیروباوەڕ وعەقیدەیەکی پوختی خواناسی ودینداری نەیان گێڕێتەوە.
کەواتە لێرەوە تێ دەگەین کە ئەو گۆڤار ورۆژنامەو (CD) وبلاوکراوە وکەناڵ وسایتانەی باسی سێکس وئافرەتی ڕووت ولادەرو وروژێنەری بابەتی جنسی دەکەن، دەبێ بڕێنرێن نەك کەسێك گۆڤارێك (CD) یەکی لەوبابەتەی لایە. بیەوێ بیگەیەنێ بەکەسێکی تر، جاری واهەیە ئەم گەیاندنە بەناوی دڵسۆزی ودینداری وخواناسیەوەیە، وەکو ئەوەی نیشانی کەسانی تری دەدات کەگوایە ئاگاداربن ئەم شتە خراپ وبەدڕەوشتیانە لەئارادان وخۆتانی لێ بپارێزن.
یان جاری واهەبوە، ووتاربێژی سەرمینبەر لەڕوی دڵسافی ودڵسۆزیەوە ناوی گۆڤار وپێگەی سایتەکەی بردوە وژمارەکەی باس کردوە، کەلاوان خۆتانی لێ بپارێزن بەڵام لەڕاستی دا، بەقسەی شەرع دەبێ ئەوقسە وباس وبابەتانە بە هیچ شێوەیەك بڵاونەکرێنەوە وکەس بۆ کەسی نەبات وباس نەکات. چونکە بێ ئەوەی بەخۆت بزانی پڕوپاگەندە (ڕیکلام) ی بۆ دەکەیت!
هەر بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بارەی ئەوئاژەڵەوە کەخەڵکی زانیان جوت بونی جنسی لەگەڵ کراوە وناسیانەوە، فەرموی دەبێ بکوژرێ و لەبەر چاوان لابرێ وگۆشتەکەشی نەخورێ! ئێمەی موسڵمانیش دەبێ ئەو گۆڤارە یان ئەو (CD) یە لەناوبەین وبیسوتێنین وئەوسایت وپێگانە بەهیچ کەس ڕانەگەیەنین ولەڕوی دڵسۆزیەوە بێئاگایانە پڕوپاگەندەی بۆ نەکەین.

**- هەندێ جۆری تری زینا کە کەمتر لای خەڵکی ئاشکرایە وخیلافی تێدایە لەناو زانایاندا ئەمانەن:**

**١- إِفْسادُ المَرْأَ عَلى زَوْجِها:** کەسێك وا لە ئافرەتێکی خاوەن مێرد بکات.

کەمێردەکەی لەبەر چاو بخات و پاشان کەمێردەکەی تەلاقی دا ئەم مارەی بکاتەوە، لەبارەی حوکمی ئەو جۆرەکەسانەوە زانایانی شەرع زان ئاوایان فەرموە:
**مالیکیەکان دەفەرمون:** (إِنَّ مَنْ أَفْسَدَ زَوْجَةَ غَيْرِهِ لِيَتَزَوَجَها بَعْدَهُ تَحْرُمُ عَلَيْهِ تَحْرِيماً مُؤَبَّداً، مَعامَلَةً لَهُ بِنَقيضِ قَصْدِهِ).
واتە: هەرکەسێك هەرکورێك. پیاوێك کارێکی وابکات کەژنێکی خاوەن مێرد لە مێردەکەی هەڵگێرێتەوە تا بەتەڵاقدانی دەدات. بەمەبەستی ئەوەی دواتر بۆ خۆی مارەی بکاتەوە، ئەوە ئەو ژنە لەدوای تەڵاقدانیشی و نەمانی هیچ پەیوەندیەکیشی بەمێردەکەیەوە، بۆ هەمیشە لەوپیاوە حەرام دەبێت کە ئافرەتەکەی لەمێردەکەی هەڵگێڕایەوە.
ئەمەش وەکو مامەڵە لەگەڵ کردنی بەپێچەوانەی مەرامەکەی خۆیەوە ونەهێشتنی بەگەیشتن بەئاواتی خۆی. هەروەکو لەو فەرمودەیەدا هاتوە کەئیمام ئەحمەد بەسەندێکی صەحیح لە (بریدە)وە دەیگێڕێتەوە کە فەرمویەتی،
پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((**مَنْ أَفْسَدَ إِمْرَأَةً عَلى زَوجِها فَلَيْس هُوَ مِنَّا**)).
هەرکەسێك ژنێك لەهاوسەرەکەی هەڵگێڕێتەوە وببێتە هۆی لەیەك جیابونەوەیان ئەوە ئەوکەسە — ئەو پیاوە — لەئێمە نیە:.
**بەڵام زانایانی حەنەفی وشافیعی دەفەرمون:** هەڵگێڕانەوەی ژنێك لەمێردەکەی نابێتە هۆی ئەوەی کەئەم ئافرەتە دوای جیابونەوەی لەمێردەکەی بۆهەمیشە لەوکەسە حەرام بێت کەبۆتە هۆی هەڵگەڕانەوەی ئەو ژنە لەمێردەکەی. بەڵکو دوای تەواوبونی عیددەی شەرعی بۆی هەیە مارەی بکات (وَلكِنْ هـذا الإِنْسان يَكوُنُ مِنْ أَفْسَقِ الفُسّاقِ، وَعَمَلُهُ يَكوُنُ مِنْ أَنْكَرِ أَنْواعِ العِصَّيانِ، وَأَفْحَشِ الذُّنُوبِ عِنْدَاللهِ عَزَّوَجَلَ يَوْمَ القِيامَةِ).
بەڵام ئەم پیاوەی کە ئەو ژنەی لەمێردەکەی هەڵگێڕایەوە ودواتر بۆخۆی مارەی کرد لە فاسقترین فاسقانە، وکردەوەکەی لەناموترین ودزێوترین تاوان وسەرپێچی خوایە وخراپترین وقێزەونترین گوناهەکانە لەلای خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا.

واتە: حەیاچوو ماڵ وێرانی ڕۆژی قیامەتە! وە ئەو ژنەش کەبەبێ هۆکارێکی شەرعی داوای تەڵاق لەمێردەکەی دەکات. ئەوە بەهەشتی خوا لەخۆی حەرام دەکات.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((**أَيُّما إِمْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَها طَلاقَها مِنْ غَيْرِ ما بَأْسٍ، فَحَرامٌ عَلَيْها رائِحَةُ الجَنَّةِ**)) رَواهُ أَحمد وَأَبوداود وَصَحَّحَهُ الأَلْباني في صَحيح الجامِع (٢٧٠٦).

واتە: هەر ئافرەتێك داوا لەمێردەکەی بکات وپێ ی بڵێ دەبێ تەڵاقم بدەیت ووازی لێ نەهێنێ هەتا مێردەکەی ناچار دەکات کەتەڵاقی بدات، وە هیچ بەهانەیەکی ڕەواشی نەبێ بۆ داوای ئەم تەڵاقە، ئەوا بۆنی بەهەشتی لێ حەرام دەبێت و بەهەشت نابینێت و هەر بۆنەکەشی بۆی ناچێت!.

- وە ئەو ئافرەتەش زۆر زۆر تاوانبارە کەکارێکی وادەکات ژنەکەی خۆی تەڵاق بدات تاوەکو ئەم شوی پێ بکات، لەو بارەیەوە پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) دەفەرموێت: ((**لايَحِلُّ لإِمْرَأَةٍ تَسْأَلُ طَلاقَ أُخْتِها لِتَسفَرِغَ صَحْفَتَها، فَإِنَّما لَها ماقُدِّر لَها**)) رَواهُ البُخاريُّ (٥١٥٢).

واتە: دروست نیە وحەڵاڵ نیە بۆ هیچ ئافرەتێك کەببێتە هۆکاری تەڵاق دانی خوشکەکەی (خوشکە ئیماندارەکەی) بۆئەوەی بچێتە شوێنی ئەوو ببێتە ژنی پیاوەکەی. چونکە بەڕاستی ئەوبەشی خۆی بۆدیاری کراوە وپێویست ناکات چاوی لەبەشی ئافرەتێکی تربێت.

**٢- کەسێك لەچوار ژن زیاتر مارە بکات:**

لەبارەی ئەوکەسانەوە زانایانی مالیکی دەڵێن: (إِذا عَقَدَ رَجُلٌ عَلى إِمْرَأَةٍ خامِسَةٍ وَمَعَهُ أَرْبَعُ نِسْوَة. فَإِنْ كانَ يَعْلَمُ بِحُرْمَتِها أُقيمَ عَلَيْهِ الحَدُّ).

واتە: ئەگەر پیاوێك چوار ژنی هەبوو، وەچوو ژنـی پێنجەمیشـی مـارەکرد. ئـەوە ئەگەر دەیزانی کە حەرامە پیاو لە چوار ژنی زیاتر هەبێ، بەڵام گوێ ی پـێ نـەدا. ئەوە دەبێ حەددی شەرعی لەسەر جێ بەجێ بکرێ.

**٣- کەسێك لەدووجار زیاتر تەڵاقی کەوتبێ:**

ئەوا وەکو ئەوکاتەی لێ دێتەوە کە ئەو ژنەی مارە نەکردوە و هەموو ژیانی دەبێت بەزینا کـردن. چـونکە لای ئاسـانکارتین ڕێگـای شـەرع تـەڵاق هـەردووجار چـاك دەبێتەوە ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ ﴾ البقرة: ٢٢٩

**٤- کەسێك ژنێك مارە بکات، بەڵام نیازی نەبێ مارەیی و بداتێ و بیخەڵەتێنێ:**

(أَخْرَجَ الطَّبَرانِيُّ بسَنَدٍ رُواتُهُ ثِقاتٌ عَنْ مَيْمُونٍ الكُردِيٍّ، عَـنْ أَبيـهِ، أَنَّ رَسُـولَ اللهِ(ﷺ) قالَ: ((**أَيُّما رَجُلٍ تَزَوَّجَ إمْرَأَةً عَلى ماقَلَ مِنْ المَهْرِ أَوْ كَثُـرَ وَلَـيْسَ في نَفسهِ أَنْ يُؤَدِّيَ إِلَيْها حَقَّها، خَدَعَها، فَماتَ وَلَمْ يُؤَدِّ إِلَيْها حَقَّها لَقِـيَ اللهَ يَـوْمَ القِيامَةِ وَهُوَ زانٍ**)). واتە: هەر پیاوێك ژنێك مارە بکات لەسەر مارەییەك، جائـەو مارەییە کەم بێت یان زۆر بێت. بەڵام لەناخی دڵیدا نیازی نـەبێت کەئـەو حەقـەی (کەمارەییەکەیەتی) بیداتێ.

بەم شێوەیە تەنها بۆ خەڵەتاندنی ئەو مارەییە لەکاتی مارەکردندا لەئەستۆ بگرێت. ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا کەدێتە حزوری خوای گەورە بەتاوانی زیناوە بەخزمەت خوا دەگات!!

**هەر بۆیـە بەپێویسـتی دەزانم کەهـەموو ئەوکەسـانەی کەلـەکاتی ژن مارەکردنـدا مارەیی پاشەکی (مُؤَخَّرَ) لەسنوری تواناي خۆیان دادەنێن، وەکو بە چەند سەد لیرە ومیسقالْ ئالْتون لەئەستۆی خۆیان گرێ دەدەن و زۆرجار بەئاشکرا دەڵـێن خۆئەمـە ناشـکرێ، بـەڵام هـەربۆ دڵنیـایی ئافرەتەکـە باهـەبێت لەعەقـدی زەواجەکـەدا لەدادگادا. ئەوە چونکە نیـازی پێـدانی نـی یـە دەبـێ بترسـێ کەبـەر هەڕەشـەی ئەوفەرمودەیە بکەوێت!**

**٥- کەسێك ئافرەتێك مارە بکات کەهێشتا لەژێر (عیددە)ی کەسێکی تردا بێت:**
جا عیددەی وەفات بێت یان تەلاّق. واتە: ماوەی شەرعی عیددەکە تەواو نەبوبێ ئەم مارەی دەکات، ئەوا ئەو مارەکردنە دانامەزرێ وپەنا بەخوا وەکو بێ مارەکردن چوبێتە لای وایە.
هەر بۆیە زۆر پێویستە کە تەلاّقدان لە لیژنەی فتوایان دادگا ئەنجام بدرێت ونوسراوی مۆرکراو کەبەرواری ڕۆژ ومانگ وساڵی لەسەرە بدرێ بەپیاوو ئافرەتە تەلاّق دراوەکە و لەوبەروارەوە عیددەی بۆ حیساب دەکرێت.
لەبەر ئەوەی ئەگەر ژنێك (٢٠) ساڵ بێ لای مێردەکەی نەمابێ ودەستی بەدەستی نەکەوتبێ. ئەوا هەتا تەلاّق نەدرێ و لەڕۆژی تەلاّقەوە، یان مردنی مێردەکەیەوە عیددەی شەرعی بەسەر نەچێت، لە کەسێکی تر مارە ناکرێت. هەر بۆیە دەبێ موسڵمانان زۆر ئاگاداربن کە تەلاّقدانی ئافرەت ولەیەك جیابونەوەی ژن ومێرد لە یەکتری نابێ لە لاکۆڵان ومالاّن ئەنجام بدرێ، بەڵکو دەبێ لە لیژنەی فتوای شەرعی یان دادوەری بەڕێز لەدادگادا ئەنجام بدرێت.
جا ئەگەر هاتوو کەسێك ژنێکی تەلاّقدراوی مارەکرد، کە هێشتا عیددەی بەسەر نەچوو بوو. وە دەشیزانی کەعیددە ماوەی چەندە و ژنەکەشی عیددەی بەسەر نەچوە.
**بەلاّم هەرمارەی کرد ئەوا: مەزهەبی مالیکی وشافیعی و حەنبەلی دەفەرمون:**
ئەگەر کەسەکە کوڕ بوو، پێشتر ژیانی هاوسەری نەبینیبوو، ئەوا داری حەددی لێ دەدرێت. وەئەگەر ژنی هەبوو، یان پێشتر ژیانی هاوسەری بینیبوو، ئەوە ڕەجم دەکرێت.
بەلاّم لای پێشەوا ئەبو حەنیفە، تەنها تەمێ دەکرێ ومارەکردنەکە دوبارە دەکرێتەوە دوای تەوابونی ماوەی شەرعی عیددە.
**٦- کەسێك بەزۆر زینا بە ئافرەتێك بکات:**

وەکو جەللادەکانی ناو گرتوخانەکانی حکومەتە دیکتاتۆریەکان. ئەوا: شافیعیەکان دەفەرمون: (إذا إستكره الرَّجُلُ المَرْأَةَ عَلى الزِّنا. أُقيمَ عَلَيْهِ الحَدُّ، وَلايُقامُ عَلَيها لأَنَّها مُسْتَكْرِهَةٌ). واتە: ئەگەر پیاوێك زۆری کرد لە ژنێك و ناچاری کرد کە لەژێر ئەشکەنجە وئازار وناڕەحەتی تەحەمول نەکراودا، زینای لەگەڵ بکات. ئەوا ئەو زیناکارە زۆردارە حەددی شەرعی لەسەرە، بەڵام ئەو ژنە زۆرلێکراوە حەددی لەسەرنیە. چونکە بەزۆر ئەوکارەی پێ کراوە!

بەڵێ مرۆڤ ڕێزدارترین دروستکراوی خوای گەورەیە ودەبێ بەسەر بەرزی بژی. وەیەکێ لەسەربەرزترین وشانازی ترین شت بۆ مرۆڤ ئەوەیە: باوك ودایكی دیارین وحەڵاڵ زادەبێ. وەئەو ماددەیەی کە لەپیاوو ژندا خوای گەورە کردویەتی بەمایەی دروست بونی مرۆڤ ، نابێ لە غەیری شوێنی حەڵاڵی خۆیدا دابنرێت. تەماشاکەن لەسەردەمی ئەمڕۆدا کە (التَلْقيح الصِّناعي) یان (أَطْفال الأنابيب) بەکوردی پیتاندنی دەستکرد، یان منالی ناو شوشە، وەکو ڕێگەیەکی زانستی نوێ ی پزیشکی بۆ ئەوکەسانەی کەمنداڵیان نابێ بەکاردەهێنرێ بەمەرجی خۆی کەباسی دەکەین. شەرع ڕێگای پێ داوە.

هەروەکو کە (مَجْمَع الفِقه الإِسْلامِي) لە عەممانی ئەردەن لە (٨ تا ١٣ی صەفەری ١٤٠٧ی کۆچی بەرامبەر ١١ تا ١٦ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٦ی زاینی) ،

**بڕیاری دا کەدروستە بەومەرجەی:**

**یەکەم:** نوتفەی پیاوەکە وەربگیرێ وهێلکۆکەی ژنەکەی خۆشی وەربگیرێ ولەشوشەدا بەیەکەوە بپیتێنرێن وپاشان دوای پیتاندن، پێکهاتوەکە لەڕەحمی ژنەکەدا بچێنرێت.

**دووەم:** تۆوی پیاوەکە وەربگیرێ وبەئامێری تایبەتی پزیشکی بخرێنە شوێنی گونجاوی ناو زێ ی ئافرەتەکەوە. یان ناوڕەحمیەوە ولەوێدا لەگەڵ هێلکۆکەی

ئافرەتەکەدا (کە ژنی حەلاڵی خۆیەتی) لەناوەوە دەپیتێنرێ وبەویستی خوای گەورە منالْ دروست دەبێ.

ئەوە لەم دوو حاڵەتەدا دروستە وشەرعیە وجگە لەم دوو ڕێگەیە، هەموو ڕێگاکانی تر کەئەمانەن بێ شەرعین وحەرامن ونابێ ئەنجام بدرێن، چونکە دانانی مەنی ژن وپیاوە لە غەیری شوێنی حەلاڵی خۆی دا.

**وەکو:**

**یەکەم:** تۆوی پیاوێك وەربگیرێ ولەگەڵ هێلکۆکەکەیدا بپیتێنرێن (تلقیح) کەئەو هێلکۆکەیە هی ژنێکە، کەژنی شەرعی وحەلاڵی ئەوپیاوە نی یە، پاشان ئەوەی دروست بوو لەو پیتاندنەی تۆو هێلکۆکەکە بخرێتە ڕەحمی ژنی پیاوەکەوە (ژنی حەلاڵی خۆی) وە لە ڕەحمیدا بچێنرێت ومنالْ دروست ببێت.

کە ئەمەش لەوکاتانەدا دەکرێت کەژنەکە (ژنی پیاوەکە) نەزۆکی هەمیشەیی هەیە وهێلکۆکەکانی دانابەزن یان پوچن ومناڵیان لێ دروست نابێت.

**دووەم:** تۆوی پیاوێك وەردەگیرێ ولەگەڵ هێلکۆکەکەیدا دەپیتێنرێت، بەلاّم لەم حاڵەتەدا تۆوەکە هی مێردی ژنەکە نیە. بەڵکو هی پیاوێکی ترە.

پاشان ئەوپێکهاتوە پیتێندراوە لە ڕەحمی ژنەکەدا دەچێنرێت ومنالْ دروست دەبێت، ئەم حاڵەتەش بۆ ئەوکاتەیە کە پیاوەکە (مێردی حەلاڵی ژنەکە) نەزۆکی هەمیشەیی (موئەبەد) ی هەیە.

**سێ یەم:** تۆوی پیاوێك وهێلکۆکەی ژنێك وەردەگیرێن کە ئەم ژن وپیاوە هاوسەری شەرعی وحەلاڵی یەکترین ودوای پیتاندن دەخرێتە ڕەحمی ژنێکەوە، کە ئەو ژنە ژنی پیاوەکە نی یە ولێ ی حەرامە. وە لەڕەحمی ئەوژنەدا منالّەکە دروست دەبێت.

ئەمەش لەو حاڵەتانەدا دەكرێت كەژنی حەلاڵی كابرا ڕەحمی نەخۆشە ومناڵ ڕاناگرێ.

**چوارەم:** حاڵەتێكە كە پیاوو ژنەكە هەردوكیان نەزۆكی هەمیشەیین - بۆ ئەوەی لە مناڵ بێ بەش نەبن پەنا بۆئەم ڕێگایە دەبەن. تۆوی پیاوێك وەردەگرن و لەگەڵ هێلكۆكەی ژنێك دەیپیتێنن. كە ئەم ژن وپیاوە هیچ پەیوەندیەكی شەرعیان بەیەكەوە نی یە وپاشان پێكهاتوەكە دوای پیتاندن دەخرێتە ناوڕەحمی ژنەكەوە - ژنی كابرای نەزۆكەوە - وە لەناو ڕەحمی ژنەكەدا مناڵەكە دروست دەبێت.

**پێنجەم:** تۆوی پیاوێك وهێلكۆكەی ژنێك وەردەگیرێ كەژن ومێردی یەكتری نین، پاشان پیتێنراوەكە دەخرێتە ڕەحمی ژنێكەوە كەمێردی نیە و پاشان ئەومناڵەی كە لەدایك بوو دەدرێت بەژن و پیاوێك بۆ خۆیان دەیكەن بەمناڵی خۆیان.

كە لەم حاڵەتەدا سێ كەس بەشداریان كرد (پیاوێك ودوو ژن) كەهەمویان نامەحرەمن بەیەكتر.

ئەوە بزانن كەئەم پێنج حاڵەتە هەمویان ناشەرعین وڕێگایان پێ نادرێت، چونكە لەم پێنج حاڵەتەدا هەرگیز ژن وپیاو ئەم تام وچێژە لەومناڵە ناكەن كەتەنها لە خۆیان بێت وكەسی سێیەم تەداخولی تێدانەكردوە، وەبێ گومان هەرشتێك كە شەرعی خوا حەرامی كردبێت بێ حیكمەت نیە و لەڕوی زانستیەوە نەخۆشی سامناكی بەدواوەیە. جا لەبەر پاراستنی كۆرپەكە وژنەكە بەتایبەت ئەم جۆرە مناڵە بلوریە حەرامە، كەدواتر لەڕوی زانستی نوێ وە باسی دەكەین، لەو باسەدا كەهۆكاری حەرام بونی زینا باس دەكەین (إِنْ شاءَ اللّٰه).

**جا بەڕێزان:** سەرنج بدەن خۆئەم حاڵەتانە هیچ هەدەفێكی ئارەزوو بازیان لەپشتەوە نیە و ئابڕوچون و فیتنەی تێدانیە و بۆ مەبەستی خێرەكەبونی مناڵێكە بۆناو باوەشی تامەزروێ ژنێك وپیاوێك بۆمناڵ. بەڵام لەبەرئەوەی ئەومەنیە لەشوێنی

بۆحەلاڵ کراویدا دانانرێ بەتاوان حیسابە، بۆچی؟! بۆ سەربەرزی ئەومنالەی کە لەدایك بوو. دواتر پێ ی نەوترێ تۆ لە (١٠٠٪) هی دایك وباوکت نیت ویەشی غەیری ئەوانیشت پێوەیە!!

**کەواتە:** سەربەرزی مرۆڤ لەو ئیسلامەدایە کەزینای حەرام کردوە، هەر بۆیە پێویستە هەمومان ئەو ڕاستی یە بزانین کاتێ کەئیسلام زینای حەرام کردوە. ئازادی مرۆڤی پێشێل نەکردوە و حوریەتی شەخصی وەکو بێ دینەکان دەڵێن پێشێل نەکراوە. بەڵکو بەو زینا حەرام کردنە، حوڕیەت وسەربەستی و سەر بڵندی و ئازادی دونیا و قیامەتی بەخشیوە بەتاك پاشان خێزان وکۆمەڵ.

بەڵام بۆچی دوژمنانی ئیسلام بەحوڕیەتی شەخصی دەزانن چونکە ئەوان مرۆڤانە بیرناکەنەوە، بەڵام ئیسلام دینێکە، کالاّیەکی پڕ بە بالاّی مرۆڤە، دوربینیانە و واقیعیانە تەماشای شتەکان دەکات.

جا هەرکەسێ دەیەوێت سەربەرزبێ، سەر بڵندبێ، بەمرۆڤانە بژی، با پابەندبێ بە ئیسلامەوە وە با هەمومان شانازی بکەین بەم ئیسلامە عەظیمە وە. کە هەر کەسێ بەڕاستی لە پەنای ئیسلامدا بژی وەکو ئیسلام گەورە دەبێ..

﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾

ٱللَّهُمَّ ءَامِينَ

# سەرچاوەکان

١- كَبائِرُ الذُنُوب ، يوسـف الحـاج أحمـد ، ص١٧٩، ص١٧٠، ص١٧٣، ص,١٧٦

٢- فَتاوى النّاس ، محمود المصري ، ج٢ ص,٦٣٥

٣- الفِقْهُ الإسْلامي وَأَدِّلَتُهُ ، د.وَهْبَة الزُّحَيلى ج٧ ، ص,٥٣٦٢

٤- جامِعُ المُهْلِكات ، عرفان بن سَليم ، ص٢٣٣، ص,٢٥٢

٥- مِفْتاح الخِطابَةِ وَالوَعْظ ، (محمد أَحمد العدوي) ، ص,٢٨٥

٦- ڕۆژنامەی: كوردستانی نوێ ، ژمارە: ٤٤٩٤ لە ٢٠٠٨/٢/١٢ ، لاپەڕە (٩).

٧- گۆڤاری هۆنیا ژمارە: ٤٥.

الحَمْدُ لله رَبِّ العَالمين، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيِّدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبهِ أجمعين.

ئاینی ئیسلام کەهەرشتێکی قەدەغەکردوە، لەبەر بەرژەوەندی مرۆڤـە، جاهەنـدێك لەزەرەرو زیانەکانی زینا ئەمانەن:

**١- لەناوبەری ئیمانە**، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: **(لايَزْنِي الزَّانِي حِـينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤمِن)** مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

واتە: لەوکاتەدا کەزیناکار خەریکی زینا کردنە. ئالەوکاتەدا ئیمانی لانەماوە.

چونکە ئەگەر وابزانیّ خوا چاوی لێی نیە، ئەوە کافر دەبیّ. وەئەگەر یـەقینی ببـیّ کەخوا چاوی لێیەتی، دیـارە لەهـەموو کـەس کـەمتر حیسـابی بـۆ خـوا کـردوە، لەبەرئەوەی ئەگەر کەس ئاگای لیّ بیّ ئەو کارە ناکات کەواتـە لەوکاتـەدا ئیمـانی نامێنێت. هەروەکو لەفەرمودەیەکی تردا کەصەحیحەو پێشەوا (أبُوداود) ڕیوایەتی کردوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: **((إذا زَنَى الرَّجُلُ خَرَجَ مِنْهُ الإيمـانُ وَكانَ عَلَيْهِ كالظُّلّةِ، فإذا انْقَلَعَ رَجَعَ إلَيْهِ الأَيمانُ))**.

واتە: هەرکاتیّ کەسێك زینای کرد. ئـەوا لـەوکاتی زیناکردنـەدا ئیمـان لەلاشـەی دەچێتە دەرەوەو لەسەری وەکو سێبەرێك دەوەستێت، جاکاتیّ لەزیناکە تەواو بـوو. ئەمجا ئیمانەکە دێتە ناولاشەکەوە — ئەگەر زیناکەی بەحەرام و تاوان زانیبیّ و خۆی بەخەجالەت باری قاپی خوا بزانیّ، بەلاّم ئەگەر بەحەلاّلی بزانیّ و خۆی بـەگوناهبار نەزانیّ. ئەوە کافر دەبیّ و ئیمانەکەناگەڕێتەوە.

**جا کەواتە:** بۆئەوەی مرۆڤـ بـەبیّ ئیمـانی نـەمریّ، زینـا حـەرام کـراوە، چـونکە زۆرکەس بوە پەنا بەخوا لەکاتی زینا کردندا مردوە.

**٢- حەیاو ئابڕو چون**، چونکە زیناکار دەبێتە هۆی ئابڕو چونی خۆی و بنەماڵەکەی و منداڵـەکانی و منـداڵی منداڵیشـی، وەئـابڕو چـون و سـوك کردنـی نـاوی لادیّ و شارەکەشی.

**کەواتــە:** زینــا تاوانەکــەی چــەندین کەســی بــێ تــاوان و بــێ ئاگــا دەگرێتــەوەو بۆگەنیەکەی بەسەر ئەوانیشدا دەڕوات.

چەند کوڕ و کچی زۆر بەڕێز هەیە، سەر شـۆڕی نـاو کۆمەڵگایــە بــەهۆی ئــەوەی کەباوکی یان دایکی یان لەبنەماڵەکەی دا زیناکارێك هەبووە!!

**٣- زینا هۆکارێکی سەرەکیە لەهۆکارەکانی کوشتن:**

زۆرجار ژن و پیاو یان کوڕو کچ دەکوژرێن، یان منالّی دروست بوو لەو زینایە لەناو سکدا دەکوژرێ و لەباردەبرێ، یان کوشتنی منالّەکە دوای لەدایك بونی، یـاخود وا ڕوی داوە کــەژن و پیــاوی زیناکــار مێــردی ژنەکــەیان کوشــتوە کــاتێ لــەکاتی زیناکردنەکەدا بینیونی و پەلاماری داون، کەلەڕاستیدا تاوانی کوشـتن زۆرلـەتاوانی زیناکە گەورەترە!

**٤- بڵاوبونەوەی زینا هۆی غەزەبی خوایە لەو ناوچــەیەی کــەزینای بەئاشــکراو لەشوێنی تایبەتدا تێدا دەکرێ.** پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویــەتی: ((**ماظَهَرَ في قَوْمٍ الزِّنا، أَوِ الرِّبا، إلاّ أَحَلُّوا بِأَنْفُسِهِمْ عَذابَ الله**)) ئەم فەرموودەیە حەدیسێکی حەسەنەو لە (صَحيحُ الجـــامِع)دا بــەژمارە: ٥٦٣٤ هــاتوە. کــە بــەکوردی واتــە: هەرکاتێ زیناو داوێن پیسی ئاشکراو بڵاوبۆوە لەناو گەل و هۆزو نەتەوەیەکدا، یـان سوو خۆری و ڕیبا بڵاو بۆوە بەئاشکرا بانقی ســوو خــۆر دانرابــوو، ئــەوا بەڕاســتی دانیشتوانی ئەو ناوچەیەو ئەو شوێنە عەزابی خوایان بۆ خۆیان مسۆگەر کردوە.

٥- زینا قەرزەو ئەو قــەرزەش خێــزان و بنەماڵــەو عائیلــەی زیناکــار دەیداتــەوە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویــەتی: ((**بَرُّوا آباءَكُم تبركم أَبْناءُكُم. وَعَفُوا تَعُفُّ نِساؤكُم**)) رَواهُ الطَبَراني بإسنادٍ حَسَنٍ.

واتە: چاکەکار بن لەگەڵ باوك و دایکتاندا، منداڵەکانتان لەگەڵتان چـاك دەبــن. وە داوێن پاك بن خێزانەکانتان داوێن پاك دەبن.

**هەزار ڕەحمەت لە (ئیمامی شافیعی) کەفەرمویەتی:**

عِفُّوا تَعِفَّ نساؤكُم في المَحْرَمِ وَتَجَنَّبُوا مـــــــالايَليقُ بِمُسْلِمِ.

إنَّ الزِّنا دَيْنٌ فَإنْ أَقْــرَضْتَــهُ كانَ الوَفا مِــنْ أَهْـلِ بَيْتِكَ فَــاعْلَمِ.

مَنْ يَزْنِ يُزْنَ بِهِ وَلَوْبِــجِدارِهِ ....إنْ كُنْتَ يــــــــاهذا لَبيباً فَافْهَمِ.

واتە: داوێن پاك بن، پاداشتەکەی ئەوەیە ژنی بنەماڵەکەت داوێن پاك دەبن و کەس ناتوانێ چـاوی بەدڕەوشـتیان بـۆ هـەڵبڕێ. وەخـۆت بپـارێزە لـەکردارو گوفتارێـك کەشایستەی موسڵمان نیە، بەڕاستی زینا قەرزەو ئەگەر ئەو قەرزەت وەرگرت، ئەوا بزانە وەفای ئەو قەرزەو دانەوەکەی لەخێزان و خانەوادەکەی خۆتدا دەبێـت و ئـەوان زینایان لەگەڵ دەکـرێ، هەرکەسـێ زینـا بکـات، زینـای لەگـەڵ دەکـرێ، ئەگـەر بەدیواری ماڵەکەشی خەڵکی ئارەزووی خۆی بشکێنێ.ئەگەر ژیرو فامیـدەبی ئـەوا زۆرچاك و زۆر زوو لەمە تێدەگەیت.

**ئەگێڕنەوە:** کابرایەکی ئاوگێڕ لەشاری (بوخارا)دا ماوەی سی ساڵ ئاوی دەبـرد بـۆ ماڵی کابرایەکی زەڕەنگەر. ئەو زەڕەنگرەش ژنێکی جوانی هەبوو. ڕۆژێکیـان وەك عادەتی خۆی کاتێ کابرای ئاوگێڕ چـوو بـۆ ماڵیـان دەسـتی ئافرەتەکـەی گـرت و گوشی. جا کاتێ مێردەکەی لەبازاڕ گەڕایەوە ژنەکـە پێـی ووت: پیاوەکـە ئـەمڕۆ لەدوکان چ کارێکت ئەنجام داوە کەخوای گەورە پێی ڕازی نـەبوبێت؟ ووتـی: هیچـم نەکردووە، ئەویش زۆری لێکرد تابۆی گێڕایەوەو ووتی: ئەمڕۆ ئافرەتێـك هـات بـۆ دوکانەکەم و منیش بازنێکم دایەو تاقیم کردەوەو کردمە دەستی، دەستی زۆر سپی و جوان بوو. سەرنجی ڕاکێشام و منیش دەستیم گووشی!! ژنەکەی ووتـی: اللهُ أكـبر ئەمە حیکمەت و هۆی کردەوەی ئەو ئاوگێڕە بـوو کـە ئـەمڕۆ کـردی. مێردەکـەی ووتی: ئافرەت من پەشیمان دەبمەوەو تەوبە دەکەم و گەردنم ئازاد بکە. بۆ سـبەینێ گەنجە ئاوهێنەکە هات و ووتی: ئەی ئافرەتی خاوەن ماڵ گەردنم ئازاد بکە بەڕاستی

دوێنێ شەیطان گومڕای کردم. ئەویش ووتی: بڕۆ خەتای تۆ نەبوو. خەتاکە خەتاو تاوانی ئەو پیاوە بوو کە لەدوکانەکەدایە (واتە مێردەکەی)، چونکە کاتێ حاڵی خۆی گۆڕی بەوەی دەستی ئافرەتێکی بێگانەی گووشی، خوای گەورەش حاڵی خێزانەکەی گۆڕی بەوەی بێگانەیەك دەستی ژنەکەی گووشی!!

بەڵێ نمونەی ئەم بەسەرهاتە زۆرەو بینیومانەو لەدووبارە بونەوەدایە.

**٦- زینا دەبێتە هۆی توش بوون بەقورسترین سزا.** ئەگەر کوڕو کچ بن دەبێ یەکی (١٠٠) داریان لێ بدرێ و خەڵکی ئاگای لێ بێ.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجْلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِاْئَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ النور: ٢

جا ئەگەر لەژێر لێدانی سەد دارەکە دەرچون ئەوا ناکوژرێن و پاك دەبنەوە لەو گوناهە. بەڵام ئەگەر زیناکار (مُحْصن) بوو.

واتە: چوبوە قەڵای ژن و مێردایەتیەوە، کەدەبوایە لەوە گەورەتر بوایە کەتوشی هەڵەی ئاوا گەورە ببێ. ئەمەیان سزاکەی ئەوەیەکە (ژن و پیاوەکە) ڕەجم دەکرێن بە بەرد. بەو شێوەیەی لەشەرعدا باس کراوە، هەتا دەمرن.

**بەڕێزان:** هەندێ کەس جا یان بێئاگان لەئیسلام یان بۆ چەواشەکاری دەڵێن:

چۆن ئیسلام ئەم حوکمە دژ بە مافی مرۆڤە بەسەر زیناکاردا دەچەسپێنێ؟!

**بەو جۆرە کەسانە دەڵێین:** سەرنج بدەن، ئیسلام لەم کاتەشدا، کەئەو کەسە ئەو تاوانە گەورەیەی ئەنجام داوە، هێشتا مافی مرۆڤ ڕەچاو دەکرێ لەگەڵ ڕەجم کراوەکەدا. گوێ بۆ شەریعەتی ئیسلام بگرن: ئەگەر ئەو کەسەی زیناکەی لەسەر چەسپا ژن و پیاو بوون، واتە (مُحْصن) بوون، ئەوا حوکمەکەیان ڕەجم کردنە.

جائەگەر هاتوو زیناکەرەکە لەڕو لاوازو بێ هێزبوو. یان نەخۆش بوو یان، وەختەکە سەرما بوو، یان گەرما بوو، کەئەو سەرما و گەرمایە لەسنور چوبونە دەرەوە. ئەوا ڕەجم کردنەکە دواناخرێ و حوکمەکەیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێت، چونکە ئەو کەسە هەر دەبێ بمرێت. جائەگەر بمرێت ساغ بێ یان نەخۆش جیاوازیەکی نیە.

**بەلام:** ئەگەر ئەو کەسەی زیناکەی کردووە. کچ و کوڕ بون، واتە حوکمەکەیان لێدانی دار بوو، ئەوە ئەگەر نەخۆش بوون، یان لەڕو لاوازو بێتاقەت بون، یان سەرما و گەرمایەکی لەسنور چوبوە دەرەوە، ئەوا: (فَيُؤَخَّرُ إلى أَنْ يَقوي أو يذهب الحَرَّ أو البرد!!) حوکمی لێدانی دارەکە دوادەخرێ هەتا ئەو کەسە (کوڕو کچە) لەڕولاوازە قەلەو دەبن وەهەتا لەنەخۆشیەکەیان چاك دەبنەوەو کوڕو تین پەیدا دەکەنەوە، وەهەتا ئەو سەرما و گەرما بەهێزە لادەچێ و ئاو هەوا گونجاو دەبێ. جائەمە باچەند مانگیش بخایەنێ. باچەند سالیش بخایەنێ، ئەو حوکمە جێبەجێ کردنەکەی هەر دوادەخرێ!!

بۆچی لەمەیاندا دوادەخرێ و بۆ ژن و پیاوەکە دوانەدەخرا؟! لەبەرئەوەی کوڕو کچ کەحوکمی لێدانیان هەیە ئومێدی ژیان و ڕزگار بونیان لەبەردەمدایە، بەلام ژن و پیاو هەر دەبێ بمرن و ئومێدی ڕزگار بونیان نیە. ئیتر دواخستن سودی چیە؟!

لەوەش گرنگتر کەمافی مرۆڤی تێدا ڕەچاو کراوە سەرنجی ئەم دەقە شەرعیە بدەن: (وَيجلد الضَّعيفُ بِعِثْكال عَلَيْهِ مائة غصنٍ. فَإنْ كانَ بِهِ خَمْسُونَ غَصناً ضَرَبَ بِهِ مَرَّتَيْن. وَتَمَسُّهُ الأَغصانُ. أَوْيَنْكَبِسُ بَعضُها عَلى بَعْضٍ لِيَنالُهُ بَعْض الأَلَمِ، أَوْيَضْرِبُ بالْنعالِ أَوَ بالثِّيابِ).

واتە: ئەگەر کەسەکە حوکمی لێدانی داری بەسەردا چەسپا، بەلام کەسێکی بێ هێز و تواناو لاواز بوو، ئەوا بەلقەدارێك لێی دەدرێ کە (سەد) شوڕکی پێوەبێت،

جائەگەر لقە دارەکە (پەنجا) شورکە داری پێوە بوو. ئەوا دووجار پێی دەکێشرێ و دەبێ شورکە دارەکان بەیەکەوە ببەسترێنەوەو بخرێنە پاڵ یەکتری بۆئەوەی تۆزێ ئازار بگەیەننە لاشەی دار لێ دراوەکە، ئەگینا ئەگەر پرش و بڵاو بن هەر هیچ ئازاری نادەن!! یاخود ئەو کەسە لاوازو بێتاقەت و نەخۆشە کەنەخۆشی درێژخایەنی هەیە. یان دوای ماوەیەکی زۆر زۆریش لاوازیەکەی هەر چاك نەبوو. وەبەو لقە دارەش ئازاری زۆری دەدا، ئەوا بەنەعل و پێڵاو لێی دەدرێ، یان بەجل و بەرگ لێی دەدرێ، بەپشتێن یان بەجامانە سەد جاری لێ دەدرێ!!!!

ئەم حوکمە شەرعیەش لەو فەرمودەیەوە وەرگیراوەکە (أحمد و نەسائی و ئیبن ماجە) لەسەعیدی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادەوە دەگێڕنەوەکە (سەعید فەرموویەتی سەعدی کوڕی عوبادەی باوکم فەرموی: کوڕێکی لەڕو لاوازی بێ هێزی – کورد ووتەنی دووچڵ ئێسقان – لەلامان دەژیا. ئەم کوڕە چوویوە لای کچێك و زینای لەگەڵ کردبوو. سەعد ئەمەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) باس کرد پێغەمبەری خواش (ﷺ) – دیارە دوای دڵنیا بونی لەوەی کەدانیان بەزینا کردنەکەیاندا هێناوە – فەرموی: (اضْرِبُوهُ حَدَّهُ) حەددەکەی لێ بدەن، هاوەڵان ووتیان: ئەی پێغەمبەری چوا (ﷺ) : (إِنَّهُ أَضْعَفُ مِنْ ذالِكَ). ئەو کوڕە زۆر لاواز ترو بێ تاقەت و توانا ترە لەوەی کەبەرگەی لێدانی سەد دار بگرێ. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((**خُذُوا عِثْكالاً فيه مائة شِمْراخٍ ثُمَّ اضْرِبُوهُ ضَرْبَةً واحِدَةً، فَفَعَلُوا**)). واتە: لقە دارێك پەیدا دەکەن کەسەد چلەداری باریکەڵەی پێوە بێت، پاشان یەك جار پێی کێشن، ئەوە لەجیاتی سەد جارەکەیە، ئەوانیش وایان کرد.

**کەواتە:** مەبەست و ئامانج لەلێدانی ئەو داری حەددە، بۆ لەناو بردنی فیتنەیە، چونکە دوای ئەوە کەس بۆی نیە هیچ قسەیەك بکات و ئەم باسە لێرەدا کۆتایی

پێ دێت، وە هەروەها مەبەست پێی تەمێ کردنی زینا کارە، هەم بەجەستە، هەم بەمەعنەوی کەلەبەرچاوی خەڵك لێی دەدرێ، بەخۆدا چونەوەیەکی بۆ دروست دەکات، کاتێ ئەو کوڕە یان ئەو کچە ئەو زینایەی کردوە ئارەزوەکانی بەسەر ئەقڵیدا زاڵ بون و وەك و مەست و بێ ئاگایەك ئەنجامی داوە، جا بۆئەوەی لێی نەبێ بەپیشە — لەش فرۆشی دروست نەبێ لەکۆمەڵداو کەسەکە لەناو نەچێت، بەم داری حەددە عەقڵ و هۆش و بیرو ویژدانی بەئاگا دەهێنرێتەوە، وەخەڵکیش دەبێ چاویان لێ بێ وەکو لەئایەتەکەدا فەرموی: ﴿وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ النور:٢.

بۆچی دەبێ خەڵکی ئاگای لێ بێ و کەئەم کوڕە یان ئەم کچە داری حەددی لێ دەدرێ، بۆ ئەوەی بناسرێ، کەناسرا ئیتر ئەم کوڕە یان ئەم کچە مەجال و دەرفەتی ئەوەی بۆ نارەخسێ جارێکی تر هەوڵی دوبارە کردنەوەی زیناکە بدات، چونکە زیاتر چاودێری دەکرێ — هەرچەندە بێ ڕێزیشی پێ ناکرێ — ئیتر ئەم داری حەددە بۆی دەبێتە خێرو بەرەکەت و ئەگەر چێژی زیناکە هانی بداتەوە بۆ دوبارە کردنەوەی ئەم دار لێدان و ئاگادار بونی خەڵکە گەورەترین بەربەست دروست دەکات لەدوبارە بونەوەو کردنە پیشە.

هەر بۆیە لەمێژووی ئیسلامیدا هەرکەسێك (کوڕ و کچێك) داری حەددیان لێ درابێ، ئیتر هەرگیز جارێکی تر زینای نەکردۆتەوەو ئەم ڤایرۆس و میکرۆبە کۆتایی پێهاتووە، بەڵام لەیاسای مرۆڤدا کەزیندانی کردنی داناوە، لەهەموو دنیادا زیناکاران دەچنە زیندانەوەو بەساڵ دەمێننەوە بەڵام کەهاتنەدەرەوە زۆر بەئاسانی توشی دەبنەوەو هیوا هەیە چەندین جار زیندانی بینیوە لەسەر دەست درێژی سێکسی و کەچی وازیشی لێنەهێناوە.

**کەواتە:** داری حەدد لەزیناکاری کچ و کوڕ نەك هەر پێشێل کردنی مافی مرۆڤ نیە، بەڵکو گێڕانەوەی ڕێزە بۆ مرۆڤـ و دوای ئەوەی بەو کارە قێزەونە لەکەداری کردبوو، هەر وەك و ئەو کارەبایە وایە کەلەکەسێکی لـەهۆش خۆچـوو دەدرێ، نـەك لەبـەر سزادانی بەڵکو بۆ پێدانەوەی دەرفەتی ژیان بۆی!

پاشان لەبارەی چۆنیەتی ڕەجم کردنەوە، کە کاتێ زینـا کارەکـە ژن و پیـاو بـوون، لەبەرئەوەی کەزینای ئەم دووانە تەنها زیانی لەکەسایەتی و ڕێزی مرۆڤانەی خۆیـان نەداوە، بەڵکو ستەم کراوە لەژنی پیاوەکە، وەلەمێردی ژنەکە، وە لەکچ و کوڕیـان، وە لەدوو بنەماڵە، وە لەنەوەی نەوەکانیان ئەگەر نەوەیان لێ کەوتبێتەوە. چـەندین کەسی بێئاگا تووشی ناڕەحەتی و شەرمەزاری و بەکەم سەیر کردن دەبن بەهۆی ئەم دوو خراپەکارەوە. منداڵ سـەرگەردان دەبـێ، پـەیمانی ﴿مِّيثَٰقًا غَلِيظًا﴾ النساء: ٢١ دەشکێ، ئای چ خیانەتێکی گەورەیە پیاوێك لەماڵ بچێتە دەر بۆ کـارو کاسـپی و پەیداکردنی بژێوی ژیان، دەیان ناڕەحەتی و سەرما و گەرماو دڵ ئازاردان و جەستە کەنەفت بونی و مێشك جەنجاڵ بون دێتە ڕێی. ئەو ماڵ و حاڵ و تەواوی سەروەت و سامان و منداڵ و کەرامەت و ڕێزی خۆی بەدڵنیاییەوە بۆ ژنەکەی بـەجێ هێشـتوە. کەچی ژنەکە. بچێ پیاوێکی تر بێنێتە ماڵەوەو خیانەتی لێ بکات.

وە بەپێچەوانەوە ژنێك هەموو کەس و کارو دایك و بـاوك و بـراو خوشـکی جـاری واهەیە شوێنی لـەدایك بـون و گـەورە بـون و پێگەیشـتنی، شـارو گونـدی خـۆی جێهێشتوە، هاتوە لەگەڵ ئەم پیاوەدا هاوسەر بێ، هاوژین بێ. هەموو شتێ قبـوڵ دەکات لەپێناوی هاوسەرەکەیدا. منداڵ بەخێو دەکات. میوان بەڕێ دەکات. ماڵ و حاڵ ڕێك دەخات، پیاو دێتەوە سەر سفرەی حازر. کەچی ئەم پیاوە لەپشتی ئەمەوە لەباوەشی بەدڕەوشتێکدا بخەوێ. ئەبێ چ خیانەت و ناپاکیەك بێ. کەچارەسەری ئەم

برینە قوڵە، ئەم سەرەگانە تەنها بەلەناوچون و لەبەرچاو نەمانی زیناکەرەکە دەبێ،
**کەشێوازی ڕەجم کردنەکەش ئاوایە:**

**لە شەرعدا دەفەرموێ:** سوننەتە چاڵێك بۆ ژن لێبدرێت و بخرێتە ناو چاڵەکەوە، کەی؟! (إِنْ ثَبَتَ زِناها بِبَيِّنَةٍ) ئەگەر هاتوو بەشاهید. بەشاهیدی دانی چوار شاهید لەلای دادوەر (حاکم) ئەم زینایە جێگیر بوو لەسەر ئەم زیناکارە. بۆچی؟! چونکە تازە مەجالی پەشیمان بونەوە نەماوەو هەرچەند بڵێ زینام نەکردوە، شاهیدەکان شاهیدیان داوەو هەر دەبێ بکوژرێت.

**بەڵام:** (إِنْ ثَبَتَ زِناها بِإِقْرارٍ فَلايحفر لَها، كي تَتَمَكَّنَ مِنَ الْهَرَبِ إِنْ رَجَعَتْ عَنِ الإِقْرارِ) بەڵام ئەگەر زینایەکە بەدان پێ داهێنانی زیناکار خۆی جێگیر بوو. واتە شاهیدی لەسەر نەبوو. هەر خۆی چوبوە بەردەم دادگاو دانی بەوەدانا بوو کەزینای کردوە. ئەوە لەم کاتەدا چاڵی بۆ هەڵناکەنرێ و ناخرێتە چاڵەوە. بەڵکو هەر لەدەشتا بەرد باران دەکرێت! بۆچی لەم حاڵەتەدا کەبەدان پێداهێنانی خۆیەتی چاڵی بۆ هەڵناکەنرێ؟! بۆئەوەی مەجالی هەڵاتن و خۆڕزگار کردنی لەبەردەمدا بێ کاتێ کەلەدان پێدانانەکەی خۆی پاشگەز بۆوە. چونکە ئەگەر کەسێك بەدەمی خۆی ووتی زینام کردوەو دواتر لەکاتی بەرد پێدادانەکەدا هەڵهات و ڕای کرد، ئەوا وازی لێ دەهێنرێ و بەشوێنیا ڕاناکرێ و پەشیمان بونەوەکەی لێ قبوڵ دەکرێ و وا دادەنرێ کەزینای نەکردوەو بەهۆی شتێکەوە ویستویەتی بەم ڕێگەی ڕەجم کردنە خۆی لەناو بەرێ. ئێستا پەشیمانەو لێی قبوڵ دەکرێ!! وە لەشەرعدا دەفەرموێ: هەموو لاشەی ئەو کەسەی ڕەجم دەکرێ، دەکرێ بەردی پێ بکەوێ بەڵام واباشە بەرد بەدەم و چاوی ڕەجم کراوەکەدا نەدرێ، لەبەرئەوەی هەندێ فەرمودە لەو بارەوە هاتوە کەقەدەغەی ئەوەی کردوە بەرد بەدەم و چاوی ڕەجم کراودا بکێشرێ! وە شوێنی وەستانی بەرد پێکێشەرەکە (الرامِي) دەبێ وابێ کەنەئەوەندە دووربێ کە

بەردەکە لەبەر دوری بەرەجم کراوەکە نەکەوێ. وە ئەوەندەش لێی نزیك نـەبێ، کـە لەبەر نزیکی ئازاری زۆر بگەیـەنێ لـەکاتی پێدادانەکـەدا، لەبەرئـەوەی تامـاوەی نێوانیان کەمتر بێ ئازاری بەردەکە زیاتر دەبێ. ئەمەش ئەوەمان تێ دەگەیەنێ کە لەئیسلامدا هەموو شتێ یاسای تایبەتی خۆی هەیە، نەك بەئارەزوی کەسەکان.

وە تەماشا دەکرێ. ئەگەر ئەو کەسەی بڕیاری ڕەجم کردنی دراوە. بەهۆی شایەتەوە کەچوار شایەت شاهیدیان لەسەردا کە زینای کردوە، حوکمی ڕەجم کردنی دەرچوو. ئەوە واباشە هەرکەس ئامادەی ئەو شوێنە بوو، بەژداری لەبەرد پێـدادانی بکـات. چونکە کاتی پەشیمان بونەوەی نیە، لەبەرئـەوە بـا زوو ڕۆحـی دەربچـێ، ئەمـەش لەبەرخاتری زیناکارەکە.

بەڵام ئەگەر ئەو کەسەی ڕەجم دەکرا هـیچ شـاهیدی لەسـەر نـەبوو، بـەڵکو خـۆی بەدەمی خۆی دانی نابوو بەوەدا کەزینای کردوە. ئەوا واباشە تەنها چـەند کەسـێك بەردی پێدا بکێشن و هەموو ئەوەی لەوێ یە بەژداری نەکات لەبەرد بارانکردنیدا، بۆچـی؟! لەبەرئـەوەی بـەڵکو لـەدان پێدانانەکـەی خـۆی پەشـیمان ببێتـەوەو زوو نەکوژرێ و ڕابکات و ژیانی بەردەوام بـێ! سـەرنج بـدەن چـۆن ئیسـلام لەهـەموو کاتێکدا ڕێزو مافی مرۆڤی پاراستوە!

وە واجبە کەهەموو عەورەتی پیاو کە لەنێوان نـاوك و ئەژنۆیـەتی – لای زۆربـەی زانایان (داپۆشرێ). وە ئافرەتیش هەموو لاشەی داپۆشـرێ، وە شـەتەك نـادرێ و قاچ و دەستی نابەسترێ. بۆئەوەی مـەجالی هـەڵاتنی هـەبێت و وە هـەتاوەکو ڕوح دەرچـونی لەسـەر ئاسـان بێـت بـەهۆی جـوڵانی دەسـت و قاچـیەوە وەئەوشـتەی کەڕەجمەکەی پێ دەکرێ و بەزیناکارەدا دەدرێ، بریتی یە لە: گڵۆگڵ – کەرسەك – لەتەخشت کەلەقوڕ دروست کراوە. وە ئەگەر بەرد بەکارهات. بـەردی پـڕ بەدەسـت بەکار دەهێنرێ، نەك هەر بـەوردە چـەو، چـونکە ئـەو کاتـە ئـازاردانی تـامردنی

زۆرکات دەکێشێ و زیاتر لە پێویست ئازاری پێ دەگات! وەنابێ تاوێرە بەرد، یان بەردێك کەبەدوو دەست هەڵگیرێ پێی دا بدرێ، چونکە بەزووتر لەماوەی دیاری کراوی خۆی دەیکوژێ! ڕەنگە کەسێ بپرسێ! باشە ئەگەر بەفیشەك بکوژرێ، یان إعدام بکرێ – هەڵبواسرێ – یان بەیەك بەردی گەورە سەری پان بکرێتەوە باشتر نیەو گونجاو تر نیە لەگەڵ مافی مرۆڤ دا و ئامانج و مەبەستەکەش کەلەناو بردنی زیناکارەکەیە هەر نایەتەدی؟!

**لە وەڵامدا دەڵێین:** شەرعی خوا هیچی بێ حیکمەت نیەو خوای گەورە خۆی زاناترە، بەڵام ئەوەی ئێمە ئێستا لێی تێ بگەین، لەبەر چوار هۆیە ئەم ڕەجمە بەم شێوەیە بەکاردێ.

١- بۆئەوەی مەجالی پەشیمان بونەوەو هەڵاتن و خۆرزگار کردن لەبەردەمی زیناکاردا هەبێ لەوکاتەدا کەبەدان پێدانانی خۆی حوکمی ڕەجمی بەسەردا سەپا.
خۆ ئەگەر بەلەسێدارەدان یان گوللە باران کردن یان سەرپانکردنەوە بوایە.
ئەو مەجالەی بۆ نەدەمایەوە. کەواتە ئەم ڕەجمی بەردە بەو شێوەیە لەبەرژەوەندی خۆیەتی.

٢- گوناهی زینا، گوناهێکی گەورەیە، شکاندنی ئەو سنورەی خوایە کەفەرموی: ئەی بەندەی خۆم، نەك هەر سنورەکە مەشکێنە بەڵکو هەر لێشی نزیك مەبەوە ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴾ الإسراء: ٣٢. دەی ئەم گوناهە گەورە بەم ڕەجم کردنە لادەچێ و ئەو مرۆڤە بەپاکی دەچێتەوە بارەگای خوا. کەوابوو دەبێ سزاکەش بەئازار بێ و هەندێ درێژە بکێشێ تارۆح دەرچون، بۆئەوەی ئەو ئازارەو ئەو شێوە مردنە ببێتە کەفارەتی تەواوی ئەو گوناهە گەورەیە.

٣- وەکو ڕونمان کردەوە ئەو کەسە ڕەجم دەکرێ کەخاوەن هاوسەر بێ. واتە کوڕ و کچ ڕەجم ناکرێن. جاکاتێ ژن زانی مێردەکەی خیانەتی هاوسەری لێ کردوە.

یـان پیـاو زانـی هاوسـەرەکەی، هاوژینەکـەی، دایکـی منالـّەکانی، ئەمینـداری مالّەکەی، ناپاکی هاوسەری بەرامبەر کردوە. بەدڵنیاییەوە دنیای لەبەرچاو تاریـك دەبیّ، ئەو برینەو ئەو داخ و خەفەتەی جەرگ و سینەی دەگریّ. تەنها بەوە ئـازاری دەشکیّ کەبزانیّ ئەو هاوسەرە ناپاکەی بەو شیّوە قورسە و ئاوا لەبەرچاوی خـەڵکاو بە بەرد باران کردن لەناوچوە. ئەینا بەلەسیّدارەدان وبەزیندانی کردن هیچ لـەئازاری دڵی کەم ناکاتەوە.

٤- وە ئەم سزادانە بەو جۆرە سامناکە بۆ ئەوەشـە کەببیّتـە پەنـدو ئامۆژگـاری و بەئاگاهیّنانـەوە بـۆ هەرکەسـیّ کـەرۆژێك لـەرۆژان بـیری بـەلای زینـاو خیانـەتی هاوسەریدا بچیّ. کەئەم دیمەنەی بینی، بەدڵنیاییەوە دەزانیّ چەند بـەئازارەو چـەند نارەحەتە و مردنیّکی چەند خراپە، ئیتر دەترسیّ و خۆی لیّ دەپاریّزیّ. بەڵام ئەگـەر بەلەسیّدارەدان یان گوللە باران کردن بیّ. ئەوا زۆر کـەس هەیـە بـیّ باکانـە پـەتی سیّدارە لەمل دەکات یان بەیەك دوو دەقیقە بەگولە خۆی لەناو دەبات.

کەواتە: تەنها ئەم ڕەجم کردنەیە کەببیّتە وانەیەکی بەئاگاهیّنەرەوە بۆ هەموو ئـەو کەسانەی ئەو ڤایرۆسە پیسە لەناخ و میّشکیاندایە و بەدوای خیانەتی هاوسەریدان **پاشان دێینە سەرئەوەی،** کیّ یەکەمجار ڕەجمەکە دەکات؟ سوننەت وایە کەپیّشەوای موسڵمانان ڕەجمەکە بکات و یەکەم بەردی پیّدا بدات، بۆئەوەی کەس و کاری ڕەجم کراوەکە بزانن ئەمە حکومەت جیّبەجیّی دەکات و ڕقـی تاکەکەسـی تیّـدانی یـە. پاشان خەڵکی بەرد بارانی دەکەن، ئەمە لەکاتیّکدا کەبەدان پیّدانی خـۆی حـوکمی ڕەجم کردنی بەسەردا چەسپا بیّ.

بەڵام ئەگەر شاهید هەبوو، ئەوا واسوننەتە کەیەکەم جار چـوار شـاهیدەکە بـەردی ڕەجمەکەی تیّ بگرن، پاشان پیّشەواو کاربەدەست.

دوای ئەوە ئەمجا خەڵکی بەرد بارانی دەکەن وەدەبێ ئەوە بۆ موسڵمانان ڕون بکرێتەوە کەبەهیچ شێوەیەك دروست نیە تف و لەعنەت بکرێت.

بەڵکو تەوبەو پەشیمانی لەبارەگای خوادا دەخرێتە بەرچاو. پێش دەست پێکردن بەڕەجم کردنی، پێی دەوترێ: مەئیوس مەبە لەڕەحمەتی خوا، بەدڵ پەشیمان بەوەو تەوبە بکەو خوای گەورە ڕەحم و لێخۆشبونی لەگوناهەکەی تۆ گەورەترە، یادی خوا بکە. فرمێسکی پەشیمانی هەڵوەرێنە، (إن شاءَ اللّٰه) بەم ڕەجم کردنە هەر لەدنیادا پێش قەبرو قیامەت لەپیسی و بۆگەنی ئەم زینایە پاك دەبیتەوە. هەروەك و ئیمامی (ماوەردی) ئەمەی فەرموە.وە ئەگەر کاتی نوێژ بوو، نوێژی فەرز، ئەوا داوای لێ دەکرێت کەدەست نوێژ بگرێ و نوێژەکەی بکات، وە ئەگەر ووتی: حەز دەکەم نوێژی سوننەت بکەم، ئەوا ڕێگای پێ دەدرێ کەدوو ڕکات نوێژی سوننەت بکات.

خۆ ئەگەر داوای ئاوی خواردنەوەی کرد، ئاوی خواردنەوەی پێ دەدرێ، بەڵام ئەگەر داوای خواردنی کرد نایدرێتێ. چونکە ئاو خواردنەوە بۆ تینویەتی پێشترە.

بەڵام نان خواردن بۆ خۆتێرکردنی لەمەو دوایە، کەپێویستی پێی نیە!!

(سُبْحَانَ اللّٰه) ئەم شەریعەتی ئیسلامە هەموو شتێکی چەند جوان و بەجێ یە.

ئەگەر ئافرەتێك زینای کردوو سکی پڕ بوو (حامیلە بوو)لەو زینایە. ئەوا کچ بێ یان ژن بێ داری حەددی لێ نادرێ وەڕەجم ناکرێ تائەوکاتەی کەمناڵەکەی لێ دەبێتەوەو دواتر ئەوەندە شیری دەداتێ، تافێری خواردن دەبێ، ئەمجا ئەگەر مناڵەکە پێویستی بەدایکی نەما بۆ شیر خواردن.

**حوکمە شەرعیەکەی** (داری حەدد بۆ کچ و ڕەجم بۆ ژنی بەمێرد) جێبەجێ دەکرێ وە لەوماوەیەدا ئەو ئافرەتە زیناکارە هیچ قسەیەکی ناخۆشی پێ ناوترێ لە لایەن

هیچ کەسێکەوەو خواردن و خواردنـەوەو دەرمـان و دوکتـۆرو جێگـای حەوانـەوەی پوخت و پێویستی بۆ دابین دەکرێت. ئایا ڕێزو کەرامەتی مرۆڤ لەمە زیـاتر دەبـێ چی بێ؟!

وە هەروەها نابێ یەکسەر قسەی زیناکارو دان پێدانانی بەوەی کەووتی زینام کردوە قبوڵ بکرێ. بەڵکو دەبێ بۆی ڕوون بکرێتەوە کـەزینا چـی یـە. لەپێشـەوا عـەلی کوڕی ئەبوطالبەوە دەگێرنەوەکە: جارێکیان ئافرەتێك دێت بۆلای و دەڵێ: من زینام کردوە.

**ئیمامی عەلی فەرموی:** لَعَلَّكِ أُتيتِ وَأَنْتِ نائِمَـــةٌ في فِراشِـــكِ. أَوْ أُكرِهْـــتِ؟!

واتە: ڕەنگە لەو کاتەدا کەئەو پیاوەی پەلاماری داوی و زینای لەگـەڵ کـردوی تـۆ لەناو جێگاکەی خۆتدا خەوتبی و ئاگات لەخۆت نـەبوبێ تالەگـەڵتا جـووت بـووە. یاخود زۆری لێکردبی و لەژێر فشارو زۆردا ناچار بوبی زینا بکـەی؟! بـەم شـێوەیە ئیمامی عەلی بەزەیی پێداهاتەوەو ڕێگای ڕزگار بونی نیشـاندا، کەواتـە ئیسـلام بەبەزەیی یە لەگەڵ زیناکارانیشدا. بەهەموو شێوەیەك ڕێگاو دەرگاکـان دادەخـات تاوەکو کەس زینا نەکات. وە ئەگەر کەسێکیش تووش بوو، دەرگای خێـری لەسـەر دەکاتەوەو دەیەوێ پاکی بکاتەوەو دڵڕەقی و ڕق و قینی بەسەردا نارێژێ.

ئافرەتەکە لە وەڵامی ئیمامی عەلی دا ووتی: (أَتَيتُ طائِعَةً غَير مكرهَةٍ).

واتە: بەڕەزامەندی خۆم بوەو کەس زۆری لێ نەکردووم.

**ئیمامی عەلی ئەمجارە فەرموی:** (لَعَلَّكَ غَصبتِ عَلى نَفْسكِ) لەوانەیە ڕقت لەخۆت هەڵسابێ و بتەوێ بەم شێوازە خۆت لەناو ببەی؟! ژنەکە ووتـی: نـەخێر مـن هـیچ لەخۆم بێزار نیم و لەژیانی خۆم تورە نیم. بەڵکو زینـام کـردوە! پاشـان دەرکـەوت حامیلەیەو ئیمامی عـەلی لێـی گـەڕا هـەتا منالەکـەی لێ بـۆوەو پاشـان منـاڵ

بەتەواوی گەورە بوو. ئەمجا داری حەددی لەئافرەتەکەدا. چونکە ئەو ئافرەتە کەزینای کردبوو کچ بوو. وەپێشتر ژیانی هاوسەری پێك نەهێنابوو.

**زینای کەسێك کەناچاربێ بۆ ئەو کارە قێزەونە:** ئەگەر کەسێك بۆ پاراستنی ژیانی خۆی زینا بکات، وەئەگەر ئەو زینایەی نەکردایە بەبێ گومان ژیانی دەکەوتە مردنەوە گیانی لەدەست دەدا، ئەوا لەم حاڵەتەدا حەددی شەرعی لەسەر لادەچێت لەسەر ڕەئی ئیمامی عەلی. هەروەکو ئەم باسە بەم شێوەیە هاتوە: (أَنَّ إمْرَأَة أَتَت عُمَر فَقالَت: إِنِّي زَنَيْتُ فَارْجمْني).

واتە: ژنێك هاتە لای حەزرەتی عومەر و ووتی: من بەڕاستی زینام کردوەو تکا دەکەم بەشەرعی خوا ڕەجم بکە.

**کەواتە:** لەئیسلامدا ئەوە چەسپاوە. کەئافرەتیش مرۆڤەو وەکو هەرمرۆڤێك تووشی هەڵە دەبێت و بۆ ڕزگار بون لەتاوانەکەی دەچێتە لای گەورەی هەموو ئیمانداران و بەئازادی و بێ ترس و شەرم باسی بارودۆخی خۆی دەکات. وە خەلیفەش زۆربەجوانی گوێی لێدەگرێ و ڕێنمایی دەکات، کە لەهیچ وولاتێکی پێشکەوتووی ئەمرۆدا. ئافرەتێك بەو تاوانە گەورەوە کە زینایە ناتوانێ ئاوا ڕاشکاوانە بچێتە لای سەرۆکی دەوڵەت.

حەزرەتی عومەر چەندجار ئەم ئیقرارەی ڕەت دەکردەوە هەتا ئەوکاتەی چوار شاهید شاهیدیان دا کەئەم ژنە زینای کردوە. ئەمجا حەزرەتی عومەر بڕیاری دەرکرد بەڕەجم کردنی ئافرەتەکە!

ئیمامی عەلی فەرموی: ئەی ئەمیری ئیمانداران دووبارە پرسیاری لێ بکەرەوە لەبارەی هۆکاری زیناکردنەوەکەیەوە.

بەڵکو عوزرو بەهانەیەکی ڕەوای هەبێ!.

حەزرەتی عومەر ژنەکەی گێڕایەوەو ووتی: بۆچی تووشی ئەم گوناهە گەورەیە بویت کەزینایە؟! ژنەکە ووتی: خێزانەکەمان لەماڵەوە حوشترمان بەخێودەکرد.

ڕۆژێکیان بۆ گرتنەوەو هێنانەوەی حوشترەکە بۆ ماڵەوە چومە دەرەوە، وەماڵی ئێمە شەریکێمان هەبوو، حوشترەکانمان تێکەڵ کردبوو، ڕۆژێکیان بۆ کاروبارو لەوەڕاندنی حوشترەکەی چووە دەشت و دەر، منیش (ئافرەتەکە) لەوکاتەدا لەدەشت بووم. هەندێ ئاوی پاکم لابوو.

بەڵام حوشترەکەمان شیری تێدانەبوو. وە شەریکەکەشمان ئاوی خواردنەوەی لابوو، وەحوشترەکانیش شیریان تێدابوو، ئەوە بوو هەردوکمان لەو دەشت و شاخ و دۆڵەدا خەریکی مەڕو ماڵات و حوشترەکانمان دەلەوەڕاند.

تائەوە بوو من هیچ ئاوم لانەما، تینویەتی زۆری بۆ هێنام و داوای ئاوی خواردنەوەم لێ کردو لێی پاڕامەوە کەهەندێ ئاوم بداتێ، بەڵام نەیکرد. خەریك بوو کوێر بم لەتینوان کەچی قومێ ئاوی نەدامێ. کەزۆر لێی پاڕامەوە چەند قومێ ئاوم بداتێ.

ئەمجا ووتی: بەو مەرجە ئاوت دەدەمێ کە خۆتم بدەیتە دەست و لەگەڵتا جووت ببم!! منیش بەتوندی بەگژیدا چومەوە، بەڵام پاش ماوەیەکی تر تینویەتی توانای لێ بڕیم و بۆ ڕزگار کردنی ڕۆحم لەمردن خۆم تەسلیم کردوو زینای لەگەڵ کردم و ئاوی دامێ!! ئەوە بەسەرهاتی زینا کردنەکەم بوو.

**ئیمامی عەلی فەرمووی:** اللّٰه أكبر، پاشان، ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۚ﴾ البقرة: ١٧٣.

بەڕاستی ئەم ئافرەتە عوزری هەبوە، وە ناچاریەکی تەواو وای لێ کردوە زینا بکات، لەبەرئەوە حوکمی شەرعی بەسەردا جێبەجێ ناکرێت.

**لەریوایەتێکدا دەڵێ:** حەزرەتی عومەر هەندێ پارەشی دایەو وازی لێ هێناو ئافرەتەکە رۆیشت کەواتە: پێویستە بەتەواوەتی لەحاڵ و بارودۆخی کەسی زیناکار ئاگاداری پەیدا بکرێ، ئەمجا حوکمی لەسەر بدرێ.

**٧- لەقەبرو ناو دۆزەخدا حاڵی زیناکار چۆنە؟** پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەیانیەکیان دوای نوێژی بەیانی فەرموی: ئەم شەو دوو پیاو هاتن و دەستیان گرتم و هەندێ دیمەنیان نیشاندام.

**یەکێ لەوانە: ((فانْطَلَقْنا إلى ثُقْبٍ مِثْلِ التَّنُورِ، أَعْلاهُ ضَيِّقٌ وَأَسْفَلُهُ واسِعٌ. يَتَوَقَّدُ تَحْتَهُ ناراً، فَإذا ارتَفَعَت ارْتَفَعُوا حَتّى كادُوا أَنْ يَخْرُجُوا، وَإذا أُخْمِدَتْ رَجَعُوا فيها وَفيها رِجالٌ وَنِساءٌ عُراة).** رَواهُ البُخارِيُّ.

واتە: پاشان رۆیشتین بۆلای کونێك کەوەکو تەنوری نان کردن وابوو، سەرەوەی تەسك و ژێرەوەی فراوان بوو. ئاگر بڵێسەی دەدا لەژێریدا، کاتێ کەبڵێسەکەی بەرز دەبۆوە. ئەوەی لەناویدا بوو بەرز دەبونەوە هەتا نزیك بوو کەلەتەنورەکە بێنە دەرەوە. وەکاتێ بڵێسەکەی دادەمرکایەوە ئەوانەی تێی دابون دەچونەوە ناوەوە. لەناو ئەو کونەدا کەوەکو تەنور وابوو پیاو و ژنی رووتی تێدابوون

**٨-** زیناکار کەسێکە لەناوەوە روخاوەو لەژیان بێزارەو حەزناکات کەس وەکو خۆی دەرچێ. لەیەکێ لەگۆڤارەکاندا خوێندمەوە کەژنێك لەسەر داوێن پیسی لەزینداندا بوو کاتێ چاوپێکەوتنی لەگەڵ کرابوو. وتبوی: خۆشترین رۆژی ژیانم ئەو کاتەیە کەدەمرم و لەم هەموو مەینەتی یەی کەبەهۆی داوێن پیسی یەوە تووشم بوو رزگارم دەبێت!!.

یەکێکی تر لەو ئافرەتە زیناکارانەی کە لەبەندیخانـەدا بـوو. وەمنـاڵێکی هـەبوو. ووتبوی: تەنها یەك داواکاریم هەیە لەژیانـدا ئـەویش ئەوەیـە: توخـوا بامناڵەکـەم وەکو خۆمی لێ نەیەت، توخوا ئەو کچە یەك ساڵەم بدەنە بەژن و پیاوێکی مەردی بەڕەوشتی داوێن پاك. باوەکو خۆم داوێن پیس و بەد بەخت دەرنەچێت.

بەڵێ زینا کردن سەرەتاکەی وەکو هەنگوینە.

بەڵام کۆتاییەکەی ژەهرەو مرۆڤ بەدبەخت و چارە ڕەشی دونیاو دوارۆژ دەکات.

**کەواتە:** جارێکی تر دووبارەی دەکەمەوە. کە ئیسلام مرۆڤی هـان داوە بـۆ داوێـن پاکی و خۆ دوورگرتن ( وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ) لە زینا. پێشێل کردنی مافی ئازادی نیە. بەڵکو گێڕانەوەی ئازادیە بۆ مرۆڤ و داوێن پاکی گەورەترین لەمپـەرە لەبەرامبـەر لەدەست دانی ئازادی و سەربەستی و کەرامەتی مرۆڤ دا.

بەپشتیوانی خوای گەورە لە وتاری داهاتودا ئەم باسە تەواو دەکەین.

﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾

ٱللَّهُمَّ ءَامِين

# سەرچاوەکان

١- قورئانی پیرۆز
٢- كَبائِرُ الذُّنُوب ، يوسف الحاج أحمد ، ص١٦٦ ، ص,١٧٦
٣- صَحيح وَصنايا الرَّسُول (ﷺ) ، سَعْد يوسف أَبُوعَزيز ، ج٣ ، ص,٥٩
٤- الفِقْهُ المَنْهَجى عَلى مَذهَب الأمام الشافِعي ، (د. مصطفى الخِن ، د. مصطفى البغا عَلي الشربجى) ج٣ ، ص,٤٢٥
٥- أَسْمَى المَطالِب في سيَرة أَمير المُؤمينين عَلي بن أَبي طالب ، د. على محمد محمد الصَّلابي ص,٣٧٨
٦- مُغني المُحْتاج في شرح المِنْهاج ، خَطيب الشربينى ج٤ ، ص,١٤٥
٧- المغْني ، إبنُ قُدامَة ، ج٨ ، ص١٨٧.

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيِّدنا مُحَمّدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجمعين.

**بەڕێزان:** لەگەڵ ئەوهەموو بەلا دینی و دونیایی و قیامەتیانەی کەباسمان کرد، کەزیناکار توشی دەبێت، وە هەموو نەفسێکی پاك نەفرەتی لێ دەکات، ئەی بۆچی زینا دەکرێ و بڵاودەبێتەوە؟!

**١- کارنەکردن بەحوکمی شەرعی ئیسلام:**

لەشەرعدا زیناکاری ژن وپیاو سجن ناکرێ، ناخرێتە گرتوخانەوە، بەڵکو ئەگەر لەسەری چەسپا کەزینای کردوە، وەکو شاهیدی دانی چوار شاهید، یان دان پێدانی (إقرار) ی خۆی، یان بەڵگەی حامیلە بون ومناڵ بون بەبێ هاوسەر، ئەوا ئەگەر ژیانی هاوسەریان پێك هێنابوو. بەرد باران دەکرێن ودەکوژرێن ودەبنە پەند ووانە بۆ هەموو کەسێکی خراپەکار.

بەڵام ئەگەر زیناکارەکان کوڕ وکچ بوون، ئەوا ناکوژرێن وداری حەددیان لێ دەدرێت وئەم بابەتە کۆتایی دێت وئیتر بۆ کەس نیە بڵێ فلان و وفلان زینایان کردوە.

بەڵام لە یاسای مرۆڤدا، دەگیرێ و بەیاسا دەخرێتە زیندانەوە بۆماوەیەك وپاشان دوای تەواوبونی ماوەکەی بەردەدرێ ولەکۆمەڵگەی موسڵماندا زۆرجار فیتنەی لێ پەیدا دەبێت وکوشتن دێتە گۆڕێ وخۆ ئەگەر هیچیشان بۆ نەبوو، ئەوا خراپەکار وداوێن پیسان چاویان لێ دەکەن ودەڵێن هەرماوەیەك گرتنە وپاشان ئازاد دەبین وئەم کارە دورلەدین وژینە لەجیاتی بنەبڕکردن ڕەواجی بۆ پەیدا دەکرێ.

**٢- خۆسوك کردنی کچ یان ژن بەرامبەر بەپیاو:**

خوای گەورە کەباسی زیناکاران دەکات دەفەرموێ: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي ﴾ لەپێشدا باسی ژنی زیناکاری کردوە، چونکە ئەگەر ژن خۆی بەدەستەوە نەدات، هەرگیز پیاو

ناتوانێ پڕبەچاو سەیری بکـات. بـەڵام لـەدزی دا دەفـەرموێ:﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ ﴾ المائدة: ٣٨ پیاوەکەی پێش خست. چونکە ئەوەی پیاو جورئـەتی هەیـە بـۆ دزی بەگشتی ژن نیەتی. بەڵام لەزینادا ئەگەر ژن خۆی نـەدات بەدەستەوە و ڕێگـا بـۆ پیاو خۆش نەکات ئەوا پیاو ناتوانێ بەئاسانی دەستی بیگاتێ.

**زانایان فەرمویانـە:** سـوێند بـەخوا ئەگـەر (دە) پیـاو هەڵبکوتنـە سـەرئافرەتێك وبیانەوێ زینای لەگەڵ بکەن. وە ژنەکە خۆی نەیەوێ ئەوکارە بکات، ئەوا هـەرگیز ناتوانن ئەوکارە بکەن.

وە خوای گەورە ڕێگای ڕزگاربون بۆ ئەو ژنە داوێن پاکە ئاسان دەکات، بەڵام ئەگەر یەك ژن لەناو (دە) پیاودا بێت، وە داوای زینایـان لێ بکـات، ئـەوا بەدڵنیاییـەوە دەکەونە ئەو داوێن پیسـی یـەوە مەگـەر کەسـێك خـوای گـەورە بـەڕەحمی خـۆی بیپارێزێت.

**کەواتە خوشکی بەڕێز:** تۆ خۆت ڕوت مەکەرەوە بۆچاوی برسی خراپەکار وهـەموو لەشتی بۆ دەرمەخە، تۆ خۆت داپۆشە بزانە گورگ ئەتوانێ پەلامارت بدات!!

وەهەروەها عەترو بۆن لەخۆت مـەدە — ئـەو عـەترو بۆنانـەی کـە بۆنەکـەیان زۆر دەڕوات و لەدوری چـەند مـەترەوە مرۆڤـ هەسـت بەبۆنەکـەیان دەکـات — کـاتێ دەچیتە بازاڕ و ناو ئۆتۆمبێـل بـۆ ئـەوەی دەرون پـیس ودڵ نەخۆشـەکان ئـارەزوی پیسیان بەرامبەرت نەوروژێ.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((**أَيُّما إِمْرَأَةٍ إِسْتَعْطَرَت فَمَرَّت عَلـى قَـوْمٍ لِيَجِدوُا مِنْ رِيحِها فَهِيَ زانِيَةٌ**)) صَحيحُ الجامِع (٢٦٩٨).

**واتە:** هەر ئافرەتێك بۆنی عەتر (عەرتی بۆن تیـژ) لـەخۆی بـدات وپاشـان بـڕوات بەلای کۆمەڵە کەسێکدا بۆئەوەی بەبۆنە عەترەکەی سەرنجیان ڕابکێشـێ و ئەوبۆنـە خۆشە سەرسامیان بکات ئەوە ئەوژنە زیناکارە، واتە: سەرەتایەکە بـۆ تـوش بـونی

بەزینا لەڕێگەی تێکەڵ بونی پیاوانی دڵ نەخۆش، کەبەوتۆزە بۆنە وائەزانێ ئەم ژنە حەزی لێ دەکات وداوای زینای پێ دەکات.

**ئەی خوشکی بەڕێز:** ئەگەر ئیشی پێویستت نەبوو، مەچۆ بۆناو بازاڕ وبەردەرگا وهەموو ماڵ وشوێن وجێگایەك خۆت قورس ڕاگرە، چونکە ئاڵتون کەبەنرخە ناخرێتە بەردەست هەموو کەس ولە شوێنی پارێزراودا نەبێ هەڵناگیرێ ولەهەموو شوێنێك دانانرێ، دەی خوشکەکەم تۆ لەئاڵتون زۆر زۆر بەنرختری وخۆت هەرزان فرۆش مەکە.

**ئەی خوشکی بەڕێز:** لەکاتی قسەکردندا دەنگت ناسك مەکەوە وبەمەکر وناز وڕوانینی سەرنج ڕاکێش لەگەڵ پیاواندا مەدوێ، وەزۆر بەدەم پیاوەوە پێ مەکەنە، چونکە پیاوی داوێن پیس واهەست دەکات کەتۆ حەزت لێ یەتی.

**یەکێ لەپیاوانی زیناکار** وتویەتی: ئەگەر هەموو ژنی دونیا هەیە ژنی من بێ. تەنها یەك ژنم لێ قەدەغە بکرێ، ئەوا تەماح وئارەزوم دەچێتەوە سەرئەویش!

**ئەی خوشکی خاوەن حورمەت:** هەرکات کەسێکی نەناسراو تەلەفۆنی بۆکردی وزانیت هیچ ئیش وکارێکی بەتۆ نیە، ئەوا یەکسەر تەلەفۆنەکە دابخەرەوە وئاگاداربە خۆتی پێ مەناسێنە.

**٣- یەکێکی تر لەهۆکاری بڵاوبونەوەی زینا ئەوەیە:**

نەمانی غیرەت لای پیاوان. بەداخەوە باوك بێ یان برا بێ یان مێردە، کچەکەی لەبەرچاوی خۆی ڕوت وبێ بەرگ دەڕواتە دەرەوە، یان مێرد هەبوە ژنەکەی بەزۆر بردوە بۆ حەفلە وهۆڵی شایی و ڕەشبەڵەك وحەرام وتن وحەرام کردن.

ئەمە مانای ئەوەنیە کەسانێك واتی بگەن ئیسلام هانی پیاو دەدات کەدڵ پیسی بەرامبەر کچەکەی یان خوشکەکەی یان هاوسەرەکەی پەیدا بکات، نەخێر ئەوە لەئیسلامدا نی یە. ئیسلام فەرمان بەپیاو دەکات کەجلی جوان وتازە بۆ ژنەکەی خۆی بکات. لەگەڵ خۆی سەفەر وگەشتی پێ بکات. بەڵام هەموو جلێ وبەرگێ نەو، نەهەموو جێگایەکیش، بەڵام غیرەت وپیاوەتی لەدەست نەدات.

**دەگێڕنەوە:** کابرایەك لەگەڵ ژنەکەی لەسەر مارەیی کێشەیان هەبوو. حاکم ووتی: دەبێ شاهیدی عەقدی زەواجەکە ئەم ژنە باش ببینێ وتەماشای بکات. تابزانێ ڕاستە ئەمە ژنیەتی ومارەیی لەسەر مێردەکەیەتی!

مێردی ژنەکە ووتی: دەی من هەموو مارەییەکەی (بەکاش) دەدەمێ وناهێڵم پیاوی بێگانە سەیری ژنەکەم بکات.

بەداخەوە زۆرجار ووتمان باوك هەیە کە فِعْلاً باوك نیە، بەڵکو بەخێوکەرە. هەردەزانێ پارە بۆماڵ ومناڵەکەی پەیدا بکات. بەڵام بەخوای گەورە باوك و بەخێوکەر، تەنها پیتی (ب) هاوبەشە لەنێوانیاندا. وەهیچ گرنگی بەڕەوشت ئەخلاقی کوڕ وکچ وهاوسەرەکەی نادات.

**٤- گرنگی نەدانی پیاوو ژن بەلایەنی سێکسی یەکتر وتێرنەکردنی:**

ژنی واهەیە سەرجێگایی لەگەڵ مێردەکەی ناکات. نازی ناداتێ، مێردەکەشی ئیمانی پتەونی یە. ئافرەتی بەرەڵڵاڕوی دەداتێ وئامێزی بۆ دەکاتەوە و توشی زینا دەبێت.

هەر بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: **((إذا دَعا الرَّجُلُ إِمْرَأَتَهُ إِلى فِراشِهِ، فَأَبَت أَنْ تجيئ، لَعَنَتْها المَلائِكَة حَتَّى تُصبِحَ)) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.**

واتە: هەرکاتێ پیاو بانگی ژنەکەی کرد بۆسەر جێگای خەوتن وکاری سەرجێ یی، بەڵام ژنەکە – بەبێ هیچ عوزرێك کەلەئافرەتدا ڕودەدات – وەڵامی نەدایەوە ولەگەڵیا نەخەوت، ئەوە فریشتەکان نەفرەتی لێ دەکەن هەتا بەیانی.

وە لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: **((وَالَّذي نَفْسي بِيَدِهِ، ما مِنْ رَجُلٍ يَدْعُوا إِمْرَأَتَهُ إِلى فِراشِهِ، فَتَأْبى عَلَيْهِ إِلاّ كانَ الَّذي في السَّماءِ ساخِطاً عَلَيْها)) رَواهُ مُسْلِم.**

واتە: سوێند بەوکەسەی کەنەفسی منی بەدەستە. هەرپیاوێك بانگی ژنەکەی بکات وداوای کاری سەرجێ یی لێ بکات. بەڵام ژنەکە وەڵامی نەداتەوە، ئەوا ئەوەی لەئاسمانە کە (الله) یە لەو ژنە توڕەیە.

وه جاری واش هەیه، پیاوەکە گوێ بەژنەکەی نادات وناچێتە لای، جا بەهۆی دورکەوتنەوەوە بێ لەخێزانی بەهۆی کارو کەسابەتەوە، یان خۆتەرخان کردن بۆ عیبادەتەوە، ئەوە ئیسلام لێ ی قبوڵ ناکات. ئیسلام بە پێویستی داناوە کە لەچوار شەودا پیاو شەوێك بچێتە لای خێزانی - لەحاڵەتی پاکی دا.

لەشەرعدا یەکێ لەو هۆیانەی کەدەبنە هۆی جیابونەوەی ژن ومێرد لەیەکتری ئەوەیە: یەکیان توانای جیماعی نەبێ، بەداخەوە چەند ژن هەیە هەر بەناو مێردی هەیە، کابرا ژنی دووەمی هێناوە. ئیتر لەوکاتەوە نزیکی ژنی یەکەمی نەبۆتەوە. کە ئەگەر شەریعەتی ئیسلامی حاکم بێت دەبێت ئەوپیاوە تەمێ بکرێت و وای لێ بکرێت بەبێ جیاوازی لەگەڵ ژنەکانی دابێت.

شەوێکیان حەزرەتی عومەر دەگەڕا بەناو شاری مەدینەدا بۆ ئاگاداربون لەحاڵ وگوزەرانی هاولاتیان لەکۆلانێکا کە پەنجەرەی ماڵێکی لەسەربوو. گوێ ی لەژنێك بوو کە بەشیعر باسی بێتاقەتی خۆی دەکرد لەدوری هاوسەرەکەی وخۆزگەی دەخواست کەمێردەکەی لەلای بوایە وبەیەکەوە جووت ببونایە.

**هەتا لەئاخری شعرەکەدا ووتی:**

فَوَاللهِ لَوْلا اللهُ لاشَيئَ غَيْرَهُ – لَحَرَّكَ مِنْ هذا السريرِ جَوانِبَهُ

**واتە:** سوێند بەخوا ئەگەر لەبەرخوای گەورە نەبوایە کەچاودێرە بەسەرمەوە وئەمبینێ وزینا وداوێن پیسی قەدەغە کردوە، ئەوا حیسابم بۆ هیچ شتێکی تر نەدەکرد وئێستا کەسێك لەگەڵم لەم سەرجێگای خەوتنە دەبوو خەلیفە عومەر ماڵی ئەو ئافرەتەی نیشان کردو بۆ بەیانی کەپرسی ئەوە ماڵی کێ یە، بۆی دەرکەوت کەئەوە ماڵی کەسێکی لاوە وتازە ژنی هێناوە وئێستا لەبەرەکانی جیهادە.

خەلیفە عومەر چوو بۆلای حەفصەی کچی ولێ ی پرسی: ئایا ژن تا ماوەی چەند دەتوانێ لەدوری هاوسەرەکەی ئارام بگرێ؟! حەفصەش بەشەرمێکەوە فەرموی: پێنج تاشەش مانگ. ئیتر حەزرەتی عومەر بڕیاری دەرکرد کەهیچ سەربازێك نابێت زیاتر لەچوار مانگ لەجیهاددا بمێنێتەوە دەبێ بێتەوە لای خێزانی وپشوو بدات وماوەیەك بمێنێتەوە وپاشان بڕواتەوە.

**لەڕوداوێکی تری مێژوی ئیسلامدا،** ژنێك دێتە خزمەت حەزرەتی عومەری کوڕی خَطّاب شکاتی لەمێردەکەی هەیە. بەڵێ ئیسلام ژنی سەرکۆنە نەکردوە، بەڵکو لەسایەی ئیسلامدا ژن ئەوەندە ئازادە، لەلای خەلیفە وئەو هەموو هاوەڵەی پێغەمبەر (ﷺ). داوای مافی ڕەوای خۆی دەکات، ئایا داواکاریەکەی چی یە؟! داوای مافی شەرعی خۆی لەکەسێك دەکات!! ئایا هیچ بەرنامەیەك لەسەدەی بیست ویەکدا ئەو ئازادیەی داوە بەئافرەت؟! نەخێر.

کاتێ ئافرەتەکە دەڵێ من شکاتم لەمێردەکەم هەیە، خەلیفە عومەر دەفەرموێت لەبارەی چی یەوە؟! ژنەکە ووتی: مێردەکەم هەرخەریکی شەونوێژ و ڕۆژوی سوننەتە. حەزرەتی عومەر فەرموی: دەی خۆ باشترین شت دەکات. چی لەخواپەرستی باشترە؟! ژنەکە چەند جار دەڕۆیشت و دوای ماوەیەك دەهاتەوە وەهەمان گفتوگۆ لەگەڵ حەزرەتی عومەر دوبارە دەبۆوە.

هەتا ئەوەبوو (کەعبی ئەسەدی) ووتی قوربان ئەمجارەیان من لێی دەپرسم بزانم شکاتەکەی لەمێردەکەی باشتر ڕون ناکاتەوە! ئەوەبوو کەلێ ی پرسی، ژنەکە ووتی:

نَهارُهُ وَلَيْلُهُ مايرقُدُهُ – فَلَسْتُ في أَمْرِ النِّساءِ أَحْمَدُهُ.

واتە: ڕۆژووشەو ناخەوێ، بەڕاستی من کەژنی ئەوم لەکاروباری ژناندا سوپاسی ناکەم ولێ ی ڕازی نیم!! ئای لەو دەربڕینە جوانە، پڕ شەرم وحەیایە، وە ئاوا بەشیعرو هۆنراوە داوای مافی خۆی دەکات، کە ئەمڕۆ کەم پارێزەر هەیە ئاوا داکۆکی لەحەقێك بۆ بکرێ.

**کەعبی ئەسەدی ووتی:** قوربان ئەی خەلیفەی موسڵمانان ئەم ژنە داوای کاری سەرجێ ی لەمێردەکەی دەکات! حەزرەتی عومەر فەرموی: دەی چۆن لەداواکەی گەیشتی، ئاواش مافی بۆ بگێڕەوە. کەعب بەژنەکەی ووت: لەمەودوا دەبێ لەهەر چوار شەو جارێکدا پیاوەکەت شەوێکیان تابەیانی خۆی بۆتۆ تەرخان بکات و لەگەڵت بخەوێ وشەونوێژ نەکات، مەگەر پێش نوێژی بەیانی بەماوەیەکی زۆرکەم

نەبێت، وە ڕۆژەکەش نابێ بەڕۆژوو بێ ودەبێ لەگەڵتا نان بخوا و پێبکەنێ وسەفەرت لەگەڵ بکات وقسەی خۆشت بۆ بکات!

حەزرەتی عومەر فەرموی: باشە بەچ بەڵگەیەك لەماوەی چوار شەودا شەوێکت دایە؟ کەعب فەرموی: چونکە لەشەرعدا پیاو بۆی هەیە چوار ژنی هەبێ — بەمەرجێك مەرجە شەرعیەکان بێنەجێ — جاوا دادەنێین کەئەم پیاوە چوار ژنی هەیە. ئەم ژنە تەنها یەك شەوی خۆی لەگەڵ ڕۆژەکەیدا بەردەکەوێت. سێ شەوەکەی تر مافی ژنەکانی ترە وئەم پیاوەش ژنی تری نیە. ئەو سێ شەوە بۆخۆی دەگەڕێتەوە و مافی ئەوەی هەیە تابەیانی شەونوێژ بکات و بە ڕۆژیش بەڕۆژوو بێت. ئەمەش بەومەرجەی کەئەو هەموو عیبادەتە سوننەتە کاریگەری خراپی لەسەر دروست نەکات وەکو بێ هێزبون بۆ شەوی لای خێزانەکەی ئەگەر کاریگەری دروست کرد لەوەش لێ ی کەم دەکرێتەوە!!

حەزرەتی عومەر فەرموی: ئەی کەعب بەڕاستی نازانم کامیان لەو دووکارە گەورەت زیاتر بەگەورە تەماشاکەم وپێ ی سەرسام بم، تێگەیشتننت لەداواکاری ئەوئافرەتە کەئاوا بەداپۆشراوی داواکەی دەوت. یان لەوحوکمە جوانەی کەبەپێ ی شەرعی خوا مافی خۆیت پێ بەخشی.

**کەواتە:** دورکەوتنەوەی یەکێ لەهاوسەران (ژن یان مێرد) لەبەرامبەرەکەی، بەهەر هۆیەك بێت هۆکارێکە بۆ توش بون بەبەلاان، هەر چەندە ئەمە هەموو ئافرەتێك ناگرێتەوە. بەڵام ئافرەتیش هەیە یان پیاویش هەیە، کەبەبێ هاوسەرەکەی ئارام ناگرێ وشەرع مافی پێ دەدات و بەهەرچۆنێك بێت هاوسەرەکەی بۆلای دەگێڕێتەوە.

٥- هەندێ جار بەهۆی ئەوەی کەئەو ژن وپیاوە بەخۆشەویستی خۆیان بەیەك نەگەیشتون بەڵکو بەزۆر ئەوژنەی دراوەتێ، یان لە صولح ولەجیاتی خوێن دراویەتیە، هەربۆیە هەمووکات بەدوژمنی خۆی زانیوە ولەهەوڵی تێرکردنی ئارەزوەکانی دابوە بەڕێگەی ناشەرعی. وەکو کەسێك بێز لەخواردنێك بکاتەوە وبەدوای خواردنێکا عەودالْ بێ کەبەدڵی خۆیەتی.

جا بابزانین ئاینی ئیسلام چۆن ئەمەی چارەسەر کردوە؟

**لەشەرعدا دەفەرموێ:** ئەگەر کوڕێکی موسڵمانی کاسبی ڕەوشت بەرز سێ جار چوە خوازبێنی کچێکی دینداری بەڕەوشتی ڕێکوپێك. باوکی کچەکە وتی: نایدەم بەوکوڕە. ئەوە شەرعەن لەسەرپەرشتیاری (ویلایەت) دەکەوێت!!

بەڵام ئەگەر کوڕەکە کەسێکی دوورلەدین بوو، سەر سەری بوو، عەرەق خۆرو قومار چی بوو، کچەکەش تەجروبەی نەبوو، باوکەکە دەیزانی هەرئەوەندە ئەم کچەی دەوێ تاخۆی پێ تێردەکات، دوایی بەڕەڵای دەکات، بۆی هەیە بڵێ: کچی خۆمت نادەمێ، ئەمە لەبەر بەرژەوەندی دوارۆژی کچەکەیە.

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:** **((إذا أتاكُم مَنْ تَرْضَوْنَ خُلُقَهُ وَدينَهُ، فزَوِّجُوهُ إن لاتَفْعَلوُا تَكُنْ فِتْنَةٌ في الأَرْضِ وَفَسادٌ عَريض))** حَدْيثٌ حَسَن رَواهُ الترمذي وَإبْنُ ماجَة وَحَسَّنَهُ الأَلْباني في السلسلة الصَّحيحَة (١٠٢٢).

**واتە: ئەگەر کەسێك هات بۆلاتان وخوازبێنی کچتانی کرد، تەماشا بکەن ئەگەر** لەڕەوشت ودینی ڕازی بون، کچی بدەنێ، جا ئەگەر واتان نەکرد (واتە کوڕەکە ڕەوشت بەرز ودیندار وخواناس بوو، وەکچەکەتان حەزی دەکرد شوی پێ بکات، بەڵام بونە بەردەم ڕێگری هاوسەرگیریان) ئەوا فیتنە وخراپە لەسەر زەوی بڵاودەبێتەوە. — سەرەنجام کچەکە دەدرێ بەکەسێك کەدڵی پێ ی ناکرێتەوە و لە ئەنجامدا ناپاکی هاوسەری ڕودەدات وخێزانێکی هەڵوەشاوە دروست دەبێت.

- کچێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی ئەوەی بۆ پێغەمبەرکرد کە: ((أَنَّ أَباها زَوَّجَها وَهِيَ كارِهَةٌ، فَخَيَّرَها النَبِيُّ (ﷺ)). **کچەکە وتی:** باوکم بەشوی داوم وداومی بەکوڕێك، بەڵام من حەزناکەم شوو بەوکوڕە بکەم ودڵم پێوەی نیە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: تۆ خۆت سەرپشکی لەوەدا لەگەڵ ئەوکوڕەدا زەماوەند بکەی یان شوی پێ نەکەی ومارەکردنەکەی باوکت ناتوانێ تۆ مل کەچ بەڕازی بونی نابەدڵ بکات.

- (عَنْ خَنْساء بِنْتِ خَدَّام الأَنْصارِيَّة – أَنَّ أَباها زَوَّجَها وَهِيَ ثَيِّبُ، فَكَرِهَت ذالِكَ، فَأَتَتْ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَرَدَّ نكاحَهُ).

واته: خەنسای کچی خەددام ی ئەنصاری، ئافرەتێکی بێوەژن بوو. باوکی بەشوی داو دای بەپیاوێك کەئەم ئافرەتە خۆی حەزی بەژیانی هاوسەری لەگەڵ ئەوپیاوە نەدەکرد بۆیە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا وباسەکەی کردەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) نیکاح ومارەکردنەکەی ڕەت کردەوە.

**خاڵێکی زۆرپێویست هەیە کەدەبێ باسی بکەین ئەویش ئەوەیە:**

لەشەرعدا وەکو ڕێز وحورمەتێك بۆکچ لەکاتی مارەکردندا پێویستە (وەلی ئەمر) کەباوك پاشان باپیر، وەبرای دایك وباوکی وبرای باوکی...هتد. ئامادەبێ وکچەکە مارە بکات لەکوڕەکە. بەلاّم ئایا ئەو وەلی ئەمرە بۆی هەیە بەزۆر ئەم کچە مارە بکات لەکەسێك؟! باگوێ لەشەریعەتی ئیسلام بگرین:

شَيْخُ الإِسْلام اِبنُ تِميَّة له (مجموع الفَتاوى) ج٢٣، ص٥٢دا ، دەفەرموێ: (وَإِذا رَضِيَتْ رَجُلاً، وَكانَ كَفُؤاً لها. وَجَبَ عَلى وَلِّيها كَالأَخِ ثُمَّ العَمِّ – أَنْ يُزَوَّجَها بِهِ، فَإِنْ عَضَلَها أَوْ إِمْتَنَعَ عَنْ تَزْوِيجِها، زَوَّجَها الوَلِيُّ الأَبْعَدِ مِنْهُ أَوِ الحاكِم بِغَيْرِ إِذْنِهِ، بِإِتِّفاقِ العُلَماء، فَلَيْس لِلْوَلِيِّ أَنْ يُجْبِرَها عَلى نكاحِ مَنْ لاتَرْضاهُ، وَلايعضلُها عَنْ نكاحِ مَنْ تَرضاهُ إِذا كانَ كَفُؤاً بِإِتِّفاقِ الأَئِمَّةِ). واتە: ئەگەر کچێك ڕەزامەندی دەربڕی وبەدڵ حەزی کرد شویکات بەکوڕێك.. کوڕەکەش هاوشانی خۆی بوو. ئەوا واجبە لەسەر (وەلی ئەمرەکەی) وەکو برا پاشان مام کەئەم کچە بدەن بەوکوڕە ولێ ی مارە بکەن.

جا ئەگەر ئەوبرایەیان ئەومامە ڕازی نەبوو ئەوکچە بدات بەوکوڕە ئەوا وەلی ئەمرێکی دورتر، یان دادوەر (قاضي) بەبێ پرسی ئەوبرایە یان مامەی کچە، ئەوکچە لەوکوڕە مارە دەکات. ئەمەش کۆ دەنگی زانایانی لەسەرە، وە بەهیچ شێوەیەك وەلی ئەمر بۆی نیە ئافرەت ڕازی بکات بەوەی کەشوو بەکەسێك بکات

کەبەدڵی نیە. وە ئەوکچە دانابرێ لەوکوڕەی کەهەڵیبـژاردوە بـۆ ژیـانی هاوسـەری خۆی، کاتێ ئەوکوڕە هاوشانی بێ بەکۆ دەنگی پێشەوایانی شەرع زان.

- وە ئەگەر وەلی ئەمر باوك وباپیرە بوو، ئەوا: لە (تُحْفَةُ المحتـــاج)دا دەفـەرموێ: ئەگەر باوك یان باپیرە، کوڕێکی هاوکوفیان بۆکچـەکە دیـاری کـرد، وەکچـەکەش بۆخۆی کوڕێکی هاوکوفی دیاری کرد، ئەوا ئەگەر دیاری کراوی کچەکە جوانتر بوو، یان دەوڵەمەنـدتر بـوو، یـان زانـاتر بـوو، ئـەوا ئەوکاتـە دیـاری کـراوی کچـەکە هەڵدەبژێردرێ وواجبە باوك وباپیرەش ڕازی بن!...

**لێرەوە دەبێ دووشت ڕون بکەینەوە:**

**یەکەم:** هەموو ئەوکچانەی کەویسـتویانە شـوو بـەکوڕێکی ڕێکـوپێکی هاوشـانی خۆیان بکەن، بەڵام باوك یان باپیر، یان برا ومام بۆتە ڕێگـر ونەیهێشـتوە ئەوکچـە بەدڵی خۆی شوو بەوکوڕە بکات، ئەوە شـەریعەتی ئیسـلامی لـەوکارە بـێ بەریـە ولەسەر ئیسلام حیساب ناکرێ.

**دووەم:** زۆرجار ناحەزان وناحاڵیان لەئیسلام ووشەی (بـاوك سـالاری) بـەکاردەهێنن وبەو مانایەی کەئیسلام وای کردوە کەباوك بەنوکی خەنجـەر ولولـەی تفـەنگ بـۆی هەیە کچی خۆی بەشوو بدات، بەڵام ئایا شـەریعەتی ئیسـلام کـە ڕونمـان کـردەوە بەفەرمودەی پێغەمبەرو فتوای زانایانی ئیسلام و شەرعزانان،

بە هیچ شێوەیە باوك سالاری تێدایە؟! ئایا پیاو سـالاری وچەوسـاندنەوەی ئـافرەت لەئیسلامدا بونی هەیە؟! بەبێ گومان نەخێر.

بەڵکو ئەوپەڕی ئازادی دراوە بەئافرەت بۆ هەڵبژاردنی ژیانی هاوسـەری خـۆی، بـۆ ئـەوەی لـە دوارۆژدا توشـی داخ لـەدڵی نـەبێ وهـەوڵ نـەدات تۆڵـەی بـە ئـاوات نەگەیشتنی لەهاوسەر ودایك وباوکی بکاتـەوە وژیـانی خـۆی وخێـزان وبنەماڵـەی بکاتە ژان!..

٦- یەکێکی تر لەوهۆکارانەی کەدەبنە هۆی بڵاوبونەوەی داوێن پیسی، کاریگەری سەتەلایت وتەلەفزیۆن وسیدی وگۆڤار وسایتی خراپە.

**بەدەربڕینێکی تر:** دەزگاکانی ڕاگەیاندن، بەبینراوو بیستراوو خوێندراوەوە، بەشێوەیەکی کاریگەر هانی بڵاوکردنەوەی خیانەتی هاوسەری ودورکەوتنەوە لەبەهابەرزو باڵاکان دەدەن.

لەیەکێ لە گۆڤارەکاندا خوێندمەوە کە: دکتۆرێکی دەرونی دەڵێ: جارێکیان پیاوێك هات بۆلام توشی گرفتی خێزانی ودڵەڕاوکێ وشڵەژانی دەرونی بو بوو، کاتێ کەوتمە گفتوگۆ وپرسیار لێکردنی بۆم دەرکەوت کەکێشەکەی بەهۆی کەناڵە بەدڕەوشتیەکانەوە بوە. ئەوپیاوە ووتی: ئەوەی لەسەتەلایتەوە دەیبینم ژنەکەم ناتوانێ وام بۆ بکات، بۆیە لەبەرچاوم کەوتوە ووێڵم بەشوێن ئەوەدا ئەوەی کەلەوێدا بینیومە، ئافرەتێك هەبێت بۆم جێ بەجێ بکات!!

دکتۆرەکە دەڵێ: منیش پێم ووت: ئەوەی تۆ بینیوتە ئەوە تەنها کارێکی بازرگانیە و زۆر دوورە لە ڕاستی یەوە وهیچ حەقیقەتێکی نیە!).

وە لەڕوی زانستی یەوە مرۆڤ پڕە لە هۆرمۆنات، چۆن لەبەر چاوت لیمۆیەك بگوشن، یەکسەر بێ ویستی خۆت لیکی ناودەمت دەڕژێ. بەهەمان شێوەش بەتەماشاکردنی فیلمێکی بێ شەرعی دوور لە ڕەوشت و بەهاباڵاکان ،هۆرمۆنە سێکسیەکان دەڕژێن وداوای خاڵی کردنەوە دەکەن.

**کەواتە:** ئەگەر سەتەلایتت هەیە وەکوڕ وکچی عازەبت هەیە، ئاگات لێ بێ کەناڵە بێ ڕەوشتیەکانی تێدا لابدە، ئەینا تۆش دەبی، ئەمڕۆ شتی وادەبینرێ ودەبیسترێ کەپێشتر هەرگیز لەکۆمەڵگەی کوردی دا ڕوی نەداوە، مناڵ لە تەمەنی دەساڵانیدا، هێشتا لەسەرەتایی یە پەلاماری کچ دەدات. لەدواوە پەلاماری مامۆستای کچ دەدات!! ئەمە هەموی کاریگەری ڕاگەیاندنی خراپە. یان ئەم هەموو کورتەنامەی سەرشاشەی تەلەفیزیۆنەکان. یەکێ دەنوسێ: من کچێکم

تەمەنم وایە وحەز لەکورێك دەکەم بۆ هاوڕێیەتی!! ئایا ئەمە چ پێشکەوتن وئازادیەکە، یان بێ ڕێزکردنی مرۆڤە. بەتایبەت کچان.

٧- گوێ گرتن وتەماشاکردنی گۆرانی کلیپ کراو، کە لەدەرەوە لە وولاتانی تورکیا وئەوروپا بەرهەم هاتوە، کەلەزۆر بەیانیدا، زۆربەی جەستەی ئافرەتەکە بەدەرەوەیە وخۆی دەخاتە باوەشی گۆرانی بێژەکەوە و ڕەقس وسەمای بۆ دەکات.

گەنجی داماویش کەئەیبینێ وائەزانێ ئەمە خۆشەویستیەتی بەلاّم لەڕاستی دا ئەم ئافرەتە بەپارەیەکی زۆر بۆ ئەوکلیپە بەکرێ گیراوە.

بەڕاستی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێویستە بەربەستێك لەبەردەم بلاّوکردنەوەی ئەم جۆرە کلیپانە دابنێت، چونکە گۆرانی ڕەسەن نین ودورن لە هونەری ڕەسەنی کوردی یەوە، بەداخەوە ئەوکوڕ وکچە بەڕێزانەی کەلەم کلیپ وفیلمانەوە فێری خۆشەویستی دەبن وزەواج دەکەن، هەموی چەند مانگێ پێ ناچێ لەیەکتری جیادەبنەوە وتەلاّق بەم شێوەیەی ئێستا زۆربوە، وە سەرەنجام بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی جنسی زۆرێك لەوانە.

ئەگەر ترسی خوا وشەرم وحەیا نەبێت توشی داوێن پیسی دەبن!

٨- گرانبونی پرۆسەی هاوسەرگیری، بەهۆی گرانی ئالّتون وکەلوپەلی ماڵ وگرانی ژیان. وەکاریگەری دەولّەمەندی پارە زۆر بەلاّم دین کەم، ئەوچی حەزبکات دەیکات وبەدەفتەر دۆلار خەرج دەکات بۆ کوڕەکەی. کوڕی هەژاریش، خانوی لەکوێ بوو؟ ئالّتون بەچی بکات؟ مالّی جیا بەچی بکات؟ سەرەنجام پیردەبێ وژنی بۆنایەت. وەکچەکەش شوی بۆ ناکرێ! دیسان ئەگەر پەروەردەیەکی موسلّمانانە وبڕوابون بەچاودێری خوایی نەبێ نزیکە ئەم گەنجە پەنا بۆ خراپەکاری وزینا ببات!

٩- هەژاری ونەداری و بێ دەرەتانی، هەندێ جار کەسانێك بەتایبەت ئافرەتان ناچار بەوحالّەتە دژوارە دەکات.

١٠- هاوڕێیەتی خەلّکی داوێن پیس وزیناکەر. کە هاوڕێ ڕەنگی هاوڕێ ناگرێ، بەلاّم خۆی دەگرێ.

**خۆپاراستن لەزینا:** پێویستە دوربکەویتەوە لەوهۆیانەی کەدەبنە هۆی زینا. چونکە زینا وەکو هیچ تاوانێکی تر نیە، هەرئەوەندە لیّ ی نزیك بـۆوە ئەکەویتـە ناویـەوە مرۆڤـ کوشتن لەوانەیە دەستت لەسەر پەلەپیتکـەی تفەنگەکـە بـیّ، بـەلاّم بتـوانی بەسـەر خۆتـدا زالّ بـی وترسـی خـوا بچـیّتە دلّتـەوە وفیشـەکەکەی نەتـەقیّنیّ. دزی لەوانەیە کەسی دز دەست بۆشتەکە ببات بەلاّم پەشیمان ببیّتەوە ودای بنیّتەوە ونەیدزیّ، بەلاّم زینا کەم کەس هەیە بگاتە حالّەتی ئەنجامدانی وبتـوانیّ نـەیکات. بۆیە سەرنجی قورئان بدەن.

لەباسـی کوشـتن دا دەفـەرمویّ: ﴿وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۚ﴾ الأنعام: ١٥١ دەفەرمویّ: کەسەکە مەکوژە.

بەلاّم بۆ زینا دەفەرمویّ: ﴿ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ ﴾ الإسراء: ٣٢.

واتە: نزیکی زینا مەبەوە. چونکە کەنزیکی بویتەوە وگەیشتیە کـاتی ئەنجامـدانی زۆر زەحمەتە بتوانی لیّ ی دوربکەویتەوە.

**جا زینا پێشەکی زۆرە، وەکو:**

١- نەزەر وتەماشا کردنی نامەحرەم وفیلم وسایت وگۆڤاری خراپ وناشەرعی.

٢- تەوقەکردنی ژن وپیاوی نامەحرەم لەگەلّ یەکتری.

٣- تێکەلاّوی وبەیەکەوە دانیشتن.

٤- ڕۆیشتن بۆ هۆلّی بەناو شایی وسەیرانی تێکەلّ لەگەلّ نامەحرەم.

هەروەکو پێغەمبەر خوا (ﷺ) لەم فەرمودەیەدا باسی ئـەوەمان بـۆ دەکـات. کـە زینا هەنگاو بەهەنگاو مرۆڤـ بۆی دەچێتە پێشەوە.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – عَنِ النَبِيِّ (ﷺ) قالَ: ((**كُتِبَ عَلى ابْنِ آدَمَ نَصيبُهُ مِنَ الزِّنــا مُدْرِكٌ لامَحالَةَ: العَيْنانِ زِناهُما النَّظَرُ، وَالأُذُنانِ زِناهُما الإِسْتِماعُ، وَاللِّسانُ زِناهُ**

الكَلامُ. وَاليَدُ زِناها البَطْشُ، وَالرِّجْلُ زِناها الخُطا. وَالقَلْبُ يَهْــوي وَيَتَمَنَّــى، وَيُصَدِّقُ ذالِكَ الفَرْجُ أَوْ يُكَذِّبُهُ)). رَواهُ البُخاري وَمُسْلِم.

**پارێزەرێکی تر، بەڵکو گەورەترین پارێزەر لەزینا:**

بڕوابونە بەچاودێری خوا. بەقیامەت، بەپاداشت وسزا. بەوەی کەدونیا هــەرئاوا ڕون نابێ وتاریکی قەبر هەیە. ئەوچەند چرکە لەززەتە حەرامــە. ســەدان ســاڵ ســوتانی ئــاگری بەدواوەیــە. بڕوابونــە بــەوەی کەهەرکەســێ لەبــەرخوا واز لــەزینا بێنــێ. لەوکاتەدا کە هیچ بەربەستێك نی یە وکــەس ڕێگــر نــی یــە و هــەموو دەرگاکــان داخراون وهەموو پەردەی پەنجەرەکان دادراونەوە. ئەوکەسەی ئالەوکاتــەدا وازبێنــێ وبڕوات. بەفەرمودەی پێغەمبەری سەروەرمان (ﷺ) یەکێکە لەوحەوت چینەی کە لەڕۆژی قیامەتدا لەژێر سێبەری عەرشی خوای گەورەدا دەبن لەوڕۆژەدا کــە هــیچ بەناو سێبەرێك نیە، سێبەری عەرشی خوا نەبێت. کە فەرموی: ((وَرَجُــلٌ دَعَتْــهُ إمْرَأَةُ ذاتُ حُسْنٍ وَجَمالٍ، فَقالَ: إِنِّي أَخافُ اللهَ)) پیاوێکە کە ئافرەتێــك بــانگی دەکات بۆ داوێن پیسی، ئافرەتەکەش هــەتا بڵــێ ی جوانــە، وەخــان ومانــە (نــەك گەڕۆك وپۆخڵ). بەڵام ئەم پیاوە لەوەڵامدا دەڵێ: مــن بەڕاســتی لــەخوا دەترســم، شەرم لەخوا دەکەم لەبەرخوا لێت نزیك نابمەوە!! بەڵێ ئەم ئیســلامە ســەدان گــەنج ولاوی ئاوای پێگەیاندوە، کە لەئێستادا کەئەم ووشانە دەنوسرێن. گــەنجمان هەیــە. جــوانترین ئــافرەت لەڕوخســار وســیمادا داوای زینــای لێ کــردوە بــەڵام ئەوگەنجــە کەزۆرجار دوکاندارە وکەلوپەلی ژنان دەفرۆشێ، یان شۆفێری تەکسیە، یــان دەســت گێڕەو لــەکۆڵانان شــت دەفرۆشــێ، ئەوداوایــەی ڕەت کردۆتــەوەو ووتویــەتی: إِنِّــي أَخافُ اللهَ. من لەخوا دەترسم. شەرم لەخوا دەکــەم. وە ئامۆژگــاری ئافرەتەکــەی کردوە کەواز لەوبۆچون وبیرکردنەوە حەیابەر وبۆگەنە بهێنێ..

وە موژدەبێ بۆ ئەوکەسەی کەلەبەرخاتری خوا لەوکاتەدا کەخەریکە جوت بونەکە ڕوودەدات وهەموو ئامادە سازیەك هەیە. وازدێنێ ودوردەکەوێتەوە.

(جا پیاو بێ یان ژن. کوڕبێ یان کچ) فەرق ناکات. بەلأم بۆیە زۆرجار لەفەرمودەکاندا باسی ئافرەت دەکات ولەئایەتەکەدا ( الزَّانية – پێش – الزَّاني ) هاتوە، چونکە ئەگەر ئافرەت تەسلیمی تەواو نەبێ بۆ زینا. ئەو زینایە ناکرێ. وەکە ئافرەتیش بە ڕەزامەندی خۆی بۆ ئەوکارە چوو.، کەمتر پیاو دەتوانێ بەسەر خۆیدا زاڵ بێ و وازبێنێ. جا هەرکەسێ لەزینا دورکەوتەوە لەبەرخوا. ئەوا با دڵنیابی (إِنْ شاء الله). خوای گەورە لەوەختێکدا دێ بەهاناو هاواریەوە کە ئیتر هیچ هێز وفریاگوزاریەکی دونیا ناتوانێ بەدەنگیەوە بچێت.

هەوەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبارەی سێ کەسی گیرخواردوی ناو ئەشکەوتەکەوە بۆمان دەگێڕێتەوە کە یەکێکیان تەنها لەبەر خواو بەبیستنی ناوی خوا وازی لەزینا هێنا. خوای گەوردش دەرگای ڕەحمەتی لیَ کردنەوە.

**پارێزەرێکی تر لەزینا:**

خوشکی بەڕێز حیجاب بکە وبەرگی ڕێزی بالأپۆشی لەبەربکە. چونکە دڵنیابن داوێن پیس زاتی ئەوە ناکات سەیری حیجاب لەبەربکات. وەئەگەر سەیریشی بکات زۆر لەدورەوە وبەترس و لەرزەوە تەماشای دەکات. دڵنیابە مێش وشتی پیس بەوشیرینیەوە دەنیسێتەوە پەسراوە. خۆ ئەگەر ئافرەت خۆی ڕوت کردەوە ولاشەی دەرخست، ئەوە بۆخۆی بەگورگەکان دەڵێ، وەرن گۆشتم هەڕاجە وپەلاماری بدەن. ئەگەر دەڵێ ی وانیە. ئەی بۆخۆت ڕوت کردۆتەوە، ئایا ڕوتی ئافرەت هونەر وڕۆشنبیریەکەی لەکوێدایە؟!

وە **خوشکی بەڕێز**، لەکاتی قسەکردندا لەگەڵ پیاوی نامەحرەم دەنگی خۆت باریك وناسك مەکە چونکە هەرچەندە تۆ خاوەنی شەرم وحەیابی، بڕوابکە هی واهەیە

تەماح لەدایك وخوشكی خۆشی دەكات. ئەوانە دەرونیان نەخۆشە، كەتۆیە ناسكی ودەنگی نەرم لەگەڵی دوای وائەزانێ حەزی لێ دەكەی وئیتر لەكۆڵت نابێتەوە.

**وە چارەسەرێكی تر بۆ رێگرتن لەزینا**. زوو ژن هێنان وشوكردنە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((**یامَعْشَرَ الشَّباب مَنِ اسْتَطاعَ مِنكُمُ الباءَةَ فَلْیَتَزَوَجْ، فإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ یَسْتَطِعْ فَعَلَیْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَهُ لَهُ وِجاءٌ – أَي وِقایَةٌ**)) رَواهُ البُخاري وَمُسْلِم.

**واتە: ئەی كۆمەڵی گەنجان هەركەس لە ئێوە توانای سەرجێ ی ومـاڵ بـەرێوەبردنی هەبوو باژن بێنێ، چونكە ئەوە چاوی لەنەزەر دەپارێزێ وداوێن لەخراپە دەپارێزێ — ژیانی هاوسەری وەكو قەلآیەكی پتەو وایـە (حِصْن) كەچـویتە ناویـەوە پـارێزراوی وەكو ئەوكەسە نیە لەبیاباندا بێ وبەئاسانی هـەموو درندەیـەك پـەلاماری بـدات. ئەگەر كەسێكیش نەیتوانی ژن بهێنێ، ئـەوا بابـەرۆژوو بێـت، چـونكە ئـەوە بـۆی دەبێتە پارێزەر وبەهۆی رژووگرتنەوە. ئەو ئارەزوە زۆرەی جنسی كەم دەبێتەوە.**

**بەڵام بەداخەوە ئەمرۆ كـوران وكچـان بـەهۆی ئـەم گرانـی بـازار وبـێ كەسـابەتی بەتایبەتی بۆ گەنجانی هەژار، وای كردوە كەپرۆسەی هاوسەرگیری زۆر لەكاتی خۆی دوادەكەوێت.**

**رێگریەكی تر لەزینا:** پاككردنەوەی سەتەلایتەكەت لەكەناڵە خراپە بەدرەوشتیەكان. وەپاشان ئاگاداربە وبزانە، كورەكـەت، كچـەكەت هاورێیـەتی كـێ دەكـات. ئایـا ئەوكەسە شایەنی رەفاقەتە. دڵ پیسی ودواكەوتویی نیە كەنەهێڵی كچەكەت لەگەڵ كورێكی بەناو رەفیقی دا بروات بۆ پیاسە وپارك وبناری شـاخ وپاشـان كـەخۆی لێ تێركرد ئەمجا ئامادەش نەبێ مارەی بكات!!

**بەرێزان:** هەندێ جار گوێ بیستی ئەوە دەبین كە بۆچی ئاینی ئیسـلام رێگـەی داوە بەپیاو زیاتر لەژنێك بێنێ — بەمـەرجێك كـە بـۆ ئارەزوبـازی نـەبێ وهۆكـارێكی سەلمێنراو هەبێ بۆ هێنانی ژنی تر كە لەشـەرعدا باسـكراوە — بـەڵام ئـەی بۆچـی

دروست نیه وحەرامە بۆ ئافرەت لەیەك كاتدا دوو هاوسەر یان زیاتری هەبێ؟ یاخود بۆچی زینا حەرامە كە ئافرەتەكە لەگەڵ هەر پیاوێكا پێ ی خۆش بێت جوت ببێ، لە كاتێكا زۆری لێ نەكرابێ، ئایا ئەمە پێشێل كردنی ئازادی وخواستی دڵی كەسەكان نیە؟! یاخود بۆچی دەبێ ژنێك ئەگەر تەڵاقدرا یان مێردەكەی مرد، لەحاڵەتی تەڵاقدا سێ پاك بونەوە ببینێ، بەئایەتی:﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴾ البقرة: ٢٢٨ وەكە مێردەكەی مرد چوار مانگ ودە ڕۆژ بوەستێ ئەمجا بۆیان هەیە ژیانی هاوسەری نوێ پێك بهێننەوە. ئەی بۆچی پیاو بۆی هەیە یەكسەر ژن بهێنێتەوە وئەم كاتەی بۆ دانەنراوە؟! ئایا ئەمە زوڵم نیە لەئافرەت وجیاوازی كردنی پیاوو ژن نیە لەئیسلامدا؟!

**لە وەڵامی ئەوجۆرە كەسانە وپرسیارەكانیاندا دەڵێین:**

ئەمڕۆ سەردەمی زانستە وقسە وردەخە بەبێ بنەمای زانستی قبوڵ ناكرێ، جاباگوێ بۆ زانستی نوێ بگرین. بزانین ئەم یاسایەی كەخوای گەورە بۆی داناوین چ حیكمەت وعیلمێكی لەپشتەوەیە؟!

بەڵێ، تاوەكو ماوەیەكی كەمیش پێش ئێستا، هەموو زانایانی پزیشكی وئاینی پیرۆزی ئیسلامیش لەلایان وابوو كەپەروەردگاری مەزن لەكاتێكدا كەفەرمانی بەو ئافرەتانە نەكردوە شوونەكەنەوە وژیانێكی نوێ ی هاوسەری دانەمەزرێننەوە، لەدوای ئەوەی كە لەمێردەكەی خۆیان جیادەبنەوە، تاوەكو سێ خاوێن بونەوەی تەواو بەسەر لێكترازان (طَلاق) دا تێنەپەڕێت، وەئەگەر هاتووهاوسەرەكەیان كۆچی دوایی كرد، ئەوا دەبێت چوار مانگ ودە ڕۆژ چاوەڕێ بكەن، پاشان ژیانێكی هاوسەری نوێ بۆخۆیان دابمەزرێننەوە. كەلەشەریعەتی پیرۆزی ئیسلامدا پێ ی دەوترێت مانگەكانی بژاردە (أَشْهُرُ العِدَّة).

بەڵێ تاوەكو ماوەیەكی كەم بەرلەئێستا زانایانی پزیشكی وفیقهی ئیسلامیش وایان دەزانی كەتەنها سود ونهێنی لەدوای ئەم فەرمانە پیرۆزەی پەروەردگارەوە

ئەوەیە: تاوەکو بزانرێت ئایا هیچ کۆرپەلەیەك لەناو منداڵدانی ئەودایکە هەیە یان نیە. وەیان هەروەکو مۆڵەتێك بێت بۆئەوەی ئەو دوو هاوسەرەی کە لەیەکتری جیابونەتەوە ڕق وکینەیان بەرامبەر بەیەکتری دابمرکێتەوە و لەگەڵ یەکتریدا ئاشت ببنەوە وژیانێکی نوێ ی هاوسەری دەست پێ بکەنەوە بێ گومان ئەم دووهۆیە ڕاستن. بەلاَم هۆیەکی تری نوێ هەیە، لەم دوو هۆیەش گرنگترە کەزانایانی پزیشکی لەماوەیەکی کەمی ڕابردودا دۆزیویانەتەوە.

**ئەویش ئەوەیە:** زانستی نوێ ئاشکرای کردوە کە (سپێرم) تۆوی هەرپیاوێك لەهی پیاوێکی تر جیاوازە، هەروەکو چۆن پەنجەمۆری کەس لەکەس ناچێ، جاتۆوی هەرپیاوێکیش کۆد ونهێنی تایبەت بەخۆی هەیە. لەبەرامبەر ئەویشدا لەشی ئافرەتێك وەك کۆمپیوتەرێك کۆد ونهێنی تۆوی هاوسەرەکەی لای خۆی تۆماردەکات. گۆڕانی کۆد ونهێنیەکانیش وەك ئەوە وایە کە ڤایرۆسێك چوبێتە ناوکۆمپیوتەرێك. بۆیە کاریگەری نەرێنی (سلبی) لە لەشی ئافرەتەکەدا بەجێ دەهێڵێت وتوشی نەخۆشی شێرپەنجەی منداڵدانی دەکات.

باشترین چارەسەریش بۆ دروست نەبونی ئەم کێشەیە لای ژنی مێرد مردوو تەلاَقدراو، مێردنەکردنەوەیە تاوەکو ئەوکاتەی لاشەی ئافرەتەکە کۆد ونهێنیەکانی مێردەکەی لەبیردەچێتەوە. کە (سُبْحانَ اللّه) ئەوکاتەی کەکۆتایی بەناسینەوەی کۆدی مەزنی پیاوەکەی دێت، یەکسانە بەوکاتەی کەپەروەردگاری شکۆدار دەست نیشانی کردوە لەقورئانی پیرۆزدا، کەڕێك دەکاتە ماوەی (العِدَّة) کە قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێ دەکات.

**لێرەدا ڕوون کردنەوەیەکی تر پێویستە بگوترێت، ئەویشیان ئەوەیە:**

باشە بۆچی شەریعەتی ئیسلامی سێ خاوێن بونەوەی داناوە بۆ ئەو ئافرەتانەی کە لە هاوسەرەکەی خۆیان جودا بونەتەوە بە (تەلاَق) بەلاَم بۆ ئەو ئافرەتانەی کە هاوسەرەکانیان کۆچی دواییان کردوە، چوار مانگ و دە ڕۆژی داناوە تاوەکو ئەو ئافرەتانە بتوانن شوبکەنەوە سەرلەنوێ؟! بۆچی ماوەی ئەم زیاترە؟!

**وەڵامی ئەوپرسیارەش ئەوەیە:** کە توێـژەرەکان هەسـتان بەتوێژینەوەیـەکی زۆر، تاوەکو بۆیان ئاشکرا بوو کەئەو ئافرەتانەی هاوسەرەکانیان کۆچـی دوایـی کـردوە، پێویستیان بەماوەیەکی زیاترە بۆ پاك بونەوەی کۆمپیوتەری ناوڕەحمیان وسڕینەوەی کۆدی مەنی مێردەکەیان لە ئافرەتانی تەڵاق دراو. ئەوەش بەهۆی ئەوەوەیە کەباری دەرونیان نیگەرانە لەسەر جیابونەوەی هاوسەرەکانیان، چونکە ئەوەی بەمردن لیێ ی جیابۆتەوە، ئەو پەڕی خۆشەویستی لەدڵیایەتی بەرامبەری وهـیچ هەڵوێسـتەیەکی ناشیرین نەبۆتە هۆی لێك جیابونەوەیان، تەنها مـردن کەلەدەسـەڵاتی کەسـدا نیـە لەیەکتری جیاکردونەتەوە. بۆیە درەنگتر لەبیری دەچـێتەوە. بـەڵام ئـەوەی بەتـەڵاق لەیەکتر جیادەبنەوە، چونکە لە یـەکتری عـاجزبون و ڕۆژێـك لەنێوانیانـدا هـەبوە. لەبیرچونەوەکە وسڕینەوەی کۆدەکە کەمتری دەوێت!!.

جا کاتێك ئەمە باسی بێوەژن وتەڵاقدراو بێت، کە دوای نـەمانی مێـردی خۆشـیان نەتوانن مێردبکەنەوە تاوەکو ماوەکەیان تەواو دەبـێ، ئـەی دەبـێ ژنێـك کـەزیاتر لەمێردێك قبوڵ بکات، یان کاری بەدڕەوشتی ئەنجام بدات تەندروستی چۆن بـێ وچ زیانێکی مەترسیدار ڕوبەڕوی ببێتەوە؟!

ئەمڕۆ سەرەنجامی بەدڕەوشتی و لەشفرۆشـی بـوە هـۆی پەیـدابونی نەخۆشـی بـێ چارەسەر وسامناکی (ئایدز). ئایدز چی یە؟! ئایـدز ئـەو نەخۆشـی یـە ڤایرۆسـیە کوشندەی هەڕەشە لەژیانی مرۆڤ دەکات لەهەموو وولاتـانی جیهـان وڕۆژ لـەدوای ڕۆژ مەترسی زیاتر دەبێت. ئایدز بریتـی یـە لەکـەمبونی بـەرگری لەشـی مرۆڤـ بەهۆی ڤایرۆسی (HIV) وەهەرکاتێ مرۆڤـ توشی ئەم ڤایرۆسە بوو بەرگری لەشـی نامێنێ دژی نەخۆشی وتوشی نەخۆشیە دەگمەنـەکان دەبێـت وبەرگـەی بچـوکترین نەخۆشی ناگرێت وبەمردن کۆتایی دێت. ئایدز بەهۆی داوێن پیسـی یـەوە دروسـت دەبێت وڤایرۆسی ئایدز لەوەدا زۆر مەترسیدار وماڵ کاولکەرەکە بەچەند ڕێگایـەك دەگوازرێتـەوە کـەزۆرجار ئـەو کەسـەی توشـی بوە،ئاگـای لێ نیـە کەچـۆن بـۆی گواستراوەتەوە. **وەکو:**

١- پەیوەندی سێکسی ناشەرعی بەهەموو جۆرەکانی یەوە. کەلە (٩٠٪)ی ئایدز بەم ڕێگایە لەکەسێکەوە بۆ کەسێك دەگوازرێتەوە. وەکو ئەوەی ئافرەتێکی لەش فرۆش بەهۆی ئەوەی چەندین پیاو لەگەڵی جوت بوە، توشی ئایدز بوە. هەرپیاوێك بۆ (یەك) جاریش لەگەڵی دروست بێ ئەویش توشی ئایدز دەبێت!

٢- بەهۆی خوێن گواستنەوەوە. جاری واهەیە کەسێك نەخۆشە وپێویستی بەخوێنە. کەسێك خوێنی پێ دەبەخشێ، ئەگەر ئەوکەسەی خوێنەکە دەبەخشێ ئایدزاوی بێ، یەکسەر کەسە خوێن تێکراوەکە بەبێ ئاگا وبێ تاوان توشی ئایدز دەبێ!! بۆیە ئێستا خوێن کەوەرگیرا ڕاستەوخۆ ناکرێتە لاشەی نەخۆشەوە. بەڵکو پشکنینی تەواو دڵنیاکەرەوەی بۆ دەکرێ کەخوێن بەخشەکە ئایدزی نیە، ئەمجا دەدرێ بە نەخۆش.

٣- ئەوانەی ئالوودە بوون بەبەکارهێنانی دەرمان ومادده بێهۆشکەرەکان. کەلە (٣٠٪)ی بەم ڕێگایە دەگوازرێتەوە.

٤- بەکارهێنانی ئامێری تیژ وەکو: (شرینقە — دەرزی، موس، ئامێری گوێ کون کردن، خاڵ کوتان و...هتد). کەئەمانە ئەگەر چونە لاشەی ئایدزاویەکەوە وکەسێکی ساغ بەکاری هێنا. یەکسەر توشی دەبێت!!

٥- لەدایکەوە بۆ کۆرپەکەی. نەخۆشیەکانی ناو لاشەی دایك هەندێکیان هەرخۆیان ناگوازرێنەوە بۆناو لەشی کۆرپە، یان بەهۆی بەکارهێنان وپێدانی دەرمان وکوتان بەدایکەکە، کۆرپەکە پارێزراو دەبێت، تەنها نەخۆشیەك کەبەهیچ شێوەیەك پارێزگاری لێ ناکرێ وکۆرپەی بێ تاوان وەکو دایکەکەی توشی دەبێت ئایدزە!!.

بەڵێ کەئیسلام ئاوا بەرەنگاری داوێن پیسی دەبێتەوە وسزای کوشتن بەڕەجم کردن بۆ پیاوی زیناکار یان ژنی زیناکار (کەهاوسەردارن) دادەنێ، پڕاوپڕە لەدادگەری وحیکمەت چونکە ئەگەر پیاو زیناکار بوو، داوێن پیسی کرد، ژنە ئاگای لەهیچ نیە. ئەم پیاوە چووە لای ژنەکەی وحامیلە بوو. ئەوا هەم ژنە بێ ئاگا وبێ تاوانەکەی، هەم کۆرپە بێ گوناهەکەی توشی ئایدز دەبێت. جا لەبەرئەوە ئەگەر

ئەو زیناکارە (پیاو بێ یان ژن) کوژرا، ئەوا ژیانی منالێکی بێ گوناه، وەهاوسەرە بێ تاوانەکەی دەپارێزرێ!

**ڕەنگە یەکێ بلێ:** باشە خۆمەرج نیە هەرپیاوێکی خاوەن ژن، یان ژنێکی خاوەن مێرد زینای کرد یەکسەر توشی ئایدز ببێ وبیکەینە بەهانەی کوشتنی بەبەرد باران کردن؟!

**لەوەلامدا دەڵێین:** ڕاستە هەموو زیناکارێ توشی ئایدز نابێ، هەربۆیە خوای گەورە وکاربەجێ ئەمەشی لەشەرعەکەیدا ڕەچاوکردوە. خۆباسمان کرد هەموو زینایەك ئاوا بەئاسانی ئاشکرا نابێ وحەددی شەرعی بەتایبەت ڕەجم کردن ناچەسپێ. بەڵکو بونی چوار شاهید، بونی حەمل، دان پێ داهێنانی بێ پەشیمان بونەوە تامردن کە بەڕاستی ئەمانەش بەیەك جار زینا دەرناکەون بەدەگمەن نەبێ. چونکە خوای گەورە (السَّتار) تاوان وگوناه دادەپۆشێ وە مۆڵەتی تاوانبار وگوناهبار دەدات کە بەخۆیدا بچێتەوە و پەشیمان ببێتەوە. بۆیە ئەوانەی کە ئاشکرا دەبن ودەگەنە حەددی کوشتن زۆربەی هەرە زۆریان بەدڵنیاییەوە جاری چەندە هەمینیانە کەئەوکارە قێزەونەدەکەن.

بۆیە قورئانیش دەفەرموێ: (ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي) بە (ئەلف لامی تەعریف) واتە ئەوەندەی زینا کردوە لێ ی بۆتە پیشە. کەبێ گومان لەئەنجامدا توشی ئایدز دەبێ ودەبێ بکوژرێ! وە پاشانیش کاتێك یاسایەك دەردەچێ بۆ بەرەنگاربونەوەی مەترسیەك، لەبەرئەوەیە کەئەگەری ڕودانی حاڵەتێکی مەترسیدار هەیە، بەهۆی یەك کەسەوە. کەچی سەدان کەس توشی لێکۆڵینەوە دەبن.

لە خاڵێکی پشکنیندا (السَّيْطَرَة لِلتَفتِش) تەنها ناوی یەك داواکراو هەیە. کەچی هەرچی بەوێدا ڕەت بێ لێکۆڵینەوە وناسنامە وپشکنینی ئۆتۆمبێلی بۆ دەکرێ. یان کەنەخۆشیەك بڵاودەبێتەوە، یەك کەس لەوانەیە بیگرێ. کەچی هەزار کەس دەکوترێ. بەهەمان شێوەش بۆڕێگرتن لەحاڵەتێکی ئایدز، چەند کەسی تر حوکمی

لەناوچونیان بەسـەردا دەچەسـپێ. چـونکە ئـەو ئایـدزە بەکەسـێك ودوو کەسـەوە ناوەستێ و وولات کاول دەکات و پڕمەترسیترین هەڕەشەیە بۆسەر هـەموو جیهـان.
ئەوەتا لە ڕۆژی سەرهەڵدانی ئایدزەوە تائێستا لەکۆتایی (٢٠١٠)یە شەست ملیۆن کەس لەسەرانسەری جیهاندا توشی نەخۆشی ئایدز بون ولەو شەسـت ملیۆنـە سـی ملیۆنیان گیانیان لەدەست داوە وبەزەلیلترین شێوە مردوون!! لـە هـەموو وولاتـانی جیهاندا ڕۆژ بـە ڕۆژ مەترسـی زیـاتر دەبێـت. لـە هەنـدێك وولات وەك وولاتـانی عەرەبی سالانە (٣٠٠٪) زیاد دەکات!! ئایدز ڕۆژانە (٨٠٠٠) هەشت هەزار کەس وە هەرمانگەی (٢٥٠٠٠٠)کـەس لـەناو دەبـات لەجیهانـدا بـەگوێرەی ڕاپـۆرتی (UNAIDS)
ئێستا ئایدز تەنها مەترسی یـەکی تەندروسـتی نیـە بـەڵکو مەترسـیەکی ئـابوری وئاسایشی وکۆمەلایەتی گەورەیەکەهەڕەشە لە مرۆڤایەتی دەکات. بۆیـە کێشـەکە بـوە بەکێشـەیەکی بایـەخ پێـدراوی جیهـانی و لـەڕێکخراوە گـرنگ وخـاوەن دەسەلاتەکانی جیهان گرنگی تایبەتی پێ دەدرێت.
ڕۆژی جیهانی بۆ دانراو، ١/١٢ی هـەموو سـالێك کـراوە بـەڕۆژی ڕوبەڕوبونـەوەی ئایدز لەجیهاندا بەلێ ئەمە بەرهەمی زینـای ڕێگاپێـدراوو شـوێنی لاشـە فرۆشـی وزینا بەناوی ئازادی وسەربەستی یەوە. کە بەڕاسـتی ئـازادی وسەربەسـتی مرۆڤـ بەهۆی ئایدز وئایدزاویەکانەوە بەتەواوی لە مرۆڤ سەنرایەوە!
سـوپاس بـۆ خـوای گـەورە کوردسـتانمان بەبەرەکـەتی دیـن ودینـداری وخواناسـی وئیسـلامەتیمان بەبەرەکـەتی مزگـەوت و ووتـاری هـەینی ورێنمـایی مامۆسـتا ماندونەناسەکانی سەنگەری مینبەر ومیحراب. کەبەردەوام وهەمیشە تۆوی داوێـن پاکی ورەوشت بـەرزی دەچـێنن وبەرهەمەکەشـی لەوپاکیەتیەیـە لەئایـدز وداوێـن پیسی بەئاشکرا دیارە.

**ئامارەکانی وەزارەتی تەندروستی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەڵێن:**

لەساڵی ١٩٨٨وە تاساڵی (٢٠١٠) لەکوردستاندا نزیکەی (٧٧) حەفتاوحەوت کەس تووشبون بەڤایرۆسی (HIV)، لەوانە تەنها هەشتیان کورد بوون وخەڵکی کوردستان بوون، ئەوانیتر بێگانەبوون ورەوانەی وڵاتی خۆیان کراونەتەوە. وە جێگای ئەوەیە دەست خۆشی لە وەزارەتی تەندروستی وهێزەکانی ئاسایش بکەین کە بەوردی لەهەموو جێگایەك، بەتایبەت لە فڕۆکەخانەکان پشکنینی تەواو بۆ ئەوکەسانە دەکەن کەدێنە هەرێمی کوردستانەوە وتادڵنیا نەبن کەئایدزی هەڵنەگرتوە ناهێڵن بێتە وڵاتەوە. بەڵێ ئەمە بەرهەمی دور لەدینی وبەناو ئازادی وسەربەستی بێ سنورە.

پێغەمبەری خۆشەویست ودڵسۆزمان (ﷺ) هەرزوو ئەم ئومەتتە وهەموو مرۆڤایەتی ئاگادار کردەوە لەم بەڵاسامناکە بێ چارەسەرە وفەرموی: ((لَمْ تظهر الفاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قَطُّ، حَتَّى يُعْلِنُوا بِها. إلا فَشا فِيهِمُ الطَّاعُونُ وَالأَوْجاعُ الَّتِي لَمْ تَكُنْ مَضَت فِي أَسْلافِهِمُ الَّذِينَ مَضَوا)). رَواهُ الحاكم وابنُ ماجَّة البَزار.

بەداخەوە مرۆڤایەتی ئەمڕۆ بەهۆی دورکەوتنەوە لە پەیامی حەق ودادپەروەری خوایی کەئاینی ئیسلامە ڕۆچوە لەزۆنگاوی نەفامی وبەدڕەوشتیدا.

**ئەوەتا:** (تۆڕی هەواڵی ئیسنای ئێرانی) لەزاری ئاژانسەکانی هەواڵی (ئوستورالیا)وە بڵاوی کردەوە کە: گەنجێکی تەمەن (٢٠) ساڵەی خەڵکی ئوستراليا بەناوی: جوگیویە، خەڵکی ناوچەی توومبای سەربەپارێزگای (کوئینزلەندی) ئوستورالیا، لەرێورەسمێکی تایبەتدا ژیانی هاوسەری لەگەڵ سەگەکەیدا پێکهێنا!!! جوگیو لە لێدوانێکدا بۆ کەناڵی ڕاگەیاندن ووتی:

بۆ ماوەی پێنج ساڵە خەریکی بەخێوکردنی ئەوسەگەم و زۆرم خۆشدەوێ!

**هەروەها ووتی:** لە ڕێوڕەسمی پێکهێنانی ژیانی هاوسەری لەگەڵ سەگەکەمدا، هەموو هاوڕێ وکەس وکارم بەشداریان کرد وجلی بووك وزاواییمان لەبەرکردبوو!!!

ئا ئەمەیە ئەو ئازادی وسەربەستیەی هەندێ کەس بەداخەوە بانگەشەی بۆ دەکەن وبەئاشکرا دەڵێن: ئاینی ئیسلام کۆت وبەندە و ناهێڵێ مرۆڤ ئاوا لەگەڵ سەگدا زەواج بکات. باشە ئەمە ئەوپەڕێ بێ حورمەتی کردن نیە بەمرۆڤ بەگشتی و بەئافرەت بەتایبەتی؟!!!

**بەڕێزان:** ڕێز وحورمەتی کەسایەتی مرۆڤ ، ژن بێ یان پیاو زۆرناسکەو وەکو شیری پاکوخاوێن وایە بە بچوکترین میکرۆب وتۆز وخۆڵ وپیسی کاری تێ دەکرێ و ڕەنگ وتامی دەگۆڕێ، مەسەلەی شەرەف وناموسیش ئاوا ناسك وپیرۆز وپاکە، دەبێ بپارێزین لەوەی کە کارێك بکەین توشی قسەو قسەلۆك و ووتی ووتی کەسی زمان ودڵ پیسی ببینەوە. کە ئەگەر دووکەس بەیەکەوە قسەبکەن بەبێ مەبەست ئەوا ئەم دەیخاتە خانەی حەزلێکردن ودەست تێکەڵ کردن ودەنگ وباسی ناوکۆڕ وکۆبونەوەی کەسانی ترەوە. ئیتر قسەش هەر ئەوەتا کرا، ئیتر ئەگەر واش نەبێت، کاریگەری خراپی خۆی هەر بەجێ دێڵێ. **شاعیر وتویەتی:**

لَقَدْ قيلَ ماقيلَ إنْ صدقاً وَإنْ كَذِباً　　　فَما إعْتِذارُكَ مِنْ قَوْلٍ إذا قِيلاً.

هەر بۆیە پێغەمبەری خوا لەم ئامۆژگاریە بەنرخەیدا ئاگادارمان ئەکاتەوە کەئاگاداری ئەوەبین پیاو نەچێتە ماڵێکەوە کە ئافرەتی نامەحرەمی تێدابێت و هیچ پیاوێکی لێ نەبێ، جا با ئەو پیاوە برا یان ئامۆزا، یان پورزا وخاڵۆزای خاوەن ماڵیش بێت.

چونکە ئەگەر کەسێك ئەم پیاوە لای ئەم ئافرەتە ببینێ ڕەنگە بتوانێ قسەیەکی بەدوا بخات وئیتر حەیا وئابڕوی بەناحەق لەکەدار بکرێت.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((إِياكُم وَالدُّخُولَ عَلى النِّساءِ، فَقالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصارِ، يارَسُولَ الله، أَفَرَأَيْتَ الحَمْوَ؟ قالَ: الحَمُو المَوْت)) رَواهُ البُخاري وَمُسلِم.

**کەواتە:** ئەمەی دەکرێ لە هەندێ شوێندا، کە پیاوانی نزیکی مێردەکە وەکو ئامۆزا وبرازا وخالۆزاکانی وبراکانی یان پیاوانی کەسوکاری ژنەکە وەکو ئامۆزا وپورزا وخالۆزای، بەبێ ئەوەی مێردی ژنەکە لەماڵ بێ، هەرخۆی پێدا دەکەن وبێ لەدەرگادان دەچنە ژورەوە. ئەوە بە ڕاستی پێچەوانەی شەرعە.

وەزۆرجاریش بوە فیتنەی لێ پەیدابوە، یان تۆمەت بۆ ژنەکە هەڵبەستراوە، یاخود پیاوەکە توشی دودڵی ودڵ پیسی بودو سەرەنجام ژنەکەی تەلاق داوە. ڕەحمەتی خوا لە پێشینانی میللەتی کورد. کاتێ لەدەرگای هەرماڵێکیان دابێت، ئەگەر ئافرەت دەرگای کردبێتەوە پرسیویەتی: ئەرێ ئەم ماڵە پیاویان لەماڵە، ئەگەر پیاوەکە لەماڵ نەبوبێ یەکسەر گەڕاوەتەوە ونەچۆتە ژورەوە.

**خاڵێکی گرنگی تر کەپەیوەندی هەیە بەم باسەوە ئەوەیە:**

کاتێ کەسێك زانی لەماڵێك، لەدەزگایەك لەسەیرانگایەك. لەئوتێلێك داوێن پیسی دەکرێ، یان گۆڤارێك ئەوبابەتانە دەوروژێنێ یاخود سایتێك لەئەنتەرنێتدا، یان کەناڵێکی سەتەلایت زینا نیشان دەدات. ئەوا نابێ ئەوباسە بلاوبکرێتەوە، بابەمەبەستی دڵسۆزیش بێت بۆ دینی ئیسلام. بەڵکو دەبێ لەشوێنی خۆیدا ئەوباسە بمرێنێ، چونکە بلاوکردنەوەی وەکو ڕیکلام کردن وایە بۆی ورەنگە کەسێك ئاگاداری ئەوشتە نەبێ ونەزانێ لەکوێ ئەنجام دەدرێ، ئەگەر زانی شەیگان ئارەزوی نەفس هانی دەدەن بۆ پێگەیشتنی وسەرەنجام توش دەبێت. پێغەمبەری

خۆشەویسـت ودڵسـۆزمان - (ﷺ) زۆرجـوان ئـەم باسـەی بـۆ ڕون کردینـەوە وفەرمویـەتی: (لاتُباشِرُ المَرْأَةُ المَرْأَةَ فَتَنعَتَها لزَوْجِها، كأنَّـهُ يَنْظُـرُ إِلَيْهـا) رَواهُ البُخاريُّ.

**واتە:** نابێ ودروست نیە. ئافرەتێك لەگەڵ ئافرەتێكدا بەیەكەوە كۆببنـەوە ولاشـەی یەكتری ببینن - دیارە ئافرەتان زۆرتر لە پیاوان خۆیـان نیشـانی یـەكتری دەدەن و سەرنجی لاشەی یەكتری دەدەن وشـوێنە شـاراوەكانی یـەكتری دەبیـنن، كەئەمـەش لەشەریعەتی ئیسلامدا بەهەموو شێوەیەك حەرامە پاشـان ئـەم ئافرەتـە بچـێ بـۆ مێردەكەی خۆی بگێڕێتەوە كەفلاَن ئافرەتە لاشەی چـۆنە، سـینەی چـۆنە، وای بـۆ باسبكات وەكو ئەوەی لەبەرچاوی بێ و بەچاوی سەر تەماشای بكـات، ئـیتر دڵـی بچێتە سەری و بەشوێنیا بگەڕێ پاشان ژنەكەی خۆی بەرچاوبكەوێت وژیانیـان تـاڵ ببێت وهێلانەیان بشێوێت.

وە بەجۆرێكی تریش فەرمودەكە مانا دەكرێت. ئەویش ئەوەیە: دروست نیـە كـاتێ ژنێك لەش ولار وشوێنە شاراوەكانی ئافرەتێكی تر ببینـێ. بچـێ بـۆ لای مێـردی ئافرەتەكە وبڵێ: ئای ئەوە چۆن لەگەڵ ئەوژنەدا دەژی ودەخەوی. خۆ فـلاَن شـوێنی ئاوایە وئاوایە ولاوازە وناشرینەو...هتد.

بەشێوەیەك باسی ئەم ژنە بكات وەكو پیاوەكە لەبەر چاوی بـێ وابێـت. ئـیتر ئـەم پیاوە كەچەند ساڵە لەگەڵ ئەم ژنەی خۆیدا بوە وپێ ی ڕازی بوە وبەدڵی بـوە. بـەم باسكردنە خەست وخۆڵە ئەمجا ژنەكەی دێتـە بەرچـاوو كـەم وكوڕیـەكانی دەبینـێ وبەرچـاوی دەكـەوێ و زۆرجـار تـەلاَقی دەدات ومنـاڵ بـێ دایـك ومـاڵ وێـران ودوژمنایەتی دوو بنەماڵەی لێ دەكەوێتەوە وهەموشی بەهۆی دەم شڕی و نـەفامی وئیمان لاوازی وكەم شەرمی ئەو ژنە بوە كەئاوا بۆ پیاوەكەی باس كردوە.

دڵنیابن چەندین ژن ومێرد زۆر بەختەوەر بون بەیەکەوە. تۆزێ ژنەکە بەرچاونەبوە، جوان نەبوە لەسیمادا. بەڵام مێردەکەی هیچ بیری لێ نەکردۆتەوە، لەولاوە ژنی خزمێکی پیاوەکە، یان جاری واهەبوە ژنێکی خزمی ژنەکە، بەمێردەکەی دەڵێ: ئای ئەوە تۆ چۆن تەمەنی گەنجی خۆت وباڵا وشۆخ وشەنگی خۆت لەگەڵ ئەوژنە ناشرینە، لاوازە، کزۆڵە بەسەردەبەیت وئەو هەموو کچە جوانە هەیە، بەخوا پێم حەیفە وپەرۆشی تۆمە ئەوە ژنت بێ!! ئیتر دڵی مرۆڤیش زۆر زوو بەقسەیەك دەگۆڕێ وژنەکەی بەرچاوکەوتوە وژیانیان لێ بۆتە ژان وئەوژنە زمان پیسە بێ شەرمە، ئۆباڵی دونیا وقیامەتی ئەوخێزانەی لەئەستۆدایە و ڕۆژێك بۆ خۆشی ژیانی لێ تێك دەچێت. جا با ئافرەتانی موسڵمان زۆر ئاگاداری ئەومەسەلەیە بن.

**خاڵێکی گرنگی تر:** ئەی ئەوکەسەی کەتوشی زینا بووی. واباسی زینا وهۆکار ودەرەنجامەکانیت زانی. ئەمڕۆ حوکمی شەرع نیە پاکت بکاتەوە. کەواتە: ئەوەندەت لەسەرە بەدڵ وبەگیان لەناخەوە، تەوبەیەکی بەکوڵ وبەدڵ بکەی وبڕیار بدەی تاماوی لەزینا نزیك نەبیتەوە وەلەلای هیچ کەسیش ئەوەی توشی بوی نەیگێڕیتەوە. ئەوبۆگەنیە بەلوتی کەسانی تردا نەکەی. ئەوا دڵنیابە (إنْ شاء الله) خوا لێت خۆش دەبێت.

وە دەرگای تەوبەت لەسەر داناخرێت، ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی لەسەر جەنازەی ئافرەتێك کرد. کە مێردی هەبوو، پاشان زینای کردبوو. وەتەسلیمی شەرعی خوا بوبوو، وەڕەجم کرابوو، کوژرا بوو. پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر جەنازەی ئەم ئافرەتە – پێشتر تاوانکار وزیناکارە، بەڵام ئێستا دوای حەددی شەرعی پاك وخاوێنە ڕاوەست ونوێژی لەسەر کرد ودوعای خێری زۆری بۆ کرد!! صەحابەکان بەسەر سوڕمانەوە عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

چۆن نوێژ لەسەر زیناکارێك دەكەی کەمێردی هەبوە وزینای کردوە وبەڕەجم کوژراوە؟! پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((**لَقَدْ تابَتْ تَوْبَةً لَوْ قُسِمَتْ بَيْنَ سَبْعِينَ مِنْ أَهْلِ الْمَدِيْنَةِ لَوَسِعَتْهُم**)) رَواهُ مَسْلِم

واتە: سوێندبێ. بەڕاستی ئەم ژنە تەوبەیەکی ئەوەندە پاك وخاوێنی کردوە. ئەگەر دابەش بکرێ بەسەر (حەفتا کەس) لە(گوناهبارانی) شاری مەدینە بەشی هەمویان دەکات!).

**قورئانیش دەفەرموێ:** ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَٰئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ ۗ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ الفرقان: ٦٨ ـ ٧٠.

واتە: یەکێ لە ڕەوشتی بەندەکانی خوای میهرەبان (عِبادُ الرَّحْمن) ئەوەیە کە: هیچ جۆرە خوایەکی تر لەگەڵ (الله) دا ناپەرستن. کەسیش ناکوژن کەخوا کوشتنی حەرام کردبێت. مەگەر بەحەق و ڕەوا، هەروەها زینا ناکەن و نزیکی ناکەون.

جا ئەوەی ئەو جۆرە کارە خراپانە ئەنجام بدات. ئەوە توشی سزا وئازارو ڕیسوایی دەبێت. لەقیامەتیشدا ئازارو سزای بۆ چەند بەرامبەر دەکرێت و بەزەلیلی و خەجاڵەتی و شەرمەزاری یەوە دەبێت ژیانی تێدا بەرێتەسەر.. مەگەر ئەوکەسەی کەتەوبە بکات وباوەڕ بهێنێت وکار وکردەوەی چاکە ئەنجام بدات. ئائەو جۆرە کەسانە، خوا کاروکردەوە خراپەکانیشیان بۆ دەگۆڕێت بەچاکە، چونکە هەمیشە وبەردەوام، خوا لێخۆشبوو میهرەبانە. بەرامبەر خەڵکی بەگشتی وئەو تەوبەکارانە بەتایبەتی.

لەم ئایەتە پیرۆزە موژدە بەخشەدا، خوای گەورە فەرموی: ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا﴾ .واتە: تەوبەکە نابێ هەرتەوبەی زمان بێ، بەڵکو کەسەکە بگۆڕێ

بەوەی ببێ بەئیمانداریێکی تەواو ڕەوشت وئیماندارانە. وە کار وکردەوەکانی پێشوی بەتەواوی (سەد وهەشتا پلە) بگۆڕێ لە خراپەوە بۆ چاکە. وەکو تازە لەدایك بـوبێ ئاوا بگۆڕێ وژیانێکی پاکو خاوێن وسپی دەست پێ بکاتەوە.

هەر بۆیە کەدەوترێ تەوبەکار هەروەکو منالّی تازە لەدایك بووی لێ دێ، بـەمانای ئەوەیە سەرلەنوێ ژیانی دەست پێدەکاتەوە بەلاّم لەچاکە وعەمەلی صالّح دا.

**کـە زانایـانی ئیسـلام بـەم حالّەتـە دەلّـێن:** (تَخْلِيـــة) و (تَحْلِيَـــة). تەخلیـە واتە: بەتالّکردن. تەحلیە واتە ڕازاندنەوە وجوان کـردن، بەنمونەیـەکی سـادە باشـتر ڕونی بکەینەوە: ئەگەر پەرداخێك پڕبێـت لـەقوڕاوو بۆگـەنی. بتـەوێ شـەربەتێکی بەتام وبۆن خۆشی تێ بکەی، بێگومان دەبێ پێش هەموو شتێ قـوڕاو و بۆگەنەکـە بڕێژی وپەرداخەکە خالّی بکەی، کەئەمە پێ ی دەوترێ (تَخْلِيَة). پاشان بیشـۆی — کەئەمەش ئاوی ئیمانە (وَءَامَنَ) ئەمجا کردەوەی جوانی بخەیتـە شـوێنی، کـەپێ ی دەوترێ (تَحْلِيَة).

**هاوەلّی ئازیز وخۆشەویستی هەموو ئیمانداران (ئەبو هورەیرە):**

بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: شەوێکیان ئافرەتێك هات بۆ لام ووتی: ئەی ئەبو هورەیرە من هاتوم بۆلای تۆ، بۆئەوەی پرسیارێکت لێ بکەم.

چونکە تۆ زۆر لەخزمەت پێغەمبەری خوا ماویتـەوە وشـارەزاییەکی باشیشـت لـە قورئان هەیە منیش ووتم: فەرموو پرسیارەکەت بکە.

ئافرەتەکە ووتی: (إِنِّي زَنَيْتُ، وَوَلَدْتُ، وَقَتَلْتُهُ فَهَلْ لِي مِنْ تَوْبَةٍ؟!). واتە: بەڕاسـتی من زینام کردوە و لەو زینایە منالّم بوە ومنالّەکەشم کوشتوە بـۆ ئـەوەی کارەکـەم

ئاشكرا نەبێت. ئایا ئەگەر تەوبە بکەم تەوبەم لێ وەردەگیرێ وخوا لێم خۆش دەبێت؟!

منیش ووتم: دەی خوا لەناوت بەرێ، جاتازە دوای چی تەوبە دەکەی. برۆ خوا چۆن تەوبەت لێ قبوڵ دەکات، لەکاتێکدا زینات کردوە ولەوەش گەورەتر قەتڵت کردوە وکوژراوەکەش کۆرپەیەکی ساوایە!! ئافرەتەکە بەگریانەوە ڕۆیشت.

منیش بۆ نوێژی بەیانی چومە خزمەت پێغەمبەری خوا و بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، فەرموی: ((**بِئْسما قُلْتَ، أما تَقْرَأ هذهِ الآيَة: وَالَّذينَ لايَدْعُونَ مَعَ الله إلهاً آخَرَ ....الخ**)).

واتە: بەڕاستی بەخراپترین و بەهەڵەترین وەڵام وقسە وەڵامت داوەتەوە، ئایا تۆ قورئانت نەخوێندۆتەوە وئەم ئایەتە موژدە بەخشەت دەربارەی زیناکار وبکوژان نەخوێندۆتەوە کە بەڕاستی بەدڵ دەگەڕێنەوە بۆلای خوا؟! خۆزگە ئەو ئایەتەت بۆ بخوێندایەوە ومەئیوس وبێ ئومێدت نەکردایە.

**ئەبو هورەیرە دەفەرمویٚ:** دەست بەجێ دەستم کرد بەگەڕان بەشوێن ئەو ئافرەتەدا وهەموو مەدینە گەڕام بەشوێنیدا، تا دۆزیمەوە. ژنەکە ئەوەندە گریابوو، چاوی سور ببوو. أبوهورەیرەش موژدەکەی پێغەمبەری خوای پێ ڕاگەیاند.

ئافرەتەکە گەشایەوەو ووتی: (الحَمْدُ لله الَّذي جَعَل لي مخْرَجاً) سوپاس وستایش بۆ ئەو خوایەی کە ڕێگای ڕزگاربون و پاکبونەوەی بۆ کردمەوە.

**ئەبو هورەیرە دەفەرموێ:** دواتر ئەو ئافرەتەم دەبینی. هەتا بڵێ ی خواپەرست وڕێك وپێك بوو. سوپاس بۆ خوای گەورە.

**لەم بەسەرهاتەدا کە گێڕامانەوە چەند سەرنج هەیە:**

١- خوای گەورە ولێخۆشبوو، جگە لەشەریك بۆخوا بڕیاردان لە هەموو تاوانێك بەتەوبەی ڕاستەقینە خۆش دەبێ.

٢- دەبێ کەپرسیارت لێ کرا بچیتەوە خزمەت قورئان وفەرمودەکانی پێغەمبەر وهەرلەخۆتەوە فتوا نەدەی ونەفرەت لە خەڵکی گوناهبار نەکەی. ئارەزوی خۆت لەشوێنی شەرعی خودا دانەنێیت.

٣- تۆی موسڵمان دەبێ ڕقت لەکاری خراپەکاران بێ، بەلاّم بەزەیشت پێیاندا بێتەوە وڕێنماییان بکەی بۆتەوبە ودەستیان بگری لەزۆنگاوی بۆگەنی گوناه دەریان بێنی.

٤- هەرکاتێك زانیت کەکەسێك توشی هەڵە وگوناه بوە، بۆی پەردە پۆش بکەی و ناوی نەبەی ولای کەس نەیناسێنی. هەروەکو ئەبو هورەیرە هەرگیز ناوی ئەو ئافرەتەی نەبردوە کەکێ یە وکچی کێ یە..

لەکۆتایی ئەم باسەدا. ئاماژە بە چەند شتێکی زۆر پێویست دەکەم، کە لەکۆمەڵگای موسڵمانی ئەمڕۆ.

بەتایبەتی کۆمەڵگەی موسڵمانی کوردی دا دەکرێ وئیسلام لێ ی بێ بەریە وناحەزانی ئیسلام لەسەر ئیسلامی حیساب دەکەن. **وەکو:**

١- زۆرجار کەزینا ئاشکرا دەبێ، ئافرەتەکە دەکوژرێ وپیاوەکە صوڵحی عەشایەری بۆ دەکرێ، کەبەحوکمی شەرع ئەگەر بڕیاربێ بکوژرێن – کە ئەمەش مافی کەسێك نیە بانزیکترین کەسی ئافرەتەکەش بێت، بەڵکو مافی کاربەدەستی موسڵمانانە – ئەوا کاتێ بڕیاری کوشتنیان درا جیاوازی ژن وپیاوەکە نیە ودەبێ هەردوکیان بکوژرێن.

٢- زۆرجار مەسەلەی زینا بە صولّحی پارە وکچ چارەسەر دەکرێ. هەندێ جار پارە وکچێك لە صولّحدا دەدرێ وموشکیلەکە حەل دەبێ.

**پێشتر ووتمان:** ئەگەر زینا بەچوار شاهیدی پیاو یان دان پێداهێنانی زیناکـار، یـان حامیلە بوون چەسپا، ئەوا کوڕ وکچ سەد دارو (مُحْصن) ڕەجم دەکرێ.

بەلاّم صولّح کردن دروست نیە لەهەردوو صەحیحی بوخاری ومـوسلیم دا هاتوە کە: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ)، کابرایەکی تری لەگەڵدا بوو. ووتـی: کوڕەکەم لای ئەم پیاوە ڕەنجبەر بوە. لەئەنجامی زۆرمانـەوە لەگەڵیانـدا وتێکـەڵی لەگەڵ خێزانەکەیدا، زینای لەگەڵ ژنەکەی کردوە. جا پێیان ووتم: کەدەبێ کوڕەکەت ڕەجم بکرێ و بکوژرێ، منیش صولّحم بۆکرد بە (١٠٠) سەرمەڕ وکچێك. وائێستا هاتومەتـە خزمـەتت. پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرموی: کچـەکە وسـەد سـەرمەڕەکە وەرگرەوە و کوڕەکەت سەد داری حەددی لی دەدرێ. ژنەکەش ئەگەر دانی بەوە دانا کەزینای کردوە ئەوا ڕەجم دەکرێ. ئیتر ئەو صولّح ومـەڕ وکـچ لـە صـولّح دانـەدا بەتاڵەو لە ئیسلامدا شتی وانی یە.

٣- زۆرجار بەڕودانی هەڵەیـەك، وەکـو بینینـی کـوڕ وکچـێك بەیەکـەوە کەقسـە دەکـەن. یـان ڕودانـی ئـەوکردارە ناشـیرینانەی کـە ناگەنـە حـەددی زینـا، وەکـو پێشەکیەکانی زینا. بەلاّم جووت بـون ڕوی نـەداوە. هـەر بەوەنـدە کـوڕ وکچـەکە دەکوژرێن. کە بەپێ ی شەرع تەنها ئاگادارکردنـەوە و ئامۆژگـاری کـردن وتـەمێ کردنیان لەسەرەو، هەرکەس بیانکوژێ قاتڵەو بەشەرع دەکوژرێتەوە!

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾

ٱللَّهُمَّ ءَامِينَ

# سەرچاوەکان

١- العَقيدَة أَوَّلاً لَوْكانُوا يَعْلَمُونَ ، صالح طه عَبْدُالواحيد ، ج٣ ، ص,٣٧٧
٢- العَقَيدة أَوَّلاً لَوْكانُوا يَعْلَمُونَ ، صالح طه عبدالواحيد ، ج٤ ، ص,١٧٤
٣- فِقْهُ السُّنَة ، السَّيد سابق ، ج٢، ص,١٨٨
٤- ژن ومێردی ئیسلامی بەختەوەر ، نەوا محمد سعید ، ل,١٢٩
٥- ژیانی عومەری کوڕی خَطّاب ، حبیب محمد سعید ، ل,٣٧
٦- التّاج الجامِع لِلأُصُول في أَحاديث الرَّسُول ، شیخ مَنصور علی ناصف.
وەرگێڕانی: نوری فارس حمه خان ،ب٣ ، ل٧٢.
٧- ڕوناکی رَبِّ العالمین ڕونکردنەوەی (مِنْهاج الطّالِبین) ، م.عبدالله عَبْدُالعَزیز هەرتەلی ب٤، ل,١٧٩
٨- كَبائِرُ الذُّنُوب ، یوسف الحاج أحمد ، ص١٦٧.
٩- گۆڤاری: چرای ڕوناکی ژمارە: ٢٨ ، ل,٤٦
١٠- هەفتەنامەی: (پەیام) پەیامی یەکیەتی زانایانی ئاینی ئیسلامی کوردستان.
ژمارە:٦٠ لە ٢٢/١٢/٢٠١٠ دەرچوە ، ل,٥
١١- هەفتەنامەی: (دەستور) ژمارە: ٦٠ لە ٨/١٢/٢٠١٠ دەرچوە ، ل,١٨
١٢- گۆڤاری (پزیشك) وەزارەتی تەندروستی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەری دەکات ژمارە: ٤ کانونی یەکەمی (٢٠١٠).
١٣- دین وژین ، فاتح مەلا رسول شارەستێنی ، ل٤١٠، ل٤٠٨.

# ووتاری یەکەم

# بۆ مانگی رَبيعُ الأَوَّل

## یادی لەدایک بونی پێغەمبەری

## خۆشەویستمان (صلى الله عليه وسلم)

بەشی یەکەم

**الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجمعين.**

**ئیماندارانی بـەڕێز:** بێگومـانم هـەموتان دڵخـۆش وشـادمان وچاگەوشـن بـەوەی کەئەمسالّیش گەیشـتینەوە بەخزمـەت مـانگی مـەولود ولـەدایك بـونی فـەخری کائینـات، سـەرداری هـەموو پێغەمبـەران — نـوری چـاومان ڕێگانیشـاندەرمان، شەفیعی مەحشەرمان — حەزرەتی محمد (ﷺ).

دەی بازۆر بە ئەدەبەوە، بەدڵ گوێ بگرین لە هەندێ لە گـەورەیی و ڕەحمـەتی ئـەو رَحْمَةً لِلْعـالَمينَ بـابێین دوای سـوپاس وستایشـی خـوا، وەڵامـی بانگەوازەکـەی پـەروەردگارمان بدەینـەوە کەفەرمویـەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾ الأحزاب: ٥٦

**لەمانگی مەولودی (رَسُولُ اللهِ) دا ڕوو لەڕوحی هەمیشە زیندوی دەکەین ودەڵێین:**

ئەی کەسێ کەوا دیدارت بەندە بەعەرشی ئەعلاوە.

لـــە پشتی قابە قەوسەینا، جوبرەئیلت جێ یەلاّوە.

لـە ئەدنا ولامەکـــانـــا ڕووت لەزاتی خودا نـاوە.

لـە بەهەشتی نـەبڕاوەدا کـەوسەرێکت پێ دراوە.

بـــە نوری پێغەمبەریەتیت چـاوی بونەوەرکراوە.

نەهەر ئەمڕۆ لەئینجیلا موژدەی هاتنت دراوە.

**ئیمانداران:** ئێمە لەخزمەت کەسێکداین، ئەگـەر بتـەوێ بیناسـی، ئـەبێ بچـیتە خزمەت قورئان ولە قورئانەوە بیناسی. بۆنمونە:

- لەڕوی بڵندی پلەو پایەی — مەعنەوی — پێغەمبەر (ﷺ) لەلای خوای گـەورە، خوای باڵادەست لە (٢١٥) جێگەی قورئاندا، ناوی بەرزی پێغەمبەری، لەگەڵ ناوی

خۆیدا هێناوە تەنانەت هەندێ جار هەڵس وکەوت وبڕیار وفەرمانی پێغەمبەری، بەفەرمان وئەمری خۆی لەقەڵەم داوە. وەکو دەفەرموێت:

- ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَۖ﴾ النساء: ٨٠

- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ﴾ الفتح: ١٠

لەلایەکی ترەوە، بۆناسین وبەدیارخستنی کەسێتی پێغەمبەر (ﷺ) قورئان وێنەیەکی ترمان پێشکەش دەکات، خوای گەورە پاش دروست کردنی ئاسمانەکان وزەوی، بۆ ڕونکردنەوە ورەواندنەوەی تاریکیەکان مانگ وخۆریشی دروست کرد. هەروەك دەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ تَرَوۡاْ كَيۡفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗا ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ ٱلۡقَمَرَ فِيهِنَّ نُورٗا وَجَعَلَ ٱلشَّمۡسَ سِرَاجٗا﴾ نوح: ١٥ ـ ١٦

دەبینین وەصفی نوری داوەتە پاڵ مانگ و وەصفی **سِراج** – چراشی – داوەتە پاڵ خۆر، بەلاَم کەباسی پێغەمبەر (ﷺ) دەکات. کەرێنما وروناکی یە بۆ دڵ ودەرون وسەرجەم تاریکیەکانی شەوەزەنگی نەفامی ونەزانی ڕادەماڵێت، هەردوو وەصفی (نور + سِراج) دەداتە پاڵ پێغەمبەری خۆشەویستمان، هەروەك دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا﴾ الأحزاب: ٤٥ ـ ٤٦

لەبەربێ سنوری ڕێزت نازانم لەکام لاوە دەس – بکەم بەباسی گەورەییت ئەی خۆشەویستی فریاد ڕەس ، نرخی تۆ لەکوێ دەزانین ئێمەی شوێن کەوتەیی هەوەس – مەردی مەیدانی پێناسەت مەگەر سەعدێکی نەورەس ، لە ڕۆژی ڕەستا خێزا لەژێر ئالاَت دابێ هەرکەس – بێگومان لەفیردەوسی بەرزا خەلاَتی گەورەی کراوە.

بەڵێ هەر لەخزمەت قورئانداین، ئەچینە خزمەت حەزرەتی ئیبراهیم، کام إبراهیم؟! ئەو ئیبراهیمەی لەبەرخوا خرایە ئاگرەوە. ئەو ئیبراهیمەی کەلەبەر فەرمانی خوا ئامادەیی دەربڕی کەبەدەستی خۆی تاقە کوڕەکەی سەربڕێ. ئەو ئیبراهیمەی

لەبەرخواژنێکی گەنج ومناڵێکی مەلۆتکەی تاقانەی لەبیابانی عەرەبستانی بێ ئاوو ئاوەدانی دا بەجێ هێشت!

بەڵێ ئەو حەزرەتی ئیبراهیمە لەدەربڕینی ڕازو نیازێکی لەگەڵ خواوەندا داوا دەکات ودەفەرموێ: ﴿وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ﴾ الشعراء: ٨٤

واتە: خودایە داوات لێ دەکەم کەزمانی نەوەکانی داهاتوم بەڕاستگۆیی بۆ بخەیتەکار، هەردەم یادم بکەنەوە وبەخێر باسم بکەن وناوم بهێنن!.

خوای گەورەش داواکەی وەرگرت وفەرموی: ﴿وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ لِسَانَ صِدۡقٍ عَلِيّٗا﴾ مریم: ٥٠

ئەوەتا ڕۆژانە بەبەردەوامی لەنوێژەکانماندا هاوکات لەگەڵ درود ناردن بۆ گیانی پاکی پێغەمبەر (ﷺ) درودیش پێشکەش بەگیانی حەزرەتی ابراهیم دەکەین. وە ساڵانە بەقوربانی کردن یادی ابراهیم واسماعیل دەکەینەوە، کەواتە: حەزرەتی ابراهیم بۆخۆی داوای لەخوای گەورە کرد کەناوی بەرز بکات. بەلاّم حەزرەتی محمد المصطفی (ﷺ) بەبێ ئەوەی داوا لەخوا بکات کەناوی بەبەرزی بێڵێتەوە خوای گەورە خۆی موژدەی پێ دەدا ودەفەرموێ: ﴿وَرَفَعۡنَا لَكَ ذِكۡرَكَ﴾ الشرح: ٤

ئەگەر کەمێك بەوردی وسەرنجەوە لەم ئایەتە پیرۆزە بڕوانین، دەبینین کەچۆن خوای گەورە ناوی پێغەمبەری (ﷺ) لەگەڵ ناوی خۆی دا هێناوە وپێنج فەرزەی نوێژیش لەهەموو دنیادا ناوی پیرۆز وبەرزی پێغەمبەری ئاخرزەمان دەوترێتەوە.

توێژینەوەیەك دەری خستوە کە: بەپێ ی جیاوازی کات وشوێنەکان لەهەر (چوار) خولەکدا بانگێك دەوترێت، بەم پێ یەش شەو وڕۆژ ناوی پیرۆزی محمد (ﷺ) لەگەڵ ناوی پیرۆزی (الله) دا، هەردەم وەك ئەستێرەی ئاسمان دەدرەوشێتەوە.

سوپاس بۆ خوای گەورە هەرلەوکاتەوە نور وبەرەکەتی ئیسلام گەیشتە ئەم کوردستانە، بۆیەك ساتیش ناوی پیرۆزی محمد (ﷺ) بێ نازنەبوە، بۆیە جارێکی تریش موژدە بە پێغەمبەری خۆشەویستمان دەدەینەوە ودەڵێین:

مۆژده قوربان، تازه ئێمه ناتوێینه‌وه.
ناوت ئاوێته‌ی گشت خاکی کوردستانه.
زیاتر له‌بالآی حه‌سارۆست
ناوت به‌رزه.
له‌ده‌ریاچه‌ی (وان)یش قوڵتر
ڕه‌گ وڕیشه‌ی په‌یامه‌که‌ت
چه‌قیوه‌ته ناوئه‌م ئه‌رزه.
(وه‌نه‌وشه) و (نێرگز)ی نازدار.
(دارگوێز) و (داربه‌ڕوو)ی بنار
چیای قه‌ندیل
(زرێبار)ی سه‌راپاشین
هه‌رودك ئێمه
تۆی دڵسۆز ومیهره‌بانیان
زۆر خۆش ده‌وێ.
پێنج فه‌رزه‌ی نوێژ به‌تاسه‌وه
گوێ ڕاده‌گرن
تابه‌ناوی دڵسۆزترینی مرۆڤان
(محمد)ی زۆر خۆشه‌ویست.
تینوێتی خۆیان بشکێنن.
واچوارده سه‌ده‌ی ڕه‌به‌قه
ناوی پیرۆزی تۆ قوربان
چونکه ده‌ریایه‌کی مه‌نگی
سۆز ومیهره‌بانی وحه‌قه.
ئه‌م خاکه‌مان ئاو ده‌دێرێ و
ده‌یخوسێنێت
کام تاشه به‌رده‌ی زۆر ڕه‌قه.

**ئیمانداران:** فه‌رمون باچه‌ند لاپه‌ڕه‌یه‌ك له‌مێژوی ژیـانی ئـه‌و پێشـه‌واو چاوسـاغه‌ی دونیا وقیامه‌تمان هه‌ڵبده‌ینه‌وه... ئه‌چینه شاری مه‌ککـه وسـاڵی (٥٧٠)ی زاینـی یه. له ماڵێکی بچکۆله‌دا مناڵێك له‌دایك ده‌بێت. به‌ڵام سه‌ره‌ڕای نه‌داری ماڵه‌که،

کۆڵەکەی ماڵەکەش دیار نیە کەباوکی پێغەمبەرە، چونکە کە محمد (ﷺ) تەمەنی (٣) مانگ بوو لەسکی ئامینــە خــاتونی دایکــی دا، بــاوکی چــوو بــۆ بازرگــانی ولەگەڕانەوەدا لەمەدینە لای ماڵی خاڵەکانی لایدا ولەویٚ نەخۆش کەوت و وەفــاتی کردو لەمەدینە نێژرا.

(سُبْحانَ الله)، سەیری نەخشەی خوایی بکە، با کاتیٚ پێغەمبەری خوا (ﷺ) چــوە مەدینە. دوای (٥٣) ساڵی تر، پێشینەیەکی لەوشارەدا هەبیٚ وکــەمیٚ لەغــەریبی یەکەی کەم بکاتەوە. ئەویش بونی ماڵە خالآنی باوکی وگۆڕی باوکیەتی!!

**زانایان دەڵێن:** بەرزترین پلەی هەتیوی ئەوەیە، باوکەکــە بمــریٚ ومناڵەکــە هێشــتا لەسکی دایکی دابیٚ، دوای لەدایك بونی محمد (ﷺ) ، قورەیش عادەتیــان وابــوو، مناڵیان ئەدا بەدایەن بۆئەوەی لەژینگەی پاکی بیابان دا بەخێوبکریٚ وجوڵە وگەشە بکات وزمانی ڕەوان فێربیٚ، بەڵام هەموو کەسی بیابان نشــین بەکــەڵکی ئــەوکارە نەدەهات، کەببێتە دایەنی مناڵ.

بەڵکو هۆزی (بەنی سەعدی)یە، ئەم کارەیان دەکرد، قورەیش تەنها مناڵیان ئەدایە ئەوان، ماوەی دوو ســاڵ لــەلایان دەمایــەوە. لەبەرامبــەر پــارە وهــەروەها دیــاری کەلەلایەن باوکی مناڵەکەوە پێشکەش بەدایەنەکە دەکرا.

ئەوساڵە کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) لەدایك بوو، دایەنەکان ڕوویــان کــردە مەککــە وهەموو بەدوای مناڵی دەوڵەمەندا دەگەڕان. هەموو مناڵــەکان هــەڵگیران تــەنها یەك مناڵ لەهەموو مەککەدا مایەوە کەس ئەدایەنەکان لەبەربیٚ بــاوکی وهــەژاری ودەست کورتی بنەماڵەکەیان هــەڵی نــەگرت، ئەومناڵــەش ســەرداری مرۆڤایــەتی حــەزرەتی ((محمــد)) بــوو. کۆتــا ئــافرەت کەبــەهۆی خــراپ ڕۆیشــتنی حوشــتر وگوێدرێژەکەیانەوە گەیشتنە مەکە ناوی (حەلیمەی سەعدی)یە بوو. ئــەم ئافرەتــە خۆی مناڵەبەر بوو، منــاڵێکی کوڕی ساوای بەرمامکانەی هەبوو، چــونکە حەلیمــە هەژار ونەدار بوو. نەیتوانی بوو خواردنێکی باش بخــوات، شــیری کــەم تێــدا بــوو.

هەربۆیە ئەومناڵەی خۆی شەو هەتابەیانی دەنگی گریانی دەهات وتێری لەشیر نەدەخوارد. هەربۆیە حاریسی مێردی حەلیمە لەپەستی وتورەییدا ووتی: ئەی حەلیمە باشە بەم حاڵەوە چۆن منالی خەڵکی وەردەگری؟! حەلیمەی نەرم ونیان فەرموی: ئەوە برسیمە بۆیە شیرم تێدا نیە، خۆئەگەر منالێکی ماڵە دەوڵەمەندێکم دەست بکەوێ وپارە ودیاری زۆرم بدەنێ ومنیش خۆم تێربکەم، ئەوکاتە بزانە چۆن بەئاسانی دوو منالم بۆ تێردەکرێت! بەلاّم هەرزوو ئافرەتە دایەنەکان لەگەڕانەوەیاندا توشی حەلیمە بوون، هەواڵی ئەوەیان دایە کەبگەڕێیتەوە باشترە، چونکە هەرچی منالی ماڵە دەوڵەمەندەکانە هەڵمان گرتۆتەوە وتەنها یەك منالی هەتیوی بێ باوك ماوە کەناوی محمدە، ماڵەکەیان زۆر هەژارن کەس وەری نەگرت!!

**حەلیمە دەڵێ:** کەئەوەم بیست زۆر دڵتەنگ بوم. چاوم پڕبوو لەفرمێسك، بەزەییم بەخۆمدا هاتەوە، بەلاّم پێم عەیب بوو کەبەدەستی خالّی بگەڕێمەوە، بۆیە چومە ناو مەککە ولەبەر دڵنیابونم لەوەی کەهیچ منالێك نەماوە بۆ وەرگرتنی، ڕاستەوخۆ ڕوم کردە ماڵی منالە هەتیوەکە کاتێ چومە ماڵەوەیان زۆربەگەرمی وحورمەتەوە پێشوازیان لێ کردم ومنالەکەیان نیشاندام. هەرکەچومە سەری وتەماشای کردم، زەردەخەنەیەکی بەودەم ولێوە جوانەی بۆ کردم. ڕەحم وبەزەییم چوە سەری و وەختێکم زانی هەردوو مەمکم خەریك بوو بتەقێ لەشیردا مەمکی ڕاستم دایە وخواردی. مەمکی چەپیشم خستە دەمیەوە، بەلاّم دەمی بۆ نەبرد بۆ برا شیریەکەی هێشتەوە.!! حاریسی هاوسەری حەلیمەش چوو بوو بەلای حوشترە لاتەکەیانەوە، کەلەبەر لاوازی وبرسیەتی شیری تێدا نەبوو، بەلاّم ناچاری پالّی بەحاریسەوە نا کەبچێ بیدۆشێ، بەئومێدی ئەوەی چەند دڵۆپە شیرێکی تێدابێ، بەلاّم گەورەیی هەربۆ خوایە، کاتێ سەیری کرد، واحوشترەکەیان خەریکە گوانی لەشیردا ئەتەقێ!!.

بەپەلە چوو بۆلای حەلیمە ووتی: ئەی حەلیمە ئەم منالە وەرگرە. دڵنیـام دەبێتـە مایەی خێر وبەرەکەت بۆمان!

**سەرنج بدەن ئیمانداران:** جاری واهەیە خوای گەورە لێت دەگرێتەوە، بۆئەوەی شتی باشترت پێ ببەخشێ. وولاخی سـواری چوسـت وچـالاك وباشـی لـەماڵی حەلیمـە گرتـەوە. بۆئـەوەی درەنـگ بگـەن ومنالـە دەوڵەمەنـدیان دەسـت نەکـەوێ وئـەو بەرەکەتی دونیا وقیامەتە بۆ ئەوان بێ.

**کەواتە:** بامانگی مەولود، مانگی دڵخۆشی بـێ بـۆ هـەموان بەگشـتی وهـەژاران ونەداران ودڵتەنگەکان بەتایبەتی. دڵنیابە هـەرکاتێ خـوای گـەورە بـە حیکمـەت وکاربەجێ ی خۆی توشی دڵتەنگی وغەم وپەژارەی کردی، خـوای گـەورە بەدوایـدا توشی خێر وخۆشیت دەکات، بەمەرجێ ناشکوری نەکەی وئارام بگری.

ئەوەتا حەلیمەی سەعدیە توشی چ خێر وبەرەکەتێکی گەورە بوو:

**١- خێری دنیایی ومادی،** مەمکی پڕبـوو لەشـیر، حوشـترەکەیان گـوانی پڕبـوو لەشیر، بیابانی ووشك وبێ ئاویان بۆشین بوو. فەلاحەت ودانەوێڵەیان بەبەرهەم بوو. منالە گرینۆکەکەی چـاك بـوو. ئـیتر هـیچ نـەدەگریا وئـازاری نـەدەدا، تەنانـەت ئاژەڵەکانیان لارە ملێ یان نەدەکرد.

**٢- خێری مێژوویی:** سەیرکەن مێژوو بەفەخرەوە، لەگەڵ ناوی محمد المصطفی(ﷺ) ناوی (حەلیمە)شی تۆمارکردوە. هیچ کتێبێکی (سیرە) نیە نـاوی حەلیمـەی تێـدا نەبێ.

بەڕاستی هەرخوا دەتوانێ ناوت بەرز بکات، ئەو هەموو دایەنەی ناوبەنی سـەعدیە یەك دانەشیان ناوی لەمێژوودا تۆمارنەکراوە، کەچی حەلیمەی هەژار وبێ نان وبـێ ئاوو گومناو کەبەزەیی بەخۆیدا دەهاتەوە وبۆحاڵی خـۆی دەگریـا، هـەتا قیامـەت ناوی زیندوە.

**٣- خێری قیامەت:** حەلیمەی سەعدیە لەڕۆژی قیامەتدا، لەخزمەت پێغەمبەری خوادا دەبێت وپێغەمبەری خوا (ﷺ) بەردەوام لیّ ی نزیك دەبێت:..

حەلیمە دەفەرموێ: محمد (ﷺ) زۆر بەخێرایی گەورە دەبوو، ئەوەی منالێك بەمانگێك گەورە دەبێ، محمد بەیەك ڕۆژ ئەوەندەی زیاد دەکرد، ئەوەی منالێك لەماوەی ساڵێکدا کەشەی دەکرد، محمد بەمانگێك ئەوەندە گەورە دەبوو، هەرزوو قاچی گرت وڕۆیشت، زۆر لەتەمەنی زوودا فێری قسەکردن بوو.

**کەواتە:** بەهۆی ئەم زوو گەورە بونەوە، هەرزوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەستی کرد کەباوکی مردوە، هەرزوو هەستی کرد کەمنالێکی هەتیوە، چونکە بۆ ساتێکیش ئامێزی باوکی بەخۆیەوە نەدی. ووشەی (بابە) بەدەمیا نەهات.

بەڵێ لەدوا دوو ساڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەماڵی حەلیمەوە گەڕایەوە ماڵی دایکی، تاتەمەنی (شەش) ساڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەباوەشی دایکی دا بوو، دایکی لەشوێنی باوکیشی بوو. کەپێغەمبەر تەمەنی بوو بەشەش ساڵ دایکی بردی بۆ شاری یەثریب (مەدینە) بۆسەردانی گۆڕی باوکی وناسینی ماڵی خاڵوانی باوکی، پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ دایکی زۆر لەسەر گۆڕی عَبْدُاللّٰه ی باوکی گریان. دوای سەردانەکە گەڕانەوە بۆ مەککە، بەڵام لەڕێگادا لە (أَبْواء) کە (١٥٠)کلم لەمەدینەوە دوورە. لەو بیابانەدا کەهیچ ئاوەدانی لیّ نی یە. ئامینە نەخۆش کەوت ولەوسەحرایەدا لەبەرچاوی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) کەتەمەنی شەش ساڵ بوو وەفاتی کرد وخزمەتکارەکەیان کەناوی (أُمُّ أَيْمَن) بوو. چاڵێکی بۆ هەڵکەند وناشتی. پێغەمبەری خوا ئەگریا وتەماشای ڕۆح دەرچون وبەخاك سپاردنی دایکی دەکرد. بەڵێ بەشەش ساڵی دیمەنی مەرگ وقەبری بینی. گۆڕی باوك ودایکی لەوتەمەنەکەمەدا بەچاوی خۆی بینی وبرینی باوکیشی لەسەر دڵی کولایەوە. وەکاریگەری مردنی دایکی زۆر بوو لەسەری. چونکە لەبەرچاوی خۆی مرد.

ئەگەر لەئاوەدانی دا بمردایە ئەهوەن تر دەبوو. چونکە نەیاندەهێشت ئەو منالە چاوی لەمردنی دایکی بێ، جا بێگومان ئەو دیمەنانەی کەدێنە بەرچاوی منال لە تەمەنی (٥ - ١٠) ساڵی هەرگیز لەبیرناچنەوە وتامردن لە یادی دەمێنن.

ئەوە بوو دوای چەندین ساڵ لەفەتحی مەککەدا سەردانی گۆڕی دایکی کرد وئەوەندە گریا هەتا هەموو ئەوانەی لەخزمەتیدا بون دەستیان کرد بەگریان.
بەڵێ پێغەمبەری تەمەن (٦) ساڵ لەگەڵ (أُم أَيْمَن) گەڕایەوە بۆ مەککەو تەسلیم بەباپیری عَبْدُالْمُطَّلّب کرا. عَبْدُالْمُطَلِب تەمەنی (٩٠) ساڵ بوو. محمدی زۆر خۆش دەویست. عَبْدُالْمُطَلِب پیاوێکی بەهەیبەت بوو. سەرۆکی قورەیش بوو. لەپەنای کەعبەدا جێگایەکی تایبەتی بۆ ڕادەخرا کەس بۆی نەبوو لەسەر ئەوجێگایە دابنیشێ. تەنانەت کوڕەکانی خۆشی، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە تەمەنی (٦) ساڵان بوو دەچوو لەتەنیشتیەوە دادەنیشت وعبدالمطلب نەیدەهێشت کەس دەری بکات، بەڵام محمد بەپێچەوانەی هەموو منداڵێکی بێ دایك وباوك ونازکێشراو، لەوتەمەنەدا کەبەردەوام وڕکی هەیە وجوڵە جوڵ دەکات ودەگری و داوای شت دەکات. زۆر بەئەدەب وبێ دەنگیەوە لەتەنیشت باپیریەوە دائەنیشت وگوێ ی لەوقسە وباسانە گرت کەگەورە پیاوانی مەککە لەگەڵ عبدالمُطلب دا ئاڵوگۆڕیان دەکرد دەربارەی بابەتە کۆمەڵایەتی وسیاسی وئابوری وبازرگانی و هەواڵی شار وهۆزەکان.
**کەواتە:** خوای گەورە وکاربەجێ بۆیە خستیە لای باپیری تا لە تەمەنی (٦بۆ٨) ساڵی دا دەرسی بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات ومیللەت بەکرداری (عەمەلی) ببیستێ وبخوێنێ!!
جا کاتێ عبدالمطلب ئەبینێ کەمحمد یاری ناکات وزۆر بەجوانی گوێ بۆ قسەکانیان شل دەکات زۆر دڵخۆش دەبوو، دەیگوت: ئەم کوڕە داهاتویەکی زۆر گەورەی دەبێ!!

ئێستا محمد (ﷺ) تەمەنی (هەشت) ساڵانەو بۆخۆی بوژاوەتەوەو لە پەنای باپیری دا ژیانێکی خۆش بەسەر دەبات. بەڵام لەناکاو جارێکی تر خۆشیەکانی لێ تێك چون. ئەوەبوو ڕۆژێکیان کەلەدەشت بوو، لە گەڕانەوەدا بینی خەڵکی دەوری ماڵی باپیریان داوە

**مامۆستا (ئەحمەدی موفتی زادە):**

لەمەولود نامەکەیدا باسی ئەم دیمەنەمان بۆ دەکات ودەفەرموێ:

- دەی خۆ محمد هەتیوە وبێ کەس — لەجێ ی هەموو کەس باپیرێکی هەس.

دڵی چکۆلەی بەئەو قەوی بوو — هەموو تەمێکی لەدڵ ڕەوی بوو

ڕۆژێکیان ماندوو، هاتەوە بۆ ماڵ — دەس و پای وردی پڕ لەدڕك و داڵ.

یەکڕاس، هەڕای کرد بەرەو لای باوا — دەس کاتە ملی، مانیەتی لاوا.

لەباتی بزەو پێشوازی باپیر — (ئۆخەی) و (ڕۆڵە) پڕنازی باپیر.

لەدوور دەنگی شین،دڵی کردبێ تین — چون باش دەیزانی مەعنای دەنگی شین.

چەند مناڵ بەرەو پیری ڕایان کرد — ووتیان محمد خۆ باپیرت مرد!!

دەردی محمد دیسان دیویاوە — زامی کۆنە ونۆ وهەوی کولیاوە...

بەڵێ، ئەمە سی یەم جارە محمد (ﷺ) هەتیوو بێ ناز بکەوێ، لەسکی دایکی دابوو باوکی مرد. لە شەش ساڵی دابوو دایکیشی مرد، لە هەشت ساڵی دا باپیریشی مرد. چەند جار ژیانی لێ گۆڕا لەمەککەوە لەلای دایکی بۆ بیابان بۆلای حەلیمە. هێنانەوە بۆ مەککە بۆلای دایکی پاشان بۆ ماڵی باپیری. (هەریەکە لەم ماڵانە شێوازی هەڵس وکەوتیان جیاواز بوو).

ئێستا پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەمەنی (هەشت) ساڵە.

کەم هەبوە برینێکی سارێژبێ برینێکی تر لەدڵی نەبێ. چاوی هەر پڕ لەگریان بــوو. کەفامی کردەوە بۆ حەلیمەی سەعدیە گریا. چــونکە دووســاڵ شــیری لێ خــوارد و لــەئامێزیا بــوو. کەچوشــەوە بــۆلای دایکــی بەبــەردەوام باســی بــاوکی دەکــرد.

مامۆستای (موفتی زادە) دەفەرموێ:

جار جار مات ئەبوو بیرئەیبردەوە — لەهەتیوی خۆی بیربیەکردەوە.

لــەبەرخۆیەوە ئەیوت: ئــاخ بریــا — بــاوکم نەچوایە وازوو لەدنیا.

خۆزگە ئەمزانی بزەی باوك چۆنە — تورەیی چلۆن، نــازی چلۆنە.

جار جاریش ئەیوت، ئاخ توخوا دایە — چەند خۆش بوو، جارێك باوکم بدیایە.

توخوا دایە گیان بۆچی ئاوا زوو — بــابە گیانەکەم، جوانــە مــــەرگ بوو.

بەڵام ئەوەی تۆزێك خەمی بێ باوکی لەسەر سووك دەکــرد، باوەشــی دایکــی بــوو، ئەویش لەشەش ساڵی دا وەفاتی کــرد. باوەشــی سۆزی عبــدالمطلبیش دوو ســاڵی خایاندو هێشتا فرمێسکی بۆ دایکی لە چــاوی ووشــك نــەبو بــوو، کــە گریــان بــۆ باپیرەیشی هاتەسەر.

لێرەدا پرسیارێك ڕوو لەمێشکی هــەمومان دەکــات ویەسەرســوڕمانەوە دەپرســین: باشە بۆچی خوایە گیان، بۆچی خۆشەویسترین کەس لەلات محمدە (ﷺ) ئاوای لێ بەسەردێ؟ بۆ نابێ دڵخۆش بێ؟! بۆنابێ چاوی لە فرمێسك خاڵی بێ؟!

ئایا بۆ خوای گەورە هیچی تێ دەچێ کەئەمری بفەرموایە: محمــدی نــازدار لەســەر خۆشترین ژیان مناڵی بەسەر ببردایە؟! (حاشا لله) هەرگیز خوای گــەورە نایــەوێت ئازاری خۆشەویستەکەی بدات. **بۆ وەڵامی پرسیارەکەش دەڵێین:**

موسڵمان دڵنیایەو بێ گومانە کەهیچ کارێکی خوا بێ حیکمەت نی یە.

**هەندێ لەو حیکمەتانە:**

١- محمد (ﷺ) دەبێ بە سەرداری پێغەمبەران وپێشەوای هەموو مرۆڤایەتی و بونەوەر. بۆیە دەبێ زۆر بەتەواوی ئامادە بکرێ، ئەوکارە گەورەش بەمرۆڤی بەناز پەروەردە ناکرێ. ژیانی زبرە کەپیاوی گەورە دروست دەکات..

ئەبێ (محمد) هەربەمناڵی لەحەقیقەتی ژیانی دونیا تێ بگات کەچۆن زوو کۆتایی دێت ونابێ دونیا بکرێ بەهەدەف وئامانج، بەڵکو دەبێ بکرێ بەوەسیلە بۆ خزمەتی دین ئەمەشی لەوەدا بۆ دەرکەوت کەچۆن لەناکاو باوکی جوانە مەرگ بوو. ئەی چۆن دایکی کتوپڕ مرد!! ئەی باپیرەی خۆئەو هەموو حورمەت ودەسەڵات وتەمەنە زۆرەشی هەرلەمردن ڕزگاری نەکرد! کەواتە: زۆرچاك تێ گەیشت وبەچاوی خۆی بینی کەژیان ومردن بەگەنجی وپیری نی یە وهەردەبێ دونیا بەجێ بێڵین.

بۆیە کاتێ کەبوو بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەیفەرموو: دەمێکە حەقیقەتی دونیام بۆ دەرکەوتوە. (مالي وَالـدُّنيا). چاك لەدنیا تێ گەیشتبوو. کە نەدەوڵەمەندی، نەهەژاری نەپلە وپایە ودەسەڵات هیچی تاسەر نی یە. بۆیە ڕۆژێ لەڕۆژان دونیا نەیتوانی بیخەڵەتێنێ.

جاری واهەبوە ئەوەندە دەوڵەمەند بووە، پڕی نێوان دوو شیوی مەڕ وحوشتر هەبوە، کەچی کاتێ کەسێك هاتۆتە خزمەتی وعەرزی کردوە. قوربان ئەوە هەمووی هی تۆیە ؟! فەرمویەتی: بەڵێ، ئایا حەزت لێ یەتی؟! وتویەتی: بەڵێ ، فەرمویەتی: دەی برۆ هەموی بۆ خۆت ببە ، کابرا هەموی پێش خۆی داوەو هەر ئاوڕێ داوەتەوە لەترسی ئەوەی کەلێ ی بسەنن‌ەوە. پاشان چۆتەوە ناو هۆزەکەی و وتویەتی: بەڕاستی محمد ئەوەندە بەخشندە وسەخی تەبیعەت ودەست ودڵ فراوانە، لەکەسێك دەچێ کەهەرگیز لەهەژار کەوتن نەترسێ!

هـەرواش بـوو. ئەوەنـدە متمانـەی بـەخوای گـەورە هـەبوو، هـەرگیز لەهـەژاری نەدەترسا.

- بەڵێ چەرمە سەری دونیا وەکو خوێندگایەك وابوو بۆی. وانەی بـەزەیی هاتنـەوە بەهەتیوو هەژاردا تێ دا فێربببوو، هەرگیز ئەو دەسەڵاتە بـوغرای نـەدەکرد. چـاوی بەمناڵی هەتیوو دەکەوت کاتێ سـەری بـێ نـازی نـابوو بەسـنگی دایکـی یـەوە، یەکسەر هەتیوی وبێ باوکی خۆی دەهاتەوە یـاد وهـۆن هـۆن فرمێسـك بەچـاویدا دەهاتە خوارەوە:

جارێکیان کابرایەك هاتە خزمەتی کاتێ قسەی لەگـەڵ دەکـرد دەلـەرزی و ڕەنگـی تێك چوبوو لەشەرما. پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکسەر کاتی بێ لانـەیی وهـەژاری خۆی دەهاتەوە یادو فـەرموی: ((**هَوِّن عَلَيْك. إنَّما أنا إبْنُ إمْرَأةٍ كانَـتْ تأكُـلُ القَديدَ**)) براکەم مەلەرزە وئارم ولەسەرخۆبە. مـن پاشـایەکی دونیـایی نـیم، مـن کوڕی ئافرەتێکم کە لەبەر هەژاری ماڵەکـەمان گۆشـتی تازەمـان بـۆ نـەدەکڕدراو گۆشتی ووشك کراوەمان دەخوارد!!.

زۆرکەس هەیە تەمەنی دەبێتە (٣٠) یان (٣٥) ساڵ کەچی هێشتا واسەیری دونیـا دەکات، کەهەر وادەزانێ مردن نیە. هەتا لەناکاو خزمێکی خۆشەویستی دەمـرێ. ئەمجا کەبەئاگا دێتەوە کە مردن هەیە.

ئەمڕۆ ئەو هەموو سەرۆکە لەجیهاندا هەیە، چونکە هەرگیز هـەژاری وبـێ نازیـان نەبینیوە. هەرگیز دڵیـان بـۆ هـەژار وبێـسـاو ونـەخۆش نـاجولێ: خۆزگـە ئـەوەی کەپێغەمبەر (ﷺ) بە (شەش)ساڵی تـێ ی گەیشـت، سـەرکردەکانی ئـەمڕۆ لـە (٤٠) سـاڵی دا فێـری ببونایـە ودەرکیـان پـێ بکردایـە. خۆزگـە سیاسـیەکانمان بیانزانیایە ژیانی دونیا کورتە ومـردن لـەناکاودێ وهـەموو ئـەوەی شـانازی پێـوە دەکەی لێت دائەبڕێ.

٢- خوای گەورە پێغەمبەرەکەی خۆی هەتیو خست، جار لەدوای جار، بۆئەوەی پشت بەهیچ مەخلوقێ نەبەستێ. بەڵکو پشت وپەنای تەنها خوای (رَبُّ العَالمين) بێ، وە تاوەکو ناحەزانی لەدوا ڕۆژدا نەڵێن:

ئەو لێهاتویی وزیرەکی وئازایەتیەیی، بەهۆی پەروەردەی باوك ودایك وباپیریەوە بەدەستی هێناوە. نەخێر هەمووی لێ سەندەوە. بۆئەوەی بسەلمێ کەخوای گەورە بەتەنها بەدەستی قودرەتی خۆی پێ ی گەیاندوە.

٣- خوای گەورە بنەماڵەکەیانی هەژار خست، تاکەس نەڵێ بەهۆی سەروەت وسامانی باپیریەوە محمد پێگەیشتوە، نەخێر یەك درهەمیشی لەباوك وباپیریەوە دەست نەکەوت. خوای کاربەجێ عبدالمُطلب ی توشی تاقیکردنەوەیەکی سەخت کرد. کە هەرچی ماڵی هەبوو ڕۆی. بۆئەوەی کەس نەڵێ محمد بەهۆی سەروەت وسامانی باپیریەوە دەسەلاتی پەیدا کرد. بەلام خوای گەورە هەرگیز پێغەمبەرەکەی بێ ئەنوا ناکات ودەبێ ئایەتی: ﴿ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَىٰ ﴾ الضحى:٦ بێتەدی، کە لەباوەشی باوکیشی نائومێد بوو بوو. باوەشی دایکی بۆی کرایەوە. پاشان ئامێزی حەلیمەی سەعدیە، دواتر سۆزی أُمُّ أَيْمَن، دواتر عبدالمُطَّلبْ. ئێستا عبدالمطلبیش وەفاتی کرد! پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەمەنی (٨) ساڵە ودەبرێتە ماڵی مامی أبو طالب.

کە لێرەدا بەکورتی ئەو وانەیە فێربوین. هەرچەندە شەوگار تاریك بێ و پاشان زۆریش درێژبێ، لەکۆتایی دا ڕۆژ دەبێتەوە.

**(إبْنُ عطاءالله) دەفەرموێ:** (بۆیە خوا لێت وەردەگرێتەوە تاوەکو بتداتێ) بەڵێ لەژیانماندا زۆرجار ڕوداوی دڵتەزێن ڕوی داوە. بەلام خێری گەورەی بەدواوە بووە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆیە ئەو هەموو خۆشیانەی لێ سەندرایەوە تاوەکو ﴿ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴾ خەلاتی بێ..

**كەواتە:** ئەی ئوممەتی محمد، تۆش هەرپشت بەخوا ببەستە وبڵێ: خوایە ڕازیم بەوەی بۆم بڕیار دەدەیت، کەواتە مانگی مەولود دەبێ ببێ بەبەهاری دڵەکانمان، بەهاری ژیانمان وپێمان بڵێ: ئەی ئیمانداران ئەی خۆشەویستانی محمد (ﷺ) هەمیشە گەشبین بن.

وەلەیادی لەدایك بونی پێغەمبەری پێشەوامانددا، بەدڵ وبەگیان وبەماڵ وسامان لەخزمەت پێغەمبەر دابین. لە یادی لەدایك بونی دا دەست بخەینە دەستی ئەو خۆشەویستەمانەوە. دڵنیابە هەرکەتۆی ئیماندار دەستت درێژ کرد، دڵنیابە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستت بۆ درێژ دەکات و دەتکات بە هاوەڵی خۆی. دەبا هەریەك لە ئێمە لە مانگی مەولوددا ئەم خاڵانە جێ بەجێ بکەین:

١- زۆر صلاوەتی لە دیدار بدەین. چونکە صەلاوەت لابەری غەم وپەژارەیە، بەرەکەتی ماڵە، ڕەحمەتی خوات بەسەردا دەڕژێ، خوا ناوی تۆ دێنێ لای فریشتەکانی. پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی گوێ ی لێ دەبێ و وەلامت دەداتەوە.

٢- خۆشحاڵی خۆمان دەربڕین بەوەی کەسوپاسی خوا بکەین کەئێمەی کردوە بەئوممەتی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە، بەڕاستی گەورەترین خەلاتی خوا بۆ ئێمە ئەوەیە کەلەم زەمانی پڕ فیتنە وبێ دینیەدا. پێغەمبەری پێشەوامان هەڵبژاردوە بەچاوساغی دونیا وقیامەتمان.

لەکاتێکدا هەر لە دەوروبەرماندا خەڵکانێك هەن، کەنازانن دین چی یە.

ئیسلام چی یە، پێغەمبەر (ﷺ) چی یە. تۆ لەقەبردا دەڵێ ی: وَمُحَمَّدٌ نَبِيٌّ.

ئەو دەڵێ: ها ها لا أَدْرِي ئەوە فەزڵی خوایە لەگەڵمان، دەبا لەشوکرانە بژێریدا، خۆشحاڵی خۆمان دەربڕین. بەوەی سوننەتەکانی لەناو ماڵ وخێزانماندا زیندوو بکەینەوە. سیرە وڕێبازی بخوێنینەوە دیراسەی ژیانی بکەین دڵی ماڵ وخێزان ومناڵمان خۆش بکەین. ئاهەنگی پوخت وجوان لەماڵەکانماندا ئازبدەین

لەخۆشحاڵی لەدایك بونی ئەو پێغەمبەرە چاوساغ ودڵسۆزەمان. دڵنیاشبن کەخوای گەورە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی خۆی لەکار وکردەوەی ئومەتەکەی ئاگادار دەکاتەوە. هەزاران سوپاس بۆ خوای گەورە ئێمەی میللەتی کورد مێژویەکی نورانیمان لەگەڵ سەروەرماندا هەیە.

**بۆ نموونە:** گوێ لەم ڕوداوە ڕاستەقینە بگرن، مامۆستا مەلا محمودی بێخود کە لەساڵی ١٢٩٨ی کۆچی لەدایك بوە ولەساڵی ١٣٧٥ی کۆچی وەفاتی کردوە. وەشاعیرێکی زمان پاراوو شعر ڕەوان بوە زۆر ناودارەو دیوانی شعری هەیە. دەفەرموی: شەوێکیان لەخۆشەویستی سەرداری مرۆڤایەتی دەستم کردە دانان ونوسینەوەی قەصیدەیەك ، کە بۆ ئەو زاتە دەریای مەحەبەتی سەپۆل دەدات، لە ناخمدا زۆرم ووشەی جوان و پڕواتا بەدوای یەکتردا ڕیزکرد. بەڵام ماندوبون وکەم کەرەستەیی و سەرئێشە نەیهێشت قەصیدەکە بێنمە پایان و هەروا بەقایش ومەرەکەب وکاغەزەوە خستمە ژور سەرم ونوستم.. بۆ بەیانی چومە سەر حەوزی مزگەوت بۆ گرتنی دەست نوێژ. بە ڕەحمەت بێت مامۆستا عَبْدُالله لەژور سەرمەوە وەستا و فەرموی: بێخود، پێم بڵێ ئەمشەو چیت کرد. چ کارێکت ئەنجام داوە زۆر خێر بوبێ؟!

منیش سەرم هێنا وسەرم برد، هیچم شك نەبرد کە شایستەی وەڵامەکەی بەڕێزیان بێت، بۆیە لە وەڵامیا عەرزم کرد: قوربان هیچ کارێکم نەکردوە، بەڵام بۆ دەپرسی؟ بەڕێزیان دوبارەی کردەوە: باش بیربکەوە بزانە چ کارێکت کردوە؟! ووتم: قوربان ئەم شەو قەصیدەیەکم لەخۆشەویستی ڕەسولی نازدار دانا، قسەکەم تەواو نەکرد جەنابی فەرموی: بەڵام قەصیدەکەت تەواو نەکرد، وانیە؟! سەرم سوڕما... ئەم چۆن ئەزانێ ئەمە تەنها نهێنی خۆم وخوای گەورەیە! بەڵێ بەڕاست ودروستی ووتم:

قوربان سەرم زۆر دێشا. هیلاکەت وشەکەتی نەیهێشت تەواوی بکەم. فەرموی: تەواو، ئەمەیە ناوەڕۆکی خەوەکە. پاشان بەڕێزیان فەرموی: ئەمشەو لەخەوما تۆ ئەی (بێخود) لە چۆڵەوانیەکدا وەستا بوی، وردە وردە هەنگاوت دەنا بەرەو کەسێك، ئەویش وردە وردە هەنگاوی دەنا بەرەو تۆ کەنزیك بۆوە بەنوری جەمالی وهەیئەت وهەیبەتی زانیم ئەمە (رسول الله) یە (ﷺ). زۆر لەیەکتر نزیك بونەوە. هەئەوەندەی مابوو دەست بکەنە ملی یەکتری، بەلاّم تۆ وەستایت وئەویش وەستا. هەنگاوەکان کۆتاییان هات ومنیش خۆزگەم دەخواست بگەنە ئامێزی یەکتر، بەلاّم ئەو لە ئامێزگرتنە دروست نەبوو.. خەبەرم بۆوە! ئای بێخود خۆزگە قەصیدەکەت تەواو بکردایە. ئەوسا لەخەونەکەمدا لەئامێزی خۆشەویستی خۆشەویسترین کەسی سەرزەویدا ئەمبینیتەوە!! خەوەکەی ڕای چڵەکاندم. بۆیە دوای نوێژی بەیانی دانیشتم قەصیدەکەم تەواو کرد. ئێستا ئەو موناجات و قەصیدەیە زیاتر لە (٦) لاپەڕەی دیوانەکەی گرتۆتەوە!.. خوای گەورە لێت دەپاڕێینەوە خۆشەویستی خۆت وپێغەمبەرەکەت لەناو دل ودەروونماندا بچەسپێ وبەرشەفاعەتی پێغەمبەری خۆشەویستمان بکەوین.

اَللَّهُمَّ آمِين

# سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز.

٢- گۆڤاری دوانگە. ژمارە: ٢٩، ل,٤

٣- شنەی سۆز ، جلال الدين نجم الدين ، ل,١٠

٤- گوڵستانی ئیرەم لە وەصفی فەخری عالەم ، عوسمان سەنگاوی ، ل,٣٣١

٥- السيرة النَبَوِيَّة ، د.علي محمد محمد الصَّلاوي ، ج١ ، ص٦٨، ص٧٢.

٦- مەولود نامەی کاك ئەحمەدی موفتی زادە.

٧- ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم ، ئاوات أبوبكر ، ب٣ ، ل١٦١

# ووتـاری دووەم

# بۆ مانگی رَبيعُ الأَول

# لەخزمەت پێغەمبەری خوادا ( ﷺ )

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبهِ أجمعين.

باسکردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەهەموو کات وساتێکدا، لەهەموو دانیشتن وکۆڕ ومەجلیسێکدا مایەی ڕەحمەتی خوایە. هەروەکو مەحوی دەفەرموێ:

لەزیکری ئەو دەجۆشێ ڕەئفەت و، ڕەحمەت دەربارەی هەم.
(رَئُوفٌ) هەم (رَحيمٌ) وەصفی ئەو وەك وەصفی ڕەحمانە.
خودا لەو زیکر وفیکرەم قەت نەکا غافلێ زوبان ودڵ.
هەتا غونچە دڵ و، سۆسەن زوبانی باغ وبوستانە.

**بەڕێزان:** هەندێ جار ئەوپرسیارە دەکرێ ومێشکی هەندێ لەخەڵکی پێوە مەشغوڵ دەکرێ ئەویش ئەوەیە: بۆچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەرەبە ولەمەککە لەدایك بوو؟! ئەی بۆچی لەکوردستان لەدایك نەبوو کەخاکێکی پیرۆزە بەفەرمودەی خوای گەورە لەقورئاندا کە لەوەڵامی داواکەی حەزرەتی نوح دا کە فەرموی: ﴿ وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِي مُنزَلًا مُّبَارَكًا ﴾ المؤمنون: ٢٩

خوای گەورە دەفەرموی: ﴿ وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِيِّ ﴾ هود: ٤٤ کە لەکوردستانە. ئەی بۆ لە (لوبنان) نەهات کەهەوای زۆر لەمەککە سازگارترە ودڵگیرە وشوێنێکی خۆشە؟!

**لەوەڵامدا دەڵێین:**

١- ئیسلام دینی عەرەب، کورد وفارس نیە، دینی هیچ نەتەوە وزەمینێك نیە بەتایبەت. بەڵکو دینی هەموو گەل ونەتەوە وزەمینێکی سەرئەم گۆی زەویەیە.

خوای گەورە بە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾ الأنبياء: ١٠٧ نەك تەنها لِلْعَرَب یان لِلْمُسلِمین.

یاخود دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ﴾ سبأ: ٢٨. وە **سەرنجی قورئانی پیرۆز بدەن.** یەکەم ئایەتی بە ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ الفاتحة: ٢ دەست پێ دەکات و کۆتا ئایەتیشی ﴿ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴾ الناس: ٦

**کەواتە:** خوای پەروەردگار (الله) خوای هەموو خەڵکی یە و ئاینەکەشی بۆ هەموو خەڵکی یە.

٢- ئایا بۆچی ئاینی ئیسلام لەناو گەلی عەرەبدا هات؟! چونکە لە هەموو کەس دواکەوتوتر بوون، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴾ یوسف: ٢. لەبەر ئەوەی هیچ فەلسەفەی یۆنانی وئیغریقی کاریگەری لەسەر عەرەبەکانی مەککە نەبوو.

٣- لەبەر ئەوەی ئیسلام دینی عالەمینەو پێغەمبەریش هی عالەمینە، پێویستە ئەو ئاینە لەناوەڕاستی زەویدا پەیدا ببێ. ئێستا بەزانستی جوگرافی نوێ سەیری نەخشەی نوێ ی جیهان بکە. مەککە — شوێنی لە دایك بونی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چەقی زەوی یە:.﴿ لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ وَمَنۡ حَوۡلَهَا ﴾ الشوری: ٧.

لێرەدا (أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ ) مەککەیەو (وَمَنۡ حَوۡلَهَا) هەموو جیهانە.

واتە مەککە وەکو چەقێك وایە وهەموو دنیا بەچواردەوریا بەیەکسانی دابەش بوە.

کەواتە: ئەمەش ئەوپەڕی عەدالەتی خوایە کەلەناوەڕاستی زەویدا پێغەمبەرەکەی هێناوەتە سەرزەوی بۆئەوەی فەزڵی هیچ گەل ونەتەوە وزمان وزەمینێك نەبێ بەسەر گەل و ناوچەیەکی تردا!!

٤- کاری خوا هەمووی پڕ حیکمەتەو (والله أعْلَم)، بۆیە لە مەککە لەدایك بوو، تاوەکو دووربێ لەدەسەڵاتی فارس وڕۆم. چونکە لەژێر دەسەڵاتی ئەواندا بوایە هەر زوو لەناویان دەبرد.

**کەواتە:** ئەمڕۆ لە هەموو کات زیاتر مرۆڤایەتی لەم سەردەمی جیهان گیریەدا (عەولەمە) پێویستی بەئیسلامە. چونکە مێژوی حەق و ڕاست شاهیدە، تەنها لەژێر بەیداخی ئیسلام وقیادەی پێغەمبەردا(ﷺ) میللەتان بەتەبایی ژیاون.

ئێمەی میللەتی کوردیش، وەکو هەموو میللەتان لەژێر ڕەحمەتەکەیدا حەساینەوە.
بەڵێ قوربان.
پاش ئەوەی کە تۆمان ناسی.
تێگەیشتین کەتۆی مەزن
زۆر دلاواو میهرەبانی
سۆز ومیهرت بێ پایانە
سنورەکان دەبەزێنێ.
ئەستەمە کەزمان وخاک
قەتیسی کات بیوەستێنێ.
بۆمان دەرکەوت.
زۆر دڵسۆز ومیهرەبانی
خەمخۆری گشت مرۆڤانی.
ڕەگەز پەرستی وخۆویستیت
قەت نەناسیوە ونایزانی.
ئەوە نی یە. چەندین (بوجەهل) و (ئومەییە)ی
عەرەب زمانی حەق نەناس
دەکەیتە پەندی زەمانە.
کەچی (سەلمان)ی پیرە فارس.
ئاوارەی دوور
کۆیلە ونەدار
هیچ کەس نەناس

کردته (سەلمان)ی خۆمانە.

فەرموت: سەلمان لە ئێمەیە و

لێم جیانیە ویەك خێزانە.

صوهەیبی ڕۆم

(جاوان)ی کورد

(بیلال)ی ڕەشتاڵەی حەبەش.

کۆیلەی ماف خوراوی بێ بەش.

هەموو لێت بوون بەپەروانە

بەڵێ قوربان.

هەر کە تۆمان بەسەروەر کرد.

بەڕاستی و مێژوش شاهیدە.

خۆمان تەواو بەختەوەر کرد.

خۆمان چارەی خۆمان نوسی

تەبایی بوو بەناسنامە.

ئای لەو سەردەمەوە قوربان

چەندە ژیانمان بەتامە.

ئێمەی ئیماندارو ئەوینداری حەزرەتی محمد (ﷺ) ، ئەگەر بمانەوێ لەگەورەیی پێغەمبەر (ﷺ) تێ بگەین، دەبێ بچینە خزمەت قورئان:

١- لە قورئاندا خوای گەورە باسی هەر پێغەمبەرێکی کردبێ، بەناوی خۆیەوە دواندویەتی وبانگی کردوە. وەك: یا آدَم، یا نوح، یا لوط، یا ابراهیم، یا موسی، یا عیسی. یا داوُد.

بەڵام كەبانگی پێغەمبەری ئاخر زەمان – محمد المصطفی (ﷺ) دەكات. دەفەرموێ: (يأَيُّها النَبيُّ، يأَيُّها الرَّسُول، يأَيُّها المُدَّثِر، يأَيُّها المُزَّمِل، طه، يس).

تەنها لە (چوار) جێگەی قورئاندا ناوی (محمد) (ﷺ) ، هاتوە. ئەویش سُبْحانَ الله لەبەر حورمەتی ئەو خۆشەویستە یەكسەر ووشەی – رَسُولِ – ی لەگەڵدا هاتوە، وەكو:

١- ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ ﴾ آل عمران. ١٤٤

٢- ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ﴾ الفتح: ٢٩

٣- ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَـٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾ الأحزاب: ٤٠

٤- ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَءَامَنُواْ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ﴾ محمد: ٢

تەنها لەم ئایەتەدا ووشەی (مُحَمَّدٌ) ووشەی (رَسُولٌ) بەدوایدا نەهاتبێت. بەڵام قەرەبوی (تەعویزی) كردۆتەوە بە (وَهُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ). وە هەروەها ڕستەی (وَءَامَنُواْ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ ) خۆی لەخۆیدا مانای (رَسُولٌ)یش دەگەیەنێت.

٢- لە سورەتی (الأنبياء) دا، خوای گەورە باسی – هەژدە – پێغەمبەر دەكات ووەكو جیاوازی پلە وپایەی پێغەمبەری ئاخر زەمان – حەزرەتی محمد – لەگەڵ پێغەمبەرانی پێشوو كاتمان ... اندنی ڕاستەقینەیەك دەكاتە كۆتایی پەیامی سورەتی (الأنبياء) ، دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴾ الأنبياء: ١٠٧ بە مانای پەیامی حەزرەتی محمد (ﷺ) لەڕوی زەمینەوە بۆ هەموو سەرزەوی و هەموو خەڵكی سەرزەوی یە. وە لەڕوی زەمانەوە، تا قیامەت بەردەوام دەبێ.

بەڵێ، هەر بۆ گەورەیی پلە پایەی پێغەمبەرمان (ﷺ) لای خوای گەورە، با تەماشای قورئان بكەینەوە. ئەوەتا حەزرەتی موسا، كاتێ كە خوای گەورە پلەی پێغەمبەریەتی پێ دەبەخشێ و دەفەرموێ بڕۆ بۆلای فیرعەون، ﴿ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴾ طه: ٢٤ یەكەم شت حەزرەتی موسا لەخوای گەورەی داوا دەكات دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱشْرَحْ لِى صَدْرِى ﴾ طه: ٢٥

بەڵام حەزرەتی محمد (ﷺ) ئەم داوایەش ناکات وخوای گەورە وەکو ئیمتینات وخۆشەویستی بۆ دەربڕین دەفەرمویت: ﴿ أَلَمۡ نَشۡرَحۡ لَكَ صَدۡرَكَ وَوَضَعۡنَا عَنكَ وِزۡرَكَ ﴾ الشرح: ١-٢

**ئیمانداران:** دەچینەوە خزمەت سیرەی پیرۆز وپڕ بەرەکەتی وبزانین چۆن خوای گەورە ئامادەی دەکات بۆئەوەی بیکات بە (خاتَمُ الأَنبياء وَالُمرْسَلِيْنَ) بیکات بە (رَحۡمَةً لِّلۡعَٰلَمِينَ) پێشتر باسمان کرد کەسێ جار بێ نازی بەخۆیەوە بینی و هەتیو کەوت. کە پاشان کەوتە لای مامەی (أبوطالب)، ئەبوطالب پیاوێکی دەست کورت بوو خاوەنی (١٠) منالّ بوو. مالێکی خێزان زۆر وکەم جێگا وهەژار وئالۆز بوو. هەر بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیتوانی بخوێنێ، بەڵام لەم ماڵەدا خوای گەورە دووشتی نیشاندا:

١- خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ يَجِدۡكَ يَتِيمٗا فَـَٔاوَىٰ ﴾ الضحى: ٦

لەماڵی ئەبوطالبی مامی دا، خوای گەورە ئامۆژنەکەی – فاطمەی کچی ئەسەدی) بۆ ڕام کرد. خوای گەورە ئەوەندە خۆشەویستی پێغەمبەری خستە دڵیەوە، کەلەهەموو منالّەکانی خۆشتر دەویست. خوای گەورە بەرەکەتی خستە سفرە وخوانیان. هەرکاتێ لە ماڵی ئەبوطالب دا نان دابنرایەو محمد ئەو ژەمە لەسەر سفرە بوایە، هەموو تێریان دەخوارد ولەبەریشیان دەمایەوە، بەڵام ئەو ژەمەی محمد ئامادە نەبوایە زۆر بەبرسیەتی دەستیان دەگرتەوە وهیچ نەدەمایەوە وخواردنەکەش هەربەئەندازەی ژەمەکانی پێشوو بوو! خوای گەورە ئەمەی بۆکرد تامنەتی لەسەر نەکرێ وبەڵکو بەمەمنونیەوە بانگ بکرێ بۆسەر سفرە وخواردن.

٢- بۆ ئەوەی منەتی کەسی لەسەر نەبێ لە پەروەردەکردندا وتەنها ((أَدَّبَنِي رَبِّــي فَأَحْسَنَ تَأْدِيبِي)) بێتەدی، خوای گەورە حەزرەتی محمدی خستە ماڵێکەوە کەماڵی مامیەتی (١٠) منالّی تێدایە. ئەگەر بێتوو ئەبوطالب تەنها یەك دوو منالّی ببوایە. ئەوە ڕەنگە بوترایە: ئەو هەموو ئەدەب وئەخلاقە بەرزەی محمد (ﷺ). بەهۆی ئەبوطالبەوەیە ئەوباشی پەروەردەکردوە. بەڵام کە أبوطالب (دە) منالّی هەیە وبەپەروەردە وئامۆژگاری منالّەکانی خۆشی ڕاناگات، ئیتر ئەوە دەسەلمێ

کەئەدەب و ئەخلاقی بەرزی محمد تەنها لەژێر چاودێری خۆیدا بـوەو منـەتی هـیچ مرۆڤێکی لەسەر نیە!!!
ئێستا کە محمد (ﷺ) تەمەنی لە (هەشت بۆ نۆ) ساڵی دایە. هەر زوو هەستی کرد کەمامی هەژارە بۆیە فەرموی: مامەگیان دەمەوێ کاربکەم! خۆ ئەگـەر لـەجیاتی محمـد (ﷺ) هـەرمناڵێکی تـر بوایـە لـەو تەمەنـەو لـەو بارودۆخـەدا دەیگـوت: مامەگیان من هەتیوم ومناڵم و تاقەتی ئیشم نیەوبۆ خۆم دەخـۆم ودەخـەوم وئـیتر وازم لێبێنن. وە بۆشی دەکرا بەقسەشی دەکرا. چونکە ئەوەندە خۆشەویست ویـەناز بوو، بەلاّم پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرگیز وای نەکرد.
فەرموی: مامە دەمەوێ کاروکاسپی یەك بۆ خۆم بکەم. ئـەبوطالب ووتـی: باشـە ئاخر ئەی محمد تۆ چ ئیشێکت پێ دەکرێ؟! فەرموی: مامە بەکرێ شـوانی دەکـەم، بەڵێ دەستی کرد بەشوانی وکاتێـك بـوو بـە پێغەمبـەری خـواو وەحـی بـۆ هـات وهاوەڵان لەخزمەتیا بون ودەسەلاّت و هێزێکی زۆرگەورەی هەبوو. ئالەو کاتەشـدا، باسی زەمەنی شوانیەتیەکەی منالّی دەگێڕایەوە ودەیفەرموو: ((**مابَعَثَ اللهُ نَبِيًّا إلاّ رَعَى الغَنَمَ، فَقالَ أَصْحابُهُ: وَأَنْتَ؟! فَقالَ: نَعَمْ، كُنْتُ أَرْعاها عَلى قَراريطَ لأَهْلِ مَكَّةَ**)) رَواهُ البُخاري (٢٢٦٢).
واتە: خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە شوانی نەکردبێ. هاوەڵانی عەرزیان کرد: تۆش شوانیت کردوە؟! فەرموی: بەڵێ منیش مەڕم لەوەڕاندوە لە — قَـــراریط — یان ناوی شوێنەکە لە مەککە یان ئەو پارەیە بوە کە لـەکرێ ی شـوانیەکە وەری گرتوە) بۆ خەڵکی مەککە شوانیم دەکرد.
بەڵێ، خوای گەورە خستیە دڵی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەیەوە کەحـەزی لەشـوانی بێ، بۆچی؟ لەبەرئەوەی شوانی کۆمەڵێك تایبەتمەندی و وانـەی پـەروەردەیی فێـری شوان دەکات. وەکو:
١- **الصَّبْر**: خۆگری وئارام گری. تەماشاکە شوان هەر لـە بەیانیـەوە هـەتا شـەو دەسوڕێتەوە لەکۆشکا ناژی. ئاوی گەرم وسوێر دەخواتەوە، هەوای پڕوکێنـەر لێ ی دەدات، خواردنی ناخۆش وساردەوە بوو دەخوات، هەمووکات دەبێ بەئاگابێ. بـەو

ڕۆژگاره وبگره هەندێ جار شەوگاریش ئیسراحەت وپشووی بۆ نادرێ. بۆیە فێری ئارام گرتن دەبێ وچۆك دانادات لەبەردەم نەهامەتی وساردی وگەرمیەکانی ژیاندا..

**٢- التَّواضُع:** خۆ بەکەم زانین، شوان سەرپەرشتی لە دایك بونی بەچکەکان دەکات. بەرخۆلە وکاریلە لەباوەش دەگریت. میزی پێدا دەکەن، کەچی ماچیان دەکا وخۆشی دەون و ئەیانخاتە سەرشان. شوان حەرەس وچاودێر وپارێزگاری ئەو ئاژەڵانەیە. لە ناویاندا دەخەوێت. ئیتر تەکەبور لەدڵیدا نامێنێ، شوان لەدەردی پیسی خۆبەزل زانین پارێزراو دەبێ ورزگار دەبێت.

**٣. الشَّجاعَة:** شوان ڕوبەڕوی دڕندەکانی بیابان دەبێتەوە ومەڕەکانی لە دەست دڕندە ڕزگار دەکات، ئەوکەسەی لەژیانی دا شوانی نەکردبێ زۆر لەودڕندانە دەترسێ. وەشوان شەوانی تاریك وئەنگوستەچاو. لەبەرلێزمەی باران و ناڵەی هەورە تریشقەدا بەتەنها لەگەڵ ئاژەڵەکانیدا دەمێنێتەوە وترس وخۆف نایگرێ.

**٤. الرَّحْمَةُ وَالعَطْفُ:** سۆز وبەزەیی ونەرم ونیانی، شوان زۆر بەزەیی بەو ئاژەڵەدا دێتەوە کە نەخۆشەو نا لەوەڕێ. یان ئەو ئاژەڵەی قاچی دەشکێ، یان گورگ برینداری دەکات چۆن بە بەزەیی وپەرۆشی یەوە بە باوەش هەڵی دەگرێ، دەرمانی دەکات، قاچی بۆ هەڵدەبەستێتەوە، دوکتۆری بەیتەری بۆ دێنێت.

چەند جار بوە شوان نانەکەی داوە بەو ئاژەڵە نەخۆشەی نەیتوانیوە بلەوەڕێ.

بەم شێوەیە دڵی پڕدەبێت لەسۆز وبەزەیی و نەرم ونیانی. ئیتر کەسێك لەگەڵ ئاژەڵدا ئاوا بەبەزەیی بێ، چۆن بەزەیی بە مرۆڤدا نایەتەوە؟!

**٥. حُبُّ الكَسْبِ مِنْ عَرَقِ الجَبينِ:** خۆشەویستی نانی ڕەنجی شان وعارەقی ناوچەوان، ئای شوان چەند ئاسودەیە. کەبەوماندویەتیە، دادەنیشێ ولەسەر تاشەبەردێ بەئاوی ناو ماقۆڕێك هەندێ نان دەخوات: چەند دڵی ئیسراحەتە بەوەی کەنانی بێمنەتی دەستی خۆی دەخوات. وەهەموو بەرهەمەکانی شیر وماست وپەنیر وکەرە ودۆ وکەشك و...هتد. وە خوری وموکە بەکاریان دەهێنێ، لەگەڵیا دڵی

ئاسودە دەبێ. چونکە بەرنەمی دەستی خۆیەتی. بەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەوشوانیە فێری هەموو ئەو ڕەوشتە بەرزانە بوو کەپێویستە هەموو سەرکردەیەك ئەم ڕەوشتانەی هەبێ. وە ئەم شوانیە پرۆڤە بوو بۆ شوانی میللەتێك وڕابەرایەتی ئومەتێك.

سەرەڕای ئەمانەش، پێغەمبەری خوا (ﷺ). لەکاتی شوانی دا دڵ ودەرونی ئیسراحەتی دەکرد وخەم وخەفەت ومەحزونی هەتیوی و هەژاری لەبیردەچۆوە وزۆر خۆشحاڵ دەبوو بەدیمەنی جوانی ئاژەڵەکان کاتێ بەیانیان ئەیبردنە دەشت و ئێواران بەرەو ماڵ دەیهێنانەوە. کە بەڕاستی ئەوەندە شادی بەخشە و دیمەنێکی سەرنج ڕاکێشە، لەوئاستەدایە کەقورئانی پیرۆز ئاماژەی پێ دەکات و دەفەرموێ:

﴿ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴾ النحل: ٦

وەپێغەمبەری خوا لەو تەمەنە منالّی یەیدا، لەکاتی شوانی دا، سەرنجی جوانی بیابانی دەدا بەتایبەتی لەکاتی خۆرئاوابوندا. وەلەشەوانی ساماڵ دا، سەرنجی جوانی مانگ وئەستێرەکانی دەدا وبیری لەگەورەیی و دەسەڵاتی پەروەردگار دەکردەوە. تا کاتێ کەبوو بەپێغەمبەر و قورئانی بۆ هات. بە عەمەلی جوانی ئاسمانی بینی، ئەو ئاسمانە جوانەی کەخوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ ﴾ الملك:

**لێرەدا ڕەنگە کەسانێك بپرسن وبڵێن:** باشە خۆبۆ خوای گەورە زۆر ئاسان بوو، کە لەئاسمانەوە پارە وسامان بنێرێ و بیخاتە ژێر سەرین و ناو گیرفانی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەیەوە کەئەمە هیچ گرانیەك وحەتمیەتێکی تێدا نی یە بۆ خوای گەورە.

ئەی بۆچی خوای گەورە ئەوەی لەگەڵ نەکرد وتوشی ئەو هەموو ناڕەحەتیەی شوانی کرد ؟!

**لەوەڵامدا دەڵێین:** تاوەکو خوای گەورە تێمان بگەیەنێ، کەخوای گەورە ئەوژیان وگوزەرانەی بۆ بەندە صالّحەکانی پێ خۆشە کەنانی ڕەنجی شان بخۆن.

هەروەکو زانایان فەرمویانە: باشترین و پاکترین ماڵ وسامان ئەوەیە کەمرۆڤ بەڕەنجی شانی خۆی بەدەستی هێنابێ پاشان خزمەتی گەل وکۆمەڵگای خۆی پێ کردبێ ومرۆڤەکانی دەوروبەری لێ ی سودمەند بوبن. وە خراپترین ماڵیش، پۆخڵترین ماڵ وسامانیش ئەو پارە وسامانەیە کەمرۆڤ دەستی کەوتبێ بەبێ عەزیەت و ڕەنج. بەوەی لەسەرپشت ڕاکشابێ و بۆی هاتبێتە ناو باخەڵی بێ ئەوەی هیچ عەزیەتی پێوەببینێ. کە بە زاراوەی ئەمڕۆ لەکوردی دا پێ ی دەڵێن: (موچەی بن دیوار وبەر سێبەر)!! کەبێ گومان ئەم ماڵە موفتە بێ عەزیەتە بەلاشە هەرگیز لەخزمەتی هاونیشتمانی یانی خۆیدا خەرجی ناکات!

بەڵێ هەر ئەم پەروەردە بونەبوو کەوای لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد کەتاوەفاتی کرد هەرگیز نانی دەستی خۆی نەبێ و بە تێکۆشانی خۆی پەیدا نەکرابێ، نەیخوارد. ئەوەتا لە هیجرەتدا لەکاتی کۆچکردندا لەمەککەوە بۆ مەدینە.

تاوەکو حەزرەتی أبوبکر پارەی حوشترەکەی لێ وەرنەگرتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) قبوڵی نەکرد. بچێتە سەرپشتی وهیجرەتی لەسەر بکات!!

وە لە ژیانی سەردەمی مەدینەیدا کەپارەو سامانێکی زۆر لە (بَيْتُ المَال)ی موسڵمانان دا بوو. بەڵام بەمانگ بووە ئاگر بۆ چێشت لێنان لە ماڵی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) نەکراوەتەوەو تەنها خورماو ئاویان خواردوە. ئاواش قبوڵی نەکردوە کە کەس شتی بۆبنێرێ و ئەم هەر بیخوات مەگەر وەکو دیاری کە قبوڵی کردوە،

وەلەسەرمەرگیداو کاتێ دونیای بەجێ هێشت قەرزی لەجولەکەیەك کردبوو، وە (درعەکە)ی لەلای جولەکەکە بوو وەکو ڕەهن تادانەوەی قەرزەکە!!

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، (حەوت) ساڵ شوانی کردو ئێستا گەنجێکەو تەمەنی وانزیکەی (١٦) ساڵانە. ووتمان پێغەمبەری خوا (ﷺ)زۆر زوو گەشەی دەکرد.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوەبکەین کەچۆن خوای گەورە ئەم خۆشەویستەی خۆی پاراست لە هەموو دەستورو باوێکی سەردەمی جاهیلی، کە دوای شەرمیان لە خۆیان دەهات باسی بکەن!!

١- لەو سەردەم و کاتەدا هیچ کەس نەبوو کەبتێك یان زیاتر لەبتێکی نەبێت و قوربانی بۆ سەرنەبڕێت و سوجدەی بۆ نەبات!! دین و ئیمانیان بت پەرستی بووە شانازیان پێوە دەکرد، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) خوای گەورە بۆ خۆی پاراستی لەوەی کە هەرگیز بت نەپەرستێ. وە هەرگیز لەژیانی دا لەو گۆشت و خواردنانەی نەدەخوارد کە بۆ بتەکان سەردەبڕان و دادەنران.

پێشەوا ئەحمەد لەموسنەدەکەیدا لە هیشامی کوڕی عوروەوە ئەویش لەباوکیەوە دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: باوکم فەرموی: ئافرەتێکی نزیکی خاتوو خەدیجە بۆی باس کردوە کەبەڕاستی گوێی لەپێغەمبەری خوا بووە کەبەخاتوو خەدیجەی فەرمووە: ئەی خەدیجەی خۆشەویستم، بەوەفام: (وَاللهِ لا أَعْبُدُ اللاَّتَ وَالعُزَّى أَبداً) واتە: سوێند بەخوای گەورە هەرگیز لەژیانمدا سەرم بۆیت دانە نەواندوە.

بەڵێ: هەر لەو گەنجیەدا، خوای گەورە پاراستی لەهەر ڕەفتارێکی هەرزەکارانە کە لە سەرکردەی دوا ڕۆژ نەوەشێتەوە. **سەرنجی ئەم فەرمودەیە بدەن.**

عَنْ عَلِيٍّ ابنِ أَبِي طالب: قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **((ماهَمَمْتُ بِقَبيحٍ مِماّ كانَ أَهْلُ الجاهِلِيَّةِ يَهِمُّونَ بِهِ. إِلاّمَرَّتَيْنِ مِنَ الدَّهْرِ، كِلْتَيْهِمـا يَعْصِمُني اللهُ**

**مِنْهُما**)). واتە: هەرگیز ڕۆژێ لەڕۆژان بەخەیاڵمدا نەهاتووە کردارێـك لـەو کـردارە ناشیرینانە بکەم کە خەڵکی سەردەمی نەفامی دەیانکردو گرنگیان پێ دەدا. تەنها دوو جار نەبێ کەهاتە خەیاڵمـەوە بچـم بـۆ ناویـان و بەشـداری بکـەم لەگـەڵیان. لەهەردوو جارەکەدا خوای گەورە پاراستمی و نەچوم. **ئەو دووجارەش:**

**یەکێکیان** ئەوە بوو. شەوێکیان لەگەڵ هاوڕێیەکمدا لە سەروی مەککـەوە مـەڕمان دەلەوەڕاند. داوای یارمەتیم لێ کرد. کە ئیزنم بدات بڕۆمەوە بـۆ مەککـە تـاتۆزێ لەگەڵ کڕوکاڵ و گەنجاندا یاری بکەم. ئەویش ئیزنـی دام. هاتمـەوەو نزیـك ماڵێـك بومەوە بوك گواسترابۆوەو گۆرانی و زوڕناو شایی بوو. حـەزم کـرد بچـمە ناویـان، بەڵام کاتێکم زانـی.خـەوم لێ کـەوتوەو بەگـەرمای ڕۆژی دوایـی کەسـەری گـەرم داهێنابوم بەخەبەرهاتم!!

**شەوی دووەمیش** بەهەمان شێوە ویستم بچمەوە کەچی هەر ئاوا خەوم لێکـەوت و بەشداریم نەکرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ:

((**فَوَاللهِ ماهممتُ بَعْدَهَا بِسُوءٍ مِمّا يَعْمَلُ أَهْلُ الجاهِلِيَّةِ حَتّى أَكْرَمَني اللهُ بِنُبُوَّتِهِ**)).

سوێند بەخوای گەورە ئیتر هەرگیز دوای ئەوکاتە نەهاتۆتە خەیاڵمـەوە کەبەشـداری لەکارێکدا بکەم کە ناشەرعی و ناشایستە بێ بەکەسی بەڕێز وخـاوەن کەسـایەتی، لەوکار وکردەوانەی کە خەڵکی سەردەمی نەفامی دەیانکرد..

ئەم فەرمودەیە: رَواهُ أَبُونَعيم فِي الدَّلائِل (١٢٨) وَالبَيْهَقـي فِي السُّـنَن الكُـبرى (٢/٣٣) وَالبزار (٢٤٠٣)..

**لێرەدا دووسەرنج هەیە:**

١- پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەکو هەر مرۆڤێك حەزی لەو شتانە بووە، کە هـەموو گەنجێ حەزی لێ یەتی، نەك هەروابزانێ کە نەفسی خۆی ڕقی لەو مەجلیس وکـارو ئیشانە بووە!.

٢- خوای گەورە خۆی پاراستی و بت پەرستی لەبەر چاو ناشیرین کـرد وخـەوی لیّ خست تاوەکو توشی تێکەڵی حەرام و ناو شایی ناشایی نەبێت.

**لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت. ئەویش ئەوەیە:**

باشە بۆچی خوای گەورە نەیهێشت بچیّ، قەیچیەکا خۆ ئـەو کاتـە تـازە لاو بـوەو سەدان گەنجی وەکو ئەو لـەو شـوێنانە بـوە وبەعەیبـەش نـەزانراوە وخـۆ ئـەوکات پەیامی ئاسمانی بۆ نەهاتوە و هەروەکو کەسێکی ئاسایی بووە؟!

**لەوەڵامدا دەڵێین:** بۆ ئەوەی کاتیّ کـەبوو بـە پێغەمبـەر (ﷺ) و پـەیامی خـۆی گەیاندو بەخەڵکی ڕاگەیاند کـە لـە ئیسـلامدا بـت پەرسـتی نیـەو ڕەش بەڵـەکی وتێکەڵی ژن وپیاوی نامەحرەم قەدەغەیە کەس نەتوانیّ بەرەو ڕوی هەڵسـیّ وبڵـیّ: ئەی محمد خۆرۆژێك بوو، تۆ بۆ خۆشت وات دەکرد. ئەی ئێستا بۆ لێمـان قەدەغـە دەکەی! تەماشاکەن، ئەگەر بێتوو هەرئەوەندەیان پیّ بوتایە، چەند قسەکانی سـارد دەبونەوە وکاریگەریان نەدەما! بەڵام ئەوە خوای تاك و تەنهایە کە پێغەمبەرەکـەی وائامادە دەکات بۆ پێغەمبەرایەتی، کەنابیّ بۆجارێکیش کارێك ئـەنجام بـدات کـە پاش بونی بە پێغەمبەر (ﷺ) بەچاویا بدرێتەوە. کە بەڕاسـتی ئەمـەش بـۆ هـیچ پێغەمبەریّ نەکراوە.

تەماشاکەن، حەزرەتی موسا کاتیّ کەسێکی ستەم لێکراو لەدەست ستەم کـارێکی خوێن ڕێژ ڕزگار دەکات و لە ناچاریدا زللەیەك لەستەم کارەکە دەدات و بەقـەدەری خوایی بەو زللەیە دەمرێت. ئاهـا چـۆن فیرعـەون دوای چـەندین سـاڵ بەچـاوی دا دەداتـەوە وپـیّ ی دەڵـیّ: ﴿ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ ٱلَّتِي فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ الشعراء: ١٩.

حەزرەتی موسا لە وەڵامدا چونکە کارەکە بەهەرچۆنێك بوبیّ ناشرین و نابەجیّ یـە دەفەرمویّ:﴿ قَالَ فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴾ الشعراء: ٢٠.

بەڵام خوای گەورە حەزرەتی محمدی پاراست تەنانەت لەپۆزش هێنانەوەیەکیش!!!
ئێستا پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەمەنی موبارەکی نزیکەی (١٦) ساڵانە.لەم کاتەدا شەڕ لەنێوان قورەیش و(هەوازن)دا ڕودەدات. پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەشداری دەکات بەوەی کەتیرەکان کەدوژمن تێیان دەگرتن، هەڵیان دەگرێتەوە وبۆ مامەکانی دەبات، هەروەکو بۆ خۆی باسی ئەو ڕوداوەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: (كُنْتُ أُنَبِّلُ عَلى أَعْمامي) ئیتر بەبینینی ئەم جەنگە وبەشداری کردن تێ ی دا جورئەت وئازایەتی و چاو نەترسی تێدا دروست بوو. وە مەشقێکی سەربازی بوو کە لە سەرەتای گەنجیەتیەوە فێری هونەری جەنگ بوو.
**کەواتە:** ڕودانی ئەم جەنگەش لەوکاتەدا، یەکێکی تربوو لەئامادە کاریەکانی خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکەی کەدواتر دەبێتە فەرماندەیەکی سەربازی ودەبێ هەرلەئێستاوە لێ ی بزانێ!!
**ئیمانداران:** بەردەوامین لە خزمەت سیرەی پڕبەرەکەت وحیکمەتی پێغەمبەری پێشەوامان‌دا. ئێستا تەمەنی (٢٠) ساڵە. لەم کاتەدا خوای گەورە بارودۆخێك دەسازێنێ تاخۆشەویستەکەی وانەی: (پەیمان نامەی سیاسی وداکۆکی لەمافی مرۆڤ بخوێنێ، دەبێ فەرمودەی: **(أَدَّبَنِي رَبِّي فَأَحْسَنَ تَأْدِيبِي)** بێتەدی.
ئەو وانە گرنگەش (حِلْفُ الفُضول) بوو. بەستنی ئەم پەیمان نامەیەش لەکاتێکدا ڕوی دا کە: کابرایەکی (زوبەیدی) کەشارێکە لە یەمەن. کەلوپەلی هێنایە مەککە و(عاصی کوڕی وائیل) لێ ی کڕی و پارەکەی نەدایە!! ئەم پیاوە غەریبە سەری بە هەموو ماڵە قورەیشیەکاندا گرت. کەس لەبەر دڵی (عاص) پشتگیری لێ نەکرد بۆ وەرگرتنی پارەکەی کە مافی حەق و ڕەوای خۆی بوو. بۆیە ئەم پیاوە ستەم لێکراوە چوە پەنای کەعبە و هۆنراوەیەکی بەجۆش وخرۆش وپڕحەماسەتی خوێندەوە وداوای مافی خۆی کرد. بەمە غیرەتی هەندێ پیاوی مەککە جوڵاو

بەنوهاشم و بەنوتەمیم و بەنو زوهرە کۆبونەوە لە مالّی (عَبْدُاللہ ی کوڕی جُدعان) و پەیمان نامەیەکیان مۆرکرد. (تَحالَفُوا باللہِ لَیَکوُنُنَّ یَداً واحِدَةً مَعَ المَظْلُومِ عَلی الظّالِمِ حَتَّی یُرَدَّ إلَیْهِ حَقُّهُ). سوێندیان خوارد بە خوای گەورە (اللہ) کە هەموویان یەك دەست بن وپشتگیری ستەم لێکراو بکەن و لەدژی ستەم کار بوەستن، هەتا ئەوکاتەی مافە ڕەواکەی خۆی بۆ دەگێڕنەوە پاشان بە کۆمەڵ چونە سەر عاصی کوڕی وائیل وپارەی کابرایان لێ سەند.

وە یەکێ لە ئامادەبوان کە بانگ کرابوو، پێغەمبەری خوا بوو(ﷺ) ، کە تەمەنی (٢٠) ساڵ بووو! وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەردەوام شانازی پێوە دەکردو دەیفەرموو: ((**شَهِدْتُ حِلْفَ الْمُطَیَّبِینَ مع عمومتي وأنا غُلاَمٌ فما أُحِبُّ أنَّ لي حُمْرَ النَّعَمِ**)). رَواهُ أَحْمَد وَالبُخاري في الأَدَب المُفرَد.

واتە: لەگەڵ مامەکانمدا بەشداری پەیمانی – مُطَیِّبین – م کردو لەو کاتەدا من گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بوم. بە ڕاستی ئەندامیەتی و ئامادەبونم لە وپەیمان نامەیەدا ئەوەندە پێ خۆشە. کە ئامادەنیم ئەگەر مێگە لە حوشتری سورم بدەنێ – کە گرانبەهاترین سامانی ئەو کاتەی خەڵکی بوە – واز لە ئەندامیەتی ئەو پەیمانە بهێنم ولێ ی بێمە دەرەوە.

یاخود دەیفەرموو: ((**لَقَدْ شَهِدْتُ في دارِ عَبْدُاللہ بن جُدْعان حِلْفاً ماأَحَبُّ أَنَّ لي بِهِ حُمْرَ النَّعَم –. وَلَوْ دُعیتُ بِهِ في الإِسْلامِ لأَجَبْتُ**). رَواهُ البَیْهَقي في السُّنَن الکُبْری.

واتە: لەماڵی عَبْدُاللہ ی کوڕی جودعان دا، بەشداری پەیمان نامەیەکم کرد – بۆ پشتگیری ستەم لێکراوو بەگژاچونەوەی ستەم کار – کە حەزناکەم ڕانە حوشتری سورم هەبێ و ئەندامیەتی ئەوم لێ بسەنرێتەوە خۆ ئەگەر لە ئیسلامیشدا بانگم

بکـەن بـۆ بەسـتنی ئاوەهـا پـەیمان نامەیـەك وەڵامیـان دەدەمـەوە و بەشـداری دەکەمەوە:.

**لەم بەسەرهاتەدا چەند وانەیەك هەیە:**

١- گەورەیی ومەزنی کەسایەتی پێغەمبـەر (ﷺ) ، کـە هێشـتا تەمـەنی (٢٠) ساڵە، بـەڵام ئەوەنـدە ڕەوشـت بـەرزە، ئەوەنـدە ئـەمین ودەسـت پاکـە، ئەوەنـدە ڕاستگۆیە، ئەوەندە بە وەفایـە، لەگـەڵ گـەورە پیـاوانی دەسـەڵاتدار و بەتەمەنـدا حیسابی بۆ دەکرێ و ڕێزی تایبەتی بۆ دادەنرێ.

**لێرەدا دەڵێم:** ئـەی ئەوکەسـانەی کەهـەڵگری پـەیامی ئـەو پێغەمبـەرەن (ﷺ) دەتوخوا بارەوشتتان ئەوەندە جوان بێ، ئەگـەر لەکۆمەڵگەیەکـدا ژیـان، هەرچـەند وەکو سەردەمی مەککەش جاهیلی بوو تۆئەوەندە بەڕێز وکەسـایەتیت بـەهێز بـێ، هەموکات جێگات دیاربێ وحیسابی تایبەتیت بۆ بکرێ.

٢- موسڵمان دەبێ شانازی بکات بەکردەوە جوانەکانی، بەو کردەوانەی کە ڕۆژێـك لە ڕۆژان یارمەتی داماوێکت داوە. چەند خۆشە لە ژیانتدا بەشداری دانیشـتنێکت نەکردبێ کەپاشان لێ ی پەشیمان بی ودڵت پێ ی نائارام بێ.

٣- لەم باسەوە ئەوە تێ دەگەین کەدروستە ئامادەبون لەگەڵ خـەڵکانی بـێ دیـن، کاتێ کۆدەبنەوە بۆ کارێکی جوان. بۆ دیفاع کردن لە مـەزلۆمێك. بـۆ خزمـەتێك بەمرۆڤایەتی بائەو کەسانە ڕەوشتی خراپ وعەقیـدەی خراپیشـیان هـەبێ، مـادام ئەوکارەیان چاکەیە تۆ دەتوانی وەکو موسڵمان بەشداریان لەگەڵ بکەی.

ئەوەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (**وَلَوْ دعيتُ بِهِ فِي الإِسْـلامِ لأَجَبْـتُ**).

ئەمەش گەورەیی و کراوەیی ئیسـلام دەردەخـات کـەخێر لـە هەرجێگایـەك بـێ و پشتیوانی لە ستەم لێکـراو لەهەرشـوێنی قسـەیەکی لەسـەر بکـرێ و بنوسـرێ و بەیاننامەیەکی لەسەر دەربکرێ وببێتە هۆی بەگژاچونەوەی زاڵم و سـتەمکار ئـەوە ئیسلام لەو شوێنە ئامادەیە ودەست خۆشی لـەو کەسـە دەکـات کـەجێ بـەجێ ی دەکات با کافر وبێ باوەڕیش بێ بە ئیسلام:..

بەڵێ ئیسلام دینی بەیەکەوە ژیانە. لەگەڵ هـەموو کەسـێك کەهـەر عەقیدەیـەکی هەیە، یان کارێك ئەنجام دەدات کەناشەرعیە وەکو: زینـا، عـەرەق خـواردن، ڕیبـا خۆری، وەکو ئاستی کەسی خۆی. بەڵام کە لە مەجلیس وکۆڕێکدا دانیشت وقسەی هەبوو لەسەر هاوکاریکردنی لێقـەوماوو دەسـت گرتنـی زاڵـم وسـەندنەوەی مـاف بۆماف خوراو. جا ئەم ستەم لێکراوە، تاکە کەسێك بێ، خێزانێك بێ، هۆزێك بـێ، گەل و نەتەوەیەك بێ، دروستە تۆی موسڵمان لە تەنیشت ئەو بێ دینە خراپەکارەوە دانیشی و ئیمزای لەگەڵ بکەی، چونکە ئـەم هـەنگاوەی ئێـرەی خێـرە. هـەروەکو ئەوانەی لەو پەیمان نامەیەدا بەشداریان کرد. زۆربەیان لەسەر ئاستی ژیانیـان ڕیبـا خۆر وعەرەق خۆرو زیناکار بون. کچیان زیندە بەچـاڵ کردبـوو. بـەڵام پێغەمبـەری خوا (ﷺ) لە دانیشتن بۆئەو پەیمانە پیرۆزە پەشیمان نەبوو، بەڵکو فەرموی: ئەگەر لەدوای بون بەپێغەمبەریشم دەعوەت بکرێم بۆ ئیمزاکردنی پەیمان نامەیـەکی ئـاوا کە دیفاع لەمەزلۆم بکات ولوتی زاڵم بشکێنێ (لَأَجَبْتُ) بەشداری دەکەم..

**کەواتە:** موسڵمان دورە پەرێز نی یە وهەمیشە پێشەنگ وبەشداری کاری جوانە..

(سُبْحانَ اللهِ) لەگەورەیی ئەم پێغەمبەرە (ﷺ) کە ژیانی پێش پێغەمبەرایەتیشـی هەموی ڕێ نیشاندەری و وەڵامـی هـەموو پرسیارەکانی تێدایـە بـۆ ئوممەتەکـەی تاقیامەت. اللَّهُمَّ صَلِّ عَلى سَيِّدِنا محمد وعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلِّم).

تابەشێکی تر لەخزمەت ژیانی پڕ بەرەکەتی ئەو خۆشەویستەدا بـەخوای گـەورەتان دەسپێرم.

# سەرچاوەکان

١ شنەی سۆز ، شعری ، م.جلال الدين نجم الدين ، ل٦-٩.

٢. گۆڤاری دوانگە، ژمارە: ٢٩ ، ل,٤

٣. السيرة النَبَوِيَّة ، د.على محمد محمد الصَّلابي ، ج١، ص٧٣، ص٧٦، ص٨٠.

# ووتاری سێ یەم

# بۆ مانگی رَبیعُ الأَوَّل

## وەفای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ هەرکەسێ کە چاکەی لەگەڵ کردبێ

**الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبهِ أجمعين.**

له مانگی لەدایك بوونی سەروەری مرۆڤایەتی دا.

**دەچینەوە خزمەتی ئەو خۆشەویستەمان و عەرزی دەکەین:**

ئەی ڕابەری دین و دونیام. چ بەیانیەکی سپی بوو. بەلەدایك بوونت ئازیز مو شەرەف بوو، پێش هاتنت دنیامات بوو، پڕکپی بوو..

کە تۆ هاتی گوڵەگەنم سەری زێڕینی دەرهێنا، کە تۆهاتی بیابان تینوێتی ڕامالّی و وشکی خەمی لەژێر پێ نا.

کە تۆ هاتی ئەبو جەهل مەرگی تارو پڕسەر شۆڕی بەجێ هێنا.

کە تۆ هاتی بیلالی ڕەش پێستی کلۆڵ، زوڕنای شەوانی سوری مەککەی تێك شکاندو سەدای (اللهُ أكبر) ی چاند لەشوێنیا.

کە تۆ هاتی باران بوویە بارانی خێر.

سەدان عومەری بەچکە شێر، لەناخیا سەری دەرهێنا.

کە تۆ هاتی، سەدان (مُصْعَب) دنیای فانی لەژێر پێ نا.

کە تۆ هاتی دەیان عائیشە و فاطمە.

شەرمی ژیانیان لەڕەگ و ڕیشەی دەرهێنا.

کەتۆ هاتی سەدان سەلمان، سەدان کاوان، چاوی یەکسانیان هەڵهێنا.

**ئیمانداران:** دوو ووتاری ڕابردوو لە خزمەتی پێغەمبەردا بوین (ﷺ) باسی ئەوەمان کرد، چۆن خوای گەورەو کار بەجێ. بە حیکمەتی خۆی پێغەمبەرەکەی پێ ئەگەیەنێ و ئامادەی دەکات بۆ پێغەمبەرایەتی.

ئێستا پێغەمبەری خۆشەویستمان، تەمەنی (٢٥) ساڵەو باسی ڕاستگۆیی و دەستپاکی و ئەمانەتی لەهەموو مەککەدا بڵاوبۆتەوە. بە [الصَّادِقُ الأَمين] بانگی دەکراو ناو دەبرا.

لێرەدا خوای گەورە دەرگایەکی تری ڕەحمەت لە پێغەمبەرەکەی دەکاتەوەو قۆناغێکی تری ئامادەکاری بۆ پێغەمبەرایەتی بۆ دەسازێنێ. ئەویش بەوەی کە (خاتوو خەدیجەی کچی خوەیلد) کەبێوەژنێکی خاوەن حەسەب و نەسەب بوو. پێشتر دوو شوی کرد بوو. تەمەنی (٤٠) ساڵ بوو. (١٥) ساڵ لە پێغەمبەری خوا گەورەتر بوو. ماڵ و سامانێکی زۆری هەبوو، بازرگانی دەکردو خەڵکی بەکرێ دەگرت بۆ بازرگانیەکەی، بەڵام زۆرجار فێڵی لێ دەکراو ماڵی دەخورا. بۆیە هەر کەباسی ڕاستگۆیی و دەست پاکی حەزرەتی محمدی بیست ناردی بۆلای داوای لێکرد سەرپەرشتی بازرگانیەکەی بۆ بکات بۆ وولاتی شام. لەگەڵ (مەیسەرە)ی خزمەتکاریدا، وەپێشنیاری کرێیەکی باشیشی بۆ کرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەخۆشحاڵیەوە قبوڵی کردو سەفەرەکەی کردو بەقازانجێکی زۆرەوە گەڕایەوە. خەدیجە هەرگیز قازانجی ئاوازۆر و سەفەری بازرگانی ئاوا پڕبەرەکەتی نەبینیبوو.

هەر بۆیە بانگی مەیسەرەی کردو باسی (محمد)ی لێ پرسی. ئەویش ووتی:

ئەی خاتوو خەدیجە هەرگیز مرۆڤی وا ڕاست گۆو دەست پاك و ڕوخۆش و مامەڵە ڕاست و دروستم نەبینیوە.

خەدیجە گومبوی خۆی دۆزی یەوە و خۆشەویستی پێغەمبەری خوای (ﷺ) چووە دڵەوەو چوە لای هاوڕێ کەی کەناوی (نەفیسەی کچی مونەبیە) بوو. باسەکەی دڵی لادرکاند و پێی ووت: بچۆ بۆلای محمد و بیری ژن هێنانی بخەرە بەردەم.

(تەماشاکەن بۆ خۆی نەچوو، بۆ ئەوەی ڕێزو حورمەت لە نێواندا بمێنێ).

سەرەنجام بونە هاوسەری یەك و ژیانێکی زۆر پڕ بەرەکەت و خۆشیان بردە سەر، دوو کوڕ و چوار کچیان بوو. کوڕەکان بە منالّی مردن و کچەکان گەورە بون و موسڵمان بوون، وەتا خەدیجە خاتون لەژیاندا بوو. پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ ژنی تری نەهێنا. لێرەدا دەوەستین و پەندو وانەکانی ئەم خێزان دروست کردنە باس دەکەین بەپشتیوانی خوای گەورە.

١- بازرگانی کردنی پێغەمبەری (ﷺ) بە ماڵی خەدیجەوەو چونی بۆ وولاّتی شام.

پێشتر ووتمان کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) شوانی کرد، شەڕی بینی. پەیمان نامەی سیاسی بینی لە (حیلفی فُضول)دا.. ئێستا دەبێ وانەیەکی تر. بخوێنێ کەبازرگانیە. باشە بۆچی بازرگانی؟

١- بە بازرگانی و هاتوچۆی وولاّتان و بینینی جۆرەها کەس و نەتەوەو زمان، مرۆڤ چاوی دەکرێتەوە

٢- لەمعامەلەو کڕین و فرۆشتندا. مرۆڤ فێری ناسینی خەڵکی دەبێ. زۆرکەس زۆر پیاوی چاکە بەڕواڵەت. بەلاّم کەمعامەلەی لەگەڵ دەکەی بۆت دەردەکەوێ چ خراپە کارێکە!!

٣- لەو بازرگانیەدا بەمەدینەدا ڕۆیشت کەشوێنی هیجرەت و بانگەوازی دینەکەی دەبێ لەداهاتوودا!!

٤- لەو بازرگانیەدا وولاّتی شامی بینی. کەدواتر بانگەوازی دینەکەی تێدا بلاّو دەبێتەوە وەهەروەها بوون بەهاوسەری خەدیجە هەر بەحیکمەت و کاربەجێ یی خوای گەورە بوو. لێرەدا پرسیارێك دەکرێ:

باشە بۆچی خوای گەورە کچێکی تازە پێگەیشتوی بەنسیب نەکرد، بۆچی ئەو ئافرەتە بێوەژنە کە"(١٥) ساڵ لەخۆی گەورەترە؟!

**لەوەلاّمدا دەڵێین:**

١ خەدیجە ئافرەتێکی دونیا دیدە بوو. زۆر خۆڕاگر بوو.

ئەم ئافرەتە شیاو بوو بۆ ئەوەی کەلەکاتی هاتنی وەحی دا، لەو کاتەدا کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) لەرزی لێ هاتبوو، هاتەوەو فەرمووی: دامپۆشن، دامپۆشن، ئەگەر خەدیجە دونیا دیدەو دڵ قایم نەبوایە ئافرەتێکی هەرزەکارو بێ ئەزمون بوایە. هاواری دەکردو دەیگوت: دیارە ئەم پیاوە تێکچوە، بەڵام خەدیجە دڵخۆشی دایەوەو بردی بۆلای وەرەقەی ئامۆزای کەشارەزای ئاینەکان و پەیامی پێغەمبەران بوو!

٢- خەدیجە ئافرەتێکی یەکتا پەرست بوو. بت پەرست نەبوو. لەو کەسە تاك تاکانە بوو کە بتی نەدەپەرست، بۆیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی بەسەرهاتی ناو ئەشکەوتی (حراء)ی بۆ گێڕایەوە و فەرمووی دەترسم تووشی کارەساتێك ببم. خەدیجە فەرموی: (كَلاَّ وَاللهِ مايُخْزِيكَ اللهُ أَبَداً..) سوێندی بە (هوبەل) نەخوارد. سوێندی بە (لات) و (عوززا) نەخوارد. بەڵکو سوێندی بەخوای گەورە (الله) خوارد. کە بەڵگەیە لەسەرئەوەی دوور بووە لەبت پەرستی و خوای تاك و تەنها و بێ شەریك ناسیوە.

وە هەر ئەم فیگرەتە پاکە بوو، کەوای کرد یەکەم کەس بێ شەرەفی موسڵمان بونی لە ئوممەتی ئیسلام دا پێ ببڕێ، وە بوو بەگەورەترین پاڵپشت بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ). کەهەموو ئازارو ماندوو بونێکی دەرەوەی ماڵی لەبیر دەبردەوە. کەئەمە بەئافرەتێکی تازە پێگەیشتوو. یان بت پەرست نەدەکرا. وەئەم پاڵپشتیە دڵسۆزانەی خاتوو خەدیجەبوو کەیەکێ بوو لەو هۆکارانەی کەخوای گەورە ڕەخساند بوی بۆ سەرکەوتنی پەیامی پێغەمبەرەکەی.

لەبەر ئەوەی ژن دەوری هەرەکاریگەری هەیە بۆ پشتگیری و هیمەت بەرزی و سەرکەوتویی پیاوەکەی. هەر بۆیە کاتێك دوو لە پێغەمبەرانی بەرێزی خوای

گەورە. کەحەزرەتی (نوح و هود)ن یەکێ لەو هۆیانەی کەپەیامەکـەیان بەرهەمـدار نەبوو. ژنە کافرەکانیان بون. کە لە ماڵی خۆیاندا دژایەتی بیروباوەڕەکەیان دەکـردن و ساردیان دەکردنەوە..

٣- خاتوو خەدیجە ئافرەتێکی پولەکی نەبوو. بەڵکو زۆر سەخی بوو. تەنانەت ئـەو خەدیجەیەی کەیەکێ بوو لەگەورە بازرگانەکانی مەککە، کاتێ کـە وەفـات دەکـات بەنەخۆشی بەدخۆراکی و کەم خواردنی باش سـەر دەنێتـەوەو لـە برسـان دەمـرێ!! چونکە هەموو سامانەکەی بە ئیسلام و پێغەمبەری خوا (ﷺ) خـوا بەخشـی دەی ئەگەر ئافرەتێکی دونیا پەرست و پارە پەرست بوایە، ئەمەی نەدەکردو تەحـەمولی ئەو ژیانە پڕ ناڕەحەتیەی ڕێبازی بانگەوازی پێغەمبەری خـوای (ﷺ) نـەدەگرت و ئاوا دڵسۆزانەو لێ بڕاوانە پشتی پێغەمبەری خوای نەدەگرت.

سەرنج بدەن چۆن خوای گەورە کەسێك بۆهاوسەری پێغەمبەرەکەی ساز دەکات!

٤- یەکێکی تر لە حیکمەتەکان ئەوەیە: تا مێژوو بـە ئـاوی ئـاڵتون بینوسـێتەوە، کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) چەندە داوێن پاك بووەو دووربوە لەهەموو هـاوار ئـارەزو پەرستیەك. چونکە ئەگەر هەر چاوی لەدوای ئافرەت و لەزەت پەرستی بوایە، ئـەوا کچێکی تەمەن مناڵ. یان لانی کەم هاوتەمەنی خۆی دەهێنا کە دەیان کچ خۆیـان پێشکەش دەکرد! نەك بچێ بێوەژنێـك بێنـێ کەپێشـتر دووجـار ژیـانی هاوسـەری پێکهێناوە. نەك ئافرەتێك بکاتە هاوسەری کە (١٥) ساڵ لـە خـۆی گـەورەترە لـە تەمەنـدا!! کـە تەنانـەت باسـی ئەویشـی نـەکردبوو. تاخەدیجـە خـۆی ڕایسـپارد! (سُبْحانَ الله) خوای گەورە کارەکانت چەند جوانن، ئەبێ خەدیجە هاوسەری یەکەمی پێغەمبەری خۆشەویست بێ و ماوەی (٢٥) ساڵ بەیەکەوە بـن و خەدیجە تەمەنی

(٦٥) ساڵ و پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەمەنی (٥٠) ساڵ بێ.

ئەمجا خەدیجە وەفات بکات. وە لەو هەموو ژیانی هاوسەریەدا ڕۆژێ لە ڕۆژان پێغەمبەری خۆشەویست بیر لەژنێکی تر نەکاتەوە!!

خوای کاربەجێ ئەمە دەکات تاوەکو ببێتە تۆپەڵە قوڕێك و بچێتە دەم و لوت و قوڕگی ئەو ناحەزانەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە بەشەهوانی و ئارەزوو پەرست ناوی دەبەن. لەکاتێکدا کەهەموو تەمەنی گەنجیەتی خۆی کە دەگاتە تەمەنی (٥٠) ساڵی کە تەمەنی پیریە لەگەڵ پیرەژنێکدا بەسەر بردو خۆشترین ژیانی لەگەڵ بەسەر بردو هەرگیز لەیادی نەکرد. کە هیچ سەرکردەیەك نیە لەمێژوودا بەهاوسەرگیری ئاوا ڕازی بێت!

**ئیمانداران:** لەم ووتارانەی مانگی مەولوددا کەلەخزمەت ژیانی پێغەمبەری خوادا بوین لەگەڵ ناوی پیرۆزی پێغەمبەردا (ﷺ) چەند ناوێکی تریش هاتن و گوێ بیستیان بوین وە لە سیرەی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) لە هەموو کتێبەکاندا ناویان تۆمارکراوە کەئەوەش ئەو وانەیەمان فێردەکات کەهەرکەسێ لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بێ. لە دونیاو قیامەتدا ناوی بەرز دەبێ (ئەوەی لەپەنای گەورەدا بێ گەورە دەبێ).

**بابزانین پێغەمبەری وەفادار چۆن بەوەفا بووە بۆیان؟**

١- بۆ ئامینە خاتوونی دایکی: لەفەتحی مەککەدا چووە سەر گۆڕەکەی و ئەوەندە گریا. هەموو صەحابەکان دەستیان کرد بەگریان، دەیفەرموو ئای دایە گیان، ئەڵێ ی ئێستا لەبەرچاوما گیان دەدەی و هەر لەبەر چاومە کەچۆن مردی، ئیتر زۆر بەکوڵ بۆ دایکی دەگریا!!

ئایا کێ هەیە دوای زیاتر لە (٥٠) ساڵ لەمردنی دایکی لەبیری بێ و گۆڕەکەی پێ بزانێ و لەکاتی گەورەترین سەرکەوتنی شۆڕشەکەیدا و هەستیارترین ساتەوەختدا، بیری دایکی ببێ و بچێتە سەر گۆڕەکەی، کەئەمە ئەو پەڕی وەفاداری دەردەخات!

٢- وەفاداری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ دایکە شیریەکەی (حەلیمەی سەعدیە) لە فەتحی مەککەدا ئافرەتێك گەپیرو بەساڵاچوبوو. هات بۆلای و فەرموی: نام ناسیتەوە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ؟

فەرموی: نەخێر دایە گیان. نازانم کێ ی — چونکە لە منالیەوە نەیبینیبوو.

ئافرەتەکە فەرموی: من حەلیمەی سەعدیەم! پێغەمبەری خوا هەستاو باوەشی پێدا کردو فەرموی: دایە گیان، دایە گیان، ئەمجا عەباکەی خۆی بۆ ڕاخست حەلیمەی لەسەر دانیشاندو گوێی بۆ قسەکانی گرت و یادی ئەو زەمانەی منداڵیان دەکردەوە کەلای حەلیمە بەسەری برد بوو. پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر خۆشحاڵ بوو، زۆر یارمەتی پێشکەش کردو زۆر بەحورمەتەوە بەڕێی کرد. وەکاتێکیش کەبیستی حەلیمە وەفاتی کردوە، چاوی پیرۆزی خوڕ خوڕ فرمێسکی پێدا هاتە خوارەوەو بۆ دایکی شیریەکەی زۆر گریاو زۆر دوعای بەخێری بۆ کرد.

٣- ئافرەتێکی تر لە ژیانی پێغەمبەری خوادا ناوی درەوشاوەیە: (بَرَكَة بنتُ ثَعْلَبَة) کەناسراوە بە (أُمُّ أَيْمَن) ئەو ئافرەتەی کە کاتێ ئامینە وەفاتی کرد، پێغەمبەری خوا هێنایەوە بۆ لای باپیری، وەهەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەدیجەی گواستەوە هەر خزمەتی پێغەمبەری دەکرد.

ئایا هەڵوێستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرامبەر بەم دایکەی چۆن بوو؟! پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەردەوام کە بانگی دەکرد دەیفەرموو: (ياأُمَّه) دایە گیان! بەدایە گیان بانگی دەکرد. چونکە کاتێ ئامینەی دایکی وەفاتی کردو تەمەنی (٦) ساڵان بوو، سەری بێ نازی و بێ دایك و باوکی نا بەسینگی (أُمُّ أَيْمَن)ەوە و بۆنی دایکی بەوەوە دەکرد! وە دەیفەرموو: (أُمُّ أَيْمَنْ أُمِّي بَعْدَ أُمِّي). ئوم ئەیمەن دایکمە دوای دایکم!.

وە ئوم ئەیمەنیش نازی دایکایەتی بەسەردا دەکردو وەکو کوڕی خۆی تەماشای دەکرد. ئەنەس دەفەرموی: چوین بۆلای (أم أَيْمَنْ) لە خزمەتی پێغەمبەردا بوین، ئاوی بۆ هێناین پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ناخۆمەوە. (ئایا بەڕۆژو بوو —

ڕۆژوی سوننەت، یان هەرتینوی نەبوو). ئەنەس دەفەرموێ: ئوم ئەیمەن وتی نابێ هەر دەبێ بیخۆیتەوە، ئاوی دایکت ناخۆیتەوە ئیتر پێغەمبەری خوا (ﷺ) زەردەخەنەی بۆ کردو ئاوەکەی خواردەوە، بەم شێوەیە نازی دایکایەتی بەسەردا دەکرد!

کاتێ (ئوم ئەیمەن) هیجرەتی کرد لەمەککەوە بۆ مەدینە، بەتەنیا بەڕێگادا ڕۆیشت، لەڕێگادا تینویەتی زۆری بۆ هێنا، بۆخۆی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: ئەوەندەم تینوو بوو لەتینوان بورامەوە، دوای مەغریب بوو. وەختێکم زانی دۆلکەیەك ئاو بەحەبلێکی سپیەوە بوو. لەئاسمانەوە هاتە خوارەوە. تێرم لێ خواردەوە، ئیتر دوای ئەوە هەرگیز لەژیانمدا تینوم نەبۆوە.

دەیفەرموو: (فَكُنْتُ بَعْدَ ذالِكَ، في اليَوْمِ الحارِّ أَطُوفُ في الشَّمْسِ كَيْ أَعطشَ فَما عَطَشتُ بَعْدَها). دوای ئەو کاتە، کەئەو ئاوەم پێ درا، لە ڕۆژانی زۆر گەرمادا لەبەرخۆ دەهاتم و دەچوم بۆئەوەی تینوم بێ، کەچی هەرگیز تینوم نەدەبوو، مەگەر بۆ حەزی خۆم ئاوم بخواردایەتەوە.

وەپێغەمبەری خوا (ﷺ) وەکو وەفا بۆ (أُمُّ أَيْمَن) کاتێ شوی کرد، مەصرەفی بوك و ناو ماڵ و حاڵی بۆ دابین کرد!.

وە أُمُّ أَيْمَن هەرگیز نەیدەتوانی لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دوربکەوێتەوەو تەنانەت لەگەڵیشی دەڕۆیشت بۆ غەزاکان و ئاوی بۆ دێنان و بریندارەکانی تەداوی دەکرد!.

٤- ئافرەتی چوارەم ئامۆژنی بوو. (فاطمەی کچی ئەسەد) کەخێزانی أبوطالب بوو، دایکی ئیمامی عەلی لە (٨) ساڵیەوە لای ئەم بەخێو کرا، زۆر بۆی باش بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەردەوام سەری لێ دەداو یارمەتی ئەدا، کاتێ بیستی کە ئامۆژنی وەفاتی کردوە، بەصەحابەکانی فەرموو: (قُومُوا إِلى أُمِّي) هەستن بابڕۆین بۆلای دایکم (فاطمەی کچی ئەسەد) پاشان کەچونە سەر قەبران، پێغەمبەر (ﷺ)

کراسەکەی خۆی داناو فەرموی: لەژێر کفنەکەیەوە لەبەری بکەن، ئەمجا نوێژی مردوی لەسەر کرد، کەجەنازەکەیان هەڵگرت بۆ گۆڕستان، پێغەمبەری خوا (ﷺ) جاریٚ تەرمەکەی هەڵدەگرت و جاریٚ لەپێشیەوە دەڕۆیشت و جارێکیش لەدوایەوە دەڕۆیشت، ئەمجا کەقەبرەکەی تەواو بوو، چووە ناو گۆڕەکەوەو تێیدا ڕاکێشا و پاشان بەدەستی خۆی (فاطمەی ئامۆژنی) خستە قەبرەکەوە، ئەمجا لەسەر قەبرەکە وەستاو فەرموی: ((اللهُ الَّذي يُحْيي وَيُميتُ، وَهُوَ حَيٌّ لايَمُوتُ، اللّهُمَّ اغْفِرْ لأُمِّي فاطِمَةَ بِنْتِ أَسَدٍ، وَلَقِّنْها حُجَّتَها. وَوَسِّعْهُ عَلَيْها بِحَقِّ نَبِيِّكَ وَالأَنْبياءِ مِنْ قَبْلي، فَإِنَّك أَرْحَمُ الرَّاحِمينَ)).

بەم شێوەیە دوعای بۆ دەکرد و دەیفەرموو، خوایە لە دایکم فاطمەی کچی ئەسەد خۆشبی، خوایە بەحورمەتی پێغەمبەرەکەت و هەموو پێغەمبەرانی پێش منیش گۆڕەکەی بۆ گوشاد بکەی، زمانی لەسەر وەڵامی ناوگۆڕ دامەزراو بکەی، خوایە گیان بەڕاستی تۆ بە بەزەیی ترین بەبەزەییانی. صەحابەکان عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، بە ڕاستی ئەوەی بۆ ئەمت کرد بۆ هیچ مردویەکی ترت نەکردووە! بۆچی ئاوا بوی لەگەڵی؟! فەرموی: ((إِنَّ هذهِ المَرْأَةَ كانَتْ بِمَنْزِلَةِ أُمي الَّتي وَلَدَتْني)). بەڕاستی ئەم ئافرەتە لەجێگای دایکم بوو، ئەو دایکە لێ ی لەدایکم بوم، واتە بەئەندازەی دایکم دڵسۆز و خەمخۆرم بوو!!

وە فەرموی: ((وَإِنَّما أَلْبَسْتُها قَميصي لِتُكْسَى مِنْ حُلَلِ الجَنَّةِ، وَاضْطَجَعْتُ في قَبْرِها لأُهَوِّنَ عَلَيْها عَذابَ القَبْرِ)).

واتە: بۆیە کراسەکەی خۆمم لەبەرکرد بەئومێدی ئەوەم کەخوای گەورە لەبەرگی بەهەشت لەبەری بکات و بەخشڵی بەهەشت دایپۆشیٚ، وەکاتێکیش لەناو قەبرەکەیدا ڕاکشام بە ئومێدی ئەوە وام کرد، کە خوای گەورە عەزاب و سزای ناوگۆڕی لەسەر سوك بکات.

**پاشان فەرموی:** ((رَحِمَكِ اللهُ ياأُمِّي، كُنْتِ أُمِّي، تَجُوعينَ وَتَشْبَعينَي وَتَعْرّينَ وَتَكْسَنَي، وَتَمْنَعينَ نَفْسَكِ طيبَها وَتَطْعِمينَي. تُريدينَ بذالِكَ وَجْهَ اللهِ وَالدَّارَ الآخِرَةَ)). واتە: هەزار ڕەحمەتی خوات لەسەر. ئەی دایکی خۆشەویستم، ئەی کەسێك کەخۆت برسی دەکرد، تا من تێر بکەیت، خۆت بێ پۆشاك بویت و جل و بەرگت بۆ من ئامادە دەکرد، ئەی کەسێك خۆت لە هەموو خۆشیەك بێ بەش دەکرد، تاخواردن بۆ من ساز بکەیت، ئەمەش تەنها لەبەر خواو پاداشتی ڕۆژی قیامەت..

٥- کەسی پێنجەم کەزۆر خزمەتی پێغەمبەری خوا کردوە، خاتوو خەدیجەی خێزانی بووە، وەفاداری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئەم ئافرەتە بەڕێزە ئەوەبوە: کە هەرچەند خاتووخەدیجە تەواو پیربو بوو تەمەنی لە (٦٠) ساڵی بەروژور بوو، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرگیز بیری لە هێنانی ژنی تر نەکردەوە. کە لەناو عەرەبدا لەو کاتەدا هێنانی ژنی دووەم و سێ یەم و بگرە حەوتەمیش نەك هیچ عەیبەیەك نەبووە، بەڵکو جێی شانازی پێوەکردنیش بووە!

بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەرگیز بیری لەژنی تر نەکردەوە، وە دوای وەفاتیشی کەباسی ژن هێنانەوەیان لەلا دەکرد زۆر عاجز بوو، وە هەرگیز لای هیچ خێزانێکی باسی خەدیجەی لەیاد نەکردوەو دەیفەرموو: هەرگیز خوای گەورە لەخەدیجەی باشتر پێ نەبەخشیوم، وە زۆر ڕێزی هەموو ئەو ئافرەتانەی دەگرت کە کاتی خۆی هاتوچۆی خەدیجەیان دەکرد!

وە لە فەتحی مەککەدا چووە ناو ئەو خانووە کۆنەوە کەکاتێ خۆی لەگەڵ خەدیجە خانی خێزانی دا تێیدا ژیابوو، وەلەناویا دانیشت و ئەوەندە گریا. هیچ صەحابەیەك نەما نەگریا. فەرموی: یادی ئەو ڕۆژە خۆشانەم دێتەوە یاد کە لەگەڵ خەدیجەدا لەم خانووەدا بردمانە سەر! وە هەر خێرێك لەماڵی پێغەمبەردا بکرایە وەکو سەربڕینی حەیوانێك، دەیفەرموو بۆ دۆست و خۆشەویستانی خەدیجەی بنێرن!

ئا ئەمەیە وەفاداری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ژن، جابائافرەتان بزانن، سوێند

بەخوا ئەوەی دڵسۆزی ئافرەتانەو ڕاستیان لەگەڵ دەكات تەنها پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، ئافرەتێكی تری گومناویش هەیە، كە یەك ئیشی بۆ پێغەمبەری خوا كردو خوای گەورە هێنایەوە ڕێی، ئەو ئافرەتەش (سوەیبە) بوو.
كە مژدەی لەدایك بونی محمدی برد بۆ (ئەبو لەهەب). ئەو دڵ ڕەقە لەخۆشی لەدایك بونی محمدی برازای (سوەیبە)ی ئازاد كرد! وە (سوەیبە)ی گومناوی بێ كەس هەر بەوەندەی كەهەواڵی لە دایك بونی پێغەمبەری خوای وەكو موژدە گەیاندوە. ناوی لەسیرەی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) تۆماركراوەو هەتاهەتایە دەخوێنرێتەوەو ڕەحمەتی بۆ دەنێردرێ.
٦- شەشەم كەس كەزۆر خزمەتی پێغەمبەری خوای كرد، بەڵام بەكافری مرد (أبوطالب)ی مامیەتی، بزانین وەفای بۆ ئەو چۆن بوو؟
كاتێ خاتوو خەدیجەی گواستەوەو بوو بەخاوەنی ژن و ماڵ یەكسەر بیری لە هەژاری و دەست كورتی (أبوطالب) كردەوە، بۆیە چوەلای و فەرموی: عەلی بدە بەمن، بامن بەخێوی بكەم، لەتەمەنی هەشت ساڵیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوە ماڵی مامی، (عەلی)ش كەكوڕی ئەبوطالبە تەمەنی هەشت ساڵان بوو كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بردی بۆلای خۆی، وەكو وەفایەك بۆمامی بەڵێ أبوطالب هەر چەندە موسڵمان نەبوو، بەڵام لەبەر خاتری پێغەمبەر (ﷺ) سوكترین سزای دۆزەخی هەیەو تەنها تا قولەپێكانی لەئاگردایە!
**ئیمانداران:** لێرەدا كە باسی وەفاداری پێغەمبەری خوامان (ﷺ) كرد دەڵێم:
ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆ بەخوا ئێمە ئیمانمان پێ هێناوی، بەخوا هەر لەخۆشەویستی تۆیە كەئاوا یادی لەدایك بونت دەكەینەوە، بەخوا دڵنیاشم كەتۆ لەهەموو كەس وە فادارتری بۆ شوێن كەوتوان و دۆستانت. دەتوخوا بە خۆشەویستی خۆت قبوڵمان بكە، دەی توخوا بەڵێنمان بدەیە لە شەفاعەتت بێ بەشمان نەكەی، لە ئاوی كەوسەرەكەت تینویەتیمان بشكێنی. إنْ شاءَ الله.

دڵنیاش بن کەخوای گەورە خۆی دیفاع لە قورئانەکەی دەکات، هەروەکو ڕوونمان کردەوە، کەچۆن هەر لەدایك بونیەوە، تابون بەپێغەمبەر بونی، خوای گەورە سەرپەرشتی و ئاگاداری کردوە، وەدوای بون بەپێغەمبەریش بەردەوام لەژێر چاودێری خوادا بووە. نەك هەر خوای گەورە لەمەترسیەکان پاراستویەتی، بەڵکو لەپاروە نانێکی گوماناویش پاراستویەتی.

**هاوەڵی بەڕێز (جابری کوڕی عَبْدُالله) دەفەرموێ:**

جارێکیان پێغەمبەری خواو چەند هاوەڵێکی بەلای گوندێکدا تێ دەپەڕن. ئافرەتێك نانیان بۆ ساز دەکات، لە کاتی نان خواردندا پێغەمبەری خوا (ﷺ). یەکەم کەس دەستی بۆ دەبات و ئیتر ناتوانێت بیخوات و دەفەرموێت: (هذهِ شاةٌ ذبحت بِغَيْرِ إِذْنِ أَهْلِها) واتە: ئەم مەڕە بەبێ پرسی خاوەنەکەی سەر بڕدراوە، ئافرەتەکەش دەڵێ: ئێمە لەگەڵ خێڵی سەعدی کوڕی معازدا، ئەوە لە نێوانماندا نیە، ئێمە ئاژەڵی ئەوان بەبێ پرس دەبەین و ئەوانیش هی ئێمە دەبەن!

بەڵێ ڕاست دەفەرموی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرس بەخاوەنی نەکراوە بۆ سەربڕینی. ئەم بەسەرهاتە. رَواهُ أحمد بِرِجال الصَّحيح. دەی دڵنیابن چۆن خوای گەورە دیفاع لە قورئانەکەی و پێغەمبەرەکەی دەکات، ئاواش دیفاع لە موسڵمانان دەکات، ئاواش ئەم ئیسلامە لە هەموو هەڵەیەك دەمانپارێزێ.

دەست خۆشیش بۆ ئێوەی موسڵمان و هەموو موسڵمانان کە بەڕاستی لەخزمەتی ڕێبازی پێغەمبەردان. کە ئەوەش واجبی سەرشانمانە، چونکە خوای گەورە کەهەرچی لەم ئاسمان و زەویەدایە خستویەتیە خزمەتی مرۆڤەوە، وە ئەم لاشەیەی خۆمان، هەموو خەڵات و بەخششی خوایە، تێکچونی هەر نیزامێکی ژیانمان تاڵ دەکات.

**هەر بۆ نموونە:** ئەو عەرەقەیەی کە ئێستا لاشەمان دەری دەدات ئەگەر ئەو عەرەقە ببێ بەشوشە حاڵمان چۆن دەبێ؟! جا ئایا شتی وادەبێ؟!

**بەڵێ دەبێ ئەوەتا سەیری:** (هەفتەنامەی پروشە، ژمارە: ٢٦ کەلە ٢٠٠٨/٣/٢٩ دا دەرچوە لە لاپەڕە: (٣)دا بابەتێکی بڵاوکردۆتەوە کە باس لە ژنێکی کوردستانی ڕۆژهەڵات دەکات کە خەڵکی سەردەشتە ناوی (عائیشە پیرۆت)ە تەمەنی (٢٤) ساڵە. (سُبْحانَ اللهِ) شوشە لەلاشەی دێتە دەرەوە. ماوەی (١١) ساڵە وایە، تا ئێستا (١٥) کیلۆ شوشە لە لەشی دەرهاتوە، تا ئێستا (٢٤) عەمەلیات کراوە، ئێستا دەرزی لێ دەدرێ تاوەکو شوشەکان نەبنە ئەڵماس ئەیگینا ئەیکوژێ!..

جا ئایا کە تۆ عەرەقی لاشەت ئاوا بەپوختی و بێ ئازار دێتە دەرەوەو بەڵکو لە ئازار ڕزگارت دەکات هەزاران سوپاسی خوای گەورەی ناوێ و صەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناوێ؟!

**ئیمانداران:** خوای گەورە لوطفی لەگەڵ کردوین. ئەو هەمووخەڵاتەی پێ بەخشیوین، کەچی لەهیچ شوێنێکی قورئاندا، منەتمان بەسەردا ناکات، تەنها بۆ دوو شت منەتمان لەسەر دەکات بۆ ئەوەی کە ئاینی ئیسلامی پێ خەڵات کردوین، وە پێغەمبەریشی پێ خەڵات کردوین لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ الحُجُرات: ١٧. وە لە باسی پێغەمبەریشدا دەفەرموێت:

﴿ لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴾ آل عمران: ١٦٤

**کەواتە:** لە ئیسلامەوە تێ دەگەین کە ئیسلام و پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەورەترین خەڵاتی خوان بۆمان و دەبێ هەموو لاشەو هەموو دونیامان بەقوربانی ئەو دوانە بکەین.

بەڵێ صەحابەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بەکردەوە وابون، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەروەردەی کردبون، هەر لەوکاتەی قورئانی پیرۆزی خەڵات کرا، ماندو نەبوو هەوڵی بۆدا، خویەییێکی پەروەردە کرد، چی دوژمن بوو هەموی جەم بوو، تا عەشقی پێغەمبەر (ﷺ) لەدڵی ئەو دەربهێنن، لەجێی عەشقی پێغەمبەردا درکێك بێنن بیڕوێنن، بەڵام خوێندکارەکەی (دارُالأَقَم) فەرموی: ڕازیم بەوەی هەموو لاشەم جنجن بکرێ. نەك پێغەمبەر لەماڵیشدا، بە درکێکیش ئەزیەت بدرێ.

**ئیمانداران:** بە ڕاستی هەموو ووتارێك کۆتایی پێ هێنانی ئاسانە، بەڵام کەباسی فەخری عالەم دەکەی، نازانی لەکوێوە دەست پێ بکەی و بەکوێ کۆتایی پێ بێنی، بەڵام هەروەکو (کەمالی) شاعیر دەڵێم:

نەکەم گەرمەحی ئەو زاتەی کەفەخری جینن و ئینسانە.
مەڵێن خەڵکە (کەمالی) کافر و بێ دین و ئیمانە.
گوناهکارم دەمم پیسە، ئەگەر ناوی نەبەم حەقمە
چ مەدحێکی بکەم، خۆمەحی ئەو ئایاتی قورئانە..

تاوەکو لەباسێکی تردا بەخزمەت گۆشەیەکی تری باسی ئەو خۆشەویستە دەگەینەوە بەخوای گەورەتان دەسپێرم...

# سەرچاوەكان


١. السيرَة النَبَويّة ، د.علي محمد محمد الصَّلابي ، ج١ ، ص,٨٤

٢. سِلْسلَة أَشْهُر النّساء ، أُمَّهات النَبى ، ص١٠.

٣. ژوانگەی سەروەران ، م.محمد سەنگاوی ، ل٣٩١ ، ل,١٣٠

٤. گوڵستانی ئیرەم، عوسمان سەنگاوی ، ل٣٩١ ، ,١٣٠

٥. ڕۆژنامەی یەكگرتوو، ژ: ٦٣٤ لە ٢٠٠٧/٤/١٠، ل٩ شیعری ئوسامە جەمیل.

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبهِ أجمعين.

**ئيمانداران:** مانگی مەولود لە کۆتایی دایەو سوپاس بۆ خوا بەپێی توانا هەندێ لە خزمەت ژیانی پێغەمبەری خوادابوین (ﷺ) خوای گـەورە گوفتـارو کردارمـان لیّ قبولّ بکاو ببێتە مایەی دڵخۆش بونی پێغەمبەری سەروەرمان (ﷺ).

ئومێدەوارم ئەوەی کردمان لەخۆشەویستی پێغەمبـەردا (ﷺ) ئـەو خۆشەویسـتیە بەربگرێ و بیکەین بەکردار، کە بریتی یە لە شوێن کەوتنی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾.

**کەواتە:** بەرهەمی شوێن پیّ هەڵگرتنی پێغەمبەر (ﷺ) بریتی یە لە:

خوای گەورە خۆشی دەوین و لەگوناهەکانمان خۆش دەبێت و بەر ڕەحمی خوای گەورە دەکەوین، وە قورئـان دەفـەرموێ: هەرکەسـێ دەیـەوێ بەرچـاوی ڕون بـێ و سـەر لێشێواو و بێ مامۆستا و چاو ساغ نەبێ، با شوێن پێغەمبەر بکەوێ.

﴿ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا ﴾ النـور: ٥٤. یـــان دەفـــەرموێ: ﴿ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾ الأعراف: ١٥٨.

جا ئەگەر بپرسین، باشە چی بکـەین تـاوەکو بـبین بەشـوێن کەوتـەی ڕاسـتەقینەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ؟!

**لەوەڵامدا دەڵێین: بەدووشت دەبێ.**

١- بچینە خزمەت قورئان

٢- سەیری ژیاننامەی صەحابەکان بکەین، کەچۆن شوێن کەوتەی پێغەمبەری خـوا بون، قورئانی پیرۆز لە سورەتی (الحُجُـــرات) دا دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾

**إبنُ عبُّاس:** دەفەرموێ مانای ئایەتەکە وایە کـە: (لاتَقُولُـوا خِـلافَ الكِتَـابِ وَالسُّنَّةِ). واتـە: قسـەیەك مەکـەن و بڕیارێـك مـەدەن کـە پێچـەوانەی قورئـان و فەرمودەکانی پێغەمبـەر بـێ. وە هـەر لەسورەتی (الحُجُـرات) ئایـەتی (٢) دا

دەفــــەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ﴾.

**بابزانین هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە چی بوو؟**

بوخاری لە عَبْدُاللهِ ی کوڕی زوبــەیرەوە گێڕاویەتیــەوەو دەفــەرموێ: چــەند ووشــتر ســوارێکی هــۆزی تــەمیم هــاتن بــۆ خزمــەت پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) ، داوای سەرکردەیەکیان کرد. حەزرەتی ئەبوبەکری صدیق فەرموی: ئەی پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) قەعقاعی کوڕی مەعبەدی کوڕی زورارە بکە بەئەمیرو گەورەیان، حــەزرەتی عومەریش فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (ئــەقرەعی کــوڕی حــابیس بکــە بەئەمیرو گەورەیان. حەزرەتی ئــەبوبکر پێــی نــاخۆش بــوو!. بــەئیمامی عومــەری فەرموو: (ماأَرَدْتَ إِلاَّ خِلافِي) تــۆ لــەم پێشــنیارەت تــەنها مەبەســتت ئــەوە بــوو کەڕکەبەرایەتی من بکەیت. حەزرەتی عومەریش فەرموی: (مــاأَرَدْتُ خِلافَــكَ) مەبەستم جیاوازی قسەی تۆ نەبوو.

ئیتر بوو بەدەمە قاڵییان و دەنگیان بەرز بۆوە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ). ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کەماناکەی ئەوەیە: ئەی ئەوانەی باوەڕتــان هێنــاوە: دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا (ﷺ) بەرز مەکەنەوە لەکاتی گفتوگۆدا. قسە بێ پەردە مەکەن لەخزمەتیدا وەکو بۆ یەکتری دەکەن. نەوەکو کردەوەکانتــان پــوچ بێتەوە و هەستیشی پێ نەکەن. حەزرەتی ابوبکری صدیق کەئــەم ئایەتــەی بیســت خێرا تەوبەی کردو فەرموی:

(یارَسُولَ اللهِ آلَیْتُ أَنْ لاأُکَلِّمَكَ إلاَّ کَأَخي السرارِ).

ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بــەڵێن دەدەم کەلەمــەودوا قســە لەخزمەتتــدا نەکــەم مەگەر وەکو کەسێ کەبە چرپە لەگەڵ هاوڕێکەیدا دەدوێ.

**حەزرەتی عومــەریش خێرا تــەوبەی کردو** (إِبنُ الزُّبَیر) **دەفــەرموێ:** (فَما کانَ عُمَر یُسْمَعُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) بَعْدَ هذهِ الآیَةِ حَتَّــی یَسْــتَفْهِمَهُ). واتــە: دوای هاتنــە

خوارەوەی ئەو ئایەتە حەزرەتی عومەر وابە نزمی قسەی دەکرد کەپێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: ئەوە دەڵێی چی ئەی عومەر تێت نەگەیشتم؟!
یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) ناوی (ثابت بن قَیْس) بوو، دەنگی گەورە و زل بوو، کەئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، هێزی ڕۆیشتنی نەماو دانیشت و دەستی کرد بەگریان. صەحابەکان چون بۆلای و ووتیان: ئەوە بۆ دەگری؟!
فەرموی: (أُنْزِلَتْ هذهِ الآيَة. وَلَقَدْ عَلِمْتُمْ أَنِّي مِنْ أَرْفَعِكُمْ صَوْتاً عَلى رَسُولِ الله (ﷺ) فأَنا مِنْ أَهْلِ النَّارِ). واتە: ئەم ئایەتە قورئانیەی سورەتی الحُجرات. ئایەتی (٢) هاتۆتە خوارەوەو بە ڕاستی ئێوەش هەموو باش دەزانن کە من لە هەموتان دەنگم بەرزترەو کەقسەدەکەم دەنگم بەسەر پێغەمبەری خوادا (ﷺ) لەهەموتان زیاتر بەرز دەبێتەوە.
دەی کەواتە: من لە ئەهلی ئاگرم: صەحابەکان ئەمەیان گەیاندەوە بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش بانگی کردو فەرموی: ئەی (ثابت) ئایا ڕازی نابی کەبەژیانێکی بەختەوەری بژی و بەشەهیدی بمری و بچیتە ناو بەهەشتەوە؟!
فەرموی: قوربان ڕازیم و هەرگیزاو هەرگیز دەنگیشم لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) بەرز ناکەمەوە.
**ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێ:** پابتی کوڕی قەیس، لە خزمەت پێغەمبەردا بوو. کاتێ کەپێغەمبەر قسەی بۆ کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر بکردایە، پابت قسەکەی بەدەنگی بەرز دەگەیاند بەخەڵکەکە. کەئەم ئایەتە هات، لەبەرئەوەی دەنگی گەورە و بەرز بوو، گەلێ جار نەئەچوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ، لە ترسی ئەوەی نەوەکا لەبێ ئاگایی دا، بەدەنگی بەرز لەخزمەتیا قسەبکات، اللّه أکبر، چۆن لەقورئانەوە فێری ئەدەب بون لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ).
**جا ئیمانداران سەرنج بدەن.** ئەگەر ئەم ئایەتە هەڕەشە بێت بۆ ئەو کەسانەی کەدەنگی لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) بەرز بکاتەوە. ئەی گومانتان چی یە

بەوکەسەی کەبیرو بۆچونی خۆی لەسەر فەرمودەی پێغەمبەری خـوادا (ﷺ) پـێش دەخات. بەڵێ یاسای دەستکردی مرۆڤ کرد پـێش دەخـات بەسـەر شـەرعی خـواو پێغەمبەردا (ﷺ) ئەڵێ ی: پێغەمبەر (ﷺ) وای فەرموە: ئـەڵێ: ئـاخر مـن وام حەز لێ یە!!

قورئانیش دەفەرموێ: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾ النساء: ٦٥

لە دوای پێغەمبەری خواش (ﷺ) شەرعەکەی هەر ماوەو مرۆڤی موسڵمان دەبێت بەوپەڕی مل کەچی و قەناعەتی دڵەوە مل کەچی فەرمان و بڕیارەکانی شەرع بێت.

**ئیمانداران:** ئاگادارbن یەکێ لەپیلانی دوژمنانی دین و ئیمانەکەمان ئەوەیە دەڵێن: موسڵمان باهەتا پێستی ناوچەوانی بەسوجدەوە دەڕوات، بۆ خۆی هەر نوێـژ بکـات ئازادە. بەڵام شەریعەتی ئیسلام بۆ ئەم سەردەمە ناشێت و نابێ بەڕێوەبردنی وڵات بەپێی بنەماکانی ئاینی ئیسلام بێت، جا هەرکەسێ بەم بۆ چون و بیرە بۆگەنە ڕازی بێت، ئەوە هیچ پەیوەندییەکی بەئاینی ئیسلامەوە نامێنێت. بۆیـە دەبـێ ئاگـادار بین، هەر زانینی فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) و گوێ گـرتن لێـی لـەوتاری ڕۆژانـی جومعەدا بەس نیە.

بەڵکو هەزار ڕەحمەت لەپێشەوا. (إبنُ القيّم) بێ کە لەکتێبە بەنرخەکەیـدا (الفَوائِد ص١٠٧) دا دەفـەرموێ: (وَالأيمانُ هُوَ حَقيقَةٌ مُرَكَّبَةٌ مِنْ مَعْرِفَةِ ماجاءَ بِـهِ (ﷺ) عِلْماً، وَالتَّصْديقُ بِهِ عَقْداً، وَالأقْرارُ بِهِ نُطْقاً، وَالأنْقِيادُ بِهِ مَحَبَّةً وَخُضُوعاً، وَالعَمَلُ بِهِ باطِناً وَظاهِراً، وَتَنْفيذُهُ وَالدَّعْوَةُ إلَيْهِ بِحَسَـبِ الأمْكـانِ). واتـە: ئیمـان ئـەو حەقیقەتەیـە کـەپێك هاتویەکـە لەناسـینی ئـەوەی کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هێناویەتی وەکو زانیاری بیزانی پاشان بڕوای پێ بکەی و بەڕاستی دابنـێ ی وەکـو پەیمانێك پابەندبی پێوەی. وە بەزمانیش دانی پێدا بنێی، وە پاشانیش تەسلیمی بی

به ئەو پەڕی خۆشەویستی و مل کەچ بونـەوە. وە کـاری پـێ بکـەی جانـەك هـەر لەبەرچاوی خەڵك بەڵکو لەناودو لەدەرەوەتدا. وە هەوڵی جێبـەجێ کردنـی بـدەی و وابکەی کە بکرێ بەدەستوری وولات، وە بانگەوازیشی بۆ بکـەی بـەپێی بۆلـوان و بۆکران...

با سەرێك لە ژیانی پڕ بەرەکەتی هاوەڵانی پێغەمبـەر (ﷺ) بـدەین. بـزانین چـۆن صەحابەکان بەبێ هیچ دودڵی و پرسیارێك شوێن پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەکەوتن:

**ئیمامی بوخاری (٧٢٥٢) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ:**

**بەڕائی کوڕی عازب فەرموی:** کاتێ قیبلە لە (بَيْتُ الْمُقَدَّس) دوە، گۆڕا بۆ کەعبە، کابرایەك لـە خزمـەت پێغەمبـەردا بـوو (ﷺ). کـە قیبلـە گـۆڕا، پێغەمبـەری خوا(ﷺ) ڕوی کردە کەعبە، ئەم پیـاوە دوای نوێژەکـە لـە خزمـەت پێغەمبـەری خوادا هەڵسـا و ڕۆیشـت بـەلای کۆمـەڵێك لـە ئەنصـار، بینـی وا نوێـژ دەکـەن. ئیتر وەستاو بانگی کردن (لە کاتێکا ئەوان لە نوێژەکەدا بون) پێی ووتـن: مـن لـە خزمەت پێغەمبەری خوادا بوم و قیبلە گۆڕا بۆ کەعبە و پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ڕوی کردە کەعبە لەنوێژەکەیدا. دەی ئیتر پێویستە ئێـوەش وابکـەن. دەفـەرموێ: کەصەحابەکان لەناو نوێژەکەیاندا گوێیان لەو هەواڵە بوو.

یەکسەر: (فَانْحَرَفُوا وَهُمْ رُكُوعٌ فِي صلاة العَصْرِ). ڕویان کردە کەعبـەو وەرسـوڕان لە بَيْتُ المُقَدَّس، لەوکاتەدا کەلە ڕکوع دابون و نوێژەکەش نوێژی عەسر بوو.

(سُبْحانَ الله). لـە ڕکـوع هەڵنەسـتانەوە کەشـوێن کەوتـەی پێغەمبـەریان کـرد. نەیانگوت با جارێ ئەم نوێژە بەم شێوەیە تەواو بکەین، دوایـی پرسـیار دەکـەین و بزانین چۆن قیبلە گۆڕاوەو کە تێی گەیشتین ئەمجا جێبەجێی دەکەین. نـەخێر بـەڵکو یەکسەر جێبەجێ یان کرد. هەر لەناو نوێژەکەدا. وە لە فەرمودەیەکی تردا صَحيح سُنَن أَبِي داود (٩٦٦) دا هاتوە و ئەلبانی تەصحیحی کردوە ئاوا دەفەرموێ:

عَنْ جابِر، قالَ: لَمّا استوى رَسُولُ الله (ﷺ) يَوْمَ الجُمُعَةِ، قالَ: إجْلِسُوا. فَسَمِعَ ذالِكَ ابنُ مَسْعُود. فَجَلَس عَلى بابِ المَسْجدِ، فَرَآهُ رَسُولُ الله (ﷺ) فَقالَ: تَعالَ ياعبدالله بْنِ مَسْعُود

واته: کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەڕۆژی جومعەدا دەچوە سەر مینبەر ڕادەوەستاو دەستی دەکرد بەخوگبە خوێندنەوە. فەرموی: دانیشن. عبدُالله ی کوڕی مسْعُود گوێی لێ بوو کەپێغەمبەر (ﷺ) فەرموی دانیشن. یەکسەر دانیشت لەشوێنی خۆی لەکاتێکدا لەبەردەم دەرگای مزگەوتەکەدا بوو،

واته: نەهاتە ژورەوەو هەر لەوسەر ڕێیە یەکسەر دانیشت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاوی لێ بوو فەرموی: وەرە ئەی عبدالله ی کوڕی مَسْعُود، واتە: تۆ وەرە پێشەوە، مەبەستم لەتۆ نەبوو کە دانیشی چونکە تۆ هێشتا نەهاتویتە ناو مزگەوتەوە.

چاوت لێیە یەك چرکە جێبەجێ کردنی فەرمانەکەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) دوانەخست.

- **نمونەیەکی تر** لەسەر گوێڕایەڵی صەحابەکان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ).

ئەوەیە کە ئیمامی بوخاری بەژمارە: (٧٢٩٨) هێناویەتی لە ابن عومەرەوە کە دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەموستیلەیەکی زێڕی لەپەنجە کردو خەڵکەیش کەئەوەیان بینی، لە خۆشەویستی پێغەمبەردا هەموو ئەموستیلەی زێڕیان دروست کردو لەپەنجەیان کرد، پاش ماوەیەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: **((إنِّي اتَّخَذْتُ خاتَماً مِنْ ذَهَبٍ، فَنَبَذَهُ. وَقالَ: إنِّي لَنْ أَلْبَسَهُ أَبَداً، فَنَبَذَ النَّاسُ خَواتِمَهُم))**. واته: بەڕاستی من ئەموستیلەی زێڕم لەپەنجەم کرد، پاشان فڕێی داو فەرموی بەڕاستی جارێکی تر من ئەموستیلەی زێڕ لە پەنجەم ناکەمەوە، ئیتر کە صەحابەکان بینییان پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەموستیلەکەی خۆی فڕێ دا. هەموو خەڵکەکە ئەموستیلە زێڕەکانی خۆیان لە پەنجەیان دەرهێناو فڕێیان دا!..

- **نمونەیەکی تر** لە گوێڕایەڵی هاوەڵان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەیە کە پێشەوایانی فەرمودە: بوخاری (٤٤١٨) و موسلیم (٢٧٦٩) بۆمان دەگێڕنەوە لە

بەسەرهاتەکەی کەعبی کوڕی مالیك دا، ئەو صەحابەیەی کە نەفس و ئارەزوی ناو باخە خۆشەکەی وای لێ کرد لە غەزای (تەبوك) دوابکەوێت ئیتر ئەوە بوو کەدواتر چوە خزمەت پێغەمبەری خواو ڕاستی باسەکەی تێ گەیاند و هیچ عوزرو بەهانەیەکی درۆزنانەی دروست نەکرد. ئەوەبوو وەکو عقوبەیەکی سەربازی **پێغەمبەری خوا** (ﷺ) **فەرموی:** بەکەعبی کوڕی مالیك بڵێن: نزیك خێزانەکەی نەبێتەوە. کەعب فەرموی: تەلاقی بدەم، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: نەخێر تەلاقی مەدە، بەڵکو هەر لێی نزیك مەبەوە. (بەبێ هیچ موناقەشەیەك بێ ئەوەی بڵێ، جائەگەر تەلاقی نەدەم و هەر حەلاڵی خۆم بێ، ئیتر بۆچی لام نەبێ؟!)

بەڵکو یەکسەر فەرموی: بەسەرچاو ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، چووە ماڵەوەو بە ژنەکەی خۆی فەرموو: ((**أَلْحِقِي بِأَهْلِكِ، فَكُونِي عِنْدَهُم، حَتَّى يَقْضِيَ اللهُ فِي هذا الأَمْرِ**)) واتە: بڕۆرەوە بۆلای کەس و کارەکەت و لای ئەوان بمێنەرەوە. هەتاوەکو خوای گەورە بڕیاری خۆی لەم ئیشەی ئێمەدا دەردەکات نابێ من و تۆ لەیەك نزیك ببینەوە!

ئەوەبوو ماوەی پەنجا ڕۆژ، کەعب و ژنەکەی لێك دابڕان. تائایەتی قورئان هاتە خوارەوەو ئیتر موژدەی لێخۆشبونی بۆ کەعب تێ دا بوو. وەڕێگەی دا کەبچێتە وە بۆلای خێزانەکەی و بەیەك شاد بونەوە.

**نمونەیەك لەئافرەتان:**

ژن و مێردێك هەبوون لەشاری مەدینە، پیاوەکە ناوی (مُغيث) بوو. ژنەکەی ناوی (بريرە) بوو. ناکۆکی کەوتە نێوانیان و ژنەکەی تۆرا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوو بۆلای ژنەکەو فەرموی: (يا بريرَةَ لَوْ راجَعْتَهُ) ئەی بەریرە خۆزگە بچویتایەوە بۆلای مُغيث، یەکسەر ئەم ئافرەتە ووتی: يارَسُولَ اللهِ أَتَأْمُرُ؟ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا فەرمانم پێ دەکەی بچمەوە لای — واتە بە مانا ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر ئەمر دەفەرموی بۆچونەوەم بۆلای ئەوە زەهریش بێ دەیخۆم و بەقسەت دەکەم.

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموی: (إِنَّما أَنا أَشْفَعُ) من تەنها تکا کارم و زۆرم لەسەرت نیە و ئارەزووی خۆت چونە ئاوا بکە.

**سەرنج بدەن،** ئەم ژنە چەند لە مێردەکەی بێزارە، کە بەهیچ شێوەیەك ناتوانێ لەگەڵی بژی بەلاّم ئەگەر فەرمانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەربێ. ئەوا بێ چەند و چون دەچیتەوە لای و ناتۆرێ!

**نمونەیەکی تر لەگوێڕایەڵی ئافرەتان:**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بینی کەپیاوان و ژنان لەمزگەوت دەهاتنە دەرەوە. تێکەڵیەك دروست دەبوو. بۆیە بەژنانی فەرموو: خۆتان دواخەن و تێکەلاّوی پیاوان مەبن و هەوڵ بدەن ئەی خوشکان و دایکان، کەئەملاو ئەولای ڕێگاکە بگرن، بۆئەوەی پیاوانیش بەناوتان دا بێن و بەریەك نەکەون. هەر کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم چەند قسەی پێ فەرمون: (كانَتِ المَرْأَةُ تَلْتَصِقُ بالْجدارِ حَتَّى إِنَّ ثَوْبَها، لَيَتَعَلَّقُ بالْجدارِ مِنْ لُصُوقِها بِهِ) رواهُ أبوداود وحَسَّنَهُ الألْباني في السلسلة الصَّحيحَة (٨٦٥)..واتە: کاتێ ئافرەتان ئەو ڕێنماییەی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) بیست، ئەوەندە خۆیان بەدیوارەوە دەنوساند وپاڵیان دەدایە لادیوارەکان. هەتاوەکو جل وبەرگەکەیان بەدیوارەکەوە دەنوساند!!.

صەحابەیەکی تر ناوی (عَبْدُالله ی کوڕی ئیمامی عومەرە) هەموو کاتێ هەربەپێ دەڕۆیشت بۆ مزگەوتی (قُباء) لێیان پرسی: بۆچی بەسواری ناڕۆی؟! خۆ وولاّخی سواری هەیە و بۆچی ئاوا خۆت عەزیەت دەدەی؟!

فەرموی: (رَأَيْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) يَمْشي إِلى هذا المَسْجدِ حَتَّى يَأَتِيَ فَيُصَلِّي فيهِ. فَأَنا أُحبُ أَنْ أَمْشي إِلَيهِ كَما رَأَيْتُهُ يَمْشي!!).

واتە: پێغەمبەری خوام بینی کەبەردەوام هەربەپێ دەڕۆیشت بۆ ئەو مزگەوتە مزگەوتی (قوباء) وە نوێژی تێدا دەکرد. جا منیش حەزدەکەم کە بەپێ بڕۆم بۆ ئەو مزگەوتە. چۆنم بینیوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەپێ ڕۆیشتوە!..

صەحابەنی پایە بەرزیش (عیمرانی کوڕی حوصەین) فەرمویەتی: (ما مَسَسْتُ ذَكَرِي بِيمِينِي مُنْذُ بايَعْتُ بِها رَسُولَ الله (ﷺ). رَواهُ أَحْمَد وَصَحَّحَهُ الحاكم.

واتە: لەو ڕۆژەوە کە پەیمانم بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) داوە ودەستم خستۆتە ناودەستیەوە ئیتر دەستم لەئەندامی زاوزێم نەداوە بەدەستی ڕاستم. ئەو دەستەی کەخستومەتە ناودەستی پیرۆزی پێغەمبەرەوە (ﷺ).

بە ڕاستی ئەوە چەند نمونەیەك بون لەخۆشەویستی ڕاستەقینە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ).

**ئیمانداران:** پێغەمبەری خۆشەویستمان دەبێ بۆ عیبادەتی خوای گەورەش لەوەی ئەو بۆی دیاری کردوین لانەدەین، ئەگینا لێمان قبوڵ ناکرێ.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: ((**مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْس عَلَيْهِ أَمْرُنا فَهُوَ رَدٌّ**)). رَواهُ البُخاري وَمُسْلِم.

واتە: هەرکەسێك کردەوەیەك بکات (لەکاروباری عیبادەت وخواپەرستی دا) بەگوێرەی ڕێنمایی وفەرمانی ئێمە نەبێ، ئەوا بەسەریدا دەدرێتەوە ولێ ی قبوڵ ناکرێ.

**فوزەیلی کوڕی عیاض لە تەفسیری ئایەتی:** ﴿ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ هود: ٧. دا فەرمویەتی: أَخْلَصُهُ وَأَصْوَبُهُ. عەرزیان کرد مانای چی یە؟! فەرموی: الخالِصُ أَنْ يَكُونَ لِلّٰهِ: پوخت و پاڵەفتە ئەوەیە کە تەنها بۆخاتری ڕەزامەندی خوا ئەنجام درابێت و (الصَّواب)یش ئەوەیە: أَنْ يَكُونَ عَلى سُنَّةِ رَسُولِ الله (ﷺ).

واتە: لەسەر سوننەت وفەرمان وڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) ئەنجام درابێت.

**ئیمانداران:** ئەوکەسەش کە سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) بکات، جاتاکە کەسێ بێ. یان خێزانێك بێ یاخود حکومەت وگەل ومیللەت و دەسەڵاتێك بێ، ئەوە چارەنوسیەتی کە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ النور: ٦٣.

بەڵێ ئەو کەسەی سەرپێچی لە فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) بکات ئەوا لە دنیادا توشی فیتنە وتاقی کردنەوەی سەختی وادەبێت، کەلەژێری دەرناچێ و لە چارەسەریدا سەرگەردان دەبێ و ناخۆشی لەسەر ناخۆشی یەخەی دەگرێت. وە لە قیامەتیشدا سزایەکی زۆر سەختی بۆ هەیە.

**پێشەوای فەرمودە (موسلیم)** بەژمارە فەرمودەی: (٢٠٢١) هێناویەتی ولەسەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە دەگێڕێتەوەکەفەرمویەتی: جارێکیان پیاوێك لەگەڵ پێغەمبەری خوادا نان دەخوات، بەدەستی چەپی دەخوات. پێغەمبەری خواش (ﷺ) دەفەرمویێت: ((كُلْ بِيَمِينِكَ)) بەدەستی ڕاستەت بخۆ. کابرا دەڵێ: ناتوانم. بەڵام ڕاست ناکات، لەبەر لوت بەرزی وگوێ نەدان بە فارمایشتەکەی پێغەمبەر (ﷺ) وادەڵێت. ئیتر پێغەمبەری خواش (ﷺ) دەفەرمویێت: ((لا اسْتَطَعْتَ مامَنَعَهُ إلاّ الكِبْرُ)) دەی یاخوا هەرگیز نەتوانی بەدەستی ڕاستت نان بخۆی. بۆیەش ئەو دوعایەی لێ کرد چونکە تەنها خۆبەزل زانین ولوت بەرزی وای لێ کرد ئامۆژگاریە زێڕینەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕەت بکاتەوە. سُبْحانَ اللهُ، هەرلەو مەجلیسەدا کابرا دەستی ووشك بوو. شەلەل لێی دا ودەستی بۆنەبرا بۆ دەمی!

دەی سوێند بەخوا، هەرمێشکێك دژی ڕێبازی پێغەمبەر بیربکاتەوە، ئەوا ئەو مێشکە وئەو فکرە وئەو بیردۆزەش توشی شەلەل دەبێ ونەزۆك دەردەچێ، بەچاوی خۆمان بینیمان بیری کۆمۆنیستی دوای (٧٠) ساڵ هەرەسی هێنا، دوای ئەوەی بەملیۆن مرۆڤ بونە قوربانی و وولاتی کاول کردو ڕوسیای ڕوسیا کرد!

بەوردی بیربکەنەوە غەیری ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) کام ڕێبازەیە کەبەدەیان جار دەستکاری نەکرابێ وئەوەی دوێنێ باش بوە ئەمڕۆ بەکەڵك نەهاتوە!

مانگی چواری ساڵی (٢٠٠٨) بوو لە کەناڵی (کوردسات) لە بەرنامەی (کولتور و ڕۆشنگەری) گوێم لە ئافرەتێك بوو لەو ئافرەتانەی کە داکۆکی لە مافی ئافرەتان دەکەن. ئەو ئافرەتە ووتی: دەبێ قانون دەستکاری بکرێ، چونکە کاتی

خۆی پیاو دایناوه وزوڵمی لەژن کردوه... ئەم قسەیە تاڕادەیەك ڕاستە چونكە ئەگەر قانونێك پیاو دایبنێ بێگومان مافی تەواو بەژن نادات.

خۆ ئەگەر ئەمجارە ژن قانونەكە دابنێ، پاش چەند ساڵێكی تر دەبێ پیاوان دەست بكەنەوە بەگلەیی وگازندەیی وداوای گۆڕینی بكەن چونكە ستەمی لەپیاو كردوە ومافی تەواوی خۆی نەداوەتێ!

**لەمەوە تێ دەگەین:** بۆئەوەی هەموو كەس مافی خۆی بدرێتێ وكەس ستەم لێكراو نەبێ دەبێ و هەردەبێ واش بێ كە خالیق و دروستكەری مرۆڤ قانون و ڕێسای ژیان بۆ مرۆڤ دابنێ.

پێغەمبەرم. ئەی سەروەرم. ئەوەی وەكو ئەبولەهەب كۆڵە دڕك دەخاتە ڕێت. وەكو وەلید پێت ئەڵێ جادووگەر وشێت. با لەداخا هەرسوێی وەبێت. تۆ ناوت هەر بەرزترە و ئەو ﴿تَبَّتۡ يَدَآ﴾ی پێ دەبڕێت.

هەرچی بەرنامەی دەستكردە، ئیفلاس دەكا و هەڕاج دەكرێت، دیسان خۆری پەیامەكەت بەسەر ئەوروپادا هەڵدێت، خەڵكی پۆل پۆل وەری دەگرێت. لە بۆی دەژی، لە بۆی دەمرێت. دەی ناحەزت باشەق بەرێت. بۆ كوێ دەچێت، دەمرێ و دەبڕێ ودەڕزێ ودەپوێت. پەنجەی حەسرەتی دەگەزێ لە دۆزەخا، كەئیمانی نەهێنا پێت. ئەی خاتەمی پێغەمبەران، لە خاكی كوردستانەوە، لە لوتكەی جودی وسورێن وهەڵگورد وشەمێرانەوە. سڵاوەتمان بەتین وتاو، دەنێرین بۆتۆی سەروەرمان، قورئان وسوننەتەكانت تاجی سەرمان.

تەنها ساتێك لێت دابڕێین، وەكو ماسی بێ ئاو دەبین، پەپولەی باڵ وسوتاو دەبین. حەنانی ناو دەڵەكانمان بۆ تۆیە وبەس. ئەی فریاد ڕەس. تۆی خزم وكەس، ئەگەر تۆ بدەین لەدەس، كام جەنتڵمان بكەین بەكەس

**ئیماندارانی بەڕێز:** ڕەحمەتی خوا لەهەموو لایەکمان بێت، بائەوەی لەم جومعەیەدا، لەم ووتارەدا بیستمان، هەرقسە نەبێ. باسی کردەوەمان کرد، دەی بائێمەش بەکردەوە شوێن پێغەمبەری خوا بکەوین (ﷺ).

چەند پێویستە لەماڵی خۆتا دانیشی، لە دوکانەکەتدا، لە فەرمانگەکەتدا، لە خوێندنگاو زانکۆکەتدا، لە ناو ئۆتۆمبێلەکەتدا. ڕابمێنی وبیربکەیتەوە. بهێنە خەیاڵی خۆتەوە، والەدەرگا دەدرێ، کاتێ دەچی دەرگا دەکەیتەوە سەرسام دەبی، دەڵێ ی: قوربان، ئەو هەموو نور وخێرو بەرەکەتەم هەرگیز نەبینیوە، ئەوە جەنابت کێ ی؟! ئەویش فەرموی: من پێغەمبەری خوام (ﷺ). ئالێرەدا بیربکەرەوە. ئایا لەڕووت دێ بڵێ ی: ئەی پێغەمبەری خوا وەرە ژورەوە لە خزمەتتدام. وەڵامەکەی لای خۆتە. بەداخەوە زۆرکەس لەڕوی نایەت پێشوازی لێ بکات، چونکە ماڵەکەی، کچ وکوڕەکانی، کتێب وگۆڤارەکانی، سەتەلایت وکەناڵەکانی، سیدی وشریتەکانی، هەرچی شێوەی ماڵە و موسڵمان بێ پێوەی نی یە!! بەداخەوە

ئای چەند خۆشیشە ماڵەکەت ڕازاوە بێ بە قورئان وکتێبی حەدیس و زانستی بەسود، ماڵ ومناڵەکەت ئەو پۆشاکەی لە بەردابێ کە پێغەمبەری خوا پێی ڕازی یە و سورەتی (النُّور) بەیانی کردەوە. ماڵەکەت پڕبێ لە ڕێز وقەدرو حورمەتی یەکتری. نوێژی جەماعەتی تێدا بکرێ، ڕێزی باوك ودایك و نەنك و باپیرەی تێدا بگیرێ. گەورە وبچوکی هەبێ. ئای ئەوکاتە چۆن پەلاماری دەستی پیرۆزی دەدەی وماچی دەکەی وفەرموی لێ دەکەی وکاتێکیش ئەو نوری چاوە دێتە ژورەوە وئەو ماڵە جوانە پڕ لە دینداری وڕێز وحورمەتە دەبینێ لە ئامێزت دەگرێ ودەفەرموێ: ئای ڕەحمەتی خوا لەخۆت و ماڵ و مناڵت بێ و بەرکەتی خواتان بەسەردا بڕژێ، من دەڕۆم و شوێنی یەکتربینینەوەمان سەر حەوزی کەوسەرەکەم بێ..

مامۆستایەکی خەمخۆری ئەم ئیسلامە وعاشقی ڕێبازی پێغەمبەرە (ﷺ) گێڕایەوە وفەرموی: کوڕێکی گەنجی زۆر بەدین بۆی باس کردم وەکو شوکرانە بژێری خوا بۆی گێڕامەوە وفەرموی: شەوێك لەخەوما بەخزمەت پێغەمبەری خوا گەیشتم. دەستم زیارەت کرد وعەرزم کرد:

ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من بەلای تۆوە چۆنم؟! ئایا قبولّم دەکەی؟ دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەپەنجە پیرۆزەکانی. پەنجەی برد بۆ هەردوو چاوی وفەرموی: تۆ هەردوو چاوی منی!.. الله أكبر لەو بەختەوەری یە. لەو سەرفرازی یە. لەو مەدالیای ڕێزە. ئەمەش بەوە دەست دەکەوێ، هەمیشە پێغەمبەری خوات لەیادبێ و صلاّوەتی لە دیدار لیّ بدەی وپیّ بەپیّ ی ئەو خۆشەویستە لەم ژیانەدا هەنگاوبنیّ ی.

ودبا هەموشمان ئاگاداربین، کەپێغەمبەری خۆشەویستمان چەند کردەوەیەکی دیاری کردوە و فەرمویەتی هەرکەسیّ، هەرخێزانی، هەر کاسبکاریّ، یان دەولّەمەند و دەسەلاّتیّ، ئەمە پیشەی بیّ ئەوە من لیّ ی عاجزم و بە ئومەتی خۆمی قبولّ ناکەم.

**خوای گەورە لە وانەمان بپارێزیّ، ئەو ڕەوشتە نابەجیّ و ناپەسەندانەش وەکو:**

١- غەش کردن ((مَنْ غَشَّنا فَلَّيْس مِنّا)) رَواهُ مُسْلِم.

جا باوك ودایك غەش لە ڕۆلّەکانیان بکەن بەوەی کە لەسەر دینداری وخواناسی پەروەردەیان نەکەن. منالّ غەش لەباوك ودایکی بکات بەوەی بیّ گوێییان بکات. قوتابی لە تاقی کردنەوەدا غەش (قۆپیە) بکات. مامۆستا هەموو توانای خۆی لە پەروەردە وفێرکردنی قوتابیەکانیدا بەکارنەهێنیّ، دکتۆر بەرامبەر نەخۆش

کەمتەرخەمی بکات. ئەندازیار و وەستا وکرێکار وبەلێندەر (بیناکە) باش دروست نەکەن ودوای ساڵێك هەڵبوەشێ وئاو بێتەژورەوە!

دوکاندار وبازرگان غەش بکات بەتەرازوبازی وسوێندی درۆ وفروشتنی شتی بەسەر چوو بەهاوڵاتیەکی دڵپاکی خۆشباوەڕ.

فەرمانبەر بەغەش کردنی لە دائیرەکەی بەوەی لەنیوەی دەوامدا دەڕواتەوە.

یان نیوەی کاتەکەی بەمۆبایل وقسەی شەخصی خۆی بەسەر دەبات وئیشی هاوڵاتیەکە ڕاپی ناکات! ئەمانە هەموو پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێیان عاجزە وپێویستە تەوبەی لێ بکەن تاوەکو لەژێر ئاڵاو خەیمەی ئەو سەروەر وسالارەدا جێگایان ببێتەوە.

٢- خۆشەویست (ﷺ) فەرموی: ((مَنْ حَمَلَ عَلَيْنا السِّلاحَ فلَيْس مِنّا)) رَواهُ مُسْلِم. واتە: هەرکەسێ چەکمان دژ هەڵبگرێ لە ئێمە نیە.

جابا ئاگاداربین وبزانین ئەمڕۆ چەك هەر بەو ئامێرە ناوترێ کە ئاگر وئاسن دەبارێنێ بەسەر مرۆڤداو ڕۆحی دەردەکات و لاشەی خوێناوی دەکات، بەڵکو زۆر جۆرە چەکی تریشمان هەیە ئافرەتی سفورو خۆڕوتکەرەوە چەکێکە بەدەستی ناحەزانی ئیسلامەوە، بۆ لە ناوبردنی گەنج ولاوەکانمان، سیدی خراپ وبەدڕەوشتی، کەناڵ و تەلەفزیۆن گۆڤارو ڕۆژنامەیەك.

کە هەموو هەدەفەکەی چڕکردۆتەوە لە دژایەتی ئیسلام و لەسەر نوسینی، سوکایەتی پێ کردنی، گومان خستنە ناو دڵی موسڵمانی بەستەزمان وبێ ئاگاوە. ئەمانە چەکی سەردەمن بۆ لێدانی ئیسلام وموسڵمانان و هەرکەسێ لەگەڵیان بێ و هاوکاریان بێ وپشتگیریان بکات، بەر ئەو فەرمودەیە دەکەوێت.

٣- پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: ((لَيْسَ مِنّا مَنْ لَطَمَ الخُدُودَ وَشَقَّ الجُيُوبَ أَوْ دَعى بِدَعْوى الجاهِلِيَّةِ)) رَواهُ أَحْمَد.

واتە: لە ئێمە نیە ئەوکەسەی لەکاتێکا کەسێکی خۆشەویستی دەمرێت ڕومەتی دەرنێتەوە ویەخەی دادەڕێ. یان بە بانگەوازی سەردەمی نەفامی شیوەن بۆ مردوەکەی دەکات. بەڵێ ئەمڕۆ ئەوەی پابەندی تەواوی بە ئیسلامەوە نەبێت شایی و شیوەنی ناشەرعیە.

٤- ((لَيْس مِنّا مَنْ لَمْ يُوَقِّرَ الكَبيرَ، وَيَرْحَمَ الصَغيرَ، وَيَأْمُرُ بالَمعرُوفِ وَيَنْهَى عَنِ المُنْكَرِ)) رَواهُ أَحمد.

واتە: لە ئێمە نیە ئەوکەسەی ڕێز لە گەورەتر لەخۆی نەگرێ و بەزەیی بە بچوکتر لە خۆیدا نەیەتەوە وە فەرمان نەکات بەچاکە و ڕێگری نەکات لە خراپە.

بەداخەوە، ئەمڕۆ لەژێر پەردەی( ئازادیدا) ڕێزگرتن لەکەسی تەمەندارو سەرو ڕیش سپی بە (پیر سالاری) ناو دەبرێ و فەرمان بەچاکە وڕێگری لە خراپە وای لێ هاتوە کە تەنها بەکاری زانایانی ئاینی ئیسلامی دەزانرێ و یاسای (دەست بەکڵاوی خۆتەوە بگرە بانەیبات) بۆتە دروشمی کاری هەندێ لە موسڵمانان!

**لەکۆتایی دا جارێکی تر دەیڵێمەوە:**

بابەکردەوە لەخزمەت گوفتار وکردارەکانی پێغەمبەری خۆشەویستدا بین، ببین بە (مُحَمَّدی)، وەکو صەحابەکان بین کە شاعیر لە بارەیانەوە دەفەرموێ:

به تیشکی نوری پێغەمبەر. ئەوەندە مونعەکیس بو بوون

غەریبی تازە هاتوو دەیگوت ئەمە پێغەمبەرە ستانە.

دڵخۆشتربن بە ئیمانەکەتان. دڵخۆشتربن بەوەی حەزرەتی محمد پێغەمبەر وسەرکردەتانە ئەمڕۆ لەجیهاندا زانایان لێکۆڵینەوە لەسەر فەرمودەکانی

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکەن پاشان بەوپەڕی قەناعەتەوە موسڵمان دەبن، بۆ زانست خوازان ئەم فەرموودە زانستی یە باس دەکەم.

**پێغەمبەری خوا** (ﷺ) **دەفەرموێ:** ((**إِذا مَرَّ بالنُّطْفَةِ إِثْنانِ وَأَرْبَعُونَ لَيْلَةً، بَعَثَ اللهُ إِلَيْها مَلَكاً فَصَوَّرَها، وَخَلَقَ سَمْعَها وَبَصَرَها، وَجِلْدَها وَلَحْمَها وَعِظامَها، ثُمَّ قالَ: يارَبْ، أَذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى؟**)) رَواهُ مُسْلِم.

واتە: کاتێ کەچل و دووشەو بەسەر نوطفە دا تێپەڕی لە ڕەحمی دایکی دا. خوای گەورە فریشتەیەك دەنێرێ و وێنەی دەکێشێ وگوێ وچاوی بۆ دروست دەکات وپێست وگۆشت وئێسقانی بۆ دروست دەبێت. پاشان دەڵێت: ئەی پەروەردگارا ئایا کوڕ دەبێت یان کچ؟. بابچینە لای زانای بەناوبانگی بواری کۆرپە لە ناسی کە پرۆفیسۆر (کیث مور)ە کە پرۆفیسۆرێکی کەنەدی یەو یەکێکە لەو (١٢) پرۆفیسۆرەی کە بۆ هەر باسێك لە مەسەلەی کۆرپەلە زانیدا پرس بەوان دەکرێت.

ئەم پرۆفیسۆرە سەرەتا بێ بڕوا بوو بەئاینی ئیسلام وپێغمبەرایەتی محمد (ﷺ) بۆیە وویستی بەخەیاڵی خۆی بە پێغەمبەر (ﷺ) بەدرۆبخاتەوە بۆیە هات شیکردنەوەی کرد لەسەر ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) کەباسمان کردو لە صەحیحی موسلیم داهاتوە.

ئەو پرۆفیسۆرە بەپێشکەوتوترین ئامێر، چاودێری کۆرپەلەی کرد لە ڕەحمی دایکی دا. تا شەوی چل ویەکەم وبیست وسێ کاتژمێر تێپەڕی هیچ دەرنەکەوت.

بەڵام هەرکەبوو بە (چل ودوو شەوی تەواو) یەکسەر قەدی مێشك دروست بوو، کەلێپرسراوە بەرامبەر: بیستن، بینین، تام کردن، بۆن کردن. وە هەروەها سەرما وگەرما. وە یەکسەر ڕەگەزی کۆرپەلەش (نێر یان مێ) دیاری دا!!

ئەم پرۆفیسۆرە کە ئەمەی بینی چۆن بێ زیاد وکەم لەگەڵ فەرمودەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەکو یەکە، موسڵمان بونی خۆی ڕاگەیاند و لە تەلەفزیۆنی کەنەدی ئەمەی ڕون کردەوە و موسڵمان بونی خۆی ئاشکرا کردو ووتی: ئەگەر خوای دروستکەری مرۆڤ، ئەمەی بە محمد (ﷺ) نەوتبێ.

چۆن پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار ئەمە دەزانێ. کە (١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر هیچ کەسێك نەیتوانیوە قسەی وابکات. وەکاتێ ئەم ڕونکردنەوەیەی دا، چەمد قوتابیەکیشی موسڵمان بوون. سوپاس بۆ خوای گەورە.

**بەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ شتێ لەخۆیەوە ناڵێت:** ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴾ النجم: ٣-٤

جا هەرچی زانا ودانایە، بەمل کەچی یەوە دەڵێ: ئەوەی محمد وتویەتی ڕاستە، ئەوەی ئیمانی بەخواو پێغەمبەران هەبێ، دەڵێ محمد کۆتا پێغەمبەری خوایە وئەوەش کەهیدایەتی ئیمانی وەرنەگرتبێ، دەڵێ محمد عەبقەری و زانایەکی بێ وێنەیە!.

**کە لەڕاستی دا تەنها پێغەمبەرەو ئەوەی دەیڵێ وەحی خوایە.**

ئەپەڕوای وولاتانی بێ باوەڕا تۆ عەبقەریت.

فەیلەسوفی، ئاشتی خوازی، چارەدۆزی دەردی سەریت.

زمانیان لاڵە پێت بڵێن، دوا زنجیرەی پێغەمبەریت.

گێلن هێشتا کە چوزانن، تۆ تکا خوازی مەحشەریت.

خوای پەروەردگار بەڕەحمی خۆت ڕەحمـان پـێ بکـەیت و لـە ڕۆژی قیامەتـدا لـە چاوپێکەوتنی پێغەمبەرەکەت وشەفاعەتی ئەو خۆشەویسـتە بـێ بـەشمان نەکـەیت وژیان ومردنمان لەسەر ڕێباز وسوننەتی ئەو نوری چاوو ڕونـاکی دڵـەمان حـەزرەتی محمد المصطفى بێ (ﷺ).

**هەموشمان لەناخی دڵمانەوە دەڵێین:**

اللَّهُمَّ صَلِّ عَلى سَيِّدنا محمد في الأَوَّلِينَ.

وَصَلِّ وَسَلِّمْ عَلى سَيِّدنا مُحَّمدٍ في الآخرين.

وَصَلِّ وَسَلِّمْ عَلى سَيِّدِنا محمد في المَلأُ الأَعْلى إلى يَوْمِ الدِّين.

اللَّهُمَّ اشْرَحْ بالصَّلاةِ عَلَيْهِ صُدُورنا.

وَيَسِّر بِها أُمُورَنا، وَفَرِّجْ بِها هُمُومَنا.

وَاغْفِرْبِها ذُنُوبَنا. وَاقْضِ بِها دِيُونَنا. وَأَصْلِحْ بِها أَحْوالَنا. وَبَلِّغْ بِها آمالَنا. وَطَهِّرْ بِها أَلْسِنَتَنا.

اللَّهُمَّ ثَقِّلْ بالصَّلاةِ عَلى سَيِّدِنا محمدٍ مَوازِينَ حَسَناتِنا.

اللَّهُمَّ ارْحَمْنا وارْحَمْ جَمِعَ المُسْلِمينَ رَحْمَةً شامِلَةً عامَّةً، وَلاتُؤاخِـذْنا بِمـا فَعَـلَ السُّفَهاءُ مِنّا. اللَّهُمَّ اشْفِ مَرْضانا. وَارْحَمْ بِفَضْلِكَ مَوْتانا ياأَرْحَمَ الرَّاحِمِينَّ.

اَللَّهُمَّ آمِينَ

# سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز.

٢- پوختەی تەفسیری قورئان ، م.محمد مەلا صالح.

٣- السلسلَة الذَّهَبيَّة ، محمـــود المصـــري، ج٣ ،ص٦٢٧، ص٦٢٩، ص٦٣٨، ص٦٥١

٤- تەفسیری ڕەوان ، مەلا محمودی گەلاڵەیی ، ب١٣ ، جزمی ٢٦ ، ل,١٦٢

٥- تەفسیری ڕامان ، م.أحمد کاکە محمود ، ل,٧٨٦

٦- قيصَصٌ مِنْ حَياةِ الرَّسُول وَأَصْحابِهِ ، محمد علی دولة ، ص,٢٨٢

٧- صُوَرٌ مِنْ حَياةِ الأَنْبياءِ وَالصَّحابَةِ وَالتابيعينَ ، محمود المصري ج١ ص,٥١

٨- ژیانەوە، ئەندازیار عُثمان ، ل٣٠.

٩- ئاشکرابونی موعجیزە زانستیەکان ، عبدالرَّزاق أَحمد ل١٢٦.

١٠- گوڵستانی ئیرەم لەوەصفی فەخری عالەم ، م.عوسمان سەنگاوی ، ل٣٣١.

# ووتـاری یەکەم

# بۆ مانگی رَبیعُ الثـاني

# بەهار و نەورۆز و مەینەتی گەلی

# کورد

الحَمْدُ لله رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبهِ أجمعين.

**ئیمانداران:** وا چوینەتە وەرزی بەهارەوە، وەرزی بەهار یەکێکە لە قەشەنگترین و ڕازاوەترین وەرزەکانی ساڵ و ماڵئاوایی کردنە لەوەرزی سەرماو سۆڵەی زستان و پێشوازی کردنە لە وەرزێکی تازەو ڕۆژێکی نوێ.. بەهار پێشەنگایەکی ساڵانەی گەورەی خوایی یە، کە چەندین گوڵ و لالەزارو تابلۆی سەرنج ڕاکێش و دڵڕفێن خۆیان نمایش دکەن لەو دیمەنگەیەدا ئەو نمایشگایە لەهەموو لایەوە دەرگای کراوەو والآیە بۆ میوان و گەشتیارانی و هەموو کەسێك بۆی هەیە بەشداری تێدا بکات بەبێ جیاوازی لەنێوان ئایدیاو ئینتمای چین و توێژەکانی کۆمەڵگە، وەرزی بەهار ئەرشیفێکە پڕێتی لەپەندو وانە گەلێکی زۆر، گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

١- بەهار وەرزی زیکرو ڕامان و تێفکرینە لەدروستکراوەکانی خوا، خوای گەورە لە قورئانـدا دەفەرموێ:﴿ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَـٰذَا بَـٰطِلًا سُبْحَـٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾ آل عمران: ١٩١

**ئێمەش دەڵێین:** ئەی کردگار، خاوەن پێشانگاکەی بەهار. بەقاچ دێم و بەدەم دەڵێم: سُبحان الله بازاڕێکی پڕکالآیەو شارێکەو دەرگای والآیە، هەر دیمەنێك یەك ئالآیە، نوسینێکی لە پالآیە لێی نوسراوە: بەهار بۆ ژێر پێشەنگایە، ئەرشیفێکی حەشرگایە... پەروەردگار، پەنجەی سۆزت لەکوێدا نادرەوشێتەوە. بۆیە کە دێم و دێمەوە، چرۆی بڕوام دەکرێتەوە. دڵەی زارم بۆ کڕنوشت دەشنێتەوە.

هەر ئاهەنگێ جۆرێ سازو هەر درەخت و گەڵاو گوڵێ، جۆرێ نازو جۆری ڕازو، ڕوحی برسی پێ تێرە بێ. باوەڕی پێ زەنوێرە بێ... شاخ و نزار، دەوەن و دار،

دەشتی سەوزی پڕ گوڵ و خار. چەم و ڕوبار، پەڵك و چنار. گوێز و هـەنار، خـان و مان و خەم ڕەوێنن، کاتێ بەناز خۆ دەنوێنن، بەگوێی ڕوحدا دەچـرپێنن. لەناخـەوە دەیهەژێنن. زاتی تۆی پێ دەناسـێنن. مـەلی بـەهار لـەناو بـاخ و سەرچـڵی دار، زەماوەندیان ڕێك خستوە، سەوزە گیا فەرشی کاشانی ڕاخستوە. مێروو ڕێچـکەیان بەستوە.

کە کامێرای چاوەکانم نزیك دەکەم بۆ لای گـوڵێ، وای لەخەنـدەو خـەت و خـاڵی، پەککو لەشەوق و جەماڵی، بـۆنی عـەترو پـەڕەی ناسـکی زەردو ئـاڵی، هەڵاڵـەی سەرخڕی کاڵی. ئەویش وەکو بولبول مەستەو گۆرانی بۆ بەهار دەچڕێ. ناز دەکڕێ. عەرەقی گەشتیاران دەسڕێ.

ئەی پەپولەی جوان و بچوك، ئەی باڵ ڕەنگینی ئێسك سووك، کێ بۆی نەخشـاندی باڵەکەت، کوا کۆشك و ماڵ و حاڵەکەت، کوانێ زەخیرەی ساڵەکەت!!

٢- بەهار وەرزی نوێبونەوەو ژیانەوەیە، بەهار فێرمان دەکات کراوەو گەشبین بـین و داخراو ڕەش بین نەبین و نابێت خۆمان ڕکود بکەین و لەتەنها دۆخێکدا بخولێینـەوە. بەڵکو پێویستە خۆمان تازە بکەینەوەو بەرگی ڕابردوو فڕێ دەین و بـەرگێکی نـوێ بپۆشین، بەرەو ژیانێکی کراوەو ژینگەیەکی پاك هەنگاو بنـێین و گـۆڕان لـەئاواز و هزرو هەستمان دروست بکەین و لەداوی تەقلیـد و چـاولێکەرّی کوێرانـە، خۆمـان ڕزگار بکەین.

٣- ئەلبومی بەهار پێمـان دەڵـێ، کەلەسـەر یـەك جـۆرە شـێوەو شـێواز نـەژین لەژیانماندا. بەڵکو دەبێت خولیاو حـەزو ئاواتـەکانمان هەمـە جـۆرو، جوانیـەکانمان هەمەڕەنگ بن.

٤- بـەهار ئـەو وەرزە دڵگـیرو ڕەنگـین و کەمەنـد کێشـەیە کـەوای لەمامۆسـتا (سەعید نەورەسی)کرد، لەو وەرزەدا (پەیامی بەهەشت) بنوسێت.

بەڵێ بەهار نمونەیەکی بچوکی بەهەشتە، چونکە بەهەشت نەگەرمایە، نەسەرمایە.
بەهار لەبەرخۆشی زوو تێ دەپەڕێت، لەبەهەشتیشا سەد ساڵ لەیەك جێگادا پاڵ دەدەیتەوە، کە چی وا دەزانی یەك دەقیقەیە!.
٥- بەهار بەزمانی حاڵ پێمان دەڵێت، کەبۆنی خۆش و جۆراو جۆر بکەین بە خۆماندا چونکە بۆن و بەرامەکانی بەهار فرە چەشنن.
٦- بەهار فێری دیاری و بەخششمان دەکات، چونکە هەموو دیمەنەکانی بەهار خەڵاتن بۆ ئێمەی مرۆڤ بێ بەرامبەر.
٧- وانەیەکی تری بەهار ئەوەیە، کەنابێت ڕەنگەکان بۆخۆمان قۆرخ بکەین و بەهی خۆمانیان بزانین، بەڵکو تەواوی ڕەنگەکان هی خوای گەورەن و بەڵگەن لەسەر گەورەیی و دەست ڕەنگینی خوای پەروەردگار.
٨- بەهار پێمان دەڵێت، کە زۆر ئاسایی و یاساییە دیدو ڕاو بۆچونمان لێکچو نەبێ و وەکو یەك بیرنەکەینەوە، چونکە ڕەنگەکان و گژوگیای بەهار هیچ کامیان لەیەك ناچن و هەر لەیەکە لەسەر بنجی خۆی دەڕوێ و هەموان لەگەڵ یەکتردا جێیان دەبێتەوە. بێئەوەی دژایەتی یەکتر بکەن. خوای بەرز و بێهاوتا ئەم جیاوازییە بەیەکێ لەنیشانەو دەسەڵاتی خۆی هەژمار دەکات و دەفەرموێ:
﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّلْعَـٰلِمِينَ ﴾ الروم: ٢٢
زانایەکیش لەم بارەیەوە دەڵێت: گەر هەموان وەك یەك بیربکەینەوە، کەواتە بیرمان نەکردۆتەوە..
٩- بەهار فێرمان دەکات کەدۆست و شەیدای جوانی بین و داهێنانکار و جوانکارانمان خۆش بوێ، جوانیەکان وەك خۆیان دەرخەین و نەیانشارینەوە.

١٠- بەهار وانەی سوپاسگوزاریمان فێر دەکات. لەسەر تەواوی بەهرەو بەخششەکانی خوای گەورە. بەڕاستی بەهار وەرزی عیبادەتی بیرکردنەوەیە لەگەورەیی و دەسەڵاتی خودا. سەرنجی وەرزی بەهار بدە، ڕۆژی درێژ، شەوی کورت، هەوای نەرم، ئەگەر ڕۆژئاوا درێژ نەبوایە تیشکی خۆرئاوا کاریگەری نەبوو لەسەر گەشەکردنی گژوگیاو گوڵەکان. وەبەهۆی ئەو شێوە لێدانەی تیشکی خۆرە لەزەوی کەئاوا هەوایەکی نەرم و خۆش هەڵدەمژین، خۆ ئەگەر بەهار شەو و ڕۆژی ئاوا نەبوایە. ئەوا چڵە گیایەك شین دەبوو. فەلاحەت نەدەبوو، خۆ لەزستاندا بارانیش و تیشکی خۆریش هەیە، کەچی هیچ سەوز نابێ. خۆ ئەگەر لەوەرزی هاویندا ئاوا ڕۆژ درێژ بێ. مرۆڤ بەرگەی ناگرێ و تەواو بێزار دەبێ. خۆ ئەگەر لەزستاندا ڕۆژئاوا درێژ بێ، دیسان مرۆڤ بەرگەی ناگرێ و سەرمای زۆر لەناوی دەبات کە ناچاردەبی بەهۆی کارو کەسابەتەوە ڕۆژگارێکی درێژ لەبەر سەرما بمێنێتەوە! کەچی لەبەهاردا لەگەڵ ئەو ڕۆژگارە درێژەدا هەرچەندە لەبەیانیەوە هەتا ئێوارە لەدەرەوە بی و هەوالێت بدات ئەوا لەشت زیاتر گەشەی پێ دەکات و پێی ئاسودە ترە!

جا ئایا ئەم شێوە لەوەرزی بەهار و هەموو وەرزەکان سوپاسی پەروەردگاری ناوێ؟! وەبەهار وەرزێکی پیرۆزە. هەموو شتێکی نوێی تێدا دەردەکەوێ و هەموو شتێکی نوێش سوپاسی خوای دەوێ. **صەحابەکان دەفەرمون:**

(كانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إذا حَمَلَ إِلَيْهِ باكورة الثَمَرِ مَسَحَ عَيْنَيْهِ بِها وَأَكْرَمَها وَقال: إِنَّهُ قَرِيبُ العَهْدِ بِرَبِّنا سُبْحانَهُ وَتَعالى).

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ نۆبەرەی هەر بەرهەمێکیان بۆ دەبرد، بەسەر چاویدا دێناو زۆر پێی خۆشحاڵ دەبوو. ڕێزی دەگرت و دەیفەرموو: ئەمە تازە لەلایەن پەروەردگارمانەوە هاتوەو پاك و خاوێنە..

١١- بەهار پێمان دەڵێت: دنیا پێنج و دوو ڕۆژێکە، تەنها پێچی مێزەرێکە، چێژو تامی هەر تاوێکە، دەبڕێتەوە لەپڕێکا، ئامان و دەخیل وریابە. لەڕاستە ڕێ، لاڕێ نەبیت و لەگەڵ خوابە، منیش وەك تۆ خۆش پێکەوتوو گەش و سەوز و دەم بەخەندەم. پاش کەمێکی تر دەژاکێم و دەپێچمەوە بارگە و بنەم!...

١٢- بەهار پێمان دەڵێت: چ بچێنی هەرئەوە دەدوریتەوە. ئێمەش ئەمڕۆ چی سەوز کەین سبەینێ دروێنەی دەکەین.

١٣- بەهار فێرمان دەکات. خوا هەرشتێ دەئافرێنێ. بەحیکمەت و لێزانی خۆی بەدی دێنێ. ڕەخنەنەگری لەسروشتی جوانی خوایی، پنجەگیا دەرنەکێشی لەبەر ڕق و بەخۆڕایی.

١٤- بەهار دیاترین بەڵگەو نمونەی بەرچاوە لەسەر زیندوبونەوەی دوای مردن کەلە چەند ئایەتێکی قورئاندا، خوای گەورە ئەمەی بۆ تۆمار کردوین. وەك دەفەرموێ:

﴿ فَانظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَـٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ الروم: ٥٠

واتە: ئەی مرۆڤی خاوەن ژیرو بیرو هۆش، تەماشای ئاسەواری کەرەم و ڕەحمەت و میهرەبانی خوا بکە، کەچۆن بەو بارانەی دەیبارێنێت و زەوی مردوو بەسەوز بوونی گژوگیا و ڕووەك و دار و درەخت زیندوو دەکاتەوەو بەسەوزایی دای دەپۆشێت. بێگومان ئەو زاتەی کە زەوی — لەپاش مردن و ووشك بونەوە — زیندوو دەکاتەوەو دەیخاتە ژێر حیساب و لێپرسینەوە. هەرکەسەو بەپێی بیرو باوەڕو کردەوەی خۆی پاداشتی دەدرێتەوە. خودا بەسەر هەموو شتێکدا بەدەسەڵات و خاوەن توانایە.

بەڵێ بەهار، هێمایە بۆ دانایەتی پەروەردگار. بۆ درەوشانەوەی ناوی ڕەحمان و ڕەحیم و غەففار، ئەوەی بەهار نەیجوڵێنێ. کەسێکە خۆی کەڕ کردوە. هەر مردوە. بەرگی زیندو بەر کردوە... چونکە تابلۆکانی بەهار کەدێنە گۆ؟ دەڵێن بەمن. دەڵێن بەتۆ. بکەو نەخۆ. توێشوی ڕێگا زوو بکەن کۆ، هەشتی لەشت مەکەن بەنۆ،

بۆیە بازۆر باش هەموو بزانین. ئێمەش گوڵی بەهارێکین، خاوەن چیغ و دەوارێکین هاکا بارەشی پاییزی چیغ و دەوارەکەی بردین، وەك گەڵای دارەکانی پار تێکەڵ بەئەو خاکەی کردین.

دەوەرن باتا لەژین داین. ملی رێگای راستی بگرین، جۆرێ بژین، جۆرێ بمرین، کەشایان بێ، بلیتی چونە بەهەشتی بەهاری قیامەت وەرگرین...

**ئیمانداران:** یەکێکی تر لەو شتانەی کەلەوەرزی بەهاردا، بەڵکو لەیەکەم رۆژی وەرزی بەهاردا گوێ بیستی دەبین و لەگەڵی دەژین بریتی یە لە — نەورۆز — ، ووشەی نەورۆز لەدوو برگە پێکهاتووە. (نەو) بەمانای نوێ. (رۆز) بەمانای رۆژ بەزمانی فارسی. کەواتە نەورۆز بەمانای (رۆژی نوێ) هاتوە.

دەتوانرێ بوترێ نەورۆز بەمانای رۆژی نوێ ی ئادەم و حەوا، کاتێ کەلەبەهەشتەوە هێزانە سەر زەوی لەسەر شاخی (بوذ) لە هیندستان دابەزێنران.

**کەواتە:** هیندستان لانکەی یەکەمی مرۆڤایەتی یە، لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت ئەویش ئەوەیە: ئایا ئەو کاتەی ئادەم و حەوا هاتنە سەر زەوی دەبێ چ وەرزێکی ساڵ بێ؟!

**بێ هیچ دودڵیەك دەتوانین بڵێین:**

دەبێ وەرزی بەهار بێ! بۆ ئەوەی ئادەم ببوژێتەوە. وەرابێ لەگەڵ ژیانێکی نوێ کەجیاوازە لە بەهەشت. دەبێ وەرزی بەهار بێ بۆ ئەوەی لەگژوگیا بخوات و دانەوێڵە بچێنێ و خانوو دروست بکات و ماڵ ئامادە بکات تا پایزی بەسەردا دێ تەواو ئامادە بێ! کەواتە ئەو رۆژە. رۆژێکی نوێ یە لەژیانی ئادەم و حەوادا.

پاشان لە مێژوی مرۆڤایەتی دا. لە سەردەمی پێغەمبەر (نوح) دا، کاتێ کە گەلەکەی وەلامیان نەدایەوە دوای هەموو هەوڵ و کۆششێك. ئیتر گەیشتە ئەو قەناعەتەی لەو گەلە هیچ کەسێکی تر ئامادەی ئیمان هێنان نی یە. لەخوای گەورە پاڕایەوەو فەرموی: ﴿ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴾ نوح: ٢٦

ئەوەبوو خوای گەورە دوعاکەی گیرا کردو لافاو هەموو دنیای گرتەوە و حەزرەتی نوح و ئیمانداران لەگەڵ جوتێ لەهەموو زیندەوەران لەناو کەشتیەکەدا لەسەر ئاو دەسورانەوە. ئالەوکاتەدا حەزرەتی نوح دوعایەکی تری کردو فەرموی: ﴿ أَنزِلْنِي مُنزَلًا مُّبَارَكًا ﴾ المؤمنون: ٢٩ خوای گەورەش فەرموی: ﴿ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ ﴾ هود: ٤٤ کەشاخی جودی کوردستانە!

**کەواتە:** بەنەصی قورئان کوردستان موبارەکەو کوردستان بوو بەلانکی دووەمی مرۆڤایەتی.

**کەواتە:** ئەوکاتەی کەنوح ڕزگاری بوو، دەبێ کات وەرزی بەهار بێت، بۆ ئەوەی زەوی کزر ببێتەوە و نوح و ئیمانداران کانیەك بدۆزنەوە و دیوارێك ڕاست بکەنەوە.

**کەواتە:** ئەو ڕۆژە کەلەکەشتیەکە دابەزین. ڕۆژێکی نوێ یەو بەفارسی پێی دەوترێ نەورۆز ئیتر هەندێ لە مێژوو نوسان وای بۆدەچن کەهەموو ساڵێ یادی ئەو ڕۆژەیان دەکردو سوپاسی خوای گەورەیان دەکرد کەلەو لافاوە سامناکە بێ وێنە هەرگیز نەبینراوە، بەڕەحمی خۆی ڕزگاری کردن و لەکافرانی گومڕاو لەناوچوو نەبون.

**کەواتە:** ئێمەی موسڵمان کاتێ ووشەی نەورۆز دەبیستین، ئەم ڕوداوە مێژووییانە دێنەوە بەرچاومان و جارێکی تر سوپاسی خوای خۆمان دەکەین کە کردوینی بە ئیماندارو شوێن کەوتەی پێغەمبەری ئاخری زەمان و بەنوری ئەو ئیسلام و ئیمانەیە کەلەقورئانەوە ئەم باس و خواسانە دەبیستین و بەرهەمی ڕزگاری کەشتیەکەی نوحین و لەسەر بنچینە و ئەصڵی خۆمانین کەئادەم و حەوایەو خۆمان بەنەوەی مەیمون نازانین!!

لە نەورۆزدا هەزاران سوپاسی خوا دەکەین لەسەر ئەم دیمەنە ڕەنگینە. لەسەر ئەم وولاتە کوردستانە شیرینە، لەسەر ئەم ئیسلامە ئازیز و بەرەکەتە. وەکو موسڵمان دەچینە ئەو دەشت و دەرەو سەیران و خۆشی دەردەبڕین. نەئازاری کەس دەدەین و

نەکەس ئازارمان دەدات. ئەگەر چی بەداخـەوە زۆر کـەس ئـاوا لەبـەهارو نـەورۆز ناگات. ئەوەی کەلەنەورۆز و بەهار حالّی بوە. تەنها بەلایەوە ئەوەیـە کەبچـێ بـۆ سەیران و خواردن و خواردنەوە بخوات و پەنا بەخوا عـەرەق بخـواو ناشـەرعی بکـاو رەقس و سـەما بکـا و خـەڵکی ئازاربـدا و گیـاو گـوڵ بخاتـە ژێـر پـێ و ژینگـە بەپاشماوەی شوشە عەرەق و خواردنی بەجێماوی بـۆ گـەن بکـات!! زۆر بەداخـەوە، گەلێك لەسەیرانەکانی ئەمرۆ بۆ ئـەوە نـی یەبچـێ لـەو دەشـت و دەرە تەماشـای گەورەیی خوا بکات و لەو رزق و رۆزی یە حەلاڵەی کەخوای گەورە پێـی بەخشـیوە بیبات لەو دەشت و سەیرانگاو لاپاڵی شاخ و دۆڵە پڕ لەگژوگیاو گولاڵـە سـورەدا، لەسەر دەریاچەو روبارو سەر چەم و کـانی و ئـاو و تاڤگەیـەك. بـەدەم هەڵمـژینی هەوای بێ گەرد و پاك و بەهەشت ئاسای خاکی موبارەکی کوردسـتانەوە. بـەئاوی سازگاری کانی و کارێزێکەوە یەك دووپارو نانی باش، بەدەم قسەی خـۆش و بـزەی سەرلێوو رێزی یەکتر گرتن لەگەڵ خێزان و منالّی دا بخـوات و لـەکاتی نوێژەکانـدا دەست نوێژێکی پوخت بگرێت و لەسەر ئەو گیاجوان و نەرمـە کـەهیچ فەرشـێکی دەست کردی مرۆڤ ناتوانێ شان لەشانی بدات نوێژەکەی بەکۆمەڵ – جەماعـەت – لەگەڵ ژن و منالّەکانیدا ئەنجام بدات و لەناخی دڵەوە بڵێ: هەزاران هەزار سـوپاس بۆتۆ خوایە گیان کەئەم خۆشی و دڵخۆشیەت پێ بەخشیم. چـونکە بزانـە. خۆشـی لەدڵخۆشی جیاوازە. زۆر کەس هەیە دەشچێتە سەیران و چی خواردن و خواردنەوەی خۆشە پێ یەتی و جـوانترین و نـوێترین و گرانبـەهاترین جـل و بـەرگی پۆشـیوەو دوامۆدیلی ئوتومبیلی لەژێردایە. بەلاّم چونکە لەخوا غافڵە.

ئەو خۆشیە دڵخۆشی ناکات و بەدڵتەنگیەوە دەگەرێتەوە بۆ ماڵ. یان بەسەر خۆشی لـەوێ توشـی شـەڕو ئـاژاوە دەبێـت و خوێنـاوڵ دەبێـت و خـۆی لەنەخۆشـخانە دەبینێتەوە. یان بەئوتومبێل بەسەر خۆشی مالّی خۆی و خەڵکیش وێـران دەکـات.

خۆ ئەگەر ئەمانەشی توش نەبوو. زۆر جار کەهاتنــەوە ماڵــەوە ئــاژاوە دەکەوێتــە نێوان خێزانەکەیانەوەو جاربوە هەر لەڕێگەوە هاتون بۆلای مامۆسـتایەکی بـەڕێزی مزگـەوت، چـونکە کـابرا تـەڵاقی خـواردوە لەژنەکـەی و کەلـەهۆکاری تـەڵاق خواردنەکەی پرسراوە. پیاوەکە ووتویەتی: مامۆستا کەهاتوینەتـە ماڵـەوە ژنەکـەم بەتوندی قاپی سەیارەکەمی پێوەداوەو هەرئەوەندە وتومە: ئـەوە بۆچـی وابەتونـدی پێوەی ئەدەی؟! ووتویەتی: دەی ئەمڕۆ سەیرانێکت پێ کردین، خـوابیبڕێ، لێمانـت کرد بەقوزەڵقورت ئیتر منیش هەر لەبەرقاپی سێ تەڵاقەکەی ژنەکەمم داوە!! کاتێ مامۆستایی بەڕێز لێی پرسیوە: لەو سەیرانەدا لەهیچـتان کـەم بـوو؟! ووتویـەتی: نەخێر لەهەموو خەڵکی باشتر بوین، مامۆستا فەرمویەتی: ئەی ئەمڕۆ نوێـژێکتان کرد؟! وتویەتی: نەخێر. هەر لەبیریشمان نەبووە!! مامۆستا بەنەرمی یەوە بـەئاگای دێنێتەوەو دەفەرموێ: برای خۆم ئەوە سەرەنجامی غەفڵەت و بێ ئاگابونـە لـەخوا. توخوا حەیف نیە لەو هەموو خۆشیەدا کەخوای گـەورە پێـی بەخشـیوی سوپاسـی خوانەکەی؟! دەی بزانە هەرچەند خۆشیت هەبوو، بەڵام دڵخۆشیت لەدەست دا !!

ئەمڕۆ زۆرن ئەو کەس و ماڵانەی کەدەچنە سەیرانگاکان:

١- بۆ خۆڕادان و خۆدەرخستنەو فیزی پێوەدەکـات، دواتـر بـۆ دراوسـێ و خزمـی هەژاری دەگێڕێتەوە چۆن سەیرانیان کردوەو چونە کـوێ و چـیان خـواردوەو زۆرجـار بونەتە هۆی خستنەوەی ئاژاوە لەو ماڵە هەژارەدا!

٢- بێ ئەمری کردنـی خـوا بەعــەرەق خـۆری و ڕەشـبەڵەکی و ڕەقـس و سـەماو تەسجیل لێدانی بەرزو چونە ناو موڵك و باخی خەڵکی و پیس کردنی کانی و ئاو و ژینگە، لە سەیرانگاکاندا بینراوە بـاوك پـەرداخی عـەرەقی بـەدەم منداڵـە شـەش ساڵەکەیەوە کردوە!!

٣- لە سەیران و سەیرانگاکاندا زۆرجار کەسەکان وایـان لـێ دێ کـەئیتر وادەزانـن نەمردن هەیە نەقیامەت هەیە. جا ئەگەر تۆی بەڕێزیش وانـەبی، ئـەوە بەداخـەوە دەچیتە بەرامبەر کەسێ، خێزانێك کەئـەو وایـە! بـۆنی دوکـەڵ و بۆگـەنی ئـەوت

بەسەردا دێ. بەڵام گەشتیاری بەڕێز: کەچویتە سەیران و سەیرانگا، لەخوا یاخی مەبە، بزانەو دڵنیابە مردن لەوێش حازرەو مۆڵەتت نادات، چەند کەسمان بینی لەسەیراندا خنکاو مردو تێداچوو!! بەیانی بەگۆرانی و چەپڵەلێدان ڕۆیشتن ئێوارە بەگریان و شیوەن هاتنەوە!! خەڵك هەبووە لەناو سەیارەکەدا کەچون بۆ سەیران لەچەپڵەلێداندا دەستی بەریەك نەکەوتۆتەوە کەجەڵدە لێیداوەو دەست بەجێ مردووە!!.

بەڵێ لەئیسلامدا شادی و خۆشی و پێکەنین و چەپڵە و گۆرانی بەڕێ و جێ لەتۆی موسڵمان قەدەغە نەکراوە، دەرونیش پێویستی بەپشوە، بەڵام بائەو خۆشیەت نەبێتە هۆی ئازاردانی خەڵکانی تر، وەپاشانیش لەخوا بێئاگات نەکات، چونکە نازانی چ قەدەرێك چاوەڕێت دەکات!

**سەرنجی ئەم ڕووداوە واقیعی یە بدەن،** لەزمانی ئەو کەسەی ڕوداوەکەی لێ ڕوداوە: مانگی پێنج بوو، وەك ئارەزوومەندانی شارەکەمان ڕوومان کردە سەیرانگای دوکان، لەبەر قەرەباڵغی و زۆری سەیارە نەگەیشتینە ناو سەیرانگای دوکان و لە قەشقۆڵی لاماندا، دەستمان کردە یاری و شەڕە ئاو و تۆپ تۆپێن.

پاش خواردنی ژەمی یەکەم چوومە قەراغ ئاوەکەی قەشقۆڵی و دەستم کرد بەسەیارە شتن، نیوەی سەیارەکەم شۆرد، کاتێکم زانی زۆر لەسەر و ئێمەوەو لەو بەرئاوەکەوەو، هاوار هاوار پەیدا بوو هەر خەڵك بوو ڕای ئەکرد و هاواری لە خەڵکی قەراغ ئاوەکە دەکرد.

منیش سەرم هەڵبڕی بزانم ئەم دەنگە دەنگ و هاوار هاوارە چی یە؟! کەسەرنجم دا منداڵێکی تەمەن سێ ساڵانە، لە ناوەڕاستی ئاوەکەدا سەرو بن ئەکاو ئاو بەرەو خوارەوە ئەیهێنێ!

لەمنەوە دوور بوو، بەڵام خۆم پێ نەگیرا، خۆم خستە ناو ئاوەکەوە بەمەلەکردن بەرەو ڕوی ئاڕاستەی منداڵەکە ڕۆیشتم، خوای گەورە یارمەتی دام و گرتمەوە! لەوبەری ئاوەکەوە بوو بەچەپڵە لێدان و دەستخۆشی. هێنامەوە لای سەیارەکەی خۆم و خەڵك بەسەرما دابارین، فریاکەوتنی سەرەتاییم بۆ ئەنجامداو دەستم نابەسنگیا، هەندێك ئاو هاتەدەرێ و منداڵەکە چاوی کردەوە. خێرا خستمە ناوسەیارەکەم و بەخۆشیەوە بردمەوە بۆلای دایك و باوکی کەلەو بەرەوە وەك باڵدار باڵیان لێپەیدا ببوو، زۆر خۆشحاڵ بووم کەتوانیم ئەو منالە لەخنکان ڕزگار بکەم و بەپشتیوانی خواو ویستی خوای گەورە ئەو تەمەنە کورتە بکەمەوە میوانی دایەو بابەی، لەسەر پردەکەی دوکان پەڕیمەوەو سەرەو خوار بومەوە ئەو بەر ئاوەکەو گەیاندمەوە دەستی دایەو بابەی، دایك و باوك نەیاندەزانی بەچ شێوەیەك و بەچ زمانێ سوپاسم بکەن. منالەکەم دانەوەو ماوەیەك دانیشتم و ویستم بگەڕێمەوە بۆ ئەمبەر بۆلای ماڵ و منالەکەم. بەڵام دایك و باوکی منداڵەکە زۆر پێداگیریان کرد و درو ئاسایی تێم ئالان کەنابێ بڕۆم تا نانی نیوەڕۆیان لەگەڵدا نەخۆم.. ئەو ماڵە تەنها ئەو منالەیان هەبوو، نانیان ئامادە کرد و بەدەم قسەی خۆش و باسی ڕابردوەوە کەوتنە گفتوگۆ کردن و نانیان بۆ منالە تاقانەکەیان دانا.

بەڵام منالەکە زۆر بەشێوەیەکی نا ئاسایی سەیری من و دایك و باوکی دەکرد. دوای نان خواردن زۆر سوپاسم کردن بۆئەو میوانداریە پڕحورمەتەو ئەوانیش زۆر سوپاسی منیان کرد بۆئەو خزمەت و هاوکاریە، سواری سەیارەکەم بومەوەو لەبەرئەوەی سەیارەیەکی تر تازە هاتبوو بەردەمی گرتبوم.

ناچاربوم بەگ دابنێم، هێواش هێواش هاتمە دواوەوە، بەڵام لەپڕ هاوار بەرز بۆوە. هۆپ... هۆپ... کوڕە لێتدا بوەستە!! سەرم لێشێواو خێراتر چوومە دواوەو وەستام. لەپڕ ووتیان: دابەزە، دابەزە!! کەدابەزیم، ئای خوای گەورە چ ببینم! ئای

لەوکارەساتە! ئای لەو ڕوو زەردی یە! ئای لەو خەفەتە گەورەیە! ئـەزانن چ ڕوی دا؟ ئەو منالەی دووسەعات لەمەو پێش لـەمردن و خنکـان ڕزگـارم کـرد کەوتـە ژێـر تایەی سەیارەکەم و دەست بەجێ گیانی سـپارد!!! لـەکاتی بەگدانانـدا نـەمزانیبوو لەدوای سەیارەکەمەوەیە! بوو بەگریان و شـین و شـەپۆڕ، خـەڵکی سەرسـام بـوون، کەسێك منالێکی لەمردن و خنکان ڕزگار کردو پاش ماوەیەکی کەم کوشتی!

دایك و باوکی منالەکە ووتیان: هەرچی خوا بیکات دەبێ ببێ. ئێمە نەمان ویسـت بخنکێ ئەوا سەیارە کوشتی!

بەخەفەت و ناڕەحەتیەوە بەرەو شـار گەڕاینـەوە. مـاڵی بـاوکی منالەکـە ئـاوابێ بەخشیانم لەو کێشەیەدا. بەڵام بڕوا بکەن لەو ساتەوە تائەم کاتەش توشی چـەندین نەخۆشی دەروونی بووم، نازانم چۆن لەئاست ئەو ماڵە سەر هەڵبڕم، ئەمـە ئاکـامی یارمەتی بوو. ئەمـە ئاکـامی شـۆفێری بـوو! ئەمـە قـەدەری ئیلاهـی بـوو، ڕەت بوونەوەی بۆ نەبوو.

بەڵێ دەبێ لەسەیران و کەیف و خۆشی دا. خوای گەورەمان لـەیاد بـێ و بـەردەوام یادی بکەین.

**خاڵێکی گرنگی تر** کە پێویستە لەبەهارو نەورۆزدا ئاماژەی پـێ بکـەین ئەوەیـە. کەنەورۆز یەکەم ڕۆژی سەری ساڵی کوردی یە، ساڵی کوردی (٧٠٠) سـاڵ لـەپێش زاینەوەیە، یەکـەم حکومـەت لەمێـژودا، کەیومـەرس کـوڕی یاخـت کـوڕی نـوح دایمەزراندوە بەناوی (دەوڵەتی پێشدادی). پیشدادی بە مانای: یەکەم حکومەت کە دادپەروەری چەسپاندو یاسای بۆ حکومەت دانا.

خەڵکی لە سایەی ئەم حکومەتەدا ژیانێکی خۆش و ئارام و ئاسودەی دەبردە سەر. بەڵام بەداخەوە بەهۆی ناکۆکی ناوخۆ — کەبۆتە پیشەی هەمیشەیی گەلی کورد — ئەم دەوڵەتە درزی تێ کەوت و سەرەنجام ڕوخا. بەم شێوەیە تا ئیسلام هـات کـورد

لەنێوان فارس و ڕۆمدا دەچەوسایەوە. ئیسلام هات و کوردی لەدەستی ئەو دوو زلهێزە جیهانیە داگیرکارە ڕزگار کرد.

**کەواتە:** ئیسلام نەك ڕۆژێ لەڕۆژان ستەمی لەکورد نەکردوە. بەڵکو ئیسلام بو بەهۆی زیندوبونەوەی کورد.

وە صەحابەکانی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) نەك نەهاتون کوردستان داگیربکەن. بەڵکو هاتن کوردستانیان ڕزگار کردو کوردەکان پێشوازی گەرمیان لێ کردن. مەگەر چەند کوردێکی خۆ فرۆش و کاسەلێسی دەوڵەتی فارسی کەخۆفرۆشیش تا هەتایە هەردەمێنێ!!

بۆیە مامۆستای پەخشان نوس. م. غەریب پێنجوێنی زۆر جوان ئەم مەشهەدەمان بۆباس دەکات و دەفەرموێ:

ئەی پێغەمبەری پێشەوا. تۆ یارانت واپێگەیاند، هەموویانت واتێگەیاند، فریاد ڕەس بن، بەخیل نەبن بەم خێرەیان... بەڵێ یاران... لە مەدینەوە ترازان... بونە دەرمان لە بۆ ژیان... بۆ ڕزگاری نەك خوێن ڕژان... کە ئەوان هاتن ئەم کوردە... میللەتێکی دەست بەسەر بوو... شەڕی بێزەنتی و ساسانی، بۆ کوردستان وێران کەر بوو... کوردی داماو یان سەرباز و خزمەت چی بوو... یان پاسەوان و تەتەر بوو... گردو شاخمان پڕ لە ڕەبیەو لەمەخفەر بوو... باپیرانمان باویان نەبوو، ناویان نەبوو... پەرچەم و دراویان نەبوو... ئەوان مافی خاوەنداری کێڵگە و باخ و ئاویان نەبوو. موڵکانەیان لێ دەسەنرا... لەشارەزوور چەند گردیان پێ دروست کرا... بردیان بۆ کۆشکی شاهانە و قوللەو قەڵاکان پێبڕا.

کورد بۆ بەرەی شەڕ دەبرا... گەر فیراری بکردایە... وەکو بەرخ سەردەبڕا کاتێ یارانی پێغەمبەر (ﷺ). بۆ فتوحاتی ئیسلامی... وەك بارانی ڕەحمەت باران. سوپای بێگانەو زۆرداران... هەموو تاران... باویان نەما وەکو جاران... لە فارس

و ڕۆم ڕزگار کراین... له ئامێزی گەرمی ئیسلام پەنا دراین... یاران خاکیان داگیر نەکرد... بۆیەك جار داوای پیتاك و باج و سەرانە یـان نـەکرد... کوردستانیان دا بەخۆمان... ئیتر بوینە خاوەن مێژوو پادشـاو پەرچـەمی خۆمـان... لەکوردستان چەندین میرنشین دامەزران... وەکـو دۆسـتەکی و ئـەردەلان... بابـان و جـەزیرە و بۆتان...

لە سایەی ئیسلام و ئازادی... کوردان زیرەك و ووشیار بوون... بۆداهێنـان دەست بەکار بوون... حەقی کۆن وەرگیرایەوە... ڕێـی تیجـارەت کرایـەوە. حـوجرە بویـە قوتابخانەو فـەقێ ی لێ جـەم کرایـەوە... قزلجـی و مەولـەوی کـوردان لـەجیهان دەنگیان دایەوە...

لە سایەی ئیسلام و ئازادی (صلاح الدین)ێك هەڵکەوت... بۆ سەندنەوەی قودسـی پیرۆز نەدەسرەوت... کورد و تورك و فارس و عەرەب بەدووی کەوت... گەر پـێش ئیسـلام بـێ ئـەرزش و بـابردە بـوین... لەسـایەی ئیسـلام فریـاد ڕەس و سەرکردەبووین... بەڵێ کورد قودسی

گرتەوە... لە دوژمن پاکی کردەوە... بۆیە لەساڵیادی مەولود، سەدان ئاهـەنگ و کۆڕ دەگێـڕن، لـە خزمـەتتا ئـەی پێغەمبـەر (ﷺ). دەسـتمان لەسـەر سـنگمان دەگرین. کوردێکی دین پەروەرین، هەتاکو ئەو ڕۆژەی دەمرین!...

**بەڕێزان:** بەداخەوە لەگەل ئەو هەموو بەرەکەت و جوانیەی لەوەرزی بەهاردا هەیـە. بەڵام بۆ ئێمەی میللەتی کورد. مانگی ئازار. فِعْلاً مانگی ئازار و ژان و ناڕەحەتی و بیرەوەری تاڵە. پڕە لەیادی ماف خوراوی زوڵـم لێکـراوی لـەکورد و کوردسـتان. کەزۆر بەپێویستی دەزانم یادیان بکەینەوەو باسیان بکەین.

١- تاوەکو شوکرانە بێژی خوا بکەین لەسەر ئەم بارودۆخـەی ئێسـتای کوردسـتان، کەهەزاران سوپاس بۆ خـوا خـاوەنی کیـانێکی خۆمـان و ئاڵاکـەی قـازی محمـد و پەرلـەمان و حکومـەتین – لەگـەڵ ئـەو هـەموو ڕەخنـەی کەهەمانـە لەسـەر

کاربەدەستانی گەندەڵ و ناپاك!.. بەڵام بەئومێدی خوا هەوڵی ئەوە بدەین باشەکانی چاکتر بکەین و خراپەکانیشی چارەسەر بکەین.

٢- تاوەکو ئەو منداڵـە، ئـەو تـازەلاوەی ئـەو ڕۆژگـارە پڕمەینـەتی و سـەختیەی بەبیرنایەت و بەچاوی خۆی نەیبینیوەو سوپاس بۆ خوا لەحکومی خۆماڵی و ئازادی دا چاوی گەشی بەکوردستانی جوان و موبارەك هەڵێناوە، بزانێ ئەم گـەلی کـوردە چی پێ کراوە. هەر بۆنمونە لەهەزاران بەسەرهات و مەئسات. چـەند شـتێکتان بـۆ باس دەکەم:

مامۆستایەکی مێژەر پـاکی دڵسـۆزی ئیسـلام و کـورد لەمەولودێکـدا فـەرموی: نائـب (ظابط) یـك کەدانیشـتوی گـەڕەکی زەرگەتـەی شـاری سـلێمانی یـە بـۆی گێڕامەوەو ووتی: ساڵی (١٩٨٨)بـوو. لـە سـەردەمی شـومی بـەناو (ئـەنفال)دا. لەگونـدێکی ئاغجەلـەر لـەدوای ڕووخـانی دێیەکـە لەلایـەن سـوپای داگیرکـەری بەعسەوە.

سـەرنجم دا واسـەگێك خـۆی دەخزێنێتـە کونێکـەوە کـەدارو پـەردوی خانوویـەکی ڕووخاوی ئەو گوندە بوو، چەند ڕۆژێ ئەمەی دوبارە دەکردەوەو ئێمەش خێمەکەمان کە (سەربازی تێدابوو) لە بەرامبەر ئەو شوێنە بوو، ئەم دیمەنە سەرنجی ڕاکێشـام و ڕۆژێ چوم سەیری ناو کونەکەم کرد. سەیر دەکەم منداڵێکی جوان لەناو بێشکەدایەو سەگەکە دەچێتە سەری و تێر شیری دەکات!! سُبحان الله ئەم دەڵە سەگە تازە چەند بەچکەی بو بوو. گوانەکانی پڕ لەشیر بوون. دەهات دەیخستە دەمـی ئـەو منداڵـەوە هەتا منداڵەکە تێری دەخوارد!!

ئەڵێ کەئەوەم بینی ئاگر لەهەناوم بەر بوو. لە ترسی ئەوەی نەوەکو منداڵەکە بێنمە دەرەوە لێم بسەنن و بیکوژن و ببمـە هـۆی لـەناو بردنـی، نـەموێرا دەری بهێـنم. هاتمەوە بۆ بارەگاکەمان و بیرو هۆشم هـەر لای منداڵەکەیـە. خوایـە گیـان هـاوارە

خۆت فریامان کەوی. خوایە گیان حەقی ئەو منالّە بێ تاوانە لەم ستەمکارانە بسەنی.

ئاگری دڵ هەڵی گرتم و ناچاربوم چومە لای فەرماندەکەم و ئەوەی بینیبوم بۆم گێڕایەوە، ووتی: هەستە بابڕۆین نیشانم بدە، چوین و کەئەو دیمەنەی بینی، ئەویش چاوی فرمێسکی باراند! ووتی: ئەو دارو بەردە لابەن و منالّەکە بەسەلامەتی دەرکەن، کاتێ هێنامانە دەرەوە. سبحان الله کەبێشکە دەکەینەوە منالّ خۆی پیس نەکردوە، وەکو ناو سکی دایك کەخۆراکیش وەردەگرێ و ناشی کات بەپیسایی.

وە وەکو ژیانی بەهەشت کەبەهەشتیەکان دەخۆن و دەخۆنەوە بەلاّم پیسایش ناکەن.

خوای گەورە هەروەکو چۆن موعجیزە ئاسا منالّەکەی لەناو ئەو هەموو خانوتێك دان و سەقف ڕوخان و دارو بەردەدا پاراست و هیچی بەرنەکەوت و پاشان ئەو سەگەی بۆ ڕام کرد وەکو بەچکەی خۆی تێر شیری بکات، ئاواش بەپاك و خاوێنی هێشتبویەوە بۆ ئەوەی لەپیسی دا نەڕزێ!!!.

فەرماندەی سوپاکەمان منالّەکەی هەڵگرت و بردی یەوە بۆ ماڵی خۆیان و ووتی: شەرتبێ وەکو منالّی خۆم بەخێوی بکەم. بەلاّم لەترسا داوای لێکردین کەمن و پاسەوانە تایبەتەکانی خۆی نەبێ کەس بەمە نەزانێ!...

ئای ئەنفال چ ستەمێکی گەورە بوو لەلایەنی بەعسی عەفلەقیەوە لەقورئانی پیرۆزو سوڕەتی ئەنفال کراو چ ستەمێك بوو کە لەمێژوودا ڕەنگە وێنەی نەبوبێ کەنزیکەی (١٨٢) هەزار مرۆڤی کورد کەزۆربەی ژن و منالّ و پەککەوتەی بێ تاوانی بێ چەك و هەژاری گوندەکانی کوردستان بوون، بێ سەرو شوێن کران و لەگۆڕی بەکۆمەڵدا هەر بەزیندوویی گڵیان بەسەردا کراو زیندە بەچاڵ کران.

﴿ وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ بِأَيِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ ﴾ التکویر: ٨ - ٩

هەر لەوەرزی بەهار و مانگی ئازاردا بوو. کەئازارێکی بەئێشی تر بەسەر گەلەکەماندا هات کە لە ١٩٨٨/٣/١٦ دا کیمیابارانی هەڵەبجە کراو لەچەند سەعاتێکدا زیاتر لە پێنج هەزار مرۆڤی کورد بێ تاوان لەمنالّی تازە لەدایك بوو، وەکورو کچی تازە پێگەیشتوو وەژن وپیاوی بەسالاّچوو، بەناهەق و ناڕەوا، بەچەکی

کیمیـاوی قەدەغـەکراوی نێودەوڵـەتی ژەهـر بـاران کـران و شـەهید بـوون..
وە هـەزارانیش برینـدار بـوون و تائێسـتاش بەدەسـت نەخۆشـی و دەردەواریـەوە دەناڵێنن و کاریگەری ئەو گازە کیمیاییـەیان لەسـەر دیـارە، وەبەسـەدان کەسـیان توشی نەخۆشی دەروونی بوە لە ئەنجامی ئەوەی کەلەبنەماڵەکەیدا کەسی نـەماوەو هەموویان مردون. وەدوای (٢٠) ساڵ کوڕە گەنجێك بەدایکی شاد بـۆوە دوای ئـەوە منـاڵی بەرمەمکانە بوەو تەمەنی (٦) مانگێ بوە. کاتێ دایکی بێ هۆش بـووە و بردویانە بۆ ئێران و مناڵەکەش دەست ماڵێکی فارسی ئێرانـی کـەوتوەو کردویانـە بەکوڕی خۆیان، سەرەنجام دوای (٢٠) گەڕان و سوڕان و چاوەڕێ کـردن، ئـەم ماڵـە فارسە بۆ ئارامی ویژدانیان بـەو کـوڕە دەڵـێن کـەتۆ بەئەصـڵ کـوردی و خـەڵکی هەڵەبجەی و لەتەمەنی (٦) مانگیەوە لای ئێمـەی و ئـەو کـات کـوڕە گەنجەکـەش کەلەئێران ناویان ناوە (عـەلی) بەشـوێن کەسـوکاریدا دەگـەڕێ لەهەڵەبجـەو چـەند کەسێ خۆیان بەخاوەنی دەناسێنن کەلەو کاتەدا لە ١٩٨٨/٣/١٦ دا منـاڵی کـوڕی (٦) مـانگانەیان بێ سەرو شوێن بوە، بەڵام کاتێ پشکنینی (DNA) بۆ کوڕەکـەو دایکەکان کرا. دەرکەوت کەمناڵی یەکێ لەو دایکە داواکارانەیەو دوای (٢٠) ساڵ گەڕان و دابڕان بەئامێزی یەکتر شاد بونەوە!
وە لە ١٩٨٨/٣/٢٢ دا. کیمیابارانی گوندی سێوسێنانی قـەرەداغ کـراو بەسـەدان شەهید و برینداری چەکی کیمیایی لێ کەوتەوە.بـەم شـێوەیە زۆربـەی بـەهارەکان مانگی ئازارەکان. ئازار بون بۆ ئێمەی کوردی. بەڵام هەزاران سوپاس بۆ خوا، هەر لەوەرزی بەهاردا بوو. وە لەمانگی ئازاردا بوو، کەڕاپەڕینی گـەلی کـورد دەسـتی پێکردو بەهاری (١٩٩١) بـوو بەمێـژوی پرشـنگداری نەتەوەکـەمان و ئـەمجارەیان مانگی ئازار بوو بەئێش و ئـازار و داخ و چـوە دڵـی دوژمنـە خوانەناسـەکانمانەوە لەسەرانی بەعس و نۆکەرەکانی و بەسزای پڕ لەعەدالەتی خوایی گەیشتن.

# سەرچاوەکان


١- ڕۆژنامەی یەکگرتوو ، ژمارە: ٦٨٢ ، لە ٢٠٠٨/٣/٢٥ ، ل,٨

٢- تریفەی مانگ ، پەخشانە شعری مامۆستا غەریب پێنجوێنی ، ل,٢

٣- طريقنا لِمَنابِرِ النُّور ، شيرين مَنير النَجار ، ص,٢٢

٤- ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم. ئاوات ئەبو بەکر ، ب٣ ، ل,١٢٧

٥- گۆڤاری دوانگە، ژمارە: ٣٠ ، ل٢٨.

# ووتـاری دووەم

# بۆ مانگی رَبیعُ الثاني

# گرنگی ئاو بۆ ژیانی مرۆڤ و

# هەموو زیندەوەران

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبهِ أجمعين.

**ئيمانداران:** ئاو ڕەگەزێكی زۆر گرنگی بون و بەردەوامی ژیانە لەسەر ئەم گۆی زەویەدا، مرۆڤ دەتوانێت چەند هەفتەیەك بێ خواردن بژی، بەلاّم ناتوانێ لەیەك هەفتە زیاتر بەبێ ئاو بژی. ئاو تاقە مادەی سەر زەوی یە کەبەسێ دۆخی ڕەقی و شلی و گازی لەسروشت دا هەن.

ئاو یەکەم دروستکراوی خوای گەورەیە لەگەردون دا، خوای گەورە دەفەرموێ:
﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ ﴾ هود: ٧

له صەحیحی بوخاریشدا هاتوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((**كَانَ اللهُ، وَلَمْ يَكُنْ مَعَهُ شَيءٌ، وَلَمْ يَكُنْ هُناكَ غَيْرُهُ**)).

خوای گەورە هەر خۆی هەبوە بەتەنها و هیچ شتێكی دی نەبووە جگە لەخوا، عەرشی خواش لەسەر ئاو بووە، هەموو شتەکانیشی لە (الـذِكر)دا نوسیوەو ئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناوە.

**إبنُ حَجَر دەفەرموێ:** مانای وایە خوای گەورە لەپێشدا ئاوی دروست کردوەو پاشان عەرشی لەسەر ئاو دروست کردوە پاشان قەلّەمی دروست کردوەو پێی فەرموە: بنوسە ئەوەی کەهەیە. ئینجا ئاسمانەکان و زەوی و ئەوانەی تیایاندایە دروست کرد..

لەفەرمودەیەکی تریشدا کەئیمام ئەحمەد و ترمذي دەیگێڕنەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ئاو لەپێش عەرشدا بەدی هێنراوە..

هەروەها (السدی)ش لەڕاڤەکردنی ئایەتەکەدا کە بەچەند مەسنەدێك دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێت: خوای گەورە هیچ شتێكی لەپێش ئاودا دروست نەکردوە.

**کەواتە:** بۆمان دەرکەوت کەئاو یەکەمین بەدیهێنراوە لەنێوان دروست کراوان و بەدیهێنراوەکانی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوانەی تیایاندایە.

بۆیە سەیر نابێت، کەخوا دەفەرموێت: سرِو نهێنی ژیان وا لەئاودایـە. ﴿ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴾ الأنبیاء: ٣٠

ئـاو سەرچـاوەی ژیـانی هـەموو بونەوەرەکانـە، لـە ڤایرۆسـێکەوە کـە بـەئامێری ووردبینی پشکنەر نەبێت نابینرێ. هەتا مـرۆڤ، لەگـەڵ هـەموو جیهـانی ڕووەك و جیهانی گیاندار و ئاژەڵاندا، لە گەردوندا زیندەوەرێکت دەسـت ناکـەوێت کـە ئـاو لەناو پێکهاتەی لاشەیدا نەبێت، ئەگەر چی بونی ڕێژەی ئـاو لـە یەکێکیانـەوە بـۆ یەکێکی تریان جیاوازە.

**بۆ نمونە:** گژوگیا و ڕووەك و ئاژەڵ و مێروی بیابانەکان ڕێژەی ئاو لەناو لاشەیاندا و لەپێکهاتەیاندا کەمە، لەگاتێکدا کەگژوگیا و ڕووەك و ئاژەڵانی ئـاوی، بـونی ئـاو لـەناو پێکهاتـەو لاشـەیاندا لـە ئاسـتێکی زۆر بەرزدایـە. بەهـەرحاڵ دەبـێ ئـاو لەجەستەی دروستکراوەکانی خوای گەورەدا هەر هەبێت، چونکە ئـاو بنچـینەکانی کارلێکە کیمیاوی و بایۆلۆجیەکانی ناو خانەیە.

شتێکی زۆر گرنگی زانستی هەیە ئـەویش ئەوەیـە کـە: جۆرێـك لەبـەکتریا هەیـە کەلەناو هەوادا دەمرێت!! بەڵێ هەوا کەچەند پێویستە بۆ بونی ژیانی ئێمەو هەموو زیندەوەران، لەگەڵ ئەوەشدا جۆرێك لەبەکتریا هەیـە کـەپێی دەوتـرێ – البَكتريا اللاهَوائِيَّة – Unaropic pacateria – کاتێ ئەم بەکتریایە هەوا لێـی بـدات دەمرێت،

**بۆیە خوای خالیق و کاربەجێ فەرمویـەتی:** ﴿ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴾ چونکە ئەوەتا بەکتریایەك هەیە کە لەهەوادا دەمرێ!!

لەکاتێکدا بە بۆ چونی مرۆڤ ئەبێ شتێ نەبێ کەپێویستی بەهەوا نـەبێت! سُبْحانَ الله ، ئەمەش یەکێکە لە إعجـازی زانسـتی قورئـان، کـەهیچ دو دڵیـەك لـەدڵی

کەسێکدا ناهێلێتەوە کەبڵێ قورئانە کەلامی خوای تاك و تەنها و دروستکەری هەموو زیندەوەرانی دیارو نادیار و ئەو بەکتریایەشە کەبەهەوا دەمرێت، خۆ ئەگەر قورئان لەلایەن غەیری خواوە بوایە، هەرگیز ئاگای لەبەکتریایەکی وردی ئاوا نەدەبوو کەدوای زیاتر لەهەزار و چوارسەد ساڵ ئەمجا زانستی نوێ دۆزیویەتیەوە...

وەهەر لەسەر ئایەتی ﴿ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ﴾ الأنبياء: ٣٠

**زانایان دەڵێن:** هەموو زیندەوەرێك لەخانە پێك هاتوەو خانەش سایتۆ پلازمی تێدایە. لە (٧٠٪ - ٨٠٪)ی پێکهاتەی سایتۆ پلازمیش ئاوە!!

هەرە لەبارەی ئاوەوە خوای گەورە دەفەرموێ:﴿وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٍ مِّن مَّآءٍ..﴾ النور: ٤٥ واتە: خوای بالاّ دەست هەموو گیانلەبەرێکی لە ئاو دروست کردوە.

کەوترا هەموو گیانلەبەرێك لەئاو دروست بوە، ئەم بنەمایە (فریشتە و جنۆکە ناگرێتەوە) چونکە ئەم دوو دروست کراوە، بەدەقی ڕاشکاو و ئاشکرا و ساغ، یەکلا بۆتەوە کەلەئاو دروست نەبون، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((خُلِقَتِ المَلائِكَةُ مِنْ نُور، وخُلِقَ الجانُ مِنْ مارِجٍ مِنْ نار، وَخُلِقَ آدَمُ مِماّ وُصِفَ لَكُم)) رَواهُ مُسْلِم (٢٩٩٦) وابنُ حَبّان (٦١٥٥) وغيرهما.

واتە: فریشتە لەڕووناکی و جنۆکەش لەدوکەڵێکی تێکەڵ لەئاگر دروست کراوەو ئادەمیش لەوە دروست کراوە کەبۆتان باسکراوە..

(سُبْحانَ الله) لەوردی ئەم قورئانە. بەیەك ووشە مەبەستە گرنگەکان ڕون دەکاتەوە، ئەوەتا لێرەدا بەوشەی (دابَّة) کەراغب لە (مُفْرَدات أَلفاظ القُرأن)دا ص٣٠٦ دا دەفەرموێ: (دابَّة)، هەموو گیاندارێك دەگرێتەوە کەبەسەر زەوی دا دەڕوات.. کەبێگومان فریشتەو جنۆکە بەمە دەچنە دەرەوە چونکە ئەوان لەهەواشدا دێن و دەچن. ئەگەر یەکێ بڵێ کەواتە: ئایەتەکە باڵندەش ناگرێتەوە.

دەڵێین نەخێر باڵندەش هەر لە (دابَّة) حیسابە، چونکە ئەویش لەهەندێك کاتدا بەسەر زەوی دا دەڕوات، وەك ئاشکرایە لای هەموو لایەك، وەکو پێشەوا (قرطبی) لەتەفسیرەکەیدا (ج٢ ، ص١٩٦) ئاماژەی پێ کردوە.

وە بەپێی زانستی ئەمڕۆش باڵندە هەرچەندە لە هەوادا دەفڕێت، بەڵام جیاوازە لەجنۆکەو فریشتە، چونکە باڵندە تەنها تاڕادەیەکی دیاری کراو دەتوانێ لە ئاسماندا بەرز ببێتەوەو هەرگیز ناتوانێ لەبەرگە هەوای دەوری زەوی دەرچێت،

بەڵام بێ گومان فریشتەو هەندێ لەجنۆکە لەو بەرگە هەوایە دەچنە دەرەوە...

ئەگەر سەرنجی مرۆڤ بدەین دەبینین کەمرۆڤ لەیەکەم ساتی دروست بونی دا لەفیچقەیەك ئاو دروست بووە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ خُلِقَ مِن مَّاءٍ دَافِقٍ يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ ﴾الطارق: ٥-٧

مرۆڤ پاش سێ ڕۆژ لەدروست بونی کە کۆرپەیەو لەسکی دایکی دایە. (٩٧٪)ی لەشی لەئاوپێك هاتووە، کاتێك کۆرپەکە دەگاتە (سێ) مانگی ڕێژەی ئاوی ناو لەشی دەگاتە (٩١٪)و ئیتر ڕێژەکە کەم دەکات تائەو کاتەی لەدایك دەبێت، کەڕێژەی ئاو لە لەشیدا (٨٠٪) دەبێت و کاتێك تەمەنی منداڵەکە دەگاتە (یەك ساڵ) ڕێژەی ئاو لە لەشیدا دەبێتە (٦٦٪)و ئیتر لەسەر ئەو ڕێژەیە بەجێگیری دەمێنێتەوە..

وە ڕێژەی ئاو لەهەر ئەندامێکی لەشی مرۆڤدا جیاوازە.

ڕێژەی ئاوی خانەکانی دەماغ دەگاتە (٧٠٪) و خوێن لە (٨٢٪).

بەڵام ڕێژەی ئاو لەخانەکانی سی دا دەگاتە (٩٠٪)...

وە ٣/٢ی لەشی مرۆڤ ئاوە.

٤/٣ی لەشی باڵندە ئاوە. ٥/٤ی میوە ئاوە.

(سُبْحانَ اللهِ) جگە لە خوای تاك و تەنها و بێ شەریك کێ دەتوانێ بەم ئەندازە گیریە جوانە کەجار بۆجار پلەیەك بەرز دەبێتەوە، ڕابگرێت. ئەمەش نەبەرئەوەیەکە: مرۆڤـ باڵندە دەخوات و باڵندەش میوە دەخوات!

وەهەروەها ٣/٤ی سەر ڕووی زەویش ئاوە کەدەکاتە نزیکەی (٧٣٪).

لەقورئانی پیرۆزدا ووشەی (البحر) -٣٣- جار دووبارە بۆتەوە، وەهەروەها ووشەی (البر) یش -١٢- جار دووبارە بۆتەوە، ئەگەر کۆیان بکەینەوە ٣٣ + ١٢ = ٤٥ جار دەکات جا ئەگەر (٣٣) دابەش بکەین بەسەر (٤٥)دا دەکاتە (٧٣٪)و ئەگەر (١٢)ش دابەش بکەین بەسەر (٤٥)دا ئەوا دەکاتە (٢٧٪). ئەم ڕێژەیەش هەمان ڕێژەی ئاو و ووشكانی یە لەسەر زەوی!!

مرۆڤیش کە خوا لەزەوی یەوە دروستی کردوە. ڕێژەی ئاو لە لەشی دا، هەر لەنزیکەی (٧٣٪)یە و ماددەکانی تریش نزیکەی (٢٧٪)ن

(سُبْحانَ اللهِ) مرۆڤـ ئەگەر بڕوای بەزانست هەبێ تەنها ئەمەی بەسە بۆئەوەی دان بنێ بەوەدا کەئەو خوایەی زەوی دروست کردوە. هەر ئەو خوایەش مرۆڤی دروست کردوەو مرۆڤـ دەبێت سەری بەندایەتی بۆ خالیقی بخاتە سەر زەوی.

ئاوی زەریاکان ٩٧٪ی ئاوی سەر ڕووی زەوی پێك هێناوەو ئاوێکی سوێرەو ناخورێتەوەو بۆ کشتوکاڵیش نابێت. بەڵام ئەو ئاوەی کە بۆ خواردنەوە دەبێت (٣,٠٪) تێناپەڕێت!

**لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت، ئەویش ئەوەیە:**

ئایا بۆچی ئاوی زەریاکان سوێرە؟!

**وەڵام:** لەبەرئەوەی ئاوی دەریاکان زۆر قوڵ و فراوانن. بەڵام لەبەرئەوەی ئاوەکانیان وەستاون و لەگەڵ تەمەنی زەوی دا هەن. بۆیە خوای گەورە بەسوێری دروستی کردون. وە ئەگەر سوێر نەبو نایە، ئەوا بێگومان بۆگەنیان دەکردو بەتێپەڕبونی ئەو

مــاوه زۆره بەســەری دا، پــیس بــونێکی زۆر گــەوره و مەترســیداری ژینگــەیی دەخولقاند، خوای کاربەجێ فەرمویەتی: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾ القمر: ٤٩

جا هەرچەنده ئاوی دەریاکان خۆیان ســوێرن و بەکــەڵکی خواردنــەوه نایــەن، بــەڵام خوای گەوره کرداری دڵۆپاندنی داناوه که (بارانه) بۆ چارەســەر کردنــی ئــەو ئــاوه سوێرەو گۆڕینی بۆ ئاوی سازگارو شیرین..

ئاو ئەو تاقه مادەیه کەخاوەنی کۆمــەڵێك تایبەتمەنــدی فیزیــایی یــه کــەوا لــەئاو دەکەن ببێته مادەیەکی دەگمەن و ناوازه لەنێو هەموو ماددەکانی دیکەدا، جێگەی خۆیەتی کەئاماژەیەك بکەین بۆ ئەو ســیفەته فیزیاییانــەی کــەوایان لــەئاو کــردوه ببێته موعجیزه (هەرچەنده هەموو ماددەکان موعجیزەن) چــونکه دروســتکراون و بەدیهێنراون، دروست کردن و بەدی هێنــانیش لەســەرو توانــای مرۆڤەوەیــه. بۆیــه بەموعجیزه دادەنرێن!

بەڵام بونی هەندێ سیفەتی فیزیایی لەئاودا زیاتر لــەماددەکانی دیکــە، وای لــەئاو کردوه سیفەتی موعجیزەییەکەی زیاتر بێ لەوانی تر.

**هەروەکو ووتمان:** ئاو یەکەمین بەدیهێنراوه لەنێوان دروستکراوان و بەدیهێنراوەکانی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوانەی تیایانــدایــه، بۆیــه ســەیر نابێــت کــەخاوەنی هەنــدێ سیفەت و تایبەتمەندی بێ کەهەر لەئاودا هەیەو تایبەتن بەئاوەوه!

**١- گەردی ئاو دوو جەمسەره وەك موگناتیس:** ئاو مادەیەکه لەڕوی گەردی یەوه دوو جەمســەره. هــەر گــەردێکی ئــاو پێکــدێت لەیــەك گەردیلــەی (٥) کەشــەش ئەلکترۆنی هەیه لەدوو خولگەی دا. وه دوو گەردیلەی ($H_2$) که هەر گەردیلەیەکی تەنها یەك ئەلکترۆنی هەیه. ئۆکسجین و هایدرۆجینەکه بەیەکەوه بەستراون بــەهۆی بەندی هاوبەشی یەوه کەلەبەهێزترین بۆندەکانەو ناتوانرێت بەئاسانی بشــکێنرێت و هەردوو توخمی ($H_2$ , $O_2$) لەیەك جیابکرێنەوه.

بەڵێ خوای گەورە ئاوی وا دروست کردوە کەبەرهەڵستی شیبونەوە دەکات و نابێتەوە بەئاگر چونکە هایدرۆجین ($H_2$) گازێکی گڕ گرتوە، ($O_2$ ئۆکسجین)یش یاریدەی سوتان دەدات. بەڵام بەیەکگرتنی دوو گەردیلەی هایدرۆجین و یەك ئۆکسجین گەردێکی ئاو پێك دێت..

بەڵام هەل و مەرجی تایبەتیدا لە (٢٧٠٠) پلەی سەدی ئاو بەرێژەی (١١٪) بۆ هەردوو توخمی ئۆکسجین و هایدرۆجین شی دەبێتەوە.

سبحان الله لەدوو ماددەی ئاگری ئاو دروست دەبێ و پاشان ئەم ئاوە دەبێتەوە بەئاگر و کارەبای لێ دروست دەبێت..

**٢- تایبەتمەندی ئاو بریتی یە لە ڕووکشان:** کاتێ دلۆپێ ئاو دەچێتە سەر ڕوی گەڵایەك ئەوا ڕوی نێوان دلۆپە ئاوەکەو گەڵاکە ڕووتەخت دەبێ، بەڵام ڕوی سەرەوەی دلۆپەکە بەهۆی ڕوکشانەوە گۆیی دەبێت و بەم جۆرە شێوەی دلۆپە ئاوەکە نیوە گۆیی دەبێت. ڕوکشانی ئاو لەڕووکشانی هەموو شلەکانی تردا زیاترە جگە لەجیوە. ئەو سیفەتە دەگمەنەی ئاویش بۆتە هۆی دروست کردنی ڕوویەکی جیڕ بەسەر ئاوەکەوە، بەجۆرێك مێروی بچوك و جاڵجاڵۆکە دەتوانن بەسەر ڕووی ئاوەکەدا بڕۆن بەبێ ئەوەی تەڕ بن.

وەیان گوێزانی ووشك و دەرزی درومان بەسەر ڕوی ئاوەکەوە دەوەستن بەبێ ئەوەی نقوم بن، هەرچەندە چڕی ئەو مادانە زیاترە لەچڕی ئاو...

**یەکێ دەپرسێ:** باشە ئەم سیفەتی ڕوکشانە چ سودێکی هەیە؟! لەوەڵامدا دەڵێین: ئەگەر ئەم سیفەتی ڕوکشانە نەبوایە، باران نەدەباری! چونکە بەهۆی سیفەتی ڕوکشانەوەیە دلۆپەکانی باران. شێوەی گۆیی دروست دەکەن و دێنە خوارەوەو بەر هەڵستی بون بەهەڵم و پەرت بوون دەکەن. وە هەر بەهۆی ڕوکشانەوەیە کەئاو دەنوسێت بەڕوی تەنەکانی وەك شوشەو بەردو تەڕیان دەکات، ئەگەر ئاو ئەم سیفەتەی نەبوایە، ئەوا هەرگیز قاپێکی شوشەت بەئاو بۆ نەدەشۆرا.

وەئەگەر ڕوکشانی ئاو کەمتر بوایە لەوەی ئێستای، ئەوا بەتەنها بەرکەوتنی خانەکە بەهەر شێلەیەکی دی. ئاوەکەی ناوی تێدا نامێنێت و خانەکەش دەمرێت....

بەڵێ بەهۆی سیفەتی ڕوکشانەوەیە، کەبەزوویی ئاو لەگەڵای ڕوەکەوە وون نابێت، ئەگەر بێتوو وانەبوایە ئەوا بەماوەی یەك خولەك گەڵا ووشك دەبوو!!

وەهەر بەهۆی ڕوکشانی ئاوەوەیە کەئاوی ڕوبارەکان تێکەڵ نابن لەگەڵ ئاوی سوێری دەریاو ئۆقیانوسەکان ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا ﴾ الفرقان: ٥٣

**٣- سێ یەم تایبەتمەندی ئاو:** هەموو مادەیەك ئەگەر سارد کرایەوە ئەوا چڕی زیاد دەکات ودەچێتەوە یەك وقەبارەکەی (حەجمەکەی)کەم دەکات.

بەڵام ئاو هەرکاتێ گەیشتە چوار پلەی سەدی (٤س°) بەپێچەوانەوە دەبێت. ئاو کەگەیشتە چوار پلەی سەدی گەردەکانی لەیەك دووردەکەونەوە ولە (سفری سەدی)دا دەیبەستێ. ئەوکاتە چڕیەکەی (١٠٪) کەم دەکات وقەبارەکەی گەورە دەبێ. بۆیە لە زستاندا بۆریەکان بەبەستن دەتەقن وشوشەی بەستوو لەبەستێنەردا (مُجَمِّدَة)دا دەتەقێ!

**لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت: باشە بۆچی ئاو وایە؟!** بۆچی بەهۆی ئەم خەسڵەتەوە ئاوا توشی زەرەرمان دەکات؟!

**لە وەڵامدا دەڵێین:** خوای گەورە حەکیم وکاربەجێ یە. ئەگەر ئەولادانە ناوازەیەی ئاو نەبوایە لەسیفەتی گشتی شلەکان، ئەوا لەزستاندا بەجارێك ئاوی دەریا ودەریاچەکان دەبونە شەختە ودەیانبەست وهەرچی گیانداری ئاوی هەیە دەمردن. بەڵام بەهۆی ئەم سیفەتە ناوازەیەوە تەنها توێژاڵێك لەسەر ڕوی ئاوەکان دەبنە

سەهۆڵ وسەهۆڵەکە سەرئاو دەبێ وژێرەوەیان ئاوێکی گەرم وخۆش دەبێ بۆ زیندەوەرانی ناوی. چونکە ئەو چینە سەهۆڵە، وەك چینێکی پارێزەر دەبێ کەپلەی گەرمی ئاوەکەی ژێرەوەی بەپارێزراوی دەهێڵێتەوە.

٤- **چوارەم تایبەتمەندی ئاو:** ئاو پاڵ بەو مادانەوە دەنێ کە دەخرێنە ناویەوە و بەرەو سەرەوە پاڵیان پێوە دەنێ. ئەمەش پێی دەوترێ یاسای (ئەرخەمێدس) بەناوی ئەو زانایەی ئەم تایبەتمەندی یەی ئاوی دۆزیەوە..

هەموو ماددەیەك کە دەخرێتە ئاوەوە نیوەی کێشەکەی لە دەست دەدات.

بۆیە شت لەناو ئاودا ئاسان هەڵدەگیرێ وسووکە. جا ئەم سیفەتەی ئاوەکە وادەکات پاپۆڕ وکەشتیەکان لە دەریا وزەریاکاندا نقوم نەبن. چونکە لەغەیری ئاودا پاپۆڕ ناتوانێ بەناو هیچ شلەیەکی تردا بڕوات وسەراو ببێ.

ئەم سەردەمەدا پاپۆڕی هەڵگرتنی نەوت هەیە، قورسی بارەکەی زیاترە لەیەك ملیۆن طه ن. **قورئان لەو بارەیەوە دەفەرموێت:** ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَكُمُ ٱلْبَحْرَ لِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِۦ ﴾ الجاثية: ١٢. یان دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِى تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ ﴾ البقرة: ١٦٤

٥- **پلەی کوڵان وپلەی بەستنی ئاو یەکێکی ترە لەسیفەتە تایبەتیەکانی ئاو،** ئاو لەسفری سەدی دا دەیبەستێ. خۆئەگەر وانەبوایە ئەوا هەربەتۆزێ هەوای سارد ئاوەکان دەبون بەسەهۆڵ.

وە ئاو لە (١٤) پلەدا دەبێ بە هەڵم. ئەگەر لەسەد پلەدا ببوایە بە هەڵم، ئەوا ئەگەر پەرداخێ ئاو لە ماڵەکەتدا بڕژایە وکات زستان بوایە، ئەوا تا چلەی هاوین ووشك نەدەبۆوە. بەڵام ئێستا کە ئاو لە (١٤) پلەدا دەبێ بەهەڵم. ئەو ئاوە ڕژاوە لە زستانیشدا بەچەند کاتژمێرێ دەبێ بە هەڵم و ووشك دەبێتەوە. ووتمان ئاو لە (١٠٠) پلەی سەدی دا دەکوڵێ، خۆ ئەگەر وەکو زەیت وابوایە کە لە (٥٠٠) پلەدا

دەکولێ، ئەو هەموو چێشتێ لەسەر ئاگر دەسوتاو ئەو کات ئیتر هیچ سودێکت لە خواردن وخواردنەوەی کولاّودا نەدەبینی بەهۆی زۆر کولاّنیەوە..

ئەگەر ئەم سیفەتەی ئاو نەبوایە کە لەسفردا دەیبەستێ و لەسەد پلەدا دەکولێ. ئەوا ئاو بەشلی نەدەبوو. بەڵکو هەر هەڵم دەبوو.

**زانایەك دەڵێ:** ئەگەر ئاو تەنها یەك تایبەتمەندی بچوك لەدەست بدات، ئەوا ژیان لەسەر زەوی کۆتایی پێ دەهات!!

**دەریازانی بە ناوبانگ: (جاك ئیف کۆستۆ) دەڵێ:** بەردەوام بونی ژیان و دوارۆژی، بەردەوام پشت دەبەستێ بەنامۆترین ئاوێتەی سەرزەوی کەئاوە!!.)

**٦- شەشەم تایبەتمەندی ئاو ئەوەیە:** خوای گەورە ئاوی بەبێ ڕەنگ وبێ تام وبێ بۆن دروست کردوە. ئەگەر ئاو ڕەنگی ببوایە، ئەوا ئەو جوانیەی ئێستای نەدەبوو. وە لەگەڵ ڕەنگەکانی تردا نەدەگونجا بۆ گرتنەوەو ڕەنگەکانی تر وەکو خۆیان دەرنەدەچون.

خۆ ئەگەر ئاو شیرین بوایە، ئەوا هیچ چێشتی نەدەخورا. ئەوەی نەخۆشی شەکرەی بوایە لێ ی مەحروم دەبوو.

**کەواتە:** تامی ئاو لەوەدایە کەهیچ تامێکی نیە. خۆ ئەگەر ئاو بۆنی ببوایە. هی واهەیە بەهەموو بۆنێ قەڵسە. لەخواردنەوەی ئاو بەهۆی ئەونەخۆشیەوە بێ بەش دەبوو لەئاو.

**جا هەر لەبەر ئەم تایبەتمەندیەی ئاوە، کە لە شەرعدا دەفەرموێ:**

١- خۆپاکردنەوە و تارەت.

٢- دەست نوێژ.

٣- غوسڵی خۆشتن.

لەمانەدا تەنها دەبێ ئاو بەکاربهێنی. بەدیتۆڵ دەست نوێژ بگری دروست نیە. خاڵێکی تر ئەوەیە کەئاگاداربین نابێ ئاو بەفیڕۆ بدرێت. تەنانەت لەدەست

نوێژیشدا. ئەگەر لەسەر دەریا دەست نوێژ بگری. مەکروهە لـە (٣) جـار زیـاتر دەست دەم وچاو وقاچتان بشۆن.

لەفەرمودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) کە پێشەوای فەرمودە نـاس ئـەبو داود (٩٦) دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: ((إِنَّهُ سَيَكُونُ فِي هذهِ الأُمَّـةِ قَوْمٌ يَعْتَدُونَ فِي الطُّهُورِ وَالدُّعاءِ)).

جا ئەگەر ئاو بەفیڕۆدان بۆ دەست نوێژ، کە کلیلی چونە ناو نوێژە مەکروهو نـاجوان بـێ. ئـەی ئـەوەی هـەموو ڕۆژێ لەسـەر جادەکـە سـەیارەی پـێ دەشـوات! وە لەشەریعەتی ئیسلامی دا هاتوە کە حەرامە سەرچاوەی ئاووکانی پـیس بکـرێ. عَبْدُاللّٰهی کوڕی عَبَّاس کە ئامۆزای پێغەمبەری خـوا (ﷺ) دەفـەرموێ: سَـمِعْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) يَقولُ: ((إتَّقُوا المَلاعِنَ الثَّلاثَ، قيلَ: ما المَلاعِنُ الثَّلاثُ يارَسُولَ اللهِ؟ قالَ: أَنْ يَقْعُدَ أَحَدُكُمْ في ظِلٍّ سَيْتَظِلُّ بِهِ. أَوْ في طَرِيقٍ، أَوْ في نَقْعِ ماءٍ)) رَواهُ أَحْمَد.

واتە: خۆبپارێزن لەوسێ شتەی کەدەبنە مایەی ئەوەی کەنـەفرەتتان لێ بکـرێ کـە خەڵکی کەئەوەیان بینی بڵێن: هەی لەعنەتی خوای لێ بـێ. عـەرزی پێغەمبـەری خوایان کرد، ئەوسێ شتە چین ئەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ؟! فـەرموی: ئەوەیـە کەیەکێ لەئێوە لەشوێنی بەربەڕۆچکە وسـێبەری خـەڵکی دا کـەلێ ی کۆدەبنـەوە وپشوو دەدەن، بچێ پیسایی بکات و سەرئاوی خۆی لەوسەرجادە جێ بەجێ بکات. یان لەسەر چاوەیەکی ئاوو کانی دا پیسایی ومیز بکات. کەخەڵکی دێنـە سـەرئەو کانی وئاوە پاکە وکەئەو دیمەنە قێزەونە دەبینن، نەفرەتی بۆ دەنێرن.

ئەمە ئیسلام ورێبازەکەیەتی کەئاوا ڕێز لەجوانی وپاکی دەگـرێ، بەتایبـەت پـاکی وجوانی وپاراستنی شوێنە گشتیەکان، خۆزگایە موسڵمانان پێوەی پابەند بونایە.

**بەڕێزان:** ئاو بەخشین گەورەترین خێرو صەدەقەیە.

**هاوەڵی بەڕێز حەزرەتی ئەبو هورەیرە دەفەرموێ:** پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((لَيْس صَدَقَةٌ أَعْظَمَ أَجْراً مِنْ ماءٍ)) رَواهُ البَيْهَقي في شعب الأيمان (٣٣٧٨)

واتە: هیچ خێر وبەخشینێك گەورەترینە لەبەخشینی ئاو وتێراوکردنی خەڵکی تینوو.

**سەعدی کوڕی عوبادەش دەفەرموێ،** بە پێغەمبەری خوام گوت: يارَسُولَ اللهِ، إنَّ أُمِّي ماتَتْ فَأَيُّ الصَدَقَةِ أَفْضَلُ؟ عەرزم کرد ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دایکم کۆچی دوایی کردوە، ئایا چ خێر وصەدەقەیەك لەهەموو خێر وچاکەیەك باشترە کەبۆی بکەم بەخێر؟

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی:** (الماءُ) فەرموی ئاوی بۆبکە بەخێر. (فَحَفَرَ بِئْراً وَقالَ: هذهِ لأُمِّ سَعْدٍ) ئیتر سەعدیش بیرە ئاوێکی لێداو وتی: ئەمە بۆ دایکی سەعد خێر وخێرات بێ. (ئەم فەرمودەیە پێشەوامان ئەبو داود ڕیوایەتی کردوە)

وە لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((أَيُّما مُؤْمِنٍ سَقَى مُؤْمِناً عَلى ظَمَأً سَقاهُ اللهُ يَوْمَ القِيامَةِ مِنَ الرَّحيقِ المَخْتُومِ)) رَواهُ الترمذي.

واتە: هەر کەسێکی ئیماندار ئیماندارێك تێراو بکات لەسەر تینویەتی، ئەوا خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا لەگوڵاوی سەرمۆری بەهەشت – دا ئاوی دەدات.

**دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشە دەفەرموێ:** عەرزی پێغەمبەری خوام کرد، (ماالشَّئُ الَّذي لايَحِلُّ مَنْعُهُ)؟ ئەوشتە چیە کەنابێ لەکەس مەنع بکرێ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (الماءُ وَالمِلْحُ والنّارُ) ئاو وخوێ و ئاگر.

**خاتوو عائیشە دەفەرموێ:** ئەوە خێری ئاوەکەمان زانی کەچەند خێرە ئاشکرایە تێراوبون لەدوای تینویەتی چەند خۆشە.

(فَما بالُ المِلْحِ والنّارِ؟!) ئەی بۆچی خویێ وئاگریشت خستە پالّی؟.

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی:** (یاحُمَیْراءُ) ئەی سورە گیان – لەخۆشەویستیدا وای پیێ فـەرموە! (**مَنْ أَعْطَى ناراً فَكَأَنَّما تَصَدَّقَ بِجَميعِ ما أَنْضَجَّت تِلْكَ النّارُ**). هەرکەسیێ ئاگر بداتە مالّێك بۆئەوەی ئاگری پیێ بکەنەوە ونان وخۆراکی پیێ ئامادە بکەن. ئەوە وەکو ئەوە وایە کەهەرچی بەوئاگرە کولاّوە کردبێتی بەخێر!! ئـەمڕۆش دەتوانی ئەو خێرەت دەست بکەوێت بەوەی کەئەگەر هاوڕیێ یەکت، دراوسیێ یەکت. پێویستی بەشقارتە بوو بۆ داگیرساندنی غازەکـەی لەوکاتـەدا خـۆی نـەیبوو، یـان لەبەردەستیدا نەبوو. تۆ بیدەیتیێ. یان بتلّە غازی لیێ بڕاوە، تۆ بتلّەغازەکەی مـالّی خۆتی بدەیتیێ تاهی خۆی پڕدەکاتەوە.

(سُبْحانَ اللّٰه) ئەوەندە خێرت دەگاتیێ وەکو ئەوەی تەواوی ئەو خواردنـەی ئـەو بـەو ئاگرەلیێ ی دەنێت تۆ کردبێتت بەصەدەقە وخێر!

**وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە عائیشەی فەرموو:**

ئەی سورە گیـان بزانـە: (**وَمَنْ أَعْطَى مِلْحاً فَكَأَنَّما تَصَدَّقَ بِجَميع ماطَيَّبَتْ تِلْـــكَ المِلْحُ**). وە هەرکەسێك خویێ ی چێشت بدات بەکەسێك بۆ ئەوەی کەچێشتەکەی پیێ تام بکات. ئەوە وەکو ئەوە وایە هەموو ئەو خواردنەی کەبەو خویێ یە تامی گرتوە، کردبێتی بەخێر وصەدەقە ودابێتی بە هەژاران و نەداران.

**پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی:**

(**وَمَنْ سَقَى مُسْلِماً شَرْبَةً مِنْ ماءٍ حَيْثُ يُوجَدُ الماءُ، فَكَأَنَّمـــا أَعْتَـــقَ رَقَبَـــةً**) وە هەرکەسیێ ئاوبداتە موسـلّمانێك. پـەرداخێك ئـاوی پـاك وسـارد وخۆشـی بـداتیێ وتینویەتی بشکێنیێ، لەوشوێنەشدا ئاو دەست دەکەوت، بەلاّم تـۆ چـوی ئاوەکـەت هێنا وئاوت بەوکەسانەدا کەلەمەجلیسەکەدا دانیشتون.

ئەوە وەکو ئەوە وایە کە گەردنی بەندەیەکت ئازاد کردبێت. **کەواتە:** ئاو گێڕان زۆر خێرە.

وە فەرموی: (**وَمَنْ سَقَى مُسْلِماً شَرْبَةً مِنْ ماءٍ حَيْثُ لايُوجَدُ الماءُ فَكَأَنَّما أَحْياها**) رَواهُ ابن ماجَّة (٢٤٧٤). وە هەرکەسێك ئاویداتە موسڵمانێك، پەرداخێك ئاوی بداتێ. لەشوێنێکدا کەئاوی لێ دەست ناکەوێ. تەنها ئەو ئاوە نەبێ کە لەلای تۆیە ئەوە وەکو ئەوە وایە ئەوکەسەی ئاوەکەی دەدەیتێ مردبێ وتۆ زیندوی بکەیتەوە، ببیتە هۆی ئەوەی لە مردن ڕزگاری بکەی.

(سُبْحانَ اللّٰه) ئاو ئەوەندە شتێکی پیرۆزە وتێراوکردنی تینویەك ئەوەندە خێرە، کە بەمرۆڤەوە ناوەستێ، بەڵکو ئاژەڵ وباڵندە وتەنانەت دڕندەکانیش دەگرێتەوە.

بەوردی سەرنجی ئەم فەرمودە زێڕینەی پێغەمبەری خوا بدەن (ﷺ).

**پێغەمبەری خوا** (ﷺ) **دەفەرموێ:** (**بَيْنَما كَلْبٌ يُطيفُ بِرَكِيَّةٍ، قَدْ كادَ يَقْتُلُهُ العَطَشُ، إِذْ رَأَتْهُ بَغِيٌّ مِنْ بَغايا بَني إِسْرائيل، فَنَزَعَتْ مُوقَها فاسْتَقَتْ لَهُ بِهِ، فَسَقَتْهُ فَغُفِرَ لَهابِهِ**). رَواهُ البُخاري وَمُسْلِم.

واتە: لەوکاتەدا کەسەگێك لە چۆڵەوانیەکدا دەسوڕایەوە وتینویەتی زۆری بۆ هێنابوو. نزیکی ئەوە بوو لە تینوان بخنکێ و لەناوچێ. لەو کاتەدا ئافرەتێکی داوێن پیس لە لەش فرۆشانی بەنی ئیسرائیلی چاوی بەم سەگە کەوت. کە چۆن لە تینوان زمانی لەزەوی یەکە دەدات وپەرێشانە بۆ ئاو.

بۆیە ئەم ئافرەتە زیناکارە بەزەیی پێدا هاتەوە وپێڵاوەکەی خۆی داکەند وچوە ناوبیرێکەوە وئاوی بۆ دەرهێنا وسەگەکەی تێراوکرد. خوای گەورە بەهۆی ئەم کردەوەیەوە، کە تێراوکردنی ئەو سەگە تینوە بوو. لەگوناهی ئەو ئافرەتە داوێن پیسە خۆش بوو!!

دەی ئەگەر ئەو تینوە، سەگێك نەبێ. مەڕ ومانگایەکی ناو ئاژەڵەکەت بێ.

کەئەو ئاوە دەکاتە شیر وگۆشت وپێشکەشبت دەکاتەوە. ئەی ئەگەر مرۆڤێـك بـێ، ئەی ئەگەر ئەو مرۆڤە کەم ئەندامێك بێ. ئەی ئەگەر ئەو مرۆڤە منـاڵێکی بچـوك وساوای تینوبێ ونەزانێ بلێ ئاو. ئەی ئەگەر ئەومرۆڤە هاوسەرت بێ، یان منـاڵ و جگەرگۆشەت بێ، یاخود دایك وباوکی لەناوجێگادا کەوتبێ، کە توانای هەڵسـانی نیە بۆخۆی پەرداخێ ئاو بخواتەوە وچاوەڕێ ی تۆیە ئاوی بدەیتێ!

ئەی ئەگەر ئەومرۆڤە دراوسێت بێ و موحتاج بێ بۆ ئاوو تۆش بیرە ئاوێکت هـەبێ سۆندەی بۆ بخەیتە ناومالّی خۆیەوە. یان ئاوەکەی لەگـەڵ بکـەیت بـەدوو بەشـەوە وەکو تۆ لێ ی سودمەند بێ! ئەوە پاداشتەکەی هەرباس مەکە.

بەمەرجێ بۆ ڕەزامەندی خوات بێ ومنەتی لەگەڵ نەکەی. ئەوە (إِنْ شاءَ اللهُ) خـوا ئەهەموو گوناهەکانت خۆش دەبێ وهەموو تای تەرازوی خێرت پڕدەکات لەچاکە.

**بەڵام:**

ئەی تاوانی ئەوکەسەی کەئاوی زیادەی هەیە، بەڵام لەخەڵکێك کەزۆر پێویستی پێ یەتی مەنعی دەکات وبەخیلە بە بەخشینی ئاو، ئـەو ئـاوەی کەفـەزڵ و بەخششـی خوایە. ئەوئاوەی بەڕەحمی خوا لەوخاکە ڕەقە هاتۆتە دەرەوە. ئەوئاوەی کەهەتا لێ ی بڕوات زیاد دەکات، ئەو ئاوەی کە لەتانکی ودەبەدا هەڵناگیرێ وخـەزن نـاکرێ. کەچی ئەم مرۆڤە بەخیلە بەبەخشینی ئەوئاوەش کە هیچ هەوڵ وئازایەتیەکی ئەوی تێدا نی یە لە دروست بون وهاتنە دەرەوەیدا.

**پێغەمبەری خوا** (ﷺ) : لەبارەی ئەوجۆرە کەسانەوە دەفەرموێ:

(ثَلاثَةٌ لايُكَلِّمُهُمُ اللهُ يَوْمَ القِيامَةِ وَلايَنْظُرُ إِلَيْهِمْ ...)

١- رَجُلٌ حَلَفَ عَلى سِلْعَةٍ لَقَدْ أَعْطَى بِها أَكْثَرَ مِمّا أَعْطَى وَهُوَ كاذِبٌ.

٢- وَرَجُلٌ حَلَفَ عَلى يَمينٍ كاذِبَةٍ بَعْدَ العَصْرِ لِيَقْتَطِعَ بِها مالَ رَجُلٍ مُسْلِمٍ.

٣- وَرَجُلٌ مَنَعَ فَضْلَ مائِهِ، فَيَقُولُ اللهُ: اليَوْمَ أَمْنَعُكَ فَضْلي كَما مَنَعْتَ فَضْـلَ مالَمْ تَعْمَلْ يَداكَ). مُتَفَقٌ عليه.

**واته:** سێ کەس هەن کەخوای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکـات لـەرۆژی دوایـی دا، وە تەماشایان ناکات. پەنا بەخوا گـەورەترین خەسـارەتمەندی. گـەورەترین ئەشـکەنجە وئازار ئەوەیە کەمرۆڤ لەرۆژی قیامەتدا لەبینینی نوری خـوای پـەروەردگاری خـۆی بێبەش بێت. وەخوای پەروەردگار قسەی لەگەڵ نەکات.

١- کەسێکە لـەکاتی فرۆشـتنی کاڵایەکـدا – کەلوپەلێکـدا – سـوێند دەخـوات بەکڕیار دەڵێت: سوێند بەخوا زیاتریان داومێ لەوەی کەوا تـۆ دەمـدەیتێ. کەچـی درۆش دەکات!.

٢- وەکەسـێك کەلـەدوای نوێـژی عەسـرەوە – کـە ڕۆژ بـەرەو ئاوابونـە ومرۆڤـ لەوکاتەدا کردەوەکانی بەرزدەبنەوە بەرەو خـوا. لەگـەڵ کەسـێکدا کێشـەی هەیـە لەسەر شتێك، ئەم شتە هی ئەم نیە، بەڵام بەرامبەرەکـەی شـاهیدی نیـە وسـوێند دەدرێ بەم. ئەگەر چی دەشزانێ ئەم شتە هی ئەونیە، بەڵام سوێند بـەخوای گـەورە دەخوات بۆ ئەوەی ماڵی ئەو موسڵمانە بەوسوێندە بەدرۆیە بکات بەهی خۆی..

٣- کەسێکە کەئاوێکی زیادەی هەیە، دراوسـێ یـەکی، کەسـێکی زۆر موحتاجـە وئاتاجەبە وئاوە بەڵام کەئاوەکەی لەبەردەستدایە ناهێڵێ ئەوکەسە کە زۆر پێویستی بەوئاوە هەیە لێ ی سودمەند بێ – لەبەر بەخیلی و چاوچـنۆکی – خـوای گـەورە دەفەرموێ: ئەمڕۆ فەزڵ وکەرەم وبەخششی خۆمت لێ قەدەغـە دەکـەم، هـەروەکو چۆن تۆ قەدەغەی ئەوئاوەت کرد کەلێت زیاد بوو، لەکاتێکدا دەسـتی تـۆ لـەبونی ئەو ئاوەدا هیچ بونی نەبوو. هیچ ئازایەتی ورەنجێکی تۆ لـەوئاوەدا نـەبوو، کەچـی قەدەغەت کرد لەخەڵکی ویەخیل بوی بەبەخشینی.

**کەواتە: موسڵمانی بەڕێز،** بیری ئاوەکەت، کانی وکارێزەکەت فەزڵ وکەرەمی خوایە لەگەڵت ومەنعی خەڵکی لێ مەکە. وەتکاشـم وایـە، ئەوکەسـەی ئەچـێ بۆمـاڵی خەڵکی بۆئاو وئاوەکە وەردەگرێ، بائەویش کارێـك نـەکات کـەخاوەن مـاڵ ئـازار بدات. بەپرسیاری نابەجێ و وردبونەوە لەماڵ وحاڵی خاوەن ماڵ.

بەڵێ بەڕاستی دونیا بەئاوەوە جوانە، پێشینان فەرمویانە: ئاو وئاوەدانی.

وەیەکێ لەدیمەنە جوانەکانی بەهەشت ئەو ئاوەیە کەبەژێر کۆشکەکاندا دەڕوات.

قورئان دەفەرموێ: ﴿ جَنَّٰتٍ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾ البقرة: ٢٥

**جا ئیماندارانی بەڕێز:** کەزانیمان ئاو ئەو هەموو گەورەیی و خێرو بەرەکەتەی بۆ دونیاو قیامەتمان هەیە، جاحەیف نیە لەگە هەر پەرداخە ئاوێکدا سوپاسی خوا نەکەین؟! ئایا حەیف و تاوان نیە لەسەر سەرچاوەکانی ئاو و کوێستانەکان و چەم و ڕووبارەکان. کەسەیرانگان لەسەر ئەو ئاوە جوانە بێ شەرعی بکرێ؟!

بەخوا هیچ کەس قەدرو نرخی ئاو نازانێ، مەگەر کەسی ئیماندارو لەخواترس نەبێ کەبەجوانی لەقورئان حاڵی بوبێ کەچۆن باسی گرنگی ئاوی کردوە.

جاهەموو خەڵاتێکی خوا ئەگەر قەدرت نەزانی خوای گەورە لێت وەردەگرێتەوە، زۆر ناشکوریمان بەئاو کرد، بەفیڕۆماندا. ئیسرافمان لەبەکارهێنانی دا کرد، ئەوەتا زۆربەی کانی و کارێز و بیرەکان ووشك بوون، خوای گەورە بەڕەحمی خۆی جارێکی تر بۆمان ببوژێنێتەوە و بژیەنێتەوە..

**دەگێڕنەوە.** جارێك سەرکردەی ڕۆمەکان کوپەیەکی بۆ هارونە ڕەشید ناردو بۆی نوسی لە هەرشتە شتێکی تێ بکە!! هارونە ڕەشیدیش سەری سوڕما کەمانای چی یەو چۆن دەکرێ لەهەرشتە شتێ بکرێتە ئەو کوپەیەوەو جێگاش ببێتەوە!! بۆیە پرسی بە شێخ حەسەنی بەصری کرد لەو بارەیەوە. ئەویش فەرموی: ئاوی تێ بکە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّ ﴾ الأنبياء: ٣٠

هارونە ڕەشیدیش ئاوی تێ کردو ناردیەوە بۆ سەرۆکی ڕۆمەکان، سەرۆکی ڕۆمەکانیش ووتی: بەڕاستی سەرۆکی موسڵمانەکان زیرەکە!..

**بەڕێزان:** پێشتریش باسمان کرد کەخوای گەورە فەرموی: ﴿ وَجَعَلۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّ ﴾ الأنبياء: ٣٠. بەڵێ هەموو شتێ لەم ژیانەدا پێویستی بەئاو هەیەبۆ ژیان، وە ئەمە بەسەر هەموو زیندەوەراندا دەچەسپێ. بەڵام لەم دوایانەدا زانایان زیندەوەرێکیان دۆزی یەوە کەهەرگیز ئاو ناخواتەوە، وەلەمەش سەیر تر ئەوەیە

کەئەگەر ئاو بخواتەوە یەکسەر دەمرێت، ئەو زیندەوەرەش بریتی یە لە (کەنغەر) کەلەبیابانی ئوسترالْیا دەژی، ئەم جۆرە کەنغەرەهەرگیز ئاو ناخواتەوە، لەگەلْ ئەوەشدا کەلەبیاباندا دەژی، وەکێشی ٦٠ تا ٧٠ کیلۆ دەبێت!! وەئەگەر ئاو بکرێتە دەمیەوەو پێی بخورێتەوە یەکسەر دەیکوژێ و پێی دەمرێت!! ئەی خوای گەورە نەیفەرموو: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ ﴾ ئەی خۆ ئەم ئاژەلْەش شتێکە لەو شتانەی کەئاوسەرچاوەی ژیانیەتی، ئەی بۆ ئەوەندە دژی ئاوە؟! خۆ ئایەتەکە هیچی لێ دەرنەکرد، ئەی چۆن ئەمە دەگونجێ؟!

پێویستە بگەڕێینەوە بۆ زانستی زیندەوەرزانی (عِلْم الأَحْياء)، زانایان هاتن دیراسەیان لەسەر ئەم ئاژەلْە کرد، بۆیان دەرکەوت کە لەگەلْ ئەوەشدا کەوەکو هەموو ئاژەلْەکانی تر کۆئەندامی هەرس و کۆئەندامی هەناسە و کۆئەندامی سوڕانی خوێنی هەیە، کارگەیەکی پێکهێنان و دروست کردنی ئاویشی لەناو سکدایە!! کارگەی ئاو؟! بەلْێ، کارگە، بەتەواوی مانای کارگە، بەجۆرێك کەکاتێ ئەم ئاژەلْە خۆراك دەخوات یەك لەو شتانەی کەلەو بیابانەدا هەیە و ئەم (کەنغەرە) دەیخوات دانەوێلْەیەکە، ئەم دانەوێلْەیە زۆر زۆر ووشکە، هیچ دلْۆپە ئاوێکی لێ دەرنایەت، بەلاّم کاتێ ئەم ئاژەلْە ئەم جۆرە دانەوێلْەیە دەخوات و هەرسی دەکات، لەناو گەدەیدا گازی هایدرۆجین (H) بەرهەم دێت.

جا لێرەوە دەچینە ناو زانستی کیمیاوە، کەهەمومان دەزانین کەئاو پێك هاتووە لەدوو گەردی هایدرۆجین و یەك گەردی ئۆکسجین ($H_2O$). جا لەخواردنەکەوە گازی هایدرۆجین پەیدا دەبێ و لەڕێی هەناسەدانەوە گازی ئۆکسجینەکە پەیدا دەبێ. ئیتر بە ئیرادەی خوای گەورە ئەم هایدرۆجین و ئۆکسجینە یەك دەگرن و ئاو دروست دەبێت. بەم شێوەیە کارگەیەکی دروستکردنی ئاو لەسکی تاریکی ئەو ئاژەلْەدا هەیەو ئێمە هەستمان پێ نەکردوەو تەوای ئاوی ئەو کەنغەرە بەرهەم

دەهێنێت و ئاوی خۆی دەخواتەوە لەڕێگەی معیدەو خوێنەوە. بەم شێوەیە ڕاستی فەرمودەی خوا بەبێ گومان بۆ دروست بون هاتە جێ، کە خوای گەورە دەفەرموێ:
﴿وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ﴾

**ئیمانداران:** ئەو ئاوەی کەدەیخۆینەوەو بۆ ژیانی ڕۆژانەمان بەکاری دەهێنین، سەرچاوەکەی بارانەو پاشان کەهاتە سەر زەوی لەناو زەویدا دەمێنێتەوە و لەڕێگەی کانی و بیرو کارێزەوە دەستمان دەکەوێتەوە، خوای گەورە سەرنجمان بۆ حەقیقەتێکی گەورەی زانستی ڕادەکێشێ و دەفەرموێ: ﴿لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ﴾ الواقعة: ٧٠.
واتە: ئەگەر بمانەوێ ئاوی بارانەکە ترش دەکەین، ئەی بۆ سوپاسی ناکەن؟ ئێستا بابزانین ڕای زانستی لەسەر ئەم بابەتە کەئایەتەکە ئاماژەی پێ دەکات چی یە؟
گۆڕینی نایترۆجین بۆ نیترات پێی دەوترێ جێگیر کردنی نایترۆجین. (تبثیت النتروجین) کەلەکاتی هەورە تریشقەدا لەناوەندی کەهرۆکیمیایی دا ڕوو دەدات. لەناوچەی هێڵی یەکساندا زۆرە، چونکە هەورە گرمەی تێدا زۆرەو بڕێکی زۆر نایترۆجین بۆ نتریت دەگۆڕێ و لەگەڵ باراندا دەبارێ، کە بۆ خاك زۆر گرنگە.

**(ولیەم ڤەرجارا) دەنوسێ: ئایا بروسکە سودی هەیە؟**

یەکێ لەسودەکانی هەورە تریشقە بەپیت کردنی خاکە، بەزیاد کردنی ئاوێتەی نایترۆجین لەناوی دا، بەپێی نوسینگەی پێشبینیەکانی هەوایی ئەمەریکی بڕی ئەو نایترۆجینە کەبۆ فەدانێ بەڕێژەی (١٢) ڕیتلە لەساڵێکدا بەهۆی بروسکەوە.
**واتە:** (٧٧٠) ملیۆن تەن دادەبارێتە سەر زەوی، بەهۆی پڕشکی بروسکە نایترۆجین و ئۆکسجین لەهەوادا یەك دەگرێ و ئاوێتەی ئۆکسیدی نتریك پێکدێ، کە

گەردیلەیـەکی ئۆکسـجین و نـایترۆجین پێکـدێ، زۆر نابـات لەگـەڵ گەردیلەیـەکی ئۆکسـجین پێکـدێ دووەم ئۆکسـیدی نـایترۆجین پێکـدێ و لەبارانـدا دەتوێتـەوە و لەشێوەی تریشی نتریکی سوك دادەبەزێ و کەرەستە کیمیاویەکان لەگەڵ ترشـەکەدا یەك دەگرن و بۆ پێکهێنانی نتراتی کالیسیۆم کەباشترین خۆراکی ڕووەکە.

لێرەدا قورئان ئاماژە بۆ ئەم ترشە دەکـات کەبروسـکە پەیـدای دەکـات لەشـێوەی ترشی نتریکی سوکدا. بەڕێژەیەکی دیاری کراو. — کەلەوە زیاد ناکات — خۆ ئەگەر خوای پەروەردگار ئەو ڕێژەی ترشی نتریکی سووکەی ئـاوا ڕانەگرتایـە، ئـەوا ئـاوی باران و ئاوی سەرزەویش ترش دەبۆوە. ئاوی سازگار نەدەماو ژیان لەسـەر زەوی دا دەکەوتەوە مەترسیەوە. ئەی بۆچی سوپاسی خـوا ناکـەن کەئـەو چـاکە گەورەیـەی لەگەڵدا کردون و پێی نازانن؟! شوکر وەکو لە (التعریفـات)ی جورجـانی دا هـاتوە: چاکە کردنە لەبەرامبەربەهرەیەکدا، چ بەزمان بێ، یان بەدەست، یان بـەدڵ، بەنـدە سوپاسی خوا دەکات بەوەرگرتنی چاکەکانی ستایشی دەکات، کەبریتی یـە لـەگوێ ڕایەڵی کردنی ئەو!

**ئیمانداران:** لەبەر گرنگی ئاوە بۆ ژیـانی مرۆڤ و سـەرجەم بۆنـەوەران. کـەخوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا بەنەکیرەیی (٣٣) جار ووشەی (ماء)ی بەکارهێناوە.

وە بە مەعریفەیی (الماء) ١٦ جار ناوی هێناوە. جایەکێ لەتایبەتمەندییەکانی تـری ئاو کەبەڵگەیە لەسەر ئایەتی ﴿ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ﴾ تەنها ئاوە بۆ ژیان دەنگونجێ ئەوەیە: پلەی دارژان وەکو ئـەوەی کـاتێ لەسوراحیەکەوە ئـاو بکەیتـە پەرداخێکەوە. ئەو ڕژانە پێی دەوترێ پلەی دارژان. ئەم دارژانە بۆ هەموو شـلەکان پلەی دیاری کراوی بۆ دانراوە.

چونکه ئـاو پلـەی دارژانەکـەی بـە (١٠) مليـار جـار لەقـەتران و (١٠٠٠) جـار لەگليسرين (١٠٠) سەد جار لەرۆنی زەيتون و (٢٥) جار لەترشی کبريتيك زياترە.

ئێرەوە باسی ئەوە دەکەين کە لاشەی مرۆڤ بەخوێن کار دەکات، جائەگـەر خـوێن خانەو پرۆتين و هۆرمۆنەکانی لێ بپالێوين ئەوا ماددەيەکی شل دەمێنێتەوە، پێ ی دەوترێ پلازما، کەبەرێژەی (٩٥٪) لەئاو پێـك دێـت. خـوێنيش لەدڵـەوە دابـەش دەکرێت بەسەر لەشدا، هەموو خانەيەك دەبـێ خـوێنی بگـاتێ کەئـەوەی لـەنێوان خانەکان ودڵدايە، پێ ی دەوترێ (مولولەکانی خوێن). جابۆئەوەی خانە کەڵك لـەم ماددانە وەربگرێت لەلايەن مولولە خوێنەکانەوە پێ ی دەگات. دەبێ دوريەکەی لە (٥٠) مايکرۆن زياتر نەبێت. کە (مايکرۆنێك = $\frac{١}{١٠٠٠}$ مليمـەتر ئەوخانانـەی کەلەودوريـە دورتـرن نـاتوانن خـۆراك بەدەسـت بهێـنن وبەدڵنياييـەوە دەمـرن. (هەندێ جار پێستی پاژنەی هەندێ کـەس بـەموس دەبـڕدرێ، خـوێنی لێ نايـەت ونازاری نيە، چونکە مولولە خوێنی ناگاتێ).

بۆيە خوای گەورە لەشی مرۆڤی وادروست کردوە، کەمولولە خوێنەکان وەکو تۆڕێك بەناو هەموو لەشدا بڵاوبونەتەوە وئيش دەکەن..

لە لەشی مرۆڤدا پێنج مليار مولولەی خوێن هەيە. درێژيان بەسـەريەکەوە دەگاتـە (٩٥٠)کلم. لەهەندێ لەشيردەرەکاندا سێ هەزار مولولەی خوێن لە يەك سانتيمەتر چوارجای ماسولکەيەکدا هەيە.. مولولـە خـوێن ئەوەنـدە باريکـە، ئەگـەر (١٠) هەزار مولولە خوێنی لەشی مرۆڤ بخەينە پاڵ يەك، ئـەوا ئەسـتوريەکەی نزيکـەی وەکو ئەستوری نوکە قەڵەمێکی ڕەساسی لێ دێت. وەتيرەی ئەو مولولانە لـەنێوان (٣-٥) مـايکرۆن دەبێـت. ئەمـەش دەکاتـە (٠,٠٣ يـان ٠,٠٥) مليمـەتر!!..

**پرۆفيسۆر: (مايکڵ دينتۆن) دەڵێ:** ئەگەر پلەی دارژانی ئاو کەمتر بوايـە، وەکـو

ڕۆنی زەیتون بوایە (١٠٠) پلە کەمتر، ئەوا دڵ نەیدەتوانی پاڵ بەخوێنــەوە بنێــت، چونکە زۆربەی ئاوە. وەدڵ خۆی نەیدەتوانی ئــاوا بــەخێرایی لەدەقیقەیەکـدا (٧٢) جار لێ بدات ئەگەر لە (٨٥٪)ی دڵ ئاو نەبوایە!! وە ئەگەر پلەی ڕژانی ئاو کەمتر بوایە، ئەوا خــوێن نەیــدەتوانی بەدەمارەکانــدا تێپــەڕ بکــات وهەرچــەندە دڵ پــاڵ بەومادده شلەشەوە بنێت. ئەوا ناتوانێت بگاتە مولولە خوێنەکانی ناولەش.

**کەواتە:** تایبەتمەندی دارژانی ئــاو هــەروەك هــەموو خەســڵەتەکانی تــری خــاوەنی بەهایەکی نایاب وگونجاوە بۆ ژیان. جیاوازیەکی بەرچاو هەیە لەنێوان پلەی دارژانی ماددە شلە جیاجیاکاندا وئــەم جیاوازیــەش هەنــدێ جــار دەگاتــە چــەندین ملیــار ئەوەندە وەلەناوەندی ئەو چەند ملیار پلە جیاجیایەی دارژانــدا دەبیــنین تــەنها ئــاو خاوەنی پلەیەکی دارژانە کەبۆژیان دەگونجێت. دەی خوایە هەرچی سوپاس وستایشە هەربۆتۆیە. پاشان قورئانی پیرۆز کەهیچ شتێ نەماوە بۆمان باس نەکات وئاماژەی پێ نەکات، قورئانی پرپەخشش وزانست جۆرەکانی ئاومان بۆدیــاری دەکــات وبــەم شێوەیە پۆلێنیان دەکات:

١- **ئاوی باران:** خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا ﴾ الفرقان: ٤٨
واتە: لەئاسمانەوە ئاوێکی پاك وخاوێنکەرەوەمان ناردە خوارەوە. واتە، ئاوەکە هــەم خۆی پاکە، هەم پاککەرەوەشە.

**زانایــان دەڵــێن:** ئــاوی بــاران دادەنــرێ بــەپاکترین ئــاو. لەســەدا ســەد پاکــە، وەپاککەرەوەشە وئاوێکی موعەقەمە ولــەبواری پزیشــکی دا بــەکاردێت. وەخاڵیــە لەهەموو جــۆرە ڤــایرۆس وبەکتریایــەك. وەهــەروەها ئــاوی بــاران تایبەتمەندیــەکی تایبەتی خۆی هەیەکەئەویش ئەوەیە، توانای مژینی هەموو ئەو مەعدەن وغــازات وتۆز وغوبارەی هەیــە کەلــەکاتی هاتنــە خوارەوەیــدا لەئاسمانــەوە دێتــە ڕێگــای.

بەرێژەیەکی زۆر دەیانمژێت ، هەرلەبەرئەمەشە ئاوی باران بەپاککەرەوەی هەوای سەرومان دادەنرێ وجەو پاك دەکاتەوە لەهەموو پیس بونێك.

لەکۆندا خەڵکی ئاوی بارانیان گرتوە وخۆیان پیێ شتوە ونەخۆشی خوروی لاشەیان ونەخۆشیەکانی تری پێستیان پێ چارەسەر کردوە. بەڵام ئێستا ئەوە ناکرێ، چونکە لەکۆندا هەوا پاك بوو. بەڵام ئێستا ئاوی باران بەپاکی ناگاتە سەرزەوی بەهۆی دوکەڵی کارگە وئەو هەموو مادەی غازی کبریت ومەعادنی رەصاص مادەی ژەهراوی.

**کەواتە:** باران پێش ئەوەی بۆ ژیاندنەوەی کانی وئاوەکانمان وئاودانی فەلاحەت و کشتوکاڵمان بەسوود بێ، ئاسمان وهەوای دەورمان بۆ خاوێن دەکاتەوە. کەواتە: ئەگەر لەهەموو لایەکەوە گەنمان بۆبێ وئاومان بەتانکەر بۆبێ هەرئاتاجین بۆ پاککردنەوەی هەواکەمان. هەروەها

**زانایان دەڵێن:** یەکێکی تر لەسودەکانی باران ئەوەیە: ئەگەر بێتو باران نەبوایە — کە لەئەنجامی سوڕی ئاوەوە بەشێوەیەکی موعجیزەیی لەهەڵم بونەوە تاچڕبونەوەو هەور وباران بارین — ئەوا زەوی لەرۆژدا گەرمیەکی کوشندەی بەسەردا دەهات وبەشەویش زەوی سەرمایەکی توندی توش دەبوو!!.

لێرەدا کەباسی یەکەم جۆری ئاومان کرد کەپاکترین وپاککەرەوەترین ئاوی سەرزەوی یە وخوای گەورە بەموبارەك وپیرۆز ناوی بردوە ودەفەرموێ:

﴿ وَنَزَّلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً مُّبَٰرَكًا ﴾ ق:٩ سەرنجی ووشەی (طَهُوراً) بدەن.

کە بۆیە ئەو ئاوە پاککرەوەیە چونکە لەئاسمانەوە دەبارێت. دەی بامرۆڤایەتی باش لەوە تێ بگات. تەنها پرۆگرام وبەرنامەیەك کەئەم ژیانی سەرزەوی یە لەهەموو زەحمەت وخەفەت وپیسی وئازاوە وخوێن رشتنێك پاك دەکاتەوە. ئەمە ئەو مەنهەجەیە کەلەئاسمانەوە هاتبێتە خوارەوە..

٢- جۆری دووەمی ئاو کەخوای گەورە باسی دەکات، ئـاوی کـانی وچـەم وکـارێزو ڕوبارەکانن. کەئاوێکی سازگار وخۆش تام وئاسـانە بـۆ خواردنـەوە. خـوای گـەورە دەفەرموێ: ﴿ وَأَسْقَيْنَاكُم مَّاءً فُرَاتًا ﴾ المرسلات: ٢٧.

**واتە:** ئایا ئاوی سازگارمان پێشکەش نەکردون بۆ خواردنەوە....

(سُبْحانَ اللّٰه) لەگەورەیی ئەم قورئانە لێرەدا کەباسی ئاوی سەر زەوی یە نافەرموێ (ماءً طَهُوراً)، لەگەڵ ئەوەشدا خۆڕۆژانە جل و بەرگ و قاپ و قاچاخ و هەموو کەل و پەلەکانمان هەر بەو ئاوە خاوێن دەکەینەوە! لەبەرئەوەی زانایان دەڵێن: ئەو ئاوەی کە لەزەوی لە بیرو کانی و ڕووبارەکان وەری دەگرین و دەیخۆینەوەو بەکاری دەهێنین ڕێژەیەکی زۆر لە زیندەوەرانی تێدایە، کە بەوردبینی زۆر وورد نەبێ نابینرێن، ئـەو پەرداخە ئاوەی کەئێمە بەگومانی خۆمان وادەزانین زۆر پاکەو ڕوونـە. لەڕاسـتی دا بەملیۆن زیندەوەری زۆر وردی تێدایە کە هەرگیز چاو توانای بینینیانی نیە، وەکـو بەکتریا و ڤایرۆسەکان. وەچەندین ماددەی مەعدەنی تێدایە وەکـو ئاسـن و مـس و صۆدیۆم و کالیسیۆم، وەچـەند مـاددەی ئەنـدامی تێدایـە وەکـو: کـاربۆن و گـڵ. کەبێگومان ئەم ماددانەش پێویستە لەئاودا هەبن، چونکە لاشەی مرۆڤ پێویسـتی پێیان هەیە، بەڵام بەمەرجێ لەڕێژەی دیاری کراوی خۆیان زیاتر نەبن.

لە سورەتی (فاطر) ئایەتی: ١٢ دا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ ﴾. ئاوێکی سازگارو خۆشە، مەلای گـەورەی کۆیـە لەتەفسـیرەکەیدا (ب٨ ، ل٧١) دا ئاوا مانای دەکات کەزۆر جوانە: عَذْبٌ: شیرینە. فُرَاتٌ: سووکە ، دافعی عە طشە.

٣- جۆری سێ یەمی ئاو کەلەسەر زەوی دا هەیە، ئـاوێکی سـوێر و تاڵـە، واتـە: ئەوەندە سوێرە لەسوێریدا تاڵ بووە.قورئان دەفەرموێ: ﴿ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ ﴾ فاطر: ١٢ بەشێکی تر لەئاو ئاوێکی سوێر و تاڵە.

(سُبْحانَ اللهِ) لێرەدا إعجازێکی زانستی قورئان هەیە، ئەویش ئەوەیە کە تەنها
تاکە یەك ووشەش لە قورئاندا بەبێ هۆ و ئامانج و مانا نەهاتوەو زیاد نیە، ئەوەتا
لێرەدا دەفەرموێ: (مِلْحٌ أُجَاجٌ) بەتەنها نافەرموێ: (مِلْحٌ) ئاوێکی سوێر!! بۆچی
ووشەی (أُجَاجٌ)ی زیاد کردوە؟!
**لە وەڵامدا دەڵێین:** خوای گەورە خۆی – حەکیم و کاربەجێ یە و ئەگەر بێتو ئەو
ئاوە فراوانەی دەریا و زەریاکان سوێر نەبوایە، ئەوا چونکە بەردەوام وەستاوە بۆ
گەنی دەکرد، وە هەروەها ئەو هەموو (گەوهەر و مرواری و یاقوتە) تەنها لەئاوی
سوێردا دروست دەبێت!! وە ئەو پاپۆڕە گەورە سەر سوڕهێنەرانە کە هەیانە
(٢٠٠٠) تەن و هەشیانە (٥٠٠) تەن هەڵدەگرێ وەکو نەوت.
لە ئاوی سوێردا نەبێت هاتوچۆی پێ ناکرێت و سەرئاو نابێت، واتە ئەو سوێرە تاڵە
یارمەتی نقوم نەبونی پاپۆڕەکان دەدات، قورئانی پیرۆزیش ئاماژە بەم ڕاستی یە
دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَٰذَا مِلْحٌ
أُجَاجٌ وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ
لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ فاطر: ١٢.
یەکێکی تر لەإعجازی قورئان کەبەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەقورئان لای خوایە و هیچ
پەیوەندی بە فورمودەکانی پێغەمبەری خواوە نی یە.(ﷺ) ئەو ئایەتەیە کە
دەفەرموێ: ﴿ وَلَهُ الْجَوَارِ الْمُنشَآتُ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلَامِ ﴾ الرحمن: ٢٤.
ئاماژە بەو پاپۆڕو کەشتیە دەریاییانەی ئەمڕۆیە کەلەسەدەی بیست و بیست و
یەکدا پەیدا بوون کەهەر وەك و شاخ دەردەکەون، ئەمە فەرمایشتی ئەو خوایەیە
کەبونەوەرو دەریاو مرۆڤی دروست کردوەو زانایە بەوەی کەچی دروست دەکرێ و
چی دەبێ، ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە هەرگیز دەریای نەبینیوە، دەتوانێ باسی

ناو دەریا و کەشتی وابکات کەوەکو شاخ وابێت لەگەورەیی و بەرزی و فراوانی دا؟!
بێگومان نەخێر.
**بەڵێ بەڕێزان:** لەکۆتایی دا لەپیرۆزی ئاودا دەڵێمەوە کە: ئاو سەرچاوەی ژیانە. ئاو ئەو ووشەیەیە کەئێمە هەر لەمناڵیەوە زوو فێری دەبین، وەلەبەرئەوەی لاشەمان بەشێکی بەرچاوی ئاوەو بەبێ ئاویش ناژین، پێویستە ڕۆژانە ڕێژەیەکی زۆر لەئاو بخۆینەوە بۆ باشتر کردنی کارکردنی ئەندامەکانی لەشمان. وە ئەگەر یەکێ بپرسێ بەشێوازێکی زانستیانە پێویستە ڕۆژانە چەند ئاو بخۆینەوە؟
**لەوەڵامدا دەڵێین:** مرۆڤ ڕۆژانە لەنێوان یەك و نیو تا دوو لیتر ئاو دەردەداتە دەرەوە، بۆیە لەبەرامبەری ئەم ڕێژەیەشدا دەبێت بەشی پێویست لەئاو بخواتەوە، واتە: لەدوو لیتر کەمتر نەبێت، کەدەکاتە (٨) پەرداخ، ئەم ڕێژەیەش بەگوێرەی کەش و هەوا پێویستە بگۆڕێت.
**بۆ نمونە:** لە ڕۆژەکانی هاوین بۆئەوەی تووشی تینویەتی نەبینەوە دەبێت ڕێژەیەکی زیاتری لێ بخۆینەوە. بەووتەی پسپۆڕانی تەندروستیش ئاو چەندی زۆرتری لێ بخورێتەوە. هیچ کاریگەری خراپی بۆ سەر تەندروستی مرۆڤ نیە، بەڵام کەمی ئاو لەلەشدا دەبێتە هۆی دروست بونی چەندین نەخۆشی و گرفتی تەندروستی و هیچ ئەندامێکی لەش ناتوانێ کار بکات.
وە ئایا لەکاتی وەرزش کردندا پێویستە ئاو بخورێتەوە؟ بەڵێ بێگومان لەکاتی وەرزش کردن بەهۆی ئارەق کردنەوە، لەشی مرۆڤ ئاوێکی زۆر فڕێ دەداتە دەرەوە و ڕێژەی ئاو لە لەشدا کەم دەبێتەوە، بۆ گەڕانەوەی هاوسەنگیش دەبێت ئاو بخورێتەوە، ئەگەر ئەم هاوسەنگیەش یەکسان نەکرێتەوە، لەش هەست بەماندو بوون و هیلاکی دەکات، بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە: کەدەبێت لەکاتی وەرزش کردندا ئاو بەیەکجار بەبڕێکی زۆر نەخورێتەوە، بەڵکو کەم کەم بخورێتەوە.

وەئایا ئاو مرۆڤ لاواز دەکات؟ بەڵێ نکوڵی لەوە ناکرێت کە کانزاکانی ناو ئاو یارمەتی لاواز بونی لەشی مرۆڤ دەدەن و ئەگەر پێش نان بخورێتەوە. کەمێك برسیەتی مرۆڤ دەشکێنێت و وادەکات کەمتر بخوات. بۆیە پسپۆڕانی تەندروستی ئامۆژگاری ئەو کەسانە دەکەن کەدەیانەوێت لاواز بن، پێش نان خواردن و لەگەڵ نان خواردن، ئاو زۆر بخۆنەوە.

## ﴿سودەکانی ئاو خواردنەوە﴾

١- یارمەتی هاوسەنگ کردنی پلەی گەرمی لەش دەدات.

٢- رۆڵی چالاکی هەیە لەپاك کردنەوەی لەش و پێست لەماددە زیان گەیەنەرەکان.

٣- کارکردنی گورچیلەکان ئاسانتر دەکات.

٤- ڤیتامین و کانزاکان لە لەشدا دەگوازێتەوە و یارمەتی هەست کردنیان دەدات.

٥- بەهۆی ئەوەی کەماددەیەکی خز و سافە، زۆر پێویستە بۆ ئەندامەکانی لەشمان و کارکردنیان بەندە بەبونی ئاو لە لەشدا..

# سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز.

٢- تەفسیری ئاسان ، بورهان محمد أمین.

٣- الأُعْجاز العِلمي في القُرْآنِ والسُّنَة ، م. نایف مُنیر فارس ، ص,٥٠٥

٤- کۆباسەکانی میحراب ، م. شەماڵ عبدالرحمن مُفتی ، ئامادەکردنی ، عادل شاسواری ، ل,٩٥

٥- ئاو لەنێوان زانست و قورئاندا ، جمال محمد أمین ، ل١٢ ، ل٢٢ ، ل,٧

٦- تەفسیری ڕامان. ، ئەحمەد کاکە محمود ، ل,٥٦٤

٧- لە خزمەت قورئاندا ، ئەندازیاران عُثمان محمد رشید ، ل,٣٣٣

٩- آیاتُ الله في الآفاق، د. محمد راتب النابلسي ، ص١٨٣ ، ص,١٨٨

١٠- موسوعَة أسْماء الله الحُسْنَى ، د. محمد راتب النابلسي ، ج١ ، ص,٢٢٤

١١- الترغيب وَالترهيب ، لِلّحافِظ المُنْذري ، فەرمودەی ذمارة: ١٤٠٩ وەفەرمودەی ژمارە: ٢٤٥ ، وەفەرمودەی: ١٣٩١، وەفەرمودەی: ١٤١٧.

١٢- كَبائِرُ الذُنُب ، یوسف الحاج أَحمد ، ص,٣٦٦

١٣- گۆڤاری چرای ڕووناکی ، ژمارە: ١١ ڕەجەبی ١٤٣٠ ، لاپەڕە ,٦١

١٤- حَدَّثَنا البَحْر ، د.محمد عبدالرحمن العريفي ، ص,١٠

١٥- موسوعَة الأَعجاز القرآني ، د.نادية طَيَّارَة ج٢ ، ص١٩٧ ، ص ٢٢٧.

١٦- زنجیرەی موعجیزەکان ، هارون یَحْيَ ، وەرگێڕانی: ڕوناك عُثمان سَعید ، ل,١٥٨

١٧- رَقائق العريفي ، د.محمد عبدالرحمن العريفي ، ص٢٩.

١٨- گەردونناسی ، لەسایەی قورئان و فەرموده ، محمد حسن سەر گەینێلی ، ب١ ، ل٩٣.

١٩- گۆڤاری ڕایز ، ژمارە: ٣ لاپەڕە: ٢٨ ، ئۆکتۆبەری ٢٠١٠.

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ.
ئیمانداران: باران خەلاّت وبەخششی خوایە بۆ مرۆڤ وسەرجەم زیندەوەران ورووەك و ژینگە وژیان. خوای گەورە دەفەرمویّ: ﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا ﴾ الفرقان: ٤٨ زۆربەی کتێبە شەرعیەکان بەم ئایەتە قورئانیە دەستی پیّ کردوە.
**بۆ نمونە:** (مِنْهاجُ الطّالِبين)ی ئیمامی نەوەوی. وەباران لە قورئاندا بەبەرەکەت ناوی هاتوە: ﴿ وَنَزَّلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً مُّبَٰرَكًا فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ جَنَّٰتٍ وَحَبَّ ٱلْحَصِيدِ ﴾ ق: ٩
هەر لەبەر پیرۆزی وبەرەکەتی ئاوی بارانە کەلە (صَحیحی موسلیم) دا هاتوە کەئەنەسی کوڕی مالیك بۆمان دەگێڕێتەوە ودەفەرمویّ: (أَصابَنا مَطَرٌ، فَحَسَر رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ثَوْبَهُ حَتَّى أَصابَهُ مِنَ المَطَرِ، فَقُلْنا: يارَسُولَ اللهِ (ﷺ) لِمَ صَنَعْتَ هذا؟ قالَ: لأَنَّهُ حَديْثُ عَهْدٍ بِرَبِّهِ تَعالى).
واتە: جارێکیان لەخزمەت پێغەمبەردا بوین (ﷺ). باران لیّ ی داین وتەڕی کردین. پێغەمبەری خوا (ﷺ) جل وبەرگەکەی لادا تاوەکو لەوبارانە بەری بکەوێت – بەرلاشەی موبارەکی بکەوێت. ئێمەش عرزمان کرد، ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، بۆچی ئەمەت کرد؟! فەرموی: لەبەرئەوەی تازە لەلایەن پەروەردگاریەوە هاتوە وتازە خوای گەورە ناردویەتی وبەرەکەتی لیّ وەردەگرم.
بارانیش زۆر بەحیساب و وردی دەبارێ بەجۆرێك کە رێژەی ئاو لەسروشتدا بەجێگیری ونەگۆڕی بمێنێتەوە. خوای گەورە دەفەرمویّ: ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّٰهُ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابٍۭ بِهِۦ لَقَٰدِرُونَ ﴾ المؤمنون: ١٨
واتە: ئێمە لەئاسمانەوە ئاومان بەئەندازە باراندوە. ئەنجا لەزەویدا هەڵمان گرتوە.
لێرەدا قورئان ئاماژە دەکات، کەخوای خالیق بەئەندازە ئاو دەکات بەهەڵم وبەئەندازە دەیبارێنیّ وبەئەندازە دەیخاتە ژێر زەمینەوە وبەئەندازە عەمباری دەکات

وبەئەندازە وەکو کاریز وکانی هەڵی دەداتەوە دەرەوە،بەئەوەندەی گیانداران وڕووەك ومرۆڤ و ژیان پێویستی پیّ ی هەبێت!
(سُبْحانَ اللهِ) کانیەك چەند زەوی لەبەردەمدا بیّ ئەوەندە ئاوی لیّ دێتە دەرەوە.
ئاها جاری واهەیەکانی یەك دەتەقیّ وچەندان زەوی ژێر ئاو دەکەون ولەناودەچن.
ئەو ئەندازە وڕێژە جوانە هەرخوا خۆی ڕای گرتوە.
ئیمڕۆ مرۆڤ توانیویەتی بۆ پێوانەی بڕی هەڵم وبڕی باران بارین وبڕی شیّ وبڕی ئاو.... هتد. پێوەری تایبەتی دابنیّ وئەندازەکەیان بزانێت. پێوەری باران پیّ ی دەوترێت (باران پێو Rain guage). وەئەم ئایەتە دەری دەخات ئاوی باران چاوگی ئاوی سەرزەوی وژێر زەوی یە.
پێغەمبەری خواش (ﷺ) دەفەرمویّ: (مامِنْ عامٍ أَمْطَرَ مِنْ عامٍ). هیچ ساڵیّ باران لەساڵێکی تر زیاتر نابارێت.
**زانایان دەڵێن:** لەسەر ئاستی ڕوی زەوی بەگشتی لەهەرچرکەیەکدا (١٦) ملیۆن تەن لەئاوی باران دێتە سەرزەوی. هەموو ساڵیّ بەبیّ جیاوازی ئەو بارانە بەبەردەوامی دەباریّ. بەڵام مەرج نیە لەهەموو سەرزەوی بباریّ. لەشوێنیّ هاوینە لەشوێنیّ زستانە. چونکە زەوی شێوە گۆیی یە.
وە باران بەشێوەی دڵۆپی زۆر وورد جوان دێتە خوارەوە.﴿ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴾
ئەوەندە بەنەرمی وجوانی دێتەخوارەوە زیان بەچڵە گیایەکیش ناگەیەنیّ. خۆئەگەر بەیەکجار وبەتەوژم دابباریایە، ئەوا دنیای وێران دەکرد!
دەی هەزاران هەزار سوپاس بۆتۆ خوای گەورە کەبارانت ئاوا بەنەرمی بۆ باراندوین.
**بەڵام:** گەلیّ ساڵ ئەم خەڵاتەی خوای گەورە کەبارانی ڕەحمەتە بۆمان نابارێ یان کەممان بۆ دەباریّ وتینویەتی زەویمان ناشکیّ.

خوای گەورە بە ئاگامان دێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍ ﴾ الملك: ٣٠

بەڵێ ئەگەر خوای گەورە بارانمان بۆ نەبارێنێ، بەڵێ ئەگەر خوای گەورە کانی وکارێزەکانمان بۆ نەژێنێتەوە ئایا هیچ هێز ودەسەلاتێك هەیە غەیری خوا بتوانێ ئاومان پێ ببەخشێ؟! بەهەموو دڵنیاییەکەوە، نەخێر.

بێگومان کەووشکە سالی ڕودەدات وباران لەوەختی خۆی دوادەکەوێ وپەلە نادات. یان هەرنابارێت. ئەوە هەمو ئیماندارێك توشی دڵ نارەحەتی دەبێت. وەئەو پرسیارە لەمێشکیدا دێت ودەچێت ولەناو کۆڕ ومەجلیسدا گفتوگۆی لەسەر دەکرێ ودەوترێ: باشە بۆچی باران نابارێت؟! ئیسلامەکەمان بۆ هەموو پرسیارێك وەلامی خۆی هەیە. **دوو هۆکاری سەرەکی هەیە بۆ باران نەبارین.**

**١- زەکات نەدان.** دەولەمەند ئەومالە بەهی خوای پەروەردگار نازانێ ووادەزانێ بەئازایەتی وژیری وماندوبونی خۆی پەیدای کردوە. کەبەڕاستی لەڕۆژگاری ئەمڕۆ سەدان کۆمپانیا وشەریکات هەیە کەخاوەنەکانیان هەرنازانن زەکات چی یە. چەند خاوەن ئاژەلی هەزارەها سەرهەیە تائێستا زەکاتی نەداوە، وەبەمەش فەقیر وهەژارێکی یەکجار زۆر کەخوا ئەوبەشەی بۆدیاری کردوە مەحروم دەبێ لەوحەقەی خۆی.

**٢- فیلْ وفرت وغەش کردن لەمعامەلە وکڕین وفرۆشتندا.**

جاران تەرازو بازی هەبوو بۆ غەش کردن. بەلام زۆر لەوغەشەی ئێستا دەکرێ باشتر بوو. چونکە کابرا لەوەدا غەشی دەکرد کەئەوەی دەیدا بەکڕیار کەمی هەبوو لەکیلۆیەکدا (١٥٠) غرامی لێ دەدزی. باقیەکەی بێ عەیب بوو. بەلام لەبازاڕەکانی ئەم سەردەمەدا وای لێ هاتوە ئەوەی دەدرێ بەکڕیار (١٠٠٪)

نەك هەر بەكەڵك نايەت بەڵكو مرۆڤەكەش لەناو دەبات، چونكە خواردنێكی بەسەرچوە. یان تەزویر كراوە ومێژوی دەرچونی تەزویری لەسەر لێ دراوە وكڕیاری بێ ئاگا دەیباتەماڵەوە ودەیخوات وكتوپڕ توشی نەخۆشی وادەبێت كەهەرگیز نەبیستراوە. نازانێ ئەوەی كڕیویەتی چونكە بەسەرچوە هەموی ژەهرە خواردویەتی: ڕۆژانە بەچەند تەن لەبازاڕو دوكانەكاندا لەلایەن ئاسایشی ئابوری و تەندروستی یەوە خۆراكی بەسەرچوو دەگیرێ. ئەمەش فەرمودەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) لەوكاتەدا كەتازە كۆچی كردبوو بۆشاری مەدینە وكۆچكردوان – مُهاجرین زۆربەیان بێ ماڵ وحاڵ وبێ ئەنوا بون. لەپەنا دیواری مزگەوتدا سەكۆیەكی بەقوڕ سواخ دراویان بۆخۆیان دروست كردبوو. ژیانیان لەوێ بەسەر دەبرد ڕۆژێكیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەردانی كردن. كە وەزع وحاڵی بینین، ڕوی تێكردن و ئامۆژگاری كردن، بەڵام (سُبْحانَ اللهُ) ئەو ئامۆژگاریانە وەكو ئەوە وایە كەڕوو لەكەسانێكی دەوڵەمەند ودەست ڕۆیشتوبێ وایە. لەكاتێكدا كەئەوان هەژار ونەدار وبێ لانە بوون. وەكو ئەوەی پێ یان بفەرموێ: من ناترسم كەبەهۆی ئەم هەژاری ونەداری یەوە لەناوبچن، نەخێر، بەڵكو ڕۆژێك دادێ زۆرتان دەبێ. بەڵام لەوە دەترسم ئەگەر دەسەلاَت وهێزتان پەیدا كرد. ماڵ وسامانتان لەبەردەستدا كۆبۆوە. دونیا بەدەمتانەوە پێبكەنێ..

فەرموی (یامَعْشَرَ المُهاجِرین) ئەی كۆمەڵێ كۆچكردوان. لەوانیشەوە بۆ هەموو ئوممەتی (خِصالٌ خَمْسٌ إنْ أُبْتُليتُمْ بِهِنَّ وَنَزَلْنَ بِكُمْ، أَعُوذُ باللهِ أَنْ تُدْرِكوُهُنَّ):

واتە: پێنج خەصڵەت وڕەوشت هەیە ئەگەر خوا نەكردە ڕۆژێك موبتەلابن پێیانەوە وبەسەرتاندا بێن وپەنا دەگرم بەخوا كەتوشیان بن.

١– لَمْ تَظْهَر الفاحِشَةُ في قَوْمٍ حَتَّى يُعْلِنُوا بِها إلاّ فَشافيهِمُ الأَوْجاعُ الَّتي لَمْ تَكُنْ في أَسْلافِهِم.

واتە: هەرکاتێ بەدڕەوشتی بەئاشکرا ئەنجام درا وشەرم وشکۆ نەما وشوێنی بۆ دیاری کراو بەئاشکرا کاری بۆ دەکرا. ئەوانە خۆشی وئازارێکی وا لەناو ئەو داوێن پیسانەدا بلاودەبێتەوە کە هەرگیز ئازاری وا لەگەلانی پێشوودا نەبوە.

(صَدَّقْتَ يارَسُولَ اللهِ وَبالْحَقِّ نَطَقْتَ) ئەمڕۆ نەخۆشی ئایدز جیهانی هەژاندوە وڕێکخراوی تەندروستی جیهانیش دەڵێ (٩٠٪)ی توش بون بەئایدز بەهۆی داوێن پیسی یەوەیە. ئایدز دەردی بێ دەرمانی پێ دەگوترێ، چونکە چارەسەری نیە! تائێستا (٦٠) ملیۆن کەس لەجیهاندا توشی ئایدز بوە ونزیکەی (٣٠) ملیۆنی کوشتوەو (١٢) ملیۆن منالّی تەنها لەئەفریقیا بێ باوك کردوە!! کە هەرگیز لەمێژودا نەخۆشی وەکو ئایدز نەبیستراوە.

**٢- وَلَمْ يَنْقُصُوا الْمِكْيالَ وَالْمِيزانَ، إِلاَّ أُخِذُوا بالسِّنِينَ، وَشِدَّةِ الْمُؤْنَةِ وَجَوْرِ السُّلْطانِ.**

واتە: وەهەرکاتێ غەش وخیانەت لەکێشان وپێوانەدا کراو - وەکو باسمان کرد بەهۆی تەرازو بازی یان بەهۆی تەزویر وشتی بەسەرچوو مافی خەڵکی بێ ئاگا بەناوی پیرۆزی کڕین وفرۆشتنەوە خورا. وە ئەمە بوو بەدیاردە وبازاڕی تەواوگرتەوە. ئەوا ئەوگەلە توشی ووشکە سالّی وگرانی گوزەران وستەمی کاربەدەستان ددبن. هەر چەندە پارەی زۆرت دەست بکەوێ و لەچەند لاوە هەوڵ بدەی کەچی ژیانت هەر بەڕێوە ناچێت و هەرنەوەندەت خۆشە تاوەکو ئیش وکاری دائیرەیەکی حکومەت نیە. ئەگینا بەبێ بەرتیل و واسیطە وناسیاوی هیچت بۆ ناکرێ و بەئاشکرا مافت پێشێل دەکرێت.

**- وَلَمْ يَمْنَعُوا زَكاةَ أَمْوالِهِم إِلاَّ مُنِعُوا الْقَطْرَ مِنَ السَّماءِ، وَلَوْلا الْبَهائِمُ لَمْ يُمْطَرُوا.**

واتە: وەهەرکاتێ دەوڵەمەندان وسامانداراني ناو گەل ومیللەتێك زەکاتی خۆیان نەدا وبەشی دیاری کراوی شەرعیان نەدا بە هەژاران وموستەحەقان کەخوای گەورە دیاری کردون. ئەوا بارانی ئاسمانیان لێ قەدەغە دەکرێ وبارانیان بۆ نابارێ. وە ئەگەر لەبەرخاتری بێ زمانەکان نەبوایە هەرهیچ نەدەباری!

٤- وَلاَنَقَضُوا عَهْدَاللهِ وَعَهْدَ رَسُولِهِ إِلاّ سُلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوٌّ مِنْ غَيْرِهِمْ فَيأَخُـذُ بَعْضَ مافي أَيديهِمْ.

واتە: هەرکاتێ گەل ومیللەتێك ئەو پەیمانەی کە بەخوای گەورەیان دابوو، وەئەو پەیمانەی کە بەپێغەمبەری خوایان دابوو هەڵیان وەشاندەوە.

واتە پشتیان لە قورئان وسوننەت کرد. ئەوا بەسەریاندا زاڵ دەکرێت دوژمنێك لەغەیری خۆیان وهەندێ لەوەی لەبەردەستیاندایە لێیان دەستێنێ.

ئەمڕۆ بەروبومی وولاتانی موسڵمان کە بەزۆری نەوتە. لەلایەن دژبەدینانەوە بەشی زۆری دەبرێ وتەنانەت ئەو وولاتە بەناو موسڵمانە – کەپشتیان لەئیسلام کردوە – بەمەمنونیەوە دەیان دەنێ.

٥- وَمالَمْ تَحْكُمْ أَئِمَّتُهُمْ بِكِتابِ اللهِ إِلاّ جُعِلَ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ.

واتە: وە هەرکات پێشەوا وسەرکردەی گەل و میللەتێك حکومیان بە کتێبی خوا کە قورئانی پیرۆزەو شاخەلاتی خوایە بۆسەر مرۆڤایەتی. ئەوا خوای گەورە دوژمنایەتی وناڕەحەتیان دەخاتە نێوانەوەو لەناو خۆیاندا ناکۆك دەبن ورقیان لەیەکتر دەبێتەوە.

ئەم فەرمودەیە (إِبنُ ماجَة والبَزار وَالبَيْهَقي) ڕیوایەتیان کردوە.

**بەڕێزان:** ڕەنگە یەکێ بپرسێ: خۆئەگەر بەگوناه وبێ شەرعی بێ، دەبوو وولاتانی ئەوروپی بارانیان بۆ نەبارییایە! ئەی بۆچی بارانی باشیان هەیە وولاتیان سەوز

ناوەدانە. لەوەلامی ئەو جۆرە کەسانەدا دەڵێین: ئەوە شەیگان دەیەوێ بتخەڵەتێنێ. ئەینا:

١- جیهانی خۆرئاوا دەڵێ، من بەهەشتم ناوێ، هەربەتەنها دونیام دەوێ، خوای گەورەش دونیای دەداتێ. بەڵام خۆئێمە موسڵمانین دەڵێین: بەهەشتمان دەوێ، دەشزانین بەهەشت جێگای پاك وخاوێنانە. خاوێنی دڵ ودەرون، خاوێنی جەستە ونەش ولار، کەچی خۆشمانی بۆ پاك ناکەینەوە!..

٢- لە ڕۆژئاوا وئەمریکادا عەدالەتێك تارادەیەك هەیە، لێپرسراوو کاربەدەست هەموو وولاتەکە ناخوات، مافی میللەتیش دەدات، سەروەت وسامانی سەرکردە نشکرایە، میللەتیش دەزانێ چی بۆ دیاری کراوە.

وە لەرۆژئاوادا، کڕین وفرۆشتن وبازاڕ پاکە، هەرکەوتت یابانی یە. ئەمریکی یە. دڵت پێ ی خۆشە وناسودەی. بەڵام بەداخەوە کەدەڵێن هی وولاتێکی موسڵمانە — بمناو بێ ناوەڕۆك — یەکسەر بیری غەش وتەزیرت بەمێشکا دێت.

دەی بەبەرامبەری عەدالەت و ئەو بازاڕ پاکی یە، خوای دادگەر، ڕزق و ڕۆزیشی زیاد دەکات وبارانیشی بۆ دەبارێنێ.

بەڵام ئەویش سزای بێ دینیەکەی بەجۆرێکی تر وەردەگرێ. ئەوەتا لەوولاتێکی وەکو نەرویج کە چوار ملیۆن و دووسەد هەزار کەسە. هەر لەچوار کەس یەکێکیان پێویستی بەچارەسەری دەرونی هەیە!!

دڵتەنگی و قەلەقی و نائارامی لەناویاندا زۆرە. لە وولاتێکی وەکو (سوید) بەرزترین ڕێژەی خۆکوشتنی تێدایە. ئەمریکا گرفتارە بەدەست بەرەنگاری تیرۆرو، بەردەوام خەریکی ئەوەیە شەڕ لەوولاتەکەی دووربخاتەوە.

نە وولاتێکی وەکو چین سالانە لانە کەم (شەش هەزار) کەس لەسێدارە دەدرێن وەنەخۆشی بێ درمانی ئایدز — کە لەداوێن پیسی یەوە توشیان دەبێت، چۆن دای

ڕزاندون.چۆن خێزانیان نەماوە ولانەی ئارامگرتنیـان لێ تێـك چـوە وهەرخـەریکی خۆبەنج کردن وخۆبێ هۆش کردنن، بەعەرەق خۆری ومەوادی هۆشبەرەوە!.

ئەمــە ســەرەڕای دودڵــی ودڵتــەنگی وقەلــەقیان، ئــەوەتا نوســەر ورۆشــنبیر ورۆژنامەنوسی ئەڵمانی (هنريك موتەنەبی برودەر) کەجولەکەیـەکی تەمـەن (٦١) ساڵە، دوژمنێکی سەرسەختی ئیسلام بووە. لەناکاو موسڵمان بونی خۆی ڕاگەیاند. لەلای ئیمامی مزگەوتی (ڕەزا) لە — نیوکۆلّندا — شایەتمانی هێنـاو ووتـی: نـاوی خۆم گۆڕی بۆ محمد (ﷺ) وە ووتی: بەموسڵمان بونم ڕزگارم بوو لەوئازارە دەرونیەی چەند ساڵە تیێ ی دا دەژیم.

**ئیمانداران:** خۆڕەنگە کەسـێکی تـر بپرسـێ: ئـەی خۆسـاڵانی ڕابـردوش ئـەم بـێ شەرعیەی ئێستامان هەرلەناودا بوو، ئەی بۆچی باران دەباری؟!

**لە وەڵامدا دەڵێین:** ساڵانێکی دورودرێژە هەرجارەی بە جۆرێ توشی دڵتەنگی دەبین. سەرنج بدەن مەرج نیە هەر بەبێ بارانی بێ. ئـەوا ئەمسـاڵ بـەبێ بارانیـە. بـەڵام چەندین جۆری دڵتەنگیمان توش بـووە. لـەعێراق دا: لەسـاڵی ١٩٧٩ دا، داهـاتی عێراق، پارەی دانراوی (١٦) ملیار دۆلاری ئەمریکی بـوو. کەچـی سـاڵی ١٩٨٨ کەجەنگی عێراق — ئێران تەواو بوو. عێراق (١١٦) ملیار دۆلار قەرزاری ووڵاتـان بۆوە.. کێ باجەکـەی داوە؟! مـن وتـۆی هـاوڵاتی!! دوای ڕوخـانی ڕژێـم وئـازادی ١٩٩١ دیسانەوە فەرهودی وتاڵانی و هەر کەس بۆ خـۆی سـەرەنجام شـەڕی تـاڵی ناوخۆ وکوژرانی زیاتر لە (چوار) هەزار ڕۆڵەی کورد بەدەستی کـورد!! ئایـا ئەمـە موصیبەت ودڵتەنگی بوو؟!

ئەی (سن) مان لەبیرچۆوە چۆن گەنمەکانمان بەڕەڵاکران وبێ نانی چی پـێ کـردین؟!! بەهەزارانمان لێ ئاوارەی ئێران بوو بۆ شوانی وکورەی خشت برین!

کەگرانیەکـە بەفـەزڵی خـوا لاچـوو. ئـەی ئـەو هـەموو نەخۆشـیە جۆراوجـۆرە نەبیستراوەی ئێستا!! ئەمجا ئەم بێ بارانیە!

**لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت. ئەویش ئەوەیە:** باشـە خـوای گـەورە ﴿ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾ لە هەموو بەزەییەك بەبەزەیی ترە. ئـەی بۆچـی خـوای گـەورە ئـەم

ڕوداوانەمان بەسەر دێنێ و ئەم بەڵاو نارەحەتیەمان نیشان دەدات؟! بێگومان خوای گەورە بەندەکانی خۆی، گەورەترینی دروستکراوەکانی خۆی خۆش دەوێت، خوای گەورە هەرگیز ڕقی لە عەبدەکانی نیە. وە خوای گەورە لەدنیادا تۆڵەی گوناهەکانمان لێ ناکاتەوە کەواتە ئەی بۆچی ئەمانەمان بەسەر دێ؟!

**بۆ وەڵامی ئەوپرسیارە دەڵێین:**

قورئانی پیرۆز لە سورەتی (الأنعام) ئایەتی (٤٣-٤٤) دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُواْ وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾ .

واتە: سوێندبێت بێگومان ئێمە پێش تۆ پێغەمبەرانی زۆرمان ڕەوانە کردوە بۆسەر قەوم و گەلانی تر. (جا کاتێك سەرکەش وياخی بوون، توشی تاڵاوی جەنگ و بەڵاو تەنگانەمان کردن بۆئەوەی لێمان بپاڕێنەوە وبلاڵێنەوە. ئەوانە کاتێك تۆڵە وسزای ئێمەيان بۆ ئەهات. بۆ نزا وپاڕانەوە بەکۆڵیان نەکرد. بەڵام دڵیان ڕەق وڕەش بوو، شەیتانیش ئەوکار وکردەوە ناپەسەندانەی بۆ ڕازاندبونەوە کەدەیانکرد..

**کەواتە:** قورئان بۆمان ڕون دەکاتەوە کە هۆی ئەو دڵتەنگی و بەڵاو تەنگانانە بۆئەوەیە مرۆڤەکان بەخۆیاندا بچنەوە وپشت لەخراپەکاری وڕوو لەچاکەکاری بن. وە ئەو بەئاگا هێنانەوەیە، بۆ ئەوەیە پێش توش بون، خۆپاراستنی بۆ بکرێ، وەکو دەرزی کوتان وایە کە لەمناڵێکی ساوا دەدرێ ودەنگی گریانی لێ بەرزدەکاتەوە وفرمێسکی لە چاودێنێ، ئایا ئەم ئازارە لە بەرژەوەندیەتی یان ڕق لێ بونە لێ ی؟! بێگومان ئەو ئازاردانە ئەوپەڕی خۆشەویستی وسۆزە بۆی، دەی بەهەمان شێوە هەرچی خوای گەورە بەسەر بەندە ئیمانداره‌کانی دا دێنێ. ئەگەر چی لەڕوی دەرەوەدا ئازاردانە. بەڵام لە ناوەڕۆك وڕاستی دا ئەوپەڕی خۆشەویستی وسۆز ومیهرەبانیە.

**چارەسەری بێ بارانی:**

١- تەوبەو پەشیمانی: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴾ نوح: ١٠-١١

واتە: حەزرەتی نـوح فـەرموی: بـەردەوام بەگەلەکـەی خـۆم دەگـوت: ئێـوە داوای لێخۆشـبون لەپــەروەردگارتان بکـەن، چـونکە بەڕاسـتی ئـەوزاتێکی لێخۆشـبووە. بارانتان بەلێزمە وخوڕەم بۆ دەبارێنێت.

وە حەزرەتی هودیش بەگەلەکـەی دەفـەمویت: ﴿ وَيَٰقَوۡمِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا ﴾ هود: ٥٢

سەرنجی ئەم بەسەرهاتە خۆشە بدەن کە لەکتێبی (مُختَصَـــر كِتـــابُ التَـــوَّابين)ی إبْنُ قُدامة ، ص٨٧ وەرگیراوە کە دەفەرموێ:

لەزەمانی حەزرەتی موسادا (سـەلامی خـوای لەسـەربێت) بـێ بـارانی و ووشـکە سالّیەکەی زۆر توند ڕوی کردە بەنی ئیسرائیلیەکان. خەڵکەکە بەکۆمەڵ ڕۆیشتن بـۆ خزمەت حەزرەتی موسا وعەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خـوا، ئـەی موسـا، ئـەی (كَليمُ الله). داوا لەپەروەردگارت بکە کە بارانمان بۆ ببارێنێ ولـەم ووشـکە سـالّی وبێ ئاوی وبێ سەوزایی یە ڕزگارمان بکات، حەزرەتی موساش فەرموی: هەموتان لەڕۆژێکی دیاری کراودا کۆببنەوە ودەڕۆینە ئەودەشت وبیابانە لـە پـەروەردگارمان دەپاڕێینەوە. بەڵێ خەڵکەکە کۆبونەوە کـەژمارەیان زیـاتر لەحـەفتا هـەزار کـەس دەبوو.حەزرەتی موسا ڕوی کردە خوای گەورە وفەرموی: بەڕەحمـەتی خـۆت بـارانی ڕەحمەتمان بۆ ببارێنە وڕەحمەتی خۆتـان بەسـەردا بڕێـژە. بـەزەیت بێتـەوە پێمانـدا لەبەرخاتری منالّی شیرە خۆرە وئاژەڵی بەستەزمان و پیرو بەساڵاچـوانێك کەسـەری بەندایەتیت بۆدەخەنـە سـەر زەوی و ڕکـوع و سـجودت بـۆ دەبـەن لەبـەر خـاتری گەنجانێك کە گەنجیەتی خۆیان بـەڕێبازو پەیامەکـەی تـۆ بەخشـیوە، خوایـە گیـان بارانمان بۆ ببارێنە.

بەڵام (سُبْحانَ الله) نەك هەر هەور نەهات و نەباری، بەڵکو گەرمای ڕۆژەکە زیادی کردو ئاسمان هەرچی پەڵە هەور بێ پێوەری نەما.حەزرەتی موسا سـەری سـوڕما و یەقینی هەبوو کەکاری خوا بێ حیکمەت نی یـە، لەدڵـەوە عـەرزی پـەروەردگاری

کرد، یا إلهی بۆچی بارانمان بۆ نەباری؟! خوای گەورە وەحی بۆ کردو پێـی فـەرموو: ئەی موسا لەناو ئێوەدا کەسێك هەیە کەدژایەتی من دەکات بەگوناه و تاوان و بێ شەرعی بڵاودەکاتەوە، وماوەی چـل سـاڵە لەسـەر ئـەو کـارەی بەردەوامـە. داوا لەخەڵکەکە بکەو بڵێ: بائەو کەسە لەناو خەڵکەکە بڕواتە دەرەوە بۆ ئـەوەی بـاران بۆ خەڵکەکەی تر بباریٚ.

**واتە:** بەهۆی ئەوەوە باران بۆ ئێوەش نابـاریٚ، چـونکە هـەموو خەڵکەکـەش بـەوە تاوانبارن کەفەرمانیان بەچاکە پێ نەکردوەو دەستیان نەگرتووە لەخراپـەو تـاوان — حەزرەتی موسا فەرمووی: پەروەردگارم یائیلاهی، من بەندەیـەکی بـێ دەسـەڵاتم و دەنگم کزە، ئایا چۆن دەنگی من دەگاتـە ئـەو هـەموو خەڵکـە زۆرە کـەژمارەیان لەحەفتا هەزار کەس زیاترە؟! خوای گەورە وەحی بۆکردو فەرمووی: بانگەواز لەسەر تۆیـە و گەیاندنیشـی لەسـەر مـن. ئـەمجا هەسـتاو فـەرمووی: ئـەی ئـەو بەنـدە سەرپێچیکارەی کەدژایەتی خوای گەورە دەکەیت بـەگوناه و تاوانـەکانت بۆمـاوەی چل ساڵە. دەرچۆ لەناومان چونکە خوای گەورە بەهۆی تـۆوە بـارانی لـەو هـەموو خەڵکە گرتۆتەوە، کەسی گوناهکار سەیرێکی ئـەملاولای خـۆی کـردو سـەرنجی دا هیچ کەس هەڵناستێ بڕواتە دەرەوە، بۆیە زانی مەبەست لەو گوناهکارە ئەوە. هەر لەوێدا بێ ئەوەی بەزمان بیڵێ و کەس گوێی لێبێ ووتی: خوای گەورە ئەگەر ئێستا من لـەناو ئـەو خەڵکـەدا هەڵسـم و بڕۆمـە دەرەوە، لەبەرچـاوی هـەموو قـەومی بەنوئیسرائیلی سوك و ڕیسوا دەبم، خۆ ئەگەر لەناویشیاندا بمێنمـەوە ئـەوا بـەهۆی خراپی و تاوانی منەوە بارانیان بۆ ناباریٚ، بۆیە سەری بەرخۆی ناو لەکردەوەکانی پەشیمانی دەربڕی و ووتی: ئەی خوای گەورەو میهرەبان. ئەی پەروەردگارم مـاوەی چل ساڵ سەرپێچیم کردی و چی تـۆ پێت ناخۆشـە و نـەهیت لێ کـردوەو زەرەری مرۆڤەکانی تێدایە کردومە. دەی وا ئێستا ڕوم کردە تۆو وەعدو بەڵێن بێ چـی تـۆ

فەرمانت پێ کردوە من ئەوە بکەم خوایە گیان وەرم گرە و تەوبەم لێ قبوڵ بکەو ڕوو ڕەش و خەجاڵەتم مەکە. زۆر بەدڵ و کوڵ و فرمێسك تەوبەیەکی نەصوحی کرد. (سُبْحانَ اللهِ) هێشتا هەر لەدوعاو پاڕانەوەدا بوو کەهەوێك هات و لەنگەری گرت و چۆن گۆزە دەمەو نخون دەکەرێتەوە ئاوا باران هاتە خوارەوە، بوویە (اللهُ أكبر) و سوپاسی خواو پێکەنین و خۆشی، لەوکاتەدا حەزرەتی موسا فەرموی: خوایە گیان خۆکەسمان لەناو نەچوە دەرەوە کە بارانت بۆ باراندین؟!

**خوای گەورە فەرموی:** ئەی موسا هەر بەهۆی ئەو بەندە خراپەکارەوە کەببوە هۆی باران نەبارین، وا لەبەرخاتری ئەو بارانم بۆ باراندن چونکە زۆر بەدڵ و کوڵ، بەڕاست و دروستی تەوبەیەکی ڕاستەقینەی کرد تەنها لە نێوان خۆی و مندا تەوبەی کردو تۆی پێغەمبەریش پێت نەزانی، حەزرەتی موسا فەرموی: خوای گەورە ئەو بەندەیەم نیشان بدەو پێم بناسێنە بۆئەوەی دەستی بگوشم و ماچی بکەم و پیرۆز بایی لێ بکەم.

**خوای گەورە فەرموی:** ئەی موسا ئەو بەندەیە لەکاتێکدا سەرپێچی منی دەکرد من ئابڕوم نەبردو بەکەسم نەناساند، ئەی ئێستا کەتەوبەی کردوەو گەڕاوەتەوە بۆ لای من چۆن ئاشکرای دەکەم و وادەکەم خەڵکی بەگوناهەکانی ڕابردوی بزانێ؟!

(سُبحانَ اللهِ) ئاوا تەوبەو پەشیمانی و ڕوکردنە خواو ڕێبازی خوا، دەرگاتی ڕەحمەتی خواو بارانی ڕەحمەتی خوا لەسەر مرۆڤ دەکاتەوە.

٢ یەکێکی تر لەو شتانەی کە ئاینی ئیسلام ڕێنمایی کردوین بۆ ئەنجام گەیاندنی لە کاتی بێ بارانیدا. صەدەقەو خێر وخێراتە. لە فەرمودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتوە کەکابرایەکی پیاو باش بەڕێگایەکدا دەڕۆیشت لەوکاتەدا هەورێك

هاته سەرئەو ناوچەیە ئەو پیاوە گویّ ی لەدەگێك بوو دەی گـوت: ئـەی هەورەکـە (إِسْقِ حَدِيقَةَ فُلانٍ) باخی فلاّن کەس – ناوی کابرای خاوەن باخی هێنا – ئاو بدە، یەکسەر هەورەکە لەسەر باخێك لەوناوچەیە وەستاو بـارانێکی زۆر جـوان ونـەرمی باراند. کابرای رێبـوار رۆیشـت بـەرەو باخەکـە وباخەوانەکـەی دۆزی یـەوە ولیّ ی پرسی: دەتوانم بپرسم ناوت چی یە؟ ووتی بەلّیّ ناوم فلاّن کەسە.

(سُبْحانَ اللّٰه) هەمان ناو بوو کە لەهەورەکەوە بیستبووی. پاشان لیّ پرسی دەتوانی پێم بلّیّ ی چ کردەوەیەك دەکەی کەبەڕاستی لای خوا زۆر خۆشەویست بێت، چونکە من ئاوا گوێم لیّ ببوو. کەدەنگێك فـەرمانی بەسـەر ئەوهـەورەدا کـرد کـە بـاران بەسەر باخەکەی تۆدا ببارێنیّ، خاوەن بـاخ ووتـی: مـن بـەروبومی باخەکـەم دوای فرۆشتن هەموو ساڵێك دەکەم بەسیّ بەشەوە بەشێکی بۆ خۆم و ماڵ و منالّم صەرف دەکەم و بژێوی ژیانمی پیّ دابین دەکەم. بەشێکیشی لەباخەکـەدا خـەرج دەکەمـەوە وەکو کێلاّن وپاککردنەوەی وسیاج ونەمامی تازە ومیوە ڕنین وکریّ ی کرێکـاری لیّ دەدەم. بەشی سیّ یەمیشی دەکەم بەخێر وخێرات ودابەشی دەکـەم بەسـەر هـەژار وفەقیران دا.

بەم شێوەیە ئەم بەخشندەیی وخێرکردنەی ئەو باخەوانە بـوە هـۆی ئـەوەی کـەئاوا فەرمان بەهەور بکرێت بارانی بۆ ببارێت.

٣- یەکێکی تر لەوشتانەی کەخوای گـەورە دەیانکـات بـە هۆکـاری بـاران بـارین لەکاتی وشکە ساڵی وبیّ بارانی دا، زیندەوەر ومێروەکـانن. کـە ئـەوانیش لـەخوا دەپاڕێنەوە کە بارانی ڕەحمەتیان بەسـەردا ببـارێنیّ و زەویـان بـۆ سـەوز بکـات و دانەوێڵەیان بۆ بڕوێنیّ.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوبارەیەوە فەرمودەیەکمان بۆ دەگێڕێتەوە ودەفەرمویّ:

(خَرَجَ سُلَيْمان يَسْتَسْقي، فَرَأى نَمْلَةً مُسْتَلْقِيَةً عَلى ظَهْرِها رافِعَــةً قَوائِمَهــا إلى السَّماءِ – تَسْتَسْقي – فَقالَ: إِرْجِعُوا فَقَد سُقيتُم بِدَعْوَةِ غَيْــرِكُم) رَواهُ أَحمَــد وَصَحَّحَهُ الحاكِمُ.

واته: حەزرەتی سولەیمان پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت). لەگەڵ گەلەکەیدا لەساڵێکی بێ بارانیدا چونە دەشــت ودەر وداوای بارانیــان دەکــرد لــەخوای گــەورە دەپاڕانەوە. لەوکاتەدا حەزرەتی سولەیمان چاوی بەمێروولەیەك کەوت مێرولەیەکی مێ بوو – دایکی بەچکە بوو. خەمی خێزانەکەی لەبەربوو. لەمێروولەدا مــێ ینــە سەرۆکی خێزانە – ئەو مێروولە دایکەیە لەسەرپشت کەوتبوو، ڕووی کردبوە ئاسمان وداوای لــەخوا دەکــرد بارانیــان بــۆ ببــارێنێ وبــەزمانی خــۆی لــەخوا دەپاڕایــەوە ودەلاڵایەوە کەبارانیان بۆ ببارێنێ ، حەزرەتی سولەیمان لەزمانی هەموو زیندەوەران گەیشتوە. کە حەزرەتی سولەیمان ئەوەی بینی فەرموی: ئەی خەڵکینــە بابڕۆینــەوە بەرەو ماڵ وبگەڕێنەوە. بەڕاستی بۆتان دەبارێ بەپاڕانەوەی غەیری خۆتان.

٤- **تەوەسول کردن:** لەکتێبی فیقهی بەناوبانگــدا وەکــو (المَجْمُــوع) و (المُغْــني) فەرمویانە: سوننەتە لەدوعایەکانی دوای باراندا، لەخوا بپاڕێیتەوە بەخاتری کردەوە چاکەکانی خۆت کەلەبەر ڕەزامەندی خوا کــردوتن. بیربکــەوە وبزانــە چ کردارێکــی نهێنی خێر وچاکە لەنێوان خۆت وخوادا هەیە وتەنها خوای گەورە پێ ی دەزانێ.

بەوکردەوانە لەخوای گەورە بپاڕێرەوە وبڵێ: خوایەگیان ئەگەر ئەوکردەوەیــەم لەبــەر خاتری تۆ کــردوە وغــەیری ڕەزامەنــدی تــۆی تێــدا ڕەچــاونەکراوە، خوایــە بــارانی ڕەحمەتمان بۆ ببارێنی.

وە هەروەها دروستە بەخاتری پیاو باشــانی زینــدووش لــەخوا بپاڕێیتــەوە کــەباران ببارێنێ. لەسەردەمی ئیمامی کوڕی خەطــاب دا. بــێ بــارانی ڕوی دا وخــەڵکی ترسیان لێ نیشت لەبێ ئاوی و ووشکە ساڵی. لەوکاتەدا حەزرەتی عومەر هــەموو ئیماندارانی کۆکردەوە وڕویان کردە دەشت ودەستیان کــرد بەنوێــژە بارانــە. پاشــان لەخوای گەورە دەپاڕانەوە.لەپاڕانەوەکاندا حەزرەتی عومەر دەستی عەباسی مــامی

پێغەمبەری خوای (ﷺ) گرت وفەرموی: (اللّٰهُمَّ إِنّا كُنّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بنَبِيِّنا (ﷺ) فَتَسْقِنا، وَإِنّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِعَمِّ نَبِيِّنا فَاسْقنا، قالَ أَنَسْ: فَيُسْقَوْنَ) رَواهُ البُخاريُّ.

**واتە:** حەزرەتی عومەر کەدەستی عەباسی گرت، لەخوای گەورە پاڕایەوە وفەرموی: ئەی پەروەردگارا ئێمە جاران کە پێغەمبەری خوا لەناوماندا بوو، بە پێغەمبەرە بەڕێزەکەت تەوەسولمان دەکرد ودەمانگوت خوایە لەبەرخاتری ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستەت. کە خاتەمی ئەنبیا ومورسەلینە، بارانی ڕەحمەتمان بۆ ببارێنە ولەووشکە سالّی ڕزگارمان بکە. ئەوا خوایە ئێستا ئێمە بەخاتری مامی پێغەمبەرەکەت لێت دەپاڕێینەوە کەبارانمان بۆ ببارێنی. ئەنەس دەفەرموێ: باران دەباری.

**کەواتە:** کاربەدەست دەبێ وەکو حەزرەتی عومەر خەمخۆری میللەتەکەی بێ. بگەڕێ بەدوای پیاو چاکاندا وبەخاتری ئەوان لەخوا بپاڕێتەوە. نەك لەووڵاتی موسڵمانانندا خواناسان بێ نازبن وسەماکەر وگۆرانی بێژ ڕێزدار ولەپێش بن!!

**٥- سەربازانی نەناسراو.** کە پێغەمبەری خوا فەرموی: زۆرکەس هەیە جل وبەرگی شڕودڕە، لەکۆڕ ودانیشتنی خەڵکی دا لەبەربێ ناوی وهەژاری وکزۆڵی لەبەردەرگادا دای دەنیشێنن. کەچی ئەوەندە نێوانی لەگەڵ پەروەردگاریدا ڕێکە، ئەوەندە دڵی پڕە لەخۆشەویستی خوا وپێغەمبەری خوا (ﷺ). هەرکاتێ هەرکارێك داوابکات لەخوای گەورە. خوای گەورە بۆی جێ بەجێ دەکات وداواکەی وئاواتەکەی دێنێتەدی.

یەکێ لەپیاو چاکان بەسەرهاتێکی شیرینمان بۆ دەگێڕێتەوە ودەفەرموێ: دوای ئەوەی دەستم لەخراپەکاری وئازاری خەڵکی هێنا وڕوم کردە خوا وچاکەکاری. ئەوساڵە بێ بارانی ڕووی دا. خەڵکی هەموو کۆبونەوە وچوینە شوێنی نوێژە بارانە. دوای بەجێهێنانی نوێژە بارانەو ووتار خوێندنەوە ودوعاکردن. خەڵکەکە خەریکی بڵاوە لێکردن بوون. خەریك بوو ئێوارە دابێ وخۆر بەرەو ئاوا بون دەچوو. ئاسمان صاف وبێ گەرد بوو. هەرچی پەڵەهەور بێ بەئاسمانەوە نەبوو. منیش خەریکی ڕۆشتنەوە بوم بۆماڵەوە. سەرنجم دا کەسێکی ڕەش پێست، بەتەنها دانیشتوە ودەگری ولەخوا دەپاڕێتەوە. مالیکی کوڕی دینار دەفەموێ: لێی نزیك بومەوە و گوێم لێگرت، ئەو لەبەر موناجاتی بەکوڵ و بەدڵی لەنێوان خۆی و پەروەردگاریدا

ئاگای لەمن نەمابوو. گوێم لێ بوو فەرموی: خوایە بەو خۆشەویستی یە بێ سنورەی لەنێوان من و تۆدا هەیە بارانمان بۆ ببارێنە. هەر ئێستا خوایە بارانمان بۆ ببارێنە و بائەو خەڵکە بەزەردەخەنەو دڵ و خۆشی یەوە بگەڕێنەوە.
(سُبْحانَ اللّٰه) مالیکی کوڕی دینار دەفەرموێ: یەکسەر هەور لە ئاسمانی سامالٚ پەیدا بوو باران دایکرد. خەڵکیم بینی بەزەردەخەنەوە و دڵ خۆشی و سوپاسی خوا کردنەوە ڕایان دەکرد بۆ ماڵەکانیان. لەبەر لێزمە بارانەکە ڕایان دەکرد تاهیچیتر تەڕ نەبن مالیکی کوڕی دینار دەفەرموێ: ئەمجا ئەو کەسە ڕەش پێستەکە ئەو بارانەی بینی بە هێمنی لەشوێنی خۆی هەستاو دەم بەحەمدوپهنا و زیکری خواوە بەرەو ماڵ گەڕایەوە. منیش شوێنی کەوتم و ئەو ماڵەم دیاری کرد کە چوە ناویەوە، بۆ بەیانی چوم بۆ ئەو شوێنە و پرسیم تابزانم چی کەسێکەو چ کارەیە. بۆم دەرکەوت بەندەیەو لەلای مسگەرێك خزمەتکارە. چومە لای گەورەکەی و زۆر تکام لێکرد کەبەهەر نرخێك بێت ئەو بەندەیە بدات بەمن و زۆرکارم پێیەتی.
گەورەکەی ووتی: هەرچەندە کەسێکی زۆر ئیش پاك و دڵسۆز و ئەمینە، وە زۆر بێ دەنگ و زمان سەلامەتە. وەشەوانە هەر خەریکی خواپەرستی و یادی خوایە، بەڵام کەئەوەندە پێ داگیریم لێ بکەی ناچارم بیدەم بەتۆ، بەڵێ لەگەڵ خۆم هێنامەوە بۆ ماڵەوەو پێی ووتم: دەتوانم بپرسم بەهۆی چیەوە تۆ ئاوا بەگەرمی داوای منت کرد لەگەورەکەم و هێنامت بۆ ماڵی خۆت. چ ئیش و کارێکت هەیە کەئاوا پێویستیت بەمن بێ. منیش پێم ووت: تۆ دەبێ تەنها و تەنها بەندەی خوا بی و نابێ خزمەتکاری کەس بیت وەبەیەکەوە ژیان بەسەر دەبەین و منیش تازە تۆ بەکارم، ئەوەی دوێنێ ئێوارە لە تۆم بینی زیاتر دڵنیایی و شیرینی ئیمان و خواناسی پێ ناساندم. فەرموی: بۆ چی تۆ دوێنێ ئێوارە لای منەوە بوی و گوێت لەمن گرتبوو؟! ووتم بەڵێ. فەرموی تکادەکەم ڕێگام بدە بابچم دەست نوێژێ بگرم و دوو ڕکات

نوێژی سوننەت بکەم. ووتم: چۆنت پێ خۆشە ئاوا بکە، هەستا دەست نوێژێکی پوختی گرت و دورکات نوێژی زۆر بەخشوعی کرد کەبەڕاستی هەرشیرین بوو سەرنجی بدەی، کاتێ سەلامی دایەوە. ڕوی کردە ئاسمان و فەرموی: ئەی خوای گەورە تازە نێوانی من و تۆ کەتا ئێستا بەنهێنی مابۆوە وا ئاشکرا بوو، خوایە گیان نەوەکو تووشی فیتنەی دین و دونیا ببم، بمبەوە بۆلای خۆت و بمگەیەنە بەکاروانی پیاو چاکان،

وەکو دوعاکەی حەزرەتی یوسف، ﴿ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ ﴾ یوسف: ١٠١. (سُبْحانَ الله) یەکسەر بەسوژدەدا کەوت و کە پەلامارم دا هەڵی بسەنمەوە. ڕوحی دەرچوو بوو. مرد!

بەڵێ لە هەموو سەردەم و زەمانێکدا خۆشەویستانی خوا. سەربازانی نەناسراوی ئەم ئیسلامە هەر هەن و (إنْ شاءَ الله) خوای گەورە بەدوعاو نزاکانی ئەوان ڕەحم و سۆزی بەسەر ئێمەشدا دەبارێت.

٦- کار بەدەستی خەمخۆری میللەت هۆکاری ئەوەیە کەخوایی گەورە ڕەحم بەو میللەتە بکات جارێکی تر لەسەردەمی ئیمامی عومەردا وشکەساڵی و بێ بارانی ڕوی کردەوە شاری مەدینە و دەوروبەری بەڕادەیەك خەڵکی توشی ئەوە بون کەکانی و ئاوەکانیان ووشك بکات و کێڵگەو لەوەڕگاکانیان زەردو ووشك ببێ. یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) کەناوی – بیلالی کوڕی حەرثی موزەنی – بوو. هاتە خزمەت گۆڕی پڕ نوری سەرداری مەدینە.

حەزرەتی محمد (ﷺ) سەلامی لێکردو فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئومەتەکەت توشی ناڕەحەتی و بێ بارانی و وشکە ساڵی بووە، تۆش تالەناوماندا بوی هەر ڕەحمەت بوی بۆمان کە بەلاشەش لەناومان دەرچوی خێرو بەرەکەتەکەت، قورئان و فەرمودەکانت هەر لەناوماندان، توخوا داوا لەخوای پەروەردگار بکە کە

باران بۆ ئومەتەکەت ببارێنێ، چونکە بەڕاستی ئەوان خەریکە بەهیلاك دەچن، هەرئەو شەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ). ئەچێتە خەوی پیاوێکەوەو پێی دەفەرموێ: (أَقْرِيءْ عُمَرَ مِنِّي السَّلاَمَ وَأَخْبِرْهُ أَنَّهُمْ يُسْقَوْنَ، وَقلْ لَهُ: عَلَيْكَ الكَيْسَ، الكَيْس. فَأَتَى الرَّجُلُ عُمَرَ، فَأَخْبَرَهُ فَبَكَى عُمَرُ وَقالَ: يارَبِّ ماءَالُوا إلاَّ ماعَجَزْتُ عَنْهُ) رَواهُ البَيْهَقي وَإبْنُ أَبِي شَيْبَةَ بأسْنادٍ صَحيح، وذَكَرَهُ الحافِظ إبنُ حَجَر في فَتْحُ البَاري وَالحافِظ إبنُ كَثير في البِدايَة وَالنِّهايَةَ.

واتە: سەلامی من بە عومەر بگەیەنەو هەواڵی پێ بدە کەبەویستی خوا بارانیان بۆ دەبارێت. وەپێشی بڵێ: باووشیار و بەئاگا بێت. باووشیارو چاو کراوە و بەئاگاو ژیر بێت بۆخزمەت کردن بەموسڵمانان... کاتێ کابرا هاتە خزمەت حەزرەتی عومەر و خەوەکەی بۆ گێڕایەوە. حەزرەتی عومەر گریا و فەرمووی: خوای پەروەردگارم، بەپشتیوانی تۆ کەمتەرخەمی ناکەم مەگەر ئەوەی لەتوانام دا نەبێت.

وە بەویستی خوای گەورە بارانی ڕەحمەت باری و موسڵمانان لەو ناڕەحەتیە ڕزگاریان بوو بەڵێ کاربەدەستی دڵسۆزو دادگەر دەبێتە هۆی ئەوەی خەم و هەم لەسەر موسڵمان بڕەوێتەوە. ئەگەر فەرمانڕەوای موسڵمانان گوێڕایەڵی خوا بوو. شەرعی خوای جێبەجێ کرد. وە دڵسۆزو خەمخۆری هاولاتیانی بوو، ئەوە بەدڵنیاییەوە، خوای گەورە هەموو کار ئاسانیەکی بۆ دەکات و هەموو خەمێکی ئەو و میللەتەکە دەڕەوێنێتەوە. سەرنجی ئەم ڕوداوە واقیعی یە بدەن کەهەر لەزەمانی خەلیفەی دادگەر حەزرەتی عومەر ڕووی داوە. ئەویش ئەوەیە: کاتێ عەمری کوڕی عاس فەتحی میصری کردو کەوتە ژێر دەسەتی پڕ عەدالەتی ئیسلامەوە. دەستورو باوێك هەبوو لەمیصردا، ئەویش ئەوە بوو بەماوەی چەند ساڵ جارێك ڕووباری نیل نەدەژیایەوەو ئاوەکەی کەمی دەکردو خەڵکی میصر دەکەوتنە تەنگانەو ڕەحەتیەوە. وە خەڵکی میصر داب و نەریتەکەیان ئەوەبوو کە

دەهاتن کچێکی تازە پێگەیشتویان دێناو دایك و باوکیان ڕازی دەکرد کەکچەکەیان لەپێناو خەڵکی وولاتدا بکەن بەقوربانی و بیبەخشن. ئیتر کچەکەیان بەجل و بەرگی جوان و ئاڵ و والاو خشڵ دەڕازاندەوەو دەیانخستنە قوڵپی ئاوی نیلەوەو تیا دەخنکا. ئیتر پاش ماوەیەك ئاوەکە دەژیایەوەو ڕووباری نیل ئاوەکەی زیادی دەکردەوە!! (کەئەمەش ئەوپەڕی ئەفسانە بازی و گێلی و گەوجیە. کە مرۆڤ ئەگەر دوور بوو لە دینی حەق ئاوای لێ بەسەر دێت!). کاتێ ئاوی نیل کەمی کرد. خەڵکەکە هاتن بۆلای لێپرسراوی موسڵمانان عەمری کوڕی عاص و پێیان ووت کەفلان ڕۆژ ئامادەبە کەکچەکە دەخەینە قوڵپی نیلەوە.

**حەزرەتی عەمری کوڕی عاصیش فەرموی:** هەرگیز ڕێگا بەشتی وانادەم تاوەکو خەلیفەی موسڵمانان، عومەری کوڕی خَطّاب ئاگادار نەکەمەوە. ئەوەبوو نامەی بۆ حەزرەتی عومەر نوسی و فەرموی: نەمهێشتوە وابکەن، چار چی یە؟!

**حەزرەتی عومەر لە وەڵامی نامەکەیدا فەرموی:**

ئەی عەمر زۆر چاکت کرد کە نەتهێشت ئەو پڕوپوچیە جێبەجێ بکرێت.

ئیسلام کەهات بۆلابردنی ئەو ئەفسانەگەری و هەڵگرتنی ئەو ستەمە گەورەیە بوو لەسەر مرۆڤ بەگشتی و ئافرەتی بێ تاوان بەتایبەتی وا ئەم نامەیە ئەنوسم و پارچەیەك کاغەزی تێدایە بیخەرە ئاوی نیلەوە، من نامەیەکم بۆ ئاوی نیل نوسیوە!! ئایا نامە بۆ ئاو دەنوسرێت؟!

بەڵێ چونکە عومەر فەرمانڕەواو ئەمینداری هەموو وولاتەکەیە، بەئاوەکەشیەوە. جائەگەر سەرکردە گوێڕایەڵی خوای خۆی بکات، ئاوەکەش بەقسەی ئەو دەکات و ئاویش سەربازێکی خوای گەورەیە و بۆ خزمەتی مرۆڤ مل کەچ کراوە، ئەی مەگەر هەر ئاوی نیل نەبوو کە فیرعەونی خنکاند؟! کەقەومە بێ بڕواو یاخی یەکەی نوحی خنکاند؟!.

بەڵێ ئاویش سەربازێکی خوای گەورەیە و هۆکاری ژیاندنەوەو هۆکاری مراندنیشە..

بەڵێ نامەکە گەیشتە عەمری کوڕی عاص و کەکردیەوە لێی نوسرابوو: لەبەندەی خوا ئەمیری ئیمانداران، عومەری کوڕی خەگابەوە بۆ ڕووباری نیلی میصر.

**لە پاشان:** بەڕاستی ئەی ئاوی نیل ئەگەر تۆ بەئیزن و ویستی خۆت دێیتە دەرەوە، ئەوا هەرگیز مەیە دەرەوەو پێویستمان پێت نیە، خۆ ئەگەر خوای تاك و تەنها و زاڵ و بەدەسەڵات تۆ لەو زەوییە ڕەق و ووشکە دێیتە دەرەوە و جاریت دەکات، ئەوا داوا لەخوای تاك و تەنها و زاڵ و دەسەڵاتدار بەسەر هەمو شتێکدا دەکەین کەفەرمانت پێ بکات و بێیتە دەرەوەو خاکمان بۆ ئاوەدان و ئاودار بکەیتەوە.

بەڵێ نامەکەیان فڕێ دایە ئاوی نیلەوەو بۆ بەیانی کەخەڵکی لەخەو هەستان (١٦) زیراع زیادی کردبوو!.

٧- حەوتەم ڕێگا لەبێ بارانیدا پەنای بۆ دەبرێ، پاڕانەوەیە لەخوا.

**کە ئەمە سێ جۆرە:**

أ- هەرکەس بەتەنها بۆخۆی، یان بەکۆمەڵ بەبێ نوێژکردن لەماڵی خۆیەوە. لەسەر شوێنی کاری خۆیەوە لەخوا دەپاڕێتەوە کەخوای گەورە دەرگای ڕەحمەتیان لێ بکاتەوە و بارانیان بۆ ببارێنێ.

**وە لەمەرجەکانی دوعای بەکوڵ و قبووڵ بوو:**

١- بەقینەوە دوعا بکەی کەخوای گەورە وەڵامی دوعاکانت دەداتەوە. نەك بەدەم دوعا بکەی و بەدڵ لەگوماندا بی کەدەبێ خوا لێت قبوڵ بکات یان نا!

٢- پەلەنەکەی لەدوعا قبوڵ بوندا، واتە بڵێی خۆئەوە چەند جار دوعام کردو خوا هەر لێی قبوڵ نەکردم. نەخێر تۆ لەسەرتە دوعا بکەی و ئیتر دڵنیابە خوای گەورە کاتی وەرگرتنەکەی دیاری کردوەو حیکمەتی تێدایە کەدوای دەخات.

٣- لەکاتی دوعاو پاڕانەوەکەدا بەخشوع و مل کەچی و زەلیلیەوە لەخوای خۆت بپاڕێیتەوە عَبْدُالله ی کوڕی عومەر دەفەرموێ: ئایا پێتان بڵێم کەی خوای گەورە دوعاکانتان قبوڵ دەکات؟! ووتیان: کەی و چ کاتێ؟! فەرموی: بیهێننە پێش چاوی خۆتان نمونەی ئەو کەسەی کەلەناوەڕاستی دەریایەکی فراواندایە. باو بۆرانێکی بەهێز هەڵدەکات و کەشتیەکەیان هەڵدەگێڕێتەوەو هەموو دەکەونە حاڵەتی بەهیلاك چون و مردنەوە، لەو کاتەدا ئەوکەسە دەست بەپارچە تەختەیەکەوە دەگرێ و بەگریانەوە هاوار دەکات: (یارَب ، یارَب) ئەی خوای گەورە، ئەی خوای پەروەردگارم بێیت بەهانامەوە. سەرنج بدەن ئەو کەسە چۆن کەدەڵێ خوایە گیان هاوار. بەهەموو لاشە و موو ئێسقانیەوە، بەهەموو ئەندامانی لاشەیەوە. بەهەموو خانەو دڵۆپەخوێنێکی لاشەیەوە هاوار دەکات یا الله، جا إبنُ عُمر فەرموی: تەماشاکەن، هەرکاتێ بەندەی موسڵمان ئاوا بەکوڵ لەخوا پاڕایەوە ، ئاوا بەزەلیلی و مل کەچی یەوە لەخوا پاڕایەوە. ئەوا سوێند بەو خوایەی کەهیچ خوایەك نیە تەنها خۆی نەبێ، کەزاتی (الله) یە، خوای گەورە دوعاکەی ڕەت ناکاتەوەو لێی وەردەگرێت.خوای گەورە خۆی فەرمویەتی: ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ ﴾النمل: ٦٢

**وە ئیمامی ئەحمەد دەیفەرموو:** من دەزانم کەی خوای گەورەدوعام گیرا دەکات! فەرمویان: بەچی دەزانی؟! فەرموی: (عِنْدَما يَخْشَع القَلْب وَتذرف العَيْنُ وَتَخْشَـعُ الجَوارِحُ، أَقُولُ: سَيُسْتَجابُ الآن).

واتە: هەرکاتێ کەدڵ ئەوپەڕی مل کەچی نواند و چاو فرمێسکی ڕشت و ئەندامەکانی لاشە مل کەچی فەرمانی پەروەردگاربوون، ئالەو کاتەدا دەڵێم: ئێستا دوعاکانم گیرا بوون.

٤- خواردنی حەڵاڵ. پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەعدی فەرموو:

**(أَطِبْ مَطْعَمَكَ تَكُن مَسْتَجاب الدَّعْوَة)**. باخۆراك و نانەکەت پاك و حەڵاڵ بێ و بەپارەی حەرام و غەش و دەست بڕین دروست نەکرابێ، ئەوا تۆ دوعاکانت قبوڵ دەبێت..

٣- پاڕانەوە لەدوای نوێژەکان و لەخوتبەکانی جومعەدا، بەو شێوەیەی کە ووتار خوێن لەووتارەکەدا دوعا دەکات و داوا لەخوای گەورە و میهرەبان دەکات کەبارانی ڕەحمەت ببارێنێ بەسەریاندا نوێژ خوێنەکانیش (مَأمُومین) ئامین دەکەن.
هەروەکو لەهەردوو صەحیحی بوخاری و مسلیم دا هاتوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کەدەفەرموێ: (أَنَّ رَجُلاً دَخَلَ المَسْجدَ يَوْمَ الجُمُعَةِ وَرَسُولُ الله (ﷺ) قائِمٌ يَخْطبُ، فَقالَ: يارَسُولَ الله، هَلَكَتِ الأَمْوَالُ وانْقَطَعَت السُّبُلُ فَادْعُ إلَيْنا يَغيْثَنا.. فَرَفَعَ رَسُولُ الله (ﷺ) يَدَيْهِ. ثُمَّ قالَ: **اللّهُمَّ أَغِثْنا اللّهُمَّ أَغِثْنا. اللّهَمَّ أَغِثْنا**).
واتە: ڕۆژی جومعە بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتاری دەخوێندەوە بەپێوە لەسەر مینبەر وەستا بوو، لەو کاتەدا پیاوێك خۆی کرد بەمزگەوتدا و بانگی کرد، ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ماڵ و سامانمان ئاژەڵ و کشتوکاڵمان هیچی نەما، هیچ بەرهەمەکان نەماوە بیبەین بۆ بازاڕو وا ڕێگاکان ووشك بوون بۆمان بپاڕێرەوە لەخوا بەڵکو بارانی ڕەحمەتمان بەسەردا ببارێنێ. یەکسەر لەناو ووتارەکەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەردوو دەستی پیرۆزی بەرزکردەوەو فەرموی: خوایە گیان، ئەی پەروەردگارا بارانی ڕەحمەتمان بۆ ببارێنی، سێ جار وای فەرموو.
**ئەنەس دەفەرموێ:** (ولاوَالله مانَرى في السَّماءِ مِنْ سَحاب وَلا قَزَعَةٍ وَمابَيْننا وَبَيْنَ سَلْع – الجَبَلِ – مِنْ بَيْتٍ وَلاَ دار، فَطَلَعَتْ مِنْ وَرائِهِ سَحابَةٌ مِثْلُ التَرْس – أي في إسْتِيدارَتِها، فَلَمَّا توسطَتَ السَّماءَ إنْتَشَرَت ثُمَّ أمطرت فَلا وَالله مارَأَيْنا الشَّمْس سَبْتاً – أُسبُوعاً).
واتە: سوێند بەخوای گەورە کاتێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوعاکەی کرد، هەرچی هەور بێ بەئاسمانەوە نەمانبینیوە، تەنانەت پەڵە هەوری بچوڵەشمان نەبینیوە، لەنێوان ئێمەو شاخەکەدا هیچ ماڵ و خانووش نەبوو تابڵێین چاومان لەهەورەکە نەبووە، بەویستی خوا لەو ئاسمانە سامالەدا لەپشتی ئەو شاخەوە هەورێك هات. وەکو کێوێك وابوو لەگەورەیی دا، کاتێ گەیشتە ناوەڕاستی ئاسمان واتە: سەر شاری مەدینە، بڵاو بۆوەو باران دای کرد، سوێند بەخوای گەورە ماوەی

یەك حەفتەی ڕێك لەجومعە بۆ جومعە، چاومان بەتیشكی خۆر نەكەوت، هەر هەورو باران بوو!!

**ئەنەس باسەكەمان بۆ تەواو دەكات و دەفەرموێ:** (ثُمَّ دَخَلَ رَجُل مِنْ ذلِكَ الباب فِي الجُمُعةِ المُقْبلَة، وَرَسُولُ الله (ﷺ) قائِمٌ يَخْطُبُ، فاسْتَقْبَلَهُ قائِماً فَقالَ: يارَسُولَ الله. هَلَكَتِ الأَمْوال وانْقَطَعَتِ السبُل، فادْعُ الله أَنْ يَمْسكَها عَنّا. فَرَفَعَ رَسُولُ الله (ﷺ) ، يَدَيهِ، ثُمَّ قالَ: **اللّهُمَّ حَوالَيْنا وَلاعَلَيْنا. اللّهُمَّ عَلى الآكامِ والضَّرابِ وَبُطُونِ الأَوْدِيَةِ وَمَنابِتِ الشَّجَر..** فَأَقْلَعَت وَخَرَجْنا نَمْشي فِي الشَّمْسِ).

واتە: پاشان لەجومعەی داهاتودا پیاوێك هەر لەهەمان دەرگای جاری پێشوەو هاتە مزگەوتەوە، لەوكاتەدا كەپێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر مینبەر وەستا بوو خوطبەی دەخوێندەوە. كابرا بانگی كرد: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ). ماڵ و سامان و ئاژەڵ و كشتوكاڵمان هەموو لەناوچوو. ڕێگای بازاڕمان ووشك بووەو هیچمان بۆ ناچێ بۆ بازاڕ بەهۆی ئەم بارانە زۆرەوە كەماوەی یەك حەفتەیە بەردەوامە، تكایە داوا لەخوای پەروەردگار بكە بەڵكو بیگرێتەوە لەسەرمان و هیچی تر جارێ نەبارێ!!

پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر لەناو خوطبەكەدا هەردوو دەستی بەرزكردەوەو فەرموی: خوایە لەچوار دەورمان بیبارێنەو بەسەرماندا مەیبارێنە. خوایە لەسەر شاخەكان و دۆڵەكان و ناو شیوەكان و ژێر ڕەگی درەختەكان و دارستانەكاندا بۆمان ببارێنە.

**ئەنەس دەفەرموێ:** دەست بەجێ باران وەستایەوە و هەور نەماو كەلەمزگەوت هاتینە دەرەوە لەبەر تیشكی خۆر دەڕۆیشین بۆ ماڵەوەو ئاسمان سامالّی پاك بوو!.

**كەواتە:** لەسەربەرەكەتی ئەو فەرمودەو دوعای پێغەمبەرە (ﷺ) ئێمەش (إِنْ شاءَ الله) لەوتاری جومعەدا بەدڵ لەخوا دەپاڕێینەوە و ئێوەش ئاوا بەدڵ ئامین بكەن و (إِنْ شاءَ الله) بارانی ڕەحمەتیش بەسەر ئێمەدا دەبارێت!

٣- ڕێگای سێ یەم كە موسڵمانان لەكاتی بێ بارانیدا پەنای بۆ دەبەن بریتی یە لەنوێژە بارانە.

کەنوێژە بارانە بەتەنهاش دەکرێ بەبێ خوێندنەوەی خوطبە. وەبەکۆمەڵ — جەماعەتیش دەکرێت.

شێوازی نوێژە بارانەش بەم جۆرەیە: پێشەوای موسڵمانان فەرمان دەکات بەخەڵکی کە:

١- تەوبەیەکی ڕاست و دروست لەنێوان خۆیان و پەروەردگاریاندا بکەن.

٢- خێرو صەدەقەی زۆر بکەن. یارمەتی هەژاران و نەداران بدەن.

٣- لەزوڵم و ستەم دەست هەڵگرن.

٤- لەگەڵ کێدا ناکۆکن و دەنگیان دابڕیوەو عاجزیان بوە. ئاشت ببنەوەو گەردنی یەکتری ئازاد بکەن.

٥- وە ماوەی سێ ڕۆژ لەسەر یەك بە ڕۆژو بن و پاشان لە ڕۆژی چوارەمدا هەموو خەڵکەکە بەتێکڕا بڕۆن بۆ دەشت.

٦- جلی شڕو دڕاو و کۆن دەکەنەبەر (بۆ چارەسەری تەکەبور و خۆ بەزل زانین).

٧- بەدڵێکی پڕ لەئومێد بەڕەحمی خواو بەمل کەچی و لەخواپاڕانەوەو دەم بەزیکری خوا بەڕێگادا دەڕۆن بۆ شوێنی نوێژە بارانەکە.

٨- هەرچی پیرو پەکەوتەیە (کەدڵی ناسك بۆتەوە) و منداڵی شیرە خۆرە — بێ تاوان — و ئاژەڵ و بێچوەکانیان لەگەڵ خۆیان دەبەن، وە دایکەکان و بێچوەکان لەیەك جیادەکرێنەوە تادەنگی باڕەباڕیان بەرز ببێتەوە و خوای گەورە زووتر ڕەحم بکاو دوعایەکان قبوڵ بکات، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (**لَوْلاشَبابٌ خُشَّعْ، وَبَهائِمٌ رُتَّعْ، وَشُيُوخٌ رُكَّعْ، وَأَطْفالٌ رُضَّعْ. لَصَبَّ عَلَيْكُمُ العَذاب صَبَّاً**) ئەم فەرمودەیە (حَدِيْثٌ ضَعِيف) لە مُغْنِي الُمحتاج (ج١ ، ص٣٢٣)دا هاتوە.

واتە: ئەگەر لەبەرگەنجانی مل کەچ و دڵسۆزی ئەم دینە نەبوایە وە لەبەر ئاژەڵی بێ زمانی پێویست بوو بەلەوەڕگا نەبوایە. وە پیاوان و ژنانی بە ساڵاچوی سەر سپی نوێژ خوێن و ڕاکع و ساجد نەبوایە، وە منداڵانی شیرە خۆرەی بێ تاوانی پاك نەبوایە. ئەوا بەڕاستی عەزابم بەسەردا دەباراندن، یەك لەدوای یەك.

**کەواتە:** نوێژە بارانە چاکسازی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایەو نوێژە بارانە دەبێتە هۆی لابردنی ئەو شتانەی کەرێگری باران بارینیان کردوە، کەواتە نوێژە بارانە تەنها مەراسیمێکی ئاینی و نوێژێکی رووت و چونە دەشت و دەرێکی سەیران ئاسانی یە، بەڵکو چاکسازیە لەناوچینەکانی کۆمەڵدا.

جا سەرنج بدەن چۆن ئیسلام چارەسەرێکی کرداریە و بەداخەوە ئێمە دەیکەین بەقسەی رووت..

**کەواتە:** هەرکات موسڵمانان ئاوا خۆیان پاك کردەوە و نوێژە بارانەیان کرد، إنشاءاللە بارانیان بۆ دەبارێ. کەنوێژە بارانە دەکرێ و نابارێ، خەتای نوێژە بارانەکە نی یە خەلەل هەیەو مەرجەکان نەهاتونەتە جێ.

خوایە گیان، ئەی پەروەردگارمان. ئەی ئەو خوایە بێ شەریکەی کەتوانات بەسەر هەمووشتێکدا زاڵە و وەڵامی ئەو کەسانە دەدەیتەوە، کەسەری بەندایەتی لەئاستتدا دادەنەوێنن و دەستەکانیان بۆلای تۆ بەرز دەکەنەوە، ئێمەش بەندەی مل کەچ و ئاتاج بەرەحمەتی تۆین، لەرەحمەتی خۆت بارانی رەحمەتمان بۆ ببارێنە.

اللَّهُمَّ آمِين

# سەرچاوەکان

١- قورئانی پیرۆز.

٢- تەفسیری ئاسان ، بورهان محمد أمین.

٣- ڕوناکی رَبّ العالَمین، ڕونکردنەوەی مِنْهاج الطّالِبین. م. عبدالله هەرتەلی ، ب٢ ، ل,١٠٥

٤- الترغیب والتَرْهیب ، للحافُظِ المُنْذري ، فەرمودەی ژمارە: ١١٣٥

٥- هەفتەنامەی (وەرچەرخان) ژ: (٨٥) ، لە ٢٠٠٨,/٤/٤

٦- رِحْلَةٌ مَعَ الصّادِقین ، محمود المصري ، ص١٢٢ ، ص,٣٦

٧- قِصَص الأَنبیاء ، عَمرو خالد ، ص,٤٦٧

٨- فِقْهُ السُّنَة ، السَّید سابق ، ج١ ، ص,٢١٦

٩- ڕۆژی پڕشنگدار ، م. عبدالله هەرتەلی ، ل,٨٨

١٠- مُغْني المُحْتاج ، الخَطیب الشَربینی ، ج١ ، ص٣٢٣.

# ووتاری چوارەم

# بۆ مانگی رَبیعُ الثاني

# ماف و رێزی کرێکار لەئیسلامدا

# جەژنی کرێکاران

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجمعين.
كرێكاران چینی زەحمەت كێش و خزمەتگوزاری وولاتن. هەموو شارستانیەتی مرۆڤایەتی لەسەر دەستی ئەو كرێكارانە دروست بوە، كەهەموو هەوڵ و هیمەتی خۆیان خستۆتەكار بۆ دروست كردنی ئەو شارستانیەتە، بۆیە جێگای خۆیەتی كەماف و رێزی خۆیان بەكردەوە بدرێتێ. نەك تەنها بەدووبارە كردنەوەی دروشمەكانی سالآنەیان لە (١/٥)دا، چونكە قسەو دروشم ناچێتە باخاڵەوەو پێشینانیش ووتویانە: (بەحەڵوا دەم شیرین نابێ)و بەپێناسی سەندیكاش باخەڵ گەرم نابێ، ئەمرۆ جیهان لەرۆژگارێكدا دەژی كەناوی زل و شاری وێرانی تیادا زۆر بوە، قسەی رازاوەو دەستە واژەی پڕ باق و بریق لەهەموو كەناڵ و ئامرازەكانی راگەیاندوە مێشكی خەڵكی پێ پڕ كراوە و عالەمێكی زۆری پێوە سەرقاڵ كراوە، لەكوردستانیشدا ئەمرۆ دەیان و سەدان دەستە واژەی نامۆ و دژ بەهەموو دابونەریتێكی رەسەنی كوردەواری و هەموو بنەما ئاینیە پیرۆزەكان خراوەتە سەر زاری گەنج و لاوی ئەم میللەتە، كەهەر یەكەیان تەعبیر لەفیكرو رێچكەو رێبازێكی تایبەت دەكات، بەهیچ جۆرێك مۆركی ئیسلاكەتی و تەنانەت كوردایەتیشی پێوە دیارنیە. بەڵكو هەریەكەیان زارە و هەڵقولاوی كەسێك یان كەسانێكی بەناو فەیلەسوف و رۆشنبیرن، كە لە وولات و مەملەكەتێكی ئەو سەری دونیاوە لەكەش و هەوایەكی تایبەتدا بۆ بەدەست هێنانی چەند بەرژەوەندیەكی سیاسی و تایبەت ئەو فیكرەو بەرنامەیان دارشتوە، لەكاتێكدا نەلەدوور و نەلەنزیكەوە پەیوەندیان بەواقیعی گەلێكی وەك گەلی كوردی موسڵمانەوە نیە.
بەهیچ جۆرێك تەعبیر لەواقیعی گەلەكەمان و گیر و گرفتەكانی و كێشە رەواكەی ناكەن و ناتوانن چارەسەری گونجاویان زۆر بدۆزنەوە، بەداخەوە لەجیهاندا بەگشتی لەجیاتی رێز لەدەورو رۆڵی بەرزی پڕ بەهای كرێكار بگیرێ، لە زۆر جێگاو شوێن و

کات و وولاّتدا کرێکاران تووشی چەوساندنەوەو خوران هاتوون، وەلـەتوانای مرۆڤـ زیاتر کاریـان پـێ کـراوە، وەمافیـان دوای پیربـون و کەمئەنـدامبون نـەپارێزراوە. هەربۆیە زۆر کات کرێکاران لەناو خۆیاندا کۆبونەتەوەو ڕێکخراوێکیان بـۆ داکـۆکی لـەمافی کرێکـاران دروسـتکردوە، وە لەسـاڵی ١٨٦٩ی زاینـی دا. لەئەمـەریکا ڕێکخراوی (فرسان العَمَل) شـۆڕە سـوارانی کـار. وەکـو ڕێکخراوێکـی کرێکـاری دامەزرا بۆ ئەوەی کاتی کاری کرێکاران ڕێك بخات و کاتژمێرەکانی کـارکردن کـەم بکاتەوە. ئیتر وردە وردە ڕێکخراو سەندیکای کرێکاران دروست دەبوو، تا ئەوە بوو لە ساڵی (١٨٨٦)ی زاینی دا، هەیئەتێك بەڕێکخراوە کرێکاریەکان دروست بوو وە ڕۆژی یەکی ئایاری دیاری کرد وەکو ڕۆژی خۆپیشاندان بۆ داواکردنی کەم کردنەوەی سـەعاتی کـارکردن بـۆ هەشـت کاتـژمێر لەڕۆژێکـدا بـۆ هـەموو پیشـەکان و پیشەسازیەکان. لەئەنجامی ئەو خۆ پیشاندانەدا تێك هەڵچـون لـەنێوان کرێکـارانی خۆپیشاندەرو پۆلیس دا ڕوی داو سـەرەنجام چـەند کەسـێك لـەکرێکاران کـوژران و هەندێکیشیان دەست گیرکران و ئەوانەی کەسەرپەرشتی خۆپیشاندانەکەیان کردبـوو دران بەدادگا و چوارکەسیان لێ لەسێدارە دران!.. ئیتر لـەوڕۆژەوە هـەموو سـاڵێك یەکی ئایار کراوە بەیادی ئەو کارەساتەو کرێکاران داوای مافەکانیان دەکەن، ئەمە کورتەی مێژوی ڕۆژی جیهانی کرێکاران کە یەکی ئایارە.

بەڵام بەداخەوە لەو ڕۆژەدا کەبەڕۆژی جیهانی کرێکاران ناو دەبرێ هیچ بۆ کرێکاران ناکرێ، مەگەر هەندێ ئاهەنگ و زەماوەند و دروشمی گەورە و بێ ناوەڕۆك بۆ زیاتر هەڵخەڵەتاندنی کرێکاران، کە بەڕاستی لەبری ئەوانە حەق وایە دادگایی ئەو حیزب و کەس و لایەنانە بکرێت کەبەناوی مافی کرێکـارەوە. کرێکـار دەچەوسـێننەوە و لەژێر نـاوە ئـەم پـیرۆزەدا حیـزب و ڕێکخـراو دروسـت دەکـەن، کەخۆزگـە چـەند کرێکارێکمـان لـەناو ڕیزەکانیانـدا ببینیایـە هـەر لەسـەرەوە تـا خـوارەوە، یـان

بەرپرسەکانیان ماوەیەك ئەگەر کەمیش بێت بەکرێکاری ژیانیان بگوزەراندایە. تاخەڵکی دڵنیابونایە کەئەمانە بەڕاستی کرێکارن و بەڕاستیش داکۆکی لەمافی کرێکاران دەکەن، داواکارین لەیەکی ئایاردا لەکوردستانیشدا لایەك لەهێز و بازووی کرێکاران و ڕەنجدەرانی کوردستان بکرێتەوە، بەسنورردانان بۆ گرانی بازاڕ، وە ڕێکخستنی کرێ و ماوەی کاری ڕۆژانەیان و چارەسەرکردنی دیاردەی بێ کاری، ئەوەش تەنها بەسەرودری یاسایەك چارەسەر دەکرێت کەلێوان لێو بێت لەدادگەری کۆمەڵایەتی کەتەنها لەپەیامی ئیسلامدا بەدی دەکرێ...

بەڵێ کرێکار، ناوێکی پیرۆز، زۆرترین چینی سەر زەوی، دێرینترین توێژ، ئەو توێژەی تاقیامەت دەمێنێ، ئەساسی کۆمەڵگا، چینی ماند و کەم دەرامەت، دەشتوانین بڵێین: تاقە چینی ئاسودەی سەر زەوی.

بەبیستنی ووشەی کرێکار، کارکردنمان بیردێتەوە. کەبەڕاستی کارکردن شیلەی ژیانە، ڕێگەی دروست و ناوازە و تەندروستی مرۆڤە بۆ گەیشتن بەئامانج و سەرکەوتن و خۆشنودی و ئاسودەیی و سەرفرازی.

بێ کاری دەردێکی کوشندەیەو سەرچاوەی زۆربەی دەردو نەهامەتیەکانی مرۆڤەو بەرەو بێزاری و دابڕان لەکۆمەڵگای دەبات، کۆمەڵگەش توشی نوشوستی و پەرتەوازەیی و پاشکۆیی دەکات، بەئەندازەیەك سەخت و دژوارو ترسناکە. بەجۆرێك ئەگەر کەسێك دوژمنی کەسێك بێت دوعای لێدەکات بێکار بێت.

ئەوە کارکردن و تێکۆشانە بەپلیکانەکانی ژیاندا دەمانگەیەنێتە لوتکەو بانگهێشتی سەر خوانی بەختەوەریمان دەکات. مرۆڤ هەر هیواو خەونێکی هەبێت لەڕێگەی کارکردنەوە دەتوانێت بەدەستی بهێنێت، بۆیە پێویستە هەر کارێك دەکەین خۆشمان بوێت و عاشقی ببین و چێژی لێ وەربگرین. بەو پەڕی دڵسۆزیەوە

کاربکەین و کارەکانمان ڕێک بخەین و بەبێزارییەوە بۆیان نەڕوانین و وانەزانین کەکۆلێکی گران بەسەر شانمانەوەیە.

**وەك نیوتن دەڵێت:** بۆ سەرکەوتن سێ ڕێگا هەیە، کارکردن و کارکردن و کارکردن.

وتراویشە: لەسودەکانی کارئەوەیە، کەڕۆژگارت کورت و تەمەنت درێژ دەکات..

کارکردن جەستە بەهێز و تەندروست و ڕوح ئاسودەو ئارام دەکات. تام و چێژی بەختەوەری بەمرۆڤ دەچێژێت و وای لێ دەکات زیاتر بڕوای بەتواناکانی خۆی هەبێت و بەشێکی زۆر لەتوانا شاراوەکانی خۆی بدۆزێتەوەو کەشفیان بکات و بیانخاتە گەڕ. بۆیە هەرچی زۆرتر کۆشش بکەین و جوڵەو بزاوتنمان زیاتر بێت بەهەمان ئەندازە ژیانمان گەشاوەتر و چالاکترو ڕازاوەتر دەبێت و هەست بە بەختەوەری و ئارامی و جێگیری دەکەین. پەندی پێشینانەو زۆر جوانە (ئەگەر نوێژکەری نورینی، ئەگەر ئیشکەری شیرینی).

**وە وتراوە:** (بەتاڵە ، سەرەنجامەکەی تاڵە). دەست بەتاڵی، کات بەتاڵی، هێلانەی وەسواسە، یاخی بوونە، چینی یەکان بەتاڵەیان بەماڵی شێت داناوە.

**د. ئەمیرال براید لەکتێبەکەیدا (وەحیدا) دەڵێ:**

ڕۆژانی بەتاڵی تاریکە وەك شەو، بەتاڵە ئاگری ئاشو بوو پڕو پاگەندە خۆشتر دەکات. بیرو باوەڕی خراپ دێنێتە ئاراوە. وە مرۆڤی خاوەن کارو پیشە لەناو کۆمەڵدا سەر فرازو خاوەن إعتبار و ڕێزێکی تایبەتیە و ووتەکانیشی زیاتر کاریگەرییان دەبێت. وەك لەم چیرۆکەدا بەڕونی دەیخوێنینەوە: گوندنشینێك لەماڵی دنیا تەنیا گوێدرێژێك و برێك گەنمی هەبوو.

ڕۆژێك گەنمەکەی لەگوێدرێژەکە بارکردو خۆشی بەپیادە بەرێ کەوت، هەرچەند مەترێك دەڕۆیشت بارەکەی خواردەبۆوەو خەریك بوو بکەوێت و ناچار دەبوو بارەکەی ڕێك بخاتەوە، تاپیاوێك پێی گەیشت و ووتی: ئەمە چی بارکردنێکە؟ بۆ گەنمەکە بەیەکسانی ناکەیت بەدوو بەشەوەو خۆت سواری گوێ درێژەکە نابیت؟!

گوندنشینەکە ووتی: تۆ چەند ژیرو تێگەیشتویت و من چەند نەزانم! خێرا بەگوێی ڕێبوارەکەی کردو پێش ئەوەی بەڕێ بکەوێت پرسیاری کرد تۆ بەم هەموو هۆش و ژیریەوە کارت چی یە؟ پیاوەکە وەڵامی دایەوە: پیشەیەکی تایبەتم نیە، ووتی: دەی چونکە دانایت لەم ڕێگەیەوە ڕۆزی خۆت دەست دەکەوێت؟! کابرای زانا ووتی: نەخێر. گوندنشینەکە ووتی: دەی کەواتە تۆ کارت چی یە؟! ڕێبوارەکە ووتی: هیچ کارە نیم و ئێستا بێ کارم! گوندنشینەکە بەتوڕەییەوە لەسەر گوێدرێژەکەی هاتە خوارەوەو دووبارە بارەکەی وەك خۆی لێکردەوە و ڕێگەی خۆی گرتە بەر!!
ڕێبوارەکە پرسی: تۆ سەرەتا زۆر مەتحی منت کردو بەپێشنیارەکەم خۆشحاڵ بویت، ئەی بۆچی ڕات گۆڕی؟! ووتی: تۆ ئەگەر شتێکت دەزانی لەدنیادا بێکار نەدەبویت. ئەی بۆچی کارێکت نیە. ووتەکانت سودو کەڵکیان نیە!!
بەڵێ، ئاینی ئیسلام زۆر هانی مرۆڤی موسڵمانی داوە بۆکارکردن، چونکە ئیسلام عیبادەت و خواپەرستی تەنها لە پەرستشەکاندا کورت هەڵنەهێنانەوە، بەڵکو ئەو قورئانەی کەدەفەرموێ: ﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا ﴾ هود: ٦
هەر ئەو قورئانەش دەفەرموێ: ئەی مرۆڤ ئاگادار بە: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولٗا فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ ﴾ الملك: ١٥
ئەو خوای پەروەردگارەی دەفەرموێت: ﴿ وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ﴾ الذاريات: ٥٦. هەرئەو خوایەیە کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ ﴾ الجمعة: ١٠
ئەو ئیسلامەی کەپێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەفەرموێ: (إذا سَأَلْتَ فَأسْأَلِ اللهَ)
هەرئەو پێغەمبەرە دڵسۆزەشمانە کەدەفەرموێ: (مَنْ فَتَحَ عَلى نَفْسِهِ باباً مِنَ السُؤالِ، فَتَحَ اللهُ عَلَيْهِ سَبْعينَ باباً مِنَ الفَقْرِ).

واتە: هەرکەسێك دەرگایەکی سواڵ کردن لەخۆی بکاتەوە وفێری سواڵ کردن ببێت. ئەوا خوای گەورە حەفتا دەرگای هەژاری لەسەر دەکاتەوە. چونکە پشتی لەکارکردن کردوە.

**ئیمانداران:** زەمانی بەختەوەریە وپێغەمبەری خوا (ﷺ) لەناو صەحابەدا دانیشتوە، هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) باسی پیاوێکیان کرد کەبەڕاستی دیندارە، بەڕۆژ بەڕۆژوە وبەشەویش هەرخەریکی شەونوێژ وزیکری خوایە.

صەحابەکان ئەمەیان بۆیە باس کرد وایان زانی کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی زۆر دڵخۆش دەبێت، شادمان دەبێت کەپیاوێکی ئاوا بەدین وخواپەرست لەناو ئەوخەڵکەدا هەیە.

بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ سەرسوڕمانی خۆی دەرنەبڕی بەخواپەرستی ئەم پیاوە، بەڵکو پرسیارێکی لەوپیاوانە کرد کەئاوا مەدحی ئەوپیاوەیان دەکرد. ئەویش ئەوەبوو. فەرمووی: (**أَيُّكُمْ يَكْفِيهِ طَعَامُهُ وَشَرَابُهُ؟**) ئایا کێ لەئێوە نان وئاوی بۆدابین دەکات، چونکە کەسێك شەو تابەیانی شەونوێژ بکات و ڕۆژ بە ڕۆژو بێ، دەبێ بە ڕۆژدا بخەوێت وکارو کە سابەتی پێ ناکرێ! صەحابەکان ووتیان: كُلُّنا يارَسُولَ اللهِ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەهەمومان نان وئاو وپێداویستی ژیانی بۆدابین دەکەین. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (**كُلُّكُمْ خَيْرٌ مِنْهُ**) دەی کەواتە ئێوە هەموتان لەو باشترن.

**لە ڕۆژی کرێکاران دا دەڵێم:** ئەی کرێکاری بەڕێز شانازی بەنازناوەکەتەوە بکە کەلەپیشەکەتە چونکە کرێکاری فەخرە، لەبەرئەم هۆیانە:

١- کرێکار وەڵامی بانگەوازی خوای گەورەی داوەتەوە کە دەفەرموێ:

﴿ وَجَعَلۡنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشٗا ﴾ النبأ: ١١.

خوای گەورە وەکو خەلاتێك باسی ئەوەی کردوە کەدابین کردنی ڕۆژو دروست کردنی هۆکارەکان بۆ ئەوەی بگونجێ بۆ هەموو بوارەکانی کارکردن. باسی ڕۆژی کردوەو، کرێکار ئەو خەلاتەی خوای گەورەی لەشوێنی خۆی دا بەکارهێناوە.

یاخود دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلۡنَا لَكُمۡ فِيهَا مَعَٰيِشَۗ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴾ الأعراف: ١٠

( لەم ئایەتەشدا خوای گەورە هەموو ئەو پێداویستانەی کە لەسەر زەوی دا ئامادەی کردون بەخەلاتی خۆی بۆ مرۆڤ ناوی بردون وداوای کردوە کەشوکرانە بژێری لەسەر بکرێ. کە بەڕاستی هەرکرێکارێك کە گەرما وسەرما بەفیڕۆ نادات و ڕۆژگار بەخەو وخواردن بەسەر نابات و لە هەوڵ وتێکۆشاندایە، بەکردەوە شوکری خوای کردوە وئەو خەلاتەی خوای بەکارهێناوە).

٢- کرێکاری و جولان و نەسرەوتن وبنیات نان و ئاوەدانکردنەوەی وولات وەکو تێکۆشان وایە لەپێناوی خوادا. یەکێ لەهاوەلانی بەرێزی پێغەمبەری پێشەوا(ﷺ) کەناوی (کەعبی کوڕی عوجرە)یە بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: (مَرَّ عَلى النَبيَّ (ﷺ) رَجُلٌ فَرَأى أَصْحابُ رَسُولِ الله (ﷺ)مِنْ جَلَدِهِ وَنَشاطِهِ، فَقالُوا: يارَسُولَ اللهِ لَوْ كانَ هذا في سَبيلِ اللهِ).

واتە: پیاوێك بەلای پێغەمبەری خوادا (ﷺ) تێ پەڕی هاوەلانی پێغەمبەر سەنجی گورج وگۆلی وچوست وچالاکی ئەم کەسەیان داو ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئای ئەگەر ئەم هەوڵ وهیمەتەی، ئەم گورج وگۆلیەی لەپێناوی خوای گەورەدا بوایە، خۆزگە بۆ خوا ئاوا بەکاربوایە!

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی:**

(إنْ كانَ): ئەگەر ئەم هیمەت وگورج وگۆلیەی ئەم کەسە بۆ:

**١- (خَرَجَ يَسْعَى عَلى وَلَدِهِ صِغاراً فَهُوَ في سَبيلِ اللهِ).**

ئەگەر لەماڵ هاتبێتە دەرو لەهەوڵی ئەوەدا بێت شتێك بۆ مناڵە بچوکەکانی پەیدا بکات. ئەوە هەرلەپێناوی خوای گەورەدایە. ئەوکار وکەسابەتەی کەبۆ ماڵ ومناڵی دەکات وەکو تێکۆشان وایە لەپێناوی خوای گەورەدا.

٢- (وَإِنْ كانَ خَرَجَ يَسْعَى عَلى أَبَوَيْنِ شَيْخَيْنِ كَبيرَيْنِ فَهُوَ فِي سَبيلِ اللهِ).

ئەگەر ئەم هاتوچۆ گەرمە و ئەم چوست وچالاکیەی کە لەماڵ هاتۆتە دەرەوە بۆئەوە بەکاربهێنێ کەکار وکەسابەتێکی حەڵاڵ بکات وخزمەتی دایك وباوکێکی پیری پێ بکات. ئەوە ئەوەش هەرلەپێناوی خوادا حیساب دەکرێت.

٣- (وَإِنْ كانَ خَرَجَ يَسْعَى عَلى نَفْسِهِ يُعِفُّها فَهُوَ فِي سَبيلِ اللهِ).

وە ئەگەر ئەم چونەدەرەوەی ئەم کەسە بەهیمەتە ماندو نەناسە بۆ ئەوەبێ کەکارو کەسابەتێکی حەڵاڵ ئەنجام بدات ولەورێگەوە خۆی لەدەست پانکردنەوە وچاو لە ماڵی خەڵك بون ودەست برینی خەڵکی بپارێزێ. ئەوەش هەروەکو ئەوەوایە کە ئەوماندوبون و چوست و چالاکیەی لەپێناوی خوادا بوبێت.

٤- (وَإِنْ كانَ خَرَجَ رِياءً وَمُفاخَرَةً فَهُوَ فِي سَبيلِ الشَّيْطانِ).

وە ئەگەر ئەم هەوڵ وتێکۆشان وهاتوچۆیەی بۆئەوەبێت کەپارەیەك پەیدا بکات و پاشان ڕیایی وخۆبادانی پێ بەسەر خەڵکەوە بکات. ئەوە ئەم جۆرەیان لەپێناو و ڕێبازی شەیگاندایە. ئەم فەرمودەیە (رَواهُ الطَّبَراني وَرِجالُهُ رِجالُ الصَّحيحِ).

بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سێ جۆری کار وکەسابەتی بەتێکۆشان لەپێناوی خوادا زانی ویەك بەشی بەرێگای شەیطان دانا.

**کەواتە:** ئەی کرێکاری بەڕێز، نیەتی خۆت لەکار وکەسابەتدا خاوێن بکەوە. هەرلەوکاتەی کەبەیانی لەماڵ دەچیتەدەرەوە تاگەڕانەوەت بانیەتت لەو جۆرەبێ کە پێغەمبەری دڵسۆزو ڕێ نیشاندەرمان بە تێکۆشانی ڕێگای خودا ناوی برد.

٣- کرێکاری وماندوو بوون دەبێتە کەفارەتی گوناه وخوای گەورە لێت خۆش دەبێت إِنْ شاءَ الله.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (**مَنْ أَمْسَى كالاً مِنْ عَمَلِ يَدِهِ. أَمْسَى مَغْفُوراً لَهُ**). رَواهُ الطَّبَراني في الأَوْسَط.

واتە: هەرکەسێ نانی ڕەنجی شانی خۆی خوارد وبەرهەمی کاسپی حەلاڵی خۆی خوارد. خوای گەورەش لەگوناهی خۆش دەبێت.

٤- بیرکردنەوە لەبەدەست هێنانی کار وکاسبی بۆخۆی بەعیبادەت دادەنرێ. پێغەمبەری خوا (ﷺ) موژدە دەدات بەچینی کرێکار ودەفەرموێت:

(**إِنَّ مِنَ الذَنُوبِ ذَنُوباً لايُكَفِّرُها الصَّلاة وَلا الصَّدَقَة وَلا الحَجُّ، وَيُكَفِّرُها الهَمُّ في طَلَبِ المَعيشَةِ**) رَواهُ الطَّبَرانيُّ.

واتە: بە ڕاستی هەندێ گوناه هەیە لەناو لیستی گوناه وتاوانەکاندا کە نوێژو بەخشین وحەج نابێتە هۆی لابردن وسڕینەوەی!، بەڵام بیرکردنەوە وغەم خواردن لەدابین کردنی بژێوی ژیان و گەڕان بەدوای سەرچاوەیەکی کاسپی دا، ئەو ماوە بیرکردنەوە دەبێتە هۆی سڕینەوە وکەفارەتی ئەو گوناهە.

بەمانایەکی تر، ئەوکەسە هەرچەندە گوناهی کردبێ، بەڵام هێشتا ئامادە نی یە گوناهەکەی بکات بەدزی وڕاوە ڕوت وکوشتن. بەڵکو حەزی لەنانی حەلاڵە وبیر لەکار وکەسابەتی حەلاڵ وشەرەفمەندانە دەکاتەوە، خوای گەورە بەئەوە لێ ی خۆش دەبێت (إِنْ شاءَ الله).

٥- نانی کرێکاری چاکترین ونایابترین وخۆشترین نانە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (**ماأَكَلَ أَحَدٌ طَعا ماً قَطُّ خَيْراً مِنْ أَنْ يَأكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ، وَإِنَّ نَبِيَّ الله داوُدَ كانَ يَأْكُلُ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ**) رَواهُ البُخاريُّ. واتە: هیچ کەس نانێکی نەخواردوە، باشتر وچاکتر وبەتام تربێ لەونانەی کەبەرهەمی ڕەنجی دەستی خۆیەتی.

وە پێغەمبەری خوا – داود – سەلامی خوای لەسەربێ، لەبەرهەمی دەستی خۆی ورەنجی شانی خۆی خوارد.

**ئیمامی عەلی دەفەرموێ:** ڕۆژێکیان زۆرم برسی بوو. بۆیە ڕۆیشتم بۆ ماڵەکانی دەوری مەدینە وبەشوێن کارێکدا دەگەڕام. کەئیشی چەند سەعاتێ بێ وکرێ یەك وەربگرم وخۆمی پێ تێر بکەم. ڕۆیشتم بەلای ئافرەتێکی بەساڵاچودا. کەخەریکی ئەوەبوو هەندێ گڵی کۆکردبۆوە ودەیویست ئاوی لێ بدات وبیکات بەقوڕی سواخ. بەڵام توانای ئەوەی نەبوو کەئاوەکە لەبیرەکە دەربهێنێ. بۆیە لەگەڵی ڕێك کەوتم لەسەر ئەوەی کەهەر دۆلکە ئاوێکی لەبیرەکە بۆ دەربکەم وقوڕەکەی پێ بگرێتەوە دەنکە خورمایەکم بداتێ! بەم شێوەیە ئاوم بۆ هەڵکێشا تاکارەکەی تەواو بوو. کە (١٦) دۆلکە ئاوی گەورەم لەبیرەکە بۆ دەرکێشابوو. ئەوە بوو (١٦) دەنکە خورمام وەرگت، بەڵام بەهۆی زبری حەبلەکەوە وقورسی دۆلکەکە وقوڵی بیرەکەوە، لەپی دەستم هەموی بوو بەتلۆق وپێستی لێ بۆوە وسور هەڵگەڕا. دەنکە خورماکانم وەرگرت ولێم نەخوارد هەتاوەکو چومەوە خزمەت پێغەمبەری خوا وکەچاوی بەدەستم کەوت، لێ ی پرسیم بۆچی وات لێ هاتوە، منیش باسەکەم بۆ گێڕایەوە (فَفَرِحَ وَأَكَلَ مَعي مِنْها).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر خۆشحاڵ بوو وەخورماکەی لەگەڵ خواردم! جا تەماشاکەن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیفەرموو: ئای عەلی ئامۆزام زۆر پەرۆشی داخی گرانم توشی چی بوی وچۆن دەستت هەموی داماڵاوە. نەخێر، بەڵکو دەست خۆشی لێ کرد وئافرەینی کرد کەبەرهەمی ڕەنجی شانی خۆی دەخوات وئەوەندە بەرهەمی ئەو کرێکاریەی بەلاوە پیرۆز بوو، لێشی خوارد. کەواتە: نانی کرێکاری وەکو موفەرك دەخورێ!.

٦- کارکردن لەمنەتی خەڵکی ڕزگارت دەکات: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: **(لأَنْ يَأْخُذَ أَحَدُكُمْ أَحْبُلَهُ، فَيَأْتِيَ بِحُزْمَةٍ مِنْ حَطَبٍ عَلى ظَهْرِهِ فَيَبيعَها – فَيَكُفَّ بِها وَجْهَهُ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ النَّاسَ أَعْطَوْهُ أَمْ مَنَعُوهُ) رَواهُ البُخاري.** (١٤٧١).

واتە: بەڕاستی ئەگەر یەکێ لەئێوە گوریسەکەی هەڵبگرێ وبڕوات پوش وپەڵاش و چیلکە لەودەشت وشاخە کۆبکاتەوە وبیخاتە سەرپشت وشانی و لە بازاڕ بیفرۆشێ و بەپارەکەی گوزەرانی خۆی دابین بکات و خۆی لەچاو بەرەژێری ئەم وئەو ڕزگار بکات، ئەوە ئەوەی زۆر باشترە لەوەی کەداوا لەخەڵکی بکات ودەست پان بکاتەوە، ئایا پێ ی دەبەخشن یان دەست بەڕویەوە دەنێن.

لەم فەرمودەیەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تێمان دەگەیەنێ کەهیچ جۆرە کارو کاسبیەك عەیبە نیە ئەگەر دار وچیلکە بەکۆڵ هەڵبگری وخەڵکی بەجۆرێك سەیرت بکەن. گرنگ ئەوەیە کارەکە حەڵاڵ بێ وتۆش بێکار نەبی.

**ئیمامی عەلی فەرمویەتی:**

لَحَمْلُ الصَخَرِ عَلى قِمَمِ الجِبالِ ....أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ مِنَنِ الرِّجالِ

واتە: ئەگەر بەرد بەپشتما بدەم وبیبەم بۆسەر ئەوشاخانە. کەچەند ماندوبون وزەحمەتی هەیە. هێشتا ئەوەم بەلاوە خۆشترە کەمنەتی خەڵکی هەڵگرم وچاو لەدەستیان بم.

٧- بەکارکردن ودەست گیرکردن لەکار وپیشەیەك دەبی بەخۆشەویستی خوا.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:

(**إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الْمُؤْمِنَ الْمُحْتَرِفَ**) رَواهُ الطَّبَراني في الكَبير.

واتە: بەڕاستی خوای گەورە ئیمانداری خاوەن پیشەی خۆش دەوێت.

٨- کارکردن لەنەخۆشی دەرونی دەتپارێزێ: لەبەرئەوەی هۆکاری سەرەکی نەخۆشی دەرونی (نەفسی) دانیشتن وبێ کاری و بیرکردنەوەیە. بەڵام نابینی کرێکار بەدەم کارکردنەوە چۆن وەکو بولبول دەخوێنێ و لەبەر خۆیەوە ئاواز دەچڕێ.

٩- پارەی کرێکاری چونکە بەنارەحەت وزەحمەت دەست دەکەوێ. خاوەنەکەی توشی بوغرایی وگومڕایی ناکات.

**قورئان دەفەرموێ:** ﴿ وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ الشورى: ٢٧
تەماشاکەن هەموو ئەوانەی کەبەبێ عەرەق کردنەوە، بەلکو بەدەم عەرەق خواردنەوەوە پارە پەیدا دەکەن ومالّی میللەت بەگەندەلّی تالاّن دەکەن، چۆن خۆیان وکوڕەکانیان تەکەبور بەسەر خەلّکا لێ دەدەن وشێوازی ئوتومبێل لێخوڕین نازانن و لە قومارخانەیەکدا بەچەند دەفتەر دۆلار دەدۆڕێنن وهیچ بەلاشیانەوە گرنگ نیە. چونکە زەحمەتیان پێوە نەچەشتوە: پاشان، ئایا کرێکار چی بکات بۆئەوەی ئەو فەزلّ وگەورەییەی دەست بکەوێت؟!
١- ئەی کرێکار. شانازی بەکرێکاریەکەتەوە بکە وپێ ی ناشکور مەبە وخۆتت لاسوك نەبێ و وامەزانە ( پەنابەخوا) کە خوا ڕقی لێتە کەنانی تۆی خستۆتە سەر کرێکاری. بەلّکو بەردەوام بیر لەوهەموو ڕێز وگەورەییە بکەرەوە کەبۆ کرێکار هەیە وباسمان کردن.
٢- هەرکارێکت کرد بەرێك وپێکی ئەنجامی بدە و وامەزانە بێگارت پێ دەکەن. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (**إِنَّ اللهَ يُحِبُّ إذا عَمِلَ أَحَدُكُمْ عَمَلاً أَنْ يُتْقِنَهُ**).
واتە: بەڕاستی خوای گەورە پێ ی خۆشە، کاتێ یەکێ لە ئێوە کارێك دەکات بەدڵسۆزی وڕێکوپێکی یەوە بیکات ودەغەلّی وگەندەلّی تێدانەکات.
جا تۆی کرێکار خوای گەورە خۆشی دەوێ ی تۆش کارێك بکە کەخوای گەورە پێ ی خۆش بێت. وەتۆی کرێکار ئاگاداربە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (**مَنْ غَشَّنا فَلَيْسَ مِنّا**) هەرکەسێ غەشمان لێ بکات لەئێمە نیە. تۆی کرێکار ئەمینداری موڵك ومالّی خەلّکی زۆرجار لەناو خێزانی خەلّکی دا لەمالاّندا کاردەکەیت، إِنْ شاءَ اللهُ دوربە لەغەش وخیانەت وسیقە ومتمانەی خۆت لەدەست

نەدەیت، واکاربکە، ئەگەر خاوەن کاریش لەویٚ نەبوو، دڵـی ئـاوا ئیسـراحەت بـیٚ کەخۆی لەویٚ یە، وچاوی لیٚتە، چونکە دەزانیٚ چەند بەدڵسۆزی کاردەکەی.

٣- کریٚکاری بەڕیٚز، ئاگات لەنویٚژ وعیبادەتەکانت بیٚ. چونکە لەگەڵ ئەو هـەموو ماندوبونەشدا ئەگەر خوانەکردە عیبادەتی خوا نەکەیت، ئـەوا پەنابـەخوا دونیـات ماندوبون وقیامەتت ڕەنج بەخەساربوون دەبیٚت.

خاڵیٚکی تر کەپیٚویستە باسی بکەین ئەوەیە: ئایـا واجـبی خـاوەن کـار بەرامبـەر بەکریٚکار چی یە؟! بیٚگومان زۆریٚك لە ئیٚمە ڕۆژیٚك لەڕۆژان کریٚکارمان هەبوە، ئایا چۆن ڕەفتار لەگەڵ کریٚکاردا بکەین؟!

١- حورمەت وڕیٚزی بگرە، وامەزانە کۆیلەیە. ئەوە خوای گەورە وەکو تاقیکردنەوە فەزڵی لەگەڵ تۆ کردوە کەئەوەندەی پیٚداوی ئیشـەکانت بـەکریٚکار دەکـەی وخـۆت خاوەن کـاری، وەسوپاسـی کریٚکارەکـەش بکـە بـەوەی کـەپیٚ ی بڵـیٚ، تـۆ بـرای خۆشەویستی منی وئیشەکەی من بەتۆی بەڕیٚزجیٚ بەجیٚ دەبیٚت.

٢- هەرکە ئیشەکەی تەواو کرد. زوو کریٚکەی بدەیـە. لـە بەرئـەوەی ئـەوکریٚکارە بۆیە کریٚکاری دەکات کەپیٚویستی پیٚ یـەتی. وەکـاتیٚ ئیٚـوارە کریٚکـەی وەرگـرت ئیسراحەت دەکات وماندوو بونی ئەو ڕۆژەی لەبیردەکات. پیٚغەمبەری خـوا (ﷺ) فەرمویەتی: (**أَعْطُوْا الأَجيرَ أَجْرَهُ قَبْلَ أَنْ يَجفَّ عَرَقُهُ**). رَواهُ ابنُ ماجَّة (٢٤٤٣).

واتە: ئەی خاوەن کار کریٚ ی کریٚکار بدە، کـاتیٚ دەسـتی لەئیشـەکەی هـەڵگرت، پیٚش ئەوەی عـەرەقی لاشەی ووشك ببیٚتەوە.

واتە: لەزووترین کاتدا کریٚکەی بدەیـە لەسـەر ئیشـەکە بیدەیـە بـۆی مـەنیٚرە بـۆ ماڵەوە. کە بەڕاستی لە میٚژوی مرۆڤایەتی دا هیچ سەرکردەو فەیلەسوف و ئـەدیب ونوسـەر وشـاعیر وخـەمخۆریٚکی کریٚکـاران نـەیتوانیوە و ناشـتوانیٚ ئـاوا بەچـەند ووشەیەکی پوخت وکورت باسی مافی کریٚکار بکات.

هەزاران سەلات و ڕەحمەتی خوای لەسەربێ، کەئەوە لە (جَوامـِعُ الكَلـِم)ی ئـەو پێغەمبەری خوایەیەو تەنها ئەو ڕێز بۆ خاوەن ڕێز و ماف دەگێڕێتەوە.

٣- ئەی خاوەن ماڵ ئامان هەرگیز کرێـی کرێکـار نـەخۆیت، هـی واهەیـە کـاتێ کرێکار کارەکەی تەواو کرد، گوێی خۆی لێ دەخەوێنێ کرێکارەکـە بـێ وەرگرتنـی کرێ کەی بەدڵ شکاویەوە دەڕواتەوە بۆماڵ، وە دوای چەند جار داواکردن، کرێکارو زەحمەت کێش نائومێد دەبێت لەپارەکەی کەڕەنجی شانی خۆیەتی وئەو ستەمەی — کەخواردنی ڕەنجەکەیەتی — هەر لەدڵیا دەمێنێتەوە.

بۆیە خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا لەسەر مافی خوراوی ئەو کرێکارە دێتە وەڵام و پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەفـەرموێ: خـوای گـەورە لـە فـەرمودەی قودسـی دا فەرمویەتی: (ثَلاثَةٌ أنا خَصْمُهُمْ يَوْمَ القِيمَةِ. وَمَنْ كُنْتُ خَصْمَهُ خَصَمْتُهُ):

١) رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ.

٢) وَرَجُلٌ باعَ حُرّاً فَأَكَلِ ثَمَنَهُ.

٣) وَرَجُلٌ اسْتَأْجَرَ أَجيراً فَاسْتَوْفَى مِنْهُ، وَلَمْ يُعْطِهِ أَجْرَهُ. (رَواهُ البُخاريُّ) واتـە: خوای گەورە فەرمویەتی: سێ کەس هەن (سێ دەستەو تاقم هەن)کـە بـۆ خـۆم لـە ڕۆژی قیامەتدا ڕوبەڕویان دەبمـەوە. وە هەرکەسـێکیش مـن کـەخاوەنی جیهانیـانم ڕوبەڕوی ببمەوە بەشی لەناوچون و تیاچونە و لەناوی دەبەم، **ئەو سیانەش:**

١- کەسێك پەیمان بدات کەلەبەرخاتری من ببەخشێ، پاشـان پەشـیمان ببێتـەوە و ئەو خێرو صەدەقەیە کەلەسەر خۆی واجبی کردوە و بۆتـە بەشـی فـەقیرو هـەژاران نەیبەخشێ و پەشیمان ببێتەوە، من لەڕۆژی قیامەتدا بۆ خۆم دوژمنایـەتی لەگـەڵ دەکەم. — ئاوا خوای گەورە لەسەر هەژاران و مافی هەژاران دێتە وەڵام.

٢- کەسـێك کـەئازادێك دەفرۆشـێ و پارەکـەی دەخـوات، وەکـو ئـەو کەسـانەی کەکچیان — یان خوشکیان، بەشیربایی دەدەن بەشوو، ئەو شیربابییە دەخـۆن، ئـەوە

بەڕاستی ئەو ئافرەتەیان کرد بەکۆیلە لەکاتێکدا بەئازادی لەدایك بو بوو، وەپارەکەیان خوارد!

یان ئەو سەرکردانەی کە گەلەکانیان، هەژارانی گەلەکەیان بۆ مەصلەحەتی شەخصی خۆیان دەفرۆشن، بەکوشتیان دەدەن و لەسەر خوێنی ئەوان دەژین وەکو زەروی خوێن مژ. ئەوانەش خوای گەورە خۆی دوژمنایەتیان دەکات لەڕۆژی قیامەتدا!! خوا بمانپارێزێ

٣- کەسێك کەکرێکار بەکرێ دەگرێت و دوای ئەوەی کرێکارەکە بەتەواوی کارەکەی بۆدەکات و هیچ درێغی تێدا ناکات، ئەم خاوەن کارە کرێی ئەو کرێکارە نادات و هەتا دەچێتە ژێر گڵ ئەو کرێکارە ئەو ئازاری ماف خواردنەی هەر لەبیرە، کەدوای ئەو هەموو ماندو بوون و عەرەق ڕشتنە، مافی خۆی پێنەدراو حەقی خورا.

ئەو کرێکارانە خوای گەورە بەنەفسی خۆی (سُبْحانَهُ وَتَعالى) لەسەریان دێتە وەڵام و دوژمنایەتی ئەو کەسانە دەکات کەمافی ئەو کرێکارەیان خواردوە!.

واجبی حکومەت بەرامبەر بەکرێکار، پێویستە لەسەر حکومەت کە ئەم خاڵانە جێبەجێ بکات بەرامبەر بەکرێکار:

١- دەستی کرێکار بەرزو بڵند ڕابگرێ، هەروەکو پێغەمبەری پێشەوامان کەکاتێ دەستی کرێکارێکی گرت کەلەکارکردندا دەستەکانی قڵیشابوون و زبر بو بوون، دەستەکانی ماچ کردو پاشان بەرزی کردەوەو فەرموی: ئەی خەڵکینە بزانن و بەشاهید بن و ڕێزی ئەم دەستە زبرە قڵیشاوە بگرن، بەچاوی سووك سەیری مەکەن، چونکە ئەم دەستە: (هذانِ كَفَّانِ يُحِبُّهُما اللهُ وَرَسُولُهُ وَلَنْ تَمَسَّهُما النّارُ).

ئەم دوو لەپە دەستە زبربوە بەکرێکاری و کار کردن، خواو پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێن و ئاگری دۆزەخ بەرئەو دوو دەستە پیرۆزە ناکەوێت.

ئایا لەمێژوودا هیچ سەرکردەیەك هەبوە کەئاوا ڕێز لەدەستی کرێکار بگرێ و ماچی بکات و بەرزی بکاتەوە؟! بەدڵنیاییەوە نەخێر.

**کەواتە:** ڕابەرو دڵسۆزی چینی کرێکار تەنها پێغەمبەری ئیسلامە (ﷺ).

٢- پێویستە کەحکومەت لەهەموو فەرمانگەو دام و دەزگاو پرۆژەکانیدا، ئەو کرێکارەی کەدڵسۆزە بۆ کارەکەی، کەغیابی نیە، کەخۆی نادزێتەوە، بەڵکو وەکو ئیشی ماڵی خۆی ئاوا دڵسۆزانە کار دەکات. پێویستە ساڵانە خەڵاتی تایبەتی پێ ببەخشرێ و لە لەوحەی شەرەفدا ناوی هەڵبواسرێ و موچەی زیاد بکرێ و بەڕێزەو تەقدیر بکرێ.

٣- ئەو کەسەی لەگەنجیەوە، بگرە لە منالی و مێردمنالیەوە پیشەی کرێکارە، با لەدائیرەش نەبێ، پێویستە لە کاتی بەساڵاچوویی و پیریدا موچەی خانەنشینی بۆدابین بکرێت. وە دوای مردنی وەکو هەرکارگوزارێکی فەرمانگەی حکومی موچە بۆماڵ و منالی دابین بکرێ یاخود ئەگەر لەکرێکاریدا کەم ئەندام بوو، موچەی بۆ دابین بکرێ و نەهێڵرێ ئاتاج و موحتاج بێ، کەبەداخەوە لەکوردستانی ئێمە نەکراوەو ئومێدەوارم حکومەت ئاوڕێکی جیدی لەم بابەتە بداتەوە.

٤- پێویستی سەرشانی حکومەتە کەکارو کاسپی بۆ ئەو کەسانە دابین بکات کەتوانای کارکردنیان هەیە بەڵام ئیشی دەست ناکەوێ، یان ئیشێکی وای دەست ناکەوێ کەلەتوانای لاشەی ئەو دا بێت یاخود کاری پێ دەکرێت، بەڵام کەل و پەلی کارکردنی نیە، پێویستە حکومەت کەل و پەلی کارکردنی بۆ دابین بکات.

**ئیمامی غەزالی دەفەرموێ:** پێویستە لەسەر حکومەت کەرەستەی کارکردن ئامادە بکات بۆ هەموو کرێکارێك وەهەروەها کار ئامادە بکات بۆ هەموو بێکارێك..

**لەکۆتاییدا دەڵێم:** ئایا کێ دڵسۆزی چینی کرێکارە؟! ئایا ئەوانەی لەجەژنی کرێکاراندا – کەبەڕاستی جەژنیش نیە، بەڵکو ماتەمینی یە و یادی کارەساتێکە – باسی کرێکار دەکەن. ئایا ئەو کەسانە بەکردەوە ڕێزی کرێکاریان گرتووە؟! ئایا ڕۆژێ لەڕۆژان نەك هەر کاریان نەکردوە، ماندو نەبونیشیان لەکرێکارێك کردوە؟! ئایا دیاری کردنی تەنیا ڕۆژێك بەناوی کرێکارانەوە، لەکاتێکدا هەر لەو ڕۆژەدا بەهەزاران کرێکار لە هەموو ڕۆژێ ماندوترن.

وە ئایا ئەو بۆنەیە بەبێ پێشکەش کردنی هیچ خزمەتێك بەکرێکار، هیچ دادیان دەدات و لەئازارەکانیان کەم دەکاتەوە؟!

ئایا باسکردنی کرێکاران لەگۆشەیەکی هەواڵەکانی دەزگاکانی ڕاگەیاندن و گۆشەیەکی ڕوپەڕی ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا هیچ دادی کرێکاری ماندو دەدات؟! لەکاتێکدا لەباقی ڕۆژەکانی ساڵدا هەر لەڕێی ئەو تەلەفیزیۆنانەوە ئاخ دەکرێ بەدڵی خۆیان و ماڵ و منداڵیادا، ئایا ئەم یادکردنەوە بێ ناوەڕۆك و بێ بەرهەمە. وەکو گاڵتە پێ کردن نیە بەچینی زەحمەت کێش و کرێکار؟!

بۆیە پێویستە کرێکاران باش باش بزانن کە دڵسۆزی ڕاستەقینەیان تەنها و تەنها ئەو ئیسلامەیە کەڕابەرەکەی محمدە (ﷺ). کە باسمان کرد چۆن ڕێز لەکرێکار دەگرێت!.

وەتاقە سەرکردەش لەمێژوی مرۆڤایەتی دا کەبەکردەوە نەك بەدروشم و قسە – لەگەڵ چینی کرێکارو زەحمەتکێش دا ژیابێ. تەنها پێغەمبەری خوایە (ﷺ). ئەو پێغەمبەرەی کەبەهەژاری و لەماڵێکی هەژاردا چاوی بەم ژیانە هەڵهێنا. ماوەیەکی زۆری ژیانی بەشوانی بەسەر برد و ئاژەڵی بەکرێ دەلەوەڕاند.

ئەو پێغەمبەرەی کەئەوەندە ڕێزی کرێکاری لابوو دەستی کرێکـاری مــاچ دەکـرد، وەلەسیرەی پڕ بەرەکەتی دا هاتوەکە لەکاتی دروست کردنی مزگـەوتی مەدینــە دا، کریکاری کردوەو قوڕو بەردی کێشاوە وەلەکاتی هەڵکەندنی خەندەقی دەوری شاری مەدینە دا، وەکو کرێکارێك بەشداری کردەیی (فعلي) کردوەو چــاڵی هەڵکەنــدوەو خۆڵی دەرداوە.

**هەزاران صەڵات و سەلامی خوا لەسەر پێشەوای مرۆڤایەتی محمد** (ﷺ)...

# سەرچاوەکان

١- قورئانی پیرۆز.
٢- الترغيب والترهيب ، للحافِظ المُنْذري ، فەرمودەی ژمارە: ٢٥١٦ ، ٢٥١٥ ، ٢٥٠٦ ، ٢٥٠٧,
٣- مِنْ وَصايا الرَّسُول (ﷺ) ، طه عبدالله العَفيفى ، ج٢ ، ص,٤٨٩
٤- مِفتاحُ الخِطابَةِ وَالوَعْظ ، محمد أَحْمَد العَدويّ ، ص,٢٦٨
٥- مَنْهَلُ المُؤمنين وَ مورد الخُطَباء ، د. محمود أَحْمَد البرشَة ، ص,٣٩٩
٦- ژیانسازی ، چەند وانەیەك بۆ باشتر ژیان ، زانست زانا ، زاهیر زانا ، ل,١١٢
٧- قسەی سەردەم ، مەلا ئەحمەدی قامیشی ، ل (٤١-٤٢).

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجمعين.

**ئیمانداران:** لەمێژووی مرۆڤایەتی دا، مرۆڤەکان لەناو خۆیانـدا هەنـدێکیان گاڵتـە پێکەرو هەندێکیان گاڵتە پێکراو بوون. هەندێك خۆبەزل زان و لوت بەرز. بەچاوی سوك و گاڵتە پێکردنەوە تەماشای ئەوانی تریان کردوە، کەئەمەش بۆ چەند هۆیەك دەگەڕێتەوە، وەکو:

١- گاڵتە پێکردن لەلایـەن بـێ دینەکانـەوە بەئـەهلی ئیمـان و دینـداری لەسـەر عەقیدەو بیرو باوەڕەکەیان خوای گەورە دەفـەرموێ: ﴿ بَلْ عَجِبْتَ وَيَسْخَرُونَ وَإِذَا ذُكِّرُوا۟ لَا يَذْكُرُونَ وَإِذَا رَأَوْا۟ ءَايَةً يَسْتَسْخِرُونَ ﴾ الصافات: ١٢-١٤

واتە: تۆ سەرسامی لەبێ باوەڕیی کافران، کەچی ئەوانە گاڵتە دەکەن بـەو هـەموو بەڵگە بەهێزانە کاتێکیش ئامۆژگاری بکرێن ئامۆژگاری وەرناگرن و سەر بـادەدەن، کاتێك بەڵگەو موعجیزەیەك دەبینن دەیکەنە گاڵتەجاڕو باوەڕ ناکەن.

بەڵێ لەهەموو سەردەم و زەمانێکدا گاڵتە بەموسڵمانان. بەبیرو باوەڕو پەرستش و دروشمەکانیان دەکرێ خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُوا۟ مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾ الأنبيـاء: ٤١. واتـــە: ئـــەی پێغەمبەر (ﷺ) سوێند بەخوا بێگومان پـێش تـۆ گاڵتـە کـراوە بەپێغەمبـەرانی تـریش ئەوسـا ئـەوەی ئـەمان گاڵتـەیان پێـدەکرد. یەخـەی پـێ گـرتن وبـەهۆی ئەوانەیانەوە گاڵتەیان کرد.

بەڵام هەموو ئەوانەی کەگاڵتە بەدین ودینـداران دەکـەن وبەچـاوی سـوك سـەیریان دەکەن لـەدنیادا. لـەڕۆژی قیامەتـدا پەشـیمانی دەردەبـڕن ودان دەنـێن بەنـەزانی ونەفامی خۆیاندا.

**خوای گەورە ئەو مەشهەدەمان بۆبەیان دەکات کەیەکێ لەوانە دەڵێت:** ﴿ أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴾ الزمر: ٥٦

واتە: ئەوکەسانەی کەگاڵتەیان بەموسڵمانان کردوە دەڵێ: ئاخ وداخ وپەشیمانی بـۆ ئەو هەموو لادان ونادروستیانەی کەکردم لەفـەرمان وبەرنامـەی خـوادا. بێگومـان

لەوکەسانەش بوم کەگاڵتەیان بەدین وبەرنامەی خوا دەکرد وئیماندارانم بەدواکەوتوو کۆنەپەرست دەزانی. بەڵێ لەڕۆژی قیامەتدا نۆرەی موسڵمانان دێت کەگاڵتە بەوانەبکەنەوە کەلەدنیادا گاڵتەیان بەخۆیان وبیروباوەڕ وئاینەکەیان دەکردن. خوای گەورە دەفەرموێ: بێگومان ئەوانەی کەتاوانیان دەکرد گاڵتەیان بەئیمانداران دەهات وپێیان پێ دەکەنین — دەیانگوت ئەمانە چۆن خۆیان لەخۆشی ورابواردنی حەرام وتەماشای ئافرەتان وعەرەق خۆری وشایی وهەڵپەرکێ ی حەرام دورخستۆتەوە وبەحەرامی دەزانن!! کاتێکیش بەلای ئەوموسڵمانە پابەندە ڕەوشت بەرزانەدا ڕەت ببونایە لەناوخۆیاندا دەیان کردە چپە چپ وسرتە سرت وبەچاو ئیشارەتیان بۆ دەکردن — ئەوە ئیماندارەکانن کەبەتەمای قیامەتن!!. کاتێکیش کەدەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە بەدەم پێکەنین وگاڵتەوە دەگەڕانەوە لەماڵیشەوە هەرباسی ئیماندارانیان دەکرد وبەدواکەوتوو کۆنەپەرستیان دەزانین کاتێکیش ئیمانداران دەبیننەوە دەڵێن: بەڕاستی ئەوانە گومڕان ولەڕێگەی باب وباپیران لایانداوە!! خۆئەو خوانەناسانە ڕەوانە نەکراون تاچاودێرین بەسەر ئیماندارانەوە — کەبەدرێژایی مێژوو خەڵکانێك هەن لەکافران ومونافیقان تەنها ئیش وکاریان چاودێری کردنی موسڵمانان وهاتوچۆیان وقسە وگوفتاریانە ولەسەر تەقریر وراپۆرت نوسین لەسەر موسڵمانان دەژین!! بەڵێ ئەوەی باسمان کرد وبەچاوی خۆمان دەیبینین خوای گەورە لە قورئاندا لەسورەتی (المُطَفِفين - ئایەتی ٢٩-٣٣) بۆی تۆمارکردوین تاوەکو ئیمانداران وانەزانن کەهەرگیز گاڵتە وبەسوك سەیرکردن وچاودێری خستنە سەریان لەلایەن دوژمنانی دینەوە بەرەو ڕووناکرێ. نەخێر مادام ئیمانداری ڕاستەقینەی دڵنیابە ڕوبەڕودەبیتەوە.

بەلاَم هەرلەسورەتی (المطففين) دا لەئایەتی دوای ئەوەدا، واتە لەئایەتی (٣٤ تا ٣٦)دا دڵخۆشی ئیمانداران دەکات ودەفەرموێ:

﴿ فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ هَلۡ ثُوِّبَ ٱلۡكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴾

واتە: ئەمڕۆ کەڕۆژی قیامەتە، ئیتر نۆرەی ئیماندارانە، جائەمڕۆ ئەوانەی باوەڕدار بوون بەکافران پێدەکەنن. لەسەر کورسی وقەنەفە ڕازاوەکانی بەهەشت تەماشا

دەکەن ودۆزەخیەکان دەبینن لەسەر شاشەی تایبەتی پێیان دەڵێن: باشە ئایا کافران پاداشتی ئەوەی کەدەیانکرد درانەوە؟!...

**ئیمانداران:** بەڕاستی ئەوەی زیاتر دڵ ئازار دەدات ئەوەیە کەئیماندار گاڵتە بەئیمانداری برا وخوشکی بکات ویەچاوی سوك سەیریان بکات. کەئەمە دەردێکی کوشندە وپڕ ئازار وسویَ یە وبرین لەناو دڵی ئیمانداران دا بەرامبەر یەك دروست دەکات. کەخوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەم حاڵەتە دەکات وچارەسەریشی بۆ دادەنێت ودەفەرمویَ: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ) کەئەمە وانەی ئەمڕۆمانە. چونکە خوای گەورە بانگمان دەکات. دەبا بەئەو پەڕی ئەدەبەوە، بە تەواوی جەستە وهەستمانەوە بەدڵ گویَ بگرین بزانین پەروەردگارمان چیمان پێ دەفەرمویَ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَآءٌ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ وَلَا تَلْمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلْأَلْقَٰبِ بِئْسَ ٱلِٱسْمُ ٱلْفُسُوقُ بَعْدَ ٱلْإِيمَٰنِ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ الحجرات: ١١

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، باهیچ کەس وهیچ هۆزێك گاڵتە بەکەس وهۆزێکی تر نەکات وزەلیلی نەکات. چونکە لەوانەیە ئەوان چاکتر بن لەمان. ژنانیش باگاڵتە بەیەك نەکەن ویەکتر زەلیل نەکەن. چونکە لەوانەیە ئەمان لەوان چاکتربن، سوکایەتی بەخۆتان مەکەن ویەکتری عەیبدار مەکەن — چونکە سوکایەتی بەیەکتر سوکایەتی یە بەخۆتان — هەروەها ناو وناتۆرەی ناشیرین بۆیەکتر دامەتاشن. ئای کەچەند ناشیرینە ناو وناتۆرەی خراپ لەدوای باوەڕهێنان وموسڵمان بوون. ئەوەش تەوبەی نەکردبێت وپەشیمان نەبوبێتەوە لەگوناهەکانی، جائەو جۆرە کەسانە هەرستەمکارن)...

بەداخەوە ئەمڕۆ چەند کەس هەیە لەموسڵمانان. لەژن وپیاوی موسڵمان، کەبەڕاستی خەڵکی دەترسن بێتەماڵی، یان میوانی بێت. چونکە هەرکەپشتی هەڵکرد، دەیان تانە وتەشەری لیَ دەدات وسوکی دەکات لەبەرچاوی خەڵکی، خوای گەورە دەربارەی ئەوجۆرە کەسانە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمویَ:

﴿ وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ﴾ الهمزة: ١. واتە: هاوار وئاهوناڵە بۆ هەرکەسێك کەبەشوێن کەم وکوڕیدا دەگەڕێت ولەعەیب وعاری خەڵکی دەدوێت...

**ئیمامی قورطوبی دەفەرموێ:** سوفیانی سەوری فەرمویەتی: (الْهُمَزَة: الَّذي يَهْمِزُ بِلِسانِهِ. وَاللُّمَزَة: الَّذي يَلْمِزُ بِعَيْنَيْهِ).

واتە: الْهُمَزَة: ئەوکەسەیە کەبەزمان تانە وتەشەر لەخەڵکی دەدات وگاڵتەیان پێ دەکات. وە وَاللُّمَزَة: ئەوکەسەیە کەبەچاوی گاڵتە بەخەڵکی دەکات.

واتە، چاو دادەگرێ وئاماژە بۆکەسێك دەکات وداوا لەخەڵکی دەکات کەسەرنجی بدەن، وەکو ئەوەی کەکەم وکوڕی هەیە وشایانی پێ ڕابواردنە!!

**هەروەها زانای گەورە:** (إِبْنُ كَيْسان) دەفەرموێ: (الْهُمَزَةُ الَّذي يُؤْذي جُلَساءَهُ بِسُوءِ اللَّفْظِ).

واتە: زمانی وەکو نەشتەر وایە وزمانی لەهەرکەسێ کرایەوە پەڕپوتی دەکات ونازاری هاومەجلیسەکانی دەدات بەوشەی ناشیرین وڕوخێنەر وتانە لێدەر..

وە دەفەرموێ: (اللُّمَزَة): الَّذي يَكْسِرُ عَيْنَهُ عَلى جَليسِهِ وَيُشيرُ بِعَيْنَيْهِ وَرَأْسِهِ وَبِحاجِبَيْهِ... واتە: اللُّمَزَة ئەوکەسەیە کەچاوی دادەگرێ لەهاومەجلیسەکانی وئاماژە دەکات بەچاوەکانی وبەسەری وبەبرۆکانی بۆ گاڵتە پێکردن بەکەسێك لەمەجلیسەکەدا.

هەروەها (یەحیای موعەلیمی) دەفەرموێ: الْهُمَزَة: بریتی یە لەگاڵتە پێکردن بەخەڵکی بە ئاماژە پێکردن، وەکو ئەوکەسانەی کەدەستی دەبات بۆلای سەری وپەنجەکانی با دەدات و مەبەستی ئاماژە پێکردنە بۆ کەسێك کەئەوە گێل وگەمژە وناتەواو وشێتە!!

وە دەفەرموێت: اللُّمَزَة: گاڵتە پێکردنە بەخەڵکی بەقسە، وەکو ناوهێنانی خەڵکی بەناوی سوك ونازناوی ناشیرین. یان کە مئەندامێکی بەڕێز بەناوی کەمئەندامیەکەوە ناوبێنێ بۆئەوەی بچوك وسوکی بکات بەو ناوهێنانە. یان

تۆمەتباری بکات بەڕەوشتێکی خراپ ودڵنیاش نەبێ کەوایە. بەڵکو هــەربۆ ســوك کردن بێت..

**بەڵێ، گاڵتە پێکردن وبەسوك تەماشاکردن لەبەر یەکێ لەم هۆیانەیە:**

١- تانە لێدان لەکەسێکی موسڵمان، چونکە باوکی پیاوێکی خراپ وکافر وبێ دین بووە. کەسێکی زاڵم وستەمکار وماڵ خۆری میللــەت بــوە. موفەســیرینی قورئــان دەفەرمون: ئایەتی: (لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ )...

لەبارەی (عیکریمەی کوڕی ئەبی جەهلەوە) هاتەخوارەوە. کاتێ عیکریــمە موســڵمان بوو. هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) موسڵمانەکان کــاتێ چــاویان پێکــەوت وتیــان: (إِبْنُ فِرْعَوْنَ هذهِ الأُمَّـــة). ئەمــە عیکریمەیــە کــەکوڕی فیرعــەونی ئائــەم ئومەتەیە. واتە کوڕی ئەبوجەهلە، کاتێ عیکریمە گوێ ی لێ بوو کەموســڵمانەکان لەناوخۆیاندا بەچرپەوە گاڵتەی پێ دەکــەن و تەماشــای یــەکتر دەکــەن وچــاولەیەك دادەگرن وئاماژە دەکەن کەئەوە کوڕی ئەبوجەهلە، کە فیرعەونی ئەم ئومەتەیە.

عیکریمە شکوای حاڵی خــۆی لای پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) کــردو وتــی: مــن لــە ڕابردوی بــاوك بەرپرســیارنیم ومــن لــەناخی دڵمــەوە موســڵمان بــوم. ئــیتر بۆچــی موسڵمانان ئاوام پێ بڵێن؟! ئیتر ئەم ئایەتە هاتــەخوارەوە وقەدەغــەی کــرد کــەس بەچاوی سوك وقسەی ڕوشێنەر وگاڵتە ئامێز تەماشای برای ئیمانداری خۆی بکــات وقبوڵ نەکرا جارێکی تر لەلای عیکریمە باسی ئەبوجەهلی بــاوکی بکــرێ بۆئــەوەی ئەم ئازاری پێ نــەخوات! (سُبْحانَ اللهِ) لەگــەورەیی ئــەم ئیســلامە کــە چــۆن ڕێــز لەمرۆڤـ دەگرێت وشعور وهەستی دەپارێزێت.

**وە هەروەها لە تەفسیری** (قُرْطُبی) دا ج١٦، ص٣٢٦دا:

دەفەرموێ: ئایەتی (وَلَا نِسَآءٌ مِّن نِّسَآءٍ ...) لەبارەی – صَفِيَّة بِنْت حُيَيٌّ بنِ أَخْطَب – دایکی ئیمانداران، خێزانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتەخوارەوە. کاتێ کەخاتوو (صەفییە) بەدڵی پڕ وچاوی فرمێسکاویەوە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وفەرموی: (یارَسُولَ اللهِ (ﷺ) إِنَّ النِّساءَ یُعَیِّرْنِي وَیَقُلْنَ لِي: یایَهُودِیَّةُ بِنْتُ یَهُودِیَّیْنَ) ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خێزانەکانت، ژنەکانت، ژنەکان گاڵتەم پێ دەکەن وبەچاوی سووك سەیرم دەکەن وپێم دەڵێن: ئەی جولەکەی کچی دووجولەکە.

**واتە:** دایك وباوکت جولەکەن!. پێغەمبەری خوا (ﷺ) زەردەخەنەی بەدەمەوە کرد وفەرموی: (هَلا قُلْتِ إِنَّ أَبِي هارُونُ وَإِنَّ عَمِّي مُوسى وَإِنَّ زَوْجِي مُحَمَّدٌ). فەرموی: ئەی صەفیە گیان ئەی بۆچی لەوەڵامیاندا نەتگوت: من لەڕاستی دا شانازی دەکەم بەوەی کەباوکم هارونە ومامەم موسایە ومێردەکەم محمدە:- کەهەرسێکیان پێغەمبەری خوان!!.

**واتە:** بەم وەڵامەتێیان دەگەیەنیێ من بەجولەکایەتیم پلەی وەرگرتوە کەباوك ومامەم پێغەمبەرن. نەك پێ ی سوك بم. ئیتر ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە وقەدەغەی کرد کە تاڕۆژی قیامەت ئافرەتی ئیماندار بەچاوی سوك وکەم سەیری ئافرەتی ئیمانداری خوشکی دینی خۆی بکات، چونکە لەوانەیە ئەوکەسەی کەئەم گاڵتەی پێ دەکات وبەچاوی سوك سەیری دەکات زۆر لەوگاڵتە پێکەرە – خۆبەزل زانە باشتر وپاکتربێ لای خوا، وە لەدنیاشدا بەهرەوەرتر ودەست ڕەنگینتربێت. ئیتر لەسەر بنەمای چی بەچاوی سوك سەیری دەکات؟!!

٢- بەسووك سەیرکردن وگاڵتە پێکردن وپێکەنینی لاقرتێ بەکەسێك لەبەرئەوەی کەنەدار وهەژارە. کەجل وبەرگی شڕە. کەئوتومبێلەکەی شڕە، کەخانوەکەی کۆنە، کەکەلوپەلی ماڵەکەی زۆرکۆنە، بەڵام پێغەمبەری دڵسۆز وڕابەرمان ئەمەشی بۆ

ڕاست کردینەوە ئەویش لەم فەرمودەیەدا: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی کە هاوەڵێکی بەڕێزی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: (مَرَّ رَجُلٌ عَلى رَسُولِ اللهِ (ﷺ). فَقالَ: **ماتَقُولُونَ في هذا؟!)**

**واتە: پیاوێك بەلای پێغەمبەری خوادا (ﷺ) تێپەڕی. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ئایا لەبارەی ئەم پیاوەوە چی دەڵێن؟!**

**صەحابەکان ڕاستگۆیانە و ڕاشکاوانە وتیان:** (حَرِيٌّ إِنْ خَطَبَ أَنْ يُنْكَحَ، وَإِنْ شَفَعَ أَنْ يُشَفَّعَ وَإِنْ قالَ أَنْ يُسْتَمَعَ). واتە: بەڕاستی ئەم پیاوە شایانە بەوەی کەئەگەر داوای کچی هەرکەسێك بکات کچی پێ بدەی. وەئەگەر هەرتکایەکی هەبێ، تکای بگیرێ، چونکە بەڕاستی کەسێکی جوان ودەوڵەمەند وبنەماڵەو خانەدانەو پیاوانەیە.

**سەهل دەفەرموێ،** پێغەمبەری خوا (ﷺ) ماوەیەك بێدەنگ بوو، هیچ قسەی نەکرد، تا ئەوەبوو: (فَمَرَّ رَجُلٌ مِنْ فُقَراءِ الْمُسْلِمينَ، فَقالَ: ماتَقُولُونَ في هذا؟! قالُوا: (حَرِيٌّ إِنْ خَطَبَ أَنْ لا يُنْكَحَ، وَإِنْ شَفَعَ أَنْ لا يُشَفَّعَ وَإِنْ قالَ أَنْ لا يُسْتَمَعَ. فَقالَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ): **هذا خَيْرٌ مِنْ مِلْءِ الأَرْضِ مِثْلَ هذا)**. رَواهُ الْبُخاري.

**واتە:** پاش ماوەیەکی کەم کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵان هێشتا هەر لەوشوێنەدا بوون پیاوێکی تر لەهەژارانی موسڵمان بەلایاندا تێپەڕی، کە پێڵاو پۆشاکی دڕاو و کۆن بوو، هەژاری بەڕوخساریەوە دیار بوو، دەستی بەکرێکاری و کاسپی قلێشابوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی لەصەحابەکان کردو فەرموی: ئەی بەرامبەر ئەم کەسە چی دەڵێن؟ ئەوانیش ڕاستگۆیانەو ڕاشکاوانە وتیان: شایانە بەوەی کەئەگەر داوای کچ بکات بۆ هاوسەری خۆی پێی نەدرێت، چونکە هەژارەو پارەو پولێکی وای نیە، ماڵ و حاڵێکی کۆن و خانوە شڕەیەکی هەیە، وەئەگەر تکا بکات. تکای نەگیرێتەوە چونکە کەسێکی خانەدان و پیاو ماقوڵ نیەو خاوەن هۆز و کەس و کاری زۆر نیە!.

**پێغەمبەری خوا** (ﷺ) **فەرموی:** دەی بزانن و باش تێبگەن کەئەم هەژارە بەپڕاو پڕی ئەم سەرزەوی یە چاکترە لەو دەوڵەمەندە، ئەو هەژارە بەپڕی ئەم زەوی یە، بەڕێزترە، بەغیرەت ترە، ڕاستگۆترە، قسەزانترە، زیاتر جێگای سیقەو متمانەیە، سەخی ترە، لەو دەوڵەمەندە کەم دینە پارە پەرستە.

٣- هۆکاری سێ یەم بۆ ئەوەی کەسێك بەسوك سەیری کەسێکی تر بکات و گاڵتەی پێ بکات ئەوەیە کەئەو گاڵتە پێکراوە کەسێکی ناتەواوە لە لاشەداو لەڕو لاوازە، یان کەمئەندام — خاوەن پێداویستی تایبەتە، کە هەر زوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم هەڵەشی بۆ مرۆڤەکان ڕاست کردەوەو ڕونی کردەوە کەڕێزی مرۆڤ بەوەنی یە کەلەش و لاری قەڵەو و باڵای بەرزو چاوی گەش بێ، بەڵکە بەناخیەتی، بەکارو کردەوەی جوانیەتی، بەسود بەخشیەتی بۆ کۆمەڵگا، بەتەقواو خواناسیەتی، **ئیمامی عەلی دەفەرموێ:** ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کرد بەهاوەڵی بەڕێز[1] (عبدالله ی کوڕی مەسعود) کە بچێتە سەر ئەو دارەو شتێکی بۆ بێنێ — لەهەندێ ڕیوایەتدا داری سیواکی دەویست — جا کاتێ کە عبدالله چوە سەر دارەکە قاچی دەرکەوت چونکە بەرگەکەی هەڵکرا. صەحابەکان تەماشای قاچی عبدالله یان کردو هەموو دەستیان کرد بەپێکەنین و تەماشای یەکتریان دەکرد (مِنْ حُمُوشَةِ ساقَيْهِ). لەبەر باریکی قاچەکانی کەشتێ لەتیرۆکی نان کردن ئەستور تر بوون!!

ئا لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی تێکردن و فەرموی: (**ماتَضْحَكُونَ!! لَرِجْلُ عَبْدِاللهِ أَحْقَلُ فِي الميزانِ يَوْمَ القِيامَةِ مِنْ أُحُدٍ**) رَواهُ أحمد بأَسْنادٍ صَحيحٍ.

واتە: بۆچی پێدەکەنن و زەردەخەنەتان دێتێ و گاڵتە دەکەن!! بەقاچە باریکەکانی عبدالله ی کوڕی مەسعود ؟! دەی سوێند بێ ئەو قاچە باریکەی عبدالله لەتەرازوی کردموەکاندا لەڕۆژی قیامەتدا لەشاخی ئوحد قورسترە!!

وە لە هەردوو صحیحی (بوخاری و موسلیم) دا هاتوە کە صەحابی خۆشەویست،

أبو هُرَيرة – بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی:
**(إنَّهُ لَيَأتِي الرَّجُل العَظِيم السَّمين يَوْمَ القِيامَةِ، لايَزِنُ عِنْدَاللهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ وَقالَ: إقْرَأوُا:** ﴿ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا ﴾ الكهف: ١٠٥.

واتە: بەڕاستی لەڕۆژی قیامەتدا پیاوێکی گەورەی قەڵەو دەهێنن، بەڵام بەقەدەر باڵە مێشولەیەك کێشی نیەو نرخی نیە لەلای خوای گەورە، پاشان فەرموی: ئەم ئایەتە بخوێننەوە کە خوای گەورە لەسورەتی – الکهف – ئایەتی (١٠٥)دا دەفەرموێ: ئەو کەسانەی کەباوەڕیان بە بەڵگەو نیشانەکانی پەروەردگاریان نەبوو بەنیازی ئامادە بوونی بەردەم بارەگای خوایی نەبوون، ئیتر هەموو کارو کردەوەکانیان بێ نرخ و پووچ بووە، لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ جۆرە بایەخ و نرخێکیان بۆ دانانێین...

**کەواتە:** هەرگیز گاڵتە بەکەمئەندام مەکە، بەناو و ناتۆرەو لەقەبی ناشرین کەپێی تەریق دەبێتەوەو پێی دەشکێتەوە بانگی مەکە، بەڵکو هەوڵ بدە بە شیاوترین ووشە باسی بکە، بۆ نموونە: بەکوێر بڵێ: نابینا، بەلاڵ بڵێ: ناگۆ، بەکەڕ بڵێ: نابیست...

بەڕاستی هەر لەدنیاشدا زۆر کەس لەوانەی کەخەڵك بەگێل یان لاواز و کەمئەندامیان دەبینن و بەچاوێکی نامۆ سەیر یان دەکەن، زۆریان خاوەنی بەهرەن.
مەگەر نەمان بینیوە و نابینین چەند نابینا، خوێندنی لە پلە باڵاکاندا تەواو کردوەو هەیان بوە دکتۆرای وەرگرتووە، وەکو د. طەحسین ی میصری!!

وە ئەمڕۆ چەند خۆێندکاری زانکۆمان هەیە کەنابینان یان کەمئەندامن و لەزیرەکترین خوێندکارەکانی زانکۆن: ئەی لەکوردەواری خۆماندا چەند نابینا هەبوە، لەشەوی بارانی بەلێزمەو تاریکە شەودا، کەخەڵکی چاو ساغی گوندەکەی میوانی بوەو ئەو زەمانە کارەبا و لایت نەبوە، ئەو چاو ساغانە نەیانتوانیوە بڕۆنەوە بۆ ماڵی خۆیان. ئەم نابینایە دەستی گرتون و یەك بەیەك گەیاندونیەوە ماڵی خۆیان و لەناو پەڕاندونیەوە!! بەچاوی خۆمان بینیومانە، کەسی نابینا

خەلکی چاو ساغی بردوە بۆ عیادە بۆ لای دکتۆر بۆ کەرکوك و موصل و بەغداد لە پارێزگای سلێمانیەوە..

ئەی چەند نابیست و ناگۆ هەیە. دەست ڕەنگینە، پیشەی دارتاشی، ئاسنگەری دەکات و جوانترین بەرهەمی هەیە، چەندیان کارەبا چی یەو جوانترین داهێنانیانی هەیە چەند کەس لەو نابیست و ناگۆیانە بەیەك ئاماژە تێ دەگات و لەهەموو دەنگ و باس و بارودۆخێکی ناوخۆ تێ دەگەن و شی کردنەوە لەسەر هەواڵەکان بەئاماژەی دەستیان دەکەن و ئەوەی لەناخیاندایە بەئاماژە دەری دەبڕن!! چەن کەس هەیە کە بەڕواڵەت فەقیر حاڵ و گێل دەبینرێن، بەڵام ژمارەی هەموو ئۆتۆمبێلی ناسیاو و دراوسێ و خزمانی لەبەرە!! چەند کەس لەو فەقیر حاڵانە، ژمارەی مۆبایلی سەدان کەسی لەبەرە!!

**دەی کەواتە:** ئەو زۆر زیاتر لەتۆ خاوەن بەهرە ترە. ئیتر بۆچی بەچاوی سوك و کەم تەماشای دەکەی؟! خۆ بۆ قیامەتیش خوا ئەزانێ کە ئەو لەتۆ بەڕێز تر نیە لای خوا..

**وە خاڵێکی تر** کە پێویستە ئاماژەی پێ بکەین، ئەوەیە زۆرکەس بەچاوی سوك تەماشای هەژارو دەست کورت و قەرزار دەکات. کەبەڕاستی ئەمەش زۆر خراپە و زۆر نزیکە خوای گەورە ئەو دەوڵەمەند بکات و تۆ وەکو ئەو هەژار بکات.

**زانای گەورەی ئیسلام (ئیبن سیرین):** لەدوا ڕۆژەکانی ژیانی دا تووشی قەرزارییەکی گەورە دەبێت و قەرزاری ژیانی لێ تاڵ دەکات، بۆ خۆی دەفەرموێ: خۆم دەزانم بۆچی ئاوا قەرزار بوم، چونکە چل ساڵ لەمەوبەر بەپیاوێکم ووت: بڕۆ ئەی موفلیس چونکە لەمعامەلەدا ئیفلاسی کرد بوو. کەهات داوای یارمەتی لێکردم، گاڵتەم پێی هات و پێم ووت: بڕۆ هەی موفلیس! ئەوا ئەمڕۆ منیش بەچاوی خۆم ئیفلاسی خۆمم بینی! ئەبو سلێمانی دارانی. کە ئەم قسەیەی (إبنُ سیرین) دەبیستێت. دەفەرموێت: ناحەقیان نیە ، گوناهیان کەم بوو. دەیانزانی دووچاری کام گوناە بوون.

بەڵام ئێمە ئەوەندە گوناهمان زۆرە، نازانین کامیان گیرۆدەی کردوین..

٤- گاڵتە بەکەسێ بکرێ لەبەرئەوەی نەشارەزاو غەریبە. لەشوێنێك، لەدائیرەیەك، نەماڵی کەسێك دەپرسێ، کەچی پرسیار لێکراو بۆ پێ ڕابواردن سەری لێ تێك دەدات و دەینێرێ بۆ شوێنێکی تر. یاخود بۆ سازدانی بەزمێك دەینرێ بۆلای کەسێکی توڕەو پەست تالیی توڕە ببێت و جوێن بدات.

بەداخەوە ئەمڕۆ گاڵتە پێکردنێکی مۆدێرن هەیە. ئەویش هەندێ لەکار بەدەستان کەبۆ ئیشێك کەمافی خۆتەو ئەو لەسەر ئەو مێزە دانیشتوەو موچە وەردەگرێ بۆ ئەوەی لەخزمەت هاوڵاتیان دابێ.

کاتێ هاوڵاتیەکی دڵپاکی ڕاستگۆی دڵسۆز دەچێت بۆلای، دەڵێ ئەم کارە بەمن ناکرێ بەڵام نامەت بۆ دەنوسم بۆلای فلان بەرپرس بۆئەوەی هاوکاریت بکات و کارەکەت بۆ ڕای بکات. بەڵام لەڕاستی دا دەیەوێت لەکۆڵ خۆیت بکاتەوەو منەتێکیشت بەسەردا بکات. کەچی هەر کەچویتە دەرەوە، تەلەفۆن بۆ برادەرەکەی دەکات و پێی دەڵێ: فلان کەسم نارده لات بەڵام لەکۆڵ خۆم کردۆتەوەو هیچی بۆ مەکەو تۆش بەڕێ ی کە!!!.

ئایا ئەمە خراپترین جۆری بەسوك تەماشاکردن و گاڵتە پێکردنی خەڵکی نیە.

یان جاری واهەیە لە فەرمانگەیەکدا فەرمانبەرێك بێزارەو تاقەتی نیە ئیشەکەت بۆ بکات دەڵێ: برۆ بۆلای فلان کەس، ئەویش دەتنێرێ بۆلای فلان کەس، ئایا ئەمە گاڵتە پێکردن نیە؟! یاخود کار بەدەستێك کاتێ دەچێت بۆ سەردانی گوندێك یان شارۆچکەیەك کەبەزۆری خەڵکی هەژارو قوربانیدەری تێدا نیشتەجێیە. بەحورمەتەوە لەلایەن ئەو خەڵکە دڵپاکەوە کەسوتەمەنی شۆڕش بوون. گوێی بۆ دەگیرێ. ئەویش دەیان وەعدو بەڵێن دەدات کەئاواو ئاواتان بۆ دەکەین، کەچی هەمووی درۆیەو تەنیا گاڵتەیان پێ دەکات!! ئای میللەتی داماو بەوە دڵخۆشە کە ئەگەر مافی خوراو گاڵتەی پێکراو بەسوك سەیر کرا بچێ بۆلای کار بەدەست مافی

بۆ وەربگرێتەوە، ئەی باشە ئەگەر کاربەدەستەکە بۆخۆی گاڵتە بەهاوڵاتی خۆی بکات ئەبێ ئەو وولاتە چی لێ بەسەر بێ؟! خۆ بەحیساب و ناونیشان لەسەردەمی جیهان گیری و دیموکراسی و مافی مرۆڤدا دەژین و ئیدیعای دەوڵەتی مۆدێرن و پێشکەوتوو دەکەین. کەچی ئەم جۆرە سوکایەتی و گاڵتە پێکردن و بەسووك سەیری کردنی هاوڵاتی عادەت و باوی جاهیلەکانی پێش ئیسلام و سەردەمی نەفامی یە.

**لەسیرەی پێغەمبەری خوادا** (ﷺ) دا باسکراوە کە (إبنُ كثير له السيرَة النَبَوِيّة) کەیدا (ج١ ، ص٢٣٠) باسی کردو دەفەرموێ: پیاوێکی ئیراشی – کەشوێنێکە لە دەرەوەی مەککە هەندێ حوشتری بۆ فرۆشتن هێنایە مەککە، ئەبو جەهل لێی کڕی بەلاّم پارەکەی نەدایەو پێی ووت: دواتر بۆت دێنم: بەلاّم هەر دەستی پێکردو ئەمڕۆ سبەی بوو، هەتا ئەوە بوو کابرا مەئیوس ونائومێد بوو لەپارەکەی و زۆر بەغەمبارییەوە چووە لای کەعبەوە و هاواری کرد:

ئەی کۆمەڵی قوڕەیش من پیاوێکی غەریب و ڕێبوارم و کێ لەئێوە پشتیوانیم لێ دەکات لەسەر ئەو زوڵمەی کە (أبوالحَكم) مەبەستی أبو جهل بوو لێی کردم و هەرچی ماڵ و سامانمە بەناڕەوا خواردی؟! لەوکاتەدا کافرەکانی قوڕەیش لەلای کەعبەوە دانیشتبون و پێغەمبەری خواش (ﷺ) لەو لاوە دور لەئەوان دانیشتبوو. خەڵکەکە بۆ دروستکردنی گاڵتەو گەپێك بەکابرایان ووت: بڕۆ بۆلای ئەو پیاوە کەناوی محمدە. ئەوە زۆر نزیك و خۆشەویستی ئەبو جەهلە ئەگەر ئەو لەگەڵت بێت بۆ ماڵی ئەبو جەهل و قسەی لەگەڵ بکات پارەکەت بۆ وەردەگرێتەوە!!

ئەم سینارۆیەیان ڕێك خست بۆ ئەوەی بەزمێك دروست بکەن. چونکە دەیانزانی ئەبو جەهل چەندە ڕقی لە پێغەمبەری خوایەو پێغەمبەری خواش (ﷺ) بەکابرا دەڵێ: کاکە گاڵتەیان پێکردوی! بەلاّم کابرای ئیراشی ئاگای لەمەنەبوو بۆیە چوە

لای پێغەمبەری خواو پێی وت: من حاڵ و بەسەرهاتێکی ئاوام لێ بەسەرهاتووەو ئێستاش ناردویانم بۆلای تۆ، تکایە لەگەڵم وەرە بۆ لای ئەو برادەرەت و تەکلیفم بۆ بکە، بەڵکو ماڵەکەم یان پارەکەم بداتێ. پێغەمبەری خواش (ﷺ) یەکسەر لەگەڵی هەستاو ڕۆیشت بۆ ماڵی أبوجهل لەدەرگای داو أبو جەهل دەرگای کردەوە و پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: هەر ئێستا پارەی ئەو پیاوە غەریبە بدە.

أبو جەهل ووتی: بەسەرچاو. ڕۆیشتە ژورەوەو پارەکەی بۆ هێناو بەتەواوی هەقی کابرای دا. خێزانەکەی ووتی: ئەوە چیبوو. خۆ ئەوە محمد بوو، چۆن بوو دەرت نەکرد، چۆن بەقسەی ئەو پارەی ئەو پیاوەت دایەوە لەکاتێکدا بەتەما نەبووی یەك درهەمی بدەیتێ؟ أبو جەهل ووتی: وازم لێبێنن. ئەوەی من بینیومە، تۆش بتبینیایە هەموو ماڵەکەمانت ئەدایە دەست. کابرا زۆر بەدڵخۆشیەوە هاتەوە بۆلای خەڵکەکەی دەوری کەعبەو سوپاسی کردن لەسەر ئەو ڕێنماییەی کەئەوان بۆلای باشترین و بەرێزترین دۆستی ئەبو جەهلیان ناردوەو بەمافی خۆی شاد بووە.

خەڵکەکە هەموو دەمیان داپرچی و چاویان ئەبڵەق بوو چۆن ئەمە ڕوویدا؟!!

بۆیە ڕۆیشتن بۆلای ئەبو جەهل و تانەو تەشەریان لێدا کەلەمحمد ترساوەو ئەوان بەتەمای دروست کردنی گاڵتە جاڕی ئەوەیان کردووە!! ئەبو جەهل ووتی: کاتێ دەرگام کردەوە لەسەر هەردوو شانی محمدەوە دوومارى گەورە دەمیان کردبۆوە هەر بموتایە " نا " یەکسەر ئەیان خواردم! بۆیە یەکسەر پارەکەم دایەوەو لەخۆمم دور خستەوە. ئیتر خەڵکەکە بەأبو جەهل پێکەنین و بەم شێوەیە ئەو ماف خۆرە ڕیسوا بوو.

بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ بەهەمان شێوەی سەردەمی نەفامی خەڵکی مافی دەخورێ و ماڵی دەخورێ کەپەنا بۆ سەندنەوەی مافەکانی خۆی دەبات، گاڵتەی پێ دەکرێ و سوکایەتی بەئەقڵی دەکرێ!!

٥- خالّی پێنجەم کەواو دەکات کەسانێك بەسوکایەتی تەماشای کەسانی تر بکەن بەهۆی ئەوەوەیە کەئەوە کەسانە خۆیان زۆر بەخوا پەرست دەزانن و خەڵکیشیان بە فاسق و تاوانبار دێتە بەرچاو لەصحیحی مُسْلِم دا هاتووە کە (جُنْدُبُ بن عَبْدُالله) بۆمان دەگێڕێتەوە. کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (قالَ رَجُلٌ: وَالله لا يَغْفِرُ اللهُ بفُلانٍ، فَقالَ اللهُ عَزَّوَجَل: مَنْ ذَا الَّذي يَتَأَلَّى عَلَيَّ أَلاّ أَغفرَ لِفُلانٍ؟! إِنِّي قَدْغَفَرْتُ لَهُ، وَاَحبطت عَمَلُكَ).

**واتە:** پیاوێك ووتی: سوێند بەخوای گەورە هەرگیز خوای گەورە لەفڵان کەس خۆشنابێ ئەوەندە گوناهبارە. خوای گەورە فەرمویەتی: ئەوەکێ یە لەجیاتی من و لەسەروی منەوە بڕیار دەدات کەلەفڵان کەس خۆشنابم. دەی وابەڕاستی من لەفڵان کەسی گەناهبار خۆش بوم و کردەوەی تۆش – ئەی ئەو کەسەی کەبەخۆت دەنازی و خۆت بەپیاو چاك دەزانی و فڵان گوناهبارت ئەوەندە بەلاوە پیسە – واکردەوەکانی تۆشم پوچ کردەوەو لێت وەرناگرم!!.

**دەی کەواتە:** بائاگاداری خۆمان بین هەرگیز بڕیار نەدەین کەخوای گەورە لەفڵان کەس خۆشنابێت بەڵکو ڕەحم و بەزەیی و لێخۆشبون و عەفوو غەفوری خوای گەورە، بەهەشت و دۆزەخ تەنهاو تەنها هی خوایەو کەس مافی ئەوەی نیەو بتوانێ بڕیار بدات کەفلان بەهەشتی یەو فلان ناچێتە بەهەشت و خوا لەوە خۆش بوو. یان خوا لەوە خۆش نابێ، بەڵکو دەبێ بڵێین خوا لەئێمەو لەئەویش خۆش بێت.

**زەرەرو زیانی گاڵتە پێکردن و بەسوك سەیرکردنی خەڵکی.**

١- سەرپێچیەکی ئاشکرای فەرمانی خوایە چونکە خوای گەورە لە قورئاندا نەهی لەو کارە کردووەو فەرمویەتی: (لَا يَسْخَرْ ....).

٢- هەرکەسێ ئەوە پیشەی بێت، دەبێت بەزاڵم. بەڵێ بەگاڵتە پێکردن و ناو ناتۆرە لەخەڵك نان و بەسووك سەیر کردن. خوا دەفەرموێ، هەرکەسێ لەوکارەی تەوبە نەکات ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ البقرة: ٢٢٩

٣- سەرچاوەی ئەم کارە ناشرینە خۆبەزل زانینەو خوای گەورەش خۆبەزل زانانی خۆشناویێت.
٤- ئەم کارە دەبێتە هۆی ناکۆکی و ڕق و قین لەنێوان گاڵتە پێکراو و گاڵتە کەردا. هەتا مردن ئەو کەسەی شکێنراوەو بەچاوی سووك سەیر کراوەو، هەوڵی تۆڵە کردنەوە دەدات وەئەو ڕق و قینە لەدڵیدا ناسڕێتەوە.
٥- هەرکەسێ گاڵتە بەکەسێك بکات دور نیە کەخوای گەورە هەر لەدنیادا تۆڵەی لێ بکاتەوە و وەکو ئەو کەسەی لێ بکات کەئەم گاڵتەی پێکردوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لاتُظْهِرِ الشَّماتَةَ لأَخيكَ فَيَرْحَمَهُ اللهُ وَيَبْتَليكَ). رَواهُ الترمذي وَقالَ حَديْثٌ حَسَنٌ.

واتە: هەرگیز بەناڕەحەتی و ئازارو نەبونی و داماوی براکەت دڵخۆش مەبە وکەیف نەتگرێ. چونکە نزیکە خوای گەورە ڕەحم بەویکات ورزگاری بکات وتۆ توشی ئەو بەلایە بکات!.

**سەرنجی ئەم ڕوداوە بدەن،** کەنوسەری بەناوبانگ. د.محمد عبدالرحمان العریفی لە (في بَطْنِ الحُوت)دا بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: کەسێك بەم شێوەیە بەسەرهاتی خۆی گێڕایەوەو ووتی: هێشتا تەمەنم لەسی ساڵ تێنەپەڕی بوو، کاتێك خێزانم یەکەم منالی بوو هێشتا ئەوشەوەم لەبیرە کەلەیەکێك لەگازینۆکان بوم.
ئەوشەوە پڕبوو لەقسەی بەتاڵ نەك هەرئەوە بەڵکو پڕبوو لەغەیبەت کردن وتوانج گرتن لەم ولەو لەزۆربەی کاتەکاندا من زیاتر ئەوانم ئەخستە پێکەنین، چونکە زۆر لێهاتوو بووم لەلاسایی کردنەوەی خەڵکدا. هەتا ئەمتوانی دەنگی خۆم بگۆڕم، بەدەنگی هەرکەسێك کەبمەوێت گاڵتەی پێ بکەم وای لێ دەهات خەڵکی لێم دوورئەکەوتنەوە بۆئەوەی گاڵتەیان پێ نەکەم، ئەوشەوەم لەیادە کەکاتێك گاڵتەم

بەنابینایەك كرد، كەبینیم سوالّی ئەكرد لەبازاڕدا، لەهەمووی سەیرتر ئەوەبوو قاچم خستە بەرپێیەكانی بۆئەوەی بكەوێت كەكەوت سەری جولاندەوە ونەیدەزانی چی بلێ، منیش قاقای پێكەنینەكەم بەرزبویەوە لەبازارەكەدا. ئەوشەوە زۆر درەنگ گەڕامەوە بۆماڵەوە. هەروەك جارەكانی تر.

بینیم كەخێزانم چاوەڕێمە لەحالێكدا بوو گریانت بۆی دەهات، بەدەنگێكی كزەوە ووتی: لەكوێ بویت؟ منیش بەگاڵتە پێكردنەوە وەڵامم دایەوەو ووتم:

لەمەریخ بووم. قابیلە لەكوێ بووم. لای هاوڕێكانم بووم، مامندووبونێكی زۆری پێوە دیاربوو. پاشان ووتی: هاوسەرەكەم بەڕاستی زۆر هیلاكم وادەرئەكەوێت كەكاتی مناڵ بوونم نزیك بوبێتەوە.

ئیتر دلۆپێك فرمێسك بەسەر گۆناكانی دا هاتەخوارەوە بەبێ دەنگی لەوكاتەدا هەستم كرد كەمن خێزانەكەمم فەرامۆش كردوە كەباشتر وابوو لەم كاتەدا تۆزێك چونە دەرەوەم بەشەواندا كەم بكردایەتەوە.

گرنگیم پێ بدایە بەتایبەتی كەمانگی خۆیەتی، خێرا گەیاندمە نەخۆشخانە چوە ژورەوە بۆ هۆڵی مناڵ بوون، تاوای لێ هات چەند كاتژمێرێك ئازار بچێژێت. زۆرم چاوەڕوانی كرد، بەڵام زۆر بەقورسی مناڵی دەبوو.

ئەوەنەم چاوەڕێی كرد هەتا ماندوو بوم، ناچار گەڕامەوە بۆماڵەوە، پاش ئەوەی ژمارەی تەلەفۆنەكەم بەجێ هێشت. پاش كاتژمێرێك تەلەفۆنیان بۆكردم تاپێم ڕابگەیەنن كەكوڕمان بووە، منیش خێرا گەڕامەوە بۆ نەخۆشخانە. هەركەبینیان من هەواڵی ژورەكەی دەپرسم، ووتیان: دەبێت جارێ بچیت بۆلای ئەوپزیشكەی كەژنەكەمی لەلابوو.

منیش هاوارم کرد کام پزیشکه؟ گرنگ ئەوەیە کەمن کوڕەکەم ببینم. ووتیان: نابێت یەکەم جار دەبێت بچیت بۆلای ئەو کەچوم بۆلای پزیشکەکە پێشەکی باسی بەلاو فەرمانی خوای گەورەی کرد کەئەو قەدەری بۆ ئادەمیزاد داناوە ئەبێت پێی ڕازی بین.

پاشان ووتی: کوڕەکەت وادەردەکەوێت کەچاوەکانی تەواو نەبێت. هەردووکی نابینا بێت. سەرم داخست دڵم پڕبوو لەگریان، یەکسەر ئەونابینایەم بیرکەوتەوە کەسوالی دەکرد کەپالّم پێوە نابوو. تالەبازارەکەدا خەڵك پێبکەنیٚ. سُبحان الله هەرچی بکەی هەرئەوە دێتەوە ڕێگاکەت...

**لەکۆتایی دا:** خۆت بپارێزە ولەکەموکورتی ناتەواویەکانی خەڵك، سەرگەرمی چاکسازی وچاککردنی ناتەواوی وکەم وکورتیەکانی خۆت بە. چونکە هەریەکە لەئێمە ئەوەندە کەم وکورتی وناتەواوی هەیە ئەگەر بەجددی لەخۆی. بپرسێتەوە هەرگیز کاتی نامێنێتەوە بۆ بەدواداچون وکەم وکورتیەکانی خەڵك کەدۆزینەوەی کەم وکورتی خەڵك وبەرامبەرەکان هەندێك جار پێویستی بەماندوو بوون وفزولیەت هەیە، بەلام دۆزینەوەی کەم وکورتیەکانی خۆمان هەمیشە لەتەکیدا دەچین ولەتەك هەناسەکانمان دایە وهەندێك کەم وکورتی هەیە لەتەك خەیالّدا هاتوچۆ دەکات.

مرۆڤ تەنها خوای دروستکار وخۆی دەزانێت کەژینگەی دەروونی چی تێدایە وڕەنگی چۆنە وبۆن وبەرامەی چۆنە، بۆیە هەرکات دەرونمان – ناخمان – پالی پێوەناین نیشانە بگرینەوە لەکەم وکورتی و ناتەواوی کەسێکی دیکە باخێرا بەهۆش بێینەوە وسەرێك بکێشینە ناومالّی خۆمان وبزانین ژینگەکەی خۆمان

لەدیوی ناوەوەی چۆنە، ئایا ئەگەر نیوەی ئەوزیرەکی وهەست وپێزانینەی سەرفی دەکەین بۆ دۆزینەوەی کەم وکورتی وناتەواویەکانی خەڵکی تر، زۆرکەمتر لەوماندوو بوونە لەخودی خۆماندا سەرف کەین قازانجی دونیا ودوارۆژمان نیە؟ ئایا دەرونمان ساف تر وبێ گرێ وبێ تەنگژەتر نابێت؟ ئایا کاتی زۆرمان بۆناگەڕێتەوە؟ ئایا چاکسازی خود پێویستی نیە؟ ئایا ڕۆحمان ئاسودە ودڵمان خاوێنتر ناکەین؟ بێگومان کەسێك نیە لەسەر زەوی دا بۆئەم پرسیارانە نەڵێت بەڵێ ڕاستە.

کەواتە ژیان وساتەکانی هەلن بادەست پێبکەین ودڵەکان وروحەکان ئاشت کەینەوە، باویژدان ئاسودەکەین.

# سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز.

٢- تەفسیری ئاسان ، م.برهان محمد أمین.

٣- نَظْرَة النَّعیم ، مجموعَة مِنَ العُلَماء ، ج١٠ ص٤٦٠٤ ، ص٤٦١٤.

٤- خُطَب الشَّیْخ محمد حسین یعقوب ، ج١ ، ص,٥٢

٥- لەگولزاری پیاوچاکاندا ، سەردار عبدالرحمن ، ل,٧٥

٦- ژیاننامـــەی پێغەمبـــەر (ﷺ) عبدالعزیز علاء الدین مصطفی ، ل١١١.

٧- لەسکی نەهەنگدا. د.محمد العریفی. وەرگێرانی: صەبیحە ڕەمەزان ل٨.

٨- وَصایَا الرَّسُولَ (ﷺ) د.محمد بکر إسماعیل ، ج٣ ، ص,٤٤٢

٩- بیست رایەلی مرۆڤ دۆستانە ، م.محمد رەئوف ، ل٧٣.


Avoid looking for peoples defects and work on correcting your own..

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أجمعين.

**لەژێر ڕۆشنایی ئایەتی:** ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ﴾ الفجر: ٢٧-٣٠

واتە: لەکاتی سەرەمەرگدا بەئیماننداری سەرفراز دەوترێت. ئەی خاوەنی دڵ و دەرونی پڕ لەئارامی ئەی ئادەمیزادی ژیرو هۆشمەند کەلەتەمەنی کۆتای ی دنیادا پەروەردگارت ناسی و بەجوانی دەتپەرست. بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت کەتۆ لەو ڕازیت وئەویش لەتۆ ڕازی یە، دەبچۆرە ڕیزی بەندە چاکە نازدار و بەڕێزەکانمەوە، بچۆرە بەهەشتە خۆشە ڕازاوەکەمەوە..

**لەژێر ڕووناکی ئەم موژدە خۆشەی خوای پەروەردگارمان دەڵێین:**

ئێمە لەم سەر زەوی یەدا میوانین و دەبێ بگەڕێینەوە بۆ بەهەشت. جاهەر وەکو چۆن میوان و سەفەری لەسەفەریشدا هەندێ نیشانەی وای پێوەیە هەر دیار دەمێنێ کە لە (موسافیر) بونی نەخات، وە ئەگەر هاتوو واخۆی دارنی لەهەموو ئاکارو شێوازێکی وولاتی خۆی. ئەوا بەکەسێکی ناشایستەو بێ وەفا دەناسرێ.

بەهەمان شێوە، مرۆڤی ئیمانداریش لەم سەفەرەی ژیانی دنیادا، پێش گەیشتنەوەی بەماڵی ئەصڵی خۆی کەبەهەشتی نەبڕاوەیەو سەرەتا لەوێوە هاتووە.

نیشانەی بەهەشتی بونی پێوە دیارەو خوای گەورە بۆ دڵدانەوەو حەسانەوەی لەو هەموو بەش مەینەتیەی دونیا. چەند بەهەشتێکی بچکۆلانەی بۆ داناوە کەبەتەعبیر فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بە (رَوْضَة) باخی بچکۆلانە ناو دەبرێ و موسڵمان پشوی تێدا دەدات، ماندو بونی سەفەری دونیای تێدا دەردەکات.

دەی با لەم باسەدا سەرنجی ئەو ڕەوزەو باخچە بچکۆلە بەهەشتیانەی دونیاو ناوگۆڕ بدەین، خوا بەنسیبمانی بکات و پشوی تێدا بدەین، تا بەیەکجاری دەگەینەوە بەماڵی حەقیقیمان کەبەهەشتی بەرینە إن شاء الله.

**بۆ ئەم مەبەستەش تەئکید لەسەر دووخاڵ دەکەینەوە:**

١- ئێمـه بڕوامـان بەغـەیب هەیـەو یەکێکـە لەبنچـینەکانی ئیمانەکـەمان، ﴿ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ ﴾ وە ئێمە بـەوە ئیمانـدارین کـە هەرچـی خـواو پێغەمبەرەکـەی فەرمویانە هیچ گومان و دوو دڵیەکمان لەڕاستی و دروستی و بەدی هاتنیان نیە.

٢- باشترین کەسانێك کەبیانکەین بەپێشـەواو چـاو سـاغی خۆمـان و چـاویان لێ بکەین، صەحابەکانی پێغەمبەر بوون – کەهەر لەدنیادا بەلاشـە لـەدونیادا بـوون. بەڵام هەموو هۆش و بیریـان لەبەهەشـت بـوو، بۆیـە زۆرتـر نمونـە بەصـەحابەکان دەهێنینەوە.

**بەڕێزان:** هەریـەك لەئێمـە لەژیانیـدا کۆمـەڵێك هیـواو ئـاواتی هـەبوە، کـەهیواو ئاواتەکانی بەدی هاتوون و پاش ماوەیەك تام و لەزەتیان بەسـەر دەچـێ و هەنـدێ جار لەوانەیە ببنەمایەی دڵنائارامی و ناخۆشیش. بەڵام جێگای خۆیەتی ئـەمجا بـیر لەبەدیهێنانی ئاواتە گەورەکەمان بکەینەوە کەبەهەشتی هەتا هەتایی یە.

(ڕەجائی کوڕی حەیوە) کەوەزیری عومەری کوڕی عَبْدُالعَزیز – خەلیفەی دادگـەری ئیسلام – بوو. دەفەرموێ: من لەگەڵ عومەری کـوڕی عَبْدُالعَزیز بـوم. لەوکاتـەدا کـەوالی – پارێزگـار – بـوو لەشـاری مەدینـە. نـاردمی بۆئـەوەی پۆشـاکێك – کراسێکی بۆ بکڕم. منیش کراسێکم بـەپێنج سـەد دیرهـەم بـۆ کـڕی. کـاتێ بـۆم هێنایەوە تەماشای کرد ووتی: جوانە وباشە ئەگەر نرخەکەی کەم نەبوایە – هێشتا پێ ی کەم بوو کەپێنج سەد دیرهەمی پێدرابوو!!!

**(سەرنج بدەن ئەم والیە ئاوا ماڵی میللەت بەفیڕۆ دەدات، چونکە خەلیفەش ئاوا ماڵی میللەتی بەفیڕۆ دەدا).**

ڕەجاء دەفەرموێ: سالاَن هاتن وچون عومەری کـوڕی عبـدالعزیز بـوو بەخەلیفـە، منیش هەرلەخزمەتیدا بوم. ڕۆژێکیان بانگی کـردم ونـاردمی بـۆ بـازاڕ بۆئـەوەی

کراسێکی بۆ بکڕم. منیش چوم کراسێکم بۆکڕی بە (پێنج) دیرهەم. کاتێ بۆم هێنایەوە تەماشای کردو فەرموی: زۆرباشە وجوانە بەڵام بەخوا پارەکەی زۆرە. چۆن پێنج دیرهەم بدرێ بەکراسێك؟! باشە بەچی وا گۆڕانی بەسەردا هات؟!

لەکاتێکا لەوالیەوە بۆتە خەلیفە، پلەی چەندەها قات بەرزبۆتەوە، ئەبوایە بەرگی گرانبەهاتری بکڕیایە. بەڵام چۆن واگۆڕا؟! ئا ئەمەیە ئەو نهێنی یەی کەدەتوانێ کاربەدەستی میللەت پەروەر دروست بکات. کاربەدەستێك هەرچەندە پلەی بەرزتر ببێتەوە، ئەمجا دونیا نەوسیتترو زاهیدتر دەبێ. نەك وەکو ئەمڕۆ کەکاربەدەست تاپلەی لەخوارەوەیە وبچوکە بەویژدانە. کەچی کەگەیشتە پۆستی باڵا، دونیای هەموو بۆدانێ ی پێ ێ تێرناخوات!.

بەڵێ ئەم هەڵوێستە کاری کردە سەر (ڕەجاء) وگریا. عومەر فەرموی: بۆدەگری؟ ڕەجاء فەرموی: بیری ئەوپۆشاکەم کەوتەوە کەپێش چەند ساڵێ لەمەوبەر بۆم کڕی. وەچیت لەبارەیەوە ووت. ئێستاش بۆ ئەم پۆشاکە هەرزانە چی دەڵێ ی: حەزرەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز نهێنی ئەم هەڵوێستەی بۆ ئاشکرا کردو فەرموی: ئەی ڕەجاء (إِنَّ لي نَفْسَاً تَوَّاقة، وَ ماحققت شَيْئاً إِلاّ تاقَتْ لِما هُوَ أَعْلى مِنْهُ) من نەفسێکی ئاوات خوازم هەبوو، هەرکاتێ بەئاواتێکی دەگەیشت لەشتێکا، ئارەزوی سەروتر لەوەی دەکرد. وەکو ئەوەی ساڵانێك هەموو هیوا وئاواتم ئەوەبوو کە (فاطمە ی کچی عبدالمَلِك) کەئامۆزام بوو، ببێتە هاوسەری ژیانم. تائەوەبوو ئاواتەکەم هاتەدی وفاطمەم مارەکردو باشترین هاوسەرمە.

پاشان نەفسی حەزی بەئەمیرایەتی و لێپرسراویەتی دەکرد وحەزم دەکرد هێزێك لەدەورم بێت و چەکدار وحیمایەم هەبێت، ئەویشم بەدی هات و بوم بەوالی. پاشان نەفسم چوە سەرخیلافەت وئەو ئاواتەشم بەدی هات و بوم بەخەلیفە بەڵام: (وَالآن يا رَجاء تاقَتْ نَفْسي إِلى الجَنَّةِ فَأَرْجُوا أَنْ أَكُونَ مِنْ أَهْلِها).

ئێستا ئەی ڕەجاء نەفسم ئاواتی بەهەشت دەخوازێت وئومێدەوارم لەئەهلی بەهەشت بێت.
**ئیمانداران:** باهەریەکێك لەئێمە وەکو عومەری کوڕی عَبْدُالعَزیز بیربکەینەوە لەنەفسی خۆمان وئەو هیواو ئاواتەی هەیبوە، ئایا چەند هیوا وئاواتمان لەدنیادا هەبوەو بۆمان بەدی هاتوە. گەنج بوی ئاواتت ئەوەبوە، فلاَن کچ ببێ بەنسیبت وببێتە هاوسەری ژیانت. پاشان ماڵ وحاڵ وخانەوادە ولانەیەکت هەبێ. پاشان هەرپارچەیەك زەویت ببێ بەسە، دواتر ئاواتت ئەوەبوو خۆزگە بۆت بکرایە بەخانوو. پاشان ئاواتت ئەوەبوو ئۆتۆمبێلێکی باشت ببێ، دواتر کەئامێرەکان پەیدابوون وەکو مۆبایل وکۆمپیوتەر وئەمە وئەوە.
ئیتر کە ئەمانەشت هەموی هەبوو، سەیرەکەی هەتا ئەمانە دەکڕی ودابین دەکەی ئەوەی یەکەمجارت باوی نەماوە وپێویستی بەگۆڕینە. ئیتر تادەمری ئیسراحەت ناکەی وناگەیتە لوتکەی ئاسودەیی و بەختەوەری. دەی کەواتە مادام مرۆڤ ئاوا حەزی بەهەموو شتێکی جوان وبەرز وبالاَو سەرنج ڕاکێشە، وەبۆئەوەی ئەم ئاوات هاتنەدی یەی دڵخۆشی بەردەوامی لەگەڵ بێ، وە ڕۆژێ لەڕۆژان لەدەستی نەچێ، وە خۆی پیرنەبێ ونەمرێ وبەجێ ی نەهێڵێ، ئەبێ شوێنێك هەبێت کەئەم ئاواتەی تێدا بێتەجێ، کەئەویش تەنها وتەنها بەهەشتی بەرینە.
بەلاَم وەکو سەرەتای باسەکە عەرزم کردن، خوای گەورە کۆمەڵێك بەهەشتی بچکۆلانەی لەدونیادا بۆ داناوین، پشوی تێدابدەین و وەکو وێستگەیەکی پشودان وهەناسەدان وئیسراحەت کردن تاگەیشتن بەبەهەشتە گەورەکە لەقیامەتی نەبڕاوەدا.
هەریەکێکیش باتاقی بکاتەوە وبزانێ لەغەیری ئەم بەهەشتە بچکۆلانانەی سەردونیا وئەم وێستگەی حەسانەوانە، کەخوا لەسەر زەوی لەم ژیانی دونیایەدا پێ ی بەخشیوین، ئایا لەهیچ شوێنێکی تردا پشوی داوە، نەك هەربەلاشە، بەڵکو بەناخ ودڵ ودەرونەوە؟! ئایا لەغەیری ئەم وێستگانە حەوانەوەی دڵ و ویژدان دەست

دەكـــەویٚ؟! بێگومـــان نـــەخێر. وەهەركەســـێكیش خـــۆی لـــەناو ئـــەم بەهەشـــتە بچكۆلانانەدا نەدۆزێتەوە، ئەوا پەنابەخوا دونیایەكی پڕ چەرمەسەری بەسەر دەبات ودەبیٚ بۆخۆی بگەڕیٚ بزانـــیٚ لـــەكام چـالٚی دۆزەخـــی دونیـــایی دا، پـــێش دۆزەخـــی قیامەت، كەبەچالٚی دۆزەخی دونیایی دەوتریٚ (حُفْرَة) خۆی دەدۆزێتەوە و هـــەولٚی خۆ ڕزگاركردن بدات.

**ئەو باخچە وبەهەشتە بچكۆلانەی یەرزەوی بۆ ئەهلی ئیمان ئەمانەن:**

١- كۆڕی زیكر ویادی خواو باسی ئیسلام وئیمان.

ئەنەس دەفەرمویٚ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (**إِذا مَرَرْتُم بِرِيـــاضِ الجَنَّـــةِ فَارْتَعُوا، قالُوا: وَما رِياضُ الجَنَّةِ؟ قالَ: حَلَقُ الذِكْرِ**). رَواهُ الترمذي.

واتە: كاتیٚ بەلای باخی بەهەشتدا ڕابـوردن، لیٚ ی لابـدەن ولیٚ ی بخـۆن. عـــەرزیان كرد ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەبەستت لـــەباخی بەهەشـت چـی یـە؟ بۆیـاخی بەهەشت لەســـەرزەوی هەیـــە؟! فـــەرموی بـــەلٚیٚ، كـــۆڕی زیكـــر ویـــادی خـــوا، ئـــەو دانیشتنانەی كەباسی خواو دینی خواو فەرمودەی پێغەمبەر وحەلاڵ وحەرامی تێدا دەكریٚ ئەوە باخی بەهەشتە. دەی لیٚ ی لابدە وتیا دابنیشە و ڕوح ودەرونت تێربكە وبەسەریا مەڕۆو تێمەپەڕە.. بەلٚیٚ ئەمڕۆ ئێمە دابڕاوین لەزیكر وكۆڕی زیكر ئـــەینا وەرە تاقی بكەرەوە. بەگیان ودلٚ دابنیشە، لەگەلٚ چەند برایەكی ئیمانی دا كەتەنها وتەنها خۆشەویستی خواو پەیامەكەی و پێغەمبەرەكەی كۆی كردبنەوە.

بەگیان ودلٚ ودابنیشە لەناو خۆتاندا باسی ئیسلام وئیمان بكەن بزانە چەند دەرونـــت ئاسودە دەبێت، وەرە باسی بەهەشـــت بكـــە چـــۆن وات لیٚ دیٚ دەلٚـــیٚ ی دەســـت بـــۆ میوەكـــانی بەهەشـــت دەبـــەیت، وەرە بـــەدلٚ زیكـــری خوابكـــە. نـــەك تەســـبیح ئەمدیواودیوو بكەی ودلٚت لەشوێنێكی تربیٚ، نەخێر بەلٚكو بەدلٚ زیكـری خوابكـە. بۆنمونە بلٚیٚ ﴿ لَآ إِلَهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾ جوان لەماناكەی تیٚ بگـــە ولەناخـــەوە بلٚـــیٚ، هـــیچ پەرستراویٚ نیە شایستەی پەرستن بیٚ، جگە لەزاتی (الله) دەی خوایە من غـەیری تۆ

هیچ کەس وهیچ شتیّ ناپەرستم. تۆ رازیقمی، تۆ خالیقمی، تۆ شیفادەرمی، ژیانم، مردنم، خۆشیم، عیزەتم، زیللەتم، هەموی هەریەدەستی تۆیە.
وەرە ئەمە لەدلّەوە بلّیّ ئیتر بزانە چۆن دەرونت ئارام دەبیّ، چۆن غەم وهەمت دەڕوات، مەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیفەرمووە: (مَنْ قالَ لاحَوْلَ وَلاقُوَّةَ إلاّ باللهِ كانَ دَواء مِنْ تِسْعَةٍ وَتِسعينَ داءً أَيْسَرُها الهَمُّ). رَواهُ الطَبَراني فِي الأَوْسَط وَالحاكم وَقالَ صَحيحُ الإسْنادِ.
واتە: هەرکەسیّ بلّیّ: لاَحَوْلَ وَلا قُوَةَ إلاّ باللهِ. ئەوە بۆی دەبێتە دەرمانی نەوەت ونۆ نەخۆشی. ئاسانترینیان غەم وپەژارەیە!.
اللهُ أكبر لەوبەرەکەتە. بەلّیّ ئەمڕۆ ئێمە بەدوای تێرکردنی جەستەمانەوەین. وزگمان تێردەکەین، دەچینە سەیرانگاکان وشوێنە جوان ودلّفرێنەکان. بەلاّم هەرهەست بەئارامیِ وئاسودەیی ناوناخمان ناکەین. ئایا پرسیومانە بۆچی واین؟
با بچینە خزمەت زانای پایەبەرز دکتۆر: محمد عبدالرحْمن العريفي کەدەفەرمویّ: برادەرێکی موسلّمان چوو بۆ بەریطانیا بۆ عیلاج، دکتۆرەکە ووتی: موسلّمانیت؟ وتی: بەلّیّ، ووتی: باشە پرسیارێکت لیّ دەکەم، لەزۆرکەسی تریشم کردوە ونەگەیشتومەتە وەلاّمێکی تەواو وتی: فەرموو. دکتۆرەکە ووتی: من وەك دەبینی دکتۆرێکی ناودارم وهەموو توانایەکی ماددی ومەعنەویم هەیە وهەرچی گەڕان وخۆشی هەیە دەیکەم ودەیبینم وکەچی دلّم خۆش نیە وبەختەوەر نیم.
موسلّمانەکە پیّ ی ووت باشە تۆ ئەگەر بتەویّ چاوت ڕوون بێتەوە چی دەکەیت؟ ووتی: سەیری گولّ وشتی جوان دەکەم. وتی: ئەی ئەگەر بتەویّ گوێت ئاسودەبیّ چی دەکەی؟ وتی: گویّ لەشتی خۆش دەگرم. ووتی: ئەی ئەگەر بتەویّ لوتت ئاسودە بکەی؟ وتی: بۆنی شتی خۆش دەکەم. موسلّمانەکە ووتی: باشە دکتۆر ئەگەر بتەویّ چاوت ئاسودە بکەی دەکریّ بۆن بکەی؟ ووتی: نەخێر. وتی: ئەی ئەگەر بتەویّ گوێت ئاسودە بکەی کێك بخۆیت ئاسودە دەبیت؟ ووتی: نەخێر. خواردن بۆگەدە وتێربونە. موسلّمانەکە ووتی: دەی تۆش پێویستت بەئاسودەیی

دڵتە وکەچی دەچی گوێ ولووت وچاوت ئاسودە دەکەیت، ئەگەر دەتەوێت بەڕاستی دڵت ئاسودە بێت تەنها بەیادی خوا ئەوەت دەست دەکەوێت خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴾ الرعد: ٢٨

پاش دیراسە وخوێندنەوەی چەند پەڕاوێك دکتۆرەکە موسڵمان بوو..

**ئیمانداران:** زانستی نوێ سەلماندویەتی کەزیکرو یادی خواو قورئان خوێندن باشترین ئارام کەرەوەی دەرونە.

ئەوەتا توێژەرەوەی هۆڵەندی (پرۆفیسۆر ڤان دیرهوڤین) دەڵێ دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر لەسەر ئەوکەسانەی کەتوشی نەخۆشی دەرونی (نەفسی) بوون، گەیشتمە ئەو ڕاستی یەی کەخوێندنەوەی قورئان وپیتی (هاء) لەووشەی (الله) دا، چارەسەرە بۆ قورسترین نەخۆشیەکانی نەفسی. وە بەوتنەوەی ووشەی (الله) بەتایبەت کاتێ (هاء) بەقوڵی بڵێ ی و هەناسەی بۆ هەڵکێشی مێشکی مرۆڤ بە تەواوەتی پشوو دەدات.

ئەم پرۆفیسۆرە دەڵێ: پیتی (هاء) لەووشەی (الله) دا کەدواپیتە، وێکچونێکی زۆر گەورەی لەگەڵ پیتی – H – ی هۆڵەندی هەیە کەبە (هاء) دەخوێنرێتەوە.

کەبەپێ ی زانست ، دەربڕینی پیتی (هاء) بەجوانی وهەناسەی قوڵەوە. ئەو پیتەیە کەهەردوو سی مرۆڤ بەدڵەوە دەبەستێتەوە ولێدانی دڵ ڕێك دەخات ولەدڵە کوتێ مرۆڤ ڕزگار دەکات.

**لەکۆتایی دا ئەم پرۆفیسۆرە هۆڵەندی یە دەڵێ:**

ئەوکەسانەی کەتوشی نەخۆشی دەرونی وقەلەقی و دڵەڕاوکێ بوون، ئەگەر بێتو ووشەی (الله) بڵێنەوە سەد جار تاهەزار جار، بەمەرجێ بیروهۆشیان بخەنە سەر ووشەکە وبەتایبەت پیتی (هاء) ی بەجوانی دەربڕن. ئەوا هەست دەکەن کەکاریگەری گەورەی هەبوە لەسەر ئارامکردنەوەی دەرونیان وهەست بەئارامی دەکەن. ئەم پرۆفیسۆرە هۆڵەندی یە دەڵێ: دای چەندین ساڵ لەلێکۆڵینەوەی بەردەوام گەیشتمە ئەو ڕاستی یەو وەکو ئەمانەتێکی زانستی گەیاندم..

(سُبْحانَ اللّٰه) ئێمەی موسڵمان چەند بەختەوەرین. ئەگەر نەخوێندەوارین ئەوەی پرۆفیسۆرێك دوای چەند ساڵ لێکۆڵینەوە دەیگاتێ، ئێمە بەسەدان ساڵ پێشتر کردومانە، هەروەکو ئەوخەتمە وکۆڕی زیکرانەی کەلەتەکیە وخانەقاکاندا دەکران.
– بەمەرجێ شێخی زانا وشارەزا بە قورئان وسوننەت سەرپەرشتی بکات و دووربێت لەبیدعە – کەئەو خەڵکە بەیەکەوە کۆدەبونەوە و لەناخی دڵەوە دەیانگوت (اللّٰه) ئیتر چۆن هەستیان بەئارامی دەرونی دەکرد وچۆن دووربون لەهەموو نەخۆشیەکی نەفسی.

**وەنمونەیەکی** بەرچاو کە هەمومان ئەیبینین لەرۆژگاری ئەمرۆدا کە دەیسەلمێنێ پشوی رۆح وئاسودەبونی دەرون تەنها لەویەهەشتی بچکۆلەدایە کەکۆڕی زیکر ویادی خوایە.

**ئەویش ئەوەیە:** دەبینین خەڵکێکی زۆر ڕوودەکەنە سەیرانگا وشوێنە دڵگیرەکان. هەرچی خواردن وپێداویستی ژیانی خۆشە هەیانە. بەڵێشاو پارە خەرج دەکەن. لەڕوی جەستەییەوە هەرچی کەم وکورِی بێت نیانە. کەچی دەستدەکەن بەعەرەق خواردنەوە وخۆیان سەرخۆش وبێ هۆش دەکەن. ئەوعەقڵە جوانە فڕێ دەدەن. ئینجا زەی دەدەن. حەزدەکەن وەکو شێت ڕەفتار بکەن وبێن وبڕۆن ودەم بخەنە تەوالێتەوە!!! ئایا بیرمان کردۆتەوە ئەمانە بۆچی وادەکەن؟ خۆهەرچی لەزەتی ماددی وجەستەییە وەریان گرتوە.

ئەی بۆخۆیان سەرخۆش دەکەن وئەو هەموو لەزەت وخۆشیە لەخۆیان تێك دەدەن؟! وەڵامەکەی ئاشکرایە کەبەشوێن تێرکردنی ناخدا دەگەڕێن و عەودالی ئاسودەیی ناخن، بەڵام هەرچەندە لەو ناومێرگ وگوڵ وگوڵزار وتاڤگە جوانەدان کەوەکو باخچەی بەهەشت وایە. هەست بەئارامی ناکەن وئیتر چونکە بەهەشتە بچکۆلانەکەی سەرزەویان نەدۆزیوەتەوە کە – حەلقەی زیکر وباسی دینداری

وخواناسی یه – وادەزانن لەرێگەی خۆسەرخۆشکردن وخۆبێ هۆش کردنـەوە پـێ ی دەگەن، کەنەك پێ ی ناکەن بەڵکو بەدبەختیان دەکات.
دەی هەزاران سوپاس بۆتۆ ئەی خوای پەروەردگار کەئێمەی ئیماندار لەسـایەی ئـەم ئیمـان وئیسـلامەدا ئەوەنـدە بەختـەوەرین کـەپێش قیامـەت هەرلـەدنیادا لەبەهەشتداین ولەبەرەکەتی ئەم ئیسـلامەیە کـە پەنابـەین بـۆ سەرخۆشـی وبـێ هۆشی وخۆبەنج کردن.
٢- بەهەشتە بچکۆلەی دووەمی سەر زەوی مزگەوتە. بەڵێ مزگەوت ئەگەر زوڵمی لێ نەکرێ و پاك و خاوێن و بۆن خـۆش ڕابگـیرێ وئـەو مەبەسـتەی مزگـەوتی بـۆ دانراوە لە شەرعدا لە مزگەوتا ڕەچـاو بکـرێ وئـەوەی تێـدا بـوترێ و بخوێنـدرێ و بکرێ. ئەوە بەڕاستی مرۆڤ بە چونە ناو مزگەوتەوە هەرچی غەم و هـەمی دنیایـە لەیادی دەکات و بە تەواوی پشوو دەدات. چونکە تۆ لە مزگەوتا دەبیت بـەمیوانی خوای گەورە (سُبْحانَهُ وَتَعالی).
**خوای گەورە لە فەرمودەی قودسی دا فەرمویەتی:** (إِنَّ بُيُوتِيَ فِي الأَرْضِ المَساجِد، وَزَوّارِي فيها عُمّارُها، فَطوُبَى لِمَنْ تَطَهَّرَ فِي بَيْتِهِ وَزارَنِي فِي بَيْتِي، وَحَـقٌّ عَلـى المَزوُرِ أَنْ يُكْرِمَ زائِرَهُ).
واتـە: ماڵـەکانی مـن لەسـەرزەوی دا بەڕاسـتی مزگەوتـەکانن، وە ئەوکەسـانەی کەهاتوچۆی مزگەوت دەکەن. ئەوانە مزگـەوتیان ئـاوەدان کردۆتـەوە. خۆشـبەختی بۆئەوکەسەی کەلەماڵی خۆی خۆی پاك دەکاتەوە ودەست نوێژ دەگرێ وپاشان دێتـە میوانداریم لەناو ماڵەکەمدا کەمزگەوتـە. وەپێویسـتە لەسـەر خانـەخوێ کـەڕێزی میوانی بگرێ.
بەڵێ مرۆڤ ئەگەر میوانداری بکرێ لەلایەن کەسێکی باڵادەستەوە خۆشحاڵ دەبێت وشادمانی ڕووی تێ دەکات. ئەی باشـە (وَللهِ المَثَلُ الأَعْلى) ئەگـەر خـوای گـەورە، پەروەردگاری جیهانیان میوانداریت بکات ولەماڵی خۆی دا کە مزگەوتە پێشوازیت لێ بکات ئەبێ مرۆڤ هەست بەچ بەختەوەریەك بکـات؟ ئـەیێ لـەچ بەهەشـتێکدا

بێت. بەڵێ بە ڕاستی ئەگەر مزگەوت دەوری خۆی بدرێتێ وستەمی لێ نەکرێ. موسڵمان کەچوە مزگەوتەوە هەست دەکات کەلەبەهەشتدا ژیان بەسەر دەبات. وەکە مردیش دەگات بە بەهەشتی نەبڕاوە.

٣- سێ یەم بەهەشتی سەرزەوی، ڕەوزەی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (مَابَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الجَنَّةِ وَرَوْضَتِي عَلَى الحَوْضِ).

واتە: لەنێوان ماڵەکەم — ئەو ژورەی گۆڕی موبارەکی تێدایە لەگەڵ مینبەرەکەم کە ووتاری لەسەر دەخوێنمەوە. باخچەیەك لەباخچەکانی بەهەشتە. وە ڕەوزەکەم لەسەر حەوزی کەوسەرە.

بەڵێ ئەوانەی کە چونەتە حەج و پاشان سەردانی شاری مەدینە یان کردوەو چونەتە ئەو شوێنە کە نێوانی ژورەکەی خاتوو عائیشە و مینبەری پێغەمبەرە(ﷺ) شاهیدی دەدەن کەبۆنێکی تایبەتی وەهای هەیە کەهەرگیز لەژیانیدا بۆنی وەهایان نەکردوە ئەو کەسانەی بەو جێگایە شاد بوونو سەلامیان لە محمد المصطفی (ﷺ)کردوەو لەلای مینبەری پیرۆزیەوە نوێژیان کردوەدەڵێن سوێند بەخوا هەرچی غەم و خەفەتی ئەم دونیایە هەیە لەدڵتا نامێنێ، کامەی هەژارە، کامەی نەدارە، کامەی نەخۆشە، بیبەرە ئەو شوێنەکە ڕەوضە ی رَسُولُ اللّٰه یە، بەخوا بەتەختی پاشایەتی ناگۆڕێتەوە، هەست دەکات لە بەهەشتا دەژی، دەڵێ ی سەر زەویەکەی جاران نیە، دەڵێ ی ناخی گۆڕاوە بۆ مرۆڤێکی تر کەتازە لەدایك بوبێ.

بەڵێ هەر ئەو بۆن و دیمەنەی ئەو باخچەی بەهەشتی سەر زەوی یە یە، کەئەهلی صوفە، کەئەو صەحابە بێ کەس و بێ ماڵ و حاڵ و هەژار و نەدارانە کەلە سەکۆکەی پشتی مزگەوتەکەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) کۆببونەوەو موسڵمانە دەست ڕۆیشتوەکان خواردنیان بۆ دەبردن، کەئەوەندە هەژار و نەدار بوون، جاری واهەبوو لەبرسان ئەکەوتن و هەڵدەستانەوە. بەگاگۆلکێ دەهاتنە ناو مزگەوتەکەی پێغەمبەرەو (ﷺ) بەڵام هەر کەقاپی ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) دەکرایەوەو ئەو

هەموو نورو جەماڵەی حـەزرەتی رَسُولُ اللە (ﷺ) دەردەکـەوت لەخۆشـیاندا وەکو گوڵی سیس و تینوو کەئاوی ژێر دەکرێت، ئاوا دەگەشانەوە.
چەندان صەحابە هەژاری و نەداری وای لێ کردبوون کەبچنە دەرەوەی شاری مەدینە بۆ کارو باری باخ و باخات. بەڵام لەخۆشەویستی ئەو پێغەمبـەرە (ﷺ) و خۆشـی ئەو باخچەی بەهەشتە. کردبویان بەنۆرە، کەئەمڕۆ تۆ بڕۆ بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (ﷺ) من کاردەکەم و بەئەندازەی دوو کەس خۆم ماندو دەکەم، بـەیانی تـۆ لێـرە ئیشی هەردوکمان بکەو من دەچمە خزمەتی، ئەو هەموو ئیشـە قورسـەی دەکـرد، بەڵام بەیەك چاوپێکەوتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وە دوو ڕکات نوێژ لەنێوان مـاڵ و مینبەرەکەی دا لەو باخچەی بەهەشتەدا، وا دەحەسایەوە دەتگوت هەرگیز هـیچ کارێکی نەکردوە. بەڵێ ئەو شوێنە باخچەیەکە لەباخچەکانی بەهەشت، چـۆن خـوا ئاوا ڕێزی لێ ناگرێت کـەماوەی (١٠) سـاڵی بـەردەوام. پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بەسەریدا هاتوچۆی کـردوە لـەنێوانی مـاڵ و مینبـەر و میحرابەکـەی، لەشـەوانی تاریکدا، لەگەرمادا، لەسەرمادا ئەو قاچە پیرۆزانەی بەر ئـەو شـوێنەکەوتوە، ئـەو مینبـەرەی مـاوەی (دە ) سـاڵ ووتـاری لەسـەر خوێنـدەوە، تـەواوی ئـەم دینـی ئیسلامەی، لەگەورەو بچوکی یەوە بەو دەمە موبارەکەی کەدرێژترین ووتاری ئێمـە بەچەند ووشەی کورتی ئەو حەزرەتە تەواو دەبوو. هەموو ئەم ئیسـلامەی گەیانـدە ئێمە.
بەڵێ ماوەی (دە) ساڵی تەواو لەو میحرابە پـیرۆزەدا دوای نوێـژی بـەیانی لەگـەڵ صەحابەکاندا دادەنیشت و قسەی بۆ دەکردن و گوێ ی بۆ دەگـرتن و زەردەخەنـەی بەڕوودا دەکردن.
(اللە) لەو بەهەشتە، بەخوا خەڵکی ئەم حەقیقەتە نازانن ئەگینا لـەجیاتی خـەڵکی بچێ بۆ سەیرانگا بەناوبانگەکانی جیهان بۆئەوەی دڵی ئارام بێ و پشـویەك بـدات،

کەناشیدات، ئەوا خەلکی دەهاتن بۆ ئەم باخچەی بەهەشتە بەلام لەسەر زەوی کەخوای گەورە ئەوەندە ڕێزی لەئومەتی ئەو پێغەمبەرە گرتووە، لەبەر خاتری پێغەمبەر (ﷺ) کە بەوەفاتی خۆشی ئەو بەرەکەتە داناخرێ. هەتا قیامەت هەر وەختێ بچێ.

والله ی دەلێ ی ئێستا پێغەمبەر (ﷺ) بەو نێوانی مالْ و مینبەرەیدا تێ پەڕیوەو وا لەمیحرابەکەیدا دانیشتوە، کێ هەیە لەئێوەی حاجیانی بەڕێز کەچویتە خزمەتی گۆڕی موبارەکی و دوو هاوەلە خۆشەویستەکەی (أبوبكر و عومەر)، وە سەلامت لێ کردون، تەواوی لاشەت موچورکەی پێدا نەهاتبێ و هەستت نەکردبێ واڕوحت بەرەو بەهەشت دەڕوات.

هەستت نەکردبێ ئەوە پێغەمبەری خوات (ﷺ) چاو لێ یەو حەزرەتی أبوبكر و عومەر لەخزمەتیدان (ئەمەش سڕی ئەوەیە کەڕوحی ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) لەگەل ئومەتەکەیدا دەژی). لەم ساتەدا کەباسی باخچەیەك لەباخچەکانی بەهەشتمان کرد لەدنیادا کەڕەوچهی پاکی پێغەمبەرە (ﷺ) لەدنیادا، پێویستەو وەفادارییە باسی کەسێك بکەین کەزۆربەی فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەڕێگەی کتێبە بێ وێنەکەی ئەوەوە گەیشتونەتە ئێمە، کە (صەحیحی بوخاری)یە.

ئەو کەسەی کە لەهەموو ووتارێکی هەینی و بۆنەیەکی ئاینی ئیسلامی دا ناوی دەبیسترێ و دەوترێ. ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە. پێشەوا بوخاری ناوی (محمدی کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیمە).

(سُبْحانَ الله) هەر ناوەکان بەرەکەتیان لێ دەبارێ!! محمد دەچێتەوە سەر ئیسماعیل ئەویش کوڕی ئیبراهیمە. لەسالی (١٩٤) ی کۆچی لە (بوخارا) لەدایك بووە.

منالێکی ساوا دەبێت کەباوکی وەفات دەکات. دایکی دلی زۆر پێی خۆش دەبێت، بەلام محمدی مەلۆتکە هەردوو چاوی نابینا - کوێر - دەبێت.

دایکی زۆر بەکوڵ و بەدڵ لەخوا دەپاڕێتەوە تا چاوی کوڕەکەی چاك بکاتەوە، تا شەوێك لەخەودا حەزرەتی ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) دەبینێت و پێی دەڵێ: خوای پەروەردگار لەبەر زۆری پاڕانەوەکانت چاوی محمدی کوڕتی چاك کردەوە. دایکی محمدی کوڕیە لەخۆشیدا لەخەو خەبەری دەبێتەوە، پەلاماری منداڵەکەی دەدات و تەماشا دەکات بەویستی خوا هەردوو چاوی چاك بۆتەوە!... الحَمْدُ لله.

پێشەوا بوخاری لەبارەی (صەحیحی بوخاری) یەوە دەفەرموێ: لەماوەی (١٦) ساڵدا صەحیحی بوخاریم نوسیوە، کە پوختەی (٦٠٠) هەزار فەرمودەیە وە هیچ فەرمودەیەکم تێدا نەنوسیوە تاوەکو هەڵنەستابم خۆم نەشۆردبێ و نوێژی (إستخارة) نەکردبێ و دڵنیانەبوم لەڕاستی و دروستی فەرمودەکە، ئەمانەم هەمووی کردوە، ئەوجا فەرمودەکەم نوسیوە.

وە دەفەرموێ: صەحیحی بوخاریم (لەنێوان مینبەر و گۆڕی موبارەکی پێغەمبەردا (ﷺ) نوسیوە). لەو جێگایەی باخێکە لەباخچەکانی بەهەشت و لەسەر زەوی یە هەر بۆیە صەحیحی بوخاریش بۆنی بەهەشتی لێ دێ!

کاتێك ئیمامی بوخاری وەفاتی کرد، ئەوانەی ناسیویانە دەڵێن: بڕوابکەن بۆنی میسك لەگۆڕەکەی دەهات، کەتا چەند ڕۆژێك بەردەوام بوو. هەروەها (عَبْدُالواحِد بن آدَم واوسِي) دەڵێ: شەوێك بەخزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشتم. چەند کەسێك لە صەحابەکانی لەخزمەتیدا بوون. لە شوێنێکدا وەستابوون، سەلامم لێ کردو وەڵامی دامەوە.

ووتم: بۆچی ڕاوەستاوی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ). فەرموی: (أَنْتَظِرُ محمد بن إسماعيل) چاوەڕوانی محمدی کوڕی ئیسماعیل (بوخاری) دەکەم... پاش چەند ڕۆژێك هەواڵم پێ گەیشت و بەدوادا چوئم کرد. ڕێك لەو بەروارەدا ئیمامی بوخاری وەفاتی کردبوو. کەمن لەخەوما بەخزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشتم!!

٤- بینینێکی تری بەهەشت، پێش گەیشتن بە بەهەشتی هەتا هەتایی ئەو کاتەیە کە مرۆڤی ئیماندار وا لەسەرەمەرگدایە. کاتێ بێ نازی. کاتی تەنیایی کە کەس ناتوانێ هیچت بۆ بکات. نەکەسوکار. نەدکتۆر، نەپارەو پلە و پایە، ئالەو کاتەدا مرۆڤی ئیماندار بۆ ئەوەی لەو ساتە چارەنوسی سازەدا نارەحەت نەبێ، شوێنی خۆی لە بەهەشتدا نیشان دەدرێت وەفریشتەکان دێن لای سەریەوە دادەنیشن و موژدەی بەهەشتی دەدەنێ — ئیتر لەو کاتەدا ئەو ئیماندارە لە خۆشیدا وەکو چۆن ئاو لە سوراحیەوە دێتە خوارەوە بۆ ناو پەرداخێك، ئاوا ڕوحەکە لەلاشەکە دێتە دەرەوە.

بەڵام بابزانین خوای گەورە چۆن باسی ئەو کەسانەمان بۆ دەکات کەئەم مردنە جوانەیان هەیە و شوێنی خۆیان لەبەهەشتدا — کەهێشتا هەر لەسەر دنیان — نیشان دەدرێت..

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ﴾ فصلت: ٣٠-٣٢

واتە: ئەوانەی بەڕاستی ووتیان: پەروەردگارمان (الله) یە، لەوەو دوا بەردەوام پابەندی ئەو ڕێبازە ڕاستە بوون. ئەوە لەسەرە مەرگدا دەستە دەستە فریشتە دادەبەزن بۆ لایان، پێیان دەڵێن: هیچ ترس و بیمێکتان نەبێت لەداهاتوودا.

هیچ غەم و پەژارەیەکتان نەبێت بۆ ڕابردوو، مژدەتان لێ بێت بەو بەهەشتەی کەکاتی خۆی بەڵێنتان پێ دەدرا. ئێمە یار و یاوەر و هاوکار و پشتیوانی ئێوەین

لەژیانی دنیاو قیامەتیشدا. مژدەتان لێبێت لەبەهەشتدا هەرچی ئارەزووی دەکەن و داوای دەکـەن بۆتـان ئامادەیـە. ئـەو بەهرەیـەش لەلایـەن پەروەردگارێکـەوە پێشکەشتان دەکرێت کەلێبوردەو میهرەبانە.

بەڵێ: ئەگەر سەرنج بدەین ئەم موژدە گەورەیە بۆ کەسێکە کەلەنێوان خۆی و خوای گەورەدا دوو شتی کردوە.

١- قالُوا رَبُّنا الله.

٢- ثُمَّ اسْتَقامُوا.

بەردەوام بون لەسەر ئەو بەڵێنـە کەلـەناخی دڵـەوە بڕیـاری داوە غـەیری الله هـیچ پەرستراوێکی تر نیە شایانی پەرستن بـێ. وە (الله)ی بـەخالیق و ڕازیـق و ژێنـەر و مرێنەر و سود پێگەیەنەر و شیفا بەخش و ماڵ و منداڵ و سامان بـەخش ناسـیوەو هاوبەشی بۆ بڕیار نەداوەو هەتا مردن لەسەر ئەو عەقیدەیە دامەزراو بووە،

پاشـان ئـەم کەسـانە کەئـەم مـوژدە گەورەیـەیان پـێ دەدرێ لەسـەرەمەرگا، لەسـەختترین سـاتەوەختدا مـوژدەی بەهەشـتیان پـێ دەدرێ لـەنێوان خۆیـان و کۆمەڵگەی موسڵمانیشدا چیان کرد؟ **ئەمـە ڕەوشـتیان بـووە:** ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ فصلت: ٣٣ واتە: جا کێ لەو کەسە جوان گوفتارترو قسەی بەجێ ترە، کەبانگەوازی کردوە بۆلای خوا، کـارو کردەوەی چاکیشی ئەنجام داوە. وتوشیەتی: بەڕاستی من لەڕیزی موسڵمانانداندام..

**کەواتە:** ئەم مرۆڤـە ئیماندارانـە لـەنێوان خۆیـان و خـەڵکی دا بـانگخواز بـوون،

**شێوەی بانگخوازیە کەشیان:**

**١- دَعا إِلى الله:** بانگەوازی کردوە بۆلای خوا، تەنها بـۆلای خـوا، نـەك لەپشـتی بانگەوازەکەوە نیەتی خۆ دەرخستنی بو بێ، یان ئومێدی گەیشتن بەپلەو پایەیـەکی هەبو بێ. نەخێر، تەنها بانگەوازی بۆلای خوا کردوە. نەك بۆلای خۆی.

٢- وَعَمِلَ صالِحاً: كردەوەی چاكیشی ئەنجام داوە. واتە: ئەوەی بەقسە بەخەڵكی وتوە، خۆشی بەكردەوە ئەنجامی داوە، نەك وتبێتی بەقسەم بكەن و بەكردەوەم مەكەن!!

٣- وَقالَ إِنَّني مِنَ المُسْلمينَ: بە شانازیی یەوە ووتویەتی: بەڕاستی من لەڕیزی موسڵماناندام. بەدو دڵی و ترس و خۆشاردنەوەوە بانگەوازی نەكردوە. بەڵكو لەهەموو جێگایەكدا شانازی بەناسنامەی ئیسلامەتی خۆیەوە كردوە و تەنازولی نەكردوە.

**پاشان خوای گەورە شێوازی بانگخوازیەكەی باس دەكات و دەفەرموێ:**

﴿ وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴾ فصلت:٣٤.

بێگومان چاكەو خراپە وەك یەك نین (تۆ ئەی باوەڕدار) بەجوانترین و چاكترین شێوە بەرەنگاری خراپە و نادروستی بكە، ئەو كاتە ئیتر دەبینیت ئەوەی كە لەنێوان تۆ و ئەودا دوژمنایەتی و ساردیەك هەیە، دەبێتە دۆستێكی دڵسۆزو گیانی بەگیانی، بەڵام ئەمە، ئەم هەڵوێستە جوامێرانەیە بەكێ دەكرێ؟ خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴾ فصلت: ٣٥.

واتە: جاكەسیش ناتوانێت بەو ڕەفتارە هەستێت جگە لەوانەی كەئارامیان گرتووە. هەروەها كەسیش ناتوانێت هەڵوێستی وابنوێنێت جگە لەكەسێك نەبێت كەخاوەنی بەهرەیەكی گەورە بێت.

ئەی لەبەرامبەر شەیگاندا چۆن هەڵوێست وەردەگرێت؟ خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ فصلت: ٣٦

واتە: ئەی ئیماندار ئەگەر لەلایەن شەیگانەوە خەتەرەو خەیاڵی نادروست لەدڵ و

دەرونتدا دروست بوو. ئەوە تۆ داوای یارمەتی لەخوا بکەو پەنای پێ بگرە، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە بیسەرو زانایە..

کۆتایی ئەم ووتارەش لەخزمەت پێغەمبەری خواو یەکێ لەصەحابەکانی دا دەبین، بزانین چۆن ئەم صەحابەیە هەر لەدنیادا لەکاتی ڕوح دەرچونی دا گەیشت بە بەهەشتی خواو خۆشی و شادی یە نەبڕاوەکانی.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەك سەرکردەیەکی لێهاتوو خەمخۆرو باوکێکی دڵسۆز بەتەنگ گیرو گرفتی هەموو کەسێکەوە دەچوو. چاودێری حاڵ و گوزەرانی بژێوی هەموو هاوەڵانی دەکرد. کاتێك بینی یەکێك لەهاوەڵە هەژارەکانی کەناوی (سەعد) بوو، لەبەر هەژاری ناتوانێت هاوسەرو خێزان پێکەوە بنێت.

ئیتر خۆی ڕاستەوخۆ ئەو ئەرکەی گرتە ئەستۆ و کەوتە هەوڵدان بۆی. پاش ئەوەی داوای کچی یەکێك لە هاوەڵانی بۆکرد مارەیی و مەسرەف و ماڵ پێکەوەنانی خستە ئەستۆی سێ کەس لە هاوەڵان و بەسەعدی فەرموو: بڕۆ بۆلای عوسمانی کوڕی عەففان (دوو سەد) دیرهەمی لێ وەربگرە، بڕۆ بۆلای عبدالرحمنی کوڕی عەوف دوو سەد دیرهەمی لێ وەربگرە، بڕۆ بۆلای عەلی کوڕی ئەبوطالب دوو سەد دیرهەمی لێ وەربگرە.

ئیتر سەعد ڕۆیشت بۆلای هەرسێکیان و ئەوانیش خوایان لێ ڕازی بێت. هەریەکە زیاتری پێشکەش کرد لەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دیاریی کردبوو، ئیتر سەعد ڕۆیشت بۆ بازاڕ تاشتومەك و کەل و پەل و پێداویستیەکانی خێزانی بکڕێت، کاتێك لەبازاڕ بوو گوێی لەبانگەوازێك بوو بانگەوازی جیهادی لێ دەداو دەیگوت: ئەی سوارچاکی ئیسلام بەڕێ بکەون بۆ مەیدانی جیهاد، کاتێك سەعد بینی واهاوەڵانی هەموو کەوتنەخۆ بۆ بەدەنگەوە چوونی بانگەوازەکە. ئیتر ئەویش سەری بەرەو ئاسمان بەرز کردەوەو ووتی: ئەی پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی، ئەی

پەروەردگاری محمد (ﷺ) ، ئەم پارەیە ئێستا لەدەستمدایە بیگێڕە بەجۆرێك خەرجی بکەم کەجێگەی ڕەزامەندی و پێخۆشبونی خوای پەروەردگارو پێغەمبەرەکەی و براداران بێ، ئیتر لەباتی کڕینی کەل و پەلی ماڵ دەستی کرد بەکڕینی ئەسپێك و شمشێرێك و تیرو کەوانێکی کڕی و خۆی توند پێچایەوەو بەجۆرێك تەنها هەردوو چاوی دیاربوو ئیتر سواری ئەسپەکەی بوو، ڕۆیشت و خۆی گەیاندە برا موجاهیدەکانی. ئەوانیش نەیانناسیەوەو ووتیان: ئەو سوارە کێ یە نایناسین؟ ئیمامی عەلی فەرموی: وازی لێبێنن ڕەنگە خەڵکی بەحرەین یان شام بێت هاتبێت پرسیاری دینەکەتان لێ بکات، بەڵام پێی خۆش بێت خۆی ماوەیەك لەگەڵتان بێ، بەڵام بینییان واشمشێری هەڵکێشاوەو گەیشتە مەیدانی جەنگ و شێرانە دەستی کرد بە جەنگ تا ئەسپەکەی پێکراو پاشان خۆی قۆلی لی هەڵماڵی و زۆر قارەمانانە جەنگا.

لەم کاتەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناسیەوە کەئەمە سەعدە، فەرموی: تۆ سەعدی؟ ووتی: بەڵێ، دایك و باوکم فیدات بێ، ئیتر سەعد بێ گوێدانە دوژمن و بێ سڵ کردنەوە لەمردن مەردانە کەوتە گیانی دوژمنانی و تاپێکراو شەهید بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووە سەر تەرمەکەی و سەری لەسەر ڕانی موبارەکی خۆی داناو تەپ و تۆزی لە دەموچاوی بەجلەکانی خۆی سڕی و فەرموی: ئای کەبۆنت خۆشە و چەند خۆشەویستی خوداو پێغەمبەری خوایشی.

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) دەستی کرد بەگریان و ڕووی وەرچەرخان و فەرموی: (ورد الحوض ورب الكَعْبَة) ئاوی حەوزی کەوسەری خواردەوە سوێند بەخوای کەعبە، ئەبو لوبابە خوای لێ ڕازی بێت، پرسی: دایك و باوکم بەفیدات بێ ئەی پێغەمبەری خوا حەوز چییە؟ فەرموی: دیارییەکی خوای پەروەردگارە پێی بەخشیوم، پانیدکەی لەصەفاوەیە بۆ حەزرەمەوت (عەممانی ئێستا) لێوارەکانی بەدووڕو یاقوت داڕێژراوەو ئاوەکەی لەشیر سپی ترەو لەهەنگوین شیرین ترە. هەرکەس جارێك لێی خواردەوە هەرگیز تینوی نابێت، **ئینجا ڕووی وەرگێڕا.**

فەرمووی: گریانەکەم بۆ سەعد بوو، پێکەنینەکەم دڵخۆشیم بوو لەبەر بەرزی پلەو پایەو ڕێزو پاداشتی لای خوای گەورە. ڕوو وەرگێڕانەکەیشم، بینیم هاوسەرانی حورلعەینی دەوریان دابوو. لاقیان پڕی خڕخاڵ و پاوانە بوو، لەشەرما ڕووم وەرگێڕا.

ئیتر پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی دا چەك و کەل و پەلەکەی بنێرنەوە بۆ هاوسەرەکەی بەم شێوەیە ئەم صەحابەیە هەر لەگەڵ ڕوح دەرچوونیدا گەیشتە بەهەشت و خۆشیەکانی و لەئاوی حەوزی کەوسەری خواردەوە، خوای گەورە بەئێمەشی ببەخشێ.

ٱللَّهُمَّ آمِين

# سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز.

٢- تەفسیری ئاسان، بورهان محمد أمین.

٣- السلسلة الذَّهَبِيَّة ، محمود المصري ، ج٣ ، ص,٥٧٥

٤- وَصايا الرَّسُول (ﷺ) ، د. محمد بكر اسماعيل ، ج٢ ، ص,٣

٥- المائة الثانيَة مِنْ وَصايا الرَّسُول (ﷺ)، طه عَبدالله العَفيفى ، ج١، ص,٢٦٧

٦- حَقائق على الحَديث ، عبدالرحمن العَصَّافي ، ج٢ ، ص,٣١٤

٧- ژوانگەی سەروەران ، محمد سەنگاوی ، ل٣٤ ، ل١٥٨.

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبهِ أجمعين.

**ئيمانداران:** له ووتاری ڕابردودا لەژێر تیشکی ئایەتی: ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ﴾الفجر: ٢٧-٣٠ باسی ئـەوەمان کـرد کـە ئینسانی ئیماندار پێش گەیشتن بە بەهەشتی قیامەت. هەرلە دونیادا خوای گـەورە چەند باخچەیەکی بەهەشتی پێ بەخشیوە.

کە بەڕاستی تێیدا هەست بە ئارامی و ئاسـودەیی دەکـات. وە لەسەرەمەرگیشـدا وێنەی بەهەشتی نیشان دەدرێ و بەرەو بەهەشت پێشوازی لێدەکرێت.

بەڵێ، ئێمەی مرۆڤ سەرەتا لە بەهەشت بوین و دەبێ بگەڕێینـەوە بـۆ بەهەشـت. وە مرۆڤ مەگەر خۆی حەزی بەدۆزەخ بێ. ئەگینا خوای گەورە مرۆڤی بۆ بەهەشت دروسـت کـردوە.وە ڕازی نـابێ بەنـدەکانی ڕێگـای چـونە دۆزەخ بگـرن. (وَلايَرضَى لِعِبادِهِ الكُفْرَ).

جا پێش گەیشتنەوە بە بەهەشتی هەتا هەتایی. چـەند بەهەشـتۆلکەیەکی بچـوك (الرَّوضَة) بۆ ئیماندار لەدونیاو سەرەمەرگدا وەلەناو گۆڕدا هەیە. کە تیایاندا پشوو دەدات و ماندووبونی ڕێگا بڕینی دونیا بەرەو بەهەشت دەردەکات.

فەرمون هەندێ لەو باخچانەی بەهەشت کەخوای گەورە هەر لـەدونیادا بـە مرۆڤـی ئیمانداری بەخشیون:

**یەکەم:** کۆڕی زیکر و یادی خواو باسی شەریعەتی ئیسلام وشی کردنەوەی ئایەت و فەرمودە.**دووەم:** مزگەوت. کە بەڕاستی مرۆڤـی ئیمانـدار کـاتێ لـە مزگەوتدایـە هەست دەکات کە بەڕاستی لەبەهەشتدایە.

**سێیەم:** زیکری (لاحَوْلَ وَلاقُوَّة إلاّبالله). هاوەڵی پایەبەرزو خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) ئەبو موسای ئەشعەری دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بـانگی کـردم و فەرموی: (قُل لاحَوْلَ وَلاقُوَّةَ إلا بالله، فأنها كَنْزٌ مِنْ كُنُزِ الجَنَّةِ). رَواهُ البُخاري.

واته: بلێ: لاحَوْلَ وَلاقُوَّة إلاّبالله. چونكه ئەم زيكره گەنجينەيەكـه لەگەنجينـەكانى بەهەشت بەڕاستى دەستت لەگەنجينەكانى بەهەشت گیردەبێت..

**چوارەم:** ئەوكاتانەى كەڕوح واپاك دەبێ ولەگەڵ خوا واتێكـەلاّو دەبـێ، واى لێ دێ چاوى لەبەهەشتە. نمونەيەك: ڕۆژى جەنگى گەورەى بەدرە، صەحابەكان لەخزمـەتى رَسُولُ الله دان كەفەرموى: (**قُومُوا إلى جَنَّةٍ عَرْضُها السَّماواتُ وَالأَرْضُ**).

هەستن بڕۆن بەرەو بەهەشت. ئەو بەهەشتەى كەپانيەكەى ئاسمانەكان وزەويە. يـەكێ لەصەحابەكان ناوى (عومـەيرى كـوڕى حمـام) بـوو. فـەرموى: ئـەى پێغەمبـەرى خوا(ﷺ) بەهەشت پانايیەكەى ئاسمانەكان وزەوى يە؟!! فەرموى: بـەڵێ. عومـەير ووتى: بەخ بـەخ، ئـاى چ خـەلاّتێكى گەورەيـە وپەلـەى دەوێ زوو دەسـتى خـۆتى بگەيەنيە.

پێغەمبەرى خوا (ﷺ) فەرموى: (**مايَحْمِلُكَ عَلى قَوْلِ بَخْ بَخْ؟!**) ئەوە چى پەتى پێوەناى كەبڵێ ى بەخ بـەخ و سەرسـوڕمان بـونى خـۆت دەربـڕى؟ ئـەم صـەحابە دڵسۆزە فەرموى: لا وَالله يارَسُولَ الله إلاّ رَجاءَ أنْ أكُونَ مِنْ أهْلِها..

بەخوا هيچ شتێ واى لێ نەكردم كە بڵێم بەخ بـەخ. تـەنها ئـەوە نـەبێ كەئومێـدم هەيە لە ئەهلى ئەو بەهەشتە بم..

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموى: (**فَإنَّكَ مِنْ أهْلِها**) دەى تۆ بەڕاستى يـەكێكى لەئـەهلى ئەو بەهەشتە!. الله أكبر لەومـوژدە خۆشە. لەوبەشارەتە، كـە الصّـادِق الأمـين. محمـدى المصـطفى (ﷺ) مـوژدەى بەهەشـتت بـداتێ، كـەبێ گومـان دێتـەجێ. لەم كاتەدا ئەم صـەحابەيە كـە ئـەم موژدەيـەى بيسـت، يەكسـەر ڕۆحـى لەگـەڵ بەهەشتدا تێكەڵ بوو، تەنها بەلاشە لەم سەرزەوى يە مابوو. ئەينا تەواوى ناخى لە بەهەشتدا بوو. بۆيە چەند دەنكە خورمايەكى لەتوێشە بەرەكەى دەرهێنا ويەك دوو دەنكى لێ خوارد.

پاشان فەرموى: (لَئِنْ حَيِّيتُ حَتَّى آكُلَ تَمراتِي هذِهِ، إنَّها لَحَياةٌ طَويلَةٌ).

ئەگەر بژیم تاوەکو ئەم خورمایانە هەموی دەخۆم. ئەوە بە ڕاستی ماوەیەکی زۆری دەویێت و لە بەهەشت دوا دەکەوم. بۆیە ئەوچەند دەنکە خورمایەی پێ ی مابوو فڕێ ی دان. دواتر چوە مەیدان ودەستی کرد بە جەنگ لەگەڵ کافرەکان ودوژمنانی ئیسلامدا. هەتاوەکو شەهید بوو. ئەم فەرمودەیە پێشەوا (مُسْلِم وأَحمد) گێڕاویانەتەوە.

پێشەوا (إِبنُ حَجر) لە - الإِصابَة ( ج٢، ص٢٣) دا ژمارە: ٣١١٨ دا دەفەرموێ: لە ڕۆژی غەزای بەدردا، باوك وكوڕێك ئامادە بوون. باوکەکە ناوی (خەیثەمە) بوو. کوڕەکەشی ناوی سەعد بوو. لەبەرئەوەی ماڵ ومناڵی ووردیان زۆر بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: یەکێکتان بگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە، چونکە کاروانەکەمان لەدەست چوەولەوە دەچێ توشی شەڕ ببین و ئێوەش دەبێ یەکێکتان بگەڕێتەوە بۆلای خێزانە زۆر وهەژارەکەتان وئاگای لێ یان بێت وبژێوی ژیانی ڕۆژانەیان بۆ پەیدا بکات. (سُبْحانَ الله) لە بەزەیی وسۆزی پێغەمبەر ودڵسۆزی بۆ ئومەتەکەی، لەکاتی ڕودانی جەنگدا. لەوکاتەدا کەچارەنوسی ئیسلامی پێوە بەستراوە ویەکەم ڕوبەڕوبونەوەی شەربازی یە.

لەشکری موسڵمانان لەڕوی چەندایەتی وچۆنایەتی یەوە، لەڕوی ژمارەی موسڵمانان وکەلوپەلی جەنگی یەوە زۆر زۆر کەمترن لەکافران. پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێویستی بەیەك کەس هەیە لەمەیدانا بێ. بەڵام لەوکاتە سامناکەدا بیری ئەو خێزانە زۆرە وهەژاری یەکەیان دەکاتەوە ودەفەرموێ: بائەم کوڕ وباوکە یەکیان بڕواتەوە بۆناو خێزانەکەیان!

ئایا بیستراوە لەمێژودا سەرکردەیەك ئاوا لەکاتی جەنگداو لەساتە وەختێکی ئاوا مەترسیدارداو بەوکەمی سەربازەوە بەرامبەر ئەو لەشکرە بێ شومارەی دوژمن. ئاوا خەمخۆری هاوولاتیانی بێت؟! بەدڵنیاییەوە نەخێر.

دەی هەزارن هەزار صەلاوات لەسەر ڕۆحی هەمیشە زیندوت. ئەی خۆشەویستمان ئەی پێشەوای ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی. اللّهُمَّ صَلِّ على سَيِّدنا محمد وعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلِّم.

**بەڵێ ئیمانداران:** پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەم باوك وكوڕەی فەرموو: یەكێكتان بگەڕێنەوە بۆلای ژن وماڵەكەتان. بەلاّم ئەو باوك وكوڕە هیچیان ڕازی نەبوون بەگەڕانەوە. تا ناچار پێغەمبەری خوا (ﷺ) قورعەی بۆكردن!! لە قورعەكەدا ناوی كوڕەكە (سەعد) دەرچوو.

واتە: ناوی كوڕەكە دەرچوو كەلەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) بمێنێتەوە ودەبێ باوكەكە (خەیثەمە) بڕواتەوە بۆناو ماڵ ومناڵەكەیان.

ئالەم كاتەدا باوكە پیرەكە بەچاوی پڕ لەفرمێسكەوە، چوە بەردەم كوڕەكەی وبەزمانی لالآنەوە وپاڕانەوەوە ووتی: (يابُنَيَّ آثرني اليَوْمَ) ڕۆڵەگیان توخوا هیچم لەتۆ ناوێ ئەوە نەبێ ئەمڕۆ نۆرەی خۆت بدەیت بەمن.. من بمێنمەوە وتۆ بڕۆیتەوە بۆلای ماڵ ومناڵ!! كوڕەكەش بەئەو پەڕی ئەدەبەوە وەلاّمی باوكی دەداتەوە.

وەكو ئەوەی پێ ی بڵێ بابەگیان دەزانم داوای چی دەكەی. دەڵێ، ئەی باوكی شیرینم: (يا أَبَتِ، لَوكانَ غَيْرَ الجَنَّةِ فَعَلْتُ) بابەگیان بەخوا ئەگەر باسەكە غەیری بەهەشت بوایە بەقسەم دەكردی وپێشكەشم دەكردی!!

(بەڵێ ئەم كوڕە گەنجە وەكو ئەوەی چاوی لەبەهەشت بێ ولەناویا بێ وەبچێ ئاوا بەیەقینەوە باسی بەهەشتی دەكرد، كەواتە موسڵمان زۆرجار هەرلەدنیادا لەبەهەشتدایە!) بەڵێ، باوك بەگریان ودڵ شكاویەوە گەڕایەوە و پاشان جەنگی بەدر دەستی پێ كرد وسەعدی كوڕی ئەم باوكە شەهید بوو ئاواتەكەی هاتەجێ و بە بەهەشت شاد بوو!...

باوکی پیر کەجەنازەی تاقە کوڕەکەی گرتە باوەش، نەیفەرموو: ئای ڕۆڵە چیمان بەسەرهات ئای من بەتەنها وبەپیری ئەم ڕەشە خێزانە چی لێ بکەم. نەخێر، چونکە ئەوەندەی متمانە بەخوا بوو. دەیزانی ئەمیش نان خۆرە، ئەمیش ڕزقی خوا دەخوا. نەك ڕۆزی دەری خۆی ومالٚ ومنالٚی. بەڵکو ئەم باوکە پیرە ڕیش سپی یە، تەنها یەك خەمی هەبوو. ئەویش ئەوە بوو چۆن بگاتە بەهەشت. ئەو بەهەشتەی هەموو دوای نوێژێکی بەیانی وئێوارە داوای لەخوا دەکرد، کە بەو بەهەشتەی شاد بکات (اللّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الجَنَّة).

بەم شێوەیە ڕۆژان هاتن و ڕۆیشتن، دوو ساڵ دوای ئەوە جەنگی ئوحود هاتە پێشەوە خەیثەمەی باوك کەسەعدی کوڕی لەبەدردا شەهید ببوو.

هاتە خزمەتی (رَسُولُ اللّٰه) وعەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڕاستی ڕۆژی بەردم لەدەست چوو، خۆ بەخوای گەورە سوربوم لەسەر بەشداربونم لەجەنگی بەدردا. ئەوەبوو گەیشتە ڕادەی قورعە کردن لەگەڵ کوڕەکەمدا (سەعد) ئەوەبوو ناوی ئەو دەرچوو بۆمانەوە وشەهیدی بەنسیب بوو.

ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ): (وَقَدْ رَأَيْتُ البارِحَةَ ابني في النَّوْمِ في أَحْسَنِ صُورَةٍ. يسرح في ثِمارِ الجَنَّةِ، وَأَنْهارِها، وَيَقُولُ: أَلْحِق بِنا تُرافِقُنا في الجَنَّة. فَقَدْ وَجَدْتُ ماوَعَدَني رَبِّي حَقّاً):

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوێند بەخوا ئەم شەوی ڕابردوو کوڕەکەمم لەخەودا بینی لەسەر جوانترین شێوە بوو. هەرحەزت دەکرد تەماشای ئەو دەم وچاوە جوانەی بکەی. لەبەهەشتدا بوو، لەمیوەی درەختەکانی بەهەشتی دەچنی و لە بەهەشتا پیاسەی دەکردو لە ئاوەکەی دەخواردەوە. وەکوڕەکەم پێ ی ووتم: بابەگیان وەرە بۆلامان. وەرە با لە بەهەشتا بەیەکەوە بین. بەڕاستی ئەوەی خوای گەورە بەڵێنی پێ دابوین من پێ ی گەیشتم ولەناویدام وبەڕاستی وەعد وبەڵێنی

خوا حەقە.!) کاتێك ئەم باوکە ڕیش سپی یە ئـەم خەونـەی بـۆ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) گێڕایەوە، بەگریانەوە فـەرموی: (وَقَدْ وَاللهِ يارَسُولَ اللهِ أَصْبَحْتُ مُشْتاقاً إِلى مُرافَقَتِهِ فِي الجَنَّةِ. وَقَدْ كبِرَتْ سِنِّي. وَرَقَّ عَظْمي. وَأَحْبَبْتُ لِقاءَ رَبِّـي، فَـادْعُ اللهَ يارَسُولَ اللهِ، أَنْ يرزقني الشَّهادَةَ وَمُرافَقَةَ سَعْدٍ فِي الجَنَّةِ).

واتە: بەڕاستی قەسەم بەخوا، ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تامەزرۆم وهەموو هیـوا وئاواتم تەنها وتەنها ئەوەیە کەبگەمەوە بەکوڕەکەم لەبەهەشتدا وچۆن لەدنیادا شەو ورۆژ بەیەکەوە بوین و وەکو دوو هاوڕێ ی گیانی بەگیانی وابـوین، لەبەهەشتیشـدا ئاوا بەیەکەوەبین وتامەزرۆی ئەو بەیەك گەیشتنەی ناو بەهەشتم! ئەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بەڕاسـتی پیربـوم وچـومە سـاڵەوە سـەرو ڕیشـم سـپی بـووە. پشـتم چەماوەتەوە وئەژنۆم دەلەرزێ وئێسقانم زەعیف بووە، ئای حەزدەکـەم کەبەدیـداری پەروەردگارم شادبم!! ئەی پێغەمبەری خوا. ئەی خۆشەویسـتی خـوا توخـوا دوعـام بۆبکە کەخوای گەورە شەهیدیم بە نسیب بکات و مەدالیای شەهیدیم بەملدا بکرێ وبگەمەوە بەهاوڕێیەتی کوڕە تاقانە خۆشەویستەکەم سەعد لە بەهەشتدا..

(فَدَعا لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِذلِكَ ، فَقُتِلَ بِأُحُدٍ شَـهيداً) پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دوعای بۆکرد کەخوای گەورە شـەهیدی بەنسـیب بکـات وبەکوڕەکـەی شـادبێتەوە لەبەهەشتدا. ئەوەبوو لەجەنگی ئوحوددا شەهید بوو.

بەڵێ ئەم پیاوە بـەڕێزە هێشـتا هەرلەسـەر دنیـا بـوو. کەبەهەشـتی خـوای بینـی وئەوەندە بەموشتاقی وتامەزرۆییەوە چاوەڕێ ی چونە ناوی دەکـرد. هـەزاران جـار تامەزرۆتر لەکەسێك کەلەم دنیایـەدا کـرێ چـی یـە و هـەررۆژەی لەخانۆیەکدایـە وەڕس بوە لەماڵە وماڵ وکرێ چیەتی، کەچـی لـەپڕدا پـێ ی بـوترێ، حکومـەت خانویەکی بۆ دروست کردوی ونەك هەرخانوی سادەیە بـەڵکو کۆشـکێکە کۆشـکی شاهانە. ڕۆژانە برۆ سەیری بکە. کەی تەواو بوو بـڕۆرە نـاوی، بیهێنـە بەرخـەیاڵی خـۆت ئـەم کەسـە کـرێ چـی یـە چـەندە تامەزرۆیـە بەگەیشـتن بـەم کۆشـکە

وهەرخولەكێكی بەساڵێك لـێ دەڕوات وئەوەنـدە پەلەیـەتی بـۆ گەیشـتن بـەناوی.
ئیمانداری ڕاستەقینە هەزاران جار زیاتر لەوکەسە، تامەزرۆی گەیشتنە بەبەهەشـت ورزگاربون لەدنیای ماڵەو ماڵ كردن!

**بەڵێ ئیمانداران:** مێژوی ئیسلام پڕیەتی لەم جۆرە كەسانە، كەبەڕاستی بەهەشتیان لەبەرچاو بووە. لەشاری (بەصرە) ئافرەتێكی زۆر ئیمانـدار ودەوڵەمەنـد، كـوڕێكی هەبوو ناوی (إبراهیم) بوو، بەدایكەكەیان دەگوت: (أُمُّ إبراهیم) دایكی إبراهیم.

**واتە:** ئەوەندە خۆشەویستی لەنێوان ئەم كوڕ ودایكـەدا هـەبوو. كـەناوی دایكەكـە بیرچوبۆوە وهەربەناوی كوڕەكەیەوە بانگی دەكرد.

ڕۆژێكیـان هـەواڵ هـات كـەدوژمن هێرشـی كردۆتـە سەرسـنورەكانی دەوڵـەتی ئیسلامی، لەڕۆژی هەینی دا. (عبدالواحد بن زَید البَصري) لـەووتاری هـەینی دا خەڵكی هاندا بۆ جیهادو، ڕوبەڕوبونەوەی دوژمن. ئەم ژنە (أُمُّ إبـــراهیم) ئامـادەی ووتاری هەینی بوو.

(ئیمام عبدالواحید) باسی خۆشـی وئاسـودەیی هەمیشـەیی ونـەبڕاوەی بەهەشـتی دەكرد. وای لەخەڵكەكە كرد، وایان دەزانی لەناو بەهەشتدان. دوای نوێـژی هـەینی (أُمُّ إبراهیم) ووتی: ئەی مامۆستا خۆت دەزانـی مـن ئـەو كـوڕە تاقانـەم هەیـە، هەرچی پیاوە دەوڵەمەندەكانە، بەشانازی یەوە كچی خۆیان پێشكەش كردوە، قبوڵم نەكردوە. خەمی ئەوەم بوە، نەوەكو ژیانی نازداری لێ تێك بچێت!

سوێند بەخوا ئەم كوڕەی من لە بەهەشتا نەبێ ناحەسێتەوە. چونكە لەدنیادا هـیچ كەس ناتوانێ وەكو من خزمەتی بكات ودڵی ڕابگرێ. تانەچێتە بەهەشتەوە دڵم لێ ی بێخەم نابێت. ئەی مامۆستا وا (دە هەزار) دیناری ئاڵتونـت دەدەمـێ لـەڕێ ی خوا صەرفی بكە، بـەڵكو ببێتـە مـارەیی بوكەكـەم كـە (حـورالعین)ی بەهەشـتە!!
وەلەگەڵ خۆت بیبە بـۆ غـەزا، بـۆ پاراسـتنی وولاتـی ئیسـلام. بـەڵكو شـەهیدی

بەنسیب ببێ وخوای گەورە بەشەهیدی قبوڵی بکـات و (فَيَكُوْنُ شَفيعاً لِي وَلأَبيهِ فِي القِيامَةِ). بەو هۆیەوە ببێتە شەفاعەتکار بۆمن و بـاوکی ڕەحمەتیشـی لەقیامەتـدا. چونکە شەهیدان شەفاعەت دەکەن.

مامۆستا عبدالواحید پارەکەی لێ وەرگرت وکرا بەخەرجی سوپا وکوڕەکەشـی لـێ وەرگرت و لەگەڵ خۆی بردی بۆ غەزا. کـوڕو دایـك بەدڵخۆشـیەوە خـوا حافیزیـان لەیەکتری کرد. (ئەوەندە بەدڵنیایی ویەقینەوە ئەم مامەڵـەیان کـرد وەکـو ئـەوەی بفەرموێ، ڕۆڵەگیان تۆبڕۆ بۆ بەهەشت ودەرگـای ژورەکـانی بکـەوە وچـاوەڕێم بـە منیش هاتم!).

بەڵێ إبراهیمی تاقانە وتازەلاو لەگەڵ فەرماندەی لەشکری موسڵمانان‌دا ڕۆیشت بـۆ غەزا ولەشکری دوژمن هێرشی هێنـا وموسـڵمانانیش زۆر مەردانـە بـەر پەرچـیان دانـەوە. تائـەوەبوو لەشـکری دوژمنیـان شـکاند، دوای تـەواو بـوونی جـەنگ وبەسەرکردنەوەی بریندار وشەهیدەکان.

بینیان إبراهیم شەهید بوە! هەربـەجل وبەرگـە خوێناویەکەیـەوە بـەخاکیان سـپارد لەگەڵ هەموو شەهیدەکانی تردا. کاتێ لەشکری موسڵمانان گەڕانەوە ئـەهلی شـار بەرەوپیری لەشـکر چـون بـۆ بەخێرهاتنـەوەیان ودەنـگ وباسـی جـەنگ وهـەواڵی ڕۆڵەکانیان. ئەم ژنەش (أُمُّ إبراهیم) لەگەڵ خەڵکەکەدا چـوە دەرەوەی شـار وکـاتێ ئیمام عبدالواحد وموسڵمانان دەرکەوتن. دایکی إبراهیم، خۆی گەیانـدە سـەرکردە وبەزەردەخەنەوە پێ ی گوت: موژدەم بـەرێ بەشـەهید بـوونی کوڕەکـەم!! چـونکە شەوی ڕابردوو لەخەوما بینـیم کـە ئیبراهیمـی کـوڕم لەکۆشـکێکی ڕازاوەدا بـوو. گومەزێکی سەوز بەسەر کۆشکەکەوە بوو، لەسـەر قەنەفـەی نـەرم و جـوان کەلـە لۆلـۆ دروست کرابوو، دانیشت بوو. تاجێکی لەسەر بوو. زۆرکـەیف خـۆش بـوو. پێ ی ووتم: (يا أُماه، أَبْشري، فَقَدْ قبل المَهْرُ، وَزفت العروس). دایەگیان مـوژدەبێ

لێت، بەڕاستی مارەییەکە (دە هەزار) دینارەکە قبوڵ کراو، بووك ئامادەکراوە وپێ ی گەیشتم!.
جا ئەگەر کوڕەکەم شەهید بووبێ، ئەوە دیارە خەوەکەم ڕاستە وئاواتەکەمان هاتەدی وکوڕە خۆشەویستەکەم گەیشتە ئەو شوێنەی کەلەوێ نەبێ دڵم ئیسراحەت ناکات؟ ووتیان: بەڵێ موژدە بێ کوڕەکەت شەهید بوو.
بەڕاستی ئەم ئیماندارانە هەر بەلاشە لەدنیادا بوون، ئەگینا بەناخ و ڕۆح لە بەهەشتدا بوون. ئایا تۆی ئیمانداریش هیچ جار بوە ئاوا خۆشەویستی بەهەشت لەناو دڵ ودەروونتا جێگیر بوبێ کەوات زانی بێ لەبەهەشت دای وفرمێسکت بۆگەیشتن پێ ی ڕشتبێ؟!
**پێنجەم:** شوێن کە مرۆڤی موسڵمان پێش گەیشتن بەقیامەت و بەهەشتی هەتا هەتایی بەهەشت ئەبینێ و بەباخێك لەباخەکانی بەهەشت شاد دەبێت، کاتی سەرەمەرگە، چونکە لەوکاتەدا بەهەشت نیشانی ئیماندار دەدرێ و لەخۆشی ئەو شوێنە بەئاسانی ڕۆحی پاکی دەردەچێ لەجەنگی ئوحوددا، دوای تەواو بونی جەنگەکە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) صەحابەکانی بەسەرکردەوە تافەرموی: بزانن سەعدی کوڕی ڕەبیع چی لێ هاتووە. زیندوە، یان مردوە، یان بریندارە، ئەگەر بریندارە ئەوا دیارە برینەکەی ترسناکە وسەختە بۆیە نەیتوانیوە بجوڵێ وبێ بۆلامان. ئەگەر بینیتان. سەلامی منی پێ بگەیەنن. نەوەکو تادەگاتە لام یان من دەگەمە لای دونیا بەجێ بێلێ وسەلام وکەلامێك لەنێوانماندا نەبێ – ئەمەیە دڵسۆزی سەرکردە بۆ سەرباز.
بەڵێ مەیدانی ئوحود فراوان بوو. چونکە شەڕەکە بلاو بوبۆوە وهەریەکەی بەلایەکدا ڕۆیشتبوو بەتایبەت کاتێ هەواڵی شەهید بوونی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بلاوببۆوە! بەڵێ کاتێ هاوەڵان (سەعدی کوڕی ڕەبیع) یان دۆزی یەوە، زۆر بەخەستی بریندار بوو. لەکۆتا ساتی ژیانی دا بوو. سەلامی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) پێ گەیاند، سەعدی کوڕی ڕەبیع فەرمووی: سەلامی خوا لەپێغەمبەری خواش بێت. پێ ی

بلێن: (أَجِدُ ريحَ الجنَّةِ) بۆنی بەهەشتم بۆدی! وەبەخزمەکانم بلێن: هیچ عوزرێکتان لێ قبولێ ناکرێ، ئەگەر یەك چاو تروکان لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) بێ ئاگابن!.. ئەمجا شەهید بوو. بەڵێ لەسەرەمەرگا بوو، بۆنی بەهەشتی دەکرد.

**نمونەیەکی تر:** بیلالی حەبەشی، کاتێ لەسەرەمەرگدا بوو. ژنەکەی هاواری دەکرد، (واکَرْبَتاه) ئای لەو موصیبەتە گەورەیە. هاوار بۆ خۆم. ئەوە بیلال بەجێم دێلی؟! بیلال فەرموی: ئەی هاوسەری خۆشەویست و بەوەفام مەڵێ (واکَرْبَتاه) بەڵکو بڵێ: (وافَرْحَتاه) ئای لەو خۆشی وشادی بە. ئای لەو ئاسودەیی یە، چونکە: (غَداً أَلْقَى الأَحِبَّة مُحَمَّداً وَحِزْبَهُ). بەیانی دەگەمەوە بەخۆشەویستانم، دەگەمەوە بە محمد وهاورێبازانی!. ئافرەت واچاوم لەبەهەشتە. وافریشتەکان دێن پێشوازی ڕوحەکەم دەکەن. وا هەر ئەوەندەم ماوە کەڕوحەکەم لەلاشەم بێتە دەرەوە وبگەمەوە بەپێغەمبەری خوا وخۆشەویستانم، بگەمەوە بەأبوبکر وعومەر وعُثمان وعەلی وطەلحە وسەعدو سەعیدو عبدالرحمن و بەدری یەکان وئوحودیەکان. ئیتر وەختی ناخۆشی من تەواو بوو. بلێ: وافَرْحَتاهُ!.

**شەشەم:** شوێن کە باخچەیەکی بەهەشتە وموسڵمان تێ ی دەچێت، پێش گەیشتن بەبەهەشتی هەتا هەتایی. ناوگۆڕە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (القَبْرُ إِمّا رَوْضَةٌ مِنْ رياضِ الجَنَّةِ وَإِمّا حُفْرَةٌ مِنْ حُفَرِ النّارِ). گۆڕ یان باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت. یان چاڵێکە لە چاڵەکانی ئاگر.

بەڵێ مرۆڤی ئیماندار هەر کەخستیانە ناو گۆڕەوە دەگات بە باخچەیەك لەباخچەکانی بەهەشت لەفەرمودەکەی (بَرائی کوڕی عازب) دا هاتووە، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: دوای ئەوەی کە مرۆڤی باوەڕدار وەڵامی فریشتەکانی ناوگۆڕی دایەوە.

(فَيُنادي مُنادٍ مِنَ السَّماءِ، أَنْ صَدَقَ عَبْدي. فَافْرِشُوهُ مِنَ الجَنَّة وَأَلْبِسُوهُ مِنَ الجَنَّةِ). بانگ کەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەکات کە بەندەکەم ڕاست دەکات، ڕاخەری لەڕاخەرەکانی بەهەشت بۆ ڕابخەن و بەرگ و پۆشاکی بەهەشتی لەبەر بکەن

بەڕاستی ئەگەر ئیماندار تەنها و تەنها ئەو فەڕش و ڕایەخەو ئەو جل و بەرگەی ناوگۆڕی کە لە بەهەشتەوە بۆی هاتووە، هەیبێت بەسیەتی و هەموو دونیاو ئەوەی تیایەتی بیدەنێ نایگۆڕێتەوە.

جا توخوا حەیف نیە بەئیمانەوە نەچیتە ناو ئەو گۆڕەوە. توخوا ئەوەندەی خەریکی ئاوەدان کردنەوەی ماڵەکاتی و سەفەریەکەی دونیا مانین، کەزۆر کەس فریا ناکەوێ بچێتە ناوی بەجێی دێڵێ زۆرکەس جوانترین و خۆشترین خانوی لە باشترین و بە بەهاترین و خۆشترین شوێن دروست کرد. کەچی چوە ناویەوە، ئیسراحەتی تێدا نەکرد بەجێی هێشت! ئایا حەیف نیە خەریکی ئاوەدان کردنەوەی قەبرەکەشمان نەبین؟! حەیف نیە لەژیانی دونیادا ئەوەندی چاکە نەکەی کەخوا بفەرموێ، گۆڕەکەی بۆ بکەن بەباخێك لەباخەکانی بەهەشت! لەفەڕشی بەهەشت بۆی ڕاخەن، لەجل و بەرگی بەهەشت لەبەری بکەن!!.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَلِأَنفُسِهِمۡ يَمۡهَدُونَ ﴾ الروم: ٤٤

**موفەسیری گەورەی قورئان (إبنُ جرير) دەفەرموێ:** مُجاهد فەرمویەتی: ئەمە مەبەست پێی ناو قەبرە.

**بەڵێ ئیمانداران:** هەمومان هەر دەمرین، جاچی بچێنی ئەوە دەدوریتەوە، دەی بالەسەر شەقامە ڕێگەی ئیسلام بژین، لەسەر ﴿ ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾ بژین، بۆئەوەی بەهەشت بەدەست بێنین، زۆرکەس هەیە بەهەشت تامەزرۆیەتی. بەخوا چۆن ئێمە تامەزرۆی بەهەشتین. ئاوا زۆر کەسیش هەیە بەهەشت تامەزرۆیەتی. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: **(إِنَّ الجَنَّةَ لَتَشْتاقُ إِلى ثَلاثَة: عَلي، وَعَمّار، وَسَلْمان)** رَواهُ الترمذي والحاكم وَحَسَّنَهُ الأَلْباني في صَحيح الجامِع: (١٥٩٨).

**واتە:** بەڕاستی بەهەشت تامەزرۆیە بۆ سێ کەس: عەلی و عمار و سەلمانی فارسی!!

(سُبْحانَ اللهِ) بەهەشت موشتاقی ئەوانە! چونکە هەموو ژیانیان بەهەشتی بوو، بۆیە بەهەشتی نەبڕاوە چاوەڕێی دەکردن.

**بەڕێزان:** هەرکەسێك لەسەر ڕێبازی عەلی و عەمار و سەلمان بێت (إن شاءالله) ئاوا بەهەشتیش بۆ ئەو موشتاق دەبێت، دەی وەرە ژیاننامەیان بخوێنەرەوە، بزانە چۆن ژیاون، چیان کردوە بۆ ئیسلام، تۆش ئاوا بژی. کەئەمڕۆ لەو سەردەمەدا، دینداری و خواناسی گەلێ ئاسانتر بووە لەسەردەمی ئەوان و تەنها هیمەت بەرزی و یەقین و دامەزراوی دەوێت..

**بەڵێ ئیمانداران:** ئێمە زۆر باسی پیاوانمان کرد لەصەحابەو پیاو چاکان. بەلام خۆ لەئافرەتانیش بەسەدان نمونەمان هەیە لەسەرئەوەی کەهەر لەدنیادا، لەبەهەشتدا ژیاون. ئەوەندە بەدڵ لەگەڵ بەهەشتا ژیاون و هەموو خولەکێك چاویان لەبەهەشت بوەو بەکردار خۆیان بەڕێبوار زانیوە لەم دنیایەدا.

یەکێ لەو ژنانە. (ئوم سولەیم ، دایکی ئەنەسی کوڕی مالیکە). پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی: **(دَخَلَتُ الجَنَّةَ، فَسَمِعْتُ خَشْفَةً، فَقُلْتُ: مَنْ هذا؟! قالُوا: هذهِ الغميصاءِ بنتُ ملحان. أُمُّ أَنَس بِن مالِكٍ)** رَواهُ مُسْلِم: (٢٤٥٦).

**واتە:** چومە بەهەشتەوە ڕەنگە لەسەفەری ئیسراو میعراج – دا بوبێ، کەچوومە بەهەشتەوە گوێم لەخشپەی پێ ی کەسێك بوو. هەستم کرد کەسێکی لێیە، پرسیم ئەوە کێ یە؟! وتیان: ئەوە دایکی ئەنەسی کوڕی مالیکە!

(سُبْحانَ اللهِ) لەو پلەو پایە گەورەیە. هێشتا ئەم ژنە لەدنیادایە کەپێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: لە بەهەشتا بینیم، بەڵێ ئەم ژنە، ئەم دایکە، هەرچەند هەژارە، نەخوێندەوارە، ماندووە، بەلام هەر بەلاشە لەسەر زەوی یە، ڕۆحی پێش لاشەی گەیشتۆتە بەهەشت؟ **بەلام دەبێ بپرسین:** ئایا کارو کردەوەی ئەم ژنە چی بوو لەدنیادا، تاخوشکانمان چاوی لێ بکەن، چونکە ئێمە کەباسی کەسێك دەکەین

لەصەحابەو پیاوچاکان و ئافرەتانی خواناس بۆ چیرۆك گێڕانەوە نیە، بەڵکو بۆئـەوە باسیان دەکەین و لەخزمەت ژیاننامەی مویارەکیاندا دەبـین بۆئەوەیــە کەبیانکـەین بەپێشەنگ بۆخۆمان ئێمەش ئەو کردەوانە دووبارە بکەینەوە.

فەرموون با هەندێ لـەکارو کردەوەکـانی ئـەم ئافرەتــە بـەڕێزە بـاس بکـەین کـە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویی: لەبەهەشتدا بوو، لەگەڵ پێغەمبەری خـوا (ﷺ) لەبەهەشتا بوو. پێش ڕۆح دەرچوون و مردنی!.

**١- خۆشەویستی ئیسلام و بیروباوەڕەکەی:** ئوم سولەیم ئافرەتێکی بەڕێزو خـاوەن کەسایەتی بـەرز بــوو. لەڕووخســاردا زۆر جـوان بــوو، پیــاوێکی گـەنج و جــوان و دەوڵەمەند، کەهەموو ئافرەتێکی بێ هاوسەر، حەزی دەکـرد شـووی پــێ بکـات و ببێتە هاوسەری، کەناوی (ئەبو طەلحە) بوو.

چووە خوازبێنی و پێی ووت: ئەگەر شووم پێ بکەیت بەڵێن بێت، هەر چەندە پـارەو ئاڵتونت بوێ دەتدەمێ و بۆت دەکەم بەمارەیی. خـانوو مـاڵی زۆر خۆشـم هەیـە، چەند باخ و بێستانم هەیە هەمویت دەخەمە خزمەت، بەڵام ئوم سـولەیم فـەرموی: (وَاللهِ مامِثْلُكَ يا أَباطَلْحَةَ يُرَدُّ، وَلكِنَّكَ رَجُلٌ كافِرٌ وَأَنا إِمْرَأَةٌ مُسْلِمَةٌ، وَلايَحِـلُّ لِي أَنْ أتزوجَّك، فَإنْ تُسْلِمْ فَذاكَ مِهْري، وَلاأَسْأَلُكَ غَيْرُهُ). رَواهُ النَّسائي.

**واتە:** ئەی ئەبوطەلحە ، سوێند بێ بەخوای گەورە پیاوی وەکـو تـۆ بـەڕێز هـەرگیز بەنەخێر وەڵامی نادرێتەوە لەلایەن ئافرەتی داخوازی کراوەوە، بەڵام ئەوەندە هەیـە تۆ پیاوێکی بێ باوەڕی و منیش ئافرەتێکی موسڵمانم. وە بۆمنی ئیماندار ڕەوانیـە کەشو بەپیاوێکی بێ باوەڕی وەکو تۆ بکـەم. جـا ئەگـەر موسـڵمان دەبـی. ئـەوە موسڵمان بونەکەت مارەییم بێت و وەبەڵێن بێ هیچی تـرت لێ داوانەکـەم! کـاتێ ئەبوطەلحە گوێی لەم ووشە بەهێزو بەپێزانە بـوو، کـە لـەناو دڵێکـی پـڕ ئیمانـەوە

هەڵدەقوڵان ئەوەندەی تر کەسایەتی ئوم سولەیم و گەورەیی ئەو ئیسلامەی بۆ دەرکەوت و لەدلا چەسپا.
کەئافرەت لەگەڵ ئەو هەموو حەزو ئارەزووەی بۆ ئالتون و پارەو ماڵ و سامان هەیەتی بەڵام ئەمانە هەمووی وازلێبێنێ، تەنها عەقیدە پاکی و ئیمانداری هاوسەری ژیانی بویێ، بۆیە ئەبوطەلحە بەئەو پەڕی قەناعەتەوە موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاندو بەشانازییەوە هاتنە ناو ڕیزی ئیماندارانی قبوڵ کردو لەگەڵ ئوم سولەیم دا هاتنە خزمەت پێغەمبەری خواو هەر کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) چاوی پێیان کەوت، لەدورەوە فەرموی: (جاءكُم أَبُوطَلّحَة عِزَّةُ الأَسْلام في عَيْنَيْهِ) ئەوە ئەبوطەلحە هات بۆلاتان و عیزەتی ئیسلام لەچاوەکانی دا دەردەکەوێ.
بەڵێ ئەم جۆرە مرۆڤانە هەر لەدنیادا لەبەهەشتدا دەژین، وەسوپاس بۆ خوا ئەم جۆرە ژنانە نمونەیان تاقیامەت هەردەمێنێ. بۆنمونە گۆڤاری (خێزان) ژمارە: ١٧، لەلاپەڕە (٢٤) دا نوسیویەتی:
ئافرەتێکی کوردی وەرگێڕ، کەلەگەڵ ئەمریکی یەکاندا کاردەکات. بەڵام ئافرەتێکی ڕەوشت بەرزو موسڵمان. سەربازێکی ئەمریکی خەڵکی ویلایەتی (تکساس)ی ئەمریکا، داوای لێ دەکات کەشووی پێ بکات، چونکە زۆر موعجیبە بەکەسایەتی و ڕەوشتی بەرزی ئەم ئافرەتە موسڵمانە، وەپێی دەڵێ: لەگەڵ خۆمدا دەتبەم بۆ ئەمریکاو چیت بویێ بۆت دەکەم، بەڵام ئەم کچە کوردە، وەکو ئوم سولەیم دەڵێ: هیچ شتێکم لەماڵی دونیا لەتۆناوێ و ناشچم بۆ دەرەوەی وڵات، بەڵام داوات لێ دەکەم، بەجوانی دیراسەی ئیسلام بکەو ئەگەر گەیشتیتە قەناعەت ئیسلام ببەو مارەییەکەی من، موسڵمان بونی تۆ بێ و هیچی تر!! ئەم سەربازە ئەمریکی یە هەروەکو (ئەبوطەلحە) ئەوەندەی تر کەسایەتی ئەو ئافرەتە و گەورەیی ئیسلام سەرنجی ڕادەکێشێ. پاشان دیراسەی ئیسلام دەکات و بەئەوپەڕی قەناعەت

و دڵخۆشیەوە موسڵمان دەبێت و دەڵێ: ئێستا هەموو ئاواتم ئەوەیە بانگی خەڵکی بکەم بۆئەم ئیسلامە پاکەی کەئێمە لێی بێئاگابوین وەلەباوکم و دایکمەوە دەست پێ دەکەم.

ئایا ئەم جۆرە ئافرەتانە پێش ئەوەی بمرن و دونیا بەجێبهێڵن. ئایا ڕۆحیان لەدونیاوە نەفڕیوە بۆ بەهەشت؟!

٢- دووەم هەڵوێستی ئوم سولەیم کەبۆتە هۆی ئەو پلە بڵندەی هێشتا لەدنیادایە بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) موژدەی دەداتێ کەگوێی لەدەنگی پێڵاوەکانی بووە. ئەوەیە کەئوم سولەیم خۆشەویستی یەکی یەکجار زۆری بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەبووە، ئەوەبوو کاتێ کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) لەمەدینە نیشتەجێ بوو، خەڵکی دەچون بۆ بەخێرهاتنی و هەرکەسە بەپێی توانای خۆی، دیاریەکی بۆ ماڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەبرد.

(ئوم سولەیم) نەیدەزانی چی پێشکەشی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکات چونکە دەبێ ئەو شتە، خۆشەویسترین شتی دونیا بێ بەلایەوە، ئەمجا بەشایەنی ئەوەی بزانێ کە پێشکەشی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکات، ئەوە بوو بیری کردەوە خۆشەویسترین شت لەدنیادا. کوڕە ژیرو تێگەیشتوو خۆشەویستەکەیەتی. کەناوی (ئەنەس)بوو. بۆیە دەستی گرت و بردیە خزمەتی و فەرموی: (يا رَسُولَ اللهِ، هذا أُنَيس ابني أَتَيْتُكَ بِهِ يَخْدُمُكَ فَادْعُ اللهَ لَهُ. فَقالَ: اللّهُمَّ أَكْثِر مالَهُ وَ وَلَدَهُ).

**واتە:** ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە (ئەنەسۆکەیە) مەبەستی ئەوەیە منداڵێکی بچکۆلانەیە. هێناومە بۆ خزمەتت، بۆئەوەی خزمەتت بکات و لەخزمەتتابێت و بەردەستیتان بکات لەماڵەوە، تکایە تۆش دوعای بۆ بکە.

**پێغەمبەری خوا** (ﷺ) **فەرموی:** خوای پەروەردگار ماڵ و سامانی زۆر بکەو ماڵ و منداڵی زۆری پێ ببەخشە.

بەڵێ ئەمە بەڕاستی هەڵوێستە، ئەمە بەڕاستی خۆشەویستی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) ئەمە دڵسۆزیە بۆ جگەر گۆشەکەی. بۆ تاقە کوڕەکەی. کەدەیباتە خزمەت دڵسۆزترینی هەموو مرۆڤەکان و مامۆستای هەموو مامۆستاکان و خاوەنی ڕەوشتی هەرە بەرز (خُلُقٍ عَظيم).

دەی دایکانی موسڵمان ئێوەش لەم هەڵوێستەدا چاو لە (أُمُّ سولەیم) بکەن و جگەر گۆشەکانتان و کوڕو کچەکانتان بەرنە بەردەستی شوێن کەوتوانی پێغەمبەری خوا (ﷺ). لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پەروەردەیان بکەن. تاوەکو وەکو ئەنەس بەختەوەر بن.

بەڵێ ئەنەس ئەو کاتە تەمەنی (١٠) ساڵان بوو، کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) وەفاتی کرد. تەمەنی (٢٠) ساڵ بوو. واتە (١٠) ساڵ مایەوە لەخزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ). ئای لەو بەرەکەتە، لەو خۆشبەختیە، ماوەی (١٠) ساڵ، شەو و ڕۆژ، زستان و هاوین، لەماڵ و لەسەفەردا ئەنەس لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بوو، لەووتەو کردارەکانی بەهرەمەند بوو، سەرەنجام بەختەوەر بوو.

**نمونەیەکی تر** لەخۆشەویستی (ئوم سولەیم) بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە بوو، کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) خەوتبوو، عەرەقەی پیرۆزی لەسەر ناوچەوانی گەلێك جوانتر لەگەوهەر و مرواری، دروست ببوو، ئوم سولەیم بەلۆکەیەك زۆر بەبێ دەنگی و هێواشی – کە نەهێڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەبەری ببێتەوە، عەرەقەکەی سڕی و لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ئاگاهاتەوەو فەرموی: ئەوە چی دەکەی؟! فەرموی: (هذا عَرَقُكَ، نَجْعَلهُ في طيبِنا، وَهُوَ مِنْ أَطيَبِ الطيبِ). – رَواهُ مُسْلِم. واتە: ئەوەی بەو لۆکەیەوەیە ئەوە عەرەقەی ناوچەوانی تۆیە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیخەینە ناو عەترو بۆنخۆشیەکانمانەوە چونکە بەخوا ئەو عەرەقەی ناوچەوانی تۆ لەبۆنخۆشترین ماددە بۆنخۆشەکانە..

وەجارێکی تریش کەبەهەمان شێوە (أُمُ سولەیم) عـارەقی ناوچـەوانی پێغەمبـەری خوا (ﷺ) گرت، خۆشەویست فەرموی: ما تَصْنعينَ يا أُمُّ سُلَيم؟ ئەی ئوموسـولەیم ئەوە چی دەکەن؟ عەرزی کـرد، (يارَسُولَ اللهِ نَرْجُوا بَرَكَتَهُ لِصبيانِنا، قالَ: أَصَبْتِ). رَواهُ مُسْلِم.

**واتە:** ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم عەرەقە بۆن خۆشەی لاشەی تۆ هەڵدەگرین، بەئومێدی بەرەکەت بۆ منالـەکانمانی دەبـەین، پێغەمبـەر خـوا (ﷺ) فـەرموی: پێکات ئەی ئوموسولەیم.

٣- هەڵوێستێکی تری ئوموسولەیم کەبەڕاستی شایستەی ئەوەی کرد کە پێغەمبەر خوا (ﷺ) هەر لەدنیادا موژدەی ئەوەی پـێ بـدات کـە لەبەهەشـتا بینیویـەتی، بریتی بوو لە: خۆڕاگری و ڕازی بوون بەقەدەری خوا.

ئەم ئافرەتە ئیماندارە خوای گەورە منالێکی پێ بەخشی، لەگەڵ مێردەکەی کەناوی (ئەبوطەلحە) بوو، لەڕادەبەدەر خۆشیان دەویست، لەبەرئەوەی منالێکی زۆرجـوان و ڕووگەش ودەم بەخەندە بوو. گەیشـتبوە ئـەو تەمەنـەی کـەیاری خـۆش بـو بـوو. پێغەمبەری خواش (ﷺ) ئەم منالەی زۆر خۆش دەویسـت، هـەرکات بچوایە بـۆ ماڵی ئەبوطەلحە و ئوموسولەیم، ئەم منالەی لەباوەش دەگـرت و یـاری و گەمـەی لەگەڵ دەکرد، ئەوە بوو ڕۆژێکیان پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بـانگی صـەحابەکانی کردو فـەرمووی دەڕۆیـن بـۆ جێگایـەك بـۆدەرەوەی شـاری مەدینـە، یـەکێ لـەو صەحابانەی کەلەخزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوونە دەرەوە (ئەبو طەلحە) بوو، منالەکەی ماچ کردو بەخۆیەوە گووشی و خوا حـافیزی لـەخێزانی کـردو ڕۆیشـت. قەدەری خوای گەورە وابوو. ئەوان ڕۆیشتن و ئەم منالە نەخۆش کەوت (سُبْحانَ اللهِ) کتوپڕ مرد! بەڵێ منالەکەیان بەهاوکاری خزم و دراوسـێ کفـن و دفـن کـراو پـاش ماوەیەك هەواڵ هات کەپێغەمبەری خواو صەحابەکان بەرەو مەدینە گەڕانەوە. ئەم

شێرە ژنە، ئەم ژنە دڵ پڕ لەئیمانە بەخواو بەقەدەری خواو بەپاداشتی خوا. بەدەرو دراوسێ و خزم و کەس و کاری ڕاگەیاند. توخوا کەس هەواڵی مردنی کوڕە خۆشەویستە نازدارەکەمان بە (ئەبوطەلحە)ی باوکی نەڵێ. من حەزدەکەم خۆم بەهێواشی هەواڵەکەی پێ بدەم. ئەوە بوو کەس ئەم هەواڵەی بە ئەبوطەلحە نەدا، تاهاتەوە ماڵەوەو ئوموسولەیم زۆربەگەشی و ڕووخۆشی و بەخێرهاتنەوەیەکی گەرمی لێکردو بەهیچ شێوەیەك بەدەم و چاو و گوفتارو کرداریدا نەدەبینرا کە چەند ڕۆژێ لەوەوبەر کوڕی مردبێ، هەر کە ئەبوطەلحە هاتە ژوورەوە ووتی: ئافرەت ئەی کوا کوڕەکەمان؟! ئوم سولەیم فەرمووی: پوری لێرە بوو. لەگەڵ خۆی بردی بۆماڵی خۆیان و هەرئێستا پێش تۆ ڕۆیشتن، زۆر تەکلیفی کرد کەئەمشەو لای بمێنێتەوە، منیش بێ دڵیم نەکرد، ئەبوطەلحە فەرمووی: هەرچەندە زۆرمشتاقم بۆ بینینی بەڵام قەیناکە پوریشی زۆری خۆشدەوێت، چاکت کرد ناردت لەگەڵیدا!

بەڵێ ئوموسولەیم ئاوی بۆ گەرم کردو جل و بەرگی پاك و خاوێنی بۆ ئامادەکردو ئەبوطەلحە خۆی شۆردو پاشان نانێکی بەتامی بۆئامادەکردو بەخۆشیەوە نانیان بەیەکەوە خوارد و شەو کەبەیەکەوە چوونە سەرجێگای خەوتن لەگەڵ مێردەکەی جووت بوون، پێش بانگی بەیانی ئەبو طەلحە خۆی شۆردو غوسڵی جەنابەتی دەرکردو ویستی بڕوات بۆ مزگەوت بۆ نوێژی بەیانی، ئالەوکاتەدا (ئوموسولەیم) بانگی کردو فەرمووی: پەلەمەکە هێشتا ماوەیەتی بۆبانگ دەمەوێت یەك دوو قسەت لەگەڵدا بکەم: ئەبوطەلحە فەرمووی: ئادەی بەم نیوە شەوە ئەتەوێ بڵێی چی؟! فەرمووی ئەی ئەبوطەلحە: ئایا ئەگەر کەسانێك ئەمانەتێکیان لەلای کەسێك دابنێن. پاشان بچن بۆ وەرگرتنەوەی ئەمانەتەکەیان، ئایا بۆیان هەیە کەنەهێڵن ئەمانەتەکەیان بەرنەوەو بڵێن: نەخێر نابێ بیبەنەوەو دەبێ جارێ هەر لای ئێمە بێت؟!

**ئەبوطەلحە ووتی:** نەخێر خاوەنەکەی هەرکات پێی خۆش بوو دەتوانێ وەری بگرێتەوە بەڵام ئەی ئوم سولەیم تۆ ئەم پرسیارەت بۆچی کردو مەبەستت پێی چی بوو؟! دەتەوێ چیم پێ بڵێی؟! فەرموی: ئێمەش خوای گەورە کوڕێکی بەئەمانەت پێ بەخشیبوین، دوای ڕۆیشتنی تۆ. کوڕەکەمان مردو خوای گەورە ئەمانەتەکەی بردەوە بۆلای خۆی!! ئەبوطەلحە فەرموی: یانی کوڕەکەشمان مردوەو تۆش ئاوا لەئێوارەوە قسەناکەی و سەرەڕای ئەوەش ئەوەی ئەمشەویشت ئەنجامدا!

بەعاجزییەوە ڕۆیشت بۆ مزگەوت و نوێژی بەیانی لەخزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد، کاتێ جەماعەت تەواو بوو، ئەبوطەلحە چوە خزمەت پێغەمبەری خواو باسەکەی لەمردنی کوڕەکەی و هەڵس و کەوتی ئوموسولەیم بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (بارَكَ اللهُ لَكُما في غابِرِ لَيْلَتِكُما) دەی خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ناو کاری ئەمشەو تانەوە!

(سُبْحانَ اللهِ) لەجیماعی ئەو شەوە ئوموسولەیم حامیلە بوو، پاشان کوڕێکی جوانی بوو، جوانتر لەمناڵە کۆچ کردووەکەی و بردیە خزمەت پێغەمبەری خواو ئەویش دەمی شیرین کردو ناوی نا (عَبْدُاللهِ). رَواهُ البُخاري (٥٤٧٠) وَمُسلِم (٢١٤٢).

ئینجا ئیمامی بوخاری لەئیبن عوبەینەوە دەگێڕێتەوە لەپیاوێکی ئەنصارەوە دەفەرموێ: نۆ کوڕی ئەو (عَبْدُاللهِ) یەم بینی هەموویان قورئان خوێن بوون.

باشە ئیمانداران جگە لەئیمان بەپاداشتی خوایی و چاوو بون لەبەهەشت چی وای لەم ئافرەتە کرد کەبەو شێوە سەرسوڕهێنەرە خۆڕاگربێ، کەببێتە نمونەی خۆڕاگری!

٤- هەڵوێستی چوارەمی ئوموسەلەمە کەوای لێ کرد هەر لەدنیادا مـوژدەی بەهەشتی پێ بدرێ. ئەو تێکۆشانەی بوو کەبۆ سەرخستنی ئیسلام لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) کردی. ئەوە بوو لەجەنگی (ئوحود)دا، لەگەڵ خاتوو

عائیشە ئاوی بۆسوپای ئیسلام دەکێشاو برینداره‌کانی تەداوی دەکرد. وەلەجەنگی (حونەین)ین دا بەشمشێر بەرگری لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکرد.

شایانی ئاماژه بۆکردنه، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر ڕێزی لە (ئوموسولەیم) دەگرت و سەری لێدەدا لەماڵەوە، جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەری لێ دەداو هەر لەماڵیاندا نوێژی سوننەت دەکات و بەئوموسولەیم دەفەرموێت:

ئەی ئوموسولەیم کەنوێژە فەرزەکانت کرد لەپاش نوێژەکان (آيَة الكُرْسى) بخوێنە و پاشان (٣٣) جار بڵێ (سُبْحانَ الله) وە (٣٣) جار بڵێ (الحَمْدُلله) وە (٣٤) جار (اللهُ أكبر) بکە، پاشان لەخوا بپاڕێرەوە. وەلامت دەدرێتەوەو پێت دەوترێت: بەڵێ، بەڵێ، بەڵێ. رَواهُ مُسْلِم والبَزارو أبو يَعْلي.. هەزاران سڵاو و درود لەگیانی ئەم شۆڕە ژنە کەموێنەیەو سەرجەم هاوەڵانی پێغەمبەر خوا(ﷺ) و ئێمەش لەگەڵ ئەواندابین.

اللَّهُمَّ آمِين

# سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز.

٢- تەفسیری ئاسان ، بورهان محمد امین

٣- المائة الثانيَة مِنْ وَصايا الرَّسُول (ﷺ) طه عَبْدُالله العَفيفى ، ج١ ، ص٣٢٣ ، ص,٢٦٧

٤- مَوسُوعَة الأَخَلاق الأسْلامِيّة ، سَعْد يوسف أبو عَزيز ، ج٣ ، ص,١٨١

٥- زادُ المِعاد ، إبنُ القَيِّم الجَوزِيَّة ، ج٣ ، ص,٢٠٨

٦- السيرَة النَبَوِيَّة ، د.على محمد الصَّلابي ، ج٢ ، ص١٠٦ ، ص,١٠٢

٧- السلسلة الذَّهَبِيَّة ، محمد المصري ، أبوعَمَّار ، ج١ ، ص٣٠٦ ، ص,٣٥٦

٨- مَواقِف إيمانِيَّة لِلْنساء، محمد عبدالعاطي بحيري ، ص٢٣٦.

٩- گۆڤاری خێزان، ژمارە: ١٧، ل,٢٤

١٠- صَحابِينات حَوْلَ الرَّسُول (ﷺ) محمد المصري ، ص,٣١٦

١١- ژوانگەی سەروەران ، محمد سەنگاوی ، ل٢٠١.

# ووتاری چوارەم

# بۆ مانگی جمادی الأولی

# ئەو شتانەی کێشە وگرفت بۆ ئافرەت دروست دەکەن

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبهِ أجمعين.

**ئیمانداران:** مرۆڤ بەڕێزترین دروستکراوی خوایە. قورئان دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴾ الإسراء: ٧٠. وە لەناو مرۆڤدا کە نێرو مێ یە. پیاو و ئافرەتە. خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ڕێزی تایبەتی لەئافرەت گرتوە. چونکە ئافرەت ناسکترە لەپیاوو زۆرتر دەبێ بەقوربانی وکەشکا جێگای خۆی ناگرێتەوە. کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ژنانی بە شوشەی ناسك وپاك وگران بەها داناوە. وە ئامۆژگاری پیاوانی کردوەو فەرمویەتی: (رِفْقاً بالْقَوارِير).

بەڵێ ئیسلام ڕێزی گێڕایەوە بۆ ئافرەت لەکاتێکا لەپێش هاتنی ئاینی پڕ ڕەحمەتی ئیسلامدا وە لەدوای ئیسلامیشدا لەژێر تێڕوانینی غەیری ئیسلامدا ئافرەت بە بەڵاو نەگبەتی ومرۆڤی پلە دوو تەماشا دەکرا.

بەڵام لە ئیسلامدا ئافرەت هەموو کاتێ بەڕێزە، کاتێ کچە و لەماڵی باوکیایەتی، کاتێ شوو دەکات ودەبێتە هاوسەر وهاوژینی پیاو هەر بەڕێزە. کاتێ دەبێتە دایك ئەوەندەی تر ڕێز وقەدری زیاد دەکات.

جا لەکاتێکا ئافرەت چ کچ بێ چ ژن. کە ئەو هەموو ڕێزەی هەیە، دەبێ زیاتریش ئاگای لەخۆی بێت. چونکە شتی گرانبەها دەبێ زیاتر پارێزگاری لێ بکرێت. بەتایبەتی لەکۆمەڵگای موسڵمانی ئێمەدا کە بەهۆی ناحاڵی بوون لە ئیسلام تاوانی ئافرەت بەگەورەتر سەیر دەکرێت لەپیاو. لەکاتێکدا لەئیسلامدا هیچ جیاوازی نەخراوەتە نێوان پیاوی تاوانکار لەگەڵ ژنی تاوانکار.

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي ﴾ النور: ٢ ( ژنی زیناکار وپیاوی زیناکار). یان دەفەرموێ: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ ﴾ المائدة: ٣٨ ( پیاوی دز وژنی دز). هەردوکیانی وەکو یەك تەماشا کردون. تەنها ئەوەندە هەیە لە

(إعجازی قورئانه) كه له‌باسی زینـادا ژنـی پـێش خسـتوه، چـونكه زینـا ئه‌گـه‌ر ئاره‌زوی ئافره‌تی له‌سه‌ر نه‌بێ زۆر به‌ده‌گمه‌ن پیاو ده‌توانێ ئه‌و كاره‌ی له‌گه‌ڵ بكات. به‌ڵام له‌باسی دزی دا پیاوی پێش خست، چونكه له‌هه‌موو جیهاندا ولـه‌ئاماره‌كانی تاوانه‌كاندا له‌به‌شی دزی دا ته‌ماشا بكه‌. ئه‌وانه‌ی دزی ده‌كه‌ن. به‌شی هه‌ره زۆریان پیاون وكه‌مێكیان ئافره‌تن: به‌ڵام خه‌ڵكانێك هه‌ن. كه له‌ناو كۆمه‌ڵگای كـورده‌واری ئێمه‌شدا هه‌ن. ئه‌گه‌ر پیاو تاوانێك بكات. گوناهێكی گه‌وره بكات.

**بۆ نمونه** زینا بكات. ئـه‌وا ده‌سـت بـه‌سمێڵی دا دێنـێ وخـزم وكـه‌س وكـار وقـه‌وم وعه‌شره‌ت صوڵحی بۆ ده‌كـه‌ن وپاشـه‌ڕۆژ نـه‌خۆی هه‌سـت به‌شـه‌رمه‌زاری ده‌كـات ونه‌ده‌وروبه‌ریش به‌چاوی نامۆ ده‌یڕواننێ. یان پیاوی وا هه‌یه چـه‌ند جـار لـه‌دزی دا گیراوه ودادگایی كراوه وزیندانی بینیوه. كه‌چی كاتێ به‌رده‌بێت وده‌چێته خوازبێنی كچێك. پێشكه‌شی ده‌كه‌ن وكچه‌كه‌ش به‌ڕه‌زامه‌ندی دڵی خۆی شـوی پـێ ده‌كـات. به‌ڵام ئه‌گه‌ر له‌هه‌مان كاتدا وله‌هه‌مان شوێن وكۆمـه‌ڵگادا. ژنێـك زینـا بكـات — زۆرجار هه‌ر گومانه. وزۆر زۆر به‌ده‌گمه‌ن مه‌رجی شه‌رعی بۆ سه‌لماندنی زینـا كـردن له‌سه‌ر ئه‌و ئافره‌ته دێته‌دی. كه‌چی ده‌بێ كوشتن ئه‌و عه‌یبه لاببات.

وه ئه‌گه‌ر ئافره‌تێك له‌ته‌واوی ته‌مه‌نی دا یه‌ك جار دزی كردبێ ولێی ئاشكرا بـووبێ وخه‌ڵكی پێی زانیبێ، ئه‌وا ته‌واوی ژیانی له‌متمانـه پێكردنـی خـه‌ڵكانی ناسـیاوو ده‌وروبه‌ری بێ به‌ش ده‌بێت وبه‌ده‌گمه‌ن نه‌بێ كه‌س بۆ هاوسه‌ری ژیانی خۆی قبـوڵی ناكات له‌كاتێكا ئه‌مه دید وتێڕوانینی ئیسلام نیـه بـۆ ئـه‌م شـێوازه ڕه‌فتاركردنـه له‌گه‌ڵ ئافره‌ت.

**جا كه‌واته:** موسـڵمان به‌گشـتی وئـافره‌تی موسـڵمان به‌تایبـه‌تی ده‌بـێ ئـه‌و ڕێـز وحورمه‌تـه‌ی كـه‌خوا بـۆی داناوه‌بپـارێزێ وخـۆی ڕه‌زیـل وسـووك نـه‌كات. پێغه‌مبه‌ری خه‌مخۆر ودڵسۆزمان فه‌رمویه‌تی: (**لايَنْبَغِي لِلْمُؤمِنِ أَنْ يُـذِلَّ نَفْسَـهُ،**

قالُوا: وَكَيْفَ يُذِلُّ نَفْسَهُ؟ قالَ: يَتَعَرَّضُ مِنَ البَلاءِ لِما لايُطيقُ) رَواهُ الترمذي وَقالَ: حَسَنٌ غَريب. الصَّحيحَة لِلألباني (٦١٣).

واته: پێویست نیه وجوان نیه بۆ ئیماندار کەنەفسی خۆی زەلیل وریسوا بکات. عەرزیان کرد ئایا بەچ شێوەیەك ئیماندار نەفسی خۆی زەلیل دەکات؟! پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: خۆی دەخاتە ژێر باری تاقیکردنەوەیەکەوە، کارێکەوە کەلەپاشاندا پێی هەڵناگیرێ وتەحەمولی ناکات..

سەعیدی کوڕی موسەیەب دەفەرموێ: یەکێ لەصەحابەکان لەنامەیەکدا ئامۆژگاری کردم وفەرمووی بزانە: (مَنْ عَرَضَ نَفْسَهُ لِلتُّهَمِ، فَلا يَلومَنَّ إلا نَفْسَهُ) شُعَب الإيمان لِلْبَيْهَقي ج٣ ض١٥

واته: هەرکەسێ (پیاو یان ژن) نەفسی خۆی خستە جێگای گومانی خەڵکی یەوە، چوە شوێنێك کەئەگەر لەو جێگایە ببینرایە. خەڵکی گومانی خراپیان پێ دەبرد. ئەوە پێویستە کەسی ئیماندار خۆی لەو جێگایانە بپارێزێ. وەئەگەر چوە ئەو شوێنە گوماناویانە کەلەگەڵ کەسایەتی ئەودا ناگونجێ وپاشان بیستیەوە کەخەڵکی بەخراپە و بەگومانەوە باسیان کردوە. ئەوە بەتەنها لۆمەی خۆی بکات وگلەیی لەخەڵکی نەکات..

جا بە پشتیوانی خوای گەورە لەم ووتارەدا ئاماژە دەکەین بۆ کۆمەڵێك لەو شتانەی، لەو کردار وگوفتارانەی، لەو جێگایانەی کە ئافرەت – جا چ کچ بێ چ ژن – خۆی تێدا زەلیل وسوك وکەم نرخ دەکات.

یاخود کەسوکارەکەی (دایك وباوك وخوشك وبرای) سوکی دەکەن تێی دا. وە دەکەوێتە بەردەمی گورگی هار:

١- چونە ناو حەفلە وشایی بوك وهۆڵەکانی شایی. کەئەگەر ڕۆژی پێشتر هەرئەو کوڕە کەلەو شایی یەدا دەستی خستۆتە ناو دەستی ئەو کچەوە ولەگەڵیا هەڵدەپەڕێ وهەموو لەشی لەلەشی دەسوێ و پاشان زۆرجار بۆ گەنجانی هاوڕێ ی

دەگێڕێتەوە کەچۆن لەگەڵ فلان کچ دا شایی کردوە ودەستی کچەی گوشیوەو بەرلاشەی کەوتوە. تاسەرەنجام ئەو کچە سووك دەکات. ئەگەر ڕۆژی پێشتر برای ئەوکچە ئەوکوڕەی لەبەردەرگای ماڵیان ببینیایە قبوڵی نەدەکرد وشەڕ وهەرای دروست دەکرد. باوکی کچەکەش هەروا. کەچی لەو هۆڵی شایی وحەفلەدا. ئەو غیرەتە باری کردوە وزەڕەیەك لەلاشەدا نەماوە:

بەداخەوە مێردی کەم غیرەتی واهەیە، باوك وبرای نامەسئولی واهەیە بۆخۆی داوا لەژنەکەی یان کچەکەی یان خوشکەکەی دەکات کەبچێ لەگەڵ خەڵکا هەڵپەڕێ!! سەرەنجامیش کێ باجی ئەم بێ شەرعیە دەدات وپێ ی سووك دەبێت؟ ئافرەتەکە.. وەکو فەرمودەکە باسی کرد. بەدەستی خۆی. خۆی دەخاتە شوێنێکەوە، بەلایەکەوە وخۆی زەلیل وڕیسوا دەکات.

٢- دانیشتنی ئافرەتان لەبەردەرگا، کەهەرچی هەواڵێك هەیە و ڕادیۆ و ڕۆژنامە نەیزانیوە، ئەو ژنە بێ ئیش وکارانە دەیزانن – فلان کەس شوی کرد، ئەو تەلاق درا، ئەو تالان کرا، ئەو حەیای برا، ئەو گیرا، ئەو بڕا – سوێند بەخوا پیاوی بەشەخصیەت و بەڕێز وحورمەت چەند کۆڵان دەکات نازانێ لەکوێوە بڕوات لەترسی ژنانی بێ ئیشی بەردەرگا. کەچاودێرن بەسەر هەرکەسێکەوە کەبەو ڕێگەیەدا بڕوات. ئەو ژنانە بەڕاستی کەسایەتی خۆیان لەدەست داوە. چونکە دیارە بێ کاروبارن ولەماڵ ومێرد ومناڵی خۆیان بێزارن.

٣- بەڵای لەهەموو بەڵاکان گەورەتر – مۆبایلە، کەبەداخەوە بەهۆی خراپ بەکارهێنانیەوە ئەو خزمەتگوزاریەگەورە، کارئاسانکەرە، بۆتە نیقمەت وبەڵاو مایەی تیاچوون وئابڕوچوونی گەنج ولاوەکانمان. بەتایبەت قوربانی یەکەم ژنان وکچانن.

جێگای داخە زۆرێك لەکوڕان، وە هەشە لەکچان ئیش وکاری بۆتە گەڕان بەدوای ژمارە مۆبایلی بەرامبەرەکەیدا وقسە لەگەڵ کردنی. تاسەرەنجام پەیوەندیەك دروست دەبێت. وەسەدان ڕوداوی واقیعی هەیە کەهەمووی کورتەکەی ئەوەیە:

لەڕێگای مۆبایلەوە. (جار هەبوە بەناوی ژمارەی هەڵە لێدانەوە) کوڕێك ژمارەی کچێکی دەست کەوتوە، ئیتر شەو ورۆژ قسە بەیەکەوە کردن وخۆبەقوربان کردن ووەعد وبەڵێن پێدان وتاسەرەنجام داوای وێنە لەکچەکە دەکات وقسەکانی تۆمار دەکات وپاشان داوای چونە دەرەوەی لێ دەکات وسەرەنجام داوای دەست تێکەڵ کردن وزینای لێ دەکات، بەناوی ئەوەی کەئەم هەردەبێتە خێزانی لەدوارۆژدا!! خۆ ئەگەر کچەی فریودراو بەئاگابێتەوە ودین وقیامەت وحەیا وشەرەف وکچێنی و ڕێزی بنەماڵەی بەبیربێتەوە وئامادەنەبێ دەستی لەگەڵ تێکەڵ بکات.

ئەوا کوڕەی گورگ صیفەت هەڕەشەی لێ دەکات بەوەی کەتازە تۆ دۆڕاندوتە وێنەکەت بلاودەکەمەوە ودەیدەمە باوك وبراکەت. دەنگەکەت لەلام تۆمارە، حەیات دەبەم! تاکچەکە لەترسان ناچار تەسلیمی دەبێ وسەرەنجام کوڕەکە بۆیەکجاری وازی لێ دێنێ وبەدوای نێچیرێکی ناسك وتازەتردا دەگەڕێ وئەوەی دەبێتە قوربانی تەنها کچەکەیە!

**بەڵێ بەڕێزان،** دەیان ڕوداو لەکتێب وگۆڤار ورۆژنامەکاندا نوسراوە، کەدوای ئەوەی کوڕەکە ئارەزوی خۆی لەکچەکەدا بەتاڵ کردۆتەوە، ئیتر پێ ی ووتوە، تۆ شایەنی ئەوەنی من سیقە ومتمانەت پێ بکەم وببیتە هاوسەرم، ئەمجا ئەوکچە هەموو غەموو هەمی بۆتە ئەوەی چۆن خۆی لەم مەینەتیە ڕزگار بکات وزۆرجاریش پەنا بۆ خۆکوشتن دەبرێت. جا بۆ خۆپاراستن لەم بەلایە، وە چارەسەر بۆ ئەوانەی توشبوون ئەوەیە کە پێویستە **ئەم خالانە ڕەچاو بکرێن:**

١- پەروەردەبوون لەسەر بیروباوەڕی ئیسلامی، کەبریتی یە لەبڕوابوون بەغەیب وقیامەت ولێپرسینەوە. ئیمان بوون بەڕەقابە وچاودێری خوایی. بڕوابوون بە پاداشت وسزای خوا بەوەی کە حەلاڵ وحەرام هەیە. هەر ئامێرێك دروست دەکرێت

و دەخرێتە بواری جولآن وئیش پێ کردنەوە کە تەلۆکی ئیش پێکردنی هەیە. ئەی باشە ئەم مرۆڤە چۆن دەبێ کەتەلۆکی ژیانی نەبێ بۆ جولەو کردار وگوفتاری؟! کەتەلۆکی ژیانی مرۆڤیش قورئان وسوننەتە.

٢- بڕوا بەخۆبوون ومەبدەئی بوون ودور بوون لەچاولێکەری: بەڕاستی مرۆڤ پیاو بێ یان ژن کوڕ بێ یان کچ، ئەگەر مەبدەئو بیرو بڕوایەکی نەبوو کەلەسەری بژی و بۆی بمرێ. ئەوا هەموو ژیانی دەبێت بەچاولێکەری خەلکی وئیتر گوێ ناداتە ئەوەی کەئەم چاولێکەریە سەرەنجامی چاکە یان خراپە. زۆر جار ئەوەی ئەم تەقلیدە دەکات، مۆدیل داهێنەرەکە دەمێکە لێی پەشیمان بۆتەوە. پێغەمبەری چاوساغ و ڕێنیشاندەرمان هەر لەزوەوە ئاگاداری کردین وفەرمووی: (لايَكُنْ أَحَدُكُم إِمَّعَةً، يَقُولُ: أَنا مَعَ النّاسِ، إِنْ أَحْسَنَ النّاسُ أَحْسَنْتُ، وَإِنْ أَساءُوا أَسَأْت) باهەریەك لەئێوە لەو کەسانە نەبێ کەلەگەڵ هەموو کەسە ودەڵێ من لەگەڵ خەلکیم، ئەگەر خەلکی چاکیان کرد چاك دەکەم وئەگەر خەلکی خراپیان کرد منیش خراپە دەکەم.

**بۆ ڕونکردنەوەی ئەم فەرموده زێڕینە دەڵێم:** چەندین جار بوە کەباوك ئامۆژگاری کچەکانی کردوە وپێی ووتون: ڕۆڵە خۆتان داپۆشن، جل و بەرگێك لەبەر بکەن کەشەرعی خوا پێی ڕازی یە ومایەی ڕێزو حورمەتتانە و لە چاوی پیسی چاوچنۆکان بەدورتان دەکات. یان کچەکانم ئاگاتان لە مۆبایلەکانتان بێت.

لەم کاتەدا کەئەم باوکە خەریکی ئەم ئامۆژگاریە جوانەیە ژنەکەی لێی بەرزەپێ دەبێ وبەدەمیا دێتەوە ودەڵێ: ئەی کچی ئەو خەلکە بۆ هەموی تا ئەژنۆی ڕووتە وسەری بێ سەرپۆشە؟! ئەی کچی ئەو خەلکە بۆ شەو وڕۆژ مۆبایلی بەگوێوەیە وکەسیش ناڵێ لەگەڵ کێ قسە دەکەی!! دەی باخراپیش بێ چونکە خەلکی وادەکەن منیش وادەکەم!

جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: وامەکـەن (وَلَكِنْ وَطِّنُوا أَنْفُسَكُم إِنْ أَحْسَنَ النّاسُ أَنْ تُحْسِنُوا. وَإِنْ أَساءُوا أَنْ تَجتَنِبُوا إِسائاتِهِم) رَواهُ الترمذي.

واتە: خاوەن ڕەئی ومەبدەئی خۆتان بـن. سـەیرکەن ئەگـەر خـەڵکی چـاکیان کـرد وهەڵوێست وگوفتار وڕەفتاریان چاکە وچاکەکاری بـوو. بـەپێوەری شـەرع پەسـەند بوو. ئێوەش وابکەن ولەچاکەدا شوێن پێ ی خەڵکی هەڵگرن. بەڵام ئەگەر خراپەیان کرد، ناشەرعیان کـرد. ئـەوە ئێـوە خۆتـان بپـارێزن لەلاسـایی کردنـەوەی ڕەفتـار وگوفتارە ناشەرعیەکانیان وبەشوێنیاندا مەڕۆن:

**بەڵێ ئیمانداران:** پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ئومەتەی وافێرکـرد کـە مەبدەئیانـە بژین خاوەنی شەخصیەت وکەسایەتی خۆیان بن. چاولێکەری کوێرانە نەبن.

فەرمووی: (لَيْس مِنّا مَنْ تَشَبَّه بِغَيْرنا، لاتَشَبَّهُوا باليَهُودِ وَلاالنَّصـارى) حَـدْيث حَسَن ، صَحيح الجامِع رَقم: (٥٤٣٤).

واتە: لە ئێمە نیە کەسێك کەخۆی بچوێنێ بەغەیری موسڵمانان. خۆتان مەچـوێنن بەجولەکە وگاورەکان.توخوا کەسێك لەم ئیسلامە دەوڵەمەنـدەوە کـەورد ودرشـتی ژیانی تاك وخێزان وکۆمەڵی باس کردوە، فێری یاسا ودەستوری ژیـان نـەبێ وچـاو لەبێگانە بکات، ئەبێ ئەوکەسە چ پەیوەندیەکی بەئومەتی محمدەوە (ﷺ) بمێنێ؟!

بە ڕاستی چاولێکەری کوێرانە وای لەکوڕ وکچە لاوەکان کردوە کەشوناسـی خۆیـان بزربکەن. چەند کچ دەبینی بەسەر وقژو پانتۆڵ وکراس دەیەوێت خۆی بکات بەکوڕ. چەند کوڕیش بەبرۆ هەڵگرتن وزنجیر لـەمل وگـوارە لـەگوێ کـردن وجلـی کچـانە لەبەرکردن. حەزدەکات وەکو کچان بێ.

کە پێغەمبەری خوا دەربارەی ئەو جۆرە کەسانە فەرمویەتی:

(لَعَنَ اللهُ المُخَنّثِينَ مِنَ الرِّجالِ والمُتَرَجِّلاتِ مِنَ النِّساءِ) رَواهُ البُخاري (٥٨٨٦).

واتە: نەفرەتی خوا لەو پیاوانە بێ، کەژنانە هەڵس وکـەوت دەکـەن ولـەو ژنانـەش کەپیاوانە هەڵس وکەوت دەکەن.

بەڵێ ئەمڕۆ جنسی سێیەم دروست بووە، کەنەژنە نەپیاوە. باشە بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) نەفرەتی لێ کردوون؟! چونکە هەرگەل و میللەتێك گەنج ولاوەکانی ئاوابوون. ئەوە نیشانەی دوارۆژ ڕەشی و فەوتانیانە. هەر کچ وکوڕێك ئاوا بژی. ئەوە نیشانەی هەست کردنیەتی بەکەم وکوڕی وخۆپێ کەم بوون. وە لەدەست دانی کەسایەتی ولەکارخستنی عەقڵ.

زۆرجار ئەوکوڕو کچانە کەخەڵك تەماشایان دەکات، وادەزانێت ئەوە خەڵکی پێی موعجەب بوون بەڵام دەبێ باش ئەوە بزانێ کەئەوە سەرنج دانی بەسووك سەیرکردن و بێبەهاییە. بەداخەوە خۆجوان کردنی – ئافرەت کە بۆ مێردەکەی خۆی جێی دەست خۆشی و ڕێزە. لەسنوور دەرچووە. بەهۆی لاسایی کردنەوەی کوێرانەوە.

کچان و ئافرەتانی واهەن برۆیان دەتاشن!! برژانگی دەستکرد دادەنێن! عەدەسەی ڕەنگا وڕەنگ لەسەر گلێنەی چاویان دادەنێ کەلەڕووی پزیشکی یەوە مەترسی زۆرە بۆ سەرچاو!! نینۆکی دەستکرد دەخاتە سەر نینۆکەکانی!! نەشتەرگەری گەورەکردنی لێوو بچوك کردنەوەی لووت ونەشتەرگەری جوانکاری لەسنوری پێویست دەرچووە وپارەیەکی یەگجار زۆر بەهەدەر دەڕوات. لەکاتێکا بەسەدان نەخۆش بۆ لابردنی ئازار پێویستیان بەنەشتەرگەری هەیە نەك بۆ جوانکاری!!

**جا دەپرسین:** ئایا ئەوە خۆجوان کردنە یان خۆتەزویر کردن؟! بەڵێ تەزویرکردن لەتەزویری پارە ومۆرو مێژوی بەسەرچونی خواردن وتەزویرکردنی خۆراکەوە گەیشتە سەر تەزویری دەم وچاویش گەیشتە سەر تەزویری چاوو برۆو ڕەنگی پێستیش. چەند گەنج هەیە کەلەگۆڤارەکاندا ئەوەی دەربڕیوە کەحەزدەکات لەبەرەبەیانێکی زوودا بچێ بۆ بینینی ئەو کچەی کەدەیەوێ بۆ هاوسەری ژیانی داهاتوی هەڵی بژێرێ! بۆچی ئەو بەیانیە زووە؟! بۆ ئەوەی وەکو خۆی ببینێ. کاتێ لەخەو هەڵدەستێ وهێشتا دەستی نەگەیشتۆتە هیچ دەرمانێك. بزانێ چۆنە؟ چونکە لەوە دەترسێ ئەوەی لەدەرەوە بینیویەتی تەزویربێ وئەو پێستە لەژێرەوە وانەبێ!! جا توخوا حەیف نیە مرۆڤ درۆ لەگەڵ خۆی ولاشەی خۆشی بکات؟!

ئایا ئەمە هونەر وزەوقە، یاخود درۆ وگێلیەتیە؟! یاخی بونە لە فیگـرەت. یـاخود گۆڕین ودەستکاری کردنی دروسـتکراوەکانی خوایـە؟! سـاویلکەیی عەقڵـە یـاخود لاسایی کردنەوەی کوێرانەیە؟! بەڕاستی هەموی بێ مەبدەئی وئیمان بەخۆنەبونە.
مرۆڤـ بەوەی کە هەوڵ بدات لاسایی ڕەگەزی بەرامبەری بکاتـەوە و لەتایبەتمەنـدی خۆی دەرچێت. نەك نیشانەی پێشکەوتنی ورۆشنبیر بوونی نیە. بەڵکو دەیسـەلمێنێ کەمتمانەی بەخۆی نیە وناسنامەی خۆی بزر کردوە.
**بەڕێزان:** دەردی گران ئەوەیە، بەهەڵە لەشتی خەڵکی وکـاروکردەوەی حـاڵی بـبی! زۆرێك لەئافرەتانی وولاتی موسـڵمان کـەجلی ناپۆشـتە لەبەردەکـەن وڕووخسـاری خۆیان تەزویر دەکـەن ودەگەنـە ئاسـتی لەسـنوور دەرچـوون لەخۆئارایشـت دانـا. بەحیسابی خۆیان بۆیە وادەکەن چونکە ئافرەتانی ئەورووپی وادەکـەن بۆیـە ئـازادن! بەلاَم ڕاستی یەکەی ئەوەیە: ئافرەتانی ڕۆژئاوایی مەگـەر لەبۆنەیـەکی تایبـەتی دا یان لەپشوویەکدا خۆی بڕازێنێتەوە وئارایشت بکات باقی ڕۆژەکانی سـاڵ خـەریکی کارکردنە، نەك وەکو لای ئێمە ساڵ دوانزەی مانگ خەریکی سوراو وسپیاو وڕەقس وسەما وهەڵپەڕکێ بن!! وە ڕاستیەکەی ئەوەیە ئـافرەت لـەڕۆژئاوادا لەکۆیلایـەتی یەکی بەناو ئازادیدا دەژی.
**ئافرەتێکی ئەورووپی دەڵێ:** هێشوە ترێ یەك لەشەقامەکانی پاریس دا، لەئافرەتێك بەنرخترە!!زانای ناودار د.إبراهیم دوەیش لەکتێبی (الفَتاة أَلَم وَأَمَل)دا دەڵێ: یەکێ لەئەدیبەکان باسی کرد کەلەیەکێ لەووتارەکانی دا لەئەمریکادا باسی لە ئافرەتانی موسڵمان کردوە. لەوێدا باسی لەسەربەخۆیی ئـافرەتی موسـڵمان کـردوە. لـەبواری کاروباری دارایی دا ولەوەدا کـەهیچ سەرپەرشـتیارێکی نیـە لـەماڵ وسـامانی دا. ئەگەر شووی کرد دەبێـت هاوسـەرەکەی خەرجیـەکانی بکێشـێ. تەنانـەت ئەگـەر خاوەنی ملیۆنەها دۆلاریش بێت، ئەگـەر هاوسـەرەکەی کرێکـارێکیش بێـت:.**ئـەو ئەدیبە دەڵێت:** کاتێ لەووتارەکەم تەواو بـووم، ئـافرەتێکی ئـەمریکی کەیەکێکـە لەنوسەرە دیار وبەناوبانگەکانی ئەوێ هەستایە سەرپێ و ووتی:

ئەگەر ئافرەت لای ئێوە بەم جۆرەیە کەباست کرد، بمبە باشەش مانگ لای ئێوە بژیم ودوایی بمکوژن.
بەڵێ بەو جۆرە ئەوان ئاخ وحەسرەت هەڵدەکێشن وئارەزوی ئەو ژیانە دەکەن کەئافرەتی موسڵمانی تێدایە..

بەڵێ، ئافرەتی وولاتی ئێمە بەهەموو شێوەیەك کاری بۆتە لاسایی کردنەوە، فلاّن گۆرانیبێژ، فلاّن بەناو شانۆکار، ئەو جل وبەرگەی لەبەرکرد. ئاوا قژی بڕی. ئاوا خۆی ڕازاندەوە. ئاوا قسەی کرد. ئەمیش هەرلەبەر تەلەفیزیۆنەکە هەڵدەستێ وهەوڵی لاسایی کردنەوەی دەدات بەڵکو وەکو ئەوی لێ بێ ووەکو ئەو بەختەوەر بێت!!. بەلاّم دڵنیابن زۆربەی زۆری ئەوانە ناخۆشترین ژیانیان هەیە، یەکێ لەوانە (مارلین مۆنرۆ)یە، ئەو ئافرەتەی گەیشتە لوتکەی ناوبانگی جیهان. وەرە گوێ بگرە بزانە بەغەمباری یەوە دەڵێ چی؟! دەڵێ: خۆت بپارێزە لەناوو ناوبانگ، من کلۆڵ وداماوترین ئافرەتی ئەم سەر زەویەم، نەمتوانی ببمە دایك. من ئافرەتێکم لەهەموو کەس زیاتر ژیانی خێزانی ومالّم بەلاوە پەسەند ترە لەهەموو شتێکی تر. سەعادەتی ڕاستەقینەی ئافرەت لەژیانی سەربەرزانە وپاکی مالّ وخێزانداریدایە. نەك هەرئەوە بەڵکو تەنها ئەو ژیانە ڕەمزی سەعادەتی ئافرەتە!

**کەواتە:** دڵنیابە مۆدێل کاری بەختەوەرت ناکات، بەڵکو ژیانت لێ دەکات بەژان. جا کەوابوو بۆ ئەوەی نرخت هەبێ و خاوەنی کەسایەتیەکی بەرزبی، هەوڵبدە خاوەن بیروڕای خۆت بەو دووربە لە چاولێکەری کوێرانە..

٣- ئاگات لە بەکارهێنانی تەلەفۆنەکەت بێ، هەرکەسێکت نەناسی وتەلەفۆنی بۆ کردی. یان هەروەلامی مەدەرەوە. یان ئەگەر وەلاّمت دایەوە تەنها ئەوەندە قسەی لەگەلّ بکە کەتێ دەگەی بۆچی تەلەفۆنی کردوە. وەدەنگی خۆتی بۆ ناسك مەکەرەوە کەوابزانێ حەزدەکەی قسەی لەگەلّ بکەی

خـوای گـەورە بەخێزانـەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێ: ﴿فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا﴾

**کەواتە:** ئیسلام بە ئافرەت دەڵێ ئاگاداربە پیاوانێکی دەرون نەخۆش هەن لەکۆمەڵ دا، دڵ ودەرونیان پیسە. ئەگەر ئافرەتێك هەرچەندە پـاکو خـاوێن دەرون ورەوشـت بەرزیش بێ وەکو برا سەیری بکات. هەرکەزەردەخەنەیەکی بەڕودا کـرد ویەنـەرمی قسەی لەگەڵ کرد، یەکسەر ئەم دڵ نەخۆشە، دەرون پیسە وا ئـەزانێ ئـەم ئافرەتـە عاشقی بوە و ئیتر چاوی پیسی تێ دەبڕێ و هەوڵی تێرکردنـی ئـارەزوە پیسـەکانی خۆی دەدات. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نی یە ئیسلام دەمی ئافرەتی بەستبێ بـەڵکو فەرمویەتی قسەی جوان وگونجاو هەڵبـژێرە (قَوْلاً مَعرُوفاً). گوفتـارت بـێ وئاگـات لەقەدر وحورمەتی خۆت بێت!.

بەڵێ ئەی خوشـکی بـەڕێز ئاگـاداری خـۆت بـەو ووریابـە لـە ڕێگـەی تەلـەفۆنی نەناسراوەوە نەکەویتە داوەوە. چونکە ئەوە هەنگاوی یەکەمە وزۆر بەزەحمەت لێـی دەردەچی.

**خـــوای گـــەورە فەرمویـــەتی:** ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ﴾ البقـرة: ١٦٨

شوێن هەنگاوەکانی شەیگان مەکـەون. چـەند ئـافرەت لـەو تەلەفۆنـە بەحیسـاب هەڵـەوە چـۆتە داوێ قسـەکردنەوە وسـەرەنجام تیـا چـووە. لـە سـەتەلایتی گـەلی کوردستانەوە، کاتێ پەیامنێرەکەی ڕاپۆرتێکی ئامادەکردبوو لەسـەر (بەندیـەکانی بەشی تاوان) وقسەی لەگەڵ ئەو کەسانە کردبوو کـە بـەهۆی ئەنجامـدانی تاوانـەوە گیرابوون. یەکێ لەو بەندیانە. ئافرەتێك بوو، خەڵکی شاری (ڕ) بوو.

بەم جۆرە باسی خۆی وئەو هۆیەی کە ئەمی خستۆتە ئەم بەندیخانـەوە بـاس کـردو ووتی: ڕۆژێکیان دەگەڕامەوە بۆماڵەوە، دەستم لەتەکسـیەك ڕاگـرت وسـەرکەوتم. هەستم کرد شۆفێری تەکسیەکە لەئاوێنەی ناوەڕاستەوە نـاوە نـاوە سـەرنجی دەدام. هەندێ ڕۆیشتین و ووتی: ئەرێ زەحمەت نەبێ مۆبایلت پێ یە. تەلەفۆنێکی زەروری

پێ بکەم ومۆبایلم لەبیرچوە؟! منیش ووتم: زۆر ئاسایی یـە فـەرموو. مۆبایلەکـەم دایە وجەرەسێکی کرد. دیاربوو بۆ مۆبایلەکەی خۆی کردبوو، ووتی: وەڵام ناداتەوە ومۆبایلەکەی دایەوە دەستم. وە هەرچەند کردم پارەشی لێ وەرنـەگرتم. بەبەهانـەی ئەوەی منیش یارمەتیم داوە ومۆبایلەکەمم داوەتێ. بەڵێ یەك دوو ڕۆژی پێ چوو. جەرەسێکم بۆهات ژمارەیەکی نەناسراو بوو، دوودڵ بووم وەڵامی بدەمەوە یان نا.

(ئای خۆزگە هەرگیز وەڵامم نەدایـەوە). بـەڵام لـە کۆتاسـاتدا هـەڵم گـرت و وتم: فەرموو. ووتی: تکات لێ دەکەم گوێم لێ بگرە وتەلەفۆنەکە دامەخە. من شۆفێری تەکسیەکەم کەمۆبایلەکەم لـێ وەرگرتـی، ئـەوە مێردەکـەت سـەیارەی نیـە واتـۆ لەبازاڕدا بەپێ دەڕۆیـت؟! منـیش وتم: سـەیارەی چـی! خانوشمـان نیـە. کرێچـین و مێردەکەم کرێکارە، چەند منالّمان هەیەو هەر ئەوەیە ڕژانە دەژین!

بەڵام تۆ مەبەستت چی یە؟! ووتی: توخوا حەیف نیە ئافرەتێکی بێ وێنەی وەکو تۆ جوان ژنی کرێکارێك بێت؟!! من کوڕێکم ژنم نیە. سـەیارەی خـۆم هەیـە. خـانوی سەربەخۆم هەیە

ئـیتر نەمهێشـت قسـەکانی تـەواو بکـات ودوا ئامـانجی قسـەکانی بـدرکێنێ تەلەفۆنەکەم بەسەردا داخستەوە بەڵام نەفس وشەیگان کاری خۆیان کـرد. ئـەوەبوو دڵم بۆی دەجولا وبێ ئەوەی بەوێ مێرد ومالّ ومنالّەکانم بەرچاوکەوتن ودڵـم چـوو سەرئەو کوڕە گەنجە. دەولّەمەندە وپێوەی وابەستە بوم: ئەوەبوو ئەویش وازی نەهێنا وشەیطان سێیەم بوو لەنێوانماندا. تەلەفۆنی کردەوە وئـەمجارەیان منـیش بەناسـکی ونـەرمی قسـەم لەگـەڵ کـردو. سـەرەنجام وادەی یـەکتربینینمان دیـاری کـرد!!.

کاتێ هاوسەرەکەم دەچوو بۆ کرێکاری ومنالّەکانم بەرێ دەکرد بۆ قوتابخانە، دەهاتە مالّەوە ودەستمان تێکەڵاو دەکرد: ئەوەبوو هەنگاو بەهـەنگاو شـەیطـان دەهاتـە پێشەوە لەگەڵماندا ونەخشەی نوێ ی بۆ دادەڕشتین. تائەوەبوو ئەو کەسە پێی ووتم: من و تۆ ناتوانین هیچی تر ئاوا دوربەدور وبەدزی یەوە یەکتر ببینین. بـەڵکو دەبـی لەیەك مالّدا وشەو وڕۆژ بەیەکەوە بین! ووتم: جـا ئـەوە چـۆن دەکـرێ، ووتـی: مـن

فکرەیەکی باشم بۆ هاتوە، ئەویش ئەوەیە: دەبێ مێردەکەت و کوڕەکەت کەتەمەنی (٩) ساڵە بکوژین ولاشەکەیان لەدەرەوەی شار فڕێ بدەین!!!
بۆ کوشتنی مێردەکەم هیچ دودڵیەکەم نەنواند. تەنها پرسیارم لەبارەی ئەوەوە کرد کەئەی بۆچی کوڕە (نۆ) ساڵەکەشم بکوژین؟! ووتی: بۆ ئەوەی هیچ کەس هەرگیز گومانی بۆ تۆ نەچێ وسەر لەدادوەری لێکۆڵینەوە دەشێوێنین کەدەڵێ، ئەگەر ئەمە دەستی ژنەکەی بێ ئەی کوڕەکەی بۆ دەکوژێ؟!
بەڵێ لەپێناوی حەزێکی بۆگەنی دا، بڕیارەکەم پەسەند کرد وشەوێکیان کە مێردەکەم کە بەڕۆژ لەکرێکاریدا زۆر ماندو بوو. ڕۆژی بەهار بوو. هەر زوو خەوت و منالەکانیشم دوای پێداچونەوەی وانەکانیان حەوتن، تەلەفونم بۆ کردو هات و لەخەودا هەردوکیانمان کوشت وپاشان خستماننە سەیارەکەیەوە و لەدەرەوەی شار لاشەکەیانمان فڕێ دا بەڵێ هاتینەوە بۆ ماڵ و وەکو هیچ ڕوی نەدابێ من خەوتم وئەویش ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆیان، ئەوەبوو بۆ بەیانی نزیکی سەعات (١٠) پۆلیس لەڕێی کەسێکەوەهەواڵی پێدرابوو کەپیاوێك ومناڵێك لەفلان جێگا کوژراون.
دوای لێکۆڵینەوەکە بۆیان دەرکەوتبوو مێرد وکوڕەکەی منن ئاگاداریان کردین ولەگەڵ خزم وکەس وکاردا داوامان تۆمار کرد لەسەر تاوانباران وئیفادەم لەبەردەم دادوەردا کەبەسەردان چون بۆ ماڵی خزمێکمان ودیارە لەڕێگا کوشتویانن.
هەموو خەڵکی زۆر بەپەرۆش بوون، بەتایبەت بۆ مناڵێکی (نۆ) ساڵان وپیاوێکی کرێکار کەزەرەری بۆ هیچ کەس نەبووە: بەڵێ بەحیسابی خۆمان سەرمان لەدادگای سەرزەوی شێواندبوو. بەڵام دادگای ئاسمان ئەم ستەمە گەورەی قبوڵ نەکردو هەرلەپرسەکەدا کە پۆلیس بەفەرمانی دادوەری لێکۆڵینەوە چاودێری خستبوە سەرم ومنیش بەزۆر خۆم دەگریاند ولەدڵەوە هیچ هەستم نەدەجولا!! هەربۆیە دوای پرسە دادوەر — حاکم — بانگی کردم وفەرمانی دەستگیرکردنی دام وخۆشم نەمزانی چۆن زمانم هاتە گۆو بێ ئەوەی هەست بەخۆم بکەم دانم نا بەهەموو تاوانێکدا وناونیشانی ئەو کوڕەشم پێ وتن وئەویشیان دەستگیر کرد وئێستا چاوەڕێی

مەحكەمەین ودڵنیام كەژیانمان كۆتایی پێ هات وڕووڕەشی بەردەم خوا ومێژوو بەشمانە.

**بەڵێ ئیمانداران:** لەم ڕوانگەیەوە پێویستە كەدایكان وباوكان ئاگایان لەتەلەفۆنی كوڕ وكچە هەرزەكارەكانیان بێ. نەك دڵ پیسی وئازادی لێ زەوت كردن، نەو. بەڵكو ئامۆژگاری كردن و بە ئاگاهێنانەوە بەوەی كەنرخی خۆی بپارێزێ وخۆی سوك نەكات بەوەی كەژمارەی مۆبایلی بداتە دەست كوڕێكی زمان لوسی وفێڵ باز كەكاتی پێ بەرێتە سەر چونكە دڵنیابن هەركچێك لەڕێگەی موبایلەوە شوبكات، تاماوە لای مێردەكەی متمانەی پێ ناكرێ و ڕەنگە هەر بەموبایلیش تەڵاق بدرێ.

مامۆستایەك دەفەرموێ: كوڕێك كە پەیوەندی لەگەڵ كچێك دروست كردبوو لەڕێگەی موبایلەوە. كەلەڕێگەی خزمێكیەوە ژمارەی ئەو كچەی دەست كەوتبوو. پاش چەند ساڵێك كەئەم كوڕە هەربەڵێن بەوكچە دەدات كەبیخوازێ و بەڵام نایەتە پێش. كچەكە پەنا بۆئەم مامۆستایە دەبات كە بەڵكو ئەو كوڕە ئاگاداریكاتەوە كەهیچی تر كات بەفیڕۆ نەدات وئەم كچە لەم دڵە ڕاوكێ یە دەربێنێ.

بەڵام كاتێ مامۆستا وەكو كەسێكی دڵسۆزو خەمخۆر ئەم داواكاری كچە بەوكوڕە دەگەیەنێت. وەڵامی كوڕەكە ئەمە دەبێت: مامۆستا گیان من دەمەوێ كچێكی بەشەخصیەت بكەمە هاوسەری خۆم. كچێك بێ بەهەست وسۆزبێ. چۆن دەتوانم كچێك بكەمە هاوسەری تەواوی ژیانم ودایكی منداڵم كەلەڕێی كەسێكەوە موبایلەكەیم دەست كەوتبێ ولەڕێگەی قسەكردنی موبایلەوە ئامادەبوبێ پەیوەندیم لەگەڵ ببەستێ. ئیتر چۆن لێی دڵنیابم كەپەیوەندی لەگەڵ كەسێكی تریشدا نابەستێ!!.

٤- ئەی خوشكی بەڕێز بۆئەوەی نرخی خۆت لەدەست نەدەی بزانە هاوڕێیەتی كێ دەكەی. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (**المَرْءُ عَلى دينِ خَليلِهِ، فَلْيَنْظُرْ أَحَدَكُم مَنْ يُخايل**) حَديْث حَسن رَواهُ أَبُوداود.

واتە: مرۆڤـ لەسەر بیرو باوەڕ ورەوشتی هاوڕێیەکەیەتی. دەی هەریـەك لـەئێوە بـا بەرچاو ڕون بێ وبەوریایەوە سەرنج بدات کەکێ ی کردۆتە هاوەڵی خۆی.

**گەنجی بەڕێز:** هەرکوڕێك باسی کچ وشەرەفی خەڵکی کـرد دەسـت بـەجێ وازی لێ بێنە، چونکە ڕۆژێك دەبێت کەتەماح لەخوشك وخێزان وناموسی تۆش دەکات.

**ئوموسەلەمە دەفەرموێ:** ڕۆژێکیـان پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) سـەردانی کـردین، لەوکاتەدا پیاوێکی ژنانی – حەزکەر لەباسی ژن – لەماڵی ئێمە بوو. گوێم لێ بوو ئەم پیاوە ژنانیە قسەی بۆ عَبْدُاللّـــە ی کـوڕی ئـەبی ئومەیـە دەکـرد ودەیگـوت: ئەی عَبْدُالله ئایا ئەگەر ڕۆژێك شاری طائف ڕزگارکراو کەوتە دەسـتی موسـڵمانان، ئاگات لێ بێ کچی فلانەکەسی لێ یە. ئەوە سمت وشانیەتی. لە پێشەوە چـوارلا و لە پشتەوە هەشت لایە لەقەڵەوی دا پێغەمبەری خواش (ﷺ) گـوێی لـەم قسـەیە بوو. ئامۆژگاری کردین و فەرموی: (لايَدْخُلْنَ هؤلاء عَلَيْكُنَّ) با ئەم جـۆرە کەسـە سەر ژنانیە. کەباسی کـچ وناموسـی خـەڵك دەکـەن. هاتوچـۆتان نەکـەن ونەیەنـە ماڵتان. ئەم فەرمودەیە – رَواهُ البُخاري وَمُسْلِم (٢١٧٩).

**حەزرەتی عوسمانی کوڕی عەفّان دەفەرموێ:**

زیناکار خۆزگە دەخوازێت هەموو ئافرەتێك زیناکار بێت.

ئای چەند کـەس لـەکوڕان وکچـانی ڕەوشـت بـەرز، هـیچ خراپەیـەکی نـەدەزانی، ژیانێکی پاکو خاوێن دەژیا. بەڵام بەهۆی برادەری خراپەوە، دەرگای خراپەی لەسەر کرایەوە. جا ئاگات لەخۆت بێ نـەبی بـەکلیلی دەرگـای شـەڕ، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموی: خەم وپەژارە بۆ کەسێك کە دەبێتە کلیلـی کردنـەوەی دەرگاکـانی خراپەو داخستنی دەرگاکانی خێرو چاکە.

بەڵێ هەرکەسێ خەڵکی فێری خراپە بکات. ئەوا لەڕۆژی قیامـەتدا گوناهی خۆشی وگوناهی ئەوانەشی لەملە کە بەهۆی ئەوەوە فێربوون. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ لِيَحْمِلُوٓا۟ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۙ وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴾ النحل: ٢٥. ئەمرۆ بە بەرنامە خەڵکی فێری پەیوەندی ناشەرعی دەکرێ، وەکو مەسیجی تەلەفزیۆنەکان، وەکو ئەو گۆڤار وڕۆژنامانەی کە

ڕۆژانەو حەفتانەو مانگانە، دەیان چیرۆك بڵاودەكەنەوە لەسەر تاوانی داوێن پیسی، كە ئەمەش وادەكات خەڵكی وخوێنەر ئەوەندە باسی زینا وخیانەتی هاوسەری داوێن پیسی ببیستیٚ.

سەرەنجام ئەو تاوانە.قێزەونەی بەلاوە سوك ببیٚ و وا لەمێشكیا وێنا ببیٚ كەخۆزینا وخیانەت ئەوەندە عەیبەیەكی گەورە وقێزەون نیە كەمن بیرم لیٚ دەكـردەوە. ئـەوە نی یە بەسەدان كەس ئەم كارە ئەنجام دەدەن!!

بەڵیٚ ئەمە هەموی بەرنامە وپیلان بۆ داڕێژراوە وزۆربەی هەرە زۆری ئەو چـیرۆكانە هەڵبەستراون و لەزەمینی واقیعدا بونیان نیە.

٥- دورکەوتنەوە لەهەموو بابـەتێکی جوڵێنـەر ووروژێنـەری جنسـی وسێكسـی. كەواتە ئاگاداری كەناڵەكانی سەتەلایتەكەت بە، بەتایبەت كاتیٚ كوڕ وكچـی تـازە پێگەیشتووت هەیە. چـونكە ئەگـەر لـەدەرەوەی مـاڵیش پـارێزراو بێـت. ئەگـەر سەتەلایتەكەت پاك نەبیٚ لەكەناڵە بـیٚ ڕەوشـتیەكان، سـەرەنجام كـوڕ وكچـەكانت لەماڵەوە توش دەبن.

٦- زوو ئەنجامدانی هاوسەرگیری: لەدینی ئیسلامدا ئەوكەسەی ژنی هێنـا وشـوی كرد وژیانی هاوسەری ئەنجامدا، پیٚ ی دەوتریٚ (مُحْصَن).

واتە: لە قەڵا وشواری قایم وپتەودایـە ودوژمنـی نـەفس وشـەیاگینیەكان نـاتوانن زەفــەری پــیٚ ببــەن ولــیخن وچــڵكنی بكــەن وتوشــی بەدڕەوشــتی بكــەن. چونكە ئارەزوەكانی ناوناخی، لەغەریزەی جنسـی بەحـەڵاڵی لەگـەڵ هاوسـەرەكەی خۆیدا بەتاڵ دەكاتەوە بەڵام ئەگەر هاوسەری نەبوو. ئەوا مەگەر ئیمـان وخواناسـی بیپارێزیٚ و ئەینا بۆ بەتاڵ كردنەوەی حەزەكانی شەیطان و نەفس بە ئاسانی فریـوی دەدەن، واتە وەكو كەسێك وایە كەلەبیابانداییٚ وهیچ شورە وپەرژینێكی بـەدەورەوە نەبێت، زۆر بەئاسانی گورگ دەیخوات. ژەهراویەكان پێوەی دەدەن وژەهراوی دەكەن. پێغەمبەری دڵسۆزمان (ﷺ) هەر لەزوەوە ئامۆژگـاری گـەنجانی كـردو فـەرموی:

(يامَعْشَرَ الشَّباب مَنِ اسْتطاعَ مِنْكُمُ الباءَةَ فَلْيَتزَوَّج، فَإنَّهُ أغضُّ لِلْبَصَرِ وَأحْصَنُ لِلفَرْجِ).

**بەڵێ بەرِێزان:** ئیسلام دینێکی میشالی نی یە. وابزانێ مرۆڤ فریشتەیە، بەڵکو خالیق کە (الله) یە، زانایە بەوەی کەمەخلوقەکەی کەمرۆڤە پێویستی بەرِەگەزی بەرامبەرە. تاوەکو لەلایدا بحەسێتەوە. وە مرۆڤ پێویستی بەئەڤین وخۆشەویستی وسۆزداری وئاسودەیی هەیە. وە نێرومێ عەودالّی هەیە بۆ یەکتر. جا ئەگەر بەحەلاڵی دەستی کەوت، ئەوە پەنا بۆ حەرام نابات. خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ الروم: ٢١.

(سُبْحانَ الله) تەعبیری قورئانی چەندە ووردە. ووشەی (لِّتَسْكُنُوٓا۟) بەکاردێنێ. چۆن مرۆڤ هەتا نەگەرِێتەوە ناو ماڵی خۆی و ووڵاتی خۆی. هەر هەست بەغەریبی ونامۆیی دەکات.

هەردوو رِەگەزی نێرومێش بۆ یەکتری ئاوان وتانەگەن بە یەکتری و سوکناو ئارامی دڵ ودەرون هەست پێ ناکەن و لەغوربەت رِزگاریان نابێت.. وە ئەو بەیەك گەیشتنەش گەورەترە لە تەنها تێرکردنی حەز وئارەزوی جنسی. بەڵکو لەسەر بنەمای (مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً) دامەزراوە. **کەواتە:** ئەی گەنجان دڵنیابن ئیسلام دژی خۆشەویستی نێوان رِەگەزی نێرومێ نیە. بەڵام دەفەرموێ: با خۆشەویستیەکی پاك وبێ گەرد وبێ لەکە، بۆ مەبەستی پێکەوەنانی خێزان بێ. نەك خوانەخواستە بۆ یەکتر سوك کردن.

**لەکۆتایی ئەم ووتارەشدا پێویستە ئەوەش بڵێین کە:** مرۆڤ بەگشتی لەهەموو تەمەنێکدا بەتایبەتی تەمەنی گەنجیەتی وهەرزەکاری توشی هەڵە دەبێ. بەڵام دەرگای گەرِانەوە بۆلای خوا، کەرِێگای پاکی وبەختەوەری وبەنرخی مرۆڤە. لەکەس

داناخریّ و پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ، وَخَيْرُ الخَطَّائِينَ التَوَّابُونَ) بەلّێ مادام ئەوەی باوکە ئادەم ودایکە حەواین وئەوانیش هەڵەیان کرد وشەیگان فریوی دان ئاسایی یە کەزۆر ئاسانتر ئێمەش بخەڵەتێنیّ و مرۆڤیش نەك هەرهەڵە دەکات. بەلّکو (خَطَّاءٌ) واتە: زۆر زۆر هەڵە دەکات.

بەلاّم ئەم هەڵەو تاوان وگوناهەشی بۆ دەبێ بە مایەی خێر. کاتێ کەتەوبەی ڕاستەقینە بکات وبەردەوام بێ لەسەر تەوبەکەی ولە – التَّوابون – دا خۆی تۆمار بکات. گرنگ ئەوە نی یە کەچڵکن نەبی. گرنگە چڵکن بوی بۆگەن نەکەی وزوو خۆت بشۆری. وە بۆ زیاتر شارەزا بوون لە خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەو گەنجانەی کەتوشی هەڵە دەبن وپاشان تەوبە دەکەن، ئەم باس وبەسەرهاتە پێشکەش بەگەنجان دەکەم.

**جابری کوڕی** عَبْدُالله **دەگێڕێتەوە ودەفەرموێ:** لاوێك لەناو شاری مەدینەدا موسڵمان بوو ناوی (سەعلەبەی کوڕی عبدالرَّحْمن) بوو. یەکێك بوو لەهاوەڵانی ئەنصار. ئەم لاوە خزمەتی پێغەمبەری خوای دەکرد. ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەینێرێت بۆ کارێك بەلایماڵێکدا تێ دەپەڕێت وتەماشای ماڵێك دەکات. ئافرەتێك دەبینێت وا لەژورەوە خۆی دەشوات. دەست بەجێ هەست دەکات تاوانی کردوە کە لەدەرگاوە سەیری ماڵێکی کردوە. دەترسێت ئایەتی لەسەر بێتە خوارەوە. (ئاها چاودێری خوایی چەندە گرنگە بۆ ئیصلاحی کۆمەڵ!). بەلّێ ئەم گەنجە لەڕوی نایەت بێتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەلّکو دەڕوات بۆ ناو ئەشکەوتی شاخەکانی نێوان مەککە ومەدینە. لەوێ زۆر پەشیمانی بەفرمێسك ڕژاندن لەخوا دەپاڕێتەوە کەلێی خۆش بێت لەم لاوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆماوەی (چل) ڕۆژ هەواڵی نازانێت، بۆیە حەزرەتی جوبریل دێتە خوارەوە هەواڵ

دەدات بەپێغەمبەر (ﷺ)کە پەروەردگار دەفەرموێت: لاوێك، گەنجێك لەناو ئومەتەکەتدا لەو شاخەدایە وپەنای بۆلای من هێناوە. پێغەمبەری خوا هەر دوو بەڕێزان، عومەری کوڕی خەطّاب و سەلمانی فارسی دەنێرێت بەدوای سەعلەبەدا. لەڕێگەدا توشی شوانێك دەبن و پرسیاری لیّ دەکەن، ئەویش دەڵێت: بە دوای ئەو کەسەدا دەگەڕێن کە لەترسی دۆزەخ هەڵاتووە؟! ئێمە هەموو شەوێك دەیبینین لەنیوەشەودا هەردوو دەستی لەسەر سەری داناوە وهاوار دەکات ودەپاڕێتەوە ودەگری لەترسی لێپرسینەوەی دواڕۆژ، ئیمامی عومەر فەرموی: ئەو کەسەمان دەوێت.

ئیتر شوانەکە بردنی بۆ نزیکی شوێنەکەی سەعلەبە وکاتێك نیوەشەو ئیمامی عومەر بینی باوەشی پێدا کرد وگوشی بەخۆیەوە. سەعلەبە ووتی: ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەتاوانەکەمی زانیوە؟ خوای گەورە بەوەحی ئاگاداری کردۆتەوە؟!

(ئای ئیمانداری ڕاستەقینە چەند لەگوناە دەترسیّ. ئیمانداری ڕاستەقینە لەگوناە دەترسیّ زیاتر لەوکەسەی کە لەژێر شاخێك دایە وگویّ ی لەقرچەی لێك ترازانی شاخەکەیە کەخەریکە بەسەریدا دەڕوخیّ!

ئیمانداری ڕاستەقینە لەگوناە دەترسیّ هەرچەندە بچوکیش بیّ. زیاتر لەترسی ئەوکەسەی کە بەئەندازەی نوکی دەرزیەك هەوکردن (ئیلتهاب) لە شوێنێکیدا دەبینیّ وترسی ئەوەی هەیە توشی شێرپەنجە بووبیّ!! کە هەرگیز سەیری بچوکی ئەو شوێنە ناکات چاوی لە ئاکامەکەیەتی).

بەڵیّ ئەی لاوی خواناس تۆ زینات کردوە؟! تۆ بە تەلەفۆن پەیوەندی ناشەرعیت بۆ ماوەی چەند ساڵ لەگەڵ کچی خەڵکی دا بەستوە ومەبەستت پیّ ی تێرکردنی ئارەزوەکانت وکات بەسەربردن بوە؟! ئایا ژیانی هاوسەریت لەخێزانێك تێك داوە؟! نەخێر. ئەمانەی هیچ نەکردوە.

تەنها نەزەرێکی کردوە وئێستا موحاسەبەی خۆی دەکات. چۆن بەچاوی خیانەت تەماشای ئافرەتێکی ئیماندارت کرد، کە لەبازنەی ئیماندا خوشکی ئیمانیتە. چۆن سەیری ئافرەتێکت کرد کەشەرەف وناموسی برایەکی ئیمانیتە؟! بەڵێ ئیماندار پێش ئەوەی لە قیامەتا خوای گەورە لێپرسینەوەی لەگەڵ بکات، خۆی لەخۆی دەپرسێتەوە:.

**بەڵێ ئیمامی عومەر فەرموی:** ئەی گەنجی دڵ پڕ لەئیمان من نازانم پێغەمبەری خوا بەتاوانەکەتی زانیوە یان نا، بەلاّم من وسەلمانی ناردوە بەشوێنتا تاوەکو بتبەینەوە بۆ خزمەتی، سەعلەبە فەرموی: دێمەوە لەگەڵتان، بەلاّم تکایە با لەکاتی نوێژدا بچینە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) !!.

کە گەڕانەوە بۆ مەدینە وچوون بۆ مزگەوت، کاتی نوێژ بوو. سەعلەبە گوێی لەدەنگی پێغەمبەر بوو، لە هۆش خۆی چوو! دوای تەواو بونی نوێژەکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتەلای ودەست وقاچی بۆ جولاّند وسەعلەبە هاتەوە هۆش خۆی. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: بۆ لێمان بزربویت؟ سەعلەبە ووتی: لەبەرگوناهباریم.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ئایەتێکی قورئانت پێ بڵێم ئەگەر بیخوێنیت تاوانەکان ڕادەماڵێت؟! ئەویش ئایەتی ﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾ البقرة:٢٠١.

**سەعلەبە فەرموی:** ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تاوانی من لەوە گەورەترە، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکرد بچێتەوە ماڵی خۆیان وئیسراحەت بکات. بەلاّم ئەم گەنجە کاتێ دەچێتەوە بۆ ماڵەوە بۆ ماوەی هەشت ڕۆژ نەخۆش دەکەوێت. پاشان سەلمانی فارسی بەپێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەری خوا سەعلەبە زۆر نەخۆشە.

پێغەمبەری خواش (ﷺ) تەشریفی دەچێت بۆ سەردانی وسەری لەسەر ڕانــی خــۆی دادەنێت. بەڵام سەعلەبە ســەری لادەبــات: پێغەمبــەر (ﷺ) دەفــەرموێت بــۆلای دەبەیت؟. سەعلەبە دەفەرموێ: سەری من پڕ تاوانە. با بەسەر ڕانی پــڕ بەرەکــەتی تۆوە نەبێت یا رَسُول اللهِ!!.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی دەپرسێت: کوێت ئازاری هەیە؟ ســەعلەبە دەفــەرموێ: واهەست دەکەم مێروو لەنێوان پێست وگۆشت وئێسقانەکانمدا دەڕوات.

پێغەمبــەر (ﷺ) فــەرموی: حــەزت لەچــی یــە؟ ســەعلەبە فــەرموی: حــەزم لــە لێخۆشبونی پەروەردگارمە ئالەوکاتەدا لەعەرشی عەزیەوە حەزرەتی جوبریل هاتــە خوارەوە، فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەروەردگار سەلامت لێ دەکــات و دەفەرموێت: ئەگەر ئەم عەبدەی من تا قەراغی ئاسمان گوناهی هەبێت، من لــێ ی خۆش دەبم..

پێغەمبەری خواش (ﷺ) ئــەم مــوژدە گــەورە، ئــەم بــەزەیی ومیهرەبانیــەی رَبُّ العَالمِین، کە تایبەت لەلایەن جوبریلەوە بۆ ئەم گەنجــە تۆبــەکارەی لەنــەزەر نــاردوە بەســەعلەبە ڕادەگەیــەنێت. هەرکەســەعلەبە گــوێ بیســتی ئــەو موژدەیــە بــوو. هاوارێکی کرد وگیانی دەرچوو کۆچی دوایی کرد:. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی کرد شۆردیان وکفن کرا ونوێژی لەسەر کرد ولەگەڵیــدا ڕۆیشــت بــۆ گۆڕســتان، بــۆ بەخاکسپاردنی، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) لەڕۆیشتندا لەسەر نووکی پەنجەکانی پێ ی دەڕۆیشت.

**پاشان هاوەڵان لە پێغەمبەریان پرسی:** بۆ لەسەر نووکی پێت دەڕۆیشتی، فەرموی: بەو خوایەی منی بەپێغەمبەر (ﷺ) ڕەوانە کردوە.

نەمتوانی پێم لەسەر زەوی دابنێم ئەوەندە مەلائیکە دابەزیوە بۆ بەخاکسپاردنی سەعلەبە..

بەڵێ ئەمەیە ڕێزی گەنجی تۆبەکار وبەئومێدی ئەوەی ببێتە سەرمەشقێ بۆ هەموو ئەو گەنجانەی کەدەیانەوێت بەرەو خوا بگەڕێنەوە، ئەی گەنجان ئێوەش بگەڕێنەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەگەر بەشەخصی لەناوماندا نەمابێ ڕێباز وسوننەتەکەی وفەرمودە شیرینەکانی لەناوماندا ماون.

وەرن پەنابېەنە بەرمزگەوت هەروەکو سەعلەبە پەنای هێنایە بەر ئەشکەوت وشاخ، ئێوە وەرنە ناو مزگەوت وخزمەت ڕێبازی ئیسلام.

خوای گەورە هیدایەتی هەموو لایەکمان بدات. بەتایبەتی گەنج ولاوەکانمان.

اللّٰهُمَّ آمِين

# سەرچاوەكان

١- قورئانی پیرۆز

٢- تەفسیری ئاسان ، م.بورهان حمد أمین.

٣- نَظْرَة النَّعیم في مَكارمِ أخلاق الرَّسُول الكریم (ﷺ) مجموعَة مِنَ العُلَماء ، ج١٠، ص٤٥٠٩ ، ج١٠ ، ص,٤٦٦٩

٤- كچان ، ئازارو هیوا ، نوسینی: د.إبراهیم دوەیش ، وەرگێڕانی: مەریوان عارف ، ل٨٠، ل٤١، ل٩٢،ل٦٠، ل,١٠٤

٥- پەیوەندیە تەلەفۆنیەكانی كوڕان وكچانی گەنج نوسینی: عِصَام محمد شریف، وەرگێڕانی: مەسعود حمە مُراد ، ل,٧٨

٦- ژوانگەی سەروەران ، محمد سەنگاوی ، ل٤٦.

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجمعين.

**ئيمانداران:** دونیا ئەگەر بەو پەیڕەوەی کە خوا بۆ مرۆڤــی دیاری کردوە،ببرێ بەڕێوە پیرۆزە و مەزرەعەی قیامەتە، وە لە ژیانی دونیادا کۆمەڵێ شتی پیرۆز هە، ژیانی دونیا بەوانەوە جوانە، بەڵام بەداخەوە لەژێر پەردەی ئەم شتەبەنرخانەدا، کاری وا دەکرێ کە ژیان دەکات بەژان. ئەویش گۆڕینی حەقیقەتی شتەکانە.

بە جوان نیشاندانی، بەڵام هەر لە توێکڵدا جوان، لە ناوەڕۆك و ناوكدا بۆگەن. بە زاراوەی ئەمڕۆ پیِ ی دەڵێن تەزویر.

بەڵێ، هەرچی لەم سەرزەویەدا هەیە، وە بەشێکی ئاسمانیش، مرۆڤـ بەکاری دێنێ و لە خزمەتی مرۆڤدایە. جا ئەگەر ڕێکوپێکو ڕاست بوو، ئەوا هەمووشتەکانی بەردەستیشی ڕاست دەبن.

چونکە هەڵسوڕانیان بەدەستی ئەوە، بەڵام ئەگەر مرۆڤەکە ڕاست نەبوو ئەوە لەژێر دەستیایەتی بە خراپ بە کاردێ، بۆیە یەکەم تەزویر کە ڕوودەدات لە مرۆڤەکەدایە. بەڵێ مرۆڤی تەزویر لە قورئانی پیرۆزدا باس کراوە، یەك سورەتی تایبەت هەیە لە قورئاندا بە ناوی سورەتی (المنافقون) موسڵمان بە توێکڵ.

بەڵام بەناوك و هەناو بۆ گەن سەرنجی قورئان بدەن لە بارەی مونافیقەکانەوە دەفەرموێ:﴿ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُوا۟ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ﴾المنافقون: ١ . واتە: کاتێ دووڕوەکان دێتە لات ئەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) ڕووت تێ دەکەن و دەڵێن: شایەتی دەدەین کە بەڕاستی تۆ پێغەمبەری خوای بەبێ شك و گومان.

**سەرنج بدەن:** بە حیسابی خۆیان ئەوەندە لە دڵەوە ئەم شایەتیە دەدەن کە بەسێ جار تەئکید کراوەتەوە (إن ، ك) کافی خِطاب، لامی تەئکید، ئەم تەعبیرە زۆری فەرقە لەگەڵ ئەوەی هەروا بیانوتایە: أنت رسول الله. تۆ پێغەمبەری خوای. کەچی لەگەڵ ئەم بەناو دڵسۆزی یەو ڕوکەش ڕاستگۆی یە. خوای گەورە باسی ناخیان دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴾المنافقون: ١ .

خوای گەورەش بە(سێ) تەئکید ڕێك بەرامبەر(سێ) تەئکیدەکەی ئەوان دەفەرموێ مونافیقان درۆدەکەن. ١- واللە یشهد. ٢- إن للتأکید. ٣- لام التأکید.

**کەواتە:** موسڵمانی تەزویر پێ ی دەوترێ مونافیق — دووڕوو

وە مرۆڤی وا هەیە هەر بە ڕووخسارو ئەندامی لاشەی مرۆڤە، ئەگینا لە ناخدا دڕندەیە شەیطانە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بارەی ئەو جۆرە مرۆڤە تەزویرانەوە دەفەرموێ: (رِجالٌ قُلوبُهُمْ قُلوبُ الشَّياطِينِ في جُثمانِ إِنْس ) رَواهُ مُسلِم.

واتە: ئەوانە جۆرە مرۆڤێکن کە دڵیان دڵی شەیطانەو لە لاشەی مرۆڤدایە:

بەڵام ئەوەی زۆر جێگای داخە ئەوەیە هەندێ جار ئەو مرۆڤە تەزویرە نازناوێکی ئایینیشی هەڵگرتوە وەکو:

**١- ناوی بەرێزو حورمەتداری (مەلا) زانای ئایینی ئیسلام.** لە ژێر ئەم ناو و پیشە گەورەو پیرۆزو پڕخزمەتدا. لەناو ئەو بەرگی ڕێزو تەقدیرەدا، کە سانێك ژیانی دونیاییانی پێ مسۆگەر دەکەن و هەرچی خەمی گەیاندنی ئیسلام بێ نیانە و وەکو وەزیفە تەماشای ئەم پلەو پایە بەرزە دەکەن، لە جل و بەرگ و ناودا مەلایە، بەڵام لەناخداو بەکردەوە (بەڵایە) بۆتە خۆرە بۆ ئیسلام، تەنها مینبەر و میحرابێکی لە کەڵك خستوە، وە ئەوەی بەلایەوە گرنگ نیە گەشەکردنی ئاینی ئیسلامە و ڕوکردنی خەڵکە لە مزگەوت و لە دین.

**بــــەکورتــی:** بە ئیسلام دەژی، نەك بۆ ئیسلام دەژی! خەڵکیش لەبەر فەرمودەی ( العُلماءُ وَرَثةُ الأَنبياء) ڕێزی دەگرن و بە قسەی دەکەن.

بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ)سزای زانای ئایینی تەزویری لەم فەرمودەیەدا ڕوون کردۆتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لەڕۆژی قیامەتدا کەسێك دێنن و فڕێ ی دەدەنە ئاگری دۆزەخەوە. ڕیخۆڵەکانی لە سکی دێنە دەرەوە و ئەمیش بە دەوری خۆی دا دەسوڕێتەوە، هەروەکو چۆن گوێدرێژ بە دەوری ڕیخۆڵەکانی دا دەسوڕێتەوە!! لەو کاتەدا ئەوانەی لە ئاگرەکەدان لێ ی کۆدەبنەوەو بەسەر سوڕمانەوە لێ ی دەپرسن: فلان کەس، ئەوە چی یە، بۆ ئاوای، ئەوە چۆن تۆ هاتیتە دۆزەخ، ئەی تۆ لە دنیادا فەرمانت بە چاکە نەدەکردو نەهیت لە خراپە

نەدەکرد؟ ئەو کەسەش دەڵێ: بەڵێ من لە دنیادا لەناو ئێوەدا بوم و ئامۆژگاریم دەکردن بەوەی کە چاکە بکەن، بەڵام خۆم نەمدەکرد. وە دەمگوت شەڕو خراپە و تاوان مەکەن، بەڵام خۆم ئەو کارەم دەکرد کە بە ئێوەم دەگوت مەیکەن. ئەوەتا ئێستا سزای من زۆر لە ئێوە قورسترە.

ئەم فەرمودەیە (رَوَاهُ البُخاري) (٣٠٩٤) و مُسلِم (٢٩٨٩).

٢- وە لەو موسڵمانە تەزویرانە هەیانە کە ناوی (حاجی) لەگەڵ ناوەکەیدایە، چونکە سەفەری حەجی کردوە، کە فەرزی حەج ئەوەندە گەورەیە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: هەرکەسێ حەج بکات و لە میانەی حەجەکەیدا قسەی نابەجێ نەڵێت و کاری نەشیاو نەکات و دەمەدەمێ نەکات، ئەوا کاتێ گەڕایەوە، وەکو ئەو ڕۆژەی لە دایك بوە، ئاوا لە گوناهـ پاك دەبێتەوە. کەچی بە داخەوە مام حاجی هەبووە. بۆ جاسوسی چوە بۆ حەج !! کە هاتۆتەوە لای خەڵکی ناوی حاجی فلان کەسی پێ ووتراوە.

بەڵام حاجییەکی تەزویر و ناشرین کەری ئیسلام. تۆی موسڵمانی دڵپاك کاتێ سەیری کەشیەی پشتی دەکەی و دەڵێ ی چۆتە ماڵی کەعبە و حاجی یە دیارە ئەو سوێندەی خواردی ڕاستەو بڕوای پێ دەکەی، کەچی پەنا بە خوا ئەو تەزویرە ئەو سیقەو متمانەی تۆیە دەقۆزێتەوە و قوڵت دەبڕێ!! ، جاران حاجی ڕاستەقینە دەچوو بۆ حەج، پێش ئەوەی بڕوات، حەق و قەرزی کێ ی لابوو دەدایەوەو گەردنی خۆی پێ ئازاد دەکرد. ئەمجا دەڕۆیشت بۆ حەج، بەڵام حاجی تەزویر کە گەڕایەوە ئەمجا دەست دەکات بە دەست بڕینی خەڵك و خواردنی ماڵی خەڵك لەژێر پەردەی حەج و ناوی - حاجی — دا !!...

٣- **مزگەوت:** بەسە بۆ گەورەیی مزگەوت کە خوای گەورە لە بارەیەوە فەرمویەتی:

﴿ وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴾ الجن: ١٨

بەڕاستی مزگەوتەکان تەنها و تەنها هی خوان و ماڵی خوان و لەبەر ئەوە ئێوەش لەگەڵ پەروەردگاردا هاوار و بانگەواز بۆ کەسێکی تر مەکەن لەگەڵ خوای گەورەدا، کەچی ئەگەر مزگەوت دەوری خۆی نەبینی و تەنها بانگەوازی بۆ لای

خوا تێدا نەکرا، وە هەدەف و مەبەستێکی تر لە دروست کردنیدا هەبوو ، ئەوا ئەو مزگەوتە دەبێتە تەزویر، وەکو مزگەوتی (ضرار) کە خوای گەورە لە قورئانی پرۆزدا باسی کردوەو پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕوخاندی.

**٤- فەرمودەکـــــانی پێغەمبـــەری خوا** (ﷺ). بەڵێ فەرمودە گەوهەرینەکانی پێغەمبەری خواش (ﷺ) تەزویریان تێدا کراوە، دوژمنانی ئیسلام لەژێر ناوی فەرمودەی پێغەمبەردا (ﷺ) چەندین قسەیان بۆ خۆیان داتاشیوەو بەناوی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بلاویان کردۆتەوە.

**ئەمەش بۆ دوو مەبەست:**

**یەکەم:** بۆ ناشرین کردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبەر چاوی توێژێکی گەورەی کۆمەڵ ، کەوا هەست بکات پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە سوك و بێ نرخ وکەم عەقڵ سەیری کردوە.

**وەکو ئەو فەرمودە تەزویرەی کە دەڵێ:** پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبارەی ئافرەتانەوە فەرمویەتی: (شاوِرُهُنَّ وخالِفُوهُنَّ) پرسیان پێ بکەن (بەژنان) بەلام بە قسەیان مەکەن!! ئەمە هەڵبەستراوە بەدەم پێغەمبەری خوا (ﷺ) وە دوژمنانی ئیسلام کە ئەم فەرمودەیەیان هەڵبەستوەو تەزویر کردوە بۆ ئەوەیان بوە کە بە ئافرەتان بڵێن، ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) ڕێزی بۆ ڕەئی و قسەی ئێوە دانەناوە.

**دووەم:** فەرمودە تەزویرەکە بۆ ئەوە بوە کە کەسە تەزویرکارەکە بەرژوەندی تایبەتی خۆی لەو کارەدا هەبوە، وەکو ئەو کابرایەی کە باینجانێکی زۆری بەسەردا کەوتبۆوەو بۆی نەدەفرۆشرا هات فەرمودەیەکی تەزویری دروست کردو بلاوی کردەوە بە ناو خەڵکی دا کە گوایە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە بارەی باینجانەوە ئاواو ئاوای فەرموەو هەرکەسێ بیخوات ئاوا خێری دەگاتێ و ئەوەندە شەڕی لێ دور دەخرێتەوە.

ئیتر ئەم فەرمودەیە بڵاو بۆوەو کابراش کێڵگە باینجانەکەی پێ گەیشت و هەموی بۆ فرۆشراو بەریش نەدەکەوت بەم تەزویرە سوودی شەخصی خۆی بەدەست هێنا.
بۆیە پێغەمبەری دڵسۆزمان (ﷺ) هەر زوو ئومەتەکەی ئاگادار کردەوە کە ووشیاربن و بزانن کە فەرمودەی ئەو سەروەرەش تەزویری تێدا دەکرێ و ئاگاداری ئەو کەسانەشی کردەوە کە ئەم غەشە گەورە دەکەن بەم فەرمودەیە کە دەفەرموێ:
(مَنْ كَذَبَ عَليَّ مُتَعَمِداً فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدهُ مِنَ النارِ).
واتە: هەر کەسێ درۆ بەدەم منەوە بکات و فەرمودەی تەزویر دروست بکات بەعەمدی و بە ئاگایی، بزانێ کە ئەوە وانی یەو من قسەی وام نەوتوە، ئەوە با جێگەی خۆی لەناو ئاگری دۆزەخ دا خۆش بکات...
**بەڵێ ئیمانداران:** خوای گەورە پاداشتی زانایانی فەرمودەناس بداتەوە کە زۆر مەردانەو لێبڕاوانە شەوو ڕۆژ یان خستە سەریەك بۆ ئەوەی کە فەرمودەی هەڵبەستراو و تەزویر لە فەرمودە صەحیحەکان جیابکەنەوەو بە پوختی و بێ دوودڵی ئەمڕۆ ئێمە فەرمودەی صەحیحیمان لەبەر دەستدایە.
**٥- تەزویری حەقیقەتەکانی ئیسلام:** وەکو ئەو کتێبانەی کە دەنوسرێن لەسەر بابەتێك بە ناوی ئایینی ئیسلامەوە، وەکو هەندێ کتێب کە بەحیسابی دانەرەکەی بێ، توێژینەوەیەکی زانستی ڕەخنەگرانەی بێ لایەنانەی کردوە لەسەر ئایینی ئیسلام و سەرچاوەکانی ، وەکو (خوێننامە) یان (سێکس و ژن و شەرع) هەن (مێژووی خوێناوی عەرەب).... هتد.
کە ئەم بەناو نووسەر و بەناو لێکۆڵەرە بیرکۆڵانە، زۆر جار ئەوەندە ترسنۆکانە تەزویرەکەیان کردوە نەیان وێراوە ناوی خۆشیان لەسەر بەرگی کتێبەکە بنوسن و بەناوی (باوکی زاگرۆس) و بەناوی (زەردەشتی) خۆیان ناساندوە. کە هەر ئەمە بەسە بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە ئەم بەناو کتێبە هەموی تەزویرەو ئەوەتا تەزویر کار ناوێرێ ناوی خۆی ئاشکرا بکات! ئەم تەزویر چیانە نەهاتون کتێبەکەیان پڕکردوە لە ئایەت و فەرمودە و قسەی زانایانی ئیسلام بەڵام بەسەقەت کردنیان وەکو ئەو قاپە هەنگوینەی چەند دڵۆپە ژەهرێکی تێ بکەی خەڵکێك کە نەشارەزایە بە

واقعی ئیسلام، دەڵێ ئەوەنیە هەمووی بە ئایەت و حەدیس هێناوە، کەچی نازانێ ئەم هەنگوینە پاڵافتە شیرینە ژەهراوی کراوە! حەدیسێکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێناوە ئەوەندەی لێ نوسیوە کە خۆی ئیشی پێ یەتی ئیتر نەهاتووە تەواوی بکات تا بە تەواوی وەکو خۆی مەبەستەکە ڕوون بێ ، یان ئایەتێکی قورئانی هێناوە، بەڵام تەواوی نەکردوە.

**وەکو:** (فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ) بەڵام نەهاتوە تەواوکەرەکەی بنوسێ کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ﴾ الماعون: ٥.

یان هاتوون ئایەتی ﴿ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ ﴾ النساء: ٥٩ ی نوسیوە، بەڵام ووشەی کۆتایی کە (مِنكُمۡ)ە، لەگەڵی نەنوسیوە، کە بەڕاستی ئەمەش تەزویری حەقیقەتەکانە! هەر بۆیە چۆن لە بازاڕدا کە شتێك دەکڕین و وریاو چاو کراوەین کە ئەمە تەزویر نەبێت، دەبێ ئاواش وریاو چاو کراوەبین، کە کتێبی لەم بابەتە دەخوێنیتەوە ئاگامان لەوەبێ کە ئەمەش تەزویری تێدا نەبێت. بەڵکو پێویستە ڕاوێژ بە کەسانی پسپۆڕ و شارەزا و ڕاستگۆ بە ئیسلام بکەین و بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانی زانایانی پێشینی (سەلەفی) ئەم ئوممەتە

کە بەڕاستی جێگای داخە ئەم تەزویرە بۆگەنە لەژێر ناوی ڕۆشنگەری و بیری سەردەم دا دەکرێ و چەندین دەزگای چاپ و بڵاو کردنەوەی بۆ تەرخان دەکرێ و پارەی ووڵاتی پێ بە فیڕۆ دەدرێت!

**٦- تەزویرکردنی کتێبە ئاسمانیەکان:** وەکو (ئینجل و تەورات). کە هەرچی پەیامی خوابێ تێ ی دا نەماوە و چۆنیان مەبەست بوبێ ، بە ئارەزوو بەرژەوەندی پاپاو قەشەکان ئاوا نوسراوەتەوە!! پەنا بە خوا تێ ی دا نوسراوە (عیسا) کوڕی خوایە!!! ساڵانە لە کوردستانی ئازاد و ئیسلام دۆستی خۆشماندا، بە تایبەت لە وەرزی بەهارو کاتی گەشتو گوزار و ناو سەیرانگاو بازاڕو زۆر جار ناوەندەکانی خوێندندا لەگەڵ هەندێ کەلو پەل دا ئینجلێکی تێ دەکەن وئەیدەنە دەست خەڵکی موسڵمانان! ئەیدەنە قوتابی یەکی سەرەتایی!!

که بەڕاستی ئەم دەستە ژهراویە ، مەسیحیە ڕەسەنەکانی کوردستان، کە لە دێر زەمانەوە لەگەڵ موسڵمانانداا لەکوردستاندا لەگەڵمان دەژین و ئەو پەڕی حورمەتیان لیّ گیراوەو حورمەتی موسڵمانانیان گرتوە.

ئەوانیش لەم دەستە ژەهراویە بیّزارن، بۆیە پێویستە موسڵمانان ووشیارین و کتێبەکان و بڵاووکراوەو شریتە دەنگی و ڕەنگەکانیان لیّ وەربگرن و لە پەنایەکدا بەبیّ دەنگی بیسوتێنن. هەرچەندە ئیسلام ڕێگا بە سوتاندنی هیچ نوسینێك نادات.

بەڵام ئەم کتێب و بڵاوکراوانە تەزویرن، ئەم بەناو کتابی موقەدەسە نەزانیاری دونیایی تێدایە، نەقیامەتی. نەباسی دینی تێدایە نەباسی ژین ، جگە لە هەندیّ بوختان و زور بەدەم خواو پێغەمبەری گەورەی خوا.

گەورەمان عیسی (علیە السلام) و دایکی گەورەو بەڕێز و داوێن پاکی خاتوو مەریەمە(سەلامی خوای لیّ بیّ) بۆیە شتی تەزویر هەر بۆ سوتاندن باشە، هەروەکو چۆن خۆراك ئەگەر پاك بیّ دروست نیە دەنکێکی لەناو ببریّ و فڕیّ بدریّ و بەفیرۆ بدریّ.

بەڵام کە تەزویر کرابوو، ئێکسپایەر بوو. ژەهراوەی بوو، واجبە لەناو ببریّ و بسوتێندریّ ، بەهەمان شێوەش کتێبی تەزویرکراو دەبیّ هەمان ڕەفتاری لەگەڵ بکریّ.

خۆزگە ئەو ڕێکخراوە تەبشیریە، تەنصیریە کە وەکو عەرزمان کردن مەسیحیە ڕەسەنەکانیش لیّ یان بیّزارن و بە دەستێکی دەرەکی خائینی دەزانن، خۆزگە لە جیاتی بڵاوکردنەوەی ئەو درۆو دەلەسانە، ئەو تەزویرکردنی کتێبە ئاسمانیانە، کتێبی قوتابخانەکانیان چاپ بکردایە، ئەو پارەیان بدایە بە کۆمەڵیّ داوو دەرمان بۆ نەخۆش و هەژار جا لە ناوبردنی ئەم ئینجیلە تەزویرانە، بەرگری کردنە لە گەورەمان. عیسی ی کوڕی مەریەم.

چونکە هەرکەسێ عیسای خۆش بوێت نابێ بهێڵێ بوختانی بەدەمەوە بکرێت و کە عیسی یەکەم ووشەی ئەوەبوە ﴿ قَالَ إِنِّي عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا ﴾مريم: ٣٠ کەچی لەو بەناو ئینجیلەدا کە گوایە پەنا بەخوا کەلامی خوایە. نوسراوە عیسی دەڵێ: من کوڕی خوام! بەڵێ هەرکەسێ ڕاست دەکات کە عیسی ی خۆش دەوێت و بڕوای پێ یەتی باشوێن محمد المصطفی بکەوێ، چونکە ئەوە حەزرەتی عیسی یە موژدەی داوە بەهاتنی محمدی موصطه فا (ﷺ) وە فەرمویەتی: ﴿ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِي ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ﴾ الصف: ٦.

هەرکەس بەڕاستی دەیەوێ لە ژیان و بەرنامەی عیسی حاڵی ببێ، بابێ لە قورئاندا بیخوێنێتەوە بابێ دیراسەی ئەو قورئانە بکات کە (٢٥) جار ناوی عیسای بردوە. بەڵام (٥) جار ناوی محمدی بردوە!!

گوێ بۆ ئەم بەسەرهاتە بگرن کە ڕووداوێکی واقیعی یە و تازە ڕووی داوە و ئەو کەسەی بۆمان دەگێڕێتەوە، بانگخوازی بەناوبانگ و نوسەری ناودارو وتاربێژی بلیمەت و بە غیرەت (شێخ محمد حسان)ە ، لە کتێبەکەی خۆیدا بەناوی (أحداث النهاية و نهاية العالم، ص٧١) دا کە دەفەرموێ: کاتێ سەفەرم کرد بۆ ئەمریکاو سەردانی موسڵمانانم کرد لە ئەمریکا ، ئەو برایانە بۆیان باس کردم کە بانیەکیان کاتێ موسڵمانان لەیەکێ لە مزگەوتەکانی شاری (برۆکلن) لە ویلایەتی نیویۆرك دا نوێژی بەیانی بە جەماعەت دەکەن ، لە کاتی نوێژەکەدا کوڕێکی گەنجی ئەمریکی دێتە مزگەوتەکەوە و لە دواوە بۆ خۆی دادەنیشێت، کاتێ سەلامی نوێژ دەدەنەوە بەخێرهاتنی دەکەن و زۆر ڕێزی دەگرن، پێش ئەوەی لێ ی بپرسن بەچ هۆیەك و کارێك ڕێ ی کەوتۆتە ئەم مزگەوتەو ناو ئەم موسڵمانانە کە دیارە موسڵمان نیەو نوێژ ناکات ، ئەم کوڕە گەنجە غەریبە خۆی دەست دەکات بەقسە و دەڵێ: بە ڕاستی من دەمەوێت ببم بەیەکێ لە شوێن کەوتوانی محمدی کوڕی عبداللە (ﷺ) دەمەوێت بێمە ناو ئاینی ئیسلامەوە

هاتوم ڕێنمایم بکەن چۆن ببمە موسڵمان!.

موسڵمانانی مزگەوتەکە هەموو لە خۆشیدا بەیەك دەنگ دەڵێن: یا خوا بەخێر بێ ی تۆ کێ ی و ناوت چی یەو بەسەرهاتت چی یەو و چۆن هاتی بۆ ئێرە ، بۆ ئەم مزگەوتە بۆ موسڵمان بون؟! گەنجەکەش دەڵێت: ڕێنمایم بکەن و پرسیارم لێ مەکەن ، ئێستا چی بکەم ؟!.

**ئەوانیش دەڵێن:** خۆت بشۆرە ، پاشان شایەتمان بێنە، بەڵێ هەرلەوێدا کە حەمامی لێ دەبێت خۆی دەشوات و پاشان ئیمامی مزگەوتەکە شایەتمان دەڵێت و ئەویش بە شوێنیدا دوبارەی دەکاتەوە. هەر لەوێدا فێری نوێژی دەکەن ، کە چۆن ڕکوع و سجود دەبرێت کە هێشتا فاتحەیشی بۆ لەبەر ناکرێت بەڵام نوێژی ئەو بەیانیە دەکات: - سوپاس بۆ خوای گەورە

**پاشان ئەم گەنجە دەڵێت:** دەمەوێت لەناوتاندا بمێنمەوە لەم مزگەوتەدا بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك بۆ ئەوەی بە تەواوی بنەماکانی ئایینی ئیسلام شارەزابم ، بەڵێ بۆ ماوەیەك لەگەڵ ئەم موسڵمانانەدا دەمێنێتەوە، ڕۆژی یەکەم و دووەم و سێ یەم تێ دەپەڕێت و بەڕاستی سەرنجی برا موسڵمانەکانی ڕادەکێشێ کە چەند جوان نوێژ دەکات و لە سوژدەدا چەند دەمێنێتەوە ، لە ڕکوعدا چەند دەمێنێتەوە و نەك هەست بە ماندوبون ناکات بەڵکو زیاتر لەزەتی لێ دەکات. وە زۆر دەگریاو دوعا دەکات و لە خوا دەپاڕێتەوە، وە زۆر حەز بەوە دەکات کە گوێ لە قورئان بگرێت ، ڕۆژێکیان دوای نوێژی مەغریب، لە تەنیشت یەکێ لە براموسڵمانەکانیەوە دادەنیشێت بۆ ئەوەی گوێ لە قورئان خوێندنی بگرێ.

چونکە لەوێ لە دوای نوێژی مەغریبەوە ناڕۆنەوە بۆ ماڵوە بۆنان خواردن. بەڵکو تاوەکو نوێژی عیشا دەمێنێتەوە و لەو نێوانەدا قورئان دەخوێنن ، ئەم برایە کە قورئانەکە دەخوێنێ ڕوو لەم تازە موسڵمان بوە دەکات و پێ ی دەڵێت:

براکەم بەڕاستی کاتێ تۆ دەبینم ، خۆم زۆر بچوك و کەم نرخ دێتە بەرچاو چونکە من ئەوە چەندین ساڵە موسڵمانم ، کەچی تۆ چەند ڕۆژێکە موسڵمان بویت ، کەچی تۆ ئاوا لە خزمەت پەروەدگاردا دەگری ، بەخشوعەوە نوێژ دەکەیت ، حەزدەکەی

هەموو خولەکێکی ژیانت لە خزمەت قورئان دانەبڕێ ی و هەر گوێ ی لێ بگری کە نازانی بیخوێنیتەوە و لە ماناکەی تێ ناگەی.

ئەی برای ئیمانی خۆشەویست سوێندت دەدەم بەو خوایەی کە هیدایەتی داوی و ئێمەی لەم ماڵەی خۆیدا کە مزگەوتە لە ژێر بەیداخی ئیسلامەتیدا کۆ کردۆتەوە ، ئەگەر باس بۆم نەکەی کە بەسەر هاتی موسڵمان بونەکەت چی یەو چۆن هاتیتە ناو ئەم ئیسلامە شیرینەوەو ئاوا بە ماوەیەکی زۆر کەم شیرینی ئیسلامەتیت چەشت؟! کوڕە گەنجە موسڵمان بوەکەش دەڵێت: لەبەر ئەوەی بە خوای گەورە سوێندت دام ، منیش بەسەرهاتی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە. براکەم: سوێند بەخوا ماوەی چوار ساڵی ڕێکە. هیچ شەوێك نەبوە کە من تێ ی دا نەگریابم و ڕوم لە خوا نەکردبێ و لێی نەپاڕابمەوە کە ڕێنمایم بکات کە دینی حەق و ڕاستی بدۆزمەوە و لە گومڕایی ڕزگارم ببێ.

تا ئەوە بوو دوای ئەو چوار ساڵە ، لەو شەوەدا کە بۆ بەیانیەکەی هاتم بۆ لای ئێوە، بەدەم گریانەوە خەوم لێکەوت ، کە هەتا خەوم لێکەوت هەر دەمگوت خوایەگیان دینی حەق و ڕاست کە تۆ پێ ی ڕازی بدۆزمەوەو خوایەگیان ڕێنمایم بکەی. بەڵێ ئەو شەوە لە خەومدا بە خزمەت عیسی ی کوڕی مەریەم گەیشتم ، بە پەنجەی شایەتمانی ئاماژەی کردو پێ ی ووتم: ببە بە موحەمەدی!! ببە بە شوێن کەوتەی ڕێبازی محمد.

کاتێ بەخەبەر هاتم وەختی نوێژی بەیانی بوو. ئەوە بوو یەکسەر لە ماڵەکەم هاتمە دەرەوە و یەکەم مزگەوت کە هاتە سەر ڕێم ئەم مزگەوتە بوو کە ئێوە نوێژی لێ دەکەن و هاتمەلاتان و سوپاس بۆ خوا موسڵمان بووم...

(شێخ محمد حسان) لە گێڕانەوی بەسەرهاتەکە بەردەوام دەبێت و دەفەرموێ: هەموو ئەو برایانەی کە ئەهلی ئەو مزگەوتە بون و ئەو چەند ڕۆژە ئەو گەنجە ئەمریکی یە یان لەگەڵ ژیاوە سوێندیان خوارد بە خوای تاك و تەنها کە هەر ئەو ئێوارە کە ئەم

گەنجە باس و بەسەرهاتی خۆی گێڕایەوەو دوای نوێژی مەغریب بوو. بۆ نوێژی عیشا ، بانگدەر بانگی فەرموو و بە جەماعەت نوێژی عیشامان دابەست و ئەم گەنجە تازە موسڵمانەش یەکێ بوو لە وانەی کە لە ڕیزی یەکەمی نوێژەکەدا بوو. بەڵێ ڕکاتی یەکەم کراو کە هەستاینەوە بۆ ڕکاتی دووەم ئەم گەنجە سەری لە سوژدە بەرزنەکردەوەو لە سوژدەدا مایەوە هەتا نوێژەکەمان تەواو کردو دوای سەلام دانەوە. بانگمان کرد فلان کەس، فلان کەس، بەلام وەلام نەبوو!!

یەکێك لەوانەی کە لە تەنیشتیەوە نوێژی کردبوو، دەستی لێداو بانگی کردەوە، بەلام بەدەست لێدانەکە بەلاداکەوت، کە تەماشامان کرد ڕوحی دەرچووبوو. لەسوژدەدا گەیشتەوەبە لیقای خوا! خوایە گیان (حسن الخاتمە) یەکی ئاوامان بەنسیب بکەی.

بەڵێ ئەمە بەسەرهاتی یەکێ لەو کەسانەیە کە لە ئەمریکادا بۆ ماوەی چوار ساڵ لە خوا پاڕاوەتەوە کە لەناوەو هەموو دین و بەرنامەی سەرزەویدا، دینی حەق و ڕاست و پەسندکراوی لای خوا. کە بەختەوەری دونیاو قیامەتی تێدابێ، خوای گەورە ئەو دینەی نیشان بدات. ئەوەبوو حەزرەتی (عیسی) فەرموی: ببە بە موحەمەدی.. کە ڕێبازی هەموو پێغەمبەرانی خوایە..

وە دڵنیاشبن ئیسلام هەرگیزاو هەرگیز بەو حەملە صەلیبیانە، نەك نالەرزێ، بەڵکو هەر هەستیشیان پێ ناکات، چۆن دار خورمایەکی ڕەگ داکوتراوی بە بەرهەم هاتوو، هەر هەست ناکات کە مێشولەیەك بە لقێکەوە نیشتۆتەوە یان نا ، نەك بترسێ بیخات !!

سەرنجی ئەم ئامارە ئایەتە بدەن کە تیایدا دەردەکەوێت، لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵ و ماندوبونەدا کەوا دەردێت لە هەموو جیهاندا بۆ بەگاورکردن، بەلام چونکە خوای

گەورە بەڵێنی داوە کە پاشەڕۆژ هەر بۆ ئیسلامە، دەبینین ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەگەڵ ئەو هەموو گرفت و لەمپەڕانەدا کە دەهێنرێتە بەردەمی و بۆی دروست دەکرێن ، ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیاد بوون و بڵاوبوونەوەدایە.

**سەرنجی ئەم ئامارە بدەن :-**

١- بڕی پارەتی دیاری کراو بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی مەسیحیەت لە ساڵی (١٩٧٠)دا یەکسانە بە (٧٠) ملیۆن دۆلار، لە ساڵی (٢٠٠١)دا یەکسانە بە (٢٨٠) بلیۆن دۆلار.

٢- ژمارەی ئەو ڕێکخراوانەی کەوا نێدراون بۆ بڵاوکردنەوەی مەسیحیەت لە ساڵی (١٩٧٠)دا یەکسانە بە (٢٢٠٠) ڕێکخراو، لە ساڵی (٢٠٠١)دا یەکسانە بە (٤١٠٠) ڕێکخراو.

٣- ژمارەی ئەو کەناڵە ڕاگەیاندنانەی (ڕادیۆ و تەلەفیزۆن) کە بۆ مەسیحیەت بەکار هاتوون لە ساڵی (١٩٧٠)دا یەکسانە بە (١٢٣٠) کەناڵ، وە لە ساڵی (٢٠٠١) دا یەکسانە بە (٤٤٥٠) کەناڵ.

٤- ژمارەی ئەو نەخشانەی کە دانراوە بۆ بە مەسیحی کردنی گەلان لە ساڵی (١٩٧٠)دا یەکسانە بە (٥١٠) نەخشە.

لە ساڵی (٢٠٠١) دا یەکسانە بە (١٥٤٠) نەخشە.

بەڵام لەگەڵ بەکار هێنانی ئەو هەموو بوجەو کەناڵە وە کەچی ئیسلام هەر بەرەو پێش دەچێت و مەسیحیەتیش ڕۆژ بە ڕۆژ لە دواوەیەو کە نیسەکانیان دەفرۆشن و موسڵمانان دەیکڕن و دەیکەنە مزگەوت، تەنانەت هەندێ قەشەی دڵڕەق و توندڕەویان ئەم بارودۆخەی کە لە ئەورووپاو ئەمریکا هەیە بەوەی کە ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی موسڵمانان زیاد دەکات و مزگەوتی زۆرتر دەکرێتەوە، وە مەسیحیەت لە

بەرامبەردا ساڵ بە ساڵ بەرەو شکست و پیربونی تەمەنی دەڕوات و بەهاری تەمەنی ڕوو لە خەزانەکاردانەوەی زۆر نابەجێ دەکەن، وەکو سوتاندنی قورئان...

**بەوردی سەرنجێکی ئەم ئامارە بدەن:**

لە ساڵی (١٩٧٠)دا موسڵمانانی جیهان یەکسان بوون (٥٥٣,٥٢٨,٠٠٠) پێنج سەدو پەنجاو سێ ملیۆن و پێنج سەدو بیست و هەشت هەزار

بەڵام لە ساڵی (٢٠٠١) دا ڕێژەی موسڵمانان لە جیهاندا یەکسان بوو بە (١,٢١٣,٣٧٠,٠٠٠) یەك ملیار و دووسەدو سیانزە ملیۆن و سێ سەدو حەفتا هەزار موسڵمان.

وە ژمارەی هەموو مەسیحیەکانی جیهان لە ساڵی (١٩٧٠) دا یەکسان بوە بە (١,٢٣٦,٣٧٤,٠٠٠)

یەك ملیار و دووسەدو سی و شەش ملیۆن و سێ و حەفتا هەزار کەس.

بەڵام لە ساڵی (٢٠٠١) دا ژمارەی مەسیحیەکانی جیهان یەکسان بووە بە (٢,٠٢٤,٩٢٩,٠٠٠) دوو ملیارو بیست و چوار ملیۆن و نۆ سەدو بیست و نۆ هەزار مەسیحی.

**کەواتە:** زیادبوونی ڕێژەی موسڵمانان زۆر زۆر بەرچاو دیارەو و پوکانەوەو بچوك بونەوەی مەسیحیەتیش لە زیادبوندا بە ئاشکرا دیارە.

جا لەبەر ئەوە زۆر بە ئاگابن و ئێمە قورئانی پیرۆزمان هەیە کە هەواڵ و باسی هەموو پێغەمبەران و ئومەتەکانیان و باس و خواسی هەموو گەلانی ڕابردوو ، وە ژیانی داهاتوشی تا قیامەت تێدایە و وە باسی سەر زەوی وە ئاسمانەکان و دەریاو زەریاکان و چینەکانی زەوی و هەموو جۆرە زانستێکی تێدایە و وەڵامی هەموو

پرسیارەکانی مرۆڤـ دەداتەوە لە بارەی ئامانج لە ژیان و ژیانی دوای مردن و بەهەشت و دۆزەخ و هەموو دەرمانێکی تێدایە بۆ چارەسەری نەخۆشی و گرفتەکانی ژیانی مرۆڤـ لە بواری ئابووری و ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ....هتد.

دەی حەیف نیە و ماڵ وێرانی نیە مرۆڤـ خاوەنی گەنجینەیەکی لەبن نەهاتووبێ ، کەچی بچێ سواڵ بکات و لە زبڵدانی فڕێدراوی خەڵکی دا خەریکی شت کۆکردنەوەبێ!

حەیف نیە لە ڕۆژی ڕوناکدا کە تیشکی خۆر تەواوی زەوی داپۆشیوە بچی پەنا بۆ مۆمێك ببەی بۆ ئەوی بەرپێ ی خۆتی پێ ڕوناك بکەیتەوە؟!!

دەی ئیسلام خۆرەو کە خۆرهەڵات دەبێ فتیلەو مۆمەکان بکوژێنەوەو ئیتر دەوریان نامێنێ.

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجمعين.

**٧- شايەتی تەزویر.(شهاده الزور):** کە بەڕاستی شایەتی دان شتێکی زۆر پیرۆزەو بەو شایەتی دانە حەقە، حەق و مافی خاوەن مافێکی پێ وەردەگیرێتەوە ، یان تاوانێك لەسەر کەسێکی بێ تاوان لادەچێت.

بەڵام لە ژێر ئەم شایەتیە پیرۆزەدا کە سانێك شایەتیەکە دەگۆڕن و ئەوەی لە مەحکەمە (دادگا) دەیلێن ئەوە نی یە کە بەچاوی خۆیان بینویانەو بە گوێ ی خۆیان بیسویانە. کە ئەو کاتە دادوەری بەڕێز بەهۆی ئەم شایەتیە تەزویرەوە بە پشت بەستن بە شایەتی دانی ئەو ڕەشی لێ دەبێت بە سپی و سپی لێ دەبێت بە ڕەشی و خاوەن ماف بێ ماف دەکرێ و تاوانبار ڕزگار دەکرێ!

کە ئەمەش گەورەترینی تاوانە، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (ألا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الكَبائِرِ) — ثلاثاً سێ جار لەسەر یەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ئایا ئاگادارتان نەکەمەوە و پێتان ڕانەگەیەنم بە گەورەترینی گوناهە گەورەکان؟! (قالوا: بلى يارسول الله) هەموو صەحابەکان فەرمویان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێمان بڵێ. فەرموی: (الإشراكُ باللهِ ، وعُقوُقُ الوالِدَين، وَجَلَسَ وكانَ مُتَّكِئاً. فَقالَ: ألا وَقَوْلُ الزُّورِ ، فَما زَالَ يُكَرِرُها حَتَّى قُلْنَا: لَيْتَهُ سَكَتَ) رَواهُ البُخاري وَمُسْلِم.

واتە: لە گەورەترینی هەموو گوناهە گەورەکان ئەمانەن: هاوبەش پەیداکردن بۆ خوای تاك و تەنها و بێ شەریك. وە ئازاردانی دڵی دایك و باوك و بە گوێ نەکردنیان ، پێغەمبەری (ﷺ) لەو کاتەدا دانیشتبوو . هەستایە سەر چۆك و فەرموی: ئاگادارین قسەی درۆ ، ئەوەندەی دوبارەکردەوە، کە هاوەڵان دەفەرمون، ووتمان خۆزگە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچی تر خۆی ماندوو نەکردایە و ئەوەندەی نەوتایەتەوە. واتە: تاوانەکە ئەوەندە گەورەیە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەندە دوبارەی کردەوە.

**ڕەنگە کەسێك بپرسێ :** باشە خۆ (شِرك) هاوبەش دانان بۆ خوا (نَعوذُ باللهِ) گەورەترین تاوانە ئەی بۆچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەریەك جار فەرموی: الشِّركُ باللهِ، بەڵام (وَقَوْلُ الزُّورِ) ی ئەوەندە دوبارە کردەوە؟!.

**له وه‌لامدا ده‌لێین:** زۆربـه‌ی کـات شـیرك تـه‌نها بـۆ خاوه‌نه‌کـه‌ی زه‌ره‌ری هه‌یـه‌ و سه‌رگه‌ردانی ده‌کات. به‌ تایبه‌ت ئه‌گه‌ر ئـه‌و موشـریکه‌ ده‌ســه‌لاتدارێك نـه‌بێ کـه‌ خه‌ڵکی فێری بت په‌رستی بکات. ئه‌وه‌ هه‌ر خۆی لێ ی زیان مه‌ند ده‌بێ و فه‌وتاوی قیامه‌ت ده‌بێت.

**به‌ڵام شایه‌تی ته‌زویرو درۆ، له‌ دووڕوه‌وه‌ تاوانه‌.**

**١- شایه‌ته‌که‌ سته‌می له‌ خۆی کردوه‌ به‌وه‌ی که‌ ئه‌و شایه‌تیه‌ حه‌قـه‌ی شـاردۆته‌وه‌و فرسه‌تی له‌وه‌ بینیوه‌ که‌ کاتێ ده‌رفه‌تی شایه‌تی دانی بۆ هه‌ڵکه‌وتووه‌ ، ژه‌هری نـاو دڵی هه‌ڵڕشتوه‌ و به‌ڕه‌شی ناو ناخی حه‌قی سپی ڕه‌ش کردوه‌.**

**واته‌: زوڵمی له‌ خۆی کردوه‌.**

٢- مافی که‌سێك به‌هۆی ئه‌و شایه‌تیه‌ ته‌زویره‌ی ئه‌وه‌وه‌ فه‌وتاوه‌.

**٣- به‌هۆی ئه‌م شایه‌تیه‌ درۆیه‌ ته‌زویره‌ ، که‌سێکی بێ تـاوان و بـێ ئاگـا تاوانبـار ده‌کرێ و تاوانبارێك ئازاد ده‌بێت.**

**٤- دادگاو به‌رده‌م دادوه‌ر که‌ شوێنی گێرانه‌وه‌ی مافه‌ بۆ ماف خوراو به‌ هـۆی ئـه‌و شایه‌ته‌ درۆیه‌وه‌ نه‌یتوانی کاری خۆی بکات و ئه‌و وه‌زیفه‌ گـه‌وره‌و عـه‌ ڤیمـه‌ جـێ به‌جێ بکات... بۆیه‌ پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویستمان ئه‌وه‌نـده‌ دوبـاره‌ی کـردوه‌ ، أَلا وَقولُ الزُّورِ ، أَلا وَقوْلُ الزُّورِ له‌ فه‌رموده‌یه‌کی تـردا ، پێغه‌مبـه‌ری خـوا (ﷺ) ده‌فـه‌رموێ: (إنَّ بَينَ يَدَيِ السَّاعة شَهادَةِ الزُّورِ وَكِتمانَ شَهادَةِ الحَقِّ ) رَواهُ أَحمد** في مُسنَدهِ بِسَنَدٍ صَحيحٍ، وَصَحَّحهُ الألْباني في الصَّحيحَة: (٦٤٧).

**واته‌: له‌ نیشانه‌کانی هاتنی قیامه‌ت ئه‌وه‌یه‌ که‌شـایه‌تی درۆ زۆر ده‌بـێ و شـایه‌تی حه‌ق و ڕاست ده‌شاردێته‌وه‌ ئه‌مڕۆ خه‌ڵك شـایه‌تی حـه‌قی لایـه‌ که‌چـی پرسـی بـۆ ده‌کات ئه‌رێ ئه‌و شایه‌تیه‌ بده‌م یان نا: که‌چی ڕۆژی چه‌ند جار شایه‌تی بـه‌ خـۆڕایی ده‌دات که‌ فـلان کـه‌س پیـاو چـاکه‌ پیـاوی نـاو پیاوانـه‌، مـه‌رده‌ ، قاره‌مانـه‌.**

بەڵام کە سەیری دەکەی ئەوەی خـوا پـێ ی خـۆش بێـت نایکـات ، نوێـژ ناکـات مزگەوتی نەبینیوە ، عەرەق دەخواتەوە حەڵاڵ و حەرام نـازانێ ، ئـیتر نـازانم پیـاو چاکیەکەی لە کوێ دایە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فێرکرد کە هەر لەخۆوە شـایەتی نەدەین و بەم نەڵێین چاك و بەو بڵێین خراپ، بەبێ ئـەوەی بـاش ناسـیبێتمان تـا خەڵك بەم شایەتی دانەی تۆ بۆ فلاّن کەس بەسەهو نەچێ. بەڵکو دەتوانی ئەوەنـدە بڵێ ی: من وا دەبینم فلان کەس باش بێ و خوای گەورەش خۆی بەندەناسە و ڕەحم بەمنیش و ئەویش بکات.

ئەمڕۆ لەم سەردەمەدا ، شایەتیەکی تەزویری زۆر ترسناك هەیە ، ئـەویش ئەوەیـە کە لەکاتی هەڵبژاردندا لە ووڵاتدا، جـا بـۆ پەرلـەمان بێـت یـان بـۆ شـارەوانی و پارێزگاکان بێت ، تۆ کەسێك یان لایەنێك هەڵدەبژێری و دەنگی پـێ دەدەی ، ئـەم دەنگ پێدانەت شایەتی دانە بۆ فلاّن کەس، کە بەڕاستی شیاوە و شایستەیە ، جـا بەڕاستی موسڵمان دەبێت زۆر وریاو چاو کراوانە ئەم شایەتیە بدات و ئەم هێڵە لەو ناوو لیستە بدات، چونکە ئەگەر خوانەخواستە تۆ لەبەر خاتری فلاّن و فیسار کەس و فلاّن لایەن و فلان پەرژەوەندیت دەنگ بەو کەسە بدەیت و لـە ناوەڕۆکـدا شـایانی ئەو پۆستە نەبێت. ئەوە بەڕاستی زوڵمێکی هەرە گەورەتکردوە هەم لە خـۆت هـەم لە هەموو ئەو میللەتەی کە دوارۆژ دەبێتە قوربانی ئەو کەسە نەشیاوە نەگونجاوە ، وە حکومەت و دەسەڵاتیش ناشرین دەکات و سەرەنجام پێشوی لە ووڵاتـدا دروسـت دەکات ، ئەمەش هەمووی لە ئەنجامی شایەتی تەزویر و دەنگـی کـڕدراوو تـەزویر کراوەوە، کە بەداخەوە زوربەی ووڵاتانی ڕۆژهەڵات و بەتایبەتی ووڵاتـانی عـەرەبی بەناو ئیسلامی (بە ناوەڕۆك دوژمنی ئیسلام) بە دەست ئەم حاڵەوە دەناڵێنن...

**٨- تەزویری دروشمە جوانەکانی سـەردەم** ، وەکـو (مـافی مرۆڤـ ، دیمکراسـی ، هەڵبژاردن) کە ئەمانە هەڵقوڵاوی ئایینی ئیسلامن، بە ئایەتی ﴿ وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴾ الإسراء: ٧٠ بە ئایـەتی ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ﴾ البقرة: ٢٥٦ بـە ئایـەتی ﴿ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ﴾ الشورى: ٣٨. کەچی لەژێر ئەم دروشمە جوان و پیرۆزانـەدا ،

دەیان و سەدان پێشێلکاری بە مافی مرۆڤ دەکرێت و لەژێر پەردەی دیمکراسیدا دەمی حەق بێژان دەدورێ و زورناژەن ماستاو چی و دووڕوو بێبار بازاڕی گەرم دەبێ و دەنگی دلێر دەبێ!!
بە داخەوە لەژێر ناوی هەڵبژاردن و دەنگی میللەتداو صندوقی دەنگداندا ، دەنگ تەزویر دەکرێ و هەڵبژاردن تەزویر دەکرێ!
**٩- تەزویری شەهادەو خزمەتی دائیرە (فەرمانگە)** ، کە ئەمەش جۆرە تەزویرێکی ئەم ڕۆژگارەیەو داهێنانێکی سەردەمیانەیە!! بینیومانە کابرا شەهادەی دووی ناوەندی هەبووە، بە شەهادەی تەزویری پۆلی شەش ئامادەیی چۆتە زانکۆ!! یان کەسێك (١٠) ساڵ خزمەتی لە فەرمانگەیەکدا هەیە، لە پڕدا بۆی دەکرێ بە (١٥) ساڵ ، ئەمە چۆن وا زوو ڕوی دا ئەمە کاتی خۆی خەباتی شاخی هەبووە!! لە کاتێکا بۆ گەشت و سەیرانیش شاخی نەبینیوە! کە بەڕاستی ئەم جۆرە تەزویر کردنەش حکومەت گەندەڵ دەکات و دڵی دڵسۆزان و ڕاستگۆیان سارد دەکاتەوە.
ڕەحمەت و ڕەزای خوا لە خەلیفە عومەری کوڕی خەگاب بێت کە کاتێ موچەی بۆ کۆچکردوان (ئەوانەی کاتی خۆی لە مەککەوە بۆ مەدینە کۆچیان کردبوو. وە هەموو ماڵ و سامانیان لەو پێناوەدا لە دەست دابوو) کاتێ موچەی ڕێزلێنانی بۆ بڕینەوە بۆ عبداللە ی کوڕی نیوە موچەی دیاری کرد! صەحابەکان عەرزیان کرد قوربان خۆ عبداللە کوڕیشت لە کۆچکردوانە وەکو ئەو خەڵکە ، ئیتر بۆچی دەبێ موچەی ئەو نیوە موچە بێت؟!
— **توخوا سەرنج بدەن ئیمانداران** ، توخوا ئێوەش بەویژدانەوە سەرنج بدەن ئەو کەسانەی کە ئیسلام بە کۆنەپەرستی دەزانن ، وە وادەزانن بە کەڵکی حوکم کردن لە ئەمڕۆدا نایەت! ئەوەتا میللەت دەنگ بەرز دەکاتەوە بەرامبەر خەلیفە و فەرمانڕەوا لەسەر ئەوەی موچەی کوڕەکەی خۆی وەکو نیوە موچەی ئەو خەڵکە دیاری کردوە، نەك وەکو ئەمڕۆ میللەت دەنگی بەرز کردبێتەوە لەسەر ئەوەی کە

بۆچی موچەی کوڕەکەی بیست قاتی موچەی کوڕی ئەو خەڵکە هەژارە ماندوە ، خەباتکارەیە؟! وەکو ئەمڕۆ!

**حەزرەتی عومەر لە وەڵامی ڕەخنەی ئەو خەڵکەدا فەرموی:** چونکە عبداللە ی کوڕم ئەو کاتە منداڵ بوو ، بە کۆڵی دایکیەوە بوو ، ئەبێ فەرقی هەبێ لەگەڵ کەسێك کە بەپێ ی خۆی ڕێگای بڕیبێت و هیجرەتی کردبێت!.

یاخود کاتێ هەر ئەم خەلیفە عومەری کوڕی خەگابە قوماشی دابەش دەکرد بەسەر موسڵمانانی ناو شاری مەدینەدا ، پارچەیەك قوماش زیاد بوو ، ووتیان با بۆ (أُم كَلثوم) ی خێزانت بێت. فەرموی : نا ، نا ، (أُمُ سُلَيْط أَحَقُ بِهـا). فەرموی: ئوموسولە یط شایان ترە بەوەی کە ئەم پارچە قوماشە زیادەی پێ بدرێ ، نەك خێزانەکەی خەلیفە! هەندێ لە وانەی لەوێ بوون ، ئەو ژنەیان نەدەناسی بۆیە عەرزی حەزرەتی عومەر یان کرد. أُمُ سُلَيْط کێ یە؟! پیرە ژنەیەکە لەو سەری شاری مەدینە بە تەنها دەژی ، ئەو ئافرەتە لە ڕۆژی غەزای ئوحوددا زۆر مەردانە ئاوی بۆ دەکێشاین و زۆر خزمەتی سەربازانی ئیسلامی کرد. ئەو خزمەتی کردوە، نەك خێزانەکەی من!

ئا ئەمەیە دادگەری ، ئەمەیە ویژدان ، نەك خزمەتی تەزویری بۆ کوڕو خێزانەکەی نەکرد بەڵکو وەکو خەڵکیش تەماشای نەکردن و خاوەن خزمەتەکانی لەیاد نەکرد. سەرکردە دەبێ ئاوا ووشیار و بە ئاگابێ لە میللەت ، خۆی بیانبینێ ، نەك بەهاتوو هاواریش خەبەری نەبێتەوە!.

**١٠- تەزویر کردن لە بواری ئابووری و بازاڕدا** ، کە بەڕاستی ئەمە ترسناکترین جۆری تەزویرە چونکە کەس لەزەرەرو زیان و مەترسیەکانی ڕزگاری نابێت ، چونکە هەموو کەس پێویستی بە بازاڕ هەیە ، بێ هۆ نی یە یەك سورەتی تەواوی قورئان ناوی سورەتی (المُطَفِفِين). تەرازوو بازەکان ، جاری تریش ووتومە: تەرازو بازی جاران باشتر بوو ، چونکە فرۆشیار لە کێشەکەیدا لێ ی دەدزی. کیلۆیەکەی کە پێ

ی دەکێشا کەمی هەبوو، بەڵام خۆ ئەوەی دەیداتە کـەل و پـەل و خـۆراکێکی بـە کەڵك بوو، بێ عەیب بوو. لـە کیلۆیەکـدا (٢٥٠) غرامـی لـێ دەدزی بـەڵام خـۆ (٧٥٠) غرامەکەی تری بێ عەیب بوو کە تۆ بە حیسـابی کیلۆیـەکی تـەواو لێـت کڕی بوو.

بەڵام تەزویرچیەکانی ئەمڕۆ، ئەوەی دەتداتێ (١٠٠٪) بـێ کەڵکـە و دەبـێ فـڕێ بدرێ چونکە ئەگەر بیخۆیت ئەوا دەبێتە ئاگری ناوسکت. ئەمڕۆ بازاڕەکان پڕبـوون لەشتی بەسەرچوو ڕۆژانە بەتەن خواردنی بەسەر چوو دەگیرێ و دەسـوتێنرێ ، هـەر لە خوێ وە تا گۆشت و مریشکی بەستوو. تا شیرەمەنی !

کەسێ وابێ ویژدان هەیە ، چوەمێژوی بەسەر چونەکەی لابردوەو بەروارێکی تـازەی خستۆتە سەر! بۆگەنی کردوە ، ژەهراوی بوە، نـەك هـەر پارەکـەت بـە فـیڕۆ چـوو کەپێت کڕی ، ئەگەر بیخۆیت دەبێ سەد قـاتی ئـەوەش لەلاشـەی خۆتـدا صـەرف بکەی و زۆر جار نەخۆشی سامناکیش توشی مرۆڤ دەکات. کە چارەسەری نیە!!

بەداخەوە خەڵکێك لە وڵاتەی ئێمەدا (إبداع) و داهێنانی هەیە لە تـەزویر کردنـدا ، خەڵکی وڵاتی پێشکەوتوو ، شتە کە دروست دەکـەن. ئێمـە دەچـین تـەزویر ی دەکەین نەمانبینی چۆن بەدەیان تەن چای بایعیان تەزویر کردبوو ، لە پاکەتی چای (سیلان) دا دەیانفرۆشت!

لە یەکێ لە کەناڵەکانی تەلەفیزۆنەوە بڵاوکرایەوە کە کەسێك داهێنـانێکی نـوێ ی ئاشکرا بوو کە ماستی بەسەر چووی ئێرانی کردبوە سەتڵی ماستی بازاڕوە کە هـی خۆماڵی یەو نیوە بەنیوە لەگەڵ ماستی تازەدا تێکەڵی کردبوو. بە ماستی خۆماڵی فرۆشتبوی!! یاخود تەزویر کردنی پارە هەر لە دۆلارەوە تـا دینـار ، کـە بەڕاسـتی مەترسی یەکی گەورەیە! داهێنانی بواری تەزویر لە وڵاتەکەماندا گەیشتە ئـەوەی کە لە گۆڤاری (سیخورمە) دا بڵاوکرایەوە، کە کەسێك قۆپییەکەی بۆ قوتابیەك بە

پارە دروست کردوە. کە لەگەڵ خۆی بیباتە هۆڵی تاقی کردنـەوەو لەبـەردەم خـۆی دایبنیٚ و کەس هەستیشی پیٚ نەکات! ئەزانن چۆن؟!

هاتوە لەسەر شکڵی تاقی کردنەوەی ووزاری. شـکڵەکەی دارِشـتوە ، وەرەقەیـەکی سپی (A4) لـەسەرەوە نوسـراوە وەزارەتـــی پـــەروەردە، ســـاڵی خوێنـدنی (- ٢٠٠ - بۆ - ٢٠٠). بابەت: ----.

تەنها پێنج پرسیار وەڵامبدەرەوە. ئیتر لەسەر شێوەی پرسـیار دەیـان مـەعلوماتی ئەو وانەیەی تێدا نوسراوە کە تاقی کردنەوەی تێدا ئەنجام دەدرێـت و بەکۆمپیوتـەر نوسراوەتەوە و چاودێری هۆڵی تاقی کردنەوە ئەگەر تەماشاشـی بکـات وا دەزانـیٚ نوسخەی دابەشکراوی تاقی کردنەوەکەیە! هەی ئافەرین داهێنەر ، بەڵام پەتی درۆو تەزویر کورتە و هەر لەو رِۆژەدا ئاشکرابوو!!.

بەڵیٚ ئەمرِۆ تەزویری جیهانی هەیە. تەزویری زۆر گەورە هەیە ، ئەویش لە رِیگـای کۆمپانیاکانەوە ئەبینی لە بازارِدا شـتیٚ ، کەلوپـەلێك دەکـرِی زۆر باشـە. کەچـی دوای مانگیٚ وەجبەی دوەمی تەقلید کراوە و تەزویر کراوە و بەکەڵك نایەت، لیٚ ی نوسراوە (یابان) کەچی لە (چین) دروست کراوە ، لەسەری نوسراوە (چین) کەچی لـە ئێران دروست کراوە. قوماشەکە نوسـراوە (England) کەچـی لـە هنـد دروسـت کراوە!! کام شت لە گۆرەویەوە بیگرە کەلەسەری نەنوسرابیٚ (احذر التقلید).

لە کۆتایی ئەم باسەدا بەڵاو نەهامەتیەکانی تەزویر غەش بۆ سەر تاك و کۆمـەڵ و ئابوری وولات باس دەکەین لە چەند خاڵێکدا:-

١- نەمانی متمانەو دڵنیایی هـەر لـەو کتێبـەی کـە دەیخوێنیتـەوە ، تـا ئـەو خواردنەی دەیکرِی و دەیخۆی.

٢- تـەزویر کردن تاوانێکە کە تاوان و گوناهەکە بە تاوانکارەوە ناوەسـتیٚ ، بـەڵکو خەڵکی تریش فێر دەبێت ، بۆ نموونەك منداڵێکی دڵ پـاکی بـیٚ گـەرد ، کـەنازانیٚ غەش و تەزویر چی یە کاتیٚ هەموو پارەکەی گیرفـانی کـە (٢٥٠) دینـاری چاپە

ئەدات بە(چیز) ێکی کۆنی کە ڕواوی بەسەرچوو. کاتێ کـڕی و زانـی بـە کـەڵکی خواردن نایەت ، جا یان بە هۆی تامی خواردنەکـەوە ، یـان کەسـێکی گـەورە لـە ماڵدا سەیری بەرواری (EXP) یەرەکەی دەکات و دەزانێ بەسەر چـوەو خـواردنی بەسەر چوش ژەهراوی بوە. ناهێڵێ بیخوات ، ئەم مناڵە کە هەسـتی کـرد (٢٥٠) دینارەکەی ڕۆژانەی فەوتا ، ئیتر ووشەی تەزویر و غەش و خیانەت دەبیستێ و وای لێ دێ لە هەموو شتێ کە دەیکڕێ بە گومانە ، کە تـۆ بلـێ ی بەسـەر نەچـویێ!! ئەمە سەرەتایەکە کە دور نیە ڕۆژێك لەم مناڵەشدا ببێتە کـردار و فێـری غـەش و تەزویر کردن ببێت. ئەمەش هۆکاری ئەوەیە کـە منـاڵانی وولاتـانی ڕۆژهـەلات و جیهانی سێ یەم بە گشتی زۆرتر فێری درۆکردن و غەش کردن دەبن لەچاو منـاڵانی وولاتانی ڕۆژئاوا و جیهانی پێشکەوتودا ، چونکە لەبـەر چـاویان دەکـرێ و ئـەنجام دەدرێ. بەڵێ ئیمانداران: لەسەرەتای ووتارەکەدا ووتمـان ، تـەزویر لـەژێر پـەردەی شتی پیرۆزدا دەکرێ، بۆچی؟!

١- چونکە خەڵکی بڕوای پێ دەکات

٢- کەسی تەزویر کار و غەش کار ، ناوێرێ بە ئاشکرا بلێ ئـەوە دەکـەم. نـاوێرێ دزی بکات ناوێرێ ڕێگری بکات ، بەلام تەزویر وغەش کە هیچی نەك لـە دزی و ڕێگری کەمتر نیە ، بەڵکو زۆر زیاترە بەهۆی ئەوەی لەوانەیە ٩٠٪ ئاشکرا نەبێ ، ئەمەدەکات و ئەگەر ئاشکراش بوو یان هەندێ غەرامە دەکرێ یـان بـە تەلـەفونی بەر پرسێکی خزمی گرفتەکەی بۆ حەل دەکرێ!.

لە بواری تەزویری حەقیقەتەکانی ئیسلامیشدا. ئەگەر نووسـەری تەزویرچـی بـێ و ڕاستەوخۆ بلێ ئیسلام بە کەڵك نایەت. یان بێ ئـەدەبی ڕاسـتەوخۆ بەرامبـەر بـە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکات ، ئەوە موسڵمانان نەك هـەر گـوێ ی لـێ نـاگرن ، بەڵکو کتێبەکەی فڕێ دەدەن! بەلام ئـەو تـەزویر چـی یـە دێـت هەنـدێ ئایـەت و فەرمودەو مێژوی ئیسلامی لەگەڵ تێکەڵ دەکات بـۆ ئـەوەی بـە ئاسـانی هەسـت بەتاڵی و کوشندەیی ژەهرەکەی نەکرێت.

# چارەسەر

١- حکومەت چاودێری بازاڕ بکات ، چ بـازاڕی ڕاگەیانـدن و بڵاوکردنـەوە بێـت، پێویستە نوسین و ڕادەربڕن تەواوی ئازادی بۆ دابین بکرێ ، بەڵام نابێ لەژێر پەردەی ئازادی دا ، تەزویری حەقیقەتە مێژوویی و دەقـە ئیسـلامیەکان بکـرێ ، چـونکە ئەوە پێشل کردنی ئازادی یە. پێشل کردنی ڕاستی یە ، ئەوە غەش و تـەزویرە. وە ئەرکی سەرشانی حکومەتە ، کە چاودێری بـازاڕ بکـات ، وە لێپرسـینەوەی تونـد بکات بەرامبەر ئەو کەسانە کە شتی کۆنەو بەسەرچـوو دەفرۆشـن ، یـاخود گـران فرۆشی دەکـەن. لەبـەر ئـەوەی ئەمـە کـارێکی ئەوەنـدە پێویسـت و پـیرۆزە کـە پێغەمبەری خـوا(ﷺ) ، خـۆی پـێ ی هەڵسـاوە لـە صـەحیحی (مسـلم) دا لـە فەرمودەیەکدا کە (ئەبو هورەیرە) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەردانی بازاڕی کردو بەلای کابرایەکـدا تێپـەڕی ، کـە کۆمـەڵـە گـەنمێکی هەڵدابۆوەو هاواری دەکرد بۆ فرۆشتنی ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، دەستی خستە ناو کۆ گەنمەکەوە و دەستی بردە قوڵایی یەوە بۆ ئەوەی بزانێ کە گەنمی ناوەوەشی وەکو دەرەوەی جوانە ، (کەئەمەش ئەوەمان فێر دەکات کە لەکاتی کڕینـی هەرشـتێکدا بەڕوکەش نەخەڵـەتێین و بەتـەواوی سـەرنجی بـدەین و تەماشـی دیـوی ناوەوەشـی بکەین) هەزاران هەزار سەڵات و سەلامی خوات لەسەر ئەی خۆشەویستمان هـیچ کارێك نەما کە سودی ئومەتەکەیی تێدابێ و تۆ نیشانمان نەدەیت...

بەڵێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی خسـتەناو کـۆ گەنمەکـەوە، تەماشـای کـرد ناوەوەی تەڕە !! دیارە گەنمیش کە تەڕبوو ، بۆن خنك دەبێ و بەکەڵك نامێنێ!

بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەربەوەندە وازی نەهێنا کە لـێ ی نـەکڕێ و بـڕوات ، بەڵکو لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کردو فەرموی: ئەمە چی یە؟! باشە بۆچی ئەم جوانـەت لەسەرەوە داناوەو ناوەوەی ئاوای لێ هاتوە؟! کابرا ووتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) باران تەڕی کردوە!

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (أَفَلَا جَعَلْتَهُ فَوْقَ الطَّعامِ كَي يَراهُ النَّاسُ؟! مَن غَشَّنَا فَلَيس مِنَّا).

واتە: ئەی بۆچی ئەو تەڕبوەت نەخستۆتە لای سەرەوە بۆ ئەوەی خەڵکی بیبینن؟! هەرکەسێ غەش بکات لە ئێمە (لە کۆمەڵگا) ئەوە لە ئێمە نیە. ئەوە موسڵمانی بە حەق نیە. ئەوە هاوڵاتی دڵسۆز و پاك نیە ئەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێ ی عاجزو توڕەیە.

خۆ شتێکی ئاشکرایە کە هیچ کەس بە ئەندازەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پڕ ئیش نەبوە. بەڵام بۆ خۆی چاودێری بازاڕی کردوە. کەواتە پێویستە کاربەدەستان زۆر گرنگی پێ بدەن و فەرامۆشی نەکەن. وە هەر لێرەشەوە سوپاسی دام و دەزگا تەندروستی یەکان و ئاسایشی ئابوری دەکەین کە هەوڵێکی زۆر باشیان داوە بۆ دەست بە سەرا گرتنی دەیان تەن خۆراکی بەسەر چوو ، وە داخستنی چەندین مارکێت و دوکان و شیرەمەنی فرۆش ، کەشتی خراپ بوو بەسەر چوویان بە هاوڵاتیان فرۆشتوە! کە ئومێدەوارین زیارتریش بە ئاگابن.

**وە بەڕێزان** ، هەر لەم فەرموودەیەدا ئەوە تێ دەگەین کە تەزویر وغەش لە بازاڕدا لە هەموو سەردەمێکدا هەر هەبووە. ئەوەتا لە شاری مەدینەی پیرۆزدا، لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی داوە، بەڵام لەوانەیە ساڵی جارێك ڕووی دابێ، بەڵام ئەمڕۆ ڕۆژانە ئەو جۆرە کارانە ئەنجام دەدرێن، بە زەرەری کوشندەی زیاترەوە.

٢- بونی ئیمان بە چاودێری خوای پەروەردگار. کە هاووڵاتی ، کاسبکار ، بازرگان ، دوکاندار ، ئەو یەقینە لە دڵ و دەرونی دا دروست ببێ کە با حکومەتیش ئاگای لێ نەبێت ، کەسیش لێپرسنەوەی لەگەڵ نەکات، بەڵام خوای پەروەردگار ئاگادارەو چاودێرە بەسەریەوەو ڕۆژێك هەیە کە قیامەتە سزای ئەو کردەوە خراپەی لێ وەردەگیرێ. هەروەکو ئەم بەسەرهاتە کە لەسەردەمی خەلیفەی دووەم. حەزرەتی عومەری کوڕی خەطابدا ڕووی داوە ، کاتێ خەلیفە عومەر دەمەو بەیانی یەك

بەناو کۆڵانەکانی شاری مەدینەدا دەگەڕا، گوێ ی لە گفتوگۆی نێوان دایك و کچێك بوو، کە دایکەکە بە کچەکەی دەگوت: ڕۆڵە هەستە هەندێ ئاو بکەرە ناو شیرەکەوە با تۆزێ زۆر بێ!!.

هەروەکو لەم سەردەمەشدا، باوکە کە کوڕەکەی فێری غەش دەکات. وە ئەمڕۆ ئەو ڕوداوە دووبارە دەبێتەوە، بەڵام بە خراپتر، خۆ ئەو کاتە کە ئاو کراوەتە شیرەوە، ئەو شیرە تەنها تامەکەی و سودەکەی لە دەست داوە، بەڵام خۆ زەرەری بۆ لاشە نەبوە، بەڵام ئەمڕۆ بەتەن ، بە هەزاران کیلۆ شیرو ماست و کەرە و پەنیر و دۆ بەسەر چوەو کەڕوو لێ ی داوە کە خواردت ، نەك هەر سودی نیە ، بەڵکو ژەهراویشت دەکات ، یان ئەمڕۆ ئاوەکە ناکرێتە شیرەکەوە ، بەڵکو ئاو دەکرێتە نەوت و گازو بەنزینەوە و چەندین ئوتۆمبێل پەکی دەکەوێت و ڕوداوی هاتوچۆ بەو هۆیەوە دروست دەبێ و سۆپای نەوت لەماڵدا کار ناکات، چونکە (یەك لەسەر چوار) ی زیاتر ئاوە لە بەرمیلەکەدا!!.

**کەواتە:** ڕوداوەکان لە مێژوودا دووبارە دەبنەوە ، بەڵام هەروەکو پێشتر ووتم: زەرەرەکان زیاترن ، بەڵێ کچەکە ووتی: ئاخر دایە گیان، خەلیفە عومەر ئەم کارەی قەدەغە کردوەو سزای داناوە بۆ هەر کەس کە غەشی ئاوا بکات، دایکەکە ووتی: جا ڕۆڵە گیان عومەر کوا ئاگای لە ئێمەیە چی دەکەین بەم بەیانی یە لەم ژوورە تاریکەدا، کچەکە ووتی: ئەی دایە گیان ئەوە تۆ دەڵێی چی؟!

باشە ئەگەر عومەر ئاگای لێ نیە. خۆ خوای عومەر ئاگای لێ یەتی، خۆ خوای گەورە لە هەموو جێگایەکدا دەمانبینێ و ئاگادارە بە کردەوەکانمان! (سُبْحانَ اللّٰه) لەم ووتە بەنرخە، سوێند بەخوا تەنها ئەمە مرۆڤ دەکاتە مرۆڤ، ئەی خوا چاوی لێمان نی یە؟! بەڵێ ئەم ئیمانە مرۆڤ لە غەش و تەزویر دوردەخاتەوە.

٣- پێویستە هاوڵاتی موسڵمان ، ووریا و چاو کراوە بێ ، تۆی موسڵمان هەر شتێکت کڕی جوان سەیری بەرواری دەرچون و بەسەر چونی بکە. وە لەوەش دڵنیابە کە ئەم بەروارەش تەزویر نەکراوە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: (لايُلْدَغُ المُؤمِنُ في جُحْرٍ واحِدٍ مَرَّتَيْنِ) مُتَّفَقٌ عَلَيهِ البُخارِي (٥٧٨٢) وَمُسْلِم (٢٩٩٨).

واتە: ئیماندار لە کونێکەوە دووجار ناگەزرێ ، ئەگەر جارێك دوکاندارێك خەڵەتاندتی دەی جاری دووەم وریابە نەتخەڵەتێنێتەوە و شتی خراپت بەسەردا ساغ نەکاتەوە.

کابرایەك لە ئیمامی ئەبو حەنیفەی پرسی: قوربان ئەگەر لە حەوزی ئاوێکدا خۆم شۆرد ڕوو لە قیبلە بکەم یان پشتی تێ بکەم؟! فەرموی: ڕوو لە جل و بەرگەکەت بکەو ئاگات لەوە بێ دز نەیدزێ و بەڕووتی نەڕۆیتەوە بۆ ماڵ!!

وە هەرکەسێ لە ئێوە شتێکی بەسەر چووی بینی کە دوکاندارێك دەیفرۆشێ ، ئەگەر دوکاندارێکی بەڕێزو بە هەڵسوێست و حەڵاڵ خۆر بوو ، لە ڕووی نەزانینەوە و هەست پێ نەکردنە وە ئەوشتەی دەفرۆشت ، ئەوا تۆش دڵسۆزانە ، بە زمانێکی زۆر شیرین و نەرم و دۆستانە ، دوور لە چاوی خەڵك و بەنهێنی ئاگاداری بکەرەوە لەم خراپەو و تاوانە

کە بێگومان ئەویش سوپاست دەکات و ئەو خراپە یە دەگۆڕێت بۆ چاکە و تۆش و ئەویش لای خوا پاداشتان هەیە.

وە ئەگەر دوکاندار و فرۆشیارەکە کەسێکی وابوو کە بە فێڵبازو حەرام خۆرو دەست بڕ ناسرابوو ، وە تێت ڕانەئەبینی کە بەزمان ئامۆژگاری بکەی ، ئەوا هیچ گوناه نیە، بەڵکو واجبە کە بە نهێنی ، بێ ئەوەی بزانێ تۆ بوی، دەزگای پەیوەندیداری لە تەندروستی و ئاسایشی لێ ئاگادار بکەیەوەو چی ڕاستە ئەوە بڵێ ی و ئەوانیش دەست بەجێ بگەنەسەرئەو فرۆشیارەو، میللەتی داماو و هەژار کە گیری خواردوە بە دەست گرانی بازاڕ و نەبونی پارەوە لەو هەلپەرست و حەرام خۆرانە پاك بکەنەوە

با ئەوەی لە توانایدا هەیە بیکرێ لیّ ی دڵنیا بیّ و ئەویش نەبێتە ئـازارێکی تـری سەر ئازارەکانی

خوای گەورە بەڕحمی خۆی ڕەحمان پیّ بکات و کـارو کردەوەکانمـان ، پیشـەمان ، ڕاست و دروست و شەرعی بێت و لە خراپە و تاوان بەدوربین و بازاڕ و کە سابەتمان، وولاّتمان لە تەزویرکاران و غەش کاران بەدور بێت.

اللَّهُمَّ آمِين

## سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز.

٢- فەرمودە پیرۆزەکانی پێغەمبەر (ﷺ).

٣- أحداثُ النِهايَة ، الشيخ محمد حسان ، ص١٥٥ ، ص٧٧ ، ص٣٠٠.

٤- بەرەو ئیسلام ، ئازادی ، ئەندازیار عثمان ، ل٨٤

٥- نظرة النعيم في مكارم أخلاق الرسول الكريم (ﷺ) مجموعة من العلماء ، ج١٠ ، ص٤٧٧٥.

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجمعين.

**ئیمانداران:** گەلێك ووشە هەیە، كاتێ ئەم ووشەیە لەناو كۆمەڵدا دەوترێ، یەكسەر بیرو هۆش و نیگای چاوەكان ئاماژە دەكەنە سەر كەسێك ، بەڵام ئەگەر لە تەرازوی شەرعدا بۆی بڕوانی وانیە و ئەو (زاراوەیە) كەسێك یان كەسانێكی تر دەگرێتەوە و ئەوی خەڵكی ئاماژەی بۆ دەكەن بێ بەر یە لە واتای ئەو زاراوەیە ، بۆ نموونە لەم ووتارەدا باسی یەكێ لەو شتانە دەكەین. كە ئەویش (وەجاخ كوێری) یە.

كەلای ئێمە بەژن و پیاوێك دەڵێن كە خوای گەورەو بە خشندە، بە حەكیمی و خەبیری و عەلیمی خۆی منالی پێ نەبەخشیون. نە كچ نەكوڕ. وە مێژووی مرۆڤایەتی وا هاتوە كە دەبێ خەڵكانێك هەر هەبن كە دەنگی گریانی بەچكەیەك لە ماڵیاندا نەبیسترێ ، چونكە ئەمەش هەر بەخشینە بەڵام بە جۆرێكی تر، وە هەركەسێ كە منالی نەبوو، بەڵام سوپاس گوزاری خوابوو، وە خۆگربوو ناشوكری نەدەكرد، ئەوە خوای گەورە لە دنیادا قەرەبوی ئەو منالْ نەبونەی بۆ دەكاتەوە بەوەی كە هەرگیز موحتاجی دەستی كەسیان ناكات، وە لەناو دڵی خەڵكی دا خۆشەویستیان دەكات و هەموو منالان و گەنجان بۆیان دەبن بە ئەولاد و ڕۆڵەیان و بەبێ عەزیەتی منالْ بون و بەخێوكردن دەیان منالی لە خزمەتدا دەبێ! وە لە قیامەتیشدا خوای گەورە قەرەبوی بۆ دەكاتەوە كە خۆی زانایە بەچ شێوەیەك پاداشتی دەداتەوە.

بەڵێ خوای گەورە لە سورەتی (الشوری) ئایەتی (٤٩-٥٠) دا ئاماژەی بەوە كردوە كە خوای گەورە كە خاوەن و پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوی یە ،چی بوێ ئەوە دروست دەكات وە خوای گەورە بەویستی خۆی مەیلی لێ بێ بە هەركەس بیەوێ ، بەهەدیەو خەڵات و دیاری كچ دەبەخشێت ، وە بەهەركەس مەیل و ویستی ببێ كوڕ دەبەخشێت ، وە هەیشە هەردوكیانی پێ دەبەخشێت ، هەم كچ و هەم كوڕ.

وە هەركەسیش كە ویستی منالی هیچ ناداتێ، بەڕاستی ئەو خوایەی كە ئەم دابەش كردنە دەكات زانایە وە بەتوانایە بەسەر هەموو شتێكدا. زانایە بەداهاتووی مرۆڤەكان و دەزانێ كەچی لە بەرژەوەندی ئەو مرۆڤەدایە.كچ یان كوڕ، یان

هەردوکیان، یان هەر هیچیان نابێت ، وە ئەوەش کە بەدڵی خۆی منالّی نابێت، وەکو ئەوەی کەهەر منالّی نابێت. یان هەر کچی دەبێ و کوڕی نابێ، یان هەر کوڕی دەبێ و تامەزرۆی بونی کچێکە بەلاّم نایبێ بابزانێ کە خوای گەورە (قدیر) ە و توانای بێ سنورە بەسەر هەموو شتێکدا و کە تەیداوەتێ ئەوە خوای گەورە خۆی باشترە دەزانێ. کەچی خێری دوا ڕۆژی ئەو بەندەیەی تێدایە.

ئیمانداری بەڕێز، تەماشای دەورو بەر بکە ، خێزانی وا هەیە (٨) کوڕی هەیە وکچی نیە، هی واهەیە (٨) کچی هەیە و کوڕی نیە.

هی واهەیە (٤) کوڕو (٤) کچی هەیە ، خێزانی واش هەیە یەك کچ و (٧) کوڕی هەیە و بە پێچەوانەشەوە هەیە. هی واش هەیە هیچ منالّی نیە.

**زانایانی جوگرافیای مرۆیی (الجُغرافِيَة البَشَرِيَّة) دەفەرمون:**

ڕێژەیەکی جێگیر هەیە لە جیهاندا بۆ نێرو مێ کە بریتی یە لە ١٠٥٪ نێرینە ٩٥٪ مێ ینە واتەلە (٢٠٠) مرۆڤ (١٠٥) نێرەو (٩٥) یان مێ یە ، ئەمە لە هەموو وولاّت و کیشەورو سەردەمێکدا وایە. لە دوای جەنگی جیهانی دووەم دا ، ئەوەندە پیاو کوژرا ، کە ئامار کرایەوە (٢٥٪) نێر مابوو. (٧٥٪) ی مێ مابوو. سبحان الله. خوای گەورە بە فەرمانی خۆی وای کرد لە ماوەی چەند ساڵێکدا زوربەی لە دایك بوون کوڕبوون ، تا ڕێژەکە وەکو خۆی لێ هاتەوە. ئەمجا کچ و کوڕ لەسەر ڕێژەی خۆیان لە دایك دەبوون.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ ٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَحۡمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلۡأَرۡحَامُ وَمَا تَزۡدَادُۖ وَكُلُّ شَيۡءٍ عِندَهُۥ بِمِقۡدَارٍ ﴾ الرعد: ٨.

**کەواتە:** ئەو کەسەی کە هەرگیز منالّی نابێ، ئەوە لەڕووی شەرعەوە وەجاخ کوێر نیە ، چونکە خوای گەورە زۆر جار بەخشینەکەی ئەوەیەو لەوەدایە کە پێت نا بەخشێت.

وە ئەو کەسانەش کە هەر منالّیان دەبێ و دەمرێ منالّی بۆ نامێنێتەوە، ئەوانیش لە ئیسلامدا پێیان ناوترێ وەجاخ کوێر، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ کە

لە هاوەڵانی پرسی: (ما تَعُدُّونَ الرَّقُوبَ فيكُم؟ قُلْنا الَّذي لا يُولَدُ لَهُ قَالَ: لَيس ذالِكَ بالرَّقُوبِ ، وَلكِنَّهُ الذي لَمْ يُقَدِّمْ مِنْ ولدِهِ شَيْئا). رواهُ البُخاري وَمُسْلِم.
واتە: ئایا لەناو ئێوەدا ئەی صەحابەکانی محمد (ﷺ) بەکێ دەڵێن وەجاخ کوێر؟ صەحابەکان: دەفەرموون: بەتێکڕا ووتمان: وەجاخ کوێر لەناو ئێمەدا بەو کەسانە دەوترێ کە هەرگیز منالّی نابێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ئەمە وانی یە و ئەو کەسە وەجاخ کوێر نیە ، بەڵام وەجاخ کوێر ئەو کەسەیە کە پێش ئەوەی بۆ خۆی بمرێ و بگاتە قیامەت، منالێکی نەمردوە و پێش خۆی نەخستوە بۆ ئەوەی لەساتە سامناکەکانی قیامەتدا ئەم منالەی شەفاعەتی بۆ بکات.
**کەواتە:** بە پێوەری شەرع ئەمیش کە هەرگیز منالّی بۆ ڕاناوەستێ. ئەویش وەجاخ کوێر نیە، بەڵکو (چوار) وەجاخ کوێر باس دەکەین. کە بەڕاستی وەجاخ کوێرانی حەقیقی و ڕاستەقینەن.
**١- زانایانی ئایینی ئیسلام ، کە زانستە شەرعیەکانی هەمووی خوێندوە.**
بەڵام کردەوەی پێ ناکات. یان لە بیری چۆتەوە، چونکە تەماشای نەکردوە و ئامۆژگاری موسڵمانانی پێ نەکردوە، نەووشەیەکی بۆ ئیسلام نوسیووە، نە چوار خوێنکاری لە دەوری خۆی داناوە کە وانەیەکیان فێر بکات. تەنانەت منالەکانی خۆشی نازانن ئەم هەموو کتێبە ئایینی یە بۆچی باشە، بۆیە زۆر جار دوای مردنی باوکیان، کتێبەکانی دەفرۆشن!! ئایا ئەم مەلایە وەجاخ کوێرە یان نا؟!
بەڵێ وەجاخ کوێر چونکە میراتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ی وەرگرت، بەڵام کەس نەبوو میراتەکە لەم وەربگرێ وبە هەدەرچوو.
بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (العُلَماءُ وَرثَةُ الأنْبياء، وَإنَّ الأنْبياءَ لَمْ يُوَرِّثُوا ديناراً وَلا دِرهَماً. وَلاكِنَّهُمْ وَرَّثُوا العِلمَ ، فَمَنْ أخَذَهُ ، أخَذَهُ بِحَظٍّ وافِرٍ). رَواهُ أحمَد وَالترمذي و صَحَّحهُ الألْباني رقم (٦٢٩٧) في صَحيح الجامِع.
واتە: زانایان میراتگرانی پێغەمبەرانن ، بە ڕاستی پێغەمبەران لە دوای خۆیان دینارو دیرهەمیان بەجێ نەهێشتوە، بەڵکو زانستیان دوای خۆیان لێ بەجێماوە، جا هەر کەسێ لەو زانستەی وەرگرتبێ ، ئەوە پشکی هەرە گەورەی بەرکەوتوە.

به داخەوە چەند مەلای گەورە و ناودارمان هەبوو، لە دوای مردنی کتێبەکانی فرۆشران و یەك کەسیش لەسەر دەستی پەروەردە نەبوو، هیچیشی نەنووسی و بە وەجاخ کوێری مرد.
پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (**إنَّ اللهَ تَعالى لايَقْبضُ العِلم إنْتِزاعاً يَنْتَزِعهُ مِن العِبادِ ، وَلكِنْ يَقبضُ العِلْمَ بِقَبْضِ العُلَماء ، حَتَّى إذا لَمْ يُبْقِ عَالِماً ، إتَّخَذَ النَّاسُ رؤوساً جُهالاً، فَسَئِلوُا فَأفْتُوا بِغَيْرِ عِلْمٍ، فَضَلُّوا وَأضَلُّوا**) رَواهُ البُخاري وَمُسلِم.
واتە: خوای گەورە زانست و زانیاری بە وەرگرتنەوە و هەڵگرتن لەناو بەندەکانی دا لانابات، بە شێوەیەك کەس هیچی لەبیر نەمێنێت. بەڵکو زانست وەردەکرێتەوە بە مردنی زاناکان. تا ئەو کاتەی کە هیچ زانایەك نامێنێ، ئەو کاتە خەڵکی کۆمەڵە کەسێکی زۆر نەزان دەکەن سەرمەشق و پێشەوای خۆیان، خەڵکی ڕوو دەکەنە ئەو نەزانانەو پرسیاریان لێ دەکەن و ئەوانیش فتوایان بۆ دەدەن بەبێ زانست.
جا هەم خۆیان سەرلێشێواو و گومڕان ئەو جۆرە بەناو زانایانە، هەم خەڵکیش گومڕا دەکەن، بەڵێ کەم نین ئەو بەناو زاناو مەلایانەی کە تەنها بە پۆشینی جل و بەرگی ڕێزداری مەلایەتی زانای ئایینن. ئەینا:
أ- لە دین و ژین شارەزانین ، هەیانە دەڵێ ئیسلام سیاسەتی تێدا نی یە!
ب- ئەوەندەی کە دەشیزانن بۆ خۆیان کاری پێ ناکەن.
ج- ئایەت و فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ دڵی کار بەدەستان دەگونجێنن و بۆیان دەکەن بە فتوا !!
**مامۆستایەکی بەڕێز دەڵێ:** جارێکیان لەماڵی خۆمان نوێژی بەیانی ڕۆژی هەینیم دەکرد. وەکو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)، سورەتی (ألم) ی سەجدەو سورەتی (الأنسان) م خوێند. دوای سورەتی (الفاتحة)، جا هەندێ مامۆستای ئایینی میوانم بوون و نوێژیان بە جەماعەت لەگەڵ کردم. کاتێك لەسەجدەی تیلاوەی سورەتی (ألم) ی سەجدەدا چوومە سەجدە، هەستم کرد کۆمەڵێیان هەر بە پێوە مابوونەوە، هەندێکیشیان هاتنە سەجدەو هەندێکی تریشیان چوونە ڕکوع. دوای تەواو بوونی

نوێژ، یەکیکێکان ووتی: ئەرێ مامۆستا ئەو نوێژە سێ ڕکات نەبوو؟!! ووتم: نەخێر مامۆستا دوو ڕکات بوو.
بۆچی دەپرسی؟! ووتی: وەڵلا ئێمە هەر سەرمان لێ تێکچوو، بوینە سێ بەش، باشە مامۆستا ئەوە چی بوو؟! ووتم: ئەوە سەجدەی قورئان خوێندن بوو. (سجدة التلاوة) ووتی: دەی وەڵلاهی من لە بیرم نەمابوو ، راست دەفەرموی، بەڵام لە ناو نوێژەکەدا هەندێکیان لەگەڵ تۆ هاتنە سوجدەو هەندێکی دیکەش هەر بە پێوە مابونەوەو منیش ووتم: خير الأمور أوسطها. بۆیە منیش چومە ڕکوع!!
جا وەرە بۆ خۆی ئیمامی مزگەوت بووە، نەیزانیوە، ئەوەندە دەمێك بوە، تەماشای هیچ کتێبێکی نەکردوەو تەنانەت بە باشی و سەرنجەوە قورئانیشی نە خوێندووە، هەتا لە بیری چۆتەوە کەسوجدەی تیلاوە لە نوێژدا چۆن دەبرێ ، ئەی باشە دەبێ ئەم بەناو زانایە لە معاملات و میرات و نکاح و تەلاق دا چی ئاگا لێ بۆبێ؟!!
بەڵێ وەجاخ کوێری ڕاستەقینەی یەکەم زانای بەناو زانای بێ میراتگر لە زانستدا لە پاش بەجێ ماو.
**٢- وەجاخ کوێری ڕاستەقینەی دووەم:** دەوڵەمەندی چروکە کەبەدەستماڵی خۆیەوە گیری خواردوە.
خەو و خۆراکی لێ تێکچووە. هیچ ژەمێکی لە شوێنی خۆی دا نەماوە پەندە کوردیەکە دەڵێ: ماڵ لە مەریوان دڵ لە دوو جێ یە!
ئەو دڵی لە دەجێگا و سەد جێگایە، حاسبە و کۆمپیوتەر و ژمێریار ، داماون بە دەست ژماردنی ماڵ و سامان و بازرگانی و هاوردە و بردەیەوە، تەنانەت لە وەختی نان خواردن دا مۆبایلەکەی بەلای گوێوەیەتی، کە نیوەشەویش چوە سەر جێگای خەوتن، لە جیاتی شایەتمان و زیکری خوا. لەو کاتەشدا هەر لاشەی لەسەر جێگاکەیە. ئەینا ڕوحی وا لە چین و دوبەی و تاران و تورانە!! هەموو هیواو ئاواتی قەصرو قصور، سەیارەی دوا مۆدیل ، کۆمپانیا. ڕەسیدی بانق. مونافەسەی فلآن

دەوڵەمەند ، کەچی وەختێ دەمرێ ، تەماشایکە لە هەموو ژیانی دا، بەم هەموو سامانەی بەردەستی ، زەکاتی نەداوە، مزگەوتێکی نەکردۆتەوە !! بەلاّم کاتێ دەمرێ ئەمجا مناڵەکانی ڕۆژی بەچەند وەرەقە لە ئارەزوی خۆیاندا صەرف دەکەن.

وە جاری وا هەیە کوڕەکە پارەی باوکی دەدزێ!

لە قەبرا ئەم دەوڵەمەندە چروکە ئەمجا پەشیمان دەبێتەوە کە لە دنیادا ئەو هەموو هەژار و داماوەی بینیوە ، لە خزمی خۆی ، لە دراوسێ و هاوولاّتی خۆی ، کەچی لەو هەموو ماڵ و سامانە دینارێکی لە دەست دەرنەهاتووە...

ئەو هەموو سامانەی لەژێر دەستدا بووە ، لە گیرفان و قاصەی دا بووە. کەچی خەمێکی لە بلاّوکردنەوی ئەم دینە نەخواردوە، تا مرد قورئانێك، کتێبێکی حەدیس، کتێبێکی ئایینی ئیسلامی لەسەر ئەرکی خۆی چاپ نەکرد.

لە قەبرا پەشیمانە بۆ ئەوەی کە ئەم هەموو خێرە نەبڕاوانە بە پارە دەکران ، ئەویش هەیبوو، کەچی نەیکرد، ئیتر هەر کە مرد ناوی کوێر دەبێتەوەو وەجاخ کوێر دەبێتەوە لە چاکەدا بۆ قەبر و قیامەتەکەی.

ئەمە بێجگە لە قیامەتی کە قورئان دەفەرموێ: ﴿ وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ٱلَّذِى جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُۥ يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ ﴾ الهمزة: ١-٣

پێشەوای توێژەرەوانی قورئان (المفسرون) الطبري دەفەرموێ: أيْ أَحْصَى عَدَدَهُ ، وَلَمْ يُنْفِقْهُ فِي سَبِيلِ اللهِ. وَلَمْ يُؤَدِّ حَقَ اللهِ فِيهِ ، وَلكِنَّهُ جَمْعَهُ فَأَوْعاهُ وَحَفَضَهُ. (تَفْسير الطَّبَري) ج ٣٠ ، ص١٨٩.

**واتە:** پارەکانی لەسەر یەك دادەناو دەیژماردن و لاسیکی لێ دەبەستن و لە پێناوی خوای گەورەدا هیچی لێ نەدەخشین، وە زەکاتی شەرعی کە خوا واجبی کردوە لێ ی دەرنەدەکرد، بەڵکو هەر خەریکی کۆکردنەوەو عەمبارکردن و بەستنی بوو لە صندوق دا.

بەڵێ ئەو جۆرە دەوڵەمەندە وەجاخ کوێرانە،ئەو ماڵە بەهی خوا نازانن (نعوذ بالله) هەروەکو قارونی سەردەستیان ووتی: ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِىٓ ﴾القصص: ٧٨

ئەمەم هەمووی بەرەنجی شانی خۆم بە دەست هێناوەو بەرهەمی زیرەکی و عەقڵی خۆمە لە بواری ئابووری و بازرگانی دا.
یاخود وەکو ئەو خاوەن باخەی کە خوای گەورە لە سورەتی (الکهف-٣٦) دا باسی دەکات کاتێ کە ئەم هەموو باخ و وباخات و کانی و ئاوەی بەهی خوای گەورە نەزانی و وای دەزانی کە هەرگیز تێك چونی بەسەردا نایەت، دەیگوت: ﴿ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيۡرًا مِّنۡهَا مُنقَلَبًا ﴾ الكهف: ٣٦
بەڵێ هەر وەختێ دەوڵەمەند ئەوماڵەی بەهی خوا نەزانی، وە بڕوای بە قیامەت نەبوو ، ئەوە ئەو ماڵە دەبێتە هۆکاری بەدبەختی بۆ خۆشی بۆ هاوولاتیانیشی و بۆ ئەوانەش کە لە ژێر دەستیدا وەکو کۆیلە کاردەکەن.
بەڵێ ئەو دەوڵەمەندە وەجاخ کوێرانە ماڵ چۆتە دڵیانەوە، جا ماڵ لە گیرفاندا بێ باشە بەڵام لە دڵ دا بێ زۆر خەتەرە. چونکە هاتنە دەرەوەی واتە لەت بونی دڵ و مردنی خاوەنەکەیەتی!!
بانگخوازی بەناوبانگی جیهانی (شێخ محمد حسان) لە کتێبەکەیدا (أحداث النهاية ، ونهاية العالم)، ص١٨٨ دا دەفەرموێ: لە سەردانێکمدا بۆ ئەمریکا، برایانی موسڵمانم لەوێ پێیان ووتم: مامۆستا فلان کەس بە شداری هیچ کارێکی خێر ناکات لەگەڵمان و سوپاس بۆ خوا ماڵو سامانیشی زۆرە، وە هاتچۆی ئەم مزگەوتەش ناکات لەگەڵ ئەوەی کە خوای گەرە لوتفی لەگەڵ کردوە شوێنێکی بازرگانی زۆر باشی دەست کەوتوە لە نزیکی ئەم مزگەوتە.
کەچی لەگەڵ ئەوەدا کە موسڵمانەو نوێژ دەکات، هەرگیز دۆلارێك نابەخشێت بۆ مزگەوت و پێویستی یەکانی، کە لێرە ئێمە خۆمان مزگەوت دروست دەکەین و پێداویستی بۆ دابین دەکەین، بەڵکو بچی ئامۆژگاری بکەی و بەقسەکانی بەرێزت. کاریگەری لەسەر دروست ببێ و هەم بۆ خۆی قیامەتی خۆی بەو سامانەی بەردەستی ئاوەدان بکات و هەم موسڵمانانیش و بانگەوازی ئیسلامیش لەم وولاتی ئەمریکایەدا لێ ی سوود مەند بێت.

**شێخ محمد حسان دەفەرموێ:** چوم بۆ لای و باسی خوای گەورەو ڕزقی خوام بۆ کرد ، کەچی هیچ سوودی نەبوو، قورئانم بۆ خوێندەوە ، فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ خوێندەوە کەچی هیچ کاری لێ نەکرد. دوای قسە بۆکردنێکی زۆر پێ ی ووتم مامۆستا خۆت ماندوو مەکە ، چۆن بوم هەر وادەبم!! منیش ووتم: خوا خێرت بنووسێ ، حەساندتمەوە ، کە نەتهێشت هیچی تر قسەت بۆ بکەم.

کە زانی دڵنارەحتم و بەدەم و چاومەوە دیارە ووتی: مامۆستا دڵنیابە کە گەڕامەوە بۆ ووڵاتی خۆمان مزگەوتێك دروست دەکەم و شەوو ڕۆژ خەریکی عیبادەتی خوا دەبم لەو مزگەوتەدا!! ووتم زەحمەت نەبێ وەرەقەو قەڵەمێکم بدەیە. ووتی بۆ چیتە؟! ووتم دەمەوێ کاغەزێك لەبارەی تەمەنی تۆوە بنوسم و فریشتەی گیان کێشان ئیمزای لەسەر بکات و بەڵێن بدات ، کە من (ملك الموت) م و بەڵێن بێت بەلای فلان کەس دا ناچم تاوەکو نەگەڕێتەوە بۆ ووڵاتی خۆی و مزگەوتێك دروست نەکات و چەند ساڵ عیبادەتی خوای تێدا نەکات!! کە ئەوەم ووت: کابرای دەوڵەمەند زەردەخەنەیەکی کرد و زانی مەبەستم لەم قسەیە چی یە.

سەیرێکی کردم و ووتی: مامۆستا: من کە هاتوم بۆ ئەم ووڵاتی ئەمریکایە تەنها یەك شت منی هێناوە بۆ ئێرە، ئەویش کۆکردنەوەی دۆلارە ، شەو و ڕۆژم خستۆتە سەریەك بۆ دۆلار کۆکردنەوە. بڕوا بکە مامۆستا کاتێ سەرم دێشێ سەد دۆلاریەك لە دەفتەرە دۆلارێك دەردەکێشم و سەد دۆلاریەکە دەخەمە سەرسەرم و بەچاومیدا دێنم، یەکسەر سەرئێشەکەم دەڕوات!! منیش پێم ووت: دەی بەخوا تۆ بەندەی دۆلاری.

بە خوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕاستی فەرمووە کە دەفەرموێ: **(تَعِس عَبْدُ الدينار، تَعِس عَبْدُ الدِّرْهَم ، وعَبْدُ الخَميصَةِ ، إنْ أُعْطِيَ رَضِيَ ، وإنْ لَمْ يُعْطَ سَخِطَ، تَعِس وَانْتَكَس وَإذا شيكَ فَلا انْتَقَشَ)** رَواهُ البُخاري.

بەڵێ عەبدی دینارو دۆلار و زێڕو زیوو ، وەجاخ کوێری ڕاستەقینەن.

**٣- وەجاخ کوێری سێ یەم:** ئەو کاربەدەست و دەسەڵاتدارو فەرمان ڕەوایانەن، کە خوای گەورە دەسەڵاتی پێ داون و حاکمن بەسەر ووڵاتێکدا ، شارێك دا، دەزگاو فەرمانگەیەك دا ئەتوانن بەهۆی ئەو دەسەڵاتەوە کە خوا پێ ی داون، دادپەروەری

بڵاوبکەنەوەو خزم خزمێنەو واسیطە کردن و بەرتیل خۆری و جیاوازی نێوان دەوڵەمەندو هەژار و بێ کەس و خاوەن خزمدا نەهێڵن و حەق بدەنەوە بە ماف خوراو و ناحەقی لە تاوانکار قبوڵ نەکەن. هات بەو دەسەڵاتەی باری ئابووری بوژاندەوە ، هەژاری نەهێشت موچەی زیاد کرد، ئیش و کاری بۆ بێکاران دابین کرد، وولاتی کرد بە گوڵستان، ئەمن و ئەمان بڵاو بۆوە، هەرزانی کەوتە وولاتەوە، ئەو جۆرەکاربەدەستە، کار جوانە، هەتا بژی بیلبیلەی چاوی میللەتەو لەدوای مردنیشی وەجاخی ڕوونە بەکردەوە باشەکانی، کە خەڵکی باسی دادگەریەکەی و کارە جوانەکانی دەگێڕێتەوە. ڕەحمەتی بۆ دەنێرن.

**بۆ نموونە:** خولەفای ڕاشدین، ئەبوبەکرو عومەر عوسمان و عەلی، عومەری کوڕی عبدالعزیز لەناو هەموو خەلیفەکانی ئومەوی و عەباسی دا، هەر ناوی عومەری کوڕی عبدالعزیز بە شانازیەوە دەبرێ. لەسەدان کتێب دا ژیاننامەیان تۆمار دەکرێ ، لە هەموو وتارێکدا بەهەزاران جار لەسەر تا سەری دنیادا لەوتاری هەینی دا ناویان دەبرێ و ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان بۆ دەنێردرێ، ئەمە سرەکەی، نهێنی یەکەی چی یە؟ نهێنی ئەم وەجاخ ڕوونیە هی باوك و باپیری ناوداریان نیە، هی ڕۆڵەو ئەولادیشیان نیە، هی دەوڵەمەندی و زۆری سەروەت و سامانیشیان نی یە، بەڵکو هی ئەو عەدالەت و دادگەریەیە کە میللەت (بە تایبەت هەژاران) لەژێر چەتری دادگەریاندا حەسانەوەو چەوانەوە، کە ئەبوبەکری صدیق و عومەری فاروق مونافەسەو کێبڕکیان دەکرد لەسەر خزمەتکردنی پیرەژنێکی نابینای بێ کەس و کار لە شاری مەدینەدا، کامیان زووتر بگەنە ماڵەکەی و نانی بدەنێ و ئاوی بۆ بەرن و ماڵی بۆ گەسك بدەن...

بەڵێ وەجاخ ڕونیان بەرهەمی ئەو عەدالەتەیە کە گەنجێکی قیبگی ، ڕەش پێستی ئەفەریقی زللیەکی لەلایەن کوڕی والی میصرەوە ، سەرکردەی سەربازی بەناوبانگی ئیسلام. (عەمری کوڕی عاص) ەوە ، بەناهەق لێ دەدرێ ، کاتێ ئەم گەنجە ستەم لێکراوە، بەناحەق لێدراوە، کەرامەت شکێنراوە. دەنگی ناڕەزایی و مەزلومەیەتی خۆی دەگەیە نێتە خزمەت خەلیفەی ئیسلام عومەری کوڕی خەتاب.

**حەزرەتی عومەر دەفەرموێ:** ئەی گەنجێك موسڵمانیش نیت، بەڵام هاووڵاتی ئەم دەسەڵاتەی

ئەبێ بە دەستی خۆت بدەیەوە لە بنانگوێ ی کوڕەکەش و باوکیشی ، چونکە دیارە بە دەسەلاتی باوکی یەوە ستەمی کردوە:

ئەو ناوە پڕشنگدارەیان بەرهەمی ئەوەیە کە لە ماوەی دوو ساڵی فەرمانڕەوایەتی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا لەبەرهەمی دەست پاکی و عەدالەت و دڵسۆزی دا، گەنجەکان بە پارەی دەوڵەت ژنیان هێنا ، قەرزی قەرزاران درایەوە، هەژاری باری کرد، تەنانەت وای لێ هات کەس نەبوو زەکات وەربگرێ، هەتا ئەو شەوەی وەفاتی کرد گورگێك مەڕێکی نەخوارد!!

باس و خواسی ناو خەڵك بەس ئەوەبوو: چەند مزگەوتی نوێ دروست کرا، چەند کەس قورئانی لەبەر کرد، چەند زانا پێگەیشتن، چونکە ووتراوە: (النَّاسُ على دِينِ مُلوكِهِم).

دەی توخوا کار بەدەستانی ئەمڕۆ، ئێوەش بە خزمەت کردنی ئەم میللەتە، بە دابین کردنی ئەمن و ئەمان بۆی، بە دابین کردنی خزمەتگوزاری بۆی، بەڕێز لێگرتنی، بە بوژاندنەوەی باری ئابووری ، بە عەدالەت و دادپەروەری، وەجاخی خۆتان ڕوون بکەنەوە، بیرێك لە ماوەی دەسەلاتەکەتان بکەنەوە، ئەرێ چیتان تێداکردوە ، کەوا میللەت بە گشتی لێ ی سودمەند بووبێ و هەتا هەتایە لە دڵی خەڵکی دا ڕەش نەبێتەوەو ڕەحمەتتان بۆبێ، وە قیامەتیشتان ئاوەدان بێ. یەکەم تاقم و دەستە بن، لەو حەوت تاقم و دەستەیەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: حەوت تاقم و دەستە هەن لەڕۆژی قیامەتدا لە ژێر سێبەری عەرشی خوادان.

کەلەو ڕۆژەدا هیچ سایەو سێبەرێك نیە مرۆڤ پەنای بۆ ببات، سایەو سێبەری خوا نەبێت یەکەم تاقم و دەستە (إمامٌ عادِلٌ). بەلام ئەگەر کاربەدەست وانەبوو. فیرعەونی بوو. ووتی: (ما أُريكُمْ إلا ما أرى) ووتی: (أَلَيْس لِي مُلْكُ مِصْرَ ، وَهٰذِهِ الأنْهارُ تَجْرِي مِنْ تَحْتِي أفَلا تُبْصِروُنَ) ئەگەر کاربەدەست نەمرودی بوو ، ووتی: (أنا أُحي وأُميت) من دەژیەنم و دەمرێنم.

ئەوەی لە خزمەتمانەبێ موچەی نابێ ، ڕێزی نابێ ، قسەی نابیسترێ ، دەبێ بەزیندویی وەکو مردوو بژی.
بەڵێ ئەگەر کاربەدەست تەواوی ماوەی دەسەڵاتەکەی تەنها بۆ ئەوە بەکارهێنا کە بەرژوەندیەکانی خۆی و دەست و پێوەند و خزم و دۆستەکانی خۆی دابین بکات ، هەر چاوی چاوی سەوزی دۆلاری دەبینی ، ئەوەی ماڵێکی هەژار لەیەك ساڵدا دەیخواردو مەصرەفی دەکرد، ئەو لەیەك دەعوەتدا صەرفی دەکرد، لەماوەی دەسەڵاتەکەیدا خێرێکی ئەنجام نەدا کە میللەت لێ ی سودمەند بێ و بوترێ ئەمە جێگا دەستی سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەوە، ئەو باسور بزانێ کە ئەو کار بەدەستە وەجاخ کوێرە، هەتا لە ژیاندایە مەگەر خەڵکی لەترسی ژیانی خۆیان یان بۆ بەرژەوەندی خۆیان، یان ماستاو و چییەکان ، ستایشی بکەن و چەپڵەی بۆ لێبدەن، ئەگینا دوای مردنی نەفرەتی لێ دەکرێ و وەجاخی کوێرە چونکە لە ماوەی ئەو دەسەڵاتەیدا ، بیری لەو پەندە نەکردەوە **کە ووتراوە:** ئەی کورسی و مێزو مۆرو قەڵەمی دەسەڵاتدار (لَوْ دامَ لِغَيْرِكَ ما وَصَلَ إلَيْكَ) ئەگەر ئەو کورسی و مێزە بۆ کەسی تر تا سەر بمایە، ئەوا نەدەگەیشت بە تۆ! دەی دڵنیابە دەبێ ڕۆژێك بێت زوو بێت یان درەنگ بەجێ ی بێڵی.
جا هەرکاربەدەستێ وەجاخ ڕون بێ، لە دوای مردنی خۆشی میللەتەکەی دەحەسێتەوە، وە وولاتێکی ئاوەدان بەجێ دێڵێ، بەڵام کاربەدەستی وەجاخ کوێر، کە بۆ خۆی دەمرێ میللەتەکش لە دوای خۆی بە وەجاخ کوێری بەجێ ی دێڵێ و ولاتێکی وێران و گەلێکی سەرگەردان دوای خۆی بەجێ دێڵێ
سەرکردەی پاك و کار جوان ئەگەر ناحەزەکانی بوختان و درۆشی بۆ هەڵبەستن کەس بڕوایان پێ ناکات ، هەروەکو لە مێژوودا دەخوێنینەوە کە هێرشی پڕ لە قسەی نەشیاو کراوەتە سەر (قەیس کوڕی عاصم) ناسراو بەنەرم ونیانی عەرەب. وەکراوەتە سەر بەرمەکیە ڕێزدارەکان و (قوتەیبەی کوڕی موسلیم) ی سەرکردەی ناودار ، بەڵام ئەو ووتە نابەجێ و پوچانە ، کەس بە ڕاستی نە زانیون و بایەخیان پێ نەدراوە و وەکو بڵقی سەر ئاو نرخێندراون، چونکە کەوتونەتە ناو دەریای

چاکەکان و لەوێ نقوم بوون، بە پێچەوانەشەوە، سەرکردەی ستەم کار و وەجاخ کوێر ، هەرچەندە لەبارەیەوە بنوسرێ و بەشان و باڵیدا هەڵبدرێ و شانامەی بۆ ساز بکرێ ، هەموو کەس دەزانێ درۆیەو لە دڵ دا جێگیر نابێ

**بۆ نموونە:** سەیری مێژوو بکەن، چەند کەس لەسەر (حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفیان ) بە چاکە نوسیوە و بەمەردی مەیدان و شێری زەمان ناویان بردوە، وە چەند کەس ستایشی (ئەبو موسلیمی خۆراسانی) و (الحاكم بأمر الله العبيدى) یان کردوەو پێیان هەڵگوتون ، کەچی بەبێ نرخ و بەهاسەیر کراوە و بەڕاست نەزانراوە، چونکە ئەو مەدح و ستایشە کەوتۆتە ژێر کەڵەك و بەردی دارماوی فێڵ و چەواشەکاری و ستەم و بێ دادی ئەوان ، وە لەم سەردەمەی خۆشماندا بینیمان چی بۆ دیکتاتۆری عێراق گوتراو نوسراو پەخشان و شعری بەسەدان لەسەر چاپ کرا، کەچی کاتێ خوای پەروەردگار گرتی و بەسەرەنجامی ستەمی بێ وێنەی خۆی گەیشت، هەمووی بوو بە بلّقی سەر ئاو و ئەو هەموو مەدحە بوو بەزەم بۆی!

خۆزەگە سەرکردەکان لەم باس و خواسانە دەرس و پەندیان وەربگرتایە ، خۆباشترین پەندو وانە، مێژووی ئەو سەرکردانەیە کە مردون و لە دوای خۆیان کاری جوانیان بەجێ نەهێشتوە و بە وەجاخ کوێری مردون ، تەماشای قسەکانی کۆتایی تەمەنیان بکەن کە چۆن سەیری تەمەنی ڕابردوویان دەکەن و بیردەکەنەوە کە بەو هەموو دەسەڵاتەوە و دەست ڕۆیشتنەوە، نەیانتوانی کارێك بکەن کە لە دڵی میللەتدا جێگای خۆیان بکەنەوە ، بۆیە دان دەنێن بەوەدا کە ئەوەی خەڵکی حەسودیان بە خۆشی ژیانیان دەبرد ، لە واقعیدا ئەمان وانەبون.

**بۆ نموونە:** (ناپلیۆن) لە (سانت هێلینا) دا، دەڵێ: بیرم نایەت شەش ڕۆژ لە ژیانمدا بە بەختەوەری ژیابم!!

خەلیفە(هیشامی کوڕی عەبولمەلیك) یش دەڵێ: ڕۆژانی بەختەوەریم ژماردن هەستم کرد تەنها (١٣) ڕۆژن!!

بەڵێ ژیانێك کە باوەڕداری بەخواو بە قیامەت و کردوەی جوان و سودبەخشی لەگەڵدا نەبێ هیچ نرخ و بەهاو سەنگێکی نیە!

دەسەڵات هەرچەند بەهێزبێت، ڕۆژێك هەر کۆتایی پێ دێت، ئەوەتا (کیسرای فارس) چی لێ هات؟! کیسرایەك کە هەرچی بچوایە بۆلای دەبوایە لە دوری (پانزە) مەترەوە لە خزمەتیا بوەستایە و پەڕۆیەکی سپی بە دەمیەوە بگرتایە، نەوەکو هەناسەی لە دوریشەوە کار لە کیسرا بکات، کەچی تەخت و بەختی هەڵتەکاو بۆ پەند لە مێژوودا ناوی دەبرێ!

خۆ ڕیسوابوون و وەجاخ کوێری (زین العابدین) ی تونس (حوسنی موبارەك) ی میصرو مامۆستاکەیان (صدام حسین) و پێش ئەویش (ڕەزا شای ئێران) لەبەر چاوی هەمومانن.

٤- چوارەم وەجاخ کوێر: دوژمنانی ئیسلام و پێغەمبەری خوان (ﷺ): دڵنیابن ئەی ئیمانداران، ئەی دڵسۆزانی ئەم ئیسلامە، کە دوژمنانی پێغەمبەری خواو پەیامی ئیسلام دوابڕاون وەجاخ کوێرن. ئەمەش بەڵێنی خوایە، پەروەردگار دەفەرموێ:﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلۡأَبۡتَرُ﴾ الکوثر:٣.

(سُبْحانَ اللّٰه)، ئەم وەعدو بەڵێنە بەم هەموو تەئکیدکردنەوە: (إن، کاف خطاب، هو).

بەڵێ ئەم بەڵێنە گەورە لە بچوکترین سورەتی قورئاندایە. کە (٣) ئایەتە. بۆ ئەوەی هەموو منداڵێك لەبەری بێت. ئەگەر لە سورەتە درێژەکاندا بوایە، ئاوا ڕۆژانە نەدەهاتە بەرچاومان.

وە بۆیەش ئەم ئایەتە لەم سورەتە بچکۆلەیەدا کە موژدەی کەوسەری تێدایە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ):، وە باسی دروشمی قوربانی و جەژنی قوربان ونوێژی جەژنی تێدایە. وە موسڵمانان لە دوای فاتحەی ناو نوێژەکانیاندا بەزۆری ئەم سورەتە (سێ) ئایەتیە دەخوێنن. تا خوای گەورە تێمان بگەیەنێ کە ئەم پێغەمبەرە بەڕێزو خاوەن قەدرە. دژایەتی دەکرێ، بەڵام دڵنیابن کە بەتەئکید دوژمنانی ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) وەجاخ کوێرو فەوتاون و وەعدی خوایە ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلۡأَبۡتَرُ﴾الکوثر: ٣.

دەی ئێوە ئەهلی ئیمان خەریکی ئەوەبن کە خۆتان لە پێغەمبەری خوا و ڕێبازو سونەتەکانی و فەرمان و ئەمرەکانی نزیك بکەنەوە، بۆ ئەوەی لە حەوزی کەوسەری، کە خەڵاتی خوایە پیّ ی بەخشیوە ، بەدەستی موبارەکی ئاو بخۆنەوە. ئێوە خەریکی قوربانی سەربڕین بن لە جەژنی قورباندا و لە هەموو کاتێکدا بە ماڵ و سەرو قەڵەم و پلەو پایەتان قوربانی بدەن لە پێناوی ئەم نوری خوایەدا، لە پێناوی گەیاندنی ئەم بەرەکەتی ئاسمانەدا بۆ چارەسەری دەردو مەینەتیەکانی سەر زەوی، ئێوە بەمەوە خەریك بن و دڵنیابن خوای گەورە بۆ خۆی دوژمنانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوابڕاو دەکات و وەجاخ کوێریان دەکات بەوەی کە بەرنامەو وفکریان پوچ دەردەچیّ و ڕۆژێك هەرخۆیان نەفرەت لە ڕابردوی خۆیان دەکەن.

بەڕاستی سورەتی (الکوثر) دەرس و وانەی زۆر گەورەی بۆ ئیمانداران تیّ دان یەکیّ لەوانە گەورەکانی ئەوەیە کە ئێمە لە جیاتی خۆمەشغوڵ کردن بە دەم کوتکردنی دوژمنانی پێغەمبەرەوە (ﷺ)کە خوا خۆی ئەمە دەکات، خەریکی خۆشارەزاکردن و کارپێکردنی ڕێبازو سونەتەکانی پێغەمبەری خوابین، کە بەداخەوە ئەمڕۆ زۆرجار ئەوەندەی خەریکی دەم کوتکردن و ڕیسواکردنی دوژمنانی پێغەمبەرین و نوسینی دەیان کتێبی بۆ تەرخان دەکەین — کە ئەگەر لەسنوری خۆی دا بێت، کارێکی باشە — زۆر کەمتر خەریکی توێژینەوە دەبین لە سیرەی گەوهەرینی (رسول الله) و خۆمان کەمتر بە جێهێنانی سوننەتەکانی دەڕازێنینەوە.

بەڵام خوای گەورە تەرتیبی ئایەتەکانی سورەتی (الکوثر) ی ئاوا کردوە کە خۆمان ئامادە بکەین بۆ هاوڕێیەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر حەوزی کەوسەری، وە پاشان بە گەورە ڕاگرتنی دروشمەکانی ئیسلام، ئەمجا دڵنیابین کە خوای گەورە خۆی دوژمنانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕیسوا دەکات.

سەرنج بدەن یەکەم کەس کە دژایەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد. ئەبولەهەب بوو.لەگەڵ ژنەکەی. خوای گەورە بۆ خۆی بەرگری لە پێغەمبەرەکەی کرد

فەرموی: ﴿ تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ ﴾ المسد: ١-٥.

لەیەك سورەتی بچكۆلەدا،كە (سُبْحانَ اللّٰه) ئەم سورەتەش لە سورەتە بچكۆلەكانە. تاوەكو هەموو منالێ لەبەری بێ و هەموو كەس بزانێ كە دژایەتی كردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تێداچوون و فەوتانە، ئەبولەهەب بە بۆگەنی مردو بەراكێشان فرێیان دایە بیرێكی قوڵەوەو بەردو خۆڵیان بەسەردا كرد، تا بۆ گەنی نەیەتە دەرەوە!!.

وە لەسەردەمی دەسەڵاتی ئیسلامیشدا. لەمەدینە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دژایەتی دەكرا، لەلایەن جولەكەكانەوە هەوڵی تیرۆركردنی درا، بە پێدانی گۆشتی ژەهراوی، بەوەی خەریك بون بەردی بەسەردا بخەنە خوارەوە و بیكوژن.

وە لە لایەن دوو ڕوەكانیشەوە بەدەیان هەڵوێستی دژ دەكراو لە سیرەدا تۆمار كراوە ، سەیری قورئان بكەن، یەكێ ی لە سورەتەكانی قورئان ناوی سورەتی (المنافقون)ە ، كە لەمەدینەدا، لەو پەڕی دەسەڵاتی پێغەمبەردا (ﷺ) دابەزیوە،بۆ پێغەمبەری خوای (ﷺ) باس كردوە كە سەرۆكی دووڕوەكان دەیگوت: ﴿ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ﴾ المنافقون: ٨.

دەیگوت: محمد زەلیلە و من عیزەدار. محمد كۆنە پەرستەو من پێشكەوتو خواز، ئەبێ محمد دەربكرێ لە مدینە، قسەی بایەخی نەمێنێ.

**عبداللە ی كوڕی ئوبەی دەیگوت:** بۆنی كەرەكەم لە محمد خۆشترە (نعوذ باللّٰه).

كەچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە چاویشیدا نەدەدانەوە و ئازاری بیرو ڕایانی لێ زەوت نەدەكردن و كەسی لێ نەكوشتن و تەنانەت كە ئەم سەرۆكی دوڕوانە مرد. لەسەر تەكلیف و داوای عبداللە ی كوڕەكە كوڕێكی زۆر ئیماندار و بە هەڵوێست بوو. زۆر دڵسۆزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) جبەی موبارەكی خۆی دایە تا لەو سەرۆكی دوڕوانەوەی بپێچن. وە نوێژی لەسەر كردو

چوه سەر قەبرەکەشی ، تا قورئان دابەزی و فەرموی: نوێژ لەسەر مونافیقان مەکەو لەسەر قەبریان ڕامەوەستە.

وە لەم چەند ساڵەی ڕابردوشدا دروست کردنی کاریکاتێر لە دانیمارك و نوسینی چەند کتێبێکی قرپۆك و ناوەڕۆك پوچ و پڕ لە درۆو و بوختان بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، کە خوای گەورە هەموویانی ڕیسوا کردن هەر بۆ نموونە: کەسێك بەناوی — مەریوان هەڵبجەیی کتێبێکی لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوسی، بەناوی (سێکس و ژن و شەرع) ، دواتر بەناوی ئەوەی کە هەڕەشەی لێکراوە، چوو بۆ ئەوروپا و لجوئی بەم کتێبە وەرگرت. — کە دیار بوو هەر ئەم ئیشەی بەم کتێبە بوو!!

بەڵام وەعدی خوایە ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلۡأَبۡتَرُ﴾ الكوثر: ٣. موسڵمانان بەرپەچی درۆو بوختانەکانیان دایەوە، بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە: ڕۆژنامەی پێگە — کە کۆمەڵە کەسێك دەری دەکەن هیچ پەیوەندیەکی فکریان بە ئیسلامەوە نیە- لاپەڕەیەکی تەرخان کرد بە ناوی - مەریوان هەڵبجەیی یان مەریوان تەزویر چی؟!) ئینجا باسی تەزویر کردنی ماوەی خزمەتی دائیرەو باسی تەزویرکردنی بڕوانامەدەکات، کە خۆی بڕوانامەی ناوەندی هەیەو کردویەتی بە بڕوانامەی شەشی ئامادەیی!

هەروەها خوای گەورە زیاتر ئەم بێ شەرمەی شەرمەزار و دوابڕاو کرد بەوەی کە: لەبەرنامەیەکی کەناڵی فارسی ئەمریکی (کانال جدید) لە ٢٠٠٨/٨/١٤ دا ووتی: ئەو کتێبەی مەریوان هەڵەبجەیی بەناوی (سێکس و شەرع و ژن) بڵاوی کردۆتەوە لەم ساڵانەی دوایی دا. خۆی نەینوسیوە کابرایەکی فارس بەناوی (سیامەك ستودە) لە ئەمریکا لە (٢٠٠٢) دا نوسیویەتی و بڵاوی کردۆتەوە مەریوان هاتوە تەنها ناوی کتێبەکەی گۆڕیوە کە (سێکس ، ژن ، در تأريخ)ەو ناوی نوسەرەکەشی کردوە

بەناوی خۆی!! بەڵێ دەرکەوت مەریوان تەزویر چیەو دزو خیانەتکارە ، نەك لە دین و میللەتی خۆی ، بەڵکو خیانەتی لە بواری نوسین و بەرهەمی خەڵکیش دا کردوە! پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەندە پاکە،ئەم ناپاکە نەیتوانیوە خۆی چەند بوختانێکی بۆ هەڵبەستێ ، هاتوە بوختانی لە خەڵکی تر دزیوە!!

دڵنیاش بن ئەم هات و هاواری دوژمنانی پێغەمبەرە (ﷺ) هەر دەبێ ، بەڵام سەرەنجام کێ سەرفراز و کێ شەرمەزار دەبێ ، ئەوە مەعلومە ، پاکی و زێرینی خۆر بە فوی دەم ناکوژێتەوە ، بەڵکو تەنها خاوەن دەمەکە ، دەم شلی و سەر ئێشەی بۆ دەمێنێتەوە. خوای گەورە خۆی ئەم بەڵێنەشی داوە: ﴿ يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ ﴾ الصف: ٨

بەڵێ (بِأَفْوَاهِهِمْ) بە قەڵمیان. بەشیعرو پەخشانیان، بە ڕاگەیاندنی بینراو و بیستراوویان بەڵام ئەم نورە هەر زاڵ دەبێ بەسەر هەموو بیرو باوەڕێکی ئاسمانی دەستکاری کراودا. وە بیردۆزەی زەمینی و مرۆیی دژ بە ئیسلامدا).

تەماشاکەن. خوای گەورە دەفەرموێ: (وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ ) خوای گەورە تەنها بۆ خۆی ئەم ئیسلامە دەپارێزێ و بڵاو دەکاتەوە و تەواو دەکات ، ئەوەی ئێمە دەیڵێین تەنها بۆ قیامەتی خۆمانە. ئەگینا چۆن ئەم تیشکی خۆرە پێویستی بەکەس نیە تا لە دوری (٩٣) ملیۆن میلەوە بگاتە زەوی، هەر خوای گەورە خۆی دەیگەیەنێ، ئاوایش ئەم نوری ئیسلامە دەگاتە هەموو کون و قوژبنێکی ئەم سەرزەوی یە.

چاویشتان ڕون و دڵیشتان گەش بێ، کە ئیسلام ڕۆژ بە ڕۆژ لەبەرەو پێشچون دایە، ئێستا لە ئەمریکا زیاتر لە (٧) ملیۆن موسڵمان هەیە ، کە بەپێ ی ئاماری سەرژمێری ئەمریکی (٣٪) ی ڕێژەی دانیشتوانی ئەمریکا پێك دەهێنن.

**لە ڕاپۆرتێکی پێگەی (CNN) دا هاتووە:** کە لەماوەی (١٢) ساڵدا (١٢٠٠) مزگەوت لە ئەمریکا دا دروست کراوە ، واتە ساڵی (١٠٠) مزگەوت.

بەڵێ ئیسلام ئاینی فکرەتە بۆیە ئاوا لە هەموو لایەکەوە خەڵکی دەستە دەستە

دێن و بەرەو لای قورئان دەفەرموێ: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ الروم: ٣٠.

وە بەدڵنیایەوە ئیسلام هەموی خێرەو بەرەکەتە، چونکە خێرو خۆشی بۆ تاك و بۆ کۆمەڵ و دەوڵەت پێ یە ، ئەوەتا باسمان کرد دەفەرموێ:

زانا نابێ ئەو فەزڵ و گەورەیی عیلمە بشارێتەوەو بە فیڕۆی بدات و ڕۆڵەکانی میللەتی لێ بێ بەش بکات.

نابێ کاربەدەست هەر بۆ خۆی بژی و دەسەڵاتەکەی بکاتە وەسیلەی خۆ دەوڵەمەندکردن، بەڵکو دەبێ کاربەدەست بەدادگەری و ڕەوشتی جوانی لە ناو دڵی میللەتدا بژی، نەك لە کۆشکی ڕازاوەدا.

**وە ئیسلامە دەفەرموێ:** دەوڵەمەند نابێ ئەو سەروەت و سامانەی بەهی خۆی بزانێ بە تەنها و بەڵکو دەبێ میللەت سودی لێببینێ. وە ئیسلام دەڵێ، باخەڵکی حەق بێن بن و چاو بەستیان لێنەکرێ و رەشیان لێنەکرێ بە سپی و چلکاویان لێ نەکرێ بە ئاوی زوڵاڵ.

ئایا لە مە جواتر هەیە بۆ ژیانی دونیاو پاشان قیامەتێکی ئاوەدان و بەهەشتی بەرین؟! ﴿ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ ﴾ یونس: ٣٢

خوای گەورە لە دینەکەی خۆی باشتر تێمان بگەیەنێ و ڕاگیراوو دامەزارومان بکات لەسەر ڕاستە ڕێگای خۆی

﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾

ٱللَّهُمَّ آمِينَ

# سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز.

٢- لا تحزن ، محمد متولي الشعراوي ، ص,١٢٣

٣- موسوعة الأعجاز القرآني ، د. نادية طيارة ، ص,٣٦٩

٤- قوتابیاتی زانیاریە شەرعیەکان ، م. عەلی باپیر ، ص,٣٦٩

٥- پەیامی مینبەر ، م. عومەر نيظامي ، ل,١١٦

٦- أحداث النهاية ونهاية العالم ، محمد حسان ، ص,٨٨

٧- خەمبار مەبە ، د.عائض القرني، وەرگێرانی (أحمد عبدالله وەرتێ) ، ص,٢١٥

٨- ژیانەوەو ، ئەندازیار عثمان ، ب٦ ، ل٩٠.

٩- بەرەو ئیسلام ، بانگخوازی : ئەندازیار عثمان محمد رشید، ل٩١، ل٥، ل٣.

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجمعين.

**ئيمانداران:** خالّی بنەڕەتی بۆ بونی تەکلیف لەسەر یەکێك ئەوەیە کە خاوەنی بیرو هۆش و هزر (عەقلّ) ێکی تەواوبیّ، واتە: ئەو مرۆڤە کەسێکی عاقلّ بیّ. هەروەکو لە کتێبە شەرعیەکاندا ڕوون کراوەتەوە کە نوێژ و ڕۆژوو حەج لەسەر شێت واجب نیە.

تاوان کاتیّ لەسەر مرۆڤ دەنوسریّ کە (عاقلّ) بێت چونکە مرۆڤ بە عەقلّ چاکەو خراپە لەیەکتر جیادەکاتەوە ، بەلاّم مرۆڤ زۆر جار ئەم عەقلّەی هەیەتی دادی نادا و پێویستی بەکەسانی ترو عەقلّی کەسانی ترە. لەبەرئەوەی مرۆڤ توشی ئەم شتانە دەبێت:

١- لەبیر چونەوە ، وەکو باوکە ئادەم – فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْماً.

٢- خۆیەزل زانین.

٣- عوجب و کەیف بەخۆهاتن.

٤- عەقلّی مرۆڤ و زانستی مرۆڤ دەرك بە هەموو شتیّ ناکات ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِى عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ یوسف: ٧٦. هەر بۆیە مرۆڤ بە عەقلانیەت و بیری مرۆیی ناتوانیّ تەواوی ژیانی بەڕێوە ببات و پێویستی بە پەیامی ئاسمانی هەیە. کە ئیسلامە، کە سەرچاوەکەی قورئان وسوننەتە.وە ئەم قورئان و سوننەتە، بەو ڕونی و ئاشکرایی یە هێشتا پێویستی بەوە هەیە ، کە مرۆڤەکان عەقلّەکانیان. ژیریەکانیان بخەنە پالّ یەك بۆ باشتر لیّ تێگەیشتنی ، ئەویش بە دوو جۆر:

**یەکەم:** ڕاویژکردن ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾ الشوری: ٣٨

خۆ مەعلومە کە هیچ کەس ژیرتر نەبوە لە پێغەمبەر (ﷺ) وە مەعصوم بوە لەهەلّەو تاوان. کەچی خوای گەورە فەرمان بە پێغەمبەر (ﷺ) دەکات کە ڕاوێژ

بە صەحابەکان بکات، ئەم ئایەتە لەو کاتەدا هاتە خوارەوە کە موسڵمانان بە هۆی ڕاوێژەوە، کە زۆرینە بڕیاری دەرچونیاندا بۆ دەرەوەی مەدینە لە جەنگی ئوحود دا. کەچی سەرەنجامەکەی شکستی موسڵمانان بوو. شەهیدبوونی حەمزەو دەیان شێرە پیاوی ئیسلام بوو.

بریندار‌بونی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو کەچی لەم کاتەدا خوای گەورە فەرموی: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ﴾ آل عمران: ١٥٩.

بۆ ئەوەی ساردنەبنەوە لە ڕاویژکردن بەهۆی ئەوەی لە ئەنجامی ڕاویژکردندا توشی زەرەر و شکست بوون. نەخێر بەردەوام ئەی محمد (ﷺ) بۆ هەموو کاروبارێکی دونیایی ڕاوێژیان پێ بکە.

**کەواتە:** مرۆڤ هەرچەند ژیربێ، زانابێ هێشتا پێویستی بەوە هەیە کە ڕاوێژ بەکەسانی تر بکات.

**ووتراوە:** ( إِذا شاوَرْتَ العاقِلَ كانَ عَقْلُهُ لَكَ). ئەگەر ڕاوێژت بەکەسی ژیرو عاقڵ کرد ، ئەوە عەقڵی ئەویش بۆ تۆ دەبێت.

شاعیر جوانی فەرمووە کە دەڵێ:

شــــاوِرْ سواكَ إذا نــــابَتْكَ نائِبَةٌ يَوْماً وَإنْ كُنْتَ مِنْ أَهْــلِ المَشوراتِ

فَالْعَيْنُ تَلْقَى كِفاحاً مَنْ نَأى وَدَنَى .......وَلا ترى نَفْسَها إلّا بِمِــــــــــرْآةِ.

بەڵێ هەرچەندە بۆ خۆت لەو کەسانە بوی ، کە خەڵکی دەهاتن بۆ لات و پرس و ڕاوێژیان پێدەکردی بەڵام ئەمە وات لێ نەکات، کاتێ کە توشی تەنگ و چەڵەمەیەکی ژیان بوی ئیتر بڵێ پێویستیم بە ڕاوێژی کەس نیە، چونکە من خۆم موشکیلەو گرفتی خەڵکی حەل دەکەم. نەخێر، چونکە تۆ وردبەوە چاو ئەو دونیە گەورەیە دەبینی ، کەچی لە ئاوێنەدا نەبێ ناتوانێ خۆی ببینێ!!.

جا ئەگەر کەسێك ڕاوێژی بەچوار دەوری خۆی نەکردو توشی هەڵە بوو ، ئەو پێویستیە کەسانی دەوروبەری ئاگاداری بکەنەوە ، بە (ئامۆژگاری کردن) کە ئەمە

بابەتی ووتارەکەمانە. کە نەصیحەت و ئامۆژگاری یەکەم کاری پێغەمبەرانە.

هەروەك حەزرەتی نوح بەگەلەکەی فەرمووی:﴿ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمْ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ الأعراف: ٦٢

واتە: من هاتوم ڕاسپاردەی پەیامەکانی پەروەردگارمتان پێ ڕابگەیەنم، وە ئامۆژگاری خێریشتان بکەم، وە سەبارەت بە زاتی خوا من شتی وا دەزانم ئێوە نایزانن.

هود پێغەمبەریش بەگەلەکەی فەرمووی:﴿ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴾ الأعراف: ٦٨

وە هەروەها حەزرەتی (صالح) یش بەگەلەکەی دەفەرموێ: ﴿ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحْتُ لَكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴾ الأعراف: ٧٩.

واتە: من ئامۆژگاری خومم کرد، بەڵام مەخابن ئێوە ئامۆژگاری کارتان خۆش ناوێت. وە حەزرەتی شوعەیبیش هەر بەهەمان شێوەی فەرموە ، وەکو لە سورەتی (الأعراف: ئایەتی:٩٣) دا هاتووە. وە سەرداری پێغەمبەرانیش (ﷺ) باشترین مامۆستای ئامۆژگاری کردن بوە. کە ئێمە وەکو وەفاداریەك بۆ ئەو دڵسۆز و ڕابەرەمان، **هەموو جارێ دەڵێین:** (نَشْهَدُ أَنَّهُ قَدْ بَلَغَ الرِّسالَةَ ، وَأَدَّ الأمانَةَ ، وَنَصَحَ الأُمَّةَ)

وەیەکێ لە مافەکانی موسڵمان لەسەر مویسڵمان ئەوەیە:

(**وإذا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْ لَهُ**) رَواهُ مُسْلِم (٢١٦٢). کاتێ داوای ئامۆژگاری لێکردی زۆر دڵسۆزانە ئامۆژگاری بکەی.

**ئیمانداران:** ئامۆژگاری چەند جۆرێکی هەیە:

**یەکەم: نەصیحەت و ئامۆژگاری تاك بۆ تاك.**

**بۆ نموونە:** کەسێك پیلانی کوشتن و لە ناوبردنی یان گرتن و ئازاردانی دراو هیچ تاوانێکیشی نەبوو. کە شایانی گرتن بێ، یان کوشتن بێ تۆش ئاگات لێ بوو.

واجبە ئامۆژگاری پیلان بۆ دانراوە کە بکەی و واجبە ئەویش بەقسەت بکات. هەروەکو لە قورئاندا خوای گەورە باسی ئەوکاتەمان بۆ دەکات کە لەکۆشکی فیرعەون دا پیلانی کوشتنی حەزرەتی (موسا) دادەنرێ و یەکێ لە دۆستە دڵسۆزەکانی حەزرەتی موسا ئاگای لێ دەبێ و بە حوکمی ئەوەی لە کۆشکی فیرعەوندایە و خزمەت دەکات ، گوێبیستی ئەم پیلانە ژەهراویە لەناویەرە بۆ کەسێکی پاك و بێ تاوانی وەکو حەزرەتی (موسا) دەبێت ، بەدزی یەوە دێت بۆ لای — لەم سەردەمەدا دەتوانی لە ڕێگەی مۆبایل یان نامەیەکەوە ، ئەوکارە بکەی بەڵێ دێت بۆ لای حەزرەتی موسا و پێ ی دەڵێ ﴿قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلۡمَلَأَ يَأۡتَمِرُونَ بِكَ لِيَقۡتُلُوكَ فَٱخۡرُجۡ إِنِّي لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ﴾ القصص: ٢٠.

ئەی موسا لە کۆشکی فیرعەوندا پیلانی کوشتنت دارێژراوە. تکات لێ دەکەم هەستە و ئێرە بەجێ بهێڵە، چونکە بە ڕاستی من دڵسۆزی تۆم و ئەم ئامۆژگارییەت لە ڕووی دڵسۆزیەوە پێ دەڵێم.

حەزرەتی (موسا)ش بەقسەی کرد ﴿فَخَرَجَ مِنۡهَا خَآئِفٗا يَتَرَقَّبُۖ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ القصص: ٢٠ — ٢١.

بەڵێ حەزرەتی موسا بەترس و حەزەرەوە ماڵ و وولاتی خۆی بەجێ هێشت و لە خوای پەروەردگار پاڕایەوە کە لە ستەم کاران ڕزگاری بکات.

**٢- نەصیحەت و ئامۆژگاری گەل بۆ کاربەدەستان:**

کە ئەم لایەنە ئەوەندە گرنگە کە پێویستە سەرکردە خۆی داوای ئامۆژگاری لە میللەت بکات کە هاوکاری بن و ڕاگۆڕینەوەی لەگەڵدا بکەن. لەچەند جێگای

سیرەدا هاتوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (أشيروا علي أيها الناسُ) ئەی خەڵکینە ڕاوێژم بۆ بکەن و ڕەئی خۆتان دەربڕن.
تەنانەت ئەگەر لەسەر ڕێگاو بانیش (لە کۆڕو کۆبونەوەیەك) هاووڵاتیەك سەرکردەی وەستاندو ئامۆژگاری کرد دەبێ سەرکردە زۆر بە مەمنونیەوە گۆی ی بۆ شل بکات ، ئەگەر پیرەژنەکەیش بێت، کە تەمەنی جوانی خۆی لە خزمەتی ووڵاتەکەدا بەسەربردوە و ئاوەدانی کردوەو ڕۆڵەی پێشکەش کردوە.
**سەرنجی ئەم بەسەرهاتە شیرینە بدەن کە زانایانی ئیسلام وەکو:**
(إبن الأثير، و قورطبي) وغەیری ئەوانیش گێڕاویانەتەوە و فەرمویانە: : ڕۆژێکیان خەلیفە عومەری کوڕی خەطاب – لە مزگەوتەوە دەڕۆیشتەوە بەرەو ماڵەوە و بەتەمای کارێك بوو ئەنجامی بدات و کۆمەڵێك لە صەحابە لە خزمەتیدا بوون، لە ڕێگادا توشی ئافرەتێکی بەتەمەن بوو. سەلامی لێ کردو ئافرەتەکەش وەڵامی سەلامەکەی دایەوەو پاشان فەرموی: ئای عومەر.
لە بیرمە ڕۆژێك بوو لە بازاڕی (عوکاز) دا – بەرخۆلەو کاریلەت پێش خۆت دابوو خەڵکی پێیان دەوتی: (عومەیر) عومەرۆکە، دوایی بویت بە پیاو و موسڵمان بویت و بویتە (عومەر) پاشان ڕۆژگار هات و ڕۆیشت و بویت بە (ئەمیری ئیمانداران).
دەی ئاگات لە خۆت بێ و لە خوا بترسە و بزانە هەرکەسێ ترسی قیامەت و لێپرسینەوەی هەبێت، بەردەوام ئامادە دەبێت بۆ بەردەم لێپرسینەوەی خوا، وە هەر کەسێ ترسی مردنی هەبێت ، ترسی زایە بونی هەیە.جا ئاگات لە خۆت بێ و لە میللەت غافڵ نەبی، با ڕوسوری بەردەمی خوای گەورە بیت.
**یەکێ لەو پیاوانەی کە لە خزمەت حەزرەتی عومەردابوو ووتی:**
ئەی ئەمیری ئیمانداران، ئەو هەموو خەڵکەت لەم سەر ڕێگایە وەستاندوە لەبەر قسەی پیرە ژنێك کە شتێکت پێ دەڵێ، خۆت باشتری دەزانی، دەی بابڕۆین!

حەزرەتی عومەر فەرموی: هاوار بۆ تۆ، ئەزانی ئەوەکێ یە؟ ئەوە ئەو ژنەیە کە خوای گەورە – گۆێ ی لە قسەی گرت لەسەر و حەوت ئاسمانەوە، ئەمە خەولەی کچی ثەعلەبەیە. سوێند بە خوا ئەگەر ئەم پیرە ژنە، دڵسۆزە تاوەکو شەو بوەستایە، لەگەڵی دەوەستام و جێم نەدەهێشت، مەگەر بڕۆشتمایە بۆ نوێژ و دوای نوێژەکە دەگەڕامەوە بۆ لای و گوێم بۆ ئامۆژگاریە بەنرخەکانی دەگرت.

**بەڵێ:** ئەگەر میللەت ئامۆژگاری سەرکردە نەکات ، ئەوە گەلێکی مردوو کۆیلەیە ، وە ئەگەر سەرکردەش قبوڵی نەبێ دەبێ بەدیکتاتۆر ، وەکو فیرعەون و نەمرود و شاگردەکانیان تا قیامەت. جارێکیان کابرایەك بە حەزرەتی عومەری کوڕی خەطابی فەرموو: إتّقِ الله.

خەڵکەکە لێ ی هاتنە دەنگ و ووتیان: ئەوە بە ئەمیری ئیمانداران دەڵێ ی لە خوا بترسە؟! حەزرەتی عومەر فەرموی: ( دَعُوهُ فَلْيَقُلْها، لا خَيْرَ فيكُم إذا لَمْ تَقُولُوها ، وَلا خَيْرَ فِينا إنْ لَمْ نَسْمَعْها).

واتە: وازی لێ بێنن ، با بیڵێ ، با ئامۆژگاریم بکات ، بە ڕاستی خێر لە ئێوەی میللەتدا نیە ئەگەر ئامۆژگاریمان نەکەن ، وە خێریش لە ئێمەی کاربەدەستاندا نیە ، ئەگەر گوێتان لێ نەگرین و ئامۆژگاریەکانتان نەبیستین.

**٣- ئامۆژگاری و نەصیحەتی گەل بۆ سەرمایەداران:**

نەك سەرمایەدار بە ئارەزوی خۆی بەوناوی بازاڕی ئازادەوە میللەتی هەژار بچەوسێنێنەوە ، خوای گەورە باسی قارون دەگێڕێتەوە، کە کاتێ شانازی و فەخری دەکرد بەماڵ و سامانەکەیەوە، کاتێ دڵسۆزانی گەل و وولات و بواری ئابووری ئامۆژگاریان کردو پێیان ووت: ﴿ إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ القصص: ٧٦ – ٧٧.

واتە: ئەی قارون کەشخە مەکەو لە خۆت بایی مەبە بەم سامانە ، چونکە بێگومان خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە کەشخە دەکەن بەسەروەت و سامانیانەوە و لە خۆیان بایی دەبن ، هەوڵبدە بەو ماڵ و سامانەی کە خوا پێ ی بە خشیوی ، ماڵی قیامەت و بەهەشتی بەرین بکڕەو بەشی خۆشت لە دنیادا بە حەڵاڵی فەرامۆش مەکە، چاکە لەگەڵ بەندەکانی خوادا بکە ، هەروەك خوا چاکەی

هێناوەتەڕێت ، نەکەیت هەوڵی فەسادو گوناهو تاوان بدەی لە زەوی دا ، چونکە بە ڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆشناوێت کە تۆوی خراپە دەچێنن. ئای چ ئامۆژگارییەکی بەنرخ و بەهێزیان پێشکەش کرد. کە پێویستە بەردەوام ئەم ئامۆژگاریانە بدرێ بە گوێ ی سەررمایەدارەکاندا ، خۆزگە ئەوانیش وەری بگرن و پێ ی بە ئاگابێنەوە و کاری پێ بکەن، وەکو قارون لە وەڵامی ئامۆژگاریەکەدا نەڵێن:﴿ قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِيٓ ﴾ القصص: ٧٨

واتە: قارون ووتی: بێگومان ئەم ماڵو دارابیەم هەر بەهۆی زانست و زانیاری نەخشەی خۆمەوە پێم دراوە!! چونکە هەرکەس وەکو قارون وەڵام بداتەوە، سەرنجامی (ففسخنا به وبداره الأرض) بەشی دەبێ و هەر ئەوەش بەسی دەبێ

**مامۆستا (قانع) ی شاعیر ئامۆژگاری سەرمایەداران دەکات و دەفەرموێ:**

هەژار ڕەببی نەجاتت بێ ، لەئەم حاڵەی پەرێشانت.

غەنی تۆش بێرە سەربـــاری سەخا دەستم بەدامانت.

خوا ئەو چاوە هەر ڕون کا ، تەماشای حاڵی بێ دەس کا.

ڕەزیل ، ڕەبی بەتیری چـاوی خۆت بێ نووکی موژگانت!

**٤- ئامۆژگاری و نەصیحەتی سەرکردە بۆ گەلەکەی:** ئەویش بەوەی کە نەك خۆیان لێ بکات بە مامۆستا. بەڵکو بەوە ئامۆژگاریان بکات کە شتیان لێ نەشارێتەوە، بارودۆخی نێو دەوڵەتی، وەزعی سیاسی ، باری ئابووری ووڵات، توانا و دارایی حکومەت ، بەرهەم و خەرجیەکانی ووڵات هەمووی بەشەفافیەت ڕابگەیەنێ.

خوای گەورە لە قورئاندا مەدحی ئەو مێرولەیە دەکات کە دڵسۆزی شارە مێرولەکەی بوو.لەو مەترسیە ئاگاداری کردنەوە کە بەرەو ڕووی هاووڵاتیانی دێت ، لە قورئاندا تۆماری دەکات بۆ ئەوەی سەرکردەکان چاوی لێ بکەن و ئاوا دڵسۆزی گەلەکەیان بن، ئەینا قورئان چیرۆك و بەسەرهاتی بەر ئاگردان نیە، بەڵکو بە ئاگاهێنانەوەیە بۆ سەرکردەکان کە ئاوا دڵسۆزی میللەتەکەیان بن.

**مامۆستا (قانع) دەفەرموێ:**

براکەم باوو باپیرت هەموو مردن ئەتۆش دەمری.

کەتۆش مردی بە تۆچی زێڕوو زێو و دوڕو مەرجانت

تەماشای حاڵەتی خۆت کە ، ئەبێ حاڵت چ ناخۆش بێ

لەکاتی غەر غەرەی سینەت ،کە ڕۆحت دێتە لێوانت.

**ئیمانداران:** خاڵێکی گرنگ کە لە ئامۆژگاری کردنی بەرامبەردا ڕەچاو دەکرێ ئەوەیە کە: شێوازی ئامۆژگاری تێدا ڕەچاو بکرێ و لەو بنەمایانە لانەدرێ.

١- ئەمینی و دڵسۆزی لە ئامۆژگاری کردندا، پێغەمبەران شیعاریان ئەمەبوو. (أنا لكم ناصح أمين). کەواتە (ئەمینی) کە بەرامبەرەکەت قەناعەت بکات کە تۆ فێڵی لێ ناکەی و بەڕاستی دڵسۆزی ئەوی، خاڵێکی گرنگە کەوا لە ئامۆژگاری کراو دەکات بە دڵ گوێ بگرێ لە ئامۆژگاری کار.

٢- دەبێ بە ئیخلاص و دڵسۆزی و لەبەرخاتری خوابێ ، نەك بۆ ئەوەت بێ کە خۆت دەرخەی و ڕایبگەیەنی کە تۆ لەو زانا تری و ژیر تری.

٣- بە نەرم و نیانی و دور لە توڕەبوون و شعور و هەست بریندار کردن بێت. جارێکیان خواناسێك چوو بۆ لای کار بەدەستێك و پێ ی ووت، هاتووە ئامۆژگاریت بکەم، بەڵام قسەم ڕەقەو دەبێ تەحەمولی بکەی، کار بەدەستەکە ووتی: ناتوانم قسەی زبرو ڕەق قبوڵ بکەم چونکە خوا بە حەزرەتی موسا و هارون دەفەرموێ:﴿ اذْهَبَا إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَىٰ فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴾ طه: ٤٣-٤٤ .

جا نەتۆ لە موسا و هارون ڕێزدارتری ، نەمنیش لە فیرعەون خراپترم. بەڵێ هەر ئامۆژگایەك بە زمانێکی نەرم نەوترێ کاریگەری دروست ناکات لەسەر بەرامبەر.

٤- لەناو خەڵكا پێ ی مەڵێ ، بەڵكو لە کەشێكی هێمن و گونجاودا ، کە لەباری دەرونی ئامادەی گوێ گرتن بێ ، بە تەنها لەگەڵی دانیشەو پێشەکیەکی کورت بۆ قسەکانت دابنێ و لایەنە ئیجابی و چاکەکانی باس بکەو پاشان لەڕوی دڵسۆزیەوە بە هێمنی کەم و کوڕیەکەی بخەرە بەرچاو. دڵنیابە ئەویش ئامۆژگاریەکەت لێ وەردەگرێ و گۆڕانکاری لە هەڵسوکەوتیدا دەکات بەڵام ئەگەر لەناو کۆمەڵێك خەڵکدا ، ڕوی تێ بکەی و ئامۆژگاری بکەی ، ڕەنگە تەحەمولی نەکات و وابزانێ بۆ شکاندنی وا دەکات.

**ووتراوە:** (مَنْ وَعَظَ أَخَاهُ فيما بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ فَهِيَ نَصيحَةٌ ، وَمَنْ وَعَظَهُ عَلى رؤوسِ النَّاسِ فَإِنَّما وَبَخَهُ). بەڵێ زۆر گرنگە نەصیحەت لەگەڵ فەضیحە ت جیابێ!

٥- ئەگەر کەسێك هەڵەی کرد لە قسەکردندا ، هەموو قسەکانی ڕەفزمەکە، بەڵکو لە پێشدا قسە جوان و حەقەکانی باس بکەو دەست خۆشی لێ بکە ، ئەمجا هەڵەکەی بۆ ڕاست بکەوە. زانای گەورە (إبن العربي المالكي) لە کتێبەکەیدا (أحكام القرآن) نوسیویەتی و دەفەرموێ محمدی کوڕی قاسمی عوسمانی هەواڵی پێدام و بۆی گێڕامەوە کە: جارێکیان چۆتە شاری (فوسطاط)، فەرموی، چومە مزگەوتی شارەکەو لەو کاتەدا ( شێخ ئەبی فەزڵی جەوهەری) ئامۆژگاری موسڵمانانی ناو مزگەوتەکەی دەکردو منیش دانیشتم گوێم بۆ ووتەکانی گرت، لە کاتی ئامۆژگاریەکەیدا (موعظە) کەدا ، مامۆستا فەرمووی: (إنَّ النبي (ﷺ) طلق وظاهر وآلى).

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرسێ بابەتی (طلاق و ظیهارو ئیلاء) ی لەگەڵ خێزانەکانی دا توش بوە لە ژیانی هاوسەریدا.

(سُبحانَ الله) هیچ سەرکردەیەك نیە لە مێژوودا و ناشبێ کە ئاوا نهێنی ژیانی هاوسەریشی ئاشکرابێ، بەڵێ ، لەناو ماڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ

خێزانەکانی وەکو سروشتی هەر ژنێك داوای خۆشگوزەرانی دونیاییان دەکرد لە ماڵی باش و خانووی جوان و تازەو خۆراکی خۆش، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: دەمەوێت وەکو هەژارانی ئومەتەکەم بژیم، جا ئەگەر ڕازین بەم ژیانە سادەو ساکارەی ئێستامان ، ئەوا بەیەکەوە دەژین و خوای گەورە لە قیامەتدا بە بەهەشتی بەرین پاداشتان دەداتەوە ، خۆ ئەگەر ڕازیش نین و ژیانی خۆشی دونیا هەڵدەبژێرن ، ئەوە بە جوانترین شێوە لێتان جیا دەبمەوە و تەڵاقتان دەدەم: ئەوەبوو، دایکی ئیمانداران، خێزانە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) خواو پێغەمبەرەکەی و ژیانی نەبڕاوەی قیامەتیان هەڵبژاردو کێشەکە کۆتایی هات

وە هەروەها (ئیلاء) یش لەناو ماڵی پێغەمبەردا (ﷺ) ڕوی داوە ، ئەوەبوو کاتی کە خێزانەکانی دەمە بۆڵەیان کردو ناکۆکی دروست بوو (ئیلاء) ی لەگەڵ کردن ، کە ئەوەیە پیاو سوێند بخوات کە نەچێتە لای خێزانەکانی، کە قورئان ئەمەی باس کردوەو کاتەکەی دیاری کردوە، ئەمەش لە ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) ڕوی داوە.

بەڵام: (ظهار) کە ئەوەیە ، پیاوێك بە ژنەکەی بڵێ، تۆ وەکو پشتی دایکم وای بۆ من، ئەوە هەرگیز بە دەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەهاتووە.

**جا (محمد کوڕی قاسم) دەفەرموێ:** کە مامۆستا کە ئەم ووتارەی خوێندەوە و ئەم هەڵە گەورەی کرد، هیچ قسەم نەکرد، هەتا ووتارەکەی تەواو بوو، کاتێ دەوری چۆڵ بوو، من مامەوە، فەرمووی: تۆ خەڵکی ئێرە نیت؟! ووتم: نەخێر غەریبەم. هاتوم لە زانست و زانیاری جەنابتان بەهرەمەندبم ، ئەویش زۆر بخێر هاتنی کردم و فەرمووی لێکردم کە لەگەڵی بڕۆمە ماڵەوە. لە خزمەتیا چومەوە بۆ ماڵەوە — مەبەستم نان خواردن و پشوو نەبوو. بەڵکو تەنها مەبەستم ئەوەبوو کە لەماڵەوە بەتەنها قسەی لەگەڵ بکەم و کەس ئاگای لێ نەبێت کە ئەم هەڵەی بۆ ڕاست دەکەمەوە.

بەڵێ لە خزمەتیا دانیشتم و عەرزم کرد، جەنابی مامۆستا من لە مزگەوت لە وانەی بەڕێزتدا دانیشتم و بەڕاستی سودم لەو ووتە گەوهەرینانەت وەرگرت ، خوای

گەورە فەهم و زانستت زیاد بکات، بەڵام لەو کاتی قسەکردندا — کە ڕەنگە لە زمان دەرچون بوبێت ئەینا جەنابت لەوە شارەزاتری ئاگات لەو باسە نەبێت ، فەرموتان کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) (تەلاق و ئیلاء و ظهار) لە ژیانی خێزانی دا ڕووی داوە. بەڵێ ڕاستت فەرموو کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەڵاق و ئیلاء لێ ڕوودواوە.

بەڵام بۆ (ظهار) ئەمەیان نەبوە. وە دروستیش نیە بوبێ، چونکە خوای گەورە کە باسی (ظهار) دەکات دەفەرموێ: ﴿مُنكَرًا مِّنَ ٱلْقَوْلِ وَزُورًا﴾المجادلة: ٢.

واتە: ئەوانەی بە ژنەکانیان دەڵێن تۆ لە جێگەی دایکمیت. ئەوانە قسەیەکی نابەجێ دەکەن و بوختانێکی نا پەسەند دەڵێن.. دەی مامۆستا گیان ، ئەمە دورە لە پێغەمبەری خواوە کە قسەی نابەجێ و بوختان بێت بەدەمیدا!!

**سەرنجی ئەدەبی ئەم ئامۆژگاری کارە بدەن** ، چۆن لە پێشدا باسی جوانیەکانی کرد، باسی بە پێزی ووتارەکەو جوانی شی کردنەوەی تەڵاق و ئیلاو کرد.

ئەمجا بە بەڵگەی قورئانی بە مامۆستای ووت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ظهاری نەکردوە لە ژیانی خێزانی دا. بەڵێ دەفەرموێ: کە ئەوەم ووت، مامۆستاکەم باوەشی پێدا کردم و سەری ماچ کردم و پیێ ی ووتم: من هەر ئێستا تۆبەم کرد لەو هەڵەیەی کە وتومە و پێغەمبەری خوا (ﷺ) لیێ ی دورە، وە خوای گەورەش بە جوانترین و باشترین پاداشت، ئەجرو پاداشتت بداتەوە ئەی باشترین مامۆستا و ئامۆژگاری کار!! بەڵێ بۆ ڕۆژی دووەم کاتێ مامۆستا چوە سەرمینبەر من هێشتا لە دەرەوەی مزگەوت بوم.

کاتێ کەوتاری دەخوێندەوە، بە هێواشی چومە ژورەوە و خەریك بوو دابنیشم. چاوی لێم بوو بە تەواوی دەنگی خۆی بانگی کردو فەرموی: یا خوا بەخێر بیێ ی مامۆستاکەم.ڕێگای مامۆستاکەم بکەن بابێتە پێشەوە! خەڵکی ناو مزگەوتەکە هەموو ئاوڕیان دایەوەو هەموو چاویان لەمن بڕی بوو.

هەموو لەبەرم هەستان و گەیاندیانمە ڕیزی پێشەوە ، دەفەرموێ: منیش لە شەرمان هەموو لاشەم عەرەقی دەردا بوو. نەم دەزانی چۆن دانیشم ماموستا لەسەر مینبەرەکەوە ڕوی کردە خەڵکەکە و فەرموی: من ماموستای ئێوەم، ئەو بەڕێزەش ماموستای منە، دوێنێ کەوتارم بۆ ئێوە خوێندەوە، هەڵەیەکی گەورەم کرد کەس لە ئێوە هەستی پێ نەکردو قسەی نەکرد. دوای چۆڵ بونی مزگەوت ئەم پیاوە بەڕێزە بەوپەڕی ئەدەبەوە لەگەڵم هاتە ماڵەوە و بە جوانترین شێوە هەڵەکەمی نیشاندام.

(ئیتر تەواوی بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە) وە خەڵکینە بە شاهید بن، من هەردوێنێ کە بەهەڵەی خۆمم زانی ، تۆبەم کردو داوای لێبوردنم لە خوای گەورە کرد وە ئەمڕۆش لەبەردەمی ئێوەدا جارێکی تر تەوبە دەکەم و داوای لێبوردن لە خوای گەورە دەکەم. ئەوەی لێرەیە ئەوە زانیتان کە چۆن هەڵەیەکم کردووە ڕاستیەکەی تێگەیشتن ئەوەشی لێرە نیە بابەو کەسانە بڵێ کە دوێنێ ئەم قسەی منیان بیستوە ئەمڕۆ لێرەنین، وە خوای گەورە پاداشتی بە خێری ئەم ماموستا دڵسۆزەشم بداتەوە. ئیتر دەستی کرد بە دوعای خێر بۆ من ، هەموو خەڵکەکەش ئامین یان دەکرد!.

جا شێخی (ابنُ العَرَبي) لەسەر ئەم باسە لێدوانێك دەنوسێ و دەفەرموێ: سەرنج بدەن بۆ جوان تێگەیشتن لەم دینە، کە چۆن ئامۆژگاری کار بە جوانترین شێوە هەڵەی بەرامبەرەکەی ڕاست کردەوە، وە لەوەش جواترو مەردانەتر، هەڵوێستی ئەو عالمە گەورە ناودرایە ، کاتێ ڕاستی بۆ دەرکەوت، چۆن لەبەر چاوی ئەو هەموو جەماوەرەی کە وایان دەزانی کەس لە ماموستاکەیان زاناتر نیە.

دانی نا بە گەورەیی و زانایی ئەو کەسەدا کە هەڵەیەکی بۆ ڕاست کرد بۆوە، وە ووتی ئەوە ماموستای منە، هەرچەندە کەسێکی غەریبی گومناوی نەناسراوبوو، کەس نەیدەناسی کێ یەو لەکوێ هاتوە! خۆ دەیتوانی بڵێ، دوێنێ ووشەیەکم لەدەم دەرچوو، یان کە چومە ماڵەوە ڕاستیم بیرهاتەوە، ئاگاداربن. نەخێر بەڵکو بە

چاکترین شێوە ئامۆژگاریەکەی وەرگرت و بەویژدانەوە مافی ئەو ئامۆژگاری کارەی بەرز نرخاند. دەی با ئێمەش بۆ ئەمڕۆی خۆمان چاویان لێ بکەین.
٥- هەندێ جار ئامۆژگاری کەسی بەهەڵەچوو ، بە قسە سوودی نیە.
بەڵکو دەبێ بە کردار هەڵکەی نیشان بدەی. بۆ زیاتر تێگەیشتن لەم شێوازە ئامۆژگاریە.
**سەرنجی ئەم بەسەرهاتە بدەن:** پێشەوایانی گەنجانی بەهەشت، دوو ڕەیحانە بۆ نخۆشەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ). کوڕانی عەلی و فاطمە.
حەسەن وحوسەین. تازە لاو بوون ، ڕۆژێکیان سەرنجیاندا وا پیاوێکی ڕیش سپی دەست نوێژ دەگرێ ، بەڵام هیچ مەرجی دەست نوێژ گرتنی شەرعی نییە تێیدا نیە. بەپەلە هەندێ ئاوی دەکرد بەدەم و چاویدا و قۆڵەکانی نیوە دەشت و ئانیشکی تەڕنەدەبو. قاچەکانی وا دەشۆرد کە پاژنەی پێ ی و قولە پێ ی ئاوی بەرنەدەکەوت، بێگومان ئەم دەست نوێژە دروست نیەو ئەو نوێژەش قبوڵ نابێ ، ، نابێ کە نوێژ بەم دەست نوێژە ناتەواوە بکرێ ، بۆیە پێویستە ئەم کەسە فێر بکرێ و نەهێڵدرێ ئەم هەڵە گەوریە کە ڕەنج بەخەساری قیامەتی دەکات ، بەسەریدا تێ بپەڕێ، بڕیاریاندا کە بەقسە پێ ی نەڵێن:
مامە پیرە گیان دەست نوێژەکەت دروست نیە. چونکە لە وەڵامیاندا دەیگوت: ئێوەی هەرزەکار دەتانەوێ منی بەتەمەن فێری دەست نوێژ بکەن. ئای چ زەمانێکە! لەبەر ئەوە پلانێکیان دانا. هەردوکیان چونە لای پیاوە پیرەکەو زۆر بە ئەدەبەوە سەلامیان لێ کردو پێیان ووت: مامە گیان ئێمە دوو براین کێشەیەکمان هەیە. ئەگەر جەنابت لوتف بکەی و دادوەری لە نێوانماندا بکەی. ئەوە زۆر مەمنونت دەبین و خوای گەورەش پاداشتت دەداتەوە.
**پیاوە بەتەمەنەکە ووتی:** بەسەر چاو ڕۆڵەکانم ، فەرمون قسە بکەن بزانم لەسەر چی کێشەتانە ، ئیمامی حەسەن فەرموی: لەسەر مەسەلەی دەست نوێژ کێشەمان هەیە ، من دەڵێم دەست نوێژ گرتنی من جوانترە و ئەویش دەڵێ: نەخێر دەست نوێژ گرتنی من جوانترە. لەبەر ئەوە ئێمە هەردوکمان دەست نوێژ دەگرین لەبەر

چاوی تۆ، تۆش باش لێمان وردبەرەوەو دواتر بڕیار بدە کە کامان دەست نوێژەکەمان پوخت و شەرعی ترە! بەڵێ هەردوکیان بە جوانترین شێوازی شەرعی دەست نوێژیان شۆردو مامە پیرەش وەکو دادوەرێك زۆر بەوردی سەرنجی دەدان.

لە ئەنجامدا مامە پیرە کە سەیری ئەو دەست نوێژە جوانەی ئەوان و ئەو هەڵپە هەڵپەی خۆی دەکرد لە دەست نوێژدا ، ڕاستی بۆ دەرکەوت و پێ ی ووتن: (لَقَدْ أَصَبْتُما، وَأَنا الَّذي أَخْطَأْتُ). بەخوا دەست نوێژی ئێوە زۆر تەواوە و ئەوەی ناتەواوە دەست نوێژەکەی منە کە تا ئێستا نەم زانیوە دەست نوێژ بگرم!

بەڵێ بەم شێوەیە ئامانجەکەیان کە تێگەیاندنی ئەو کەسەبوو ، ها تەدی ، بەڵام بەم ڕێگا کرداریە نەك قسە.

**بەڵێ ئیمانداران:** مرۆڤ هەرچەندە عاقڵ و ژیربێ، پێویستە لەسەری زۆر بە گرنگی دانەوە گوێ لەقسەی ئەمانە بگرێ، وە ئامۆژگاریەکانیان لە گوێ بگرێ.

١- زانایانی ئیسلام ، عولەمایانی شەرع. چونکە ئەوان میراتگری پێغەمبەرانن و ئەوەی دەیلێن فەرمودەی خواو پێغەمبەری خوایە (ﷺ). وە هەمووی مایەی بەختەوەری دونیاو دوا ڕۆژە.

٢- دایك و باوکی موسڵمان و ژیر: چونکە هەرگیز دایك و باوك ئامۆژگاری خراپەی منداڵەکانیان ناکەن.

٣- دکتۆر: لەبەر ئەوەی ئامۆژگاریەکانی هەمووی لە سودی مرۆڤدایە و مایەی پاراستنی تەندروستیەتی.

٤- کاربەدەستی دادپەروەر دڵسۆز و یاساناس ، لەبەرئەوەی هیچ کەس لە پەیڕەوی کردنی یاسادا زەرەر ناکات.

٥- پۆلیسی هاتووچۆ و ڕێنماییەکان و هێماکانی هاتوچۆ: لەبەرئەوەی مایەی سەلامەتی خۆت و ئوتومبیلەکەت و ژیان وماڵی کەسانی تریشە.

وە هەروەها بزانن کە پێنج ئامۆژگاری کاری بێ دەنگ هەن کەدەبێ خۆت لە ئامۆژگاریەکەیان پەند و وانە فێر ببی چونکە ئەوان بەقسە هیچ نالێن.

١- **هەژاری:** کە فێری نرخی پارەو پاروت دەکات، تا ئەم ئامۆژگاری کارە نەبینی، دۆست و دوژمنی خۆشت بۆ لەیەك جیا نابێتەوەو قەدرو قیمەتی ماڵ و گیرفانی خۆت نازانی.

٢- **نەخۆشی:** کە ئامۆژگاری کارێکی بێدەنگەو بەبێ دەنگی فێری ڕێزگرتنی لەش ساغیت دەکات. بینیومانە کەسی وا هەبووە دور لە ڕێبازی ئیسلام و گاعەت عیبادەتی خوا بوە، چەند ساڵ گوێ بیستی ووتاری بەهێز و بەپێزی زانایانی ئیسلام بوە، کەچی کاری تێ نەکردوە. کەچی بە هۆی نەخۆشیەکەوە، تەوبەیەکی ڕاستەقینەی کردوەو ڕووی لە خوا کردوە.کەواتە ئەو نەخۆشیە باشترین ئامۆژگاری کاری بوە ، بەڵام بە بێدەنگی.

٣- **مردن:** کاتێ دەچیتە سەر قەبران و سەیری گۆڕی ئەو هەموو دۆست و ئازیزانەت دەکەی کە پێش تۆ مردون و دونیایان بەجێ هێشتوە، کە چەند ئومێد و هیوایان لە ژیاندا هەبوو. بەتەمابوون ساڵانێکی زۆر بژین، کەچی لە پڕدا دەنگوباسی مردنیان بڵاوبۆوەو بونە دەنگ و باسی مێژوو..

کە بە ڕاستی زۆر بە بێدەنگی ئامۆژگاریت دەکەن و ووتراو: كَفَى بالمَوْتِ واعِظاً...

**(خەیام) لە شعرێکدا ، کە مامۆستا هەژار موکریانی کردویەتی بە کوردی دەڵێ:**

وابزانە جیهان بە ئارەزوی تۆ دەگەڕێ

ئەم چەرخ و خولەی هەموی بەفوی تۆ دەگەڕێ

وا بزانە کەسەد ساڵ ژیای پاشان چی ؟!

مەرگێکە لەسەر ڕێگە لە دوی تۆ دەگەڕێ

هەر کەس کە دەستی بەتیکە نانێ بڕەسێ.

لا کوخێ هەبێ شەوانە تێیدا وە حەسێ.

چەند خۆشە ژیانی وا ، چ ئازادە بە دڵ.

بۆ خۆی بێ ، نە ئاغابێ ، نەبەردەستی کەسێ.

٤- **ڕۆژگاری ژیان و چەرخی زەمان،** کە پێویستە لە هەموو بەسەر هاتێك پەندێك وەربگری. ڕۆژانە-دەبیستی و دەبینی و دەخوێنیتەوە کە خەڵکانێك توشی بەڵاو نەگبەتی و لاڕێ بون هاتون. دەی ئەوە هەمووی بەبێ دەنگی ئامۆژگاریە بۆ تۆ کە ئاگاداربە تۆش ئاگات لە خۆت بێ و وەکو ئەو توش نەبیت. (السعید من وعظ بغیره). بەختەوەر ئەو کەسەیە کە ئامۆژگاری لە غەیری خۆیەوە وەردەگرێ.

٥- **هێماکانی هاتوچۆ و هێڵەکانی سەر ڕێگا:** هەموو تابلۆیەك مامۆستاو ئامۆژگارێکە بۆ تۆی شۆفێر. کە بە بێ دەنگی ئامۆژگاریت دەکات و ئەگەر بەقسەی نەکەیت بە چاوی خۆت ئەگەر گیان لە دەست نەدەی زەرەرەکەی ئەبینی!.

کە هەر لێرەوە بە پێویستی دەزانم ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە کەسانێکی زۆر نامەسئول هەن کەئەو تابلۆیانەی کە هێمای هاتوچۆن ئەشیشکێنێ یان حیزب و لایەنەکان بەداخەوە لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا.

بانگەشەی لیستەکان و وێنەوی کاندییەکانی خۆیانی پێوە هەڵدەواسن و بەم شێوەیە نازانرێ ئەو هێمایە چی لێ تۆمار کراوە، دەی ئەمە هیچی کەمتر نیە لەوەی کەسێك و لایەنێك بیەوێت دەمی ئامۆژگاری کارێکی دڵسۆز و ئەمین بگرێ. کە دەیەوێت ئامۆژگاری خێری هاولاتیانی بکات چۆن ئەوە بە دژایەتی کردن و پێشل کردنی مافی مرۆڤ دەزاندرێ، ئاوایش هەڵکەندن و شکاندن و

داپۆشینی ئەو هێمایانەی هاتوچۆ، ئاوا پێشێل کردنی مافی مرۆڤە و پێویستە بەپێ ی یاسا ئەو کەس و لایەنانە سزا بدرێن!

**بەرێزان:** لەم سەردەمەدا جگە لە مینبەری مزگەوتەکان کە هەردەم باشترین ئامۆژگاری کاربون، بەراستی و بوێری و پاکی و دڵسۆزیەوە ئامۆژگاری حاکم و مەحکوم ، دەوڵەمەند و هەژار. زاناو نەزانیان کردوە و ڕێ ی چاکەیان نیشانداون. دەشتوانرێ و بگرە پێویستیشە سود لەم شێوازانە وەربگیرێ بۆ ئامۆژگاری گەل و میللەت:

١- ڕۆژنامەو گۆڤار ، کە جێگەی داخە زۆرێك لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان ئەو دەورە پیرۆزە نابینن و زوربەیان بە هەواڵی ناڕاست و و هەڵبەستراو نەبونی ستراتیژیەتی کار. متمانەیان لەناو جەماوەردا لە دەست داوە.

٢- رادیۆو تەلەفیزۆن ، چونکە دەچێتە ناو هەموو ماڵ و هەموو جێگایەك و هەموو چین و توێژێکەوە ئەگەر شتی جوان و زانستی و بەسودی بۆ دونیاو قیامەت تیا پەخش بکرێ. باشترین ئامۆژگاری کارە.

٣- شانۆو تەمسیلی زۆر جار بەبینینی فلیمێك. یان شانۆیەك مرۆڤ ئامۆژگاریەك وەردەگرێت کە بەچەند ساڵ گوێگرتن فێری نابێت. کە بەڕاستی ئێمەی موسڵمان لەم بوارەدا کەم و کوڕیمان هەیەو پێویستی زۆرمان بە شانۆکاری دیندار هەیە، کە لەڕێگەی تەمسیلی و شانۆوە بە هونەرەکەی خزمەت بە ئایینی ئیسلام بکات.

چەند جوانە چیرۆکە قورئانیەکان ، ئەو بەسەر هاتە شیرینیانەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی گێڕایوینەتەوە ، لە ڕێگەی کردنیان بە تەمسیلی یەوە پێشکەش بە هاووڵاتیان بکرێت، کە زۆر جار کاریگەری زۆر زیاترە لەوەی کە بە خوێندنەوە بۆ خەڵکی باس بکرێت.

٤- کتێب ، کە باشترین هاوڕێ و ئامۆژگاری کارە بۆ مرۆڤ.

٥- گۆرانی و سرود، که باسی ژیانی دونیاو مردن و خۆشەویستی و وەفاداری و ڕەفتاری جوان دەکات، چەند جار بوە مرۆڤـ بە سرودێك ، بە شعرێك، بە چەند پەخشانە شعرێك ، بە پارچە مۆسیقایەك فرمێسك بەچاوی دا دێتە خوارەوەو دڵی نەرم دەبێ و بەخۆی دا دەچێتەوە و لە خۆبەگەورەزانین و فیزو دەعیە ڕزگاری دەبێت.

**ئیماندراران:** هەندێك کەس هەن ڕەش بینانە بیردەکەنەوە و دەڵێن: ئامۆژگاری و نەصیحەت دەوری نیەو مرۆڤـ ڕەوشتی خۆی چۆن بوو، ناتوانێ بیگۆڕێت ، بەڵام ئەم قسەیە لە ڕووی زانستەوە ناڕاستەو مرۆڤـ کاری تێ دەکرێ بە چاکە و خراپە ، ئەگەر قسەی چاکی بۆ بکرێ ، بێگومان چاکەی لێ دێتەدی و ئەگەر خراپەی فێر بکرێ ئەوا ڕەفتاری دزێو و خراپ دەنوێنێ..

پێشەوا (ئەبو حامیدی غەزالی) لەم بارەیەوە دەفەرموێت: (لَوْ كانَتِ الأَخْلاقِ لاتَقْبَلُ التَّغييرَ لَمْ يَكُن لِلْمَواعِظِ وَالوَصايا مَعْنَى ، وَكَيْفَ تُنْكِرُ تَغْيِيرَ الأخلاقِ وَنَحْنُ نَرَى الصَّيْدُ الوَحْشِيَّ يَسْتَأْنَسُ). مِنْهاجُ القاصِدين ، ص١٩٩.

واتە: ئەگەر ڕەوشت گۆڕانی بەسەردا نەهاتایە.، ئەوا ئامۆژگاری و وەسیەتکردن ، هیچ واتایەکی نەدەبەخشی، باشە چۆن نکۆڵی لە گۆڕانی ڕەوشت دەکرێ لە کاتێکدا ئێمە دەبینین نێچیری کێوی دەستەمۆ دەکرێت؟!

بەڵێ مرۆڤـ بە هۆی سنورداری ژیری و زانیاریەکانیەوە، بەردەوام پێویستی بەوە هەیە گوێ لە ئامۆژگاری بگرێ، کە باسمان کرد لە چەندین ڕێگاوە مرۆڤـ ڕۆژانە ئامۆژگاری وەردەگرێ، بەڵام ئەگەر گوێ ی نەگرت ، ئەوە بە ڕاستی لەناوچون و سەرگەردانی بۆ دەمێنێتەوە.

**دەگێڕنەوە:** شاخەوانێك دەیەوێت بگات بە لوتکەی شاخێکی زۆر سەخت و بەرز ، کە پێش ئەو کەس پێ ی نەگەیشتوە، بۆیە لە شەوێکی ئەنگوستە چاوی زستاندا کە دونیا بەفر داپۆشیوە ، وەك تەحەدایەك بڕیاری هەڵگەڕان بەسەر ئەو چیایە سەختەدا دەدات ، هەرچەندە دڵسۆزان ئامۆژگاری دەکەن سودی نابێت و گوێیان لێ ناگرێ ، دوای ئەوەی بەسەر شاخەکە دەکەوێت. لەپڕ دواهەمین مێخ (شیشی ئاسن) کە چەقاندویەتی دەترازێت و بەدوایدا مێخ بە مێخ ، شیشە ئاسنەکان دەترازێن و کابرا دەکەوێتە خوارەوە، بەڵام یەکێك لە مێخەکان کە بە مەحکەمی دا کوتراوە کابرای پێوە دەوەستێتەوەو لەبری ئەوەی بکەوێتە سەر زەوی لە ئاسماندا بەهەڵواسراوی دەمێنێتەوە، لەو کاتەدا شاخەوانەکە یەکەم باجی هەڵەی گوێ نەگرتن لە دڵسۆزان دەدات. ئەویش ئەوەیە لە دوای کەوتنە خوارەوەی تەنها ئامانجی ئەوە دەبێت کە بەسەلامەتی لە ژیاندا بمێنێت. نەك ناو و ناوبانگ. کە پێشتر هەوڵی بۆ دەدا. بۆیە دەست دەکات بە هاوارکردن بەو ئومێدەی کەسێك بێت بە هاواریەوە و ڕزگاری بکات ، بەڵام بێسود دەبێت. ئاخر لە شەوێکی تاریك و سارد و سڕی زستاندا لەو شاخە کێ فریای کەوێت؟! بەڵام دوای تۆزێك گوێ ی لە دەنگێك دەبێت هاوار دەکات (پەتەکە بپسێنە) ، کابرای شاخەوان کە گوێ ی لەم قسەیە دەبێت ، زۆر توڕە دەبێت ، هەروەك چۆن بە ئامۆژگاری یەکەم جاری خەڵکەکە توڕەبوو کاتێك پێ ی وابوو ئەوان دەیانەوێت لە ڕێگەی ئەو بەر پێ گرتنە یان ئەو شەرەفەی بەرنەکەوێت ، ئەمجارەشیان پێی وابوو دەیانەوێت بمرێت و لەناو بچێت ، بۆیە بڕیاری دا هەر بە هەڵواسراوی بمێنێتەوە ، بە ئومێدی ئەوەی بەیانی خەڵك بێن بە هانایەوە.

بەڵام بێئاگا لەوەی کە مانەوە بۆ ماوەیٚ شەوێك بە هەڵواسراوی لەم شەوە ساردو بەفراویەدا سەرەنجامی باش نابێت ، کاتێك دونیا ڕوناك دەبێتەوە ، خەڵك دێن بۆ ڕزگارکردنی ، بەڵام دەبینن کابرا بە ئاسمانەوە لە سەرماندا مردووە. لە کاتێکدا تەنها چەند مەترێکی کەم لە زەوی یەوە دوورە.

واته ئەگەر پەتەكەی بپچڕاندایەو بەقسەی ئامۆژگاری كارەكەی بكردایە ، زۆر بە ئاسانی ئەكەوتە سەر زەوی و ڕزگاری دەبوو.

بە داخەوە زۆر كەس هەیە كاتێ كەسانێك یان كەسێكی دڵسۆز ئامۆژگاری دەكات كە ئەو كارە مەكەو مەترسیدارە وازی لێ بێنە، یان لەم قەیرانەی تێ ی كەوتوی ئاوا بكە ڕزگار دەبی، وا دەزانێ ئەو ئامۆژگاری كردنە، حەسودی پێ برد نیەتی و دەیانەوێ ئەو پلەو پایەو دەسكەوتەی بۆنە بێت. یان دەیانەوێت لە ناوی ببەن. كە سەرەنجام لە بە گوێ نەكردنی ئامۆژگاری كاری دڵسۆزدا لەناوچوون هەیە.

**لە كۆتایی دا دەڵێم: موسڵمانی ڕاستەقینە پێویستە لە دوو حاڵەت ئاگاداربێ.**

١- بەردەوام ئامۆژگاری بكاو ئامۆژگاریش لە خەڵكانی دڵسۆز وەربگرێ.

نەك كەس حەقی كەسی نەبێ، چونكە لە دوای ئیمان و عەمەلی صالح لە سیمای كۆمەڵگای ئیمانداره ﴿ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلصَّبْرِ ﴾ العصر: ٣. كە هەر ئەوانیش لە خەسارەتمەندی بە دوورن.

٢- موسڵمانیش نابێت زۆر خۆشباوەڕبێت و بە قسەی هەموو كەسیش بڕوا بكات، چونكە هی واهەیە كە لەڕێگەی زمانی نەصیحەت و ئامۆژگاری و دڵسۆزی بۆ نواندنەوە و لە ڕێگەی هەڵوەراندنی فرمێسكی تیمساحیەوە، دەیەوێت لە خشتەت بەرێ و بەدبەختت بكات. دەبێ موسڵمان ووشیار بێ، ئەوەتا خوای گەورە لە قورئاندا ئاماژە دەكات بەم ڕاستی یەو لە بەسەر هاتی باوكە ئادەم و دایكە حەوادا ئاگادارمان دەكاتەوە كە شەیگان لە ڕێگەی ئامۆژگاری كردن ودڵسۆزی بۆ نوادنەوە زەفەری پێ بردن.

تەنانەت بۆ ئەوەی لە دڵسۆزی خۆی دڵنیایان بكاتەوە، سوێندیشی بۆ خواردن!! كەواتە بەهەموو سوێند خواردنێكیش بڕوا مەكە. بەڵێ، شەیتان چوە لای ئادەم و حەواو وەكو دڵسۆزێك پێ ی ووتن: ﴿مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّى لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴾ الأعراف: ٢٠ _ ٢١.

واتە: پەروەردگارتان ئەم درەختەی لێ قەدەغەنەکردون ، تەنها لەبەر ئەوەیە نەوەکو ببنە فریشتە یاخود بۆ ئەوەیە نەوەکو لە نەمران بن ، ئەو سا شەیتان زانی دەترسن و دوو دڵن لە خواردنی. بۆیە سوێندی بۆ خواردن کە بە ڕاستی من لە ئامۆژگارانم بۆ ئێوە و دڵسۆزتانم.

ئای چەند ژنماڵی لێ تێك چوو، لەبەر ئەوەی ژنانێك لە بەردەرگا ئامۆژگاریان کرد کە ئاگاداربە مێردەکەت وایەو وایە، چەند پیاویش بە دوو قسەی خراپ لەڕێ ی شەیطان سیفەتێکەوە بە ناوی ئامۆژگاری وازی لە ژنەکەی هێناو ماڵی لێتێکچوو، مناڵی سەرگەردان بوو.کەواتە، ئاگاداریەوە گوێ لە ئامۆژگاری بگرە.

بەڵێ لێرەدا ڕەنگە کەسێك بڵێ باشە من چۆن بزانم ئەم کەسە کە ئامۆژگاریم پێشکەش دەکات، دڵسۆزە تا بەقسەی بکەم ، یان وەکو شەیطان دەیەوێ فریوم بدات تا خۆی لێ بپارێزم؟!

**لەوەڵامدا دەڵێین:** هەموو قسەو ئامۆژگاریەك بە تەرازوی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بکێشەو ئەگەر بە تەرازوی شەرع پەسەندبوو ، ئەوە وەری بگرە ، ئەینا وازی لێ بێنە. خوای پەروەردگار بمانگێرێ لەو کەسانەی کە :

﴿ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ﴾

ٱللَّهُمَّ آمِينَ

# سەرچاوەکان

١- قورئانی پیرۆز
٢- تەفسیری ئاسان ، بورهان محمد أمین.
٣- وصایا وحکم ، یوسف أحمد ، ص,٢٥٧
٤- سلسلة كُنْ ، كُنْ نَصُوحاً ، ص٤ ، ص١٠.
٥- گوڵبژێر.
٦- الوافي في شرح الأربعين النووية ، د. مصطفى البغا ، ص٤٩.
٧- تَبْصِرةُ الأنام بالحقُوق فِي الإسلام ، صالح بن طه عبالواحد ، ص,٣٨٣
٨- موسوعة الأخلاق الأسلامية ، سعد یوسف أبو عزیز ، ج٣ ، ص,١٤٢
٩- ڕۆژنامەی یەکگرتوو ، ژمارە: (٨٣٥) لە ١١ / ٤ / ٢٠١١ ، ل٦.

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجمعين.

**ئيمانداران:** گەورەترين خەڵاتی خوا بۆ مرۆڤـ ئيمان و ئيسلامە، ئيمانيش هەر قسەی زوبان نيە بە تەنها. بەڵكو گۆڕانی مرۆڤە بە تەواوەتی. گۆڕانيەتی هەر لە ناخيەوە، هەر لە دڵيەوە، لە بيركردنەوەيەوە لە عەقڵ و هزريەوە، لە قسەكردنيەوە، لە كارو كاسبی و داهات و خەرجی يەوە، لە كات بەسەربردنی ڕۆژانەيەوە، لە جل و بەرگ و ڕۆاڵەتيەوە ، لە پەيوەنديە كۆمەڵايەتيەكانيەوە.

واتە: ئەو مرۆڤە كە دێتە بازنەی ئيمانەوە، لەگەڵ شايەتمانەكەدا، دەبێت بە كەسێكی نوێ،﴿ خَلْقًا ءَاخَرَ ﴾، تەنانەت هەندێ جار ناوەكەشی دەگوڕێ، هەروەكو ئەو كەسەی لە سەردەمی كافريەتيدا ناوی (حرب) بوو. كە موسڵمان بوو ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناوی نا (سەليم).

**كەواتە:** ئيماندار كە هاتە بازنەی ئيمانەكەوە ، دەبێ بە تەواوی بگۆڕێ.

بەڵام گەلێك جار ئەم موسڵمانە لەبەر ئەوەی مرۆڤەو قابيلی لە بيرچونەوەيە، قابيلی هەڵچون و توڕبونە، قابيلی عوجب و كيبرە قابيلی عەجەلەكردن و پەل پەل كردنە، ﴿ خُلِقَ ٱلْإِنسَـٰنُ مِنْ عَجَلٍ ﴾ الأنبياء: ٣٧.

زۆر جار ئەم موسڵمانە بەبێ ئەوەی هەست بە خۆی بكات، هەندێ ڕەفتار و ئاكار و گوتاری پێش موسڵمانيەتی يان پێش ئيلتيزام بونی بە ئيسلامەوە، تێ ی دا سەرهەڵدەداتەوە و ميكرۆبەكە زيندوو دەبێتەوە، جا لە ئيسلامدا دوو زاراوە هەيە، ئيمانداری، وە پێش زەمەنی ئيمانداری، كە پێ ی دەوترێ جاهيليەت (نەفامی، دواكەوتويی ، نەزانی ، نادانی).

وە زۆرجار ئەو كەسەی كە ڕەگێكی جاهيلی تێدا زيندوو دەبێتەوە،زۆر ئيمانداريشە.

وەكو ئەو بەسەر هاتەی (ئەبو زەڕی غيفاری) كە كاتێ لەگەڵ بيلالی حەبەشی دا، دەمە بۆڵەيەك كەوتە نێوانميانەوە (عَيَّرهُ بأُمِّه) ئەبوزەڕ بە بيلالی گوت: بڕۆ بەولاوە

هەی کوڕی دایك ڕەش! بیلال یش زۆر دڵگران بوو بەمەوە چوە خزمەت پێغەمبەری خواو بۆی گێڕایەوە ئەویش بانگی ئەبو زەڕی کردو فەرمووی: (**إنَّكَ امرؤٌ فيكَ الجَاهِلِيَّة**) أي: خَصْلَةٌ جَاهِلِيَّةٌ.

واتە: بە ڕاستی ئەی ئەبوزەڕ تۆ هێشتا ڕەفتارێکی جاهلیلیت تێدا ماوە!

خۆ مەعلومیشە کە (ئەبوزەڕ) چەندە ئیمانی بەهێزو پتەو بوو. کەچی ئەو دەمارە جاهیلیەی جولاّبۆوە. بۆیە پێویستە هەموو کات ئاگامان لە خۆمان بێت کە توشی قسەو گوفتارێك نەبین کە هی جاهیلیەت بێ، هەرچەندە ئیمانیشمان پتەوبێت و لە ئیسلامیش شارەزابین.

**پێشەوا** (إبن القيم) **دەفەرموێ:** لە شيخ الإسلام (إبن تيميه) م بیست کە لە دوا ڕۆژەکانی ژیانی دا دەیفەرموو: (أَنا مُنْذُ أرْبَعينَ سَنَةٍ، أُصَحِّحُ إسْلامي كُلَّ يَوْمٍ وَما أَظُنُّ أنّي أَسْلَمْتُ إسْلاماً جَيِّداً إلى الآن).

واتە: من ماوەی چل ساڵە لە هەوڵی ئەوەدام کە ئیسلامەتیەکەم ڕاست بکەمەوە ، هەموو ڕۆژێ چاودێری کردەوەکانی خۆمم کردوە ، بۆ ئەوەی ئەگەر ڕەفتارێکی جاهیلیم تێدا ما بێت پاکی بکەمەوە ، هێشتاش دوای ئەو چل ساڵە لە گوماندام کە توانیبێتم ئیسلامەتیەکی جوانم لە خۆمدا جێ بەجێ کردبێ ، هەتا ئێستاش!.

**ئیمانداران:** بۆ خۆپاراستن لە هەرشتێك پێویستە ئەو شتە باش بناسین ، جا بۆ ئەوەی خۆمان لە جاهیلیلەت بپارێزین، پێویستە بیناسین.

زانایان دەفەرمون: (الجاهِلِيَّةُ هِيَ مَجْمُوعَةٌ مِنَ الأعْتِقَاداتِ والتَّصَوُّراتِ والسُّلُوكِيّاتِ المُنْحَرِفَةِ عَنِ الشَّريعَةِ). واتە: جاهیلیەت بریتی یە لە کۆمەڵێك لەبیرو باوەڕ و دیدو تێڕوانین و هەڵس و کەوتی وا کەلادراون لە شەریعەتی ئیسلامی دا.

**کەواتە: جاهیلیەت چەند جۆری هەیە:**

**١- جاهیلیەتی ئیعتیقادی** (ظَنُّ الجاهِلِيَّة): خوای پەروەردگار ئەم جۆرەی جاهیلی یەتمان بەم ئایەتە بۆ ڕوون دەکاتەوە:

﴿ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ﴾ آل عمران: ١٥٤.

واتە: دەستەیەك بە ڕاستی خەمی خۆیان بوو، گومانی ناڕەوایان دەبرد بە خوای گەورە، بەگومانی نەفامانە، دەیانگوت: ئایا ئێمە لەم کارەدا (لەبەدەست هێنانی سەرکەوتن) هیچ شتێکمان هەیە؟! ئەو پشتیوانیەی کە خوا بەڵێنی پێ دابوین بۆ نەهات؟! ئەی محمد (ﷺ) پێیان بڵێ: بێگومان هەموو شتێك بە دەست خوایە.

بە داخەوە لە هەموو سەردەمێکدا خەڵکانێك لەناو موسڵماناندا هەر هەن کە لە دەرونیاندا، گومانی نەفامی (ظَنُّ الجاهِلِيَّة) هەیەو ئەگەر شکستێك ڕوبکاتە موسڵمانان یەکسەر گومانەکەیان دەدەبڕن و دەڵێن ئەی بۆ خوا ئیماندارانی سەرنەخست؟ ئەی کەی ئیسلام سەردەکەوێ؟ کەی حوکمی خوا دێتەوە؟!

بەڵام هەموو شتێك بەدەست خوایە و کاتی خۆی هەیەو موسڵمانان دەبێ کەم و کوڕیەکانی خۆیان چاك بکەن، ئەمجا چاوەڕێ بن بە سەلامەتی بگەنە مەنزڵ و شوێنی مەبەست.

هەروەها دەبینین لەناو موسڵماناندا کەسانێك هەن کە لەگەڵ خوای تاك و تەنها و بێ شەریکدا بەبێ ئەوەی هەستی پێ کردبێ — بە هۆی کەم زانستی شەرعی یەوە. توشی هاوبەش دانان بوە بۆ خوا ڕێك وەکو سەردەمی جاهیلی پێش ئیسلام. وەکو ئەو کەسەی کە قەبرێك دەپەرستێ لە ڕێگەی ئەوەوە کە داوای کوڕ و کچ و شیفای نەخۆشی لێ دەکات ، پەنا بەخوا وا دەزانێ لەو شوێنە نەبێ خوای گەورە دەنگی نابیستێ و وەڵامی ناداتەوە، ئەمە جاهیلیەتی بواری عەقیدە. زۆرجار ئەوکەسانە کە ئەگەر ئاگاداریان بکەیتەوە پێت دەڵێن: بۆ ئێمە موسڵمان نین؟!!

**دەڵێین بەڵێ** ، بەڵام جاهیلی لە بواری عەقیدەدا، کە خەتەرترین جۆری جاهیلیەتە ئیتر با شارەزاش بیت لە بواری نوێژو عیبادەتەکانی تردا. پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر سور بوو لەسەر ئەوەی کە ئوممەتەکەی وا پەروەردە بکات کە هەرگیز هاناو

هاوار بۆ غەیری خوانەبەن. ئیمامی طەبەرانی دەفەرموێ: لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) کابرایەکی دوو ڕوو ئازاری موسڵمانەکانی دەدا.

**ئینجا حەزرەتی أبوبكر فەرمووی:** بابچین پەنا ببەینە بەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڵکو لەم دووڕوە ڕزگار ببین ، کە پێیان ووت ، فەرمووی: (إِنَّهُ لايُسْتَغاثُ بِي ، إِنَّما يُسْتَغاثُ بِاللهِ تَعالى).

واتە: پەنا بەمن نابرێ و هاوار بۆ لای من ناهێنرێ کە فلان کەستان لێ دوور خەمەوەو ئەو بەڵایەتان لە کۆڵ بکەمەوە، بەڵکو پەناو هاوار هەر بۆلای خوای گەورە دەبرێ.

**٢- جاهیلیەتی حوکمڕانی (حُكْمُ الجاهِلِيَّة).** خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾ المائدة: ٥٠

واتە: ئایا ئەوانە حوکم و فەرمانڕەوایی جاهیلیەت و نەفامیان دەوێت و ئەویان لا پەسەندە؟! ئاخر بۆ بیرناکەنەوە، کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکمی جوان و چاك و بەجێ بێت. بە تایبەت لای ئەو کەسانەی کە بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە.

**ئیبن و عەبباس دەفەرموێ:** دەستەیەك لە زانایانی یەهود (جولەکە) وەك: (ئیبن سوریا ، کەعب ، شاسی کوڕی قەیس ) کۆبونەوە و گوتیان: بابچینە لای محمد بەڵکو بتوانین لە خشتەی بەرین و فریوی بدەین، چونکە خۆ ئەویش هەروەکو ئێمە ئادەمی یە با بچین پێ ی بڵێین: کە لە فلان مەسەلەدا پشتگیری لە ئێمە بکە، ئەوسا ئێمەش لە هەندێ شتا پەیڕەوی لە تۆ دەکەین.

دیارە خۆشت چاك دەزانی ئەگەر ئێمە شوێنت بکەوین هۆزەکانی تریش چاومان لێ دەکەن! بەڵێ بەم نیەتە پیسەوە هەستان و چونە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەبەستەکەیان لادرکاند.

بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەهیچ شێوەیەك بە گوێ ی نەکردن و نەیانتوانی لەڕێ ی ڕاست بیترازێنن ، ئەمجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە و فەرمووی:

﴿ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَ ﴾ المائدة: ٤٩

**کەواتە:** موسڵمانان نابێت ، هیچ کاتێك و هیچ زەمانێك و بەهیچ بیانویەك لە هیچ بڕگەیەکی جێگیری چەسپاوی ئەم ئیسلامە تەنەزول بکەن ، بۆ ئەوەی کافران لێیان ڕازی بن ، یاخود مەترسیان بۆ سەریان نەبێت یاخود یارمەتیان بدەن.

وە هەرکاتێ یاسایەك بۆ وولات و گەلی موسڵمان دانرا، ئەگەر ئەو بڕگەیە لە یاسا (٩٩٪) ی بەپێ ی شەریعەتی ئیسلام بوو. بەڵام (١٪) ی پێچەوانەو دژبوو لەگەڵ نەصێکی چەسپاوی شەرعی ، ئەوا ئەو قانونە بە حوکمی جاهیلی ناودەبرێ ، وەکو لە مێژوودا گەلێ جار یاسایی وادانراوە.

**بۆ نموونە:** (تەتار)ەکان ، بە یاسای (جەنگیزخان) کاریان دەکرد، کە پێك هاتبوو لە چەند فەرمان و بڕیارێکی تێکەڵ لە دینی ئیسلام و هاتن پەیڕەوییان لێ کردو فەزڵیاندا بەسەر شەریعەتی خوادا، دیارەکاری ئاوا دەرچونە لە ئیسلام و جولەکە و گاور، هاوڕێ لەگەڵ هەندێ ڕاو بۆچونی خۆشی.

پاشان چینی پاش ئەوان کە مرۆڤی پێ کافر دەبێ. پێغەمبەری خوا دەفەرموێ:
**(أبْغَضُ النَّاسِ إلى اللهِ مَنْ يَبْتَغِي في الأسلامِ سُنَّة الجاهِلِيَّةِ، وَطالَبَ دَمَ امريءٍ بِغَيْرِ حَقٍّ لِيُريقَ دَمَهُ)** رواه الطبري.

**واتە:** لە هەموو کەس زیاتر کە خوای گەورە ڕقی لێ ی بێ ی و لێ ی تووڕە بێت، ئەو کەسەیە کە لەناو ئیسلامدا بە دوای زیندوکردنەوەی ڕێبازێکی جاهیلیە، وە ئەو کەسەشە کە بەشوێن خوێنی کە سێکەوەیە، بەبێ ئەوەی مافێکی بەسەریەوە بێت، بۆ ئەوەی خوێنی بڕێژێت.

**لە تەفسیری (صفوه التفاسیر)ی** شێخ (محمد علی صابونی) دا (ج١،ص٣٤٧) ، لە تەفسیری ئایەتی: ﴿ أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ ﴾ المائدة: ٥٠ دا **دەفەرموێ:** ئەو پرسیارە بۆ ئینکارو تەوبیخە، ماناکەی ئەوەیە: ئایا ئەوانە پشت لە حوکم و فەرمانی تۆ دەکەن و بەشوێن حوکم و یاسایەك دا دەگەڕێن و عەودالن و داواکارن کە غەیری حوکمی خوایە ، کە ئەویش حوکمی جاهیلیە؟.

وه له تهفسیری ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ؟ ﴾ المائدة: ٥٠ دا دهفهرموێ:
**مانای ئەوەیە:** ئایا کێ داد گەرترە لە حوکم و بڕیاردا لە خوای گەورە؟
وه ڕاستگۆترو ڕاشکاوانەترە لە دەربڕینی حوکمەکەدا؟ وە کاربەجێ ترین بڕیاردەرە لە دانانی بڕیارو یاسادا؟ ئەم پرسیارانە بۆ کەسانێکە کە بڕوایان هەیە بە خوایەکی بەرزی کاربەجێ ، کە جوان بیربکەنەوە؟
هەر لە (صفوه التفاسیر) دا شێخ (محمد علی صابونی) دا (ج١،ص٣٤٨)، **لە تەفسیری ئایەتی: ﴿ أَفَحُكْمَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ﴾ دا دەفەرموێ: سەید قوطب (رحمه الله) ئایەتەدا ئاوای فەرموە:**
**حوکمی جاهیلی: بریتی یە لە حوکمی مرۆڤ بۆ مرۆڤ. وە مل کەچی مرۆڤ بۆ مرۆڤ ، وە ڕەفزکردن و بەلاوەنانی ئولوهیەتی خوای گەورە و دەرچون لەملکەچی و بەندایەتی بۆکردنی بۆ بەندایەتی غەیری خوا، ئەمەش دووریانی ڕێگاکەیە. یان حوکمی خوا. یان حوکمی جاهیلیەت. ڕێگای سێ یەم لەم نێوانەدا نی یەو بەدیلێکیش نیە. جا کەوابوو یان جێ بەجێ کردنی شەریعەتی ئیسلامی لە بەڕێوبردنی ژیانی خەڵکی دا، یان جێ بەجێ کردنی حوکمی جاهیلی و ڕێسای ئارەزوبازی مرۆڤ و پەیڕەوی بەندایەتی کردن بۆ غەیری (الله).**
**جاهیلیەتیش تەنها بریتی نیە لە قۆناغێك لە زەمان. بەڵکو بارودۆخێکە لە باردۆخەکان دوێنێش هەبووە و ئەمڕۆش دەبێ و سبەی نێش بونی دەبێ.**
**جا خەڵکی یان بەشەریعەتی خوا حوکم دەکەن لە نێوان خۆیاندا و بەدڵ و بەگیان تەسلیمی دەبن و مل کەچی دەبن ، کە ئەوکاتە موسڵمانی بەحەق دەبن.**
**یاخود حوکم دەکەن بە یاساو دەستورێك کە دەستکردی مرۆڤەو بەجێ بەجێ کردنی ئەو یاسا مرۆڤ کردە ئەوان لە جاهیلیەتدا دەژین و لەشەریعەتی خوا دەچنە دەرەوە**

**٣- جاهیلیەتی دەمارگیری (العصبیة):** جابری کوڕی عبداللە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: لە غەزایەکدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بوین (ﷺ) خەڵکێکی زۆری موهاجرین (خەڵکی مەککە کە کۆچیان کردوە بۆ مەدینە) لە خزمەتیابوون ، جا لەناو ئەو خەڵکە زۆرەی موهاجرین دا، کابرایەکی تێدابوو کە زۆرکات یاری بەڕمەکەی دەکردو هەڵی دەسوڕاند.

ڕمەکەی فڕێ دەداو دەیگرتەوە. لەناکاوێکدا سەری ڕمەکەی بە پاژنە پێ ی کەسێکی مەدینەیی (ئەنصار)ی کەوت و ئازاری دا.

ئەنصاریەکە زۆر زۆر توڕەبوو. هەتا هاواری کردو داوای لە ئەنصارەکانی خزمی کرد کە فریاوی بکەون و تۆڵەی بۆ بکەنەوە ، ووتی: ئای کۆمەڵی ئەنصاری ، ئای خزمەکانم وەرن تۆڵەم بکەنەوە، کابرای موهاجریش کە ڕمەکەی پێ بوو، ترسا و ئەویش هاواری کرد، ئای موهاجرین، ئای خزمەکانم وەرن بە هانامەوە، وا هێرشم دەکەنە سەر. لەم کاتەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێ بیستی ئەو دەنگە دەنگە بوو. بەپەلە هاتە ناوەوەو فەرمووی: (ما بالُ دَعْوى أَهْلِ الجاهِلِيَّةِ؟!) ئەوە چی یە وا بە بانگەوازی خەڵکی جاهیلی بانگ دەکەن و کە گەلەکۆمەکی لە یەکتری دەکەن!!

پاشان فەرمووی ، هێمن ببنەوە و وەرن دانیشن بزانم لەسەر چی وادەکەن ؟!

ئیتر بۆیان باس کرد کەلەسەر ئەوە بووە کە ڕمەکەی ئەو موهاجریە بەر پاژنەی پێ ی ئەو ئەنصاریە کەوتوەو زۆر ئازاری داوە و ئیتر داوای یارمەتی و گەلەکۆمەکی لە خزمەکانی کردوەو موهاجریەکەش بە هەمان شێوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (دَعُوها فَإِنَّها خَبِيثَةٌ) وازی لێ بێنن لەم ڕفتارەی سەردەمی جاهیلی کە گەلەکۆمەکی و خزم کۆکردنەوە و لەشکر کێشیە بۆ سەر بەکتر و لەجیاتی چارەسەری گرفتێکی بچوك دروست کردنی شەڕێکی گەورە و خوێناوی. چونکە بەڕاستی ئەمە پیسە و بۆگەنیەو لە ئەهلی ئیسلام ناوەشێتەوە.

ئەم فەرمودەیە: مُتَّفَقٌ عَلَيهِ ، بُخاري: ٣٥١٨ ، وَمُسْلِم: ٢٥٨٤.

**جا ئیماندارانی بەڕێز سەرنج بدەن:** موهاجیر و ئەنصار لە خۆشویستانی خواو پێغەمبەرن ، خوای گەورە لە قورئاندا ، لە سورەتی (التوبة) ئایەتی:١١٧ دا ناوی هێناون. کەچی کاتێ کە گەلەکۆمەکی و خزم خزمێنە و لەشکرکێشی بۆسەر یەك دەکەن دەفەرموێ: ئەوە جاهیلیتە.

**کەواتە:** هەرچەندە ئیمانت بەهێز بێت ، هێشتا مەترسی ئەوەت لەسەرە توشی رەفتارو هەڵوێستێکی جاهیلی ببیت.

ئەی باشە ئەگەر دوو کەس شەڕبکەن لەسەر ئەوەی فلان وولات لەیاری تۆپی پێدا بردویەتیەوەو فلان وولات دۆڕاندویەتی!! یان لەسەر حیزب و لایەنێك ، یان لەسەر رەنگی پەڕۆیەك ، لەسەر سەرکردەیەك ، دوو حزب بە شەڕ بێن ئەوە ئەو پەڕی جەهالەتە و گەڕانەوەیە بۆ نەفامی!.

**٤- جاهیلیەتی خۆهەڵکێشان و تەکەبور لێدان بە باوك وباپیرو بنەماڵەوە.**

(عُبِّية الجاهِلِيَّةَ) چەند کەس هەیە خۆی هیچ نیە، بەڵام فەخرو تەکەبور بەسەر خەڵکا دەکات کە کوڕی فلان کەسە یان لە فلان بنەماڵەیە.

**هاوەڵی بەڕێز ئەبو هورەیرە، فەرمویەتی ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی:** (**إنَّ اللهَ عَزَّوَجَل قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُم عُبِّية الجاهِلِيَّةَ، وَفَخْرَها بالآباء، مُؤمِنٌ تَقِيٌّ، وَفاجِرٌ شَقِيٌّ. أنْتُم بَنُوا آدَمُ، وَآدَمُ مِنْ تُراب، لَيَدَعَنَّ رِجالٌ فَخْرَهُم بأقْوامٍ إنَّما هُم فَحْمٌ مِنْ فَحْمِ جهَنَّم، أو لَيَكُونَنَّ أهْوَنَ عَلى اللهِ مِنَ الجِعْلانِ التِي تَدْفَعُ بأَنْفِها النَّتِين**)
رَواهُ أبُوداود (٥١١٦) وَحَسَّنَهُ الألباني (٤٢٦٩) في صَحيح أبي داود.

واتە: بە ڕاستی خوای گەورە خۆهەڵکێشان بە باوك و باپیرانەوەی لەناو لابردون، مرۆڤـ یان ئیماندارێکی موتەقی و خواناسە، یان خراپەو بەدبەختە، ئێوە هەموتان نەوەی ئادەمن ئادەمیش لەگڵە، خەڵکانێك هەن زۆر خۆیان بە باوك و باپیریانەوە بادەدەن، بە هۆز و گەل و عەشیرەتیانەوە با دەدەن، لە کاتێکدا کە ئەوانە

سووتەمەرۆی دۆزەخن، یاخود لای خوای گەورە بێ نرخ ترن لەو قالۆنچەیەی کە بەلوتی ڕیخ و پاشەڕۆی ئاژەڵ پاڵ پێوە دەنێ و خڕی دەکاتەوە!...

**٥- جاهیلیەتی ڕەئی خۆسەرخستن لە گفتوگۆدا:**

لە پێش ئیسلامدا کاتێ ناکۆکیەك لە گفتوگۆدا لە نێوان دوو کەسدا دروست دەبوو، هەر یەکەیان دەیەویست ڕەئی و بۆ چونی خۆی سەربخات، تەنانەت ئەگەر بیشیزانیایە کە ڕەئی و قسەکەی ناحەقەو ناڕەوایە.

بەڵام ئیسلام چارەسەری ئەمەی کرد بەوەی کە ئەگەر دوو کەسی موسڵمان قسەو گفتوگۆ لەسەر بابەتێك کەوتە نێوانیانەوە ئەوا:

١- ئەگەر بابەتەکە پەیوەندی بە عەقیدەو عیبادات و معامەلات و کڕین فرۆشتن و ئەحواڵی شەخصییەوە وەکو نیکاح و تەلاق و میراتەوە هەبوو.

ئەوە خوای گەورە چارەسەری بۆ داناوە کە دەفەرموێ:﴿ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴾ النساء: ٥٩.

**کەواتە:** لەم جۆرە بابەتانەدا تەنها دەبێ بگەڕێیتەوە بۆ قورئان و سوننەت و ئەوەی لەوێدا بڕیاری لەسەر دراو پەسەندکرا هەر ئەوە تەواو وڕاستەو ئیتر هیچ کەس قسەی نامێنێت. خۆ ئەگەر ئەو بابەتەی کە قسەی لە بارەوە دەکرێ و موناقەشەی لەسەر دروست بوە. بابەتێکی دونیایی بوو.

لەسەر مەسەلەی چارەنوسی سیاسی ناوچەیەك ، وولاتێك ، یان لایەنێك و کەسێك قسە دەکراو هەر یەکە رەئی و بۆچونی خۆی دەردەبڕی ، یان بابەتەکە کە قسەی لەسەر دەکرێ بابەتێکی ئایینی بوو.

بەڵام لەو بابەتانەو بوو کە خیلاف هەڵدەگرێ و زانایان بۆچونی جیاوازیان لەسەری هەیە.

**بۆ نمونە:** وەکو کۆکردنەوەی دوو نوێژ و کورتکردنەوەیان، ئایا لەچ شوێنێ دروستە و دەبێ نێوانی ئەو شوێنەی لیَ ی دەژی و ئەو شوێنەی بۆی دەچی چەندبێ ، وە

لەچ کاتێکدا دروستە. یان دروست نیە، ئەوە زانایانی ئیسلام هەر لەزووەوە ئەو چەند ووشە زێڕینەیانکردوە بە چارەسەری کە فەرمویانە:
(قَوْلِي صَوابٌ يَحْتَمِلُ الخَطَأ ، وَقَوْلُ مُخالِفِي خَطَأ يَحْتَمِلُ الصَّوابَ).
من قسەی خۆمم پێ تەواوە و ڕاستە و وا دەزانم پێکابێتم، وە قسەی بەرامبەرەکەم کە دژایەتی لەگەڵ قسەی من هەیە بە هەڵەو ناتەواو دەزانم ، بەڵام لە هەمانکاتدا بۆشی هەیە من قسەو بۆچونەکەم هەڵەبێ و ڕەئی و بۆچونی بەرامبەرەکەم ڕاست بێت.
**یەکێ لە زانایانی پێشین (سەلەف) دەفەرموێ:** کەسم نەبینیوە لە ئیمامی شافیعی عاقڵ و ژیر ترو بەویژدان تربێ ، جارێکیان لەگەڵ ئیمامی شافعی لەمەسەلەیەکدا قسەمان تێك گیراو خیلاف کەوتە نێوانمانەوە دوای ماوەیەك یەکتریمان بینیوە ، من تۆزێ دڵم گەردی گرتبوو کە بۆی نەسەلماندم کە بۆچون و ڕەئیەکەی من ڕاستە، بۆیە من تۆزێ ساردیم نواند، بەڵام ئیمامی شافیعی دەستی گرتم و پێ ی ووتم: باشە ئەگەر ئێمە ڕەئیمان لەمەسەلەیەکدا لە یەکتری جیاواز بێت و نەگەینە قەناعەت بە ڕاستی بۆچونی بەرامبەرەکەمان.
ئایا مەجالی ئەوەمان لەبەر دەستانیە کە وەکو دوو برای خۆشەویست بەیەکەوە بژین و برایەتیمانکەمان هەر پتەوبێ؟! بەڕاستی فەرمودەی ئیمامی شافیعی حەق وایە لە دانیشتنی حیزب و لایەنەکاندا ، هەڵبواسرایە و بکرایە بە بەردی بناغەی دانیشتن و بیرورا گۆڕینەوە.
(سُبحانَ اللّٰه) لە فەزڵی ئەم ئیسلامە گەوهەبارە، کەگەورە زانایانی ئەم ئیسلامە چ ووشەیەکی گەوهەرینی گران بەها، کە هەرگیز کۆن بونی بەسەردا نایەت، لە دەمیان هاتۆتە دەرەوە کەچی نەزان و نەفامانێك هەن کە باسی زانایانی ئیسلام و ووتە بەنرخەکانیانت کرد، پێ ی شتێکی کۆن و ماوە بەسەر چوە!.

**٦- جاهلیەتی مەدح کردن:** لە پێش ئیسلامدا کە ئەگەر مەدح و ستایشی کەسێکیان بکردایە جا سەرۆك هۆزو عەشیرەتێك بوایە، عابیدو خواناسێك بوایە

عالم و زانایەك بوایە، دەچون بەرەو ڕووی دادەنیشتن و بەشیعرو پەخشان دەستان پیّ دەکرد بە مەدح و ستایشی چیان بەسەر دەمدا بهاتایە ئاوا مەدحیان دەکرد.
بەڵام پیّغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمەشی ڕاست کردەوە، هەروەکو جاریّکیان پیاویّك زۆر مەدح و ستایشی پیاویّکی تری کردو پیایا هەڵدا لە خزمەت پیّغەمبەری خوادا (ﷺ) پیّغەمبەری خوا فەرموی: (وَيْلَكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صاحِبِكَ، قَطَعْتَ عُنُقَ صاحِبِكَ مِراراً، ثُمَّ قالَ: مَن كانَ مِنْكُمْ مادِحاً اخاهُ لامَحالَة ، فَلْيَقُلْ: أَحْسبُ فُلَاناً واللهُ حَسِيبُهُ، وَ لا أُزكي على اللهِ أحَداً، أَحْسبُهُ كَذا وَكَذا إنْ كانَ يَعْلَمُ ذالِكَ مِنْهُ) مُتَفَقٌ عَلَيه - البُخاري:٢٦٦٢ ، ومُسْلِم:٣٠٠٠.
واتە: ملی هاوڕێیەکەت شکاند، ملی هاوڕێیەکەت شکاند، چەند جار ئەمەی دووبارە کردەوە ، پاشان فەرموی: هەر کات یەکێ لە ئێوە بە پێویستی زانی کە بۆ مەبەستێکی خێر ستایش و مەدحی براکەی بکات، با بڵێ: من وا دەبینم کە کەسێکی باش بێت و هەر خوای گەورە خۆشی بەندە ناسە وەمن تەزکیەی هیچ کەس ناکەم لە بەرامبەر خوای گەورەدا، تەنها ئەوەندیە کەوا دەزانم فلان کەس ئەو کردەوە جوانە و ئەو ڕفتارە پەسەندەی هەیە.
ئەگەر بەڕاستی دەیزانی کە فلان کەس ئەو ڕفتارەی تێدایەو خۆی لیّ ی بینیوە یان بە هۆی هاوڕێیەتی و دراوسێیەتیەوە شارەزای بوە.
- کاتیّ وەفدی بەنی (عامر) هاتنە خزمەت پیّغەمبەری خوا (ﷺ) یەکیّکیان ویستی مەدح و ستایشی پیّغەمبەری خوا (ﷺ) بکات.
بۆیە ووتی: (أنت سيدنا) تۆ گەورەو سەییدی ئیّمەی. پیّغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (السيد: الله تبارك وتعالى) گەورەو پایەدار هەر خوای تەبارەکو تەعالایە.
کابرا ووتی: (وأفْضَلُنا فَضْلاً، وَأعْظَمُنا طَوْلاً) لە هەمومان خاوەن ڕێزتری و لە هەمومان بەخشەندە تری.
پیّغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (قُولوُا بِقَولِكُم أوْ بَعْضِ قَولِكُم وَلا يَستَجْرِيَنَّكُمُ الشَّيْطانُ) رَواهُ أبُوداود (٤٨٠٦) وَحَسَّنَهُ الألباني (٤٠٢١) في صَحيح أبي داود.

**بەڵێ:** لە ئیسلامدا مەدحی کوێرانە قەدەغەیە، هەر بەوەندەی لە مزگەوت بینیوتە، وا بزانی پیاوی چاکە. جارێکیان کابرایەك مەحی کابرایەکی دەکرد لەلای ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب.

**حەزرەتی عومەر فەرمووی:** سەفەرت لەگەڵ کردوە؟ هاوەڵی بوی لەسەفەردا؟

کابرا ووتی: نەخێر، فەرمووی: ئایا هیچچ کات معامەلەت لەگەڵ کردوە و پارە کەوتۆتە نێوانتانەوە؟ وتی: نەخێر، حەزرەتی عومەر فەرمووی: دەی کەواتە هەر ئەوەندە لە مزگەوتا بینیوتە هەڵساوەو دانیشتوە. ئیتر بە پیاوی چاکی چی دەزانی!

ۆوتی: بەڵێ ڕاستە.

حەزرەتی عومەر فەرمووی: (إذْهَبْ فإنَّكَ لا تَعْرِفُهُ) بڕۆ بە ڕاستی تۆ هەرگیز ئەو پیاوەت نە ناسیوە تا مەدحی بکەی. بە داخەوە ئەمڕۆ موسڵمانان وایان لێ هاتوە ، کە کەوتنە ستایش و مەدحی کەسێك لە پلەی خۆی زیاتر بەرزی دەکەنەوە. دەیان ناوو نازناوی بۆ دادەنێن. مەناقیبی بۆ دەنوسنەوە ئەگەر یەکێکیشیان شکاند، بە زەویدا دەیبەنە خوارەوە، بە هەموو کارو کردەوەی چاکیەوە زەڕیی سفری دەکەن. کە ئەمەش هەردوو لای هەڵەیەو هی سەردەمی جاهیلیە.

**ئیسلام فەرمووی:** ﴿ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ أَن تَعْتَدُواْ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ﴾ المائدة: ٢

هەرچەندە ڕقیشت لە کۆمەڵە کەسێك ، یان تاکە کەسێك بێت ، با ئەو ڕقە واتان لێ نەکات کە دادگەر نەبن لە هەڵسەنگاندنیداو لە باس کردنی چاکەکانیدا هەروەکو خراپەکانی دەبینن و باس دەکەن.

## ٧- ئابوری و بازاڕ و کاسپی سەردەمی جاهیلی:

بازرگانان و کاسبکارانی زەمەنی جاهیلی دەیانگوت:

إذا لَمْ تَأكُلِ النّاسَ أكَلُوكَ .......... مَنْ لا تسرقه سَيَسرقُكَ

ئەگەر خەڵکی نەخۆی دەتخۆن. کەسێ دزی لە خەڵك نەکات، خەڵکی دزیت لێ دەکەن.دەیانگوت:

إذا لَمْ تَكُنْ عَقْرَبَاً يُتقَى.......... لَعِبْت في ثِيابِكَ العَقارِبُ

ئەگەر دوو پشك نەبێت خەڵكی خۆت لێ بپارێزن، ئەوە بزانە دووپشکەکان لە جل و بەرگەکەتدا یاری دەکەن!!!

وە لەو کڕین و فرۆشتنەی کە لە سەردەمی جاهیلی هەبووەو ئیسلام نەهی لێ کرد کە موسڵمانان بیکەن.

**ئەمانەن:** فرۆشتن لەسەر فرۆشتنی براکەت، خەریکە شتێك لە کەسێك دەکڕی تۆ دەچی دەڵێ ی لەوی مەکڕن من هەرزانتر پێت دەفرۆشم. ئەمە حەرامە.

وە کەشتیان فرۆشت، خراپەکەیان دەشاردەوەو جوانەکەیان دەخستە بەرچاو و کڕیار کە دەچوەماڵەوە ئەجا دەیزانی ئەوەی هێناوەیەتیەوە، ئەوە نیە لە بازاڕ بینیویەتی و کڕیویەتی.

**٨- جاهیلیەتی جل و بەرگ:**

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ﴾ الأحزاب: ٣٣. **کەواتە:** خۆڕوت کردنەوەو سەرو قۆڵ و قاچ ڕوتی ئافرەتان، دواکەوتنەو هی سەردەمی جاهیلیە نەك مۆدیل و پێشکەوتن.

**وە بزانن:** لە ئومەتی ئیسلامدا، ئەم جاهیلیەتانە دەمێنن. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: **(أَرْبَعٌ فِي أُمَّتِي مِنْ أَمْرِ الجاهِلِيَّةِ لا يَتْرُكُونَهُنَّ)**

فەرموی: چوار شت لەئومەتەکەم لە ڕفتاری جاهیلیەتن، بەداخەوە ئومەتەکەم تەرکیان ناکەن و وازیان لێ ناهێنن و هەر تیایاندا دەمێننەوە:

١- الفَخْرُ بالأحْساب. شانازی کردن بە حەسەب و نەسەبەوە.

٢- والطَّعْنُ فِي الأنْساب. تانەو تەشەردان لە ڕەچەڵەك وبنەماڵە.

٣- والإسْتِسْقاءُ بالنُّجُوم: وا بزانێ کە بەهۆی ئەستێرە و بورجەوە باران دەبارێت.

٤- وَالنِّياحَة: یەخەدادڕین و قوڕپێوان و لاواندنەوەی مردوو. لە کاتی مردنی خۆشەویستێکدا.

**بەڵێ ئیمانداران:** صەحابەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیانزانی موسڵمان بون واتە: ژیانێکی نوێ ، کە سایەتیەکی نوێ. بۆیە لە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە لە پێش ئیسلام بونیاندا کردویانە، پرسیاریان دەکرد. بۆ ئەوەی بزانن ئایا لە ئیسلامدا ڕێگا پێدراوە یان نا.

تەنانەت ئەگەر ئەو کردەوانە جوانیش بوبن. بۆ نموونە: حەکیمی کوڕی حیزام عەرزی پێغەمبەری خوای کرد: يارسول الله أرأيْتَ أشْياءَ كُنْتُ أتَحَنَّثُ في الجاهلية مِنْ صَدَقَة، أوْ عِتاقَةٍ، وَصِلَةِ رَحِمٍ ، فَهَلْ فيها مِنْ أجْرٍ؟! فَقَال النبي (ﷺ) **أسْلَمْتَ على ما سَلَفَ مِنْ خَيْرٍ)** مُتَفَقٌ عَلَيه ، البُخاري:١٤٣٦، ومُسْلِم:١٢٣.

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا ئەو کردەوە چاکانەی کە لە زەمانی جاهیلی دا کردو من وەکو خێرو خێرات و بەخشین و کۆیلە ئازاد کردن و سیلەی ڕەحم و چاکە لەگەڵ خزم و خوێشاندا. ئایا هیچ ئەجرو پاداشتێکمان تێدا هەیە؟!

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:** موسڵمان بویت لەسەر ئەوەی ڕابورد لە خێرو چاکە. واتە: بەڵێ ئەم کردەوە جوانانە لە ئیسلامیشدا هەر بە جوان دادەنرێن و ئیسلام جوانتریان دەکات. سەیرکەن ئەم صەحابە تەنانەت لەم کردەوە جوانانەش دەپرسێ، کە ئایا لە ئیسلامدا بیان کات یان وازیان لێ بهێنێ. بۆ ئەوەی بە تەواوی لە جاهیلیەت ڕزگاری ببێ.

جا بە ڕاستی موسڵمان بۆیە ئەمری پێکراوە کەواز لە ڕفتارو گوتار و کردارێك بهێنێ کە لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێ چونکە موسڵمان پێویستە لەسەری بەهاتنی بۆ مزگەوت و هەڵگرتنی ناسنامەی موسڵمانیەتی، خاوەنی کەسایەتی و شەخصیەتی خۆی بێ و دووربێ لە چاولێکەری کوێرانە. هەر ڕۆژەی لەسەر پەتێك یاری نەکات و لە کوێوە بای هات شەن نەکات و وای لێ نەیەت، خۆشی نەزانێت چی یە؟!...

وە بە ڕاستی ئەگەر هاتنمان بۆ جومعە و جەماعەت و گوێگرتن لە ووتاری هەینی

نەبێتە مایەی ئەوەی ڕەفتارو گوفتار و کرداری جاهیلی کە ئیسلام پێ ی ڕازی نیە واز لێ بێنین و ئەوا بە ڕاستی تام و چێژی ئیمان و شیرینی ئیسلامەتی ناچێژین.
**هەزار ڕەحمەت لە پێشەوا (ابن القیم) کە فەرمویەتی:** (لا يَذُوقُ العَبْدُ حَلاوَةَ الأيمانِ ، وَطَعْمَ الصِّدق وَاليَقينِ ، حَتَّى تَخْرُجَ الجاهلِيَّةُ كُلُّها مِنْ قَلْبِهِ).
واتە: بەندە تامی شیرینی ئیمان نا چەژێ، وە تام و لە زەتی ڕاستگۆیی و یەقین ناکات، هەتا ئەو کاتەی کە جاهیلیەت بە تەواوی، هەرهەموی لە دڵی فڕێ دەداتە دەرەوە.
داوا کارم لە خوای گەورە لە هەموو بەشەکانی جاهیلیەت پاکمان بکاتەوەو تام و چێژی ئیمان بکەین بەوەی کە بە تەواوی موسڵمانانە ڕەفتار بکەین.

اللَّهُمَّ آمِين

# سەرچاوەکان


١- قورئانی پرۆز.
٢- تەفسیری ئاسان ، بورهان محمد أمين.
٣- قصة الإلتزام ، محمد حسين يعقوب ، ص٣١ ، ص٣٧ ، ص٣١٨ ، ص٣١٩ ، ١٩٣ ، ص٨٨-٨٩ ، ١٣٩ ، ص,٧٤
٤- تەفسیری ڕامان ، ئەحمەد کاکە مەحمود ، ل٢٠٤ ، ل٢٠٩ ، ٢١٠,
٥- صفوة التفاسير ، محمد علي الصابوني ، ج١ ، ٣٤٨,
٦- نظرة النعيم في مكارم أخلاق الرسول الكريم ، ج٩ ، ٤٣٧٦,
٧- تهذيب مدارج السالكين ، إبن القيم الجوزية ، ج١ ، ص٢٨١.

# ووتاری دووەم

# بۆ مانگی ڕەجەب

# تێگەیشتنی ڕاست و دروست لە بابەتە ئاینی یەکان

# بەشی یەکەم

**الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجمعين.**

**ئيمانداران:** له دونیای جەنجاڵی و بگرەو بەردەدا، کێشە و جیاوازی زۆر لە نێوان مرۆڤەکاندا دروست دەبێت.

بۆچونی جیاواز بە ئەندازەی مرۆڤەکان لە بیرو بۆچون و بیرکردنەوەدا دروست دەبیّ، بێگومان کە بۆچونەکان جیاوازبوون، حوکم و بڕیارەکانیش جیاواز دەبن.

یاخود جاری واهەیە بابەتێك گفتوگۆی لەسەر دەردەبڕدریّ، چەند کەس بەشداری ئەو گفتوگۆیەبن. ئەوەندە هەڵسەنگاندنی جیاواز بۆ ئەو بابەتە دەکرێت. ئەمەش ئاسایی یە چونکە زادەی بیرکردنەوەی مرۆڤە.

**ووتراویشە:** ئەگەر هەمومان وەکو یەك بیربکەینەوە دیارە بیرناکەینەوە.

لێرەوە ئاماژە بەوە دەکەم کە ووتاری ئەمڕۆمان بە شتیوانی خوای گەورە باسی تێگەیشتنە (الفهم) کاتیّ کە دوو بۆ چوون لەسەر بڕیارێك هەیە ، هەردووکیشیان حەقن

بەڵام یەکیان جوانتر تیّ ی دەگات و فەهمی دەکات. وە ئەم جوان تێگەیشتنە پەیوەندی نیە بەوەی کە ئەم کەسە خوێندەواری لەچ پلەیەکدایە، تەمەنی زۆرە یان کەم ، باوکەیان کوڕە، سەرکردەیە یان سەرباز، خوێندکارە یان مامۆستا، خاوەن کارە یان کرێکار، چونکە ئەو تێگەیشتنە جوان و بەجیّ یە فەزڵ و بەخششی خوایە دەیدات بەهەر کەسیّ کە بیەوێت بۆ بەرژەوەندی مرۆڤەکانی دەوروبەری ئەو کەسە.﴿ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴾ الحديد: ٢١.

ئەوەش زیادە ڕێزێکی تایبەتە لە لایەن خواوە دەیدات بەو کەسانەی کە خۆی دەیەوێت ، هەر خوا خۆی خاوەنی بەخشش و بەخشندەیی زۆر گەورەو بیّ سنورە.

وە ئەم باسی فەهم و تێگەیشتنی ڕاست و دروستە، لە قورئاندا هاتوەو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ إِذۡ يَحۡكُمَانِ فِي ٱلۡحَرۡثِ إِذۡ نَفَشَتۡ فِيهِ غَنَمُ

ٱلْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَٰهِدِينَ فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ ۚ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ ۚ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴾ الأنبياء: ٧٨ ـ ٧٩.

واته: یادی داودو سولەیمانیش بکەرەوە کاتێك بڕیاریاندا دەربارەی ئەو کێڵگە کشتوکاڵیە، کاتێك کە مەڕو ماڵاتی خەڵکی تیایدا بڵاوبونەوە بەشەو و زیانیان بە کێڵگەکە گەیاند ، ئێمەش شایەت بووین لەسەر ئەو دادوەری و بڕیارەی ئەوان.

جا ئێمە چارەسەری کێشەکەمان لە سولەیمان گەیاند، بەڵام هەریەکە لەم باوك و کوڕە، بەهرەوەرمان کردبوو لە حیکمەت و دانایی و عیلم و زانستی ، هەروەها ئێمە باڵندەو چیاکانیشمان لەگەڵ داود دا مل کەچ و فەرمانبەردار کردبوو، هەموان پێکەوە تەسبیحات و ستایشی ئێمەیان دەکرد، ئێمەش ئەوەمان کرد.

**ئیمانداران:** سەرچاوەی ئەم بەسەر هاتە ئەوەیە: لەسەردەمی حوکمی حەزرەتی داود دا، کابرایەکی خاوەن مەڕو ماڵات، شەوێکیان مەڕو ماڵاتەکەی ڕودەکەنە کێڵگەیەکی کشتوکاڵی و کاولی دەکەن و هەرچی بەرهەمە دەیخۆن و زیانێکی زۆری لێ دەدەن، بۆ بەیانی خاوەن باخ و خاوەن مەڕ دەچنە خزمەت حەزرەتی داود، کاتێ داود گوێ ی بۆ گرتن ، فەرموی: وا بڕیارمدا ئەی خاوەن مەڕ، مەڕو ماڵاتەکەت بدەی بەو خاوەن باخە، لە جیاتی ئەو هەموو زەرەرەی کەلێت داوەو بێ بژێوی ژیان بووە بە هۆی مەڕو ماڵاتەکەی تۆوە، کاتێ هاتنە دەرەوە خاوەن مەڕ مات و مەلولەو عاجزو غەمبارە.

لەبەر دەرگا توشی حەزرەتی سولەیمان کە کوڕی حەزرەتی داودە دەبن ، حەزرەتی سولەیمان لە مەڕ دارە عاجزو مەلولەکە دەپرسێ ، دیارە حوکمەکەت بە قازانج نەبوە بۆیە پێ ی غەمباری ، باشە باوکم چی پێ ووتن؟ ئەوانیش بۆیان باس کرد کە فەرمویەتی وەکو قەرەبوو ، دەبێ هەموو مەڕو ماڵاتەکەی بدات بە خاوەن باخ و زەوی یەکە. **حەزرەتی سولەیمان فەرموی:** بەڵام من تێگەیشتنی ترم هەیە بۆ ئەم مەسەلەیە ، بۆیە هەردوولا چونە خزمەت حەزرەتی داودو قسەکەی سولەیمانی

کوڕیان بۆ گێڕایەوە ، حەزرەتی داودیش بانگی کردو فەرمووی: ئادەی ڕۆڵە بزانم تۆ ڕەئیت چی یەو بۆچونی تۆچۆنە لە چارەسەری ئەم کێشەیەدا ؟! حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: باوکەگیان بێ ئەدەبی نەبێ لە خزمەتتا من وا دەبینم کە بفەرمووی: با مەڕو مالاتی ئەم پیاوە مەڕدارە بدرێتە ئەو خاوەن باخ و کێڵگە کشتوکاڵیەو ئەویش بەرهەمەکەی بخوات وەکو شیرو بەرهەمەکانی و خوری و ئەو بەچکانەی دێتە بەرهەم ، کابرای خاوەن مالاتیش باخەکەی بۆ خزمەت بکاتەوە هەتا وەکو خۆی لێ دێتەوە ، ئەوسا مەڕەکە وەربگرێتەوە و ئەمیش بچێتەوە سەرباخ و کێڵگەی خۆی. بەم شێوەیە ئەم زیان لێکەوتووە قەرەبوی زیانەکەی بۆ دەکرێتەوە و ئەم زیانکارەش سزای زیان کردنەکەی دەدات و پاشان هەردوکیان دەچنەوە سەر پیشەی خۆیان!! حەزرەتی داود زۆر ئافەرینی لێ کردو بڕیاری دا کە حوکمەکەی سولەیمان جێ بەجێ بکەن

**جا بەڕێزان:** سەیری جوانی و ناسکی و بەجێ ی قورئان بکەن:

دەفەرموێ: (فَفَهَّمْنَٰهَا) واتە: ئێمە سولەیمانمان لە چارەسەری ئەم کێشەیە بەم ڕایە پەسەندەو ئەم تێگەیشتنە وردو جوانە ڕێنمایی سولەیمانمان کرد.

**کەواتە:** هەموو بیرو بۆچونێکی جوان کە مرۆڤ دەری دەبڕێت هی خوای گەورەیە و وەکو بەخششێك بە مرۆڤی دەبەخشێت. نەك زیرەکی و ئازایەتی خۆی!

وە تەماشاکەن قورئان چۆن ڕێز لەو هەڵوێستە جوانەی حەزرەتی داود دەگرێ ، کەهەرچەندە باوکی سولەیمان بوو، تەمەنی دوو چەندانەی ئەو دەبوو، تەجروبەی ژیانی زیاتربوو بەڵام کاتێ بڕیارێکی جوانتر لە بڕیارەکەی خۆی بیست یەکسەر تەسلیمی بوو. وە ئافەرینی لە خاوەنی ئەم ڕایە پەسەندە کرد، نەك ئێرەی پێ ببات و دەری بکات و بڵێ تا من وەستابم تۆ چ کارەی.

بۆیە خوای گەورە ڕێزو قەدری علیم و عیبادەتی حەزرەتی داود دەخاتە بەرچاو و پێمان دەڵێ داود زۆر کەسایەتیەکی گەورە بوو.

**وە تەنانەت فەرموی:** (وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ) هەردوکیان. داودیش وەکو سولەیمان خاوەن حیکمەت و دانایی و عیلم و زانستی بوە. خوای گەورە باسی ڕێزو گەورەیی داودی کرد فەرموی: ﴿وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴾ الأنبياء: ٧٩. ئای چ وانەیەکی گەورەیە بۆ هەموو مرۆڤایەتی بەگشتی و بەتایبەت بۆ زانایان و دادوەران و سیاسەت مەداران و ڕۆشنبیران، کە فێربن، کاتێ کەسێك هەرچەندە لە خۆیان لە خوارتربێ لە ڕووی تەمەن و پلەی زانستی و ئاستی کۆمەڵایەتی و خەباتی درێژو نوسینی زۆرەوە، بەڵام کاتێ بۆچونێکی جوانتر و پەسەندتری لە هی خۆی بینی لەلایەن ئەو بچوکترەوە (لەو ئاستانەدا) بەسنگ فراوانیەوە وەری بگرێ و ئافەرین و دەست خۆشی لەو خاوەن بیرو بۆچونەو دەربڕین و نوسین و هەڵوێستە جوانە بکات و بە دڵێرانەو بوێرانەوە ، بەدەنگی زوڵاڵەوە بڵێ: وا من لە بۆچونەکەی خۆم پەشیمان بومەوەو ئەوەی تۆ پەسەندترەو شایانی بڵاوکردنەوەو کارپێکردن و وەرگرتنە!

وە کەسی خاوەن فەهم و تێگەیشتنی پەسەندتر و جوانتریش لەخۆ بایی نەبێت و سوپاسی خوا بکات و بەهی خوای بزانێ کەڕێنمایی کردوەو فەهم و تێگەیشتنی فراوان کردوە. وە پاشان ڕێزو حورمەتی زۆر دابنێ بۆ ئەو کەسەی کە بۆ چوون و تێگەیشتنە پەسەندەکەی بە سنگێکی فراوانەوە لێ وەرگرت. وە باسی چاکەو لێهاتویی و مەردایەتی و زانستی باڵای ئەو کەسە بکات و پێ ی بڵێ

بە ڕاستی ئەوە نیشانەی گەورەیی و زانستی زۆرتە کە ئاوا گوێت بۆ من گرت و بۆچونی خۆت واز لێهێناو هی منت قبوڵ کرد.

**بەڵێ ئیمانداران:** ئا ئەمەیە ڕۆشنبیری ئیسلامی کە قورئان لەم بەسەرهاتەی حەزرەتی داود و سولەیمان ذا فێرمان دەکات و ئەو گرێ کوێرەیە دەکاتەوە کە دەمێك زەمانە مرۆڤایەتی پێوەی ناڵاندوەو حاڵی حازر پێوەی دەناڵێنێ.

کە هەرچەندە کەسی لێهاتوو تێگەیشتوو فەهمی جوان پەیدا بن، لە لایەن کەسانی باڵاوە گوێیان بۆ ناگیرێ و جێگایان بۆ چۆڵ ناکرێ و لە جیاتی ئافەرین و هێنانە پێشەوەیان، هەوڵی لابردن و سڕینەوە یان دەدرێ. کە ئاکامەکەشی بڵاوبونەوەی ڕق و قینە لە جیاتی خۆشەویستی و ڕێز، وەبێ بەش بونی کۆمەڵە لە بەهرەو فەهمی جوان و تازەو هاتنە پێشەوەی چینێکی پاکی دەم و دەست بەخێر.

**خۆشەویستان:** نمونەیەکی تر لەسەر تێگەیشتنی جوان و پەسەندو بەجێ ی حەزرەتی سولەیمان بۆ چارەسەری کێشەکان ، وە دوبارە دەرکەوتنی گەورەیی و سینە فراوانی و پێشەنگی جوانی حەزرەتی داود.

لە فەرمودەیەکی پێغەمبەری پێشەوامانذا (ﷺ) دەردەکەوێت، کە لەهەردوو صەحیحی (بوخاري ومسلم)دا هاتوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: (أنَّ امرأتَيْنِ اعْتَدَى ذِئْبٌ عَلى وَلديْهِما، فَأخَذَ الذِّئْبُ أحَدَ الوَلَدَيْنِ، لما أخَذَ الذِّئْبُ إبنَ المرأةِ الكُبْرى).

واتە: دوو ژن ، یەکیان تەمەنی لەوی تریان زیاتر بوو. هەردووکیان منالی ساوای شیرە خۆرەیان هەبوو. ڕۆژێکیان بۆ چیلکەو دار بەیەکەوە ڕۆیشتن بۆ دارستانێکی نزیك ماڵیان و لەبەر ئەوەی کەس لە ماڵەوە نەبوو. منالە بچوکەکانیانی بۆ بەجێ بهێڵن ، هەردوو منالە مەلۆتکەکەشیان لەگەڵ خۆیان برد، لە ژێر سێبەری دارێکدا دایان نان و خۆیان دەستیان کرد بە دار کۆکردنەوە، لە دوای تەواو بونی کارەکەیان، هاتنەوە بۆلای منالەکانیان، سەیریان کرد وا گورگیان لەسەرەو گورگوکە قەپی کرد

به منالێکیانداو هەرچی دوو ژنەکە هاواریان کردو ڕایان کرد بە شوێنیا سودی نەبوو ، منالەکەی بردو بزربوو.
بە نائومێدی یەوە هاتنەوە لای منالەکەی تریان، کە سەیریان کرد ئەو منالەی کە گورگەکە کە بردویەتی ئی ژنە گەورەکەیە کە تەمەنی زیاترەو ئەم منالەی سەلامەتەو ماوەتەوە لە جێگای خۆی هی ژنە تەمەن بچوکترەکەیە، بەڵام ژنە تەمەن گەورەکە هەرچەندە تەواو دڵنیابوو، کە ئەو منالە هی ئەو نیە، بەڵام لەبەر دڵی خۆی و پاراستنی ناوو کەسایەتی خۆی و ناو ماڵ و مێردو کەسو کاری کە توشی کێشە نەبێ و سەرکۆنەو لۆمە نەکرێ، منالەکەی گرتە باوەش و ووتی: هی منە، دایکی ڕاستەقینەی منالەکە هەرچەندە لەبەری پاڕایەوە و قسەی بۆکرد و نیشانەی بۆ هەڵدا ، سودی نەبوو، بۆیە ژنەی دایکی ڕاستەقینەی منالەکە کە ماوە و گورگ نەیخواردوە، سکاڵای ستەم لێکراوی خۆی بردە لای حەزرەتی داود، کە هەم پێغەمبەربووە ، هەم پاشاو حاکمی ووڵاتیش بووە — حەزرەتی داودیش ناردی بە شوێن ژنە گەورەکەدا کە منالەکەی داگیرکردبوو ، کاتێ! هاتن بۆ دادگا و کەوتنە قسەکردن.
ژنە بەتەمەنەکە زۆر لێزانانەو وەکو پارێزەرێکی کارامە بەرگری لە داوای خۆی کردو منالکەی وا دەنوساند بەسینەیەوەو ماچی دەکرد بە تامەزرۆی یەوە کە هیچ کەس گومانی نەدەکرد ئەمە منالی خۆی نیە، ژنە کەم تەمەنەکەش ، لە بەرامبەر ئەو زمان پاراویەی ئەودا هیچی وای بۆ نەدەوترا منالیشی لە لانەبوو تا هەستی ناو ناخی بەسەردا ببارێنێ، بۆیە حەزرەتی داود بڕیاری دا  کە ئەم منالە هی ئەو ژنە تەمەن گەورەیەکە منالەکەی بە باوەشەوەیە!
بەڵێ لە دادگا هاتنە دەرەوەو یەکیان پێ دەکەنی و دایکی ڕاستەقینەی منالەکەش هەر سەیری جگەر گۆشەکەی دەکات و فرمێسك دەرێژێ و مەمکی شیری  پیا دێتە خوارەوە!! حەزرەتی سولەیمان کەبەم شێوەیە ئەیانبینێ،
لەو دوو دەم و چاوە جیاوەزەدا نهێنی یەکی شاراوە بەدی دەکات و بۆ زیاتر حاڵی بون دەچێتە بەردەمیان و پرسیاری کێشەو حوکمی حەزرەتی داود لە بارەیەوە

دەکات. ئەوانیش باسەکەو خوکمەکەی حەزرەتی داودی بۆ باس دەکەن، حەزرەتی سولەیمانیش دەفەرموێ: تکایە بابگەڕێینەوە بۆ خزمەت باوکم چونکە منیش قسەیەك و تێگەیشتنێکی خۆم هەیە بۆ ئەم کێشەیەی ئێوە بەڵێ چونەوە بۆ خزمەت حەزرەتی داود.

حەزرەتی سولەیمان فەرموی: باوکە گیان ، ڕێگەم پێدەدەی کە منیش بیرو بۆچون و تێگەیشتنی خۆم دەربڕم لەم مەسەلەیەداو ئەگەر بهاتنایە بۆ لای من چۆن حوکمم دەکردن. حەزرەتی داود فەرموی: بەڵێ بەخۆشحاڵی یەوە، فەرموو بزانین تۆچۆن حوکمت دەکرد.

حەزرەتی سولەیمان فەرموی: (لَوْكانَ الأمْرُ إلَيَّ لَقَضَيْتُ بِغَيْرِ هذا) باوکە گیان ئەگەر بێ ئەدەبی نەبێ لە خزمەتتا، ئەگەر من ئەم کێشەیەم بەرەو ڕووبکرایەوە، بە شێوازێکی غەیری ئەم بڕیارەی تۆ حوکمم دەردەکرد!

حەزرەتی داود فەرموی: ئادەی بزانم چۆن؟! حەزرەتی سولەیمان بە ژنەکەی گوت: ئەو منداڵەی باوەشت بێنەو لەسەر ئەم مێزە دای بنێ، پاشان فەرمانی کرد چەقۆیەکی گەورەی زۆر تیژی بۆ بێنن.

کە بۆیان هێنا، فەرموی: لەبەر ئەوەی ناتوانین بەڵگەیەکی وامان لەبەر دەستا بێت کە دڵنیامان بکات لەوەی کە ئەو منداڵە هی کامیانە، بڕیارماندا کە لەناوە ڕاستەوە بیکەم بەدوو کەرتەوەو هەر لایەکیان بدەم بەیەکیان، بەم شێوەیە هیچیان ستەمیان لێ ناکرێ!

حەزرەتی سولەیمان ئەوەندە بە متمانەوە قسەکانی دەکرد کە هەمویان بڕوایان کرد کە فعلاً منداڵەکە لەت دەکات. جا کاتێ چەقۆکەی لەسەر ناوچەوانی منداڵەکە نزیك کردەوە ، ژنە کەم تەمەنەکە هاواری کرد: تکایە کاری وانەکەی، ئەو منداڵە هی من نیە، با بۆ ئەو ژنە بێ، بەڵام ژنە بەتەمەنەکە کە منداڵەکەی پێشتر لابوو.

هیچ قسەو جوڵەیەکی نەبوو. ئالەوێدا حەزرەتی سولەیمان فەرموی:

دەی ئێستا دەرکەوت کە ئەم منداڵە هی ئەم ژنە تەمەن کەمەیە ، کە پارچەیەکە لە جگەری. حەزی کرد بژی و نەمرێ با منداڵەکە لای خۆشی نەبێ ، گرنگ ئەوەیە

مەرگی نەبیٚ! بەڵام ئەوی تریان چونکە جەرگی بۆی نەدەهێشا. هیچ بە خەیاڵیا نەدەهات کە منالّەکە بمریٚ یان بمێنیٚ! بەم شیٚوەیە منالّ و دایکە ڕاستەقینەکەی بەیەك شادکردنەوەو ئافرەتە دلّڕەقەکەش ڕیسوابوو.

حەزرەتی داودیش زۆر سوپاسی خوای کردو پاشان ئافەرینی لە سولەیمان کردو دوعای بە خێری بۆ کرد.

**بەلّیٚ ئیمانداران:** ئەمە حیکایەت نیە، ئەمە واقیعێکە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی گێڕاوینەتەوەو فەرمودەکانی ئەو سەروەرەش هەموی خوای گەورە پیٚ ی ڕاگەیاندوە ، چونکە ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴾ النجم: ٣-٤

کە بەڕاستی لەم بەسەر هاتەدا وانەو دەرسێکی زۆر گەورە هەیە کە تێمان دەگەیەنیٚ! حاکم و فەرمانڕەوا وکار بەدەست، ئەگەر ئاوا خاوەنی فەهم و تێگەیشت بیٚ ، دەتوانی خاوەن ماف بگێڕێتەوە. با دەلیل و بەلّگە و نەصێك و ماددەیەکی قانونیشی لەبەر دەستا نەبێت ، لەسەر ئەو ڕوداوو مەسەلەیە...

جا هەر میللەت و گەلێك چاك وپاك بیٚ خوای گەورە کاربەدەستی تێگەیشتوی بۆ دەنێریٚ ، کە بەبیٚ لێدان و ئەشکەنجەدان و زیندانی کردن و سوێند پێخواردن ، لە کورترین ماوەدا ماف دەگێڕێتەوە بۆ خاوەن ماف ، کە یاسا بەپیٚ ی ماددەکانی ناتوانیٚ بۆی بگێڕێتەوە.

کەواتە: ئەم ئایەت و حەدیسە بەلّگەن بۆ ئەوەی کە پێویستە لەسەر دەسەلاّت و حکومەت ئەفسەرانی بواری ئاسایش و پۆلیس و لێکۆلّینەوە بخاتە ئەو دەورانەوە کە باسی ئەم بابەتانە دەکەن و ڕینمایی فەهم و تێگەیشتنی دروست دەدەن بەو کەسە بەر پرسانە بۆ چارەسەری گرفتەکان.

بەلّیٚ قورئان هەموو باس و بابەتێکی تێدایە تا کۆتایی جیهان ، وە باسەکانی چیرۆکی بەرئاگردان نین ، بەلّکو هەموو ئایەتێکی ئەم قورئانە پێویستی بە دەزگایەکی حکومی هەیە کە بیخاتە بواری جیٚ بەجێکردنەوە.

جا ئەوکاتە خەڵکی بە ڕاستی بەرەکەتی قورئانیان باشتر بۆ دەردەکەوێ، کە لە قورئانەوە، لە ئایەتی (فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ ) ەوە، دەتوانرێ دەزگای (الفهم) لەلایەن حکومەتەوە دابمەزرێ، وە کادری بواری ئاسایش و پۆلیس و دادوەری لێکۆڵینەوەی تاوانی تێدا پێ بگەیەنرێ.

**ئیمانداران:** پێغەمبەران لە هەموو کەس زیاتر خاوەنی (تێگەیشتنی وردو دروست) بوون، دەچینە خزمەت سەرداری هەموو پێغەمبەران.

نوری چاومان حەزرەتی محمد (ﷺ) لە جەنگی بەدردا، صەحابەکان کافرێکیان بە دیل گرت، لە کاتێکا وەکو چاودێری دەسوڕانەوە، ئەمە پێش دەست پێکردنی جەنگەکە، موسڵمانەکان ووتیان: پێمان بڵێ، ژمارەی سوپای کافرەکان چەندە؟ ووتی: زۆر زۆرە ، ووتیان: باشە زۆر زۆرە ،بە ژمارە چەندە؟ ووتی نازانم، لێیانداو ئازاریان دا بێسود بوو، نەیتوانی ژمارەیەك بڵێ، کە هێنایانە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و باسەکەیان بۆ گێڕایەوە ، فەرموی: وازی لێ بێنن. ئاوی بدەنێ با پشوو بدات.

کاتێ کە حەسایەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ئادەی پیاوی باش پرسیارێکت لێ دەکەم: (كَمْ يَنْحرُوُن مِنَ الجُزُرِ؟) ئەو لە شکرەی قورەیشی کافر کە هاتون بۆ جەنگی ئێمە و تۆ لە ناویاندابوی، ئایا ڕۆژی چەند حوشتر سەردەبڕن بۆ خواردنی سوپاکەیان؟! کابرا ووتی: هەموو ڕۆژێ (دە) حوشتر سەردەبڕن.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (القَوْمُ أَلْفُ ، كُلُّ جَزُورٍ لِمِئَةٍ وَتَبِيعَها).

واتە: ژمارەی لە شکری دوژمن هەزار کەسە، چونکە هەر حوشترێك بۆ سەد کەس دانراوە!! بەم شێوەیە بەیەك پرسیاری ئاسان ژمارەی دوژمنی ئاشکرا کرد.

بەڵێ ئەمە بواری سەربازی یە. گرنگە ژمارەی هێزی دوژمن بزانێ ، بەڵام بە لێدان بێ سودە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) تێگەیشت کە ئەم سەربازە خەڵکەکەی یەکجار زۆر هاتۆتە بەرچاو، وە ژمارەی هەزارو ئەوانە نازانێ ، بەڵام ژمارە (١٠) کە

ژمارەی حەیوانە سەربڕاوەکانە بۆ خواردن باش دەزانێ، بۆیە لەوبارەوە پرسیاری لێکردو ڕێك و تەواو لە شکری کافرەکان هەزار کەس بوون!

**نموونەیەکی تر** لەسەر زیرەکی و فەهمی پێغەمبەرانی خوا (سەلامی خوا لە هەموویان بێ)، لە بواری تێگەیشتن و ڕووبەڕووبونەوەی فکری موخالیف، بە قسەیەکی بەهێز: ڕۆژێکیان، إبلیس (علیه اللعنة) دەچێت بۆ لای حەزرەتی عیسی و پێ ی دەڵێ: ئەی عیسی تۆ ناڵێ ی هەرچی خوا لە چارەتی نەنوسیبێ نابێ و هەرچی خوا مەیلی لێ نەبێ نایەتەدی؟!

حەزرەتی عیسی فەرموی: بەڵێ بەبێ گومان ، شەیطان ووتی: دەی وەرە تۆ لەو شاخەوە خۆت فڕێ بدەرە خوارەوە، ئەگەر خوا مەیلی لێ بێ بت پارێزێ — کە پێغەمبەرانی خۆی دەپارێزێ، ئەوا هیچت لێ نایەت و بە سەلامەتی ڕزگارت دەبێت. حەزرەتی عیسی فەرموی: خوای گەورە بۆی هەیە بەندەکانی خۆی تاقی بکاتەوە ، بەڵام بەندە بۆی نیە پەروەردگاری خۆی تاقی بکاتەوە!!

(سُبحانَ اللهِ) لەم فەهم و تێگەیشتنە جوانە، کە بەو چەند ووشەیە دەمکوتی ئەو دوژمنی مرۆڤایەتیەی کردو ڕێگای گومان خستنە ناو دڵی ئیماندارانی لێ قەدەغەکرد!

بواری دووەم کە پێویستە کەسانی تێگەیشتوو کاری تێدا بکەن و خزمەتی موسڵمانانی پێبکەن. تێگەیشتنە لە قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەرو (ﷺ) دانانی بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامی ، چونکە بەسەر کێڵی تێگەیشتن لە قورئان و حەدیس بۆ ئەو کەسەی شەرعی خەڵکی دەکات. زەرەری زیاترە لە قازانجی.

**زانای گەورەو ناوداری ئیسلام (إبن القیّم) دەفەرموێ:** (وَهَلْ أَوْقَعَ القَدَرِيَّةُ وَالمُرْجِئَةُ وَالخَوارِجُ وَالمُعْتَزِلَةُ وَالرَّوافِضُ وَسائِرُ طَوائِفُ أَهْلُ البِدَعِ ، هَلْ أَوْقَعَهُمْ فيما وَقَعُوا فِيهِ إلاَّ سُوءَ الفَهْمِ عَنِ اللهِ وَ رَسُولِهِ؟!). واتە: ئایا ئەوەی کە قەدەرییەکان و مورجیئەکان و خەواریج و موعتەزیلە و ڕافیزیەکان و هەموو تائیفەکانی ئەهلی

بیدعەو سەرلێشێواوی والێکرد، بکەونە ناو گومڕایی یەوە، ئایا چی پاڵی پێوەنان کە توشی ئەو سەرلێتێکچونە ببن. جگە لە خراپ تێگەیشتن لە فەرمودەکانی خواو فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

هەر لەبەر گرنگی بابەتی باش تێگەیشتنە لە دەقی ئایەت و فەرموودەکان، کە دەبینین ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەیدا (صەحیحی بوخاری) لە (کتاب العلم) دا ، بابێکی بەناونیشانی (بابُ الفَهْمِ في العِلْم) ی دیاری کردوە و یەکەم فەرمودە کە تێ ی دا تۆمار کردوە بریتی یە لە حەدیسی معاویە ، کە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) گێڕاویەتیەوە، کە فەرمویەتی: (**مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ**) رَواهُ البُخاري في العِلْم (٧١).

واتە: هەرکەسێك خوای گەورە بیەوێت چاکەی بداتێ ، لە شەریعەتی ئیسلام تێ ی دەگەیەنێ. هەروەها: رواه أحْمَدُ في مُسْنَدِهِ (ج١ ، ص٣٧٠)، وأبوداود في الطَّهارَة ، (٣٣٧-٣٣٦) وإبْنُ ماجَّة في الطَّهارَة (٥٧٢) وفي الزَّوائِد: سَنَدُهُ مُنْقَطِعٌ وَالحَديْثُ بِطُرُقِهِ حَسَنٌ.

**لە فەرمودەی جابری کوڕی عبداللە وئیبن عەبباسەوە کە فەرمویانە:**

جارێکیان لەگەڵ کۆمەڵێکدا ڕۆیشتین بۆ کارێك کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێ ی سپاردبووین، لە ڕێگادا یەکێکمان بەردێك بەسەری کەوت و سەری بریندار بوو، دوای ئەوە شەو (لەش گرانی) بەسەرداهات ئەوکەسە لەبەر برینی سەری کە نەیدەتوانی بیشوات ، ڕووی کردە هاوەڵەکانی پێ ی ووتن: (هَلْ تَجِدُونَ لِي رُخْصَةً فِي التَّيَمُمِ؟!) ئایا ئێوە هیچ زانیاریەکتان لایە کە من بۆم هەبێ خۆم نەشۆرم لەبەر ئەو برینەی سەرم و تەیەموم بکەم؟ خەڵکەکە پێیان ووت: (لا، مادُمْتَ تَقْدِرُ عَلى الماءِ، فاغْتَسَلَ فَماتَ!!).

ووتیان: نەخێر بۆت نیە تەیەمموم بکەیت ، چونکە تۆ ئاوت لەبەر دەستایە، کەواتە دەبێ خۆت بشۆری، ئەویش هەستا خۆی شت و ئاو چوە برینەکەی سەریەوەو برینەکەی پیس بوو، سەرەنجام پێ ی مرد! جا کاتێ گەڕانەوە بۆ مەدینە و چونە خزمەت پێغەمبەری خواو (ﷺ) بەسەرهاتی مردنی ئەو هاوەڵەیان بۆ کرد ، کە

چۆن و بەهۆکاری ئەو خۆشتنەوە مردوە ، بۆیان گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (قَتَلوُهُ، قَتَلَهُمُ اللهُ) کوشتیان ، خوابیانکوژێ.
پاشان فەرموی: (ألا سَألوُا إذا لَمْ يَعْلَمُوا، إنَّما شِفاءُ العَيِّ السُؤال).
ئایا بۆچی پرسیاریان نەکرد کاتێ خۆیان نەیاندەزانی، بەڕاستی دەرمانی نەزانی و سەردەرنەکردن لە وەڵامی پرسیار، تەنها پرسیار کردنە لەکەسی شارەزاو پسپۆڕ، کە لە زانستەوە وەڵام بداتەوە.
بەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو کۆمەڵە خەڵکەی کە پێیان ووت، هەردەبێ خۆت بشۆی و مەجالی تەیەمومت نیە، بە نەزان وەسفی کردن.
هەرچەندە صەحابەش بوون، وە فەرموی کوشتیان، تاوانی کوشتنی کەسێکی بێ تاوانی دایە پاڵیان. وە لە ژیانیدا دوعای شەڕی لە کەس نەکردوە، بەڵام بەو کەسانە فەرموی: قَتَلَهُمُ اللهُ، خوابیانکوژێ. چونکە بەناوی فتوای شەرعەوە، ژیانی کەسێکیان لەناوبرد.
هەرچەندە ئەوان بەحیسابی خۆیان بەبەڵگەی ڕاست فتوایان دابوو.کە وتیان، خوا لە قورئاندا فەرمویەتی: ﴿فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ النساء: ٤٣
ئەگەر ئاوتان دەست نەکەوت، ئەوجا تەیەموم بکەن.
بەڵام بە ڕاستی لە ئایەتەکەو شوێنکاری ئایەتەکەو باسی گشتی تەیەموم و مەرجەکانی و هۆکارەکانی تێنەگەیشتبون و هەر سەرکێڵ تەماشایان کردبوو، وە فتوایان پێ دابوو.
ئای لە کوردەواری خۆشماندا، چەند کەسمان هەیە، ئێستا کە پیروبوە شانازی بەوەوە دەکات کە کاتێ گەنج بوەو خۆشتنی لەسەر پێویست بوە، کە حەوزی ئاو بەستویەتی بە بەرد سەهۆڵەکەی شکاندوەو خۆی لەو سەهۆڵاوەدا شتوە!!
کە ڕەنگە زۆر جار خراپ پێ ی نەخۆش کەوتبێ، بەڵام بێ ئاگا لەوەی کە ئەمە خۆبەهیلاك بردنە بەناوی شەرعەوە ، چونکە بێ ئاگابوە لە باسی تەیەموم و ئەو

ڕوخسەتە شەرعیە گەورەی کە خوای (أرحم الراحمین) بە موسڵمانانی بەخشیوە بەشێکە لە ئاسانیەکانی ئەم ئیسلامە کە هیچ قورسی و گرانیەکی تێدانیە...

بەڵام بێ ئاگا لەوەی کە تەیەمومی بۆ هەیە.

**تەنانەت لە شەرعدا دەفەرموێ:** ئەگەر کاتێ نوێژ هات و گڵ و تۆزیشت دەست نەدەکەوت تەیەمومی پێ بکەی لەبەر ئەوەی هەموو شوێنەکە قوڕ بوو، یان نەدەگونجا تەیەموم بکەی، لەو کاتەدا هەستە نوێژەکەت لە کاتی خۆی دا بکە دوای ئەوەی دڵنیابوی کە تەیەمومیشت بۆ ناکرێ ، کە نوێژەکەت کرد. هەرچەندە لە شیشت گرانە ، هەردروستە، دواتر کە خۆت بۆ شۆرا ، دەبێ قەزای ئەو نوێژانە بکەیتەوە خۆ ئەگەر نەگەیشتە خۆشۆردن و مردی (کە مردن لە هەموو شتێ زیاتر لە مرۆڤ نزیکە) ئەوا لای خوای گەورە قەرزاری ئەو نوێژانە نیت و ئەجرو پاداشتی تەواوی خۆت بۆ نوسراوە، ئای لە ڕەحمی خواو ئاسانی ئەم دینی ئیسلامە، بەمەرجێ موسڵمان باش تێ ی بگات.

یان زۆر جار کە سەردانی نەخۆشمان کردوە، کە زەلیلی سەرجێگایەو لە جوڵەکەوتوە بەڵام بیرو هۆشی سەلامەتەو ئاگای لە خۆیەتی و بەگەنجیەتی بەساغی نوێژ پاك و ئەهلی مزگەوت بوە.

ئێستا هەموو غەموو هەمی بۆتە ئەوەی کە نوێژەکانی بۆ ناکرێت، بەڵام نازانێ ئەگەر پرسی شەرعی بکردایە توشی ئەو گرفتە نەدەبوو، وە نوێژەکانی لەدەست نەدەچوو. کە هیچ ڕێگایەك نیە بۆ نوێژنەکردن ، چونکە ئەو ئەوەندە ئاسانکاری بۆ کراوە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند جوانی فەرموو: (إنَّما شِفاءُ العَيِّ السُؤال).

**ئەوەتا شەرع دەفەرموێ،** ئەگەر کەسێ قاچی شکابوو، یان هەموو لەجوڵە کەوتبوو. ئەوە با لەلایەن کەسوکاریەوە بەئەندازەی تواناو بۆ کران و گونجان خاوێن بکرێتەوە لە پیسی و میز — کە ئەمە بۆ غەیری نوێژەکەش هەر پێویستەو پاکو خاوێنی پێویستە بۆ نەخۆش پێش هەموو شتێك بێت.

دوای خاوێن کردنەوە، ئەمجا دەست نوێژی پێ بگیرێت. (خێزانەکەی خۆی کە مەحرەمترین کەس و نزیکترین کەسیەتی دەتوانێ دەست نوێژی پێ بگرێ) چونکە لای مەزهەبی ئەبوحەنیفە دەست نوێژی ناشکێ ، بەتایبەت لە کاتێکی ئاوادا کە هیچ لەزەت و ئارەزویەکی جنسی نیە لە نێوانیاندا -.
ئیتر هەر لە شوێنی خۆی مەیجولێنەوەو نوێژ دابەستەو بەحاڵ سەری بجولێنێ بۆ ڕکوع و سوژدە و سەلام دانەوە بەسە، ئەگەر نەخۆشەکە نەیدەتوانی سەریشی بجولێنێ.
ئەوا با بە ئاماژەی چاو ئیشارەت بکات بۆ چونە ڕکوع سوژدە، وە دەتوانێ نوێژی نیوەڕۆ و عەسر بە کۆکردنەوەی (جمع) بەیەکەوە بکات، وە نوێژی مەغریب و عیشاش بەیەکەوە بکات. (ئیتر بۆچی نوێژی بفەوتێ؟!).
خۆ ئەگەر نەخۆشەکە میزو پیسای دەکردە ژێر خۆی و هەستی بەخۆی نەدەکرد. کەس نەبوو خزمەتی بکات و پاکی بکاتەوە وەکو پێویست لە کاتی نوێژەکاندا. یان کەسوکاری نەیاندەتوانی بیجولێنن. ئەوە لەو کاتەدا بابە میزو پیسایەوە نوێژ بکات. هەر کات چاك بۆوە قەزایان بکاتەوە بەپێ ی کات و بۆ کران.
خۆ ئەگەر بەو حاڵەوە مایەوەو چاك نەبۆوە تامرد. ئەوە لای خوای گەورە و بە بەزەیی ئەو عەبدە قەرزاری نوێژ نیە!
ئیتر بۆچی نوێژ نەکات و چاوەڕێ ی ئەوەبێت کە مرد(ئیسقاط) ی بۆ بکرێ و پارەی بۆ بگێڕدرێ و بدرێ بە هەژاران لە جیاتی نوێژی فەوتاوی!!
خۆزگە مامۆستایانی ئایینی بەڕێز لە جیاتی لە دوای مردنی ئیسقاطي نوێژی فەوتاوی بۆ بکەن و خەڵکی بۆ کۆبکەنەوە، لە کاتی ژیانی دا دەچونە لای نەخۆشەکەو لەگەڵ دڵدانەوەو دوعای خێر بۆکردندا، هیمەتیشیان بەرزدەکردەوە بەوەی کە پێویستە نوێژەکانی بکات و ئەم کارئاسانیەی کە شەرع فەرمویەتی

وەکو دیاری خوای گەورە بۆ نەخۆش، بۆیان شی بکردایەتەوەو ئەوسا نەخۆشەکە هەم لە ڕووی قیامەتەوە، ئەجرو پاداشتی نوێژەکانی لە دەست نەدەچوو، هەم لە ڕووی دەروونیەوە هیمەتی بەرز دەبۆوە، چونکە کە زانی نوێژی پێدەکرێ متمانەو سیقەی بە خۆی بۆ دەگەڕێتەوە...

بەڵێ شەرع هەموی ئاسان کاریە، بەمەرجێ زانا شی بکاتەوە و لە خەڵکی موسڵمانی بگەیەنێت ئەوەتا هەر لە بارەی نوێژەوە، کاتێ ئیشی دائیرەو فەرمانگەیەکت هەیە و لە کاتی نیوەڕۆدا ئشەکەت کاتی هاتوەو تا تەواو دەبێ نوێژی نیوەڕۆ نزیکی تەواوبونە (بە تایبەت لە ڕۆژگارە کورتەکاندا وەکو وەرزی پایز) وە شوێنی نوێژی لێ نیەو مزگەوتی لێ دورە.

ئالەم کاتەدا دوای بانگی نیوەڕۆ نیەتی ئەوەبێنە کە نوێژی نیوەڕۆ دەبەیتە لای عەسر، ئەوکاتە بە ئیسراحەت و ئاسودەیی کاری فەرمانگەکەشت بکەو لەگەڵ نوێژی عەسریشدا بە هێمنی و پوختی نوێژی نیوەڕۆکەشت بەکۆکردنەوەو دواخستن (جمع التأخير) بکە.

لە نەخۆشخانەدا چاودێری نەخۆشێکی و ناتوانێ هەموو کات بەجێ ی بێڵێ.

یان شوێنی دەست نوێژو نوێژکردن لە نەخۆشخانەدا، وەکو پێویست پاکو خاوێن و گونجاو نیە. ئەوە دەتوانی نوێژی نیوەڕۆو عەسر. وە مەغریب و عیشا بەکۆکردنەوە بەیەکەوە بکەیت.

یان لە مانگی ڕمەزاندا، بەهۆی نەخۆشی یەوە یان سەفەرێکی زۆر پێویستەوە کە نەکرێ نەچی بۆی ، ئەگەر بەڕۆژوو بویتایە، ڕەنگە توشی کزی چاو، یان نەخۆشی مەترسیدار ببویتایە لە تینوان و برسان، ئەوە دروستە بە ڕۆژوو نەبی و لە دوای ڕمەزان قەزای بکەیتەوە، وە خۆئەگەر کەسێك بەونەخۆشیەوە هەربەڕۆژوو بوو.

وە توشی زیانی تەندروستی بوو ،ئەندامێکی لاشەی زیانی پێگەیشت ، ئەوە هەر حەرامە بەڕۆژوو ببێت. نەك هەر خێری ناگاتێ، بەڵکو گوناهباریش دەبێت.

بەڵێ (مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهُ فِي الدِّينِ).

**ئیمانداران:** زۆرجار ئەو پرسیارە دەکرێ، ئایا جیاوازی لە نێوان مەزهەبەکانی ئایینی ئیسلامدا. وە جیاوازی بیرورِای فەقیهو شەرع ناسەکان لەسەر بابەتێکی شەرعی ، ئایا مانای ئەوەیە قورئان و حەدیسەکە یەك نیە؟!

نەخێر لە قورئان و حەدیسەکە هەر یەکە بەڵام تێگەیشتنی ئەو موجتەهیدە لە قورئان و حەدیسەکە جیاوازە لەگەڵ تێگەیشتنی موجتەهیدێکی تر لە هەمان بابەت. بۆ نموونە: جارێك پیاوێك هاتە خزمەت ئیمامی مالیك و عەرزی کرد: قوربان من بلبول فرۆشم بولبولێکم بەم پیاوە فرۆشت، کەچی بۆی هێنامەوەو دەڵێ: بولبولەکە ناخوێنێ، منیش رِقم هەڵساو سێ بەسێ تەڵاقم خواردوە کە ئەم بولبولەی من بەردەوام دەخوێنێ ، ئایا تەڵاقم کەوتوە؟!

**ئیمامی مالیك فەرموی:** بەڵێ تەڵاقەکەت کەوتوە، چونکە نەبوەو نەبیستراوە بولبول شەو و رِۆژ نەوەستێ لە خوێندن و هەر بخوێنێ!. کابرای تەڵاق خۆر رِەنگی زەرد هەڵگەرِاو لە تاوی ژنی داماوی بێ ئاگای و منداڵی سەرگەردانی و خانەو ماڵی وێرانبوی لە ژورەکەی ئیمام مالیك هاتەدەرەوە.

تەبعەن ئیمامی مالیك زاناترین کەسی ئەو سەردەمەبوە. یەکەم کەس بوە کتێبی (الموطأ) ی لە فەرمودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) نوسیوە.

بەڵام هەروەکو لە سەرەتای ووتارەکەدا ووتم: تێگەیشتن لە دین فەزڵی خوایەو جاری واهەیە دەیبەخشێ بە قوتابیەك کە مامۆستاکەی نایزانێ:

لەو کاتەدا ئیمامی شافیعی تەمەنی (١٥-١٦) ساڵان بوو، لە خزمەت ئیمامی مالیك دا فەقێ بوو. کە کابرای بەو شپرزەیی یەوە بینی پێ ی ووت: بۆچی وامەلول و غەمباری؟!

کابرا ووتی: هەرلێم گەرِێ. چاری دەردی من بە ئیمام مالیك نەکرا. ئیتر بۆچی بۆ تۆی باس بکەم. تۆیەك منالی دوێنێ ی لە چاو ئیمام مالیکدا.

**بەڵام ئیمامی شافیعی فەرموی:** ڕەنگە کەسی گرفتار زەرەرێك نەکات، ئەگەر گرفتەکەی بۆ کەسێکی تریش باس بکات. بە ئومێدی خوا بەڵکو چارەسەرێکی لابێت! کابرا باسەکەی و فتواکەی ئیمام مالیکی بۆ گێڕایەوە، ئیمامی شافیعی فەرموی: هەرچەندە من قسەم نیە لەسەر قسەی مامۆستاکەم بەڵام وای تیٚ دەگەم کە ئەو تەڵاقەنەکەوتوە!

کابرا وەکو گوڵێکی سیس بوو کەئاوی، ژێر دەکریٚ ئاوا دەم وچاوی گەشایەوە. چوەوە بۆ خزمەت ئیمام مالیك و قسەکەی ئیمامی شافیعی بۆ باس کرد، ئیمام مالیك فەرموی: بڕۆ ئەو کەسەم بۆ بانگ بکە. بابزانین بەڵگەی چی یە؟!

ئەمەیە نیشانەی زانای بە تەواوی مانا زاناو پڕ علیم ، نەیفەرموو بائەو منالٚ کارە بۆخۆی هەربلێٚ.

چەند سالٚی تر بابیٚ وانەی شەرعی پیٚ بلێم ئەمجا قسە لە شەرعدا بکات. نەخێر بەڵکو فەرموی: بانگی بکەو با گویٚ لە بەڵگەی بگرین کاتیٚ بانگی کرد. سەیری کرد محمدی کوڕی إدریسی شافیعی یە کە قوتابی و فەقیٚ ی خۆیەتی.

**ئیمام مالیك فەرموی:** ڕۆڵەگیان محمد بەڵگەت چی یە لەسەر ئەوەی کە تەڵاقی ئەم پیاوە نەکەوتوە؟! ئیمامی شافیعی فەرموی: مامۆستای گەورەمان دوو سیٚ ڕۆژ لەمەوبەر من لە خزمەت جەنابتدا ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خوام خوێند کە دەفەرمویٚ: فاطمە ی کچی قەیس هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا هاتومە خزمەتت تا پرس و ڕاوێژێکت پیٚ بکەم ، دووپیاو هاتونەتە خوازبێنیم کە (ئەبوجەهم و معاویە)ن.

ئایا شوو بەکامیان بکەم؟! پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (**أَمَّا مَعاوِيَةَ فَصَعْلُوكٌ لا مالَ لَهُ ، وَأَمَّا أَبُوجَهْم فَرَجُلٌ لايَضَعُ عَصَاهُ عَنْ عاتِقِهِ ، وَلَكِنْ أَنْكِحِي أُسامَةَ**) رَواهُ مُسْلِم (١٤٨٠) كِتابُ الطَّلاقِ.

واتە: معاویە پیاوێكی لات و نەدارو بێ ماڵە و ژنی پێ بەخێو ناكرێ، ئەبو جەهمیش پیاوێكە گۆچانەكەی و گۆپاڵەكەی لەسەر شانی لا نابات واتە: پیاوێكی تورەیەو هەر ڕقی هەڵسا گۆچانێكت پێ دەكێشێ. بەڵام وەرە شو بە ئوسامە بكە).

**ئیمامی شافیعی فەرموی:** قوربان، ئەی ئیمام مالیك ئەگەر بەوردی سەرنجی فەرمودەكەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدەین، كاتێ فەرموی: ئەبوجەهم گۆچان و گۆپاڵەكەی لەسەر شانی لا نابات.

دیارە پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەبەستی ئەوەبووە كە زۆربەی كات ئاوایە و ئەوە حاڵیەتی، ئەینا خۆ مانای ئەوەنیە كە شەوو ڕۆژ ئەم گۆچانەی لەسەر شان بێت! دەی ئەم پیاوەش مەبەستی ئەوە نەبوە كە بولبولەكەی هەرگیز لە خوێندن ناكەوێ، بەڵكو مەبەستی ئەوەبوە كە زوربەی كات دەخوێنێ و خوێندنەكەی زۆرترە لە بێدەنگ بونەكەی!!

ئیمامی مالیك ماوەیەك بێ دەنگ بوو پاشان سەری هەڵبڕی و ئافەرینی لە ئیمامی شافیعی كردو دوعای بەخێری بۆ كرد و ڕوی كردە كابراو فەرموی: بە ڕاستی ئەم كوڕە لاوە باشتر لەمن لەم مەسەلەیە تێگەیشت و قسە قسەی ئەوەو تەڵاقەكەت نەكەوتوە.

بە داخەوە لەم سەردەمەشدا زۆرجار بەهۆی باش تێنەگەیشتن لە دەقەكانی قورئان و فەرمودە، تەڵاق دەخرێ و ماڵ وێران دەكرێ و منداڵ سەرگەردان دەكرێ.

بۆیە خەڵكی پێویستە بۆ مەسەلەی تەڵاق بچنە لای زانایانی شەرع ناس لە لیژنە فتواكان و نەچنە لای هەموو بەناو خوێندەوارێك!

**نمونەیەكی تر** لەسەر مەسەلەی فەهم و تێگەیشتنی جوان و دروست، لەسەردەمی پێشەوا (ئەبو حەنیفە)دا، كابرایەك لەگەڵ ژنەكەی بوو بە دەمەقاڵێیان لەسەر عیبادەت و خواپەرستی كابرا تەڵاقی خوارد كە دەبێ عیبادەتێك بكات بۆ خوای

گەورە، کە هیچ کەس لەم سەرزەویەدا لەو کاتەدا ئەو عیبادەتەی نەکردبێت! کابرا قسەکەی لەدەم دەرچوو پەنجەی خۆی گەست کە چ هەڵەیەکی گەورەی کرد. خۆ هەر عیبادەتێك بکات ، لەم سەرزەویەدا یەکێ ئەم عیبادەتە لەو کاتەدا هەر دەکات! بۆیە تەواوی عالم و زانایانی شەرع گەڕا، هەموویان ووتیان: تەڵاقەکەت کەوتوە، چونکە هەر عیبادەتێ بکەی لەو ملێونەها خەڵکەی سەرزەوی ، ئیحتیماله و ڕێ ی تێدەچێ کە لەو کاتەدا کەسێکی تریش هەمان عیبادەتی کردبێ!

بەڵام کاتێ ئەم پیاوە گەیشتە خزمەت ئیمام أبو حەنیفە، فەرموی: تەڵاقەکەت ناکەوێ ، بەو مەرجەی بڕۆیتە لای کەعبەوە لەوکاتەدا کە کەسی لێ نیە — کە ئەو کات دیارە دەوری کەعبەی پیرۆز لە شەوان و نیوەی شەواندا چۆڵ بوەو وەکو ئێستا نەبوە — بڕۆ لەو کاتەدا کە کەس تەواف ناکات تۆ تەوافی کەعبە بکە، ئیتر تەڵاقەکەت ناکەوێ، چونکە عیبادەتێکت ئەنجام داوە کە کەس لەوکاتەدا نەیکردوە!

ئا ئەمەیە فەهم و تێگەیشتن لە دین (مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهُ فِي الدِّينِ).

**بەڵێ ووتمان:** هەندێ جار دەقێکی شەرعی نیە لەسەر ئەو مەسەلەیە کە گرفتی کەسێکەو پرسیاری لە بارەوە دەکات، بەڵام زانای تێگەیشتوو چارەسەری بۆ دەدۆزێتەوە، چارەسەرێکی وا جوان و گونجاو کە بەسەدان زانا کە فەهمی وا دروستیان نیە نا دۆزرێنەوە.

**بۆ نموونە:** کەسێك دەچێتە خزمەت ئیمام ئەبو حەنیفە و دەڵێ: ئەی پێشەوای موسڵمانان من لە شوێنێکدا پارەیەکم شاردۆتەوە، کەچی ئێستا کە ماوەیەکی بەسەردا ڕۆیشتوە شوێنەکەیم لێ بزربوەو نایەتەوە یادم ، هەرچی پارەو سامانیشم هەبوو ئەوەندەبوو. بە حیسابی خۆم لەبەر دزی و فەوتان شاردمەوە کەچی نەمزانی

خۆم لەناوی دەبەم. تکایە چارەیەکم بکە. ئیمام ئەبو حەنیفە فەرموی: ئەمە بابەتێکی فیقهی نیە تا من شتێکت بۆ بدۆزمەوە.

بەڵام برۆ ئەمشەو هەتا بەیانی شەو نوێژ بکە. (إن شاء الله) دێتەوە یادت.

کابرا هەر شەوی لیّ هات چوە سەربەرماڵ و دەستی بەشەو نوێژ کرد. ئەوەبوو کەمتر لە چارەکێکی شەو تێپەڕی کرد. شوێنی پارەکەی هاتەوە یاد. کە ڕۆژبوەوە هاتەوە خزمەتی ئەبو حەنیفە و هەواڵەکەی دایە.

**ئیمام فەرموی:** هەر زانیم شەیطان لێت ناگەڕێ تا بەیانی شەو نوێژ بکەیت خێرا شوێنەکەت بیردێنێتەوە. بەڵام دەبوایە وەکو شوکرانە بژێری خوا شەوەکەی تا بەیانی بە ئاگابویتایەو بەشەونوێژ بەسەرت ببردایە!

**لە کۆتایی ئەم بەشەدا لەم زنجیرە باسە ، ئەوە دەڵێم:**

١- ئیسلام عەقڵی مرۆڤ دەکاتەوە، نەك دایبخات و دۆگمای بکات، بۆیە ڕێزی تایبەت لەو کەسانە دەگرێ کە فەهمیان هەیە بۆ تێگەیشتن لە بابەتەکان، تەنانەت خوای گەورە ئەوەندە ڕێزی زانیاری و گەڕان بە دوای دۆزینەوەی نوێ ی سودبەخشدا ، گرتوە لە شەرعدا — سەگی خاوەن بەهرەو زانیاری (کلب معلم) گڵاونیە.

٢- شەریعەتی ئیسلامی هەرگیز کۆن نابێت و بۆ هەموو دەردێك دەرمانێکی هەیە، بەڵام بەمەرجێ صەیدەلانیەکی شارەزا هەبێ، بۆیە ئیمامی شافیعی مەزهەبی کۆن و تازەی هەیە بەپێ ی سەردەم. چونکە خەڵك، جۆری ژیان، سنوری جوگرافیا، زەمان و زەمینێك لەگەڵ زەمان و زەمینێکی تر حوکمە شەرعیەکان دەگۆڕن، ئەوانەی کە نەصێکی قەطعی قورئان یان فەرمودەیەکی صەحیحی وایان لەبارەوە نەهاتبێ کە قابیلی تەئویل و قسە لەسەر کردن نەبێ. تا بەشی دووەمی ئەم بابەتە بەخوای گەورەتان دەسپێرم، کە سپاردە زایە ناکات.

# سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز.

٢- تەفسیری ئاسان ، بورهان محمد أمین.

٣- چیرۆکی زیرەکان حبیب محمد سەعید ، ل٦ ، ل,٤٩

٤- الخُطَب المِنْبَرِيَّة ، الشَّيخ محمد حَسَّان ، ج٤ ، ص٣٠.

# ووتاری سێ یەم
# بۆ مانگی ڕەجەب
# تێگەیشتن — الفهم
## بەشی دووەم

لحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أجمعين.
**ئیمانداران:** ووتاری ڕابردوو باسی ئەوەمان کرد، کە زانست لەگەڵ تێگەیشتن جیاوازە. تێگەیشتن لە دەقەکان زۆر گرنگە.

**خوای گەورە فەرمووی:** (فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ ) ئەم تێگەیشتنە وردو دروستە جاری واهەیە کوڕ دەیبێ و باوك نایبێت، مامۆستا نایبێت و قوتابی یەکەی دەیبێت. ئەمڕۆش بە پشتیوانی خوای گەورە هەندێکی تر لەو باسە شی دەکەینەوە تێگەیشتنی وردو دروستی پێغەمبەرانی خوا (سەلات و سەلامی خوا لە هەمویان بێت).
**بۆ نموونە:**
**حەزرەتی سولەیمان پیاوێك دەچێتە خزمەتی و دەڵێ:**
دراوسێکانم قازەکانم دەدزن، ناشزانم کامیانن، بەڵام دڵنیام یەکێکە لە دراوسێکانم، تکایە ئەی سولەیمان تۆ کە گەورەو فەرمانڕەوامانی چارەیەکم بکە. حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: تۆ بڕۆ من کارێك دەکەم ، ڕۆژێکیان حەزرەتی سولەیمان بڕیاری دا کە دانیشتوانی ئەو گەڕەکە ، کە پیاوە شکات کارەی لێ دادەنیشێ هەمویان لە شوێنێك کۆببنەوە، کاتێ هەموو خەڵکەکە کۆبونەوە.
**حەزرەتی سولەیمان فەرمووی:** هی واهەیە لەناو ئێوەدا قازی دراوسێکەی دەدزێت و پاشان دێت بۆ ناو کۆڕو کۆبونەوەی ئاواو هێشتاش پەڕی قازەکە وابەسەریەوە! لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا پیاوێك بەئاسپای دەستی برد بۆسەری (بەو نیازەی کە پەڕە قازەکە لابەرێت، یان بزانێ ڕاستە پەڕی قازەکە بەسەریەوەتی) حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: ئەو پیاوەم بۆ بانگ بکەن! بەڵێ بردیە ژووری خۆی و فەرمووی: دڵنیام تۆ قازی ماڵی فلان کەس دەدزی، ئەویش ناچار دانی نا بەتاوانەکەدا و بەم تێگەیشتنە وردو سەرنج ڕاکێشە، ئەو دزیەی ئاشکرا کرد. ئەبێ ئەوەی لێدان و بەندکردن و توندوتیژی بەکار بهێنێ.

**ئیمانداران:** زۆر جار بەعیلم و بەڵگەی زانستی ڕووت ناتوانی قەناعـەت بەکەسـی بەرامبەرت بکەی کە ئەوکارە خراپەو تاوانـە. بـەڵام بەڕێگـەی تێگەیشـتن قسـەی لەگەڵ بکەی دەتوانی قەناعەتی پێ بکەی کە ئەو کارە خراپەو ناپەسەندە.

**بۆ نموونە:** گەنجێك دێتە خزمەت سـەرداری پێغەمبـەران حـەزرەتی محمـد (ﷺ) ، لەبەر دەمیا دادەنیشێ و بە دەنگێکی بەرز کە هەموو ئەو کەسانەی لـە خزمـەت پێغەمبەردان گوێیان لێ یەتی ، هاوار دەکات ئەی پێغەمبەری خوا مـن دەمـەوێ زینا بکەم. ئایا ڕێگەم پێدەدەی؟! پێغەمبەری خـوا (ﷺ) نەچـوو بـەعیلم باسـی ئایەتەکانی قورئانی بۆ بکات کە باس لە قەدەغـەکرانی زینـا دەکـەن یـان باسـی زەرەری جەستەیی و لەناوچونی لاشە بەهۆی زیناوەی بۆ بکات، چونکە ئەم قسـانە کاریگەری لەسەر ئەو گەنجە دروست ناکات. بەڵکو لە ناخی گەنجە کـە تێگەیشـت بۆیە فەرموی: ئایا ڕازی زینا لەگەڵ دایکت بکرێ؟ ووتـی:نـەخێر.کـێ دەتـوانێ و جورئەتی ئەوە دەکات لە دایکم نزیك ببێتـەوە! ڕەنگـی سـور هەڵگـەڕاو غیرەتـی جوڵا. پێغەمبەری خوا (ﷺ) زانی ئەم گەنجە غیرەتی شەرەفی هەیە، هەر بۆیە لەم ڕێگایەوە بۆ نەصیحەت بەئاگا هێنانەوەی چوو. بۆیە بەردەوام بـوو لەسـەر بـەئاگا هێنانەوەی فیگـرەت و دەرونـی پـاکی کـە بـەئارەزوی زۆری جنسـی داپۆشـرابوو، بەرچاوی تاریك کردبوو. هەر بۆیـە ئـەمجارەیان فـەرموی: ئـەی ڕازی دەبێـت زینـا لەگەڵ خوشکت بکرێ؟! لەگەڵ پورت بکرێ؟!...

هەموو جارێ کوڕە گەنجەکە بە حەماسەتەوە دەیگوت: نەخێر ئەی پێغەمبـەری خوا (ﷺ) هەرگیز شتی وا قبـوڵ نـاکرێ. ئـیتر گەنجەکـە بەئاگاهاتـەوە، ئـا لەوێـدا **پێغەمبەری خوا** (ﷺ) **فەرموی:** دەی خەڵکیش بۆ دایك و خوشك و پوری خۆیان ئاوان و ڕازی نابن زینایان لەگەڵ بکرێ ، دەی کوڕی گەنج خـۆ ئـەو ئافرەتـەی تـۆ دەتەوێ زینای لەگەڵ بکەی هەر دایك و خوشك و پـوری خەڵکـە! ئاهـا تـۆ چـەند ناڕەحەت دەبی، ئەوانیش ئاوا نیگەران دەبن و قبوڵی ناکەن. ئالەوێدا گەنجەکـە بـە تەواوی بەئاگاهاتەوەو ووتی: ئەی پێغەمبەری خـوا (ﷺ) دەی توخـوا دوعـام بـۆ بکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی خستەسەر سینەی گەنجەکە.

بەڵێ ئیسلام دەست بەسەر سنگی گەنجاندا دێنێ کاتێ خەریکـە لارێ دەبـن. نـەك دارو شەلاق لەسینە یان بدات - پێغەمبەری خوا (ﷺ) فـەرموی: خـوای گـەورەو میهرەبان ، داوات لێ دەکەم دڵی ئەم گەنجـە خـاوێن بکەیتـەوە، وە داوێنـی پـاك ڕابگرێ و هەرگیز توشی زینا نەبێت. وە جێگەی بەهەشت بێت.

(سُبحانَ الله) **ئەم گەنجە دەڵێ:** سوێند بەخوا هەرکە لە خزمەت پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هەڵسام، دڵم بە تەواوی لەو خەیاڵ و خەتـەرە خراپانـە پـاك بـۆوە، وە لـە هەموو شتێ زیاتر ڕقم لە زیناو داوێن پیسی یە!

بەڵێ ئیمانـداران: ئەگـەر پێغەمبـەری خـوا هـەموو قورئانیشـی بـۆ ئـەم گەنجـە بخوێندایەتەوە سودی نەدەبوو. بەڵام بەم ڕێگایە کاری لێ کردو بەئاگای هێنایەوە.

**بەڵام** ئەبێ بزانین، ئەگەر هەمان پرسیار: (ئایا قبوڵ دەکـەی زینـا لەگـەڵ دایـك و خوشکت بکرێ) لە کەسێکی وای بکەی کە غیرەت و مەردایـەتی نـەمابێ ، ئایـا سودی هەیە؟! بێبێگومان نەخێر، هەروەکو بانگخواز (عـەمرو خالیـد) دەفـەرموێ: جارێکیان لە فڕۆکەدا گەنجێك لە تەنیشتمەوە بوو. کتێبێکی بەدەسـتەوەبوو باسـی شێوازی زیناکردن و داوێـن پیسـی دەکـرد. منـیش دوای گفتوگـۆ و قسـەو بـاس لەگەڵی ، بەحیسـابی خـۆم وویسـتم وەکـو شـێوازەکەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) قەناعەتی پێ بکەم کە زینا چەند قێزەونە چۆن مرۆڤ پێ ی قبـوڵ نـاکرێ ، بۆیـە پرسیم لێی ئایا قبوڵی دەکەی کە کەسێك بێت و زینا لەگەڵ دایکت یـان خوشـکت دا بکات؟! بۆچی قبوڵی ناکەم !!!

**کەواتە:** ئەم کە غیرەت و پیاوەتی و شەهامەتی مردوە ، ئیتر ئەم پیـاوە پرسـیارە مردوو بە ئاگاناهێنێتەوە! **کەواتە:** (كَلِّمِ النَّاس عَلى قَدَرِ عُقُولِهِم). هەر بۆیە گەلێ جار بوە کە ووتاری ڕۆژانی هەینی سەرمینبەر، هەرچەندە زانستی بوە، بە ناوەڕۆك بوە، بەڵام چونکە ووتار بێژەکە تێگەیشتنی وردو دروستی بۆ ئـەو ڕۆژە نـەبوە کـە قسەکەی تێدا دەکات یان نەگونجاوە لەگەڵ سنوری جوگرافیاکە ، یان زانستی گوێگرەکان، ئەوە ووتارێکی بێ سود بوە بۆ ئەو کەسانەی کە گوێیان بۆ گرتوە.

تێگەیشـــتنی هـــاوەڵانی پێغەمبـــەری (ﷺ) هـــاوەڵانی خۆشەویســـت (ﷺ) تێگەیشتنی زۆر جوانیان هەبووە بۆ مەسەلەکان ، بـۆ نموونـە: أبـوبکری صـدیق ، کاتێ کە لەسەفەری هیجرەتدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بەرەو مەدینـە دەڕۆیشتن، توشی هەرکەسێ ببونایە کە أبوبکری بناسـیایە ، دەیپرسـی: ئەبوبـەکر ئەمە کێ یە لە گەڵتا؟! — چونکە حەزرەتی أبوبکر بـە هـۆی بازرگانیـەوە زۆرتـر چوبوە دەرەوە ، خەڵکی زیـاتر دەیناسـی وەك لـە پێغەمبـەری خـوا - حـەزرەتی أبوبکریش کە نەیدەویست کـەس پێـان بزانـێ و دەنـگ و باسـیان ئاشـکرا بـبێ. لەوەڵامی پرسیارکاردا دەیفەرموو: (هَذا هادٍ يَهْدِينِي السَّبِيل) ئەمە کە هاوەڵمە ڕێ نیشاندەرو ڕێگام نیشـان دەداو ڕێنمـایم دەکـات!. مەبەسـتی ئـەوەبوو کـە ئەمـە پێغەمبەری خوایەو ڕێگای بەهەشت و بەختەوەری دونیاو وقیامەتم نیشان دەدات و ڕێنمایی و چاوساغیم دەکات. کابراش وای دەزانی مەبەستی لە شارەزای ڕێگایـەو دەیەوێت لە بیاباندا ڕێگای نیشان بدات و شارەزای ڕێگا پێدا ڕۆیشتنە.

**نمونەیەکی تر لەسەر فەهم و تێگەیشتنی حەزرەتی أبوبکر ئەوەیە:**

کـاتێ کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لەژورەکـەی خۆیـدا و لـە کـاتی نەخۆشـی سەرەمەرگدا و لەو کاتەدا أبـوبکر پـێش نوێـژی بـۆ خەڵکەکـە دەکـرد، فـەرموی **(إنَّ اللهَ خَيَّرَ عَبْداً بَيْنَ الدُّنيا وَبَيْنَ ما عِنْدَهُ فَاخْتَارَ ذالِكَ العَبْـدُ مَـا عِنْـدَاللهِ عَزَّوَجَلَّ)**. واتە: بەڕاستی خوای گەورە بەندەیەکی خۆی سەرپشـك کـرد لـە نێـوان دونیاو چونە خزمەتی پەروەردگاردا. ئـەو بەندەیـەش ئـەوەی لای خـوای گـەورەی هەڵبژارد.

حەزرەتی أبوبکر کەئەمەی بیست دەستی کرد بـە گریـان. فـەرموی: ئـەو عەبـدە پێغەمبەری خوا خۆیەتی و جێمان دێڵێ و دەگەڕێتەوە خزمەت پەروەردگاری.

فِعْلاً باشی تێگەیشت و هەربەو نەخۆشیەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەفاتی کرد.

تێگەیشتن و فەهمی وردو دروستی پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو طالب:

شـێخ محمـود المصری لـە (أَصْـحابُ الرَّسُـول)ە کەیـدا لـە لاپـەڕە (٢٠٤)دا بەسەرهاتێکی زۆر سەرنج ڕاکێش بـاس دەکـات، کـە دەفـەرموێ، لـە کتێبـی —

(الرِّياضُ النَظِرَة في مَناقِب العَشَرَة) ي (الُمحِــبِّ الطَبَــري) (ج٣،ص١٦٩) وەری گرتوە.

دەفەرموێ: حەزرەتی عەلی بەڕاستی خاوەن فەهم و تێگەیشتنێکی سەرسوڕهێنەر بوو. ئەوەتا لە چەند کێشەو گرفتێکدا حوکمی داوە کە مرۆڤ سەری سوڕدەمێنێ بۆ ئەو بڕیارە بەجێ و سەرسوڕهێنەرەی.

**بۆ نموونە:** لە شاری کوفەدا بیرێك کە ئاوێکی زۆری تێدا دەبێت. ڕۆژێکیان شێرێك کە دیارە لە دەشتەوە تینویەتی زۆری بۆ هێناوە و هاتۆتە سەربیرەکەو لە تاوی تینویەتی سەری خۆی خستۆتە بیرەکەوە و دەمی نەگەیشتۆتە ئاوەکە و هەر سەری بردۆتە خوارەوە ، هەتاوەکو کەوتۆتە ناوەوە کاتێ خەڵکی پێ دەزانن کەوا شێرێك وا لەو بیرەدایەو دەنەڕێنێ ، وەکو شتێکی سەرسوڕهێنەر ، خەڵکێکی زۆر زۆر لێ ی کۆدەبنەوە ، لە ئەنجامی پاڵە پەستۆی خەڵکەکەدا، یەکێك لە ئامادەبوان قاچی دەترازێ و دەکەوێتە بیرەکەوە. لە ترسی کەوتنە ناو بیرەکەوە، پەلاماری قاچی کەسێکی تر دەدات و لەگەڵ خۆی ڕای دەکێشێتە بیرەکەوە ئەوەی دووەمیش پەلاماری کەسێکی تر دەدات و لە گەڵیان دەڕواتە خوارەوە، کەسی سێ یەمیش بەهەمان شێوە لە تاوی خۆی پەلاماری کەسێك دەدات و قاچی دەگرێ و دەیخاتە بیرەکەوە، خەڵکەکە کە هەموو لە ترسان ڕادەکەن و کەسی چوارەم ناتوانێ کەس بگرێ و بەم شێوەیە ئەم چوارکەسە دەکەونە ناو بیرەکەوەو بەهۆی شێرەکەوە کە ئەویش لە ترسی گیانی خۆی کە وا دەزانێ بۆ ئەو هاتونەتە ناو بیرەکەوە و ئەو دەنگ و هەرایە دەبیستێ ، لەناو بیرەکەدا دەیانخنکێنێ و هەرچواریان لەناو دەچن! کەس و کاری ئەو چوار کەسە لە دادگای شەرعدا سکاڵا تۆمار دەکەن لەسەر ئەو کەسانەی کەلەو کاتەدا لە دەرەوەی بیرەکە بوون و ئەو پاڵە پەستۆیەیان دروست کردوەو بونە هۆی کەوتنە خوارەوەی کەسەکانیان بۆ ناو بیرەکە و لەناوچونیان. دیارە خوێنی کەسێکیش کە بەو شێوەیە لەناو بچێ سەد حوشترەو دەبێ بەهەموو خەڵکەکە بیدەن.

هەریەکە لە چوار بنەماڵەش داوای سەد حوشتر دەکەن.

چونکە کەسێکیان لەدەست داوە ، خەڵکەکەش دەڵێن، ئێمە ئەگەر وابێ دەبێ چوارسەد حوشتر بدەین بۆ چوار مردوەکەو ئەمەشمان پێ نادرێ خۆ هەریەك کەسی یەکەمیان بە هۆی پاڵە پەستۆی ئێمەوە کەوتۆتە خوارەوە ، ئەوانی تر خەتای ئێمەی تێدانەبوو.

ئەم کێشەیە چارەسەری نابێت تاوەکو دەگەنە خزمەت ئیمامی عەلی (شاری زانست و زانیاری و فەهم و تێگەیشتن) ئیمامی عەلی دوای گوێ گرتن و حاڵی بونی تەواو لە کێشەکە دەفەرموێ:

تەنها دووسەد و پەنجا حوشتر دەدرێ و ئەو دووسەدوو پەنجا حوشترەیش دەبێ هەر کەسێك لەو کاتەدا لەو جێگایە ئامادە بوبێ بەشداربێ لە کۆکردنەوەی ئەو خوێنەدا کە (٢٥٠) حوشترەکەیە. چونکە هۆکاری لەناوچونەکە بوە ، وە ئەو (٢٥٠) حوشترەشی بەم شێوەیە بەسەر میراتگرانی ئەو چوار کەسەدا دابەش کرد: یەکەم کەس کە کەوتە بیرەکەوە (٢٥) حوشتری بۆ دادەنرێ ، دووەم کەس کە کەوتە خوارەوە (٥٠) حوشتری بۆ دادەنرێ ، بۆ کەسی سێ یەم (٧٥) حوشتر و کەسی چوارەمیش(١٠٠) حوشتری تەواو!هەموو خەڵکەکە بە سەرسوڕمانەوە دەپرسن: قوربان بەچ شێوەیەك ئەمەت بڕیاردا ؟! فەرموی: مردوی یەکەم (٢٥) حوشتری بۆ دانرا، کە دەبوایە خوێنی تەواو کە (١٠٠) حوشترە بەهای بوایە.

بەڵام ئەم کە خۆی کەوتە ناوەوە هۆکاریش بوو بۆ کەوتنە خوارەوەی (سێ) کەسی تریش بە خۆیەوە. کەواتە سێ یەکی خوێنەکەی کە (٧٥) حوشترە لێ کەم بۆوە و تەنها (٢٥) حوشتری خوێن دەدرێ بەکەسوکاری! دووەم کەسیش چونکە دووکەسی تری لەگەڵ خۆی فەوتاندوە.

دەبێ نیوەی خوێنەکەی کە (٥٠) حوشترە لێ کەم بکرێتەوەو تەنها (٥٠) حوشتر وەکو خوێنەکەی دەدرێ بە کەسوکاری میراتگری. کەسی سێ یەمیش چونکە کەسێکی لەگەڵ خۆی بردۆتە ناو بیرەکەوەو فەوتاندوە(٢٥) حوشتری لێ کەم دەکرێتەوەو(٧٥) حوشتر وەردەگرێ.کەسی چوارەمیش کە کەسی لەگەڵ خۆی ڕانەکێشاوە تەواوی حوشترەکە وەردەگرێ. چونکە تاوانی کەسی تری لە ئەستۆدا

نیە. بەم شێوەیە لە جیاتی (٤٠٠) حوشتر (٢٥٠) حوشتری داناو مـافی هـەموانی داو خەڵکەکەش پارەی (٢٥٠) حوشترەکەیان کۆکردەوە. بە شێوەیە ئەم تێگەیشتنە وردەی ئیمامی عەلی ئەو کێشەیەی چارەسەرکرد.
(مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهُ فِي الدِّينِ).

**جارێکیان پرسیاریان لە عەبباسی مامی پێغەمبەر (ﷺ) کرد:**

ئایا تۆ گەورەتری یان (ﷺ) مەبەستیان تەمەن و ساڵ بوو؟ فەرموی: ئەو لە مـن گەورەترە، بەڵام من لە پێش ئەوەوە لە دایك بووم!!

سەرنجی ئەو فەهمە جوانە بکەن ، ڕاستیەکەشی بە پرسیارکار گەیانـدو ئەدەبیشـی نواند لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ).

**ئیمانداران:** فـەهم و تێگەیشـتن هـەروەکو بـۆ چارەسـەری کێشـە بـەکاردێت، بـۆ تێگەیشتن لە مەبەست مەرامی خەڵکی فێڵبازیش زۆر گرنگە.

بۆ نموونە: پیاوێك دێتە لای دەرگاوانەکەی موعاویەو پێ ی دەڵێ: بە خەلیفە بڵـێ، برایەکی دایك و باوکیت لە دەرگادا وەستاوە، کـابرای دەرگـاوان کـە چـوە ژورەوەو پەیامەکەی گەیاند، معاویە ووتی: نایناسم، بـەڵام بـا بێتـەوە ژورەوە، کـە هاتـە ژورەوە معاویە نەیدەناسی، ووتی: ئادەی بزانم من و تۆ چۆن برایەکین؟

کابرا ووتی: براین لە ئادەم و حەواوە! معاویە فـەرمانی دا دیرهـەمێکی بـدەنێ ، پارەیەکی زۆر کەم! کابرا ووتی:

برایەکی دایك و باوکیت هاتوە بۆ لات کەچـی دیرهـەمێکی دەدەیتـێ؟!! معاویـە ووتی: ئاخر ئەگەر هەرچی برای دایك و باوکیم لە ئادەم و حەواوە هەن یەکی دیرهەمێکیان بدەمێ. تۆ ئەمەشـت بەرناکـەوێ!! بـەم تێگەیشـتنە جوانـە، جوانترین وەڵامی قسەبڕی دایەوەو خۆی لەو تەماعکارە ڕزگارکرد.

هەر لەسەر ئەو باسە دەگێڕنەوە کە کابرایەکی گاوری خۆبە شارەزاو بلیمـەت زان ، لە شێخ (محمد عبدەی) پرسی: ئێوەی موسڵمان دەڵێن:

هەموو شتێ لە قورئاندا هەیە، باشە لە قورئاندا هەیە کە فەردەیەك ئارد چەند نانی تێدا دەبێت؟!! شێخ محمد عبدە فەرموی: بەڵێ هەیە.

بەڵام بەیانی وەڵامت دەدەمەوە! بۆ بەیانی شێخ محمد عبدە بە کابرای گاوری ووت: فەردەیەك ئارد ئەوەندەی نان تیادا دەبێ – ژمارەیەکی گوت گاورەکە ووتی: جا کوا ئەوە لە کام ئایەتی قورئاندا هەیە؟!

شێخ محمد عبدە فەرموی: ئاخر قورئان دەفەرموێ: ﴿ فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ النحل: ٤٣

منیش لە ژێر ڕوناکی ئەم ئایەتەدا پسپۆڕی بواری نان و ئاردم دۆزیەوە کە نانەواکەیەو چوم بۆ لای و پرسیارم لێکرد. ئەویش ووتی: ئەوەندە نانەی تێدا دەبێ و وا وەڵامەکەم دایەوە بە تۆ.

**کەواتە:** قورئان فێری کردم کە بچمە لای نانەواو نەچمە لای قەصابێك.

**کەواتە:** ئەمە لە قورئاندا هەیە!! کابرای گاور دەمی بوو بەتەڵەی تەقیوو!

بەڕاستی ئەمرۆش زۆر پێویسیمان بەو کەسانە هەیە کە ئاوا فەهمیان هەبێ لە قورئان و فەرمودەو عەقڵێکی کراوەیان هەبێ ، ئەمجا بچنە موناقەشەی کەسانی بێ دین لەسەر تەلەفیزیۆن و دەزگاکانی ڕاگەیاندن.

چونکە هەرچەندە عیلمت پێ بێ ، بەڵام فەهمت نەبێ لە دین دا ، لەبەر پەرچ دانەوەی بێ دینساندا سەرکەوتوو نابی.

**ئیماندارانی بەڕێز:** بابەتێکی ڕۆژانەی ئەمڕۆ لەسەر فەهم و تێگەیشتن لە ئیسلام کە پێویستە قسەی لەسەر بکەین ئەوەیە، کە زۆر جار ئەو پرسیارە دەکرێت: ئێمە بۆچی عیبادەت دەکەین؟خۆ مەعلومەو بەڵگە نەویستە کە خوای گەورە هیچ پێویستی بە عیبادەت و خواپەرستی ئێمە نیە.

بەڵکو هەموی بۆ بەرژەوەندی خۆمانە. کەواتە نابێ ئیسلامەتی و دینداری قورسی و گرانیەکی وای تێدابێ کە مرۆڤ لە جیاتی ئاسودەبون، توشی بێزار بوون بکات،

که له ڕاستی دا ئیسلامەتی قورس نیەو زۆریش ئاسانکاریە، بەلاّم ئەگەر تێ ی نەگەی قورس دەبێ و دەبێتە زەحمەت لە جیاتی ڕەحمەت ، چونکە لە خۆتی قورس دەکەی.

لە صەحیحی مسلم دا هاتوە، هاوەڵی بەڕێز (ئەبی هورەیرە) دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتاری بۆ خوێندنەوە، فەرموی: ئەی خەڵکینە، خوای گەورە حەجی لەسەر فەرز کردون،

کەواتە: حەجی ماڵی خوا بکەن. یەکسەر کابرایەك هەڵساو ووتی: (أَكُلَّ عامٍ يارَسُول اللهِ) ئایا ئەو حەجە دەبێ هەموو ساڵێ بیکەین ، ئایا دەبێ هەموو ساڵێ بچین بۆ حەج؟! پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێدەنگ بوو، وەلاّمی کابرای نەدایەوە.

هەتا سێ جار ئەو پیاوە هەمان پرسیاری کردەوە: (أَكُلَّ عامٍ يارَسُول اللهِ).

**ئەمجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (لَوْ قُلْتُ نَعَمْ لَوَجَبَتْ ، وَلَما آسْتَطَعْتُم)** ئەگەر بموتایە بەڵێ ، ئەوا لەسەرتان واجب دەبوو کە هەموو ساڵێ هەموو موسڵمانێ بچێ بۆ حەج (نەك لە تەمەندا یەك جار) وە بێگومان ئەوکاتیش نەتاندەتوانی. پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: **(ذَرُونِي ما تَرَكْتُكُم، فَأَنَّما هَلَكَ مَنْ كانَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤالِهِم، وَإِخْتِلافِهِم عَلى أَنْبِياءِهِم، فَإِذا أَمَرْتُكُم بِشَيءٍ فَأْتُوا مِنْهُ ما اسْتَطَعْتُم، وَإِذا نَهَيْتُكُم عَنْ شَيءٍ فَدَعُوهُ)** رَواهُ مُسْلِمٌ.

واتە: وازم لێ بێنن لەسەر ئەوەی کە بۆتان بەجێ دێڵم. چونکە لە ڕاستی دا ئەوانەی پێش ئێوە کە بەهیلاك چون هی ئەوەبوە کە زۆر پرسیاریان کرد ، لە هەموو شتێکیان دەکۆڵیەوە، وە ڕای جیاوازیان هەبوو لەسەر پێغەمبەرەکانیان.

جا لەبەر ئەوەی چەندی لە تواناتاندا هەیە جێ بەجێ بکەن. وە ئەگەر شتێکم لێ قەدەغەکردن و ووتم نزیکی مەبنەوە ، ئەوە ئێوەش وازی لێ بێنن. **کەواتە:** ئیسلام هەموو شتێکی بۆ ئێمە باس کردوە ، پێویست ناکات ئەوەندە پرسیاری وورد

بکەین. ئەمە بۆ وایەو ئەوە بۆ وایە. خوای گەورە خۆی فەرمویەتی لە قورئاندا :﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ﴾ البقرة: ١٨٥.
وە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ﴾ الحج: ٧٨.
وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إنَّ هذا الدِّينَ يُسْرٌ، يَسِّرُوا وَلا تُعَسِّرُوا) رَواهُ البُخارِيُّ. واتە: بە ڕاستی ئەم ئاینی ئیسلامە ئاسانکاریە ، دەی ئێوەی هەڵگرانی ئەم ئیسلامە ئاسانە ئاسانکاربن و کار قورس مەکەن.
ئێستاش چەند بنەمایەکی شەرعی لە ئاسان کاریەکانی شەرعدا باس دەکەین:
١- (الضَّرُوريات تُبِيحُ المَحْظُورات). حاڵەتی ناچاری قەدەغە کراوەکان حەلاڵ دەکات بەپێ ی پێویست. وەکو:
- کەسێك لە شوێنێکدا گیری خواردبێ کە هیچ جۆرە خۆراکێکی لێ دەست نەکەوێت تەنها مردارەوەبوو نەبێت ، ئەم کەسە بە ئەندازەی ئەوەی کە نەمرێت تا دەگاتە خواردنی حەلاڵ بۆی هەیە لەو مردارەوەبوە بخوات.
- کەسێك دەچێتە لای پزیشك بۆ چارەسەری نەخۆشی، شوێنی نەخۆشەکەش عەورەتە، ئەو دکتۆرە دروستە تەماشای ئەو شوێنە بکات بەپێ ی پێویست ، بە مەبەستی چارەسەر – کەسێکی غەریب و نەشارەزا چوە گوندێك یان شارۆچکەو شارێکەوە ، ئوتێل و چێشتخانەو دوکان نەبوو لێ ی بخواو بخەوێ. یان هەبوو. بەڵام پارەی پێ نەبوو. وە لە دەرگای ماڵی خەڵکی دا. بەڵام کەس ئامادە نەبوو . دەرگای لێ بکاتەوەو نان و ئاوێکی بداتێ. ئەوە ئەو کەسە بۆی هەیە ئەوەندە خواردنە بدزێ کە ئەو شەوو ڕۆژە پێ ی بژی تا دەگاتە گوندێکی تر یان شوێنی خۆی.
- کەسێك ئیشێکی ڕەواو حەلاڵی خۆی هەیە و لەڕووی یاسایی یەوە کارەکەی لە فەرمانگەیەکی حکومیدایە مافێکی خۆیەتی کە وەکو هاووڵاتیەك کارەکەی بۆ

بکرێ و ستەمی لێ نەکرێ. ئەم ئیشەی ئەو ئەگەر بکرێ زەرەری کەسی تێدانیــە. بەڵام ئەو فەرمانبەرە وافێر بووە بەبێ بەرتیل ئەو ئیشە بۆ کەس ناکات. کە حەقی خۆتە. وە کەسیش نەبوو لەسەرزوو ئەوەوە لە دەسەڵاتدا بچی شکاتی لـێ بکـەی چونکە شەریکە دزی بوون، یان وەکو ئەو بـەرتیل خـۆر بـوون. ئـەوە لـەو کاتـەدا بەرتیل دان بۆ تۆ حەرام نیە و لەعنەت لەبەرتیل خۆرەکەو ئەو کەسانەیە کە یەکەم جار فێری بەرتیل خۆریان کرد. بەڵام دەبێ ئاگادارین لە هەموو ئـەم حاڵەتانـەدا ، قاعیدەی شەرعی کـە دەفـەرموێ: (الضَّرُورَةُ تُقَدَّرُ بِقَدَرِها) بـەکار دەهێنـرێ. بـۆ نمونە: کەسێك ماڵ و مناڵی هەیە ، بەڵام خـانوی خـۆی نیـەو کـرێ چیـەو ژیـانی بەکرێچیەتی و ئەم ماڵ و ئەو ماڵ تاڵ بوە، بەڵام پارچـە زەویـەکی هەیـە ، بـەڵام پارەی ئەوەی نیە دوو ژوری گونجاوی تێدا دروست بکات ، بایی ئەوەندەی تێ ی دا بژی و لەسەرما و گەرما بیپـارێزێ ، لـەم حاڵەتـەدا ئـەم کەسـە بـۆی هەیـە لـە حکومەت یان بانقێك پارە بە (ڕیبـا — سـوو) وەربگرێـت ، بـە ئەنـدازەی ئـەوەی خانویەکی بچکۆلەی پێ بکات بۆ حەوانەوە. وە گوناهی ئەو ڕیبا خۆری یە لەسـەر حکومـەت و بانقەکەو ئەو هەموو دەوڵەمەندانەیە کـە ئامـادە نـەبوون ، پـارە بـە قەرزی درێژ خایەن بدەن بەو کەسە هەژارە خاوەن پێویستی یە بە خانوو ، بۆ ئەوەی ژیانی خێزانی بەهۆی کرێچیەتی و ئەملاولاوە تێك نەچێ و مناڵەکانی هـەر ڕۆژەی لە قوتابخانەیەك نەبن! بـەڵام دەبـێ ئاگـاداری ئـەوەبین کـە ئـەو کەسـەی پارەکـە وەردەگرێ نابێ ئەوەندە پارەی (ڕیبا) وەربگرێ کـە خانویـەکی غـەربی، گـەورەی، تەواو تایبەتمەنـدی خـانوی مالـە دەوڵەمەنـدەکانی پێـوەبێ و هـەر ئـەوەی وەکـو دیکۆرات بەکاردێ تێ ی دا، بایی نیوە خانوویەکە! ئەگەر ئاوای کرد ئەوە بە ڕیبـا خۆر حیسابە ، چونکە لە پێویستی خۆی زیاتری کردوە.

- یاخود کەسێك بکەوێتە ژێر دەستی کافرو خوانە ناسانەوەو بیخەنە ژێر ئەشکەنجەو ئازارێکەوە کە تەحمول نەکرێ ، وە پێ ی بڵێن: ئەگەر بێ ئەدەبی نەکەی و قسەی نابەجێ نەڵێ ی بە خواو پێغەمبەرەکەی دەتکوژین. ئەوە لەو کاتەدا بە ئەندازەی خۆ ڕزگارکردن بۆی هەیە ، ئەوەی پێ ی دەڵێن بیڵێ دڵی پڕ لە ئیمان بێ ، زەرەر بە بیرو باوەڕەکەی ناگات.

**٢- بنەمای دووەم: (الْمُشَقَّةُ تَجْلِبُ التَّيْسِيرِ): موشەقەت و ناڕەحەت بوون ئاسانکاری بە شوێن خۆی دا دەهێنێت، وەکو:**

- کەسێك لە مانگی ڕەمەزاندا نەخۆشیەکی وای گرت کە نەیتوانی بەڕۆژوو بێت ، بە هۆی بەکارهێنانی دەرمانەکان لە ڕۆژدا. یان لاوازی لاشەی ، یان سەفەرێکی پێویستی هاتە پێش کە نەدەکرا ئەو سەفەرە نەکات. ئەوە لەو کاتەدا کە سەفەرەکەی گەیشتە ئەوەی کە دروست بێ نوێژی تێدا کورت بکاتەوە، وە ماندوبون و ناڕەحەتی سەفەر ئازاری بدات ، ئەوە بۆی هەیە بە ڕۆژوو نەبێت و لە دوای ڕەمەزان قەزایان دەکاتەوە.

- کەسێك ئاوی دەست نەکەوت بۆ خۆشۆردن و دەست نوێژ، یان ئاو هەبوو بەڵام نەیدەتوانی بەکاری بهێنێت بەهۆی ئەوەی نەخۆش بوو، یان دونیا زۆر سارد بوو، توشی نەخۆشی دەکرد. ئەوە ئەم ناڕەحەتیەی ڕوخسەتی (تەیەمومی) بۆ دێنێت و تەیەموم دەکات.

وە شوانێك کە لە شاخێکدا کە کانی و ئاوی لێ نیە. یان لێ یەتی بەڵام دورەو ناتوانێ ئاژەڵەکەی بەجێ بهێڵێ. وە ئەو ئاوەی پێ یەتی هەر بەشی خواردنەوەی خۆی یان ئاژەڵەکەی دەکات ، ئەوە بۆ ئەویش دروستە ، بەڵکو پێویستیشە کە تەیەموم بکات و ئاوەکە بۆ خواردنەوەی خۆی و ئەو ئاژەڵەی تیونیەتی زۆری بۆ دێنێ بەکار بهێنێ

- کەسێك میزە چرکەی هەبوو. بەردەوام وابوو. یان بای لێ دەبۆوە بە بەردەوامی ، ئەوە ئەو کەسەش دەرگای ئاسانکاری لێ دەکرێتەوە ، بەوەی کە بـا دەسـت نوێـژ نەگرێ تا وەختی نوێژەکە دێت و بانگ دەدرێت ، ئەو کاتە ، تارەت بگرێ و جلـی ژێرەوەی (بۆ میزە چرکە کە) بگۆڕێ و دەست نوێژ بگرێ و نوێژەکەی بکات ، ئەوە ئەگەر لەناو نوێژەکەدا میزیش هاتە خوارەوە ، یان بای لێ بۆوە. نوێژەکەی نابڕێـت و نوێژەکەی تەواو دەکات و دروستە ، بـەڵام پێویستیشـە لـە سـەردانی پزیشـکی پسپۆڕ و شارەزای ئەو بوارە کەمتەرخـەمی نـەکردبێ ، چـونکە زوربـەی جـار بـە بەکارهێنانی دەرمان چارەسەری دەکرێت.

- وە هەروەها چاوپۆشی کراوە لـە هەنـدێ لـە پیسـی کـە خۆپاراسـتن لـێ ی زۆر نارەحەتە. وەکو خوێنی برین و دومەڵ کـە بەلاشـەی مرۆڤـەوەن و هـەموو کـاتێ خاوێن ناکرێتەوە. یان قوڕی ڕێگاو بان — بە تایبەتی لە زستاندا = کە ئەو ڕێگایە پیسیشی لێ بێ وەکو پاشەڕۆی ئاژەڵ و سەگ. بەڵام چاوت لە خودی پیسەکە نیەو تەنها قوڕەکە دەبینی ئەوە ئەو قوڕە عەفوی لێ دراوەو پێویست ناکات بیشۆریتەوە بۆ نوێژ.

وە هەروەها لە ڕوی شەرعەوە جل و بـەرگی کرێکـار خاوێنـە ، وە جـل و بـەرگی فیتەر هەرچەندە چەوری پێوەیە هـەر خاوێنـە ، وە جـل وبـەرگی قەصـاب — کـە نەتوانێ وەختی نوێژ جلێکی پـاکتر لەبـەر بکـات دروسـتە نوێـژی پێـوە بکـات و چاوپۆشی لەو پڕیشکە خوێنانە ئەکرێت...

یاخود لەسەر کومبارێك، فەرشێك نوێژ دەکەی ، مادام چاوت لـە پیسـیەکە نیـەو بۆنی نیە دروستە نوێژی لەسەر بکەی بـا منـاڵی بچـوکیش لـەو ماڵـەدا هـەبێ و میزیش بکات، ئەصڵ وایە ئەو شوێنەی کە تۆ نوێژەکەی لێ دەکـەیت و ڕەنـگ و بۆنی پیسی پێوەنیە ، میزی ئەو مناڵەی بەرنەکەوتبێ.

- یاخود دەچیتە ماڵێکەوە و دەبی بە میوان، ئەو خاوەن ماڵە، حەڵاڵیشی هەیەو حەرامیشی هەیە. ئەو خواردنەی لە بەردەمی تۆ دایناوە نازانی لە حەڵاڵەکەیە یان لە حەرامەکەیە، ئەوە لەو کاتەدا شەرع ڕێگات پێنادات کە پرسیار لە خاوەن ماڵ بکەی کە ئەم خواردنەی کە بۆ من دانراوە ئایا حەڵاڵە یان حەرامە؟ یان لە کوێت پەیدا کرد. بەڵکو نانی خۆت بخۆو گومانت بخەرە سەر ئەوەی کە ئەوەی بۆ تۆ دانراوە لە پارە حەڵاڵەکەی دروست کراوەو حەرامەکە نیە.

- هەروەها بەلای ماڵێکدا تێدەپەڕی، ئاوێك لە بلوسکی سەربانێکەوە دێتەخوارەوە ، تۆ نازانی پاکە یان پیسە، پێویست ناکات بچی لەماڵەکە بپرسی: ئەم ئاوە پاك بوو یان پیس. بەڵکو حوکم بە پاکی دەکرێ و ئەگەر پیسیش بێت تۆی لە نوێژ نەبردوە و نوێژەکەت دروستە.

جارێکیان ئیمامی عومەر لەگەڵ چەند کەسێکدا بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشت ، لە ماڵەکەوە ئاو فڕێ درایە کۆڵانەکە، یەکێ لەو کەسانەی کە هاوڕێ ی حەزرەتی عومەر بوو ووتی: ئەرێ ماڵەکە ڕەحمەتی خواتان لێ بێ ئەو ئاوە پاك بوو یان پیس؟! حەزرەتی عومەر فەرموی: ڕەحمەتی خواتان لێ بێ وەڵامی ئەم وەسواسە مەدەنەوە کە شەرعی خوا ئاسانەو دەیەوێت لەسەرمان قورسی بکات.

ئیمانداران: یەکێك لەو شتانەی کە هەندێك لە موسڵمانان زۆر لە خۆیان قورس کردوەو لە.شەرعدا بە پێچەوانەوە زۆر ئاسانە.

بریتی یە لە نیەتی غوسڵ و دەست نوێژ و نوێژ دابەستن ، کەهی واهەیە ئەوەندە دووبارەی دەکاتەوە توشی وەسوەسەیەکی وا کوشندە بوە کە دڵی پاك نابێتەوە چەند جار نیەت دیچنێ و خۆی گوێ ی لە قسەکانی خۆیەتی، کەچی گومانی لە زمان و گوێ ی خۆی هەیە و دیسانەوە دووبارەو چەند بارەی دەکاتەوە!!!

بەڵام با گوێ لە شەرع بگرین و بەقسەی بکەین و ئەو کارە ئاسانە لە خۆمان قورس نەکەین. (شَيْخُ الإسْلام إبْنُ تَيمِيَّة) دەفەرموێ: (مَحَلُّ النِّيَـةِ القَلْبِ دُونَ اللِّسانِ فِي جَميع العِباداتِ الطَّهارَةُ وَالصَّلاةُ وَالزَّكاةُ وَالصِّيامُ وَالحَجُّ ، فَلا يشْرَعُ الجَهْرُ بِها وَ لاتكريرُها بَلْ مَنْ إعْتادَهُ يَنْبَغِي تَأْدِيبَهُ وَتعْزيرَهُ بَعْدَ تَعْرِيفِهِ ، لاسِيَما إذا آذى بِهِ وَ كَرَّرَهُ ، وَالجاهِرُ بالنِّيَةِ مُسْيءٌ).. صَحيح فِقْهُ السُّنَة ، ج١ ، ص١١٢.

واتە: شوێنی نیەت ناودڵە نەك بەزمان نیەت بیەنی و دڵ ئاگای لێ نەبێت. بەڵکو هەر نیەتەکەی ناو دڵت بەسە بۆ هەموو عیبادەتەکان ، وەکو دەست نوێژو غوسڵ دەرکردن و نوێژ دابەستن و دەرکردنی زەکات. وە نیەتی ڕۆژوو گرتنی ڕەمەزان و حەج کردن.

کەواتە پێویست ناکات بەدنگی بەرز نیەتیان بۆ بێنی ، بۆ نمونە: تۆ چویتە حەمام. هەر کە چویتە ژورەوە بونیەتی ئەوە چویت کەواجبێکی شەرعیت لەسەر پێویستە کە خۆشۆردنە، ئیتر بۆ ئەوە نەچوی کە چلکو پیسی لە خۆت بکەیتەوە وەکو خۆشۆردنی ئاسایی. دەی هەر ئەم نیەتە کە لە دڵتا بوە بەسەو پێویست نیە بەزمان بڵێ ی نیەتم هەیە غوسڵ لە خۆم دەردەکەم ، ئەمجا چەند جار دووبارەی بکەیتەوە. یاخود هی واهەبووە جل و بەرگەکەی لەبەرکردۆتەوە ئەمجا وتویەتی: خۆ نیەتم نەهێناوە، سەر لەنوێ ئاوی بەخۆیدا کردۆتەوە!!

وە بۆ دەست نویژیش بەهەمان شێوە. تۆ ئەو ئاوە بەدەم و قاچتا ناکەی بۆ خۆفێنك کردنەوەو لابردنی چلکو پیسی ، بەڵکو بۆ ئەوە دەست و دەم و چاوو قاچ دەشۆری بەنیازی عیبادەتی خوا بکەی.

دەی هەر ئەم نیەتەی ناو دڵت بەسەو پێویست ناکات چەند جار بڵێ ی نیەتم هەیە بێ دەست نوێژی لەسەر خۆم لادەبەم. وە لە دەرکردنی زەکاتدا ، هەر کەپارەکەت یان دانەوێڵەکەت ، یاخود ئاژەڵەکەت جیاکردەوە بەنیەتی ئەوەی کە ئەمە زەکاتی شەرعی یە ئیتر پێویست نیە لەو کاتەی کە دەیتە هەژارەکە بڵێ ی: ئەمەزەکاتە و

لێم قبوڵ بکە. ئەوەی پێویست نیە. وە لەڕۆژوشدا تۆ کە ئێوارە خەوتی نیەتی ئەوەت لە دڵدابوو کە بەیانی بەڕۆژوو دەبیت.

ئیتر پێویست ناکات چەند جار دووبارەی بکەیتەوەو بەزمان بڵێ ی:

نیەتم هەیە بەیانی بەڕۆژوو دەبم، لەم مانگی ڕەمەزانەداو لەسەرم فەرزە بۆ خوای گەورە ، ئەمە هەموی زیادەیە. چونکە هەر نیەتی ناودڵەکەت بەسە بۆ بەڕۆژوو بوون. وە دیارە ئەو مانگەی تێ ی دا ڕۆژوی فەرز هەیە هەر ڕەمەزانە. وەهەر بۆ خواش بەڕۆژو دەبی. ئیتر ئەم نیەتە دوورو درێژەی بۆ چیە؟!

**بەڵێ شێخ الإسلام فەرموی:** هەر کەسێ خوی پێوەگرت ، کە ئاوا نیەتی بەدەنگی بەرز بەزمان دەهێنا ، پێویستە ئاگادار بکرێتەوەو تێ بگەیەنرێ ، ئەگەر تەرکی نەکرد سەرکۆنە بکرێ و لێ ی تورە ببی- لە لایەن کاربەدەستی موسڵمانانەوە نەك هەموو کەسەوە – بەتایبەت ئەگەر ئەو نیەت هێنانەی بەدەنگی بەرز ئازاری دەداو پێ ی تەریق دەبۆوەو خەڵکی گاڵتەیان پێ کرد. وە چەندین جار دووبارەی دەکردەوەو دەیگوت: نیەتمە دەکەم ، دەکەم دەکەم

ئەمە دەبێ فەرمانڕەوای موسڵمانان تەمێ ی بکات و لێ ی قبوڵ نەکات کە ئاوا لەسەر شتێك کە شەرع پێویستی نەکردوەو بەڵکو نەهیشی لێکردوە، خۆی سوك بکات و خۆی بکات بەگاڵتەجاڕی خەڵکی. وە ئەو کەسەی ئاوا نیەت دەهێنێ بە دەنگی بەرزو خۆی ئازار دەداو خەڵکی ناڕەحەت دەکات گوناهبارە

## ٣- بنەمای سێ یەمی شەرع ئەوەیە: (المَيْسُور لا يَسْقُطُ بالْمَعْسُور):

بۆ ڕونکردنەوەی ئەم بابەتە دەڵێین: واجبێك هەیە تۆ هەمویت بە تەواوی پێ جێبەجێ ناکرێت ، بەڵام هەندێکت پێ دەکرێ ، دەبێ ئەوەندەی پێت دەکرێ بیکەی و نابێ بە بەهانەی ئەوەی کە هەمویم بە تەواوی پێ ناکرێ وازی لێ دەهێنم.

**بۆ نموونە:**

- هەندێ ئاوت پێ یە ، وەختی نوێژ هاتوەو هەتا دەگەیتە سەرکانی و ئاوێك و ئاوەدانیەك کاتی نوێژەکەت دەفەوتێ ، لەم کاتەدا وەرە ئاوەکەی کەلاتە — ئەگەر بۆ خواردنەوەی خۆت پێویست نەبوو - دەست نوێژی پێ بگرە. ئەوەندەی بەشی کرد باشە، ئەوەی بۆت نەشۆراو ئاوەکە بەشی نەکرد، تەیەمومی بۆ بکە.

- قاچێکت بریندارە ، یان هەر ئەندامێکی لاشەت برینی پێوەیە. یان کانولایەك بەدەستەوەیە لەم حاڵەتەدا ئەوەی ساغە بیشۆ ، بۆ ئەو شوێنەی کە ناتوانی بیشۆری تەیەموم بکە.

**نمونەیەکی تر:** لەشەرعدا دەفەرموێ: لە نوێژدا واجبە بە پێوە ڕابوەستی بۆ فاتیحە خوێندن دەی ئەگەر کەسێك نەیتوانی بە پێوە نوێژ بکات نابێ واز لە نوێژکردن بهێنێ، بەڵکو ڕێگای ئاسانی بۆ دانراوە.

صەحابی پایەبەرز ، عیمرانی کوڕی حوصەین دەفەرموێ: من توشی (مایەسیری) بووم ، پرسیارم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد کە چۆن نوێژ بکەم . فەرموی: (صَلِّ قائِماً ، فَأنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقَاعِداً، فَإنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَعَلى جُنُبٍ) رَواهُ البُخاريُّ.

واتە: بەپێوە نوێژبکە ئەگەر توانات نەبوو بەپێوە بوەستی. ئەوا بەدانیشتنەوە نوێژبکە. ئەگەر نەشتدەتوانی دابنیشی ئەوا لەسەر تەنیشت ڕابکشێ و نوێژبکە.

**نمونەیەکی تر:** خوێندنی فاتحە لە نوێژدا واجبە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لا صَلاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بفاتِحةِ الكِتابِ) رَواهُ البُخاری (٧٥٦) وَمُسْلِم (٣٩٤). دەی ئەگەر کەسێك هەرچەندە هەوڵی دا فێری فاتحە خوێندن نەبوو. ئەوە خۆناکرێ بڵێ نوێژ ناکەم. بەڵکو بۆی ئاسان دەکرێ. ئەویش بەوەی کە حەوت ئایەت لەقورئاندا دەخوێنێ. لە سورەتێکی تردا.

ئەگەر نەیتوانی حەوت ئایەت بەسەر یەکەوە لەبەر بکات. باحەوت ئایەت بەئەندازەی فاتحە بخوێنێ هەرئایەتەی لەسورەتێك بێ:

ئەگەر ئەوەشی بۆ نەدەکراو هەرچی هەوڵی دا لەهەموو قورئاندا حەوت ئایەتی بۆ لەبەرنەکراو فێرنەبوو. ئەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) رێگای بۆ ئەم کەسەش داناوە، پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەرزی کرد: (یا رَسُولَ اللهِ إنّي لاأَسْتَطِيعُ أَنْ اَخِذَ مِنَ القُرْآنِ شَيْئاً، فَعَلِّمْنِي مايجزيني فِي صَلاتِي.) (**فَقال: قُلْ سُبحانَ اللهِ وَالحَمْدُ لِلّهِ وَلّاإِلَه إلاّاللهُ وَاللهُ أكبر.وَلاحَوْلَ وَلاقُوَّةَ إلاَّ باللهِ**). رَواهُ أَبوُ داود (٨٣٢) وَحَسَّنَهُ الأَلْبانِيُّ.

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من هەرچەندە هەوڵمداوە، بەلاّم ناتوانم هیچ شتێك لەقورئان فێربم! (سُبحانَ اللهِ). لەوهەموو ئایەتە. یەك ئایەتیشی بۆ لەبەر نەکرا: لەبەر ئەوە هاتوومە خزمەتت بەڵکو شتێکم فێربکەی کەلەنوێژەکەمدا بیخوێنم. پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ئەم زیکرە بکە (سُبحانَ اللهِ والحمدُ لله الخ).

بەڵێ شەرعی خوا زۆر ئاسانە. ئەگەر بەنەزانی لەسەر خۆمانی قورس نەکەین

**٤- بنەمای چوارەمی شەرع : (دَرْءُ المَفاسِدِ مُقَدَّمٌ عَلى جَلْبِ المَصالِح).**

**بۆ رونکردنەوە و تێگەیشتنی ئەم بنەمایەش دەڵێین:** لەئیسلامدا کاروکەسابەت و بەدەستهێنانی پارە و مەصڵەحەتی ژیان رێگە پێدراوە. بەلاّم بەمەرجێ توشی حەرام خۆری نەبیت.

**هەروەکو:** کەسێك رەز و باخی ترێ ی هەیە. حەرامە ئەم کابرایە ترێ یەکەی بفرۆشێ بەکەسێك کە سوراوسور دەزانێ شەراب و عارەقی لێ دروست دەکات و

پیشەی ئەوەیە عارەق فرۆشە. هەرچەندە پارەیەکی زۆر باشیشی پێ بدات و زیاتر لەخەڵکی پێ بدات.
وەهەروەها حەرامە و ڕێگە پێنەدراوە بازرگانی کردن و دروست کردن و هێنان و بردنی عارەق و مادە سەرخۆشکەر و بێ هۆشکەرەکان.
هەرچەندە لەڕووی ماددی یەوە قازانجێکی گەلێ زۆربکات. یان بەرژەوەندیەکی ئابوری بۆ وولاتەکە تێدابێت. ئەمە داخستنی دەرگای خراپە و شەڕەکە پێش بەدەست خستنی قازانج و مەنفەعەتەکە دەخرێت.

**یاخود:** گەنجێك دەیەوێت کاسپی بکات. لەگەڵ کۆمەڵە کەسێك لە کۆمپانیایەك، لای بەرپرسێك بەپارەیەکی زۆر باش دادەمەزرێ. بەلاّم لەوشوێنە عارەق دەخورێتەوە، کوفر دەکرێ، سوکایەتی بەئەهلی ئیسلام دەکرێ، قەدەغەی نوێژی لێ دەکرێ، ئەگەر ئافرەت بێ قەدەغەی حیجاب و خۆداپۆشینی لێدەکرێت.
ئەوە ئەم کەسە موسڵمانە. ئەگەر لەشوێنێکی تر وەزیفەیەك. کارێکی تری دەست دەکەوت هەرچەندە نیوەی موچەی ئەویش بێ.
بەلاّم دین و بیروباوەڕەکەی لێی دا ئازادە و بێ شەرعی لێ ناکرێ. ئەوە پێویستە واز لەوشوێنەی پێشووی بهێنێ لەبەر پاراستنی دینەکەی و نەوەکو ئەویش فێری ئەو بێشەرعییانە ببێت. یان سوکایەتی بەپیرۆزییەکانی دینەکەی بکرێت.
یاخود: کەسێك دەوڵەمەندە و مقاولە (بەلێندەرە) یان کۆمپانیاو شەریکەی هەیە. ئیشەکەی دەچێتە لای کۆمەڵێك مەسئول و بەرپرس، ئەوانیش داوای لێ دەکەن دەعوەتێکیان بکات و عارەقیان بۆ بکرێت. ئەم خاوەن مەصلەحەتە بەهیچ

شێوەیەك ڕێگەی ئەوەی پێ نادرێت ئەو عارەقەیان بۆ بکڕێت باخۆیشی نەیخواتەوە یان هەرلەوێش نەبێت.

**یان:** کەسێك حەزی لەوەیە خواپەرستێکی چاك بێت. خێروخێرات بکات. دەزگیرۆیی خەڵکی بکات. بەڵام ئەگەر کەسابەتی حەرام نەکات ، ئەوە وا دەوڵەمەند نابێت کە خێرو خێرات بکات

لەم کاتەدا واچاکە کەواز لە حەرامەکە بێنێ و خێروخێراتەکەی نەوێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (**إِتَّقِ الَمحارِمَ تَكُـنْ أَعْبَـدَ النّـاسِ**) رَواهُ الترمذي. خۆت لەحەرام خۆری بپارێزە دەبی بەخوا پەرستترین کەس.

وەخوای گەورە پاکە و ماڵی پاکو حەڵاڵیش نەبێت قبوڵی ناکات. (**إنَّ الله طَيِّـبٌ لايَقْبَلُ إلاّ طَيِّباً**).

**عبدالله کوڕی عومەریش دەفەرمویت:** (لَرَدُّ دانِقٍ مِنْ حَرامٍ أَفْضَلُ مِنْ مائَةِ أَلْـفٍ تُنْفِقُ في سَبيل الله). ئەگەر شتێکی زۆرکەم لەپارەکە حەرام بێت، وازی لێبهێنم و ڕەتی بکەمەوە. باشترە لەوەی کە سەد هەزار پارە بکەم بەخێر لەپێناوی خودای گەورەدا و بیبەخشم بەهەژاران.

**ئیمانداران:** قاعیدەیەکی شەرعی لەفەرمانکردن بەچاکە و نەهی کردن لەخراپە، هەیە کەتێمان دەگەیەنێ پێویستە تێگەیشتن و فەهمی ڕاست و دروستمان هەبێت نەك هەر عیلم بەتەنها بۆ نموونە : کەسێك لەناو مسوڵمانانندا دەژی سێ ڕەوشتی خراپ و دزێوی تێدایە. زیناکارە ، عارەق خۆرە ، موشریکە و هاوبەشی بۆ خودا بڕیارداوە. تۆی مسوڵمان وەکو ئەمر بەچاکە و نەهی لەخراپە بەواجبی خۆتی دەزانی کە ئامۆژگاری بکەی.

ئەبێ تۆی ئامۆژگاری کار وریابی و بزانی لەکوێوە دەست بەئامۆژگاری دەکەیت یەکەم جار هەوڵبدە لەشرك ڕزگاری بکە چونکە ئەگەر لەسەر تەوحید و یەکتاپەرستی بمرێ.

یان خوای گەورە بەڕەحمی خۆی یەکسەر لێ ی خۆش دەبێ و دەچێتە بەهەشت.

یاخود بەعەدلی خوا دەچێتە جەهەنەم و لەدۆزەخدا لەگوناهەکانی پاك دەبێتەوە و دواتر هەر دەچێتە بەهەشت.

بەڵام ئەگەر تۆ چوی لەوەوە دەستت پێکرد کەزینا کردن یان عارەق خۆریەکە تەرك بکات وەسەرکەوتویش بوی و قەناعەتیشت پێ کرد. بەڵام بەشیرکەوە مرد. ئەوە هەتاهەتایە جێگای دۆزەخ دەبێت. لەبەر ئەوە پێش هەموو شتێ پێویستە تۆلەهاویەش پەیدا کردن بۆخوای گەورە ڕزگاری بکەی.

یاخود جاری واهەیە کەسێك نوێژ ناکات. هیچ خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر و پەیامی ئیسلام لەدڵیا نیە. هیچی لەو بارەیەوە بۆ باس نەکراوە. تۆ پێش ئەوەی پێ ی بڵێ ی نوێژبکە و سزای نوێژنەکەر ئاوایە و ئاوایە. وەرە باسی گەورەیی خوای بۆ بکە. باسی بەرەکەتی ئەم ئیسلامە و نوری پێغەمبەری بۆبکە.

بزانە ئەو کاتە کەخۆشەویستی خوا و دینەکەی چوە دڵیەوە چۆن خۆی بڕیاری نوێژکردن دەدات.

بەڵام ئەگەر خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) و ناسینی بەرەکەتی ئیسلام لەدڵیا نەچەسپی بوو. ئەوە ئەگەر توانیت ماوەیەکیش وەکو هاوڕێیەتی نوێژی پێ بکەی ئاخری هەر واز دەهێنێ لەنوێژکردن.

هەروەها دەبێ بزانین لەئەمر بەچاکە و نەهی لەخراپەدا هەرشەرت ئەوە نییە قسە و بانگەوازەکە بکەی بەڵکو پێویستە ئەم مەرجانەشی تێدابێت.

١- یەقینت ببێ کە ئەوکەسەی وازی لەخراپە و بێ شەرعی هێنا، لەجێگایدا چاکە دەکات.

٢- بەهۆی ئەو ئامۆژگاری کردنەوەی تۆوە تۆزێك لەبێ شەرعیەکەی و خراپەکاریەکەی کەم دەکاتەوە، بۆ نمونە: ئافرەتێکە سەری دانا پۆشێ و پانتۆڵی تەسك لەپێ دەکات. تۆ ئەگەر ژیرانە ئامۆژگاری بکەی یەقینت هەیە لانی کەم سەرپۆشەکە ئەدات بەسەریدا. ئەوە لەم دووکاتەدا ئەمر بەچاکە و نەهی لەخراپە واجبە.

٣- ئەزانی ئەگەر واز لەو گەناهە بێنێ، دەچێ گوناهێکی هاوشێوەی ئەوەدەکات، **بۆ نمونە:** ڕیبا خۆری دەکات. پارە بەسوو دەدات. ئەگەر تۆ قەناعەتی پێ بکەی کەواز لەڕیبا خۆری بهێنێ دەچێت گوناهێکی هاوشێوەی ئەوە دەکات،

**بۆنمونە:** برازای هەتیوی هەن کەباوکیان مردووە. پارە و سامانیان هەیە و ئەم مامەیان پێ ی دەزانێ و دەتوانێ دەستی بەسەردا بگرێ. ئەوە ئەم ڕیبا خۆرە چونکە فێری پارەی بەلاش بوە.

کە ڕیباکەی لێ بڕا دەچێت دەست دەکات بەخواردنی ماڵی ئەو هەتیوانە. کەڕیبا و خواردنی ماڵی هەتیوو. هەردوکیان لەگوناهە گەورەکانن!

یان کەسێك سوێند بەغەیری خوا دەخوات.

**بۆنمونە:** دەڵێ: بەگۆڕی باوکم. تۆش پێ ی دەڵێ ی ئەمە گوناهە و وامەڵێ. ئەوە وازی لێ دێنێ بەلام ئەمجارە دەڵێ بەسەری تۆ — هەردوو گوناهەکە وەکو یەکە —

لەم حاڵەتەدا بیردەکەیتەوە ئەگەر واز لەوەی تریشیان بهێنیّ ئەوە باشە. ئەینا هەر یەکەم جار دەستی لیّ مەدە و وازی لیّ بێنە.

٤- بەو ئامۆژگاریەی تۆ واز لەو بیّ شەرعیە دەهێنیّ. بەڵام توشی گوناهێکی گەورەتر دەبێت. هەروەکو پێشەوا (إبنُ القَيِّم) لە (إعْلامُ المُوَقِّعين) ج٣ ، ص١٦دا دەفەرمویّ: کەسێك زۆر شەیدای خوێندنەوەی کتێبە و زۆربەی کات کتێبی بەدەستەوەیە بەڵام ئەو بابەتانەی کە دەیاخوێنێتەوە هەمووی ئەو چیرۆك و کورتە چیرۆك و ڕۆمان و شیعر و پەخشان.

یان ئەو گۆڤارانەیە کەباسی جنس و دڵداری و حەزلێکردن و خیانەتی هاوسەری و جەستە و باڵای ئافرەت دەکەن. تۆ ئەگەر ویستت ئامۆژگاری بکەی و قەناعەتی پیّ بکەی کەواز لەوبابەتە بیّ سوودە خەیاڵ بڵاوانە بێنیّ کەهەمووی هەر ئاخ و ئۆف و تیر لەدڵدانە. هەمووی دابڕان و بۆیەکسوتان و کوشت و بڕە!!

نەسودی بۆ دونیا هەیە نەبۆ قیامەت. بەڵکو مرۆڤ دەباتە دەریای ئارەزو بازییەوە. ئەگەر وازی لەمە هێنا دەبیّ دڵنیا بی لەوەی هۆگری بۆ کتێب و خوێندنەوەوە ئەم جارە توشی خوێندەوەی کتێبی ئیلحادی و بیّ باوەڕی نابیّ. کە مرۆڤ دوردەخەنەوە لەخوا و لەئاین و لەقیامەت و بیرێکی ماددی و دور لەبەها ڕەوشتی و ئاینیەکانی دەخەنە مێشکەوە. کەئەمەیان لەگەڵ ئەوەی پێشوو ، کامیان زەرەری زیاترە ؟!

**پێشەوا (إبنُ القيم) دەفەرموێت:** (نَتْرُكُهُ عَلى كُتُبِ الجِنْسِ الصّادِرُ عَنْ مَرَضِ الشَّهْوَةِ، لِئَلاّ يَنْتَقِلَ إلى كُتُبِ الإبْتِداعِ وَالإلْحادِ، الصّادِرُ عَنْ مَرَضِ الشُّبْهَةِ، وَمَعْلومٌ أَنَ مَرَض الشُّبْهةِ أشَدُّ وَأَنكَى مِنْ مَرَضِ الشَّهوَةِ ). واتە: وازی لیّ دێنین با هەر بۆخۆی کتێبی دڵداری و جنسی و ئارەزوبازی بخوێنێتەوە کە لە نەخۆشی شەهوەت

بازی یەوە سەری هەڵداوە. بۆ ئەوەی کە وازی لەم بابەتە هێنا نەگوازێتەوە بۆ خوێندنەوەی کتێبی ئیلحادی و بێ دینی و فکرەی دۆڕاوی دور لە خواو دژ بەخوا. کە لە نەخۆشی گومان و شوبهەوە دروست دەبێ. وە ئاشکراشە کە نەخۆشی گومان و شوبهە بۆ دین. زۆر خراپترەو لەناوبەرترە لە نەخۆشی ئارەزوپەرستی، چونکەئارەزو پەرستی ڕەنگە بە ژن هێنان و چونە تەمەنەوە کۆتایی پێ بێت.

بەڵام بیری ئیلحادی بۆگەن کە چوە مێشکەوە ، ڕۆژ بەڕۆژ ڕەگی زیاتر دادەکوتێ و وازهێنان لیٚ ی زەحمەتە.

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: (مَثلُ هذا دَعْهُ، لا تَنْقُلْهُ مِنْ سُوء، إلى ما هُوَ أشَدُّ مِنْـهُ). نمونەی ئەم جۆرە کەسانە واز لیٚبیٚنە، بۆ ئەوەی لە خراپەیەکەوە سەنگەر نەگوازێتەوە بۆ خراپتر لەوەی پێشووی!...

**وە هەر پێشەوا** (إبنُ القيم): لە مامۆستاکەیەوە (شَيْخُ الإسْـلام إبْـنُ تَيميَّـة) دەگێڕێتەوەکە فەرمویەتی: جارێکیان مـن و هەنـدێ لـە هاوڕێکانم لـە زەمـەنی تەتارەکاندا بەلای کۆمەڵە کەسێکدا ڕۆیشتین کە خەریکی عەرەق خواردنەوە بوون ئەوانەی لەگەڵمابوون وویستیان بچن بۆلایان و ئامۆژگاریان بکەن کەواز لەو گوناهە گەورە بێنن و عەرەق نەخۆنەوە منیش ووتم: وازیان لیٚبیٚنن!!

ووتیان چۆن؟! ووتم (إنَّما حَرَّمَ اللهُ الخَمْرَ لأنَّها تَصُدُّ عَنْ ذِكْرِ اللهِ وَعَـنِ الصَّـلاةِ، وَهؤلاءِ يَصُدُّهُمُ الخَمْرُ عَنْ قَتْلِ النُّفوسِ).

واتە: خوای گورە عەرەقی حەرام کردوە چونکە مرۆڤ دور دەخاتەوە لە یادی خواو لە نوێژ کردن دەی ئەمانە عەرەق خواردنەکەیان دوری خستونەتەوە لە کوشتنی خەڵك ، ئەگەر سەرخۆش نەبن و بە ئاگابن ، ئەم تەتارو مەغۆلانە بەردەبنە گیانی

خەڵك و دەیانکوژن. خۆ کەوازیان لە عەرەق خواردنەوەکە هێنا ناچن نوێژ و زیکری خوا بکەن!!.

بە ڕاستی ئەمەیە تێگەیشتنی جوان و دروست لە شێوازی فەرمان کردن بە چاکەو نەهی کردن لە خراپە، کە بەرهەم داربێ و وانەبێ کە زەرەری لە قازانجی زیاتر بێت...

**تا بەشی سێهەمی ئەم زنجیرە باسە بە خوای گەورەتان دەسپێرم.**

# سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز.

٢- چیرۆکی زیرەکان ، و: حبیب محمد سعید ، ل٥ ، ل٩ ، ل,١٤

٣- قصص الأنبياء ، عمرو خالد ، ص,٤١١

٤- أصحاب الرسول ، الشيخ محمود المصري ، ص,٢٠٤

٥- الوافي في شرح الأربعين النووية ، د. مصطفى البغا ، محي الدين وديب مستور ص ,٥٦

٦- صحيح فقه السنة ، أبو مالك ، ج١ ، ص١١٢ ، ص٣٢١.

٧- صور من حياة الأنبياء والصحابة والتابعين ، الشيخ محمود المصري ، ج٢ ، ص١٠٢.

# ووتاری چوارەم

# بۆ مانگی ڕەجەب

# تێگەیشتنی جوان لەئایین الفَهم

# بەشی سێ یەم

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجمعين.

**ئیمانداران:** لەکۆتایی مانگی ڕەجەبداین کە لە (٢٧) ی ئەو مانگەدا بیرەوەری و ڕوداوێکی زۆرگەورە هەیە لە ئیسلامـــدا. کە قورئان تۆماری کـــردووە و پێغەمبـــەری خۆشـــەویستمـــان (ﷺ) لـــە فەرموودەکانی دا چۆنیەتیەکەی و ئەو شتانەی کە بینیویەتی، بۆی باس کردوین.

کە ئەویش ڕووداوی ئیسراو میعراجە. کەشەوڕەوی وبەرزبوونەوەی خۆشەویستی خوایە، پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) کەسورەتێکی قورئان بەناوی (سورة الأسراء) ناونراوە. وەسوپاس بۆ خوا لەسالآنی ڕابردوودا لەو باسە گرنگە دواوین و ئەمسالٚ ناچینەوە سەری. بەلٚکو درێژە بەزنجیرە باسەکەمان دەدەین. وەکو بەرەکەتی موعجیزەی ئیسراومیعراج، کەبەپوختی (مەولەوی) باسی کردووە، ئەو شعرە پوخت و جوانەی شاعیری گەورەو خواناس (مەولەوی تاوگۆزی) دەخوێنینەوە کەفەرموویەتی

ڕێی چەند هەزار سالٚ     طە ی چەند حیجابات

زاتـــی حەق کەلام     سوئـــــال جەوابـات

چوو ، بـــوو ، دی     بیستی ، کریا ، دریاوە

هاتەوە، حەلقـــــە     هەر ئەلـــەریـــــاوە

**ئیمانداران :** پێویستە کۆمەلێ کەس هەبن لەناو موسلٚماناندا ، کەبەشوێن زانستی شەرعیدا بگەڕێن و لەدین تێبگەن و فەهم و تێگەیشتنی دروستیان بۆ دین هەبێ وپاشان ئامۆژگاری و ڕێنمایی گەل و قەومی خۆیان بکەن.

خوای گەورە فەرمویەتی : ﴿ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً ۚ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴾ التوبة:١٢٢.

واتە: حەق نەبوو باوەڕدارەکان هەموو بەجارێ بچنە جیهاد و شارو گوندەکان چۆڵ بکەن. بەڵێ پاش هەڕەشەکانی خوای گەورە لەوانەی خۆیان لەجیهاد دەدزیەوە و دوا دەکەوتن لەجیهاد، موسڵمانەکان پەیمانیاندا ، کەئیتر لەمەودوا هیچ کەسێکیان بەجێ نەمێنێ ، هەر بۆیە کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) چوویە مەدینە ، هەموو بەجارێ پەلاماریان دەداو دەچونە غەزاو ، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) بەتەنیا خۆی دەمایەوە ، ئینجا ئەو ئایەتە هات کە فەرموی: با لەباتی ئەوە هەموو بچنە دەرێ ، لەناو هەر دەستەیەك چەند کەسێکیان بچنە دەرێ بۆ ئەوەی لەو جموجوولەی جیهادەدا، لەکاروباری ئاییندا شارەزاو ئاگادار ببن و، باش تێبگەن کە: ئیسلام ئاینی جمووجوولەو کەلە گۆڕەپانی جیهادیش گەڕانەوە ناو خێڵی خۆیان بیان ترسێنن و هۆشیاریان بکەنەوە بەڵکو لەفەرمانی خوا خۆ وە دوور بگرن

**لەم ئایەتەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە:**

١- پێویستە لەناو موسڵماناندا خەڵکانێك هەبن کە خۆیان تەرخان بکەن بۆ خوێندنی شەریعەتی ئیسلامی و هیچ ئیش و کارێکی تریان نەبێ و لەلایەن حکومەت و گەلەوە گوزەرانیان دابین بکرێ. وەکو فەقێی جاران لە حوجرەکانی کوردستاندا

٢- ئەم کەسانە بەباشی لەدین تێبگەن، نەك هەر چەند کتێبێك وەکو مەتن لەبەر بکەن ئایەتەکە دەفەرموێ : (لِيَتَفَقَّهُواْ ) نەك (لِيَتَعَلَموا) کەبەداخەوە هەندێ جار ئەو خوێندکار و فەقێ یە چونکە هەر عیلمی خوێندووە بەبێ فەهم و تێگەیشتنی وردوقوڵ لەئیسلام و مەبەستەکانی شەریعەت.

لەجیاتی ببێتە خزمەتگوزاری ئیسلام ، بۆتە دوژمنی ئیسلام و بەو چەند کتێبەی کەسەر کێڵ خوێندوویەتی ، دژایەتی ئیسلامی کردووە. کە زۆر جار دەپرسرێ. باشە فلان کەس خۆ لە مەلایەتی خوێندویەتی.

یان کۆلیژی شەریعەی تەواو کردووە. ئیتر چۆن ئاوا بێ دین بووە ؟! ئەوە وەلامەکەیەتی کەباسمان کرد
٣- ئایەتەکە دەفەرموێ: پێویستە ئەو کەسەی زانستی شەرعی دەخوێنێ ، بە وولاتانی سەر زەوی دا بگەرێ و گەل و نەتەوە و رەنگ و زمانی جیاواز ببینێ و عادات و تەقالیدیان شارەزابێ و وای لێ بێ کەسێکی چاو کراوە و دونیا دیدە بێ وانەزانێ دونیا هەر ئەو شوێنەیە کە ئەو تێ ی دا دەژی ئەمجا سوود لەئەزمونی سەفەرەکەی وەرگرێ و ئەوەی فێری بووە بەگەل و نەتەوەکەی خۆی بگەیەنێ هەربۆیە کاتێ ژیاننامەی پڕ بەرەکەتی موجتەهیدانی ئیسلام دەخوێنیتەوە دەبینین زۆرترین شوێنیـ دونیای ئەو کاتە ، بەپێ و بەسواری ووشتر گەڕاون.
**بۆ نموونە:** ئیمامی شافیعی. فەلەستین و مەککەو مەدینەو بەغداو میصر گەڕاوە ، هەربەپێ و بە سواری وولاخ. خۆ ئەگەر ئەمڕۆ بژیایە بەفڕۆکە تەواوی سەر زەوی دەگەڕا. وەدەبینین لەئەنجامی ئەو گەڕانە زۆرەدا گۆڕانیش بەسەر تێگەیشتنی لە قورئان و حەدیس دا هاتووە و فەتواکانی گۆڕیوون. وەکو قەولی قەدیمی گۆڕی بە جەدید
**کەواتە:** مەلای دینی ، یان موفتی پێویستە هەر چەند ساڵێك گەشتێکی وولاتان بکات کەچی ئەمڕۆ خەڵکی ئەو مەلایە بەپیاوی چاك و زانای تەواو دەزانن ، کە بەتەمەنی خۆی لەمزگەوتەکە و ماڵەکەی خۆی دوور نەکەوتبێتەوە!! سەرنج بدەن تێنەگەیشتن لە ئیسلام وەکو ئەوەی قورئان و فەرموودە باسیان کردووە ، چ زەرەرێکی لێ داوین و هەموو شتێ بە پێچەوانەوە حاڵی دەبین.
**کەواتە:** پێویستە هەر ئەم ئایەتە قورئانیەی کە باسمان کرد، یەك دەزگاو وەزارەتی تایبەتی هەبێ بۆ جێ بەجێ کردنی و تێگەیاندن و پێگەیاندنی بانگخوازانی ئیسلام کە لەدین تێبگەن و میللەتەکەیان تێ بگەیەنن.

٤- بەپێی ئەم ئایەتە پێویستە ئەو فەقێ و فێرخوازەی کە زانستە شەرعییەکان دەخوێنێ کەسێکی وەفادەر بێ بۆ میللەت و قەومی خۆی و بەو زانستەی خزمەتی میللەتی خۆی بکات و ژیانی هەندەران هەڵنەبژێرێ. بەنیازی ئەوەی کەلەوێش هەر خزمەت بەئیسلام دەکات.

نەخێر قەومی خۆت لە پێشترە لەخەڵکی تر. خوای گەورە فەرموی: ﴿وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ..﴾کە ئەمەش گرنگی سۆزی نەتەوایەتی لە ئیسلامدا دەردەخات ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی : (**مَنْ يُرِدِ اللّٰهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهُ فِي الدِّينِ**) متفق عليه.

**ئیمامی (عەلی) یش دەفەرموێ:** ئایا پێتان بڵێم کەشەرع زان بەکێ دەڵێن و کێ ناوەرۆکی فەقیهی تێدایە. ووتیان بەڵێ. فەرموی: شەرع زان ئەو کەسەیەکە خەڵکی لە ڕەحمەتی خوا نائومێد ناکات. کارێکی واناکات هەرباسی عەزاب و عیقابی خوا بکات و خەڵکی کە گوێبیستی قسە و ووتارەکانی بوون وایان لێ بێ کە مەئیوس بن لە ڕەحمەتی بێ سنوری خوا!

هەروەها کارێکیش نەکا کە خەڵکی ئەمین بن لەسزای خواو وایان لێ بکات کە خوا هیچ سزایەکی بۆ بەندە سەرپێچیکار و خراپەکارەکانی دانەناوە!

وەهەروەها قورئان واز لێ نەهێنێ و شعرو شانامە بۆ خەڵکی بخوێنێتەوە وا بزانێ ئەوە چاکتر کاریان لێ دەکات ! ..

**ئیمانداران:** پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەهاوەڵە بەڕێزەکانی کە پەروەردە کراوی دەستی ئەو ڕەحمەتە بوون. بەردەوام خەڵکیان بانگ کردووە بۆ ڕەحمەت و دوریان خستونەتەوە لە زەحمەت. وە ئاسانکاریان بۆ کردون لەسنوری شەرعدا و دوریان خستونەتەوە لەدین لەسەرخۆ قورس کردن و توندوتیژی و دڵە ڕاوکێ، قوڵ

بونەوەیەکی وا کە دوایی سەری لێ دەرنەکات. هەر وەکو خوای گەورە کە خیتاب لەگەڵ پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەکات پێ ی دەفەرموێ:﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴾ ص: ٨٦. ئەی محمد(ﷺ)پێیان بڵێ، لە پێناوی ڕاگەیاندنی پەیامەکەدا، من هیچ پاداشتێکم لە ئێوە ناوێ وەمن لەوانەیش نیم کەشت هەڵبەستم و زۆر لەخۆ بکەم.

**- صەحابی پایە بەرز. (ئەنەسی کوڕی مالیك) دەفەرموێ:**

لە خزمەت ئیمامی عومەری کوڕی خطابدا بووین. گوێم لێبوو دەیفەرموو : (نَهَيْنا عَنِ التَّكَلُّفِ) لێمان قەدەغە کراوە کەزۆر لە خۆمان بکەین و دین لەسەر خۆمان قورس بکەین، بەوەی کەبە ئارەزوی خۆمان بکەین. نەك شەرع

تەنانەت جارێکیان کەقورئانی دەخوێندەوە، گەیشتە ئایەتی:﴿ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴾ عبس: ٣١. ویستی پرسیار بکات ئایا مانای پڕاوپڕی (وَأَبًّا) چی دەگەیەنێ. پاشان ترسا کە ئەمە بچێتە چوار چێوەی دین لەخۆ قورس کردن و تەکەلوف کە شەرع نەهی لێ کردووە. بۆیە بۆ خۆی بە خۆی گوت: (ماذا على عُمَر إذا لَمْ يَعْرِف ما أبَاً؟) باشە عومەر چی لەسەرە، ئەگەر نەزانێ بەتەواوی مانای (وَأَبًّا) چی یە ؟ بۆچی وا لە خۆتی قورس دەکەی ؟!

**ئیمانداران:** یەکێ لەو شتانەی کەدین لەبەر چاوی خەڵکی قورس دەکات، ئەوەیە کەوا بزانێ تەنها قسەی فلاّن موجتەهید ڕاستەو تەواوە.

**بۆ نموونە:** ئەوەی بەڕێبازی ئیمامی شافیعی کار نەکات سەر لێشێواوە، لەکاتێکا هیچ موجتەهیدێکی ئەم دینی ئیسلامە خۆی بە (معصوم) پارێزراو لەهەڵە نەزانیوە. گوێ لەقسەی پێشەوایان بگرن.

**ئیمام مالیك دەفەرموێ :** (كُلُّ إنْسانٍ يُؤْخَذُ مِنْ كَلامِهِ وَيترَكُ إلا صاحِبَ هذا القَبْرِ (ﷺ) ). واتە: هەموو مرۆڤێك قسەی وەردەگیرێ و قسەشی واز لێ ئەهێنرێ. تەنها خاوەنی ئەم گۆڕە نەبێت كە پێغەمبەری خوایە (ﷺ) ئیمامی شافعی دەفەرموێ (رَأْيي صَوابٌ يَحْتَمِلُ الخَطأَ ، وَ رَأي غَيْري خَطَأٌ يَحْتَمِلُ الصوابَ) بیروڕاو قسەی من ڕاستەو بەڕاستی دەزانم. لەگەڵ ئەوەشدا بۆی هەیە هەڵەبێ، وە بیرو ڕاو قسەی بەرامبەرەكەم هەڵەیەو بەهەڵەی دەزانم. بەڵام بۆشی هەیە قسەكەی ڕاست بێت.

**وە هەر ئیمامی شافیعی فەرموویەتی** (إذا صَحَّ الحديثُ فَاضْرِبُوا بِقَوْلي عُرْضَ الحائِطِ) هەركاتێ فەرمودەیەكی صەحیحتان دەست كەوت و قسەو بۆچونی من پێچەوانەی ئەو فەرمودە صەحیحە بوو قسەكەی من فڕێ بدەن و بیكێشن بەدیواردا

**وە پێشەوا (ئەبو حەنیفە) فەرمویەتی:** (إذا جاءَ الحديثُ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَعَلى الرَّأْسِ والعَيْنِ ، وَإذا جاءَ عَنِ الصَّحابةِ ، فَعَلى الرَّأْسِ والعَيْنِ ، وَإذا جاءَ عَنِ التَّابعين فَهُمْ رِجالٌ وَ نَحْنُ رِجال).

واتە: هەركاتێ فەرموودەیەك لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) هات. ئەوە لەسەر سەرو لەسەر چاومانی دادەنێین. خۆ ئەگەر فەرمایشتێك لە صەحابەیەكی پێغەمبەرەوە (ﷺ) هات. ئەوە هەر لەسەر سەروچاومانی دادەنێین.

وە ئەگەر قسەو گوفتارێك لەو كەسانەوە هات كە تابعین، واتە: بەخزمەت هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتون ئەوە ئەوانیش مرۆڤن و ئێمەش مرۆڤین. وەكێبەركێیان لەگەڵ دەكەین و ڕەئی و بۆچونی خۆمان دەردەبڕین

**بەڵام ئیماندارانی بەڕێز:** پێویستە لەسەرمان کەکاتێ ئەم قسانە دەبیستن لەوە تێ بگەین کەمەبەست ئەوە نی یە کە موسڵمان بەئارەزووی خۆی لە نێوان مەزهەبەکاندا تەراتێن بکات و وەکو باڵندەی سەر درەخت. ئەم چڵ و ئەو چڵ بکات و لەهەمویان بخوات.

ئەمیش لەهەموو مەزهەبەکان وەر بگرێ لەوەی کە لەگەڵ ئارەزوی ئەو دەگونجێ! بەبێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئەصلّ و بەڵگە و دەلیلی ئەو قسەو بڕیارە لەو مەزهەبەدا. کە ئەبێ ئەو قسەیەی کەلە مەزهەبێکدا وەردەگیرێ بۆ کارپێکردن ، **سێ مەرجی تێدا بێت :**

١. قورئان و فەرمودەی صەحیحی پێغەمبەر (ﷺ) سەرچاوەی بن.

٢.موافیقی بنچینەکانی شەریعەت بێت.

٣.لەگەڵ ڕۆحی ئیسلامدا بگونجێ، کە مەبەست لە ڕۆحی ئیسلام لە بواری شەرعدا ، ئاسانکاریە هەر وەکو کاتێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبا موسای ئەشعەری و موعاذی کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن ئەم وەصیەت و ئامۆژگاریە بەنرخەی کردن و فەرموی : ( **يَسِّرا ولا تُعَسِّرا ، وَ بَشِّرا ولا تُنَفِرا** ).

واتە: ئاسانکار بن و کار قورس مەبن. وە موژدە دەر بن و دورخەرەوە مەبن.

زانایانیش دەفەرمون: (التيسير: أمرٌ فَوْقَ التبسيط، التبسيط إنّما يَكونُ في التعليم ، والتَّيْسير يتناولُ العَمَلُ و الأداءُ) .

واتە: کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی. يَسِّرا ، ووشەی – ئاسانکاری ، لەسەرو (التبسيط) ەوەیە کە لە کوردی دا هەر بە مانای ئاسان کاری دێت. چونکە (التبسيط) لە بواری فێرکردندا دەبێت.

بەڵام (التَّيْسير) ئاسانکاریەکەی لەکاتی کردەوە پێکردندا دەرئەکەوێ

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە مُعاذو ئەبو موسای فەرموو: هەر بە قسە کار ئاسانی بۆ خەڵك مەکەن، بەڵکو بەکردەوەش کار ئاسانیان بۆ بکەن. هەر وەکو کە

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەکردەوە لە کاتی ڕوداوی نەخوازراودا کار ئاسانی بۆ خەڵکی نەزان دەکرد. ئەوە بوو کاتێ کەسێك لەناو مزگەوتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات و میزی کرد. کە لە بیابانەوە هاتبوو. کەمتر شارو خەڵکی زۆری بینی بوو. وە صەحابەکان کە لەوکاتەدا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بوون (ﷺ) ووتیان لێ ی توڕەبن و لەمزگەوت بیکەنە دەرەوە

بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئالەوێ دا بەکردەوە نیشانی دا کە ئاسانکاری دەکات. نەك هەر بە ووتار و قسە بەڵام کە هەڵوێست و کردار هاتە پێشەوە نەتوانی ئەو قسانەی لەمەیدانی کردەوەدا جێ بەجێ بکات ، بۆیە فەرموی:

(لا تَقْطَعُوا على الرَّجُلِ بَوْلَتَهُ ، فَإِنَّمَا بُعِثْتُمْ مَيَسِّرِينَ وَلَمْ تُبْعَثُوا مُعَسِّرِينَ).

واتە: میزەکە بەپیاوەکە مەبڕن و لێ ی گەڕێن بابەتەواوەتی خۆی خاڵی بکاتەوە، چونکە بەڕاستی ئێوە خوای گەورە کە ئەم ئیسلامەی بۆ ڕەوانکردون. بۆ ئەوەیە تا ئاسانکار بن. نەك کار قورس کەرو خەڵك دورخەرەوە لە ئیسلام

پاشان فەرموی: دۆلکەیەك ئاو بهێنن و بیکەن بەشوێن میزەکەدا. چونکە ئەو کاتە ناو مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) نوێنی تێدا ڕانەخراوە. بەڵکو هەر گڵ بووەو هەندێ چەوی بەسەردا کراوە. جا کاتێ ئاوەکە کرا بەسەر میزەکەدا ئەوا دەچێتە خوارەوەو پیسیەکە پاك دەبێتەوە. کە دیسان دەبێ لەم فەرمودەیەوە، وانەی تێگەیشتن و فەهمی ڕاست و دروست لە فەرمودە زێڕینەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) فێر ببین. نەك هەر ڕوکەشەکەی ببینین.

ئەوەتا کە فەرموی: دۆلکەیەك ئاوی بکەن بەسەردا، نابێ کەسێك بڵێ ئەمڕۆ کەمزگەوت ژێرەوەی چیمەنتۆ و کاشی یە. وە فەرشی لەسەر ڕاخراوە.

ئەگەر کەسێ میزی لێ کرد یان پیسیەك لەو شوێنە دروست بوو. لەسەر فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) دۆلکەیەك ئاوی پێدا دەکەین: چونکە لەم کاتەدا نەك مەبەستەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە پاککردنەوەی شوێنەکە بوو نایەتە دی.

بەڵکو بە پێچەوانەوە چەند مەترێك بەملاولای خۆیدا پیسیەکە بڵاو دەکاتەوە. چونکە ناو مزگەوتی ئەمڕۆ فەرقی هەیە و جیاوازە لەناو مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی خۆیدا. هەر بۆیە حوکمەکەش دەگۆڕێت !!

هەر لەسەر مەسەلەی ئاسانکاری لەشەرعدا: جارێکیان کەسێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەرزی کرد: (يا رسول الله إِنِّي لأَتأَخَّرُ عَنِ الصلاةِ فِي الفَجْرِ مِمّا يَطيلُ بنا فُلانٌ فيها) ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڕاستی من بێبەشم و بەشداری ناکەم لە جەماعەتی نوێژی بەیانی دا. ئەو هەموو خێروپاداشتە گەورەم لەدەست دەچێ. بەهۆی ئەوەی کە فلان کەس پێشنوێژیمان بۆ دەکات و ئەوەندە نوێژەکە درێژ دەکاتەوە بەڕاستی من خۆم بۆ ڕاناگیرێ و ئیتر لەبەر ئەوە ناچم بۆ مزگەوت و نوێژی بەیانیەکەم لە ماڵەوە دەکەم. کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمەی بیست نەچوو لەو کەسە تووڕە ببێ و بفەرموێ ، چۆن بەعیبادەتی خوا و قورئان خوێندنی درێژ لە نوێژی بەیانی دا بێزاری. لە خۆت بترسە ، ئەوە ئیمانت لاوازە.

نەخێر. وای نەفەرموو. بەڵکو تووڕە بوو. بەڵام لە کێ تووڕە بوو؟!

سەرنجی درێژەی فەرمودەکە بدەن ، کە دەفەرموێ : (فغضبَ رسولُ الله (ﷺ) ، ما رأيْتُهُ غضبَ في مَوْضِعٍ كانَ أَشَدُّ غَضَباً مِنْهُ يَوْمَئِذٍ ، ثُمَّ قالَ **يأَيُّها النَّاسُ إنَّ مِنْكُم مُنَفرين، فَمَنْ أَمَّ النَّاسَ فَلْيَتَجوَّزْ ، فَإِنَّ فِيهِمُ الضَّعِيفَ وَالْكَبِيرَ وَذَا الْحَاجَة)** متفق عليه. بخاري (٧٠٤) ومسلم (٤٦٦).

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەشێوەیەکی وا تووڕە بوو.کە هەرگیز لە هیچ جێگایەکدا ئاوا تووڕە نەبوبوو.

پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکینە، بەڕاستی هەندێ لەئێوە هەن کە خەڵکی دور دەخەنەوە لە ئیسلام، لەڕەحمەتی خوا، لەپاداشتی زۆر، لە مزگەوت، لەجەماعەت، لەجومعە.

دەی ئاگادار بن وبزانن هەرکەسێ کەپێش نوێژی بۆ خەڵکی کرد، باپێش نوێژیەکی کورت و پوخت بێت. ئەوەندەی درێژ نەکاتەوە خەڵکی بێزار بن. چونکە بەڕاستی لەناو ئەو کەسانەدا کەنوێژی لەدواوە دەکەن. کەسانێکی تێدایە کە لاوازە و بەساڵا چووە و تواناى زۆر وەستان و مانەوەی نیە. وەکەسانێك لە ڕیزی جەماعەتەکەدان کەخاوەن کارن و ئیش و کاریان هەیە و چاوەڕێی ئەوەن نوێژەکەیان بکەن و بڕۆنەوە سەر کارەکەیان

یاخود جارێکی تر کەسێك شکوای حاڵی خۆی دەکات بەدەس مُعاذی کوڕی جەبەلەوەکەبە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕادەگەیەنێت مُعاذ پێش نوێژیمان بۆ دەکات. بەڵام بەڕاستی زۆر درێژە. چونکە سورەتی (البقرة) وە سورەتی (النساء) لە دوو ڕکاتدا دەخوێنێ !!

کە ماوەی چەند سەعاتی پێ دەچێت لەنوێژی عیشا داو نزیکی نیوەشەو خەریکە بەری بەیان دەبێت ئەمجا لەنوێژی عیشا دەبینەوە. ئێمەش هەموو خەڵکی ماندوین و ناتوانین ئەوەندە بمێنینەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ڕەخنە بنیات نەرە بەجێ یەی وەرگرت و بانگی مُعاذی کردوو فەرمووی (أَفَتَّانٌ أَنْتَ ؟! ثلاثاً ) سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: ئەوە تۆ بویت بەمایەی فیتنەو نارەحەتی بۆ خەڵکی ئەی مُعاذ؟! پاشان فەرموی: (فَلَوْلاَ صَلَّيْتَ بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى ، وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا ، وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى ) متفق عليه ( بُخاري:٧٠٥ ) و ( مسلم: ٤٦٥).

واتە: باشە بۆچی لەپێش نوێژیەکەتدا سورەتی (الأعلى، سورەتی الشَّمس، سورەتی الليل) ناخوێنی کورت و پوخت نوێژەکەیان بۆ بکە: بەڵێ ئەمەیە تێگەیشتنی ڕاست و دروست لەدین و لە ڕۆحی شەریعەت کە ئاسانکاریە.

**چەند نموونەیەکی ئاسانکاری لە بواری شەرعدا :**

١- نوێژ کردن بە پێڵاوی خاوێنەوە لەحاڵەتی ناچاری دا.

**بۆ نموونە:** لەگەرمایەکی زۆر بەتیندا یان لەسەرماو بەستەڵەکێکی لەڕادەبەدەری ساردا لەناو مزگەوت جێگای نوێژکردن نەماوە یان لەدەشتای و کاتی نوێژە و بەردەنوێژێك نیە و زەویەکە هەموی دڕك و داڵ و و بەزدی تیژە. ئەگەر پێڵاوەکەت دابکەنی، قاچت دڕکی پێدا دەچێ یان ئازارت دەگات بەبەردی گەرم یان تیژ ئەوە مادام پێڵاوەکەت پاکە بە پێڵاوەوە نوێژەکەت بکە. ئەگەر پیسیەکی دیار بە پێڵاوەکەتەوە بوو. بەگڵەکە بیسڕە، بەئاویش نەیشۆری (کەئاوت دەست نەکەوت) دروستە نوێژی پێوە بکەیت. بەڵگەی ئەمەش ئەم فەرمودەیەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی ( **إِذَا جاءَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيَنْظُرْ فَإِنْ رَأَى على نَعْلَيْهِ قذراً فَلْيَمسَحْهُ ولْيُصَلِّ فِيها** ).

واتە: ئەگەر کەسێك لەئێوە هات بۆ مزگەوت ، باتەماشا بکات ، ئەگەر لەسەر پێڵاوەکانی پیسی هەبوو. بابیسڕێ پاشان کە خاوێنی کردەوە نوێژی پێوە بکات.

وەلە فەرمودەیەکی تردا. خۆشەویستمان (ﷺ) دەفەرموێ: (**إِذَا وُطِئَ أَحَدُكُمْ بِنَعْلَيْهِ الأَذَى، فَإِنَّ التُّرَابَ لَهُ طَهُورٌ** ) هەر کاتێ یەکێ لە ئێوە پیسی بە نەعل و پێڵاوەکەیەوە نووسا ئەوە گڵ بۆی دەبێتە پاك کەرەوە. بابەگڵ بیسڕێ

٢-هەموو شوێنێکی ئەم سەر زەوی یە دروستە نوێژی لێ بکرێت تەنها دوو شوێن نەبێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (**جُعِلَت لِيَ الأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا، فَحَيْثُمَا أَدْرَكَتك الصَّلاَةَ فُصَلِّ** ). واتە: خوای گەورە هەموو سەر زەوی بۆ کردووم بەمزگەوت و شوێنی نوێژ. وەهەمووی پاکە. دەی لەهەر جێگایەك نوێژ بوو. باناو مزگەوتیش نەبێت نوێژەکەت بکە. ( لە ئاینەکانی پێش ئیسلامدا نوێژ دەبوایە لە پەرستگاکاندا بکرێ )

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی کردووە لەشوێنی مۆڵینی مەڕو ماڵات. وە فەرمویەتی: (**الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدٌ إلاَّ المَقْبُرَةَ والحَمَّامَ**). زەوی هەمووی مزگەوتەو شوێنی نوێژ کردنە ، تەنها گۆڕستان و حەمام نەبێت

کەچی ئەمڕۆ خەڵکی بەهۆی تێنەگەیشتنەوە لەڕۆحی ئیسلام و شەرع ، نوێژ لەسەر مەرقەد و گۆڕ دەکات و حەمامی پێ شیاوترە لەشوێنی مۆڵینی مەڕ و ماڵات !!

٣- هەڵگرتنی منالّی ساوا لەکاتی نوێژدا ، هەر وەکو لەفەرمودەی (متفق علیه) دا هاتووە کە :(أنَ النبـــــيَّ (ﷺ) صلّى وَهْوَ حَامِلُ أُمَامَةَ بِنْت الْعَاصِ بْنِ رَبِيع). واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی دەکرد و لەکاتی نوێژەکەدا ئومامەی کچی عاصی کوری ڕەبیع، کەمنالێکی ساوا بووە بەکۆڵیەوە بووە و هەڵی گرتووە..

کەمنالّی ساوا لای وەسواسەکان پیسی پێوەیە ! هیچیشی پێوە نەبینن هەر لە خۆیەوە دەڵێ : بەخوا منالّ شتێ میز و پیسایی هەر پێوەیە ! بەلاّم پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو منالّە ساوایەوە نوێژی کرد. کە دیارە کەسی لێ نەبووە ووریای بێ و منالّەکەش لەتەمەنی ئەوەدا بووە بەملاولادا بڕوات و توشی مەترسی ببێ

٤- بەخاوێن دانانی جل و بەرگ و کەلوپەلی کافران و گاور و جولەکە هەروەکو لەم فەرمودەیەدا هاتووە (أنَ النبـــــيَّ (ﷺ) كانَ يَلْبسُ الثيابَ التِي كانَ يَنْسِجُها المشرِكونَ وَيُصَلِّي فيها). واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو جل و بەرگانەی دەپۆشی کە موشریکەکان بەدەست دەیانچنی و نوێژیشی پێوە دەکردن. چونکە هیچ پیسیەکی پێوە نەدەبینین ، نەشی دەشۆردن. بەڵکویەکسەر نوێژی پێوە دەکردن. کە لای وەسواس و خۆ بەخواپەرستی حەق زان دەڵێ: چونکە دەستی کافری بەرکەوتووە تا نەیشۆم ، نوێژی پێوە ناکەم.

وە لەسەر ڕێبازی ڕاستی پڕ ئاسانکاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ ئیمامی عومەری کوڕی خطّاب سەردانی وولاّتی شامی کردو چووە شوێنێك بەناوی (الجابيّة) جل و بەرگەکەی خۆی پێویستی بە شۆردنی هەبوو. وە جل و بەرگی زیادەشی لانەبوو. هەر بۆیە جل و بەرگێکی لە پیاوێکی (نەصرانی) خواست (فَلَبِسَهُ حتَّى خاطُوا لَهُ قَميصَهُ وَ غَسَلُوهُ) جل وبەرگی ئەو گاورەی لەبەرکرد هەتا

ئەو کاتەی جل و بەرگەی خۆی کە دڕابوو ، بۆیان دوریەوە و شۆردیان و ووشك بۆوە – دیارە تا ئەمە کراوە کاتی نوێژیش هاتووە و نوێژیشی بەجل وبەرگی ئەو گاورەوە کردووە چونکە هیچ پیسیەکی ئاشکرای پێوە نەبینیوە ، کابرای گاور عەرەق خۆریش بووە! کەبەڕاستی ئەمە سەرەڕای ئاسانکاری ئاینی ئیسلام نیشان دەدات ئەو پەڕی بەیەکەوە ژیان و یەکتر قبوڵ کردنیش نیشان دەدات لەنێوان ئیسلام و نەیارانی دا. وە ئەوپەڕی پاکی و بێ فیزی گەورەی هەموو موسڵمانان. جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیشان دەدات کەلەوهەموو سەروەت و سامانەی کەلە ژێر دەستیدا بووە. ئامادەنەبوو چەند دیرهەمێکی لێ هەڵگرێ کە هیچ موسڵمانێکیش نەبووە پێی ناخۆش بێ – بچێ جل و بەرگێکی تازەی پێ بکڕێ و جل و بەرگی گاور لەبەر نەکات! کە ئەمە تەنها لەئیسلامدا بەکردەوە بەرجەستە بووە. لەسەردەمێکیشدا کە گەورە پیاوانی دونیا، کیسراو قەیصەر جل و بەرگەکانیان بە ئاڵتون دەنەخشێنران و ئەو بەرگەی جارێك لەبەریان بکردایە، جارێکی تر لەبەریان نەدەکردەوە

ئای ئیسلام چەند عەظیم و گەورەیە کەمرۆڤی گەورەی وەکو عومەر پێ دەگەیەنێ. کە بەداخەوە شەمشەمە کوێرەکان چاویان بەنورو ڕوناکیەی هەڵنایەت. هەر ئیمامی عومەری کوڕی خطّاب (تَوَضَّأَ مِنْ جُرَّةِ نَصرانِيَّةٍ) لە کوپەڵە و گۆزەی گاورێکدا دەست نوێژی گرتووە. کە لای خەڵکی وەسوەسەدار و ناحاڵی لە ڕۆحی ئاسانکاری ئیسلام ڕەنگە بڵێ، دەگونجێ ئەم قاپە، ئەم کوپەڵەیە عەرەقیشی تێدا خورابێتەوە !

٥- لەشەرعدا دەفەرموێ: (ما أُكِلَ لَحْمُهُ فَرَوثُهُ وَ بَوْلُهُ طاهِرٌ) هەر ئاژەڵێك گۆشتی بخورێ ئەوە پاشەڕۆ و میزەکەشی پاکە. تەنها لای مەزهەبی ئیمامی شافیعی شیاکە و میزی مانگاو مەڕ و بزن و ووشتر بە پیس دەزانرێ. بەڵام

مەزهەبی مالیکی میز و پاشەرۆکەی پاکە چونکە گۆشتی دەخورێ. کە ئەمە بۆ ئاژەڵدارەکان زۆر گونجاوە و کار ئاسانیە بۆ یان

**هەروەها پێشەوا (إبن القیّم) دەفەرموێ:** (إنّهُ يُعْفى عَنْ يَسيرِ أَرْواثِ البِغالِ والحَميرِ و السِّباعِ في إحدى الرِّوايتينِ عَنْ أَحمد)

واتە: چاو پۆشی کراوە لەکەمێك لە پاشەڕۆ و میزی ووڵاخە بەرزە و گوێدرێژ و شێر و پڵنگ و گورگ و خاوەن کەڵبەکان لە یەکێك لە ڕیوایەتەکانەوە کە لە پێشەوا ئەحمەدەوە گێڕدراوەتەوە کە بەڕاستی ئەم جۆرە فتوایە ئاسانکاریانە دەتوانم بڵێم ، پێویستە ڕەچاوی کەسەکەی تێدا بکەین ،

**بۆ نموونە:** کەسێك زۆربەی کاتی ژیانی بەشوێن ئەسپ و ماین و گوێدرێژەوەیە بە هۆی ووڵاخداری یەوە، کەباری پێ دەگوازێتەوە، وەکو خەڵکی سەر سنوورەکان. ئەم فتوایە بۆ ئەوان زۆر گونجاوە. یان ئەوانەی لەباخچەی ئاژەڵان دا کاردەکەن و خزمەتیان دەکەن ئەم فتوایە گونجاوە.

بەڵام کەسێك ساڵی جارێك لە پرپیشکە میزی گوێدرێژ و ئەسپ و ئێستر و ماین بەری بکەوێ. چونکە ئیش و کاری پێیان نیە. ئەوە بەڕاستی پێویستە خۆی بشواتەوە و فەتوا ئاسانەکە بۆ ئەم نەگونجاوە!

چونکە ئێمە باسی ئاسانکاری شەرع دەکەین و ئەو جارە شۆردنەوە لە ساڵێکدا ، یان لەهەموو تەمەندا هیچ قورسیەك و بارگرانیەکی بۆ دروست ناکات. بە پێچەوانەی ووڵاخدارەکەوە کە هەموو ڕۆژێ تووشی ئەو حاڵەتە دەبێت..

(وَقَدْ نَصَ أحمد على أنَّ الوَديّ يُعفى عَنْ يسيرِهِ كالمذيّ، وكذلكَ يُعفى عنْ يسيرِ القيءِ) .

واتە: پێشەوا ئەحمەد بڕیاری داوە کە ئاوی (وەدی) کەشلەیەکی ڕوونەو لینجە و لە نێرینە دێتە دەرەوە دوای بالغ بوون.

بەڵام ئارەزوی پێ ناشکێ و جیاوازە لەگەڵ مەنی (شەهوەت) ئەوە ئەگەر کەمێك لەو ئاوەی بەئەندامی زاوزێ یەوە بینی وە زۆربەی کات وابوو. بۆی گران بوو هەموو جارێك بیشواتەوە. ئەوە ئەو ئاوی وەدی و هەروەها ئاوی (مەزیش) چاوپۆشیان لێ کراوە.

وە هەروەها لە شەرعدا چاوپۆشی کراوە لەکەمێك لە ڕشانەوە. کاتێ ڕشانەوەکە هی خۆی بوو یان هی کەسێکی تر، چەند پرپیشکێکی کەم بوو. ئەوە عەفوی لێ دراوەو شۆردنەوەی ناوێت ، لای پێشەوا ئەحمەد

**کەواتە:** گەنجێك بەردەوام ئاوی وەدی و مەزی دەبینێ ، زۆر نیەو کەمە. ئەم گەنجە نابێ وای لێ بکرێ کەتەرکی نوێژ بکات ، لەبەر ئەوەی کەبۆی نەگونجێ و نەتوانێ هەموو جارێك لاشەی و جلی ژێرەوەی بشواتەوە، یان ئافرەتێك منالە بەرەو منالەکەی زۆربەی کات دەڕشێتەوە.

بەڵام ڕشانەوەکەی کەمێکە، نابێ تەکلیفی ئەوەی بخرێتە سەر کە هەموو جارێك جل و بەرگەکەی بشواتەوە. یاخود کەسێك زۆربەی کات دەڕشێتەوە و چەند دڵۆپێك بەر جل و بەرگەکەی دەکەوێت ئەویش چاو پۆشی لێ دەکرێت. یاخود کەسێك نەخۆشە و برین بەلەشیەوەیەتی و کێم و جەراعەتی لێ دێ بانوێژەکان بکات ، پێویست ناکات هەموو فەرزێك جل و بەرگەکەی بشواتەوە.

هەروەکو پێشەوا (إبن القیم) لە (إعاثة اللهفان) ج ١ ص ١٥١ دا دەفەرموآ

(قال شیخُنا – أيّ شیخُ الأسلام إبنُ تیْمیة -: لا یجیبُ غَسْلُ الثوْبِ ولا الجسدِ مِنَ المِدَّةِ والقیح والصدیدِ)

٦- الماءُلاینْجسُ إلا بالتغییرِ. لە مەزهەبی ئیمامی مالیك دا ، ئاو با هەر چەندە کەمیش بێت و لە قوللەتەینیش کەمتر بێ، پیس نابێت بەتێکەوتنی پیسی. ئیللا مەگەر تام و ڕەنگ و بۆنی گۆڕابێت.

بەڵام لای ئیمامی شافیعی: ئەگەر ئاوێك کەمتر لە قوللەتەین بێ ، بەتێکەوتنی پیسی پیس دەبێت و بەکەڵکی دەست نوێژ و شت پێ پاککردنەوە (شۆردن) نایەت.

**سەرنج بدەن. ئیمامی غەزالی کە توندترین شافیعی مەزهەبە دەفەرموێ:**
(وَ كُنْتُ أَوَدُّ أن يكونَ مذْهَبُهُ "أي الشافيعي" كمذْهَبِ مالك في اَنَّ الماءَ وَ إنْ قلَّ لا يَنْجِسُ إلا بالتَّغيير، إذِ الحاجَّةُ ماسَّةٌ إلَيْهِ).
واتە : بەڕاستی من خۆزگەم دەخواست کەمەزهەبی شافیعی وەکو مەزهەبی مالیك بوایە لەوەدا بوونی زۆر بۆ ئاو و پێویستی بەو فتوایە هەیە.
(سُبْحانَ اللهِ) ئەو گەورە زانایانە چەند بەئینصاف (ویژدان) بوون، لەگەڵ ئەو هەموو تەقدیر و حورمەتەی بۆ سەر مەزهەبەکەی خۆیان هەبووە.
بەڵام کاتێ فەتوایەکی جوان و بەجێی سەرمەزهەبێکی تریان بەر چاو کەوتووە کەلەگەڵ ڕۆحی شەرعدا گونجاو ترە و کار ئاسانی بۆ موسڵمانان زیاتر دەکات بەتقدیرەوە، بەو پەڕی ڕێزەوە باسی گەورەیی و جوانی و بەجێی ئەو فتوایەشیان کردوەو تەنانەت خۆزگەی خواستووە، سەرمەزهەبەکەی ئەمیش وەکو ئەوئاوا فەهمی جوانی ئەو مەسەلەیەی بکردایە.

ئیمامی ئەحمەد و ئەصحابی سونەن لەئەبی سەعیدەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی:
جارێکیان پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردو عەرزیان کرد
(أَتَوَضَّأُ مِنْ بِئْرِ بُضَاعَةَ ؟ وَهِي بِئْرٌ تُلْقى فِيهَا الْحِيَضُ وَلُحومُ الْكِلاَبِ وَالنَّتْنُ ؟! فَقَالَ (ﷺ) **الْمَاءُ طَهُورٌ لاَ يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ**) قال الترمذي حديث حسن ، وقال أحمد: حديث بُضاعة صحيح.
واتە: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا بۆمان هەیە لە بیری بوزاعە دەست نوێژبگرین؟ لەکاتێکدا کە ئەو بیرە پەڕۆی ئافرەتی بێ نوێژی تێ دەکرێ و سەگی

تێدا دەتۆپێ و شتی بۆگەنی تێ دەکرێ. بەڵام ئاوی زۆرە و ئەگەر ئاوی لێ دەربهێنین و دەست نوێژی پێ بگرین دروستە ؟! پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ دروستەو ئاو پاکە و هیچ شتێ پیسی ناکات

دیارە ئەو ئاوەی کەلەو بیرە دەرهێنراوە، لەگەڵ ئەوەشدا کەئەو شتە پیسانەی تێ کراون. بۆن و تام و ڕەنگی نەگۆڕاوە و ئاسایی بووە. بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی پیس نابێ و دەست نوێژی پێ هەڵگرن.

کە ئەگەر خەڵکی وەسواس بوایە دەیگوت: هەر بەر لاشەت بکەوێ پێویستە بچی ئەو شوێنەش بشۆیتەوە کەئاوی ئەو بیرەی بەرکەوتووە.

بۆیە تێگەیشتن لە ئیسلام وەکو خۆی (نەك وەکو ئارەزووی کەسی وەسواس) زۆر پێویستە و وا نەبێ دین لە جیاتی ڕەحمەت بۆ خەڵکی دەبێتە زەحمەت

٧- کۆتا ئاسانکاری شەرع کەلەم بەشەدا باسی ئەکەین ئەوەیە کە بە داخەوە زۆرێك لەمەزهەبەکان پێچەوانەکەیان باس کردووە و ئەم ڕەئیە ئاسانە کەمتر باس کراوە لەمەزهەبە بڕواپێکراو و نوسراوەکاندا کەئەم فتوایەش ڕەئی صەحابی پایەبەرز، عبداللە کوڕی عومەرەوە و لە تابیعینیش رەئی: عطای کوڕی ئەبی رباح و سەعیدی کوڕی موسەیەب و طاووس و سالم و موجاهید و شەعبی و ئیبراهیمی نەخەعی و زوهەریە.

**وە لەدوای ئەوانیش:** ڕەئی ئەوزاعی و مالیك و ئیسحاقی کوڕی راهویە و ئەبو سەور و یەکێ لە دوو ڕیوایەتی ئیمام ئەحمەدە.کە ڕاسترینیانە، کە ئاوایان فەرمووە: (أن الرجل إذا رأى على بدنهِ أو ثوبهِ نجاسةٌ بعدَ الصلاةِ. و لمْ يكنْ عالماً بها، أو كانَ يَعلمها ولكنهُ نسيها، أوْ لم ينسِها ولكنهُ عجزَ عن إزالتها: أنّ صلاتَهُ صحيحةٌ ولا إعادةَ عليهِ )

واتە: ئەگەر کەسێك نوێژی کردو دوای تەواو بوونی نوێژەکەی تەماشای کرد وا پیسیەك بەجل و بەرگەکەیەوەتی. یان بەپێستی لاشەیەوەیەتی.

یان بەقژی سەریەوەیەتی، وەکو ڕیقنەی چۆلەکە بەنموونە ، پێشتریش — پێش نوێژەکە هەستی بەبونی ئەم پیسیە بەلاشەیەوە نەکردبوو. یان پێشتر پیٚ‌ی نەزانیبوو.

بەڵام لەبیری چوو بۆو، کەنوێژەکەی کرد ئەمجا بەبیری هاتەوە کە ئەو پیسیەی پێوە بووە و نەیشۆردۆتەوە. یاخود لەبیری نەچو بۆوە بەڵکو نەیدەتوانی لایببات، بەهۆی کەمی ئاوەوە. یان هەر هۆیەکی تر.

ئەوە لەهەموو ئەم حاڵەتانەدا کە باسمان کرد، نوێژەکەی دروستەو گێڕانەوەی لەسەر نی یە

**هاوشێوەی ئەم مەسەلەیەش وەکو ئەوەی کە:** کەسێك لە شوێنێکدایە نازانێ ئاڕاستەی قیبلە بەرەو کوێ یە. بۆیە ڕوو لەشوێنێك دەکات و نوێژەکەی دەکات. پاشان بۆی دەردەکەوێ کەئەو ئاڕاستەیەی کەئەو لە نوێژەکەدا ڕووی تێکردووە، ئاڕاستەی قیبلە نەبووە و ڕووی لە جێگایەکی تر کردووە. ئەوە نوێژەکەی دروستەو پێویست بەدووبارە کردنەوە ناکات.

خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ البقرة: ١١٥

خۆ ئەگەر حەزی کرد نوێژەکە دووبارە بکاتەوە دوای ئەوەی کەزانی ئاڕاستەی قیبلەی هەڵەکردووە. ئەوە دەتوانێ نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە. هەروەکو لە مەزهەبی ئیمامی شافعی دا هاتووە. بەپشتیوانی خوای گەورە و میهرەبان ، ئەم باسە لەوتاری داهاتوودا درێژە پێدەدەین.

# سەرچاوەکان

١- قورئانی پیرۆز

٢- تەفسیری ڕامان ، ئەحمەد کاکە محمود

٣- العبادة في الاسلام ، د. يوسف القرضاوي ، ص ٣١٧ ، ص ٣٣٢، ص٣٣٧، ص ٣٤٠

٤- تحذير الساجد مِن أخطاء العبادات والعقائد ، الشيخ محمد المصري، ص٦٢٣.

# ووتاری پێنجەم

# بۆ مانگی ڕەجەب

# تێگەیشتنی ڕاست و دروست

# لەبنەماکانی شەرع

# بەشی چوارەم

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبهِ أجمعين.

**ئیمانداران:** یەکێ لەو شتانەی کە بەهۆی تێنەگەیشتنی ڕاست و دروست لە شەریعەتی ئیسلام توشی موسڵمان دەبێ و توشی زەحمەت و ئازار خواردنی دەرونی و لاشەیی دەبن .

**بریتی یە:** لە خۆقورس کردنی بواری دەست نوێژ و خۆشۆردنی پێویست و تەیەموم...

کە لەڕاستی دا، وا قورس نیە کەموسڵمانان تێی گەیشتوون. بەڵکو ئاسانترین بەشی ئیسلامەتیە، بەبەڵگەی ئەوەی خوای گەورە هەموو باسی دەست نوێژ و خۆشۆردنی واجب و تەیەمومی تەنها لەیەك ئایەتی قورئاندا بۆ باس کردووین. کە ئایەتی (٦) ی سورەتی(المائدة) یە. کەلەکۆتاییەکەیدا دەفەرموێ، ئەی موسڵمانان:

١- ﴿ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ ﴾ المائدة: ٦

واتە: خوای گەورە نایەوێت لەئایندا تووشی سەغڵەتی و ناڕەحەتیتان بکات.

ئەوەتا خوای گەورە خۆی دەفەرموێ ، غوسڵ و دەست نوێژ و تەیەموم گرانی تێدا نیە. کەچی ئێمە وادەزانین ئەگەر بەقورسی بیکەین و زیادەڕەوی تێدا بکەین ، خوا پێی خۆشە. کە ئەوە مانای حاڵی نەبوونە لەقورئان. ئەی خوای گەورە چی دەوێ؟!

٢- ﴿ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ ﴾ المائدة: ٦

واتە بەڵکو خوای گەورە دەیەوێت پاکو خاوێنتان بکات. ( لە ڕواڵەت و ناوەڕۆکدا).

٣- ﴿ وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴾ المائدة: ٦.

واتە: وەخوای گەورە لەو (باسی دەست نوێژ و غوسڵ و تەیەمومەدا) دەیەوێت نازونیعمەتی خۆیتان بەسەردا تەواو بکات بۆ ئەوەی سوپاسگوزار بن

**جا کەواتە:** زۆر جار ئێمە لەڕادەی پێویست کەشەرع دیاری کردوە. گرنگی زیاتر بەمەسەلەی دەست نوێژ و غوسڵ دەدەین. لەکاتێك دا وەکو ووتمان تەنها یەك

ئایەتی قورئان باسی کردووە. کەحەق وایە قورئان پێوەرمان بێت لەگرنگی دان بەشتەکان. وەئەوەندە گرنگی بدەین بەشتێك کەقورئان پێ‌ی بەخشیووە.
کەمەبەستمان گەورەیی دەست نوێژ و غوسڵ و تەیەموم نیە لەڕووی عیبادەت و پاداشتەوە لای خوا. کەبناغەی نوێژە و بەبێ ئەوە خوا نوێژ وەرناگرێ بەڵکو مەبەستمان لەبواری ئاسانکاریە.

**کە قورئان ئاوا ئاسانی کردووە و پێمان دەفەرموێ:**

ئێوەش لەخۆتانی قورس مەکەن. بەڵام شەیگان بەردەوام خەریکی فریودانی بەنی ئادەمە و بەسەر مرۆڤدا زاڵ دەبێ و لەم ئاسانەدا توشی وەسوەسەی دەکات، کەچی زۆر لەو کەسانەی کەلەدەست نوێژ و غوسڵ دا ئاوا وەسواسن.
لەحەرام خۆری دا هیچ وەسواس نین و ، یەك و دووی لێ ناکەن!! بەڵێ وەسوەسە خراپترین نەخۆش یە.
**سەلەفی صالّح فەرموویانە:** وەسوەسە بریتی یە لە(خَبْلٌ في العَقْلِ وَ نَقْصٌ في الدِّينِ) واتە: وەسوەسە تێکچوونی عەقڵ و نوقسانی دینە
وە جوانترین وەصف و پێناسە بۆ وەسوەسە و وەسواسەکان، ئەو وەصف و باس کردنەیە کەپێشەوای بەناوبانگ (إِبْن قُدامة الحَنْبلي) باسی کردووە، کەئەم گەورە زانایە لە ساڵی (٦٢٠) کۆچی وەفاتی کردووە و ڕیسالەیەکی بەنرخی نوسیوە بەناوی (ذَمُّ المُوَسْوِسين وَ التَحْذيرُ مِنَ الوَسْوَسةِ). کە ئەم زانایە لەسەر مەزهەبی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە.
لێرەدا بەپێویستی دەزانم کەئەوە بڵێم. لەکوردەواریدا،بەکەسانی وەسواس دەڵێن: (حەنبەلی) کەلە میصرییەکانەوە فێری بوون.

بەلاّم ئەم ووشەیە هەڵەیە. چونکە مەزهەبی (حەنبەلی) کەئەحمەد بن حەنبەل پێشەوایەتی. لە ئاسانترین مەزهەبە فیقهیەکانە.

وە سێ زانای بەناوبانگی حەنبەلی کە (إِبْن قُدامة) لەو ڕیسالەیدا کەباسمان کرد ، وە پێشەوا (إبن القَيِّم) لە (إغاثةُ اللهفان) داو (إبن الجَوْزي) لە (تبليس إبليس) دا زۆر بە جوانی باسی وەسوەسەیان کردووە

جا دەچینە خزمەت (إِبْن قُدامة) کە لە وەصفی وەسواسەکاندا دەفەرموێ وەسوەسە گوێڕایەڵی شەیطانە ، تا ئەو کەسە وای لیّ دێ ، وادەزانێ کەئەگەر وەکو پێغەمبەر (ﷺ) نوێژ بکات و دەست نوێژ بگرێ ، ئەوا خوا لیّ ی قبوڵ ناکات وەکەسی موەسویس دەگاتە دەرەجەی شێتی. چونکە ئەوەی شەیگان دەیخاتە دلّیەوە بەقسەی دەکات و ئینکاری ئەو ڕاستیە و یەقینە دەکات کەنەفسی خۆی پیّ ی ئاگادارە. بەچاوی خۆی شت دەبینێ ، کەچی ئینکاری ئەوە دەکات کەبەچاوی بینیویەتی. تەماشای قاچی دەکات کەلە دەست نوێژدا جوان و پوخت شۆردویەتی. کەچی کاتێ شەیطان پیّ ی دەڵێ: نەخێر تەڕ نەبووە.

دەڵێ ڕاستە تەڕ نەبووە و سەر لەنوێ جارێکی تر دەیشواتەوە !! بەگوێی خۆی گوێی لەو ووشەیەیە کە وتویەتی بەزمانی خۆی کەچی گومانی لەگوێی خۆی هەیە دەبێ بیستبێتی یان نا !!

ماوەیەك خەریکی ئیشێك بووە. وەکو دەست نوێژ و غوسڵ. کەچی دەکەوێتە گومانەوە، ئایا کردوویەتی یان نا!!

تەنانەت لەنیەتەکەیدا دەکەوێتە گومانەوە.کەبەجوانی ووتویەتی و تەنانەت خەڵکی تریش لەمەوە فێری نیەت هێنان بوون، ئەوەندە بەپوختی و وردی و دەنگی بەرز ووتویەتی !! کە چی لەگەڵ ئەوەشدا لەناوەڕاستی نوێژ دا بەقسەی شەیطان دەکات

و خۆی بەخۆی دەڵێ: بەخوا نیەتم نەهێناوە و نوێژەکەم دروست نیە  باسەر لەنوێ دەست پێ بکەمەوە!!

جا کە شەیطان لەم هەنگاوەدا سەرکەوتنی بەدەست هێناو ئاوا دڵ و دەروونی ئازاردا بەو وەسوەسانە، ئەمجا خەریکی ئەوە دەبێ کەتوشی ئازاری جەستەشی بکات، بەوەی کەلە ڕۆژگاری بەستەڵەك و سەرمای زستاندا خۆی دەخاتە ئاوی سەهۆلاوەوە.

کەچی کەدێتە دەرەوە لەو حەوزە ئاوە ، شەیطان پێی دەڵێ: جەستەت تەواو تەڕ نەبوەو جارێکی تریش خۆت بخەرە ئەو ئاوەوە کەلەسارديدا جەستەت لەناو دەبات!! یان لەناو ئاودا چاوی هەڵدێنێ بۆ ئەوەی چاویشی ئاوی تێبچێ تاوای لێ دێ ئازار بەچاوی دەگات !! یان ئاو دەکاتە ناو کونی گوێیەوە کە زۆر جار توشی ئیلتیهاباتی گوێ دەبێت! لەکاتێکا لەشەرعدا نە چاو و نە کونی گوێ شۆردنی لەسەر نیە! پاشان شەیطان ئەو کەسە وەسواسە دەکات بەگاڵتەجاڕی منالان و گەوران.

چونکە وانیەت دێنێ و دەست نوێژ دەگرێ و خۆی دەشۆرێ .کە گەورە و بچوك گاڵتەی پێ دەکەن

**ڕوداوێکی واقیعی و لەگوندێکی پارێزگای سلێمانی ڕووی داوە:**

کەسێك لەو موەسویسانە لەحەوزی ئاوی گوندەکەیاندا کەپیاوان خۆی لێ دەشۆن، غوسڵ لەخۆی دەردەکات. چەند جارێك خۆی لەئاوی حەوزەکەدا نقوم دەکات و ماوەیەك لەئاوەکەدا دەمێنێتەوە. کەچی لەخۆی دەکەوێتە گومانەوە ئایا تۆ بڵێ ی پشتی تەڕ بووبێت!! بۆیە لەحەوزەکە دێتە دەرەوە و کەسێکی مێرد منال دەبینێ و بانگی دەکات و پێی دەڵێ: ئادەی ڕۆڵە گیان بزانە پشتم تەڕ بووە؟!! ئەویش سەیری دەکات و دەڵێ : نەخێر بستێکی تەڕ نەبووە!

– بۆ ئەوەی گاڵتەی پێ بکات. دیسان کابرا نیەت دێنێتەوە و خۆی نقوم دەکاتەوە لەئاوەکەدا و ئەمجارەیان بەکوڕەکە دەڵێ : ئادەی بزانە ئەمجارە ئەو شوێنە تەڕ بووە ؟! ئەویش دەڵێ : بەڵێ ئەوێ تەڕ بووە بەڵام لەولاتر شوێنی تری لاشانت ووشکە !! جارێکی تریش خۆی دەخاتەوە ناو حەوزەکە و تیا نقوم دەبێ و دوو سێ دەقیقە دەمێنێتەوە. وە بەئومێدی ئەوەی ئاوی بەرکەوێ!! کە ئەمجارەش سەیری پشتم بکەوە بزانە هیچ شوێنی ماوە تەڕ ببێ؟!! کوڕەی گاڵتە جاڕیش دەڵێ ، لەولاترەوە شوێنێکی تر ماوە هێشتا ئاوی بەرنەکەوتووە!! کابرا توڕە دەبێ و دەست دەداتە بەردێك و دەڵێ : دیارە تۆ گاڵتە بەمن دەکەی.

چۆن ئەمە نزیکەی (١٠) جارە خۆم دەخەمە ئەو حەوزە ئاوەوە هێشتا پشتم پەڵەی ووشکی پێوەیە. ئادەی بوەستە بزانم بەکێ ڕادەبوێری! کوڕەی مێرد منالیش دەڵێ مام فلان کەس من گاڵتەت پێ ناکەم. ئەوە خۆتی گاڵتە بە خۆت دەکەی ، ئەوە خۆتی متمانەت بەعەقڵ و چاوی خۆت نیە.

پرس بەمن دەکەی ، ئەی منیش دەبێ شتێکت بۆ زیاد بکەم!! پاشان ئەم کەسە موەسویسە ، شەیطان وابە سەری دا زاڵ دەبێت، کە بەهۆی وەسوەکەیەوە نوێژی جەماعەتەکەی دەفەوتێ، هەندێ جار بەهۆی وەسوەسەی لەنیەتدا، هەتا نیەت دێنێ، ئیمام دەچێتە ڕکوع و خێر و پاداشتی (الله أكبر) ی یەکەمی لەدەست دەچێ، هی وا هەیە بەهۆی ئەو وەسوەسەیەوە تەواوی نوێژی جەماعەتەکەی لەدەست چووە. هەر خەریکی تارەت گرتن بووە.

هەتاوەکو جەماعەت تەواو بووە. ئەم هەر لەسەر ئاو خەریکی خۆ پاکردنەوە بووە.

هەر گومان بۆ خۆی دروست دەکات بەوەی کەوا دەزانێ میزی پێ ماوە

بەداخەوە هی وا هەیە، پێش نوێژی دەکات بۆ موسڵمانان ، کتێبەکانی شەریعەتی ئیسلامی خوێندووە کەچی کاتێ کە نیەتی نوێژ دابەستن دێنێ، بەدەنگێکی زۆر

بەرزو حەماسی یەوە نیەت دێنێ و لەهەمووشی سەیر تر دەڵێ: (مُسْتَقبِلَ القِبْلَةِ)
کەس نیە پێی بڵێ: ئەرێ مامۆستا گومانت هەیە کە ڕووت لەقیبلە یە.
وائەمەشی بۆ زیا دەکەی ؟!!!

پاشان شەیطان گەمە و یارییەکی تر بەم کەسە موەسویسە دەکات. ئەویش بەوەی کە وەسوەسەی بۆ دروست دەکات لەدەربڕینی پیتەکاندا.

هەتا پیتی وا هەیە دوبارە و سێ بارەی دەکاتەوە. هەیە سێ چوار جار دەڵێ : وَلا الضالین ، لین ، لین کەچی هە قەناعەتی نایەت !!

(إبن قدامة) **دەفەرموێ:** جارێکیان کەسێك هات بۆ لام و ووتی: مامۆستا هەر چەند دەکەم بۆم نایەت بڵێم (السلام علیکم) !!! باشە چی بکەم تالەو گرفتە ڕزگارم ببێ و وەکو ئەو خەڵکە سەلامم بۆ بکرێ ؟!

منیش پێم ووت (قُلْ مِثْلَ ما قُلْتَ الآنَ ، وَقَدْ إسْتَرَحْتَ).

واتە: برام ئەوەی ئا ئێستا ووتت بیڵێ. کاتێ کەسەلام لە خەڵکی دەکەی. ئەوە ئاسودە دەبێ و ڕزگارت دەبێ لەو گرفتە خەیاڵیەی کەخۆت بۆ خۆتت دروست کردووە

**چارەسەری ئەم وەسوەسەیەش بەم شێوەیە دەبێت :**

١- زۆر ووتنی [أعوذُ باللّٰه مِن الشیطانِ الرَّجیم]

٢- شەرع چۆنی پێ ووتوی ئاوا بەسوکی و بەئاسانی و ڕێکوپێکی خواپەرستی بکە

٣- کاتێ شەیطان وەسوەسەی بۆ دروست کردی بەقسەی مەکە.

**بەڕێزان:** هەندێ لەموسڵمانان وا حاڵی بوون کە ئەگەر لەناو نوێژ دا، بەحاڵ دەست بجولێنن نوێژەکەیان بەتاڵ دەبێت، بەڵام نەخێر بۆ حاڵەتی زەروری دروستە.

**بۆ نموونە:**

١- لەکاتی باوێشکدان لەناو نوێژدا ، کەپێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرموێ:

(**إِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُم في الصلاةِ ، فَلْيَضَعْ يَدَهُ على فيهِ ، فإنَّ الشيطانَ يَدْخُلُ مَعَ التثاءُبِ**) متفق عليه، صحيح الجامع (٤٢٦).

**واته:** ئەگەر یەکێك لەئێوە لەناو نوێژدا باوێشکی دا. بادەستی بخاتە سەر دەمی. چونکە شەیطان دەچێتە ناوەوە لەگەڵ باوێشکدا

٢- کاتێ مۆبایلەکەت زەنگی بۆ هات، لەبیرت چوو بوو بیکوژێنیتەوە. یان بێدەنگی بکەی (ئەوە بۆ ئەوەی بەو دەنگی زەنگە) کەبەداخەوە هەندێ جار گۆرانیە!! هەم خۆت بیر و هۆشت لای نوێژەکەت نامێنێ. هەم ئەوانەی دەوروبەریشت بەتایبەتی لەنوێژی جەماعەتدا. بیریان لای نوێژەکەیان نامێنێ دەی لەبەر ئەوە یەکسەر دەست ببە بۆ مۆبایلەکەت و بیکوژێنەوە و نوێژەکەت بە تاڵ نابێت

**ئیمانداران:** بەشێکی تر لە ئاسانکاری ئەم شەرعی ئیسلامە ئەوەیەکە (العِنايةُ بالفَرائِضِ اَوَّلاً) ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە کە : کابرایەکی ئەعرابی هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) و پرسیاری لێ کرد چیم لەسەر واجبە ؟ فەرموی : (**خَمْس صَلَواتٍ**) پێنج نوێژ، کابرا ووتی: (هَلْ عَلَيَّ غَيْرُها؟!) جگە لەو پێنج نوێژە هیچ نوێژی ترم لەسەر پێویستە ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (**لا ، إلا أَنْ تَطَوَّعَ**). نەخێر. مەگەر نوێژی سوننەت بکەیت

پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەکابرای فەرموو: هەموو ساڵێکیش پێویستە مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بیت. کابرا ووتی: ئایا جگە لە ڕۆژوی ئەو مانگە هیچ ڕۆژوی ترم لەسەر فەرزە ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: نەخێر مەگەر خۆت ڕۆژوی سوننەت بگری. وەفەرموی: ئەگەر ماڵ و سامانیشت هەبوو وەگەیشتە ئەو ڕادەیەی کە زەکاتی

تێدا واجب دەبێ. پێویستە لەسەرت ساڵی جارێکیش زەکات بدەی. کابرا ووتی ئایا جگە لەو زەکاتە واجبە هیچی تر بدەم ؟ فەرموی : نەخێر مەگەر خۆت خێر و صەدەقەی سوننەت بکەیت    کابرا ڕۆیشت و ووتی: (واللّٰه لا أَزيدُ ولا أنقصُ فيما فرضهُ اللّٰهُ عليَّ شيئاً).

سوێند بەخوای گەورە لەوەی خوای گەورە لەسەری فەرز کردوم ، نەزیاد دەکەم و نەکەم. تەماشاکەن پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیفەرموو : بەخوا ئەم تەمەڵە حەزی بەدینداری نیە، بۆیە تەنها فەرزەکان دەکات. بەڵکو فەرمووی: (فَلَحَ إِنْ صَدَقَ). سەرفراز بووە، ئەگەر ڕاست بکات و قسەکەی بباتە سەر.

کەچی ئێمە ئەمڕۆ بەهۆی کەم حاڵی بوغمان لەدینەوە، کەسی وا دەبینین تەرکی سوننەتێك دەکات، دنیایی لێ تێ دەگەیەنین، کابرایەك هەبوو. بەردەوام لەمزگەوت بوو.

ئەگەر یەکێك بهاتایە مزگەوت و دوو ڕکات سوننەتی نەکردایە. لەبەر چاوی هەموو خەڵکی لێ ی تورە دەبوو، کەچی چوار پێنج کوڕی هەبوو. هیچیان نوێژی فەڕزیان نەدەکرد، ڕۆژێك قسەیەکی بەئەوان نەدەگوت !!..

هەروەها زۆر جار عورف و عادەت لەگەڵ عیبادەت تێکەڵاو دەکەین

**بۆ نموونە:** گەنجێك لەمزگەوتا نوێژ دەکات، یان ئیمامەتی دەکات لەو کاتانەی مامۆستای بەرێزی مزگەوت ئامادە نی یە. قورئانێکی زۆر جوان دەخوێنێ.

هەرچی کەم و کورتی بێ لە نوێژەکەیدا نیە. کەچی بەداخەوە مام حاجی وامان هەیە لەدوایەوە نوێژ ناکات. بۆچی؟! چونکە، سەری ڕوتەو کولاو و جامانەی لەسەردا نی یە!! یان کراسی قۆڵ کورتی لەبەر دایە، یان سەری چەور کردووە!!

**لێرەدا سەرنج بدەن:** لەهەموو شەرعدا ، کە لە دوو سەرچاوەی بێگەردی قورئان و سوننەتەوە وەرگیراوە. نەصی ئایەتێك یان فەرمودەیەك نیە، کەباسی ئەوە بکات

سەری ڕووت یان جامانەو کولاو و مێزەر، ڕوکنێك و مەرجێکی ئیمامەتی یان نوێژی مەئموم بێت!

مەگەر هەندێ فەرموودە هەبێ کەباس لەوە بکات کەبەسەری داپۆشراوەوە خێری زیاتر بێت، کەئەو فەرمودانەش پلەی بێ هێز (ضعیف) یان (موضوع) هەڵبەستراو یان پێ دراوەو نەگەیشتونەتە (حَسَن) یش چ جای صحیح .

وە هەروەها ڕەنگە هەڵەمان نەکرد بێ کە بڵێین کولاو و مێزەر بەسەرەوە بونی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئێمەی ئەمڕۆ نەبێتە سوننەتێکی زۆر گەورە

(هەر چەندە هەندێ زانای سەردەمیش لەگەڵ ئەوەن کەوا چاکە موسڵمانی پیاو کولاو مێزەری لەسەر بێت) بەڵام لەڕاستی دا زیاتر ئەوە عورف و داب و نەریتە.

چونکە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ، تەنانەت تا سی چل ساڵێك لەمەو بەریش لەکوردەواری خۆماندا. بەکافر و موسڵمانەوە ، نوێژخوێن و نوێژنەکەرەوە، کولاو و جامانەی بەسەرەوە بووە.

بەتایبەت لەعەرەبستاندا کە گەرمە، بۆ پاراستنی سەریان لەتیشکی خۆر کە زۆر بەهێزە و بەتینە، جامانەو مێزەریان لەسەر کردووە. بەڵام خۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیفەرمووە ئەم کولاو و جامانەی من دینە و مەرجی قبوڵ بونی نوێژ و دروست بونی ئیمامەتیە

بەڵکو ئەوە ئێمە خۆمانین کە کردومانە بەدین و مەرجی قبوڵ بونی نوێژ. بەداخەوە ، تەشبیە نەبێ و دوور لە ئاینی ئیسلامی بێ گەرد و موسڵمانانی بەڕێز. خەریکە وەکو ئەو شیوعیانەمان لێ بێ ، کە ، د. کاوس قەفتان لەبارەیانەوە دەڵێ:

کابرایەکی شیوعی لەسلێمانی، لەکاتی گەرمای چلەی هاویندا خۆی پێچاوەتەوە بەپاڵتۆ و مل پێچەوە و دەست کێشی گەرمی لەدەست کردووە! پێیان ووتوە : ئەوە چی یە. بۆچی وا ئەکەی؟ ئەویش لەوەڵامدا وتویەتی: دەڵێن ئێستا لەمۆسکۆ بەفر دەبارێ!

پاشان هی وا هەیە بەو گەنجە بەڕێزە دڵسۆزانە بۆ ئیسلام دەڵێ:
سەری چەور کردووە و دای هێناوە و شانەی کردووە! وەکو ڕەخنە لێ گرتن.
کە ئەمەش دەبێ دەست خۆشی لێ بکرێ چونکە ئەو گەنجە سوننەتی پێغەمبەری خوای (ﷺ) جێ بەجێ کردووە. چونکە لەسەردەمی پێغەمبەری خۆشەویستماندا (ﷺ) کەسێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد ئایا قژم دابێنم و چەوری بکەم ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ( نَعَمْ ، فَأكْرِمْهُ وَ دَهِّنْهُ ) بەڵێ ، ڕێزی قژت بگرە بەوەی بەپاکو خاوێنی ڕایبگرە و شانەی بکەو و خزمەتی بکە.
وە هەروەها چەوری بکە
بەڵێ ئەوە تۆی ڕەخنەگری لەو گەنجە پاکو خاوێنە، قورئان خوێنە. کەتەرکی سوننەتی پێغەمبەرت کردووە قژی خۆت خزمەت نەکردووە و بەکولاو و جامانە شێواندوتە و هەر تاڵە مووەی ڕوی کردۆتە لایەك زۆر جار کەسانێك هەن کاکڵ و توێکڵیان لێ تێکەڵ بووە و کولاوی چڵکنی وا هەیە چەندین ساڵە نەشۆراوە و هەر خۆی نوێژی دروست نیە !..
**وە هەروەها جێگای باس کردنە کەبڵێین:** ئەوەی لەمزگەوتا ڕەخنە لەگەنجی سەر ڕووت و قۆڵ ڕووت دەگرێ. کە بۆ کوڕ حەلاڵە و هیچ بێ شەرعیەکی تێدا نیە.
کەچی بەبای خەیاڵی دا نایەت کەلەمزگەوت ڕۆیشتەوە وا کچەکەی خۆی نەك سەر و قۆڵی ڕووتە. بەڵکو قاچیشی تا پشت ئەژنۆی ڕووتە. کەنەفرەتی لێ کراوە کەچی بۆ ئەم بێ شەرعیەیان موویەك لە لاشەی نابزوێ و دەڵێ: مۆدە!!!
تکایە ئەم ووشانە بەتوند وەرمەگرن. ئەمە واقیعە و ناچارین کەهەڵەکان ڕاست بکەینەوە.
**ئیمانداران:** قاعیدە و بنەمایەکی تری شەرعی کە موجتەهیدان فەهمیان کردووە ، بریتی یە لە ( إِنَّ اللهَ لا يَقْبَلُ النافِلَةَ ، حتى تُؤَدي الفريضَة ).
**بۆ نموونە:** هی وا هەیە حەجی دووەم و سێیەم دەکات ، ئەمە سوننەتە.
کەچی لەولاوە دراوسێیەکەی ، نەدارە ، هەژارە ، قەرزارە ، کرێ چی یە، نەخۆشە، کەس نیە هاوکاری بکات. ئەوە بەڕاستی ئەگەر حەجە سوننەتەکەی نەکات و یارمەتی ئەم دراوسێ یەی بدات باشترە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ:

(**ما آمَنَ بي مَنْ باتَ شَبْعانَ وَ جارُهُ إلى جَنْبِهِ جائِعٌ وَهُوَ يَعْلَمُ**) رواه الطبراني والبزار بأسنادٍ حسن.

واتە: بەڕاستی ئیمان و بڕوای بەمن نیە کە پێغەمبەری خوام کەسێك کە بۆ خۆی تێر و تۆخە ، کەچی دراوسێیەکەی لەتەنیشیەوە برسیەتی و ئەم پێ دەزانێ و ئاگای لەحاڵ و بارودۆخی نالەباری یەتی و ئامادە نیە هیچ هاوکاریەکی بکات.
بەڵێ کەسی واهەیە خێر و خێرات دەکات، مزگەوتیش دروست دەکات. کەچی مافی خوشکەکانی نادات کەلە میراتی باوکی دەستی بەسەردا گرتووە و بەشی ئەوانیشی پێوەیە، لەم پارەی کەبەشی ئەوانیشی پێوەیە و مافی خۆیانە. ئەم خێر و خێرات و پیاوەتی دەکات. دەی واجبەکە ئەوەیە، مافی ئەو خاوەن میراتیانە بداتەوە، ئەمجا خێر و خێراتەکە کە سوننەتە ، لیّ ی قبولّ دەکریّ.

**یاخود:** ساڵانە ئەو هەموو پارەیە لەسەفەری پیرۆزی عەمرەدا سەرف دەکرێت. کە زۆربەیان عەمرەی دوو بارەو چەند بارەن. کەئەمە سوننەتێکی زۆر گەورە و پیرۆزە. بەڵام لەولاشەوە بەسەدان گەنج و لاوی بێ دەرامەت. پرۆسەی هاوسەرگیریان بۆ ئەنجام نادرێت.- کەنیوەی ئیمانی پێ تەواو دەبێت — لەبەر دەست کورتی و نەداری و هەژاری و بێ خانویی. دەی ئەو پارەیەی کەلەعەمرەی دووەم و سێیەمدا صەرف دەکرێت، بدرێت بەو گەنجانە باشترە و کوڕ و کچە لاوەکان بە حەڵاڵی بگەنە خانە و لانەی هاوسەری خۆیان و کۆمەڵگا لە داوێن پیسی بەدوور بێت.
یان ئەو هەموو قەرزارە، کەقەرزاری وەکو کۆیلەی لیّ کردوە. بچی ئەو قەرزەی بۆ بدەیتەوە باشترە لەوەی کە عەمرەی دووەم و چەند بارەی پێ بکەی. ئەو قەرزارە کەلە قەرزاری ڕزگاری بوو وەکو سەر لەنوێ لەدایك ببێتەوە ئاوایە و ژیانێکی نوێ دەست پێدەکات ئای چ خێرێکی گەورەیە !.

- **بنەمایەکی تری شەرعی ئەوەیە:** (المُسْلِمُ الفقيه، لا يَحْرُصُ على مَنْدُوبٍ، يُوقِعُهُ في مَكْرُوُهٍ أَوْ حَرامٍ)

بۆ نموونە: ئیمامی غەزالی لە کتێبە ناوازەکەیدا (أَحياء عُلوم الدين) دا، لە باسی حەج دا دەفەرموێ: ئەگەر کەسێ چوو بۆ حەجی سوننەت و لەڕێگادا کاربەدەستانی وەخت پارەیان وەکو باج و و سەرانە لە حاجیەکان بەناڕەوا دەساند، کەئەمە حەرام و نارەوایە، ئەوا لەو کاتەدا بۆ ئەو کەسانەی کەحەج و عەمرەی سوننەت دەکەن ئەمە پێویستە

(إِنْ ترك التَّنَفُل بالحجِّ والرجوعِ عنِ الطريقِ ، أَفْضَلُ مِنْ إعانةِ الظَلَمَةِ) بەڕاستی واز هێنان لەو حەجە سوننەتە و گەڕانەوە لەڕێگادا، کەزانی ئەو باج و سەرانە ناڕەوایە دەسەندرێ ، باشترە لەوەی کەبچێ حەجە سوننەتەکە بکات، بەڵام یارمەتی زاڵم و ستەمکار بدات بەوەی کەئەو زەریبە و باجە حەرامەیان پێ بدات !

**وەلە ئەمڕۆشدا:** بگەیتە نزیك مەککە بۆ حەجی سوننەت. کەچی کاربەدەستانێك داوای بەرتیلت لێ بکەن، یان لێرە مامەڵەی حەجەکەت تەواو بووبێ، بەڵام بە ناڕەوا داوای پارەیەکی زیادەت لێ بکەن. کەچەند نەفس نزمێك. دوور لە یاساو ڕێنمایی حەج ، لەخەڵکی داوا بکەن. ئەوە بەڕاستی حەجەکەت نەکەی باشترە نەك بەرتیلە کە بدەی !..

- **بنەمایەکی تری شەرعی ئەوەیە:** (أَنَّ العملَ الذي يَعُودُ بالخَيْرِ والنفعِ على المجتمعِ (إذا صحتْ فيه النيةُ) قَدْ يفضل نوافِلُ العِباداتِ بدرجاتٍ كثيرةٍ ).

واتە: ئەو کار و کردەوەیەی کەسەرەنجامەکەی بەخێر و سودی کۆمەڵگا دەشکێتەوە، بەمەرجێ بەنیەتێکی پاك و بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە بکرێ، ئەوە باشترە لە عیبادەتی سوننەت بەچەند پلەیەکی زۆر.

**ئەمەش وەکو:** صولح و ئاشتەوایی لەنێوان خەڵکی ناکۆکدا و کوژاندنەوەی فیتنەیی و دووبەرەکی و خوێن ڕێژی. لەنێوان دوو کەسدا. دوو شەریکدا ، دوو ماڵ و دراوسێ دا. دوو هۆز و عەشرەتدا. یان ژن و مێردێکی ناکۆکدا. پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە فەرمودەی گەوهەرینی خۆیدا، ئەم ئیصلاح و ئاشتەوایی یەی بەگەورەتر داناوە لە ڕۆژوو نوێژ و خێر و خێراتی سوننەت.

هەروەها کاربەدەستی کاروباری خەڵکی، لەهەر پلەوپایەیەکدا بێت، کەلەخزمەتی هاووڵاتیاندا بێت و کاروبارەکانیان بەجوانی بەڕێ بکات و خزم خزمێنە و مەحسوبیەت و مەنسوبیەت نەکات. ئەوە خێری زۆر زیاترە لەعیبادەتی سوننەت هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی **(لَيَوْمٌ مِنْ إمامٍ عادِلٍ أفضَلُ مِنْ عِبادةِ ستينَ سنةٍ)** رواه الطبراني بإسنادٍ حسن.

واتە: تاکە یەك ڕۆژی خێر و پاداشتی کار بەدەستی دادپەروەر. کەبەهۆی عەدالەت و دادپەروەریەکەیەوە ماف بۆ ماف خوراو دەگەڕێتەوە زۆرباشترە و خێر و پاداشتی گەورەترە لە عیبادەتی شەست ساڵ خواپەرستی سوننەت کەکەسێك لەگۆشەیەکدا بۆ خۆی خەریکی خواپەرستی بێت! بۆچی ؟! چونکە خواپەرستی ئەم عابیدە هەر بۆ خۆی سودی هەیە. بەڵام کاربەدەستی دادوەر بەمەرجەێ خوا بناسێ و بەنیەتێکی پاکەوە، کە چاوەڕێی پاداشتی خوا بێ، ئەم دادپەروەریەی ئەو هەموو خەڵکی بەگشتی ، تێکڕا لیّ ی سودمەند دەبن

- **بنەمایەکی تری شەرعی ئەوەیە:** کە پێویستە، لەکاتی فەتوادادندا. موفتی تەماشای حاڵی ئەو کەسە بکات کە فتواکەی بۆ دەدات. چونکە زۆر حوکم و بڕیاری شەرع هەیە بۆ کەسێك گونجاوە. بەڵام بۆ کەسێکی تر گونجاو نیە.

**بۆ نموونە:** کڕینی کەلوپەل، جا کەلوپەل و پێدا ویستی ناو ماڵ بێ، یاخود ئۆتۆمێل بێت. بەقیستی مانگانە، ئەگەر چی نرخەکەشی گرانترە لەوەی کە بە حازر بیکڕێ دروستە.

بەمەرجێ ئیستغلالی وەزوع و بارودۆخی کڕیار نەکرێ و لە ویژدان دەرنەچێ. بەڵام بۆکێ حەلاڵە. بۆ ئەو کەسەی کە نیوەی پارەکەی هەیە.

**بۆ نموونە:** بۆ نیوەکەی تریش کەبەتەمایە بەقیستی مانگانە بیداتەوە. هەر چەندە پارەکەی لەبەر دەستا نیە. بەڵام زەوی یەك. ئالتونێك ، شتێکی وای هەیە کە ئەگەر پێویستی بوو ، دەتوانێ بیفرۆشێت.

بەڵام ئەمڕۆ حەز ناکات لەدەستی بیێتەوە و بیفرۆشێ، جا ئەگەر ئۆتۆمێلەکەی توشی کارەساتێك بوو. یان کەلوپەلەکەی کەبەقیست وەری گرتووە فەوتاوە، ئەم کە هەر دەبێ قیستەکان بداتەوە. پەنا ببات بۆ فرۆشتنی ئەو شتەی کە هەیەتی و دەفعی قیستەکانی پێ بکات و توشی قەرز و قۆڵە و کۆمەك کۆکردنەوەی بەردەرگای مزگەوت و ناو خزم و کەس و کاری نەبێت.

بەڵام ئەگەرکەسێك جگە لە نیوە پارەیەك بۆ ئەو ئۆتۆمبێلە، یان ئەو کەلوپەلە هیچی تری شك نەدەبرد، ئەگەر توشی کارەساتێك ببوایە. یان نەخۆشیەکی بەسەردا بهاتایە نەیدەتوانی لە موچەکەی پاشەکەوت بکات و قیستبەکانی پێ بدات ، وە هیچی نەبوو بیفرۆشێ

ئەوە لەم کاتەدا لەبەر ناچاری ئەبێ سواڵ و پیتاك لەناو خزمان و دۆستانی دا بکات و پەنا بۆ ئەملاولا بەرێت و کەسایەتی و شەخصیەتی پێی دادەبەزێ ، ئەوە بەڕاستی بۆ ئەم کەسە ، کەئەوە حاڵیەتی ئەو کڕینی شتە بەقیست دروست نیە!

**یاخود وەکو ئەم نموونەیە:** دەگێڕنەوە کە یەکێ لە خەلیفەکانی ئەندەلوس، کەکاتی خۆی وولاتێکی ئیسلامی دەوڵەمەند و پڕ سەروەت و سامان بووە، ئەوخەلیفەیە دێتە خزمەت زانای گەورەی ئیسلام (**مونذری کوڕی سەعید**) پێی دەڵێ: سوێندێکم خواردووە و ناچار بووم سوێندەکەم شکاندووە، ئێستا دەمەوێ کەفارەتی ئەو سوێندەم بدەم. چی بکەم باشە ؟!

**ئەم عالمە شارەزایە فەرمووی:** سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە. لەو کاتەدا یەکێ لە مەلاو زاناکانیش لەوێ بوو، ووتی: جەنابی مامۆستا: (قَدْ ضَيَّقْتَ واسعاً) بەڕاستی تۆ

ڕێگایەکی فراوان و فتوایەکی ئاسانت گۆڕی بەڕێگایەکی تەسك و فەتوایەکی گران!!

مامۆستا ( موندری کوڕی سەعید ) فەرموی: چۆن؟ ووتی: قوربان خوای گەورە کەفارەتی سوێندی داناوە بەوەی خواردنی ( دە ) هەزار بدرێ یان جل بەرگیان بۆ بکرێ. کەچی تۆ باسی ڕۆژوو گرتنەکەت بۆ کرد: مامۆستای بەحەق شەرع زان و تێگەیشتوولەبنەمای شەرع و مەبەستەکانی شەریعەت، فەرموی: برای خۆم.

کەفارەتی سوێند بۆ تەمێ کردن و بەئاگا هێنانەوەی مرۆڤە، کەخاوەن ئیرادەی خۆی بێت و وەکو شێر هەڵنەچێ و قسە فڕێ نەدات و پێویستی بەسوێند خواردن نەبێت جا من لە تۆ دەپرسم: ئایا کەسێکی ساماندار و پارەداری وەکو خەلیفە.

کە ڕۆژی خواردنی (دە) هەزار هەر لەسەر سفرەی وەکو بەرماوە دەمێنێتەوە

ئایا ئەگەر لە کەفارەتی سوێندەکەیدا. خواردنی (١٠) هەزار بدات، هەر هەستیش بەخۆی دەکات و بە ئاگای دێنێتەوە. تا تەمێی بکات ؟!!

ئەمە بۆ خەلیفە هەر هیچی تێ ناچێ. چونکە لەیەك ڕۆژدا نانی هەزار کەسی پێدەدرێ و جل و بەرگی هەزار کەسیشی پێ دەکرێ.

بەڵام: ( إنَّما يَزْجرهُ الصَّوْمُ )! ، ئەوەی تەمێی دەکات ڕۆژوو گرتنە، کە بەڕاستی بەو سێ ڕۆژەوە. کە پێشتر بە ئارەزووی خۆی خواردن و خواردنەوەی خواردووە و ئێستا هیچی بۆ ناخورێ و بەشداری سەر سفرە ناکات. لەناخەوە دەهەژێ و وای کار لێ دەکات هەر جارێ بیەوێت سوێند بخوات.

ئەمەی بەبیر دێتەوەو لەیادی ناچێتەوە! هەزاران ڕەحمەتی خوا لە فەقیهوشەرعزانی ڕاستەقینە (موندری کوڕی سەعید) و هەموو زانایانی ئیسلام.

# سەرچاوەکان


١ قورئانی پیرۆز.

٢. تەفسیری ئاسان ، بورهان محمد أمین

٣. العبادة في الإسلام ، د. یوسف القرضاوي ، ص ٣٢٦ ، ص ٣٤٢ ، ص ٣٤٤.

٤. خُلُق المسلم ، محمد متولي الشعراوي ، ص ٢٤٨